پرۆفیسۆر مستەفا زەلمی

# رادەی دەسەڵاتی ویست لە تەلاقدا

(لە شەریعەت و یاسا و عورفی چوار هەزار ساڵدا)



وەرگێڕانی: عبدالکریم فتاح



# رادەی دەسەڵاتی ویست لە تەڵاقدا

(لە شەریعەت و یاسا و عورفی چوار هەزار ساڵدا)

# رادەی دەسەڵاتی ویست
# لە تەڵاقدا

## (لە شەریعەت و یاسا و عورفی چوار هەزارساڵدا)

نووسینی

**دکتۆر مصطفی زەلمی**

وەرگێڕانی

عبدالکریم فتاح

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

# مدى سلطان الإرادة في الطلاق

## في الشرائع والقوانين والأعراف خلال أربعة آلاف سنة

# ڕادەی دەسەڵاتی ویست لە تەڵاقدا

## (لە شەریعەت و یاسا و عورفی چوار هەزار ساڵدا)


| | |
|---|---|
| نووسینی | : دکتۆر مصطفی زەڵمی |
| وەرگێرانی | : عبدالکریم فتاح |
| نەخشەسازی | : جمعە صدیق کاکە |
| نۆرەی چاپ | : چاپی یەکەم ٢٠١٧ |

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
٢٥٠,٠٠٠ دینار


**پرۆژەی وەرگێرانی**
**کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا**



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٤٤ ) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا

تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا﴾

سورة النساء:٣٤

**(أَبْغَضُ الْحَلَالِ إِلَى اللَّهِ الطَّلَاقُ)**

رواه ابن ماجة: ٢٠٠٨

# ناوەرۆك

**دەروازەی چوارەم**

# پێشەکی چاپی چوارەم

ئامانجی سەرەکی لە دەستبردن بۆ ئەم دانراوە و هەستان بە رێکاری بەراورد لە نێوان شەریعەتەکان و یاساکان و عورفە جۆراوجۆرەکاندا بەدرێژایی چوار هەزار ساڵ، بەتایبەت لە مەزهەبە فیقهییە ئیسلامییە تۆمارکراوەکاندا لەگەڵ بەراورد پێکردنیان بە یاسای باری کەسێتی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی، ئەم کتێبە یادخەرەوەی مفتی و قازیە بەم خاڵانە:

١-گرنگی بابەتەکە پەیوەست بە بەردەوامبوونی ژیانی خێزان.

٢-ئافرەت شمەکێك نییە بفرۆشرێ و بکڕێت و نرخەکەی بریتی بێت لە مارەیی، ئافرەت بەنرخترە لەوەی بەنرخ مادیانە بخەملێنرێت.

٣-ئافرەت دایك و کچ و خوشك و ژنی پیاوان، پیاو لە ئافرەت خولقاوە، بۆیە لەسەر پیاو پێویستە شوێن و پلە و پایەی ئافرەت لە کۆمەڵگەدا بزانێت.

٤-ژن لەژێر بەزەیی مێرددا نییە گەر بیەوێت رایبگرێت و گەر نەیەوێت تەڵاقی بدات، تەڵاق خراپترین حەڵاڵە و بۆ پێویستییەکی زۆر دانراوە و پێویستیش بە بڕی خۆی ئەندازەگیری بۆ دەکرێت.

٥-هاوسەرگیری پەیماننامەیەکی تووندوتۆڵ و پێکەوەبوونێکی رۆحییە و سەرمایەکەی بریتییە لە خۆشەویستی ئاڵوگۆڕ و رێزی بەرانبەر، و قازانجەکەشی بریتییە لە لەدایکبوونی نەوەیەکی نوێی چاك و پاك.

٦–ئیسلام نایەوێت بینایەك تەواوبوونی چەندین ساڵی خایاندووە و تێچوونێکی زۆری بردووە بە یەك ساتی کەم بەسەر ژن و مێرد و منداڵەکاندا دابڕوخێت، جیابوونەوەی نێوان ژن و پیاو لە قورئاندا بە هەشت قۆناغدا گوزەر دەکات و پەیوەندی ژن و مێرد تەنها لە قۆناغی هەشتەم و دواییدا کۆتایی پێ دێت.

٧–تێکەڵی ڕاستبووەوە لە نێوان شەریعەتی ئیسلام و فیقهی ئیسلامیدا و جێگرتنەوەی مەزهەبەکان بۆ قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) لە کارکردنیان بە ئیسلام، ئەمەش هەڵەیەکە جێگەی لێخۆشبوون نییە لەگەڵ ڕێزی زۆرمان بۆ پلە و پایەی مەزنی فەقیهان کە بە باشترین شێوە ئەرکی سەرشانی خۆیان بەئەنجام گەیاند و پابەندبوون بە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) و فتوا و قەزاوەتی هاوەڵانەوە–خوایان لێ ڕازی بێت– بە پێچەوانەی ئەوەی پیاوانی ئایین لەسەرینی لەدوای وەستانی ئیجتیهاد لە سەرقاڵبوون بە زانستە ئامرازییەکانەوە بەدرێژایی تەمەن، بەبێ کارکردن لەناو قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)

٨–مەزهەبگەرایی لێجێماوێك نییە لە میراتلێگیراوەوە بگوێزرێتەوە بۆ میراتگران، ئیسلام بە چاخی زێڕینی خۆیدا گوزەری کرد کە زیاتر لە (١٥٠) ساڵ بوو، لەو ماوەیەدا مەزهەب بوونی نەبوو، کەسێك نەدەبینرایەوە بە مەزهەبێکی دیاریکراوەوە کۆتوبەند بێت، ناوی یەکێك لە فەقیهان و ئیمامانی مەزهەب لە قورئان و فەرموودەدا نەهاتووە، هەر بەو جۆرە لە قەزاوەتی هاوەڵاندا، بۆیە پیرۆزکردنی مەزهەبێکی دیاریکراو و پابەندبوون پێیەوە بەدرێژایی ژیان و گواستنەوەی ئەم کۆتوبەندبوونە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر سەرچاوەکەی لە دواکەوتن و تێنەگەیشتنەوەیە لە شەریعەتی ئیسلام، بەڵکو بەپیرۆزکردنی مەزهەب و دانانی لە جێگەی قورئان و فەمووده و کارکردن پێی دەچێتە خانەی هاوەڵدانانەوە.

٩–زانایانی ئوسولّی فیقە کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی کەسی رەشۆکی(ئەو کەسەی شایستە نییە بە ئیجتیهاد) مەزهەبی نییە، واتە پابەند نابێت بە مەزهەبێکی دیاریکراو، بەلاّم لەسەریەتی شوێنی مەزهەبێك بکەوێت گونجاوتر و ئاسانتر بێت لە کارکردن و باشترین بێت لە ئەنجام و نزیکترین بێت لە سەردەمی فتواوە، لە قورئاندا شوێنکەوتن دەبینرێتەوە، بەلاّم مەزهەب نابینرێتەوە، خودا–ﷻ– دەفەرموێت: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾[1] ئەم ئایەتە راشکاوە لە نادروستی شوێنکەوتنی مردوو، چونکە پرسیارەکە ئاراستەی زیندوو دەکرێت نەك مردوو، هەروەها لەبەر ئەوەی بڕیارەکان بە گۆڕینی کات و سەردەمەکان دەگۆڕێن.

١٠–پابەندبوون بە مەزهەبێکی دیاریکراوەوە لە بابەتی تەلاّقدا سەریکێشاوە بۆ وێرانکردنی ملیونەها خانەوادە لە جیهانی ئیسلامی بە تایبەت لە کوردستانی عێراقدا، لە کاتێکدا پێویستە هەمیشە کامەی ئاسانە دەست بۆ ئەوە ببەین، ئەوەش وەك کارکردن بە ئایەتی: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾[2].

١١–لەسەرمانە ئەو رێگەیە بگرینە بەر هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) وەك "معاذ بن جبل" پێیەوە پابەندبوو، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) وەك والی و قازی و مفتی رەوانەی یەمەنی کرد و تاقیکردەوە، وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە ((پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك ویستی مەعاز رەوانەی یەمەن بکات، فەرمووی: چۆن قەزاوەت دەکەی گەر کێشەیەك هاتە بەردەستت؟ فەرمووی: بە کتێبەکەی خودا قەزاوەت دەکەم، فەرمووی: گەر لە کتێبی خودادا نەتبینییەوە؟ فەرمووی: بە سوننەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، فەرمووی: گەر لە سوننەتی پێغەمبەری خودا و لە کتێبەکەی خودادا نەتبینییەوە؟ فەرمووی: بەبۆچوونی

---
[1] سورة نحل/ ٤٣
[2] سورة الأنبياء/٧

خـۆم ئیجتیهـاد دەکـەم و زیـادەڕەوی و کەمتەرخـەمی ناکـەم(ولا آلـو)، پێغەمبـەر(ﷺ) کێشـای بـە سـینەیدا و فـەرمووی: حەمـد بـۆ ئـەو خودایـەی نوێنەرەکەی پێغەمبەری خودای سەرکەوتوو کـردووە بـۆ شـتێك پێغەمبـەری خودا ڕازی دەکات))[1]، بۆیە مفتی و قازی گەر شایستە نەبوون بـە ئیجتیهـاد لەسەریانە پرسیار لە ئەهلی زیکر(یاد و زانست) بکەن بەبێ کۆتوبەندبوون بـە مەزهەبێکی دیاریکراو، ئەوەش وەك جێبەجێ کردنی فەرمانی خودا: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾[2].

١٢–تەڵاقی پەیوەست بە مەرج و سـوێندخواردن لـە شـەریعەتی ئیسـلامدا ·هـیچ بنچینەیەکیان بۆ نییە، بەڵکو لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا داهێنـران، ئـەوەش بەهۆی هۆکاری سیاسییەوە کە دزەی کرد بۆ ناو مەزهەبە فیقهییەکان و دواتر بوو بە بەشێك لە شەریعەتی ئیسلام[3]

[1] سنن أبي دأود، رقم الحديث ٣١١٩. ولا آلو: واتە لە ئیجتیهاددا کەمتەرخەمی ناکەم.

[2] سورة الانبياء/٧

[3] پەیوەستکردن لە تەڵاقدا و سوێند پێخواردنی لە چاخی ئەمەوییەکاندا داهێنرا، کاتێك بەرپرسان لە خەلافەتی ئەمەوییەکاندا تۆمەتیان دەدایە پاڵ ئەوانەی بەرهەڵستیان دەکردن لە خەلافەتی سیاسیدا لە عەلەوییەکان لە کاتی گرتنی یەکێك لەوانەی ئەم تۆمەتەی دەدرایە پاڵ سزای نەرێنی بە ئازادی بە بەندکردن و دیلکردن بوونی نەبوو بۆ ئەو مەبەستە پەنایان دەبرد بۆ سوێندخواردن بە قورئان لەسەر ئەوەی ناپاکیان لێ نەکەن و نەبنە سەرخەرانی ململێکارانی ئەوان، پاشان پێچەوانەی ئەوە دەردەکەوت لێیان، بۆیە پەنایان برد بۆ بەکارهێنانی ڕێگەیەکی تر ئەوەش بریتی بوو لە پەیوەستکردنی تەڵاق یان سوێندپێخواردنی، کەسی تۆمەتبار دەبوت گەر لەگەڵ بەرهەڵستکاران هاوکاریم کرد تەڵاقی ژنەکەم کەوتبێت، یان دەبوت بە تەڵاقم ناپاکیتان لێ ناکەم و نابمە سەرخەرانی بەرهەڵستکارانی ئێوە، گەر درۆی دەربکەوتبایە لەلایان حوکمیان بە کەوتنی تەڵاقەکەی دەردەکرد و ڕێگەیان نەدەدا هاوسەرییەکەی نێوان پیاو و ژنەکە بەردەوام بێت، ئا بەم ڕێگەیە پەیوەستکردن بە تەڵاق و سوێندخواردن بە تەڵاق هاتە ئاراوە، پاشان ئەم ڕێگەیە بوو بە جێگەی ناکۆکی فەقیهان، هەیانە پەیوەستکردنی تەڵاق و سوێندخواردن پێی بە پووچ دادەنێت بەهۆی نەهاتنی لە قورئان و فەرموودەدا و فتوا و قەزاوەتی هاوەڵاندا، هەشیانە وتویەتی کاریان پێ دەکرێت و تەڵاقیان پێ دەکەوێت گەر مەرجی پێوەپەیوەستکراو هاتە دی یان سوێندەکەی کەوت، بەم جۆرە هەتا ئەمڕۆ ناکۆکییەکە
←

١٢-فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی کە هەڵسوکەوتی شەرعی (لە گرێبەست وەك فرۆشتن و ویستی تاکلایەنە وەك بەخشین) گەر پەیوەستکرابێت لەسەر مەرجێك پووچەڵە، لە دووتوێی ئەوەدا هاوسەرگیریش، گەر پەیوەست بکرێت بە مەرجێك بە کۆدەنگی پووچەڵە، کەچی پێیانوایە پەیوەستکردنی تەڵاق لەسەر مەرجێك و روودانی لە کاتی بەدیهاتنیدا دروستە، لە کاتێکدا تەڵاق ترسناکترین هەڵسوکەوتی رێگەپێدراوە بە مرۆڤ بۆ رووتێکردن و پێهەستانی، چونکە ئەوە بینای قەوارەی خێزان بەسەر ژن و مێرد و منداڵەکانیاندا دەروخێنێت و بەزۆری داهاتوویان وێران دەکات، لە کاتێکدا خێزان خانەی یەکەمی دروستبوونی کۆمەڵگەیە، گەر خێزان رووبەرووی تێکچوون و تیاچوون بوویەوە کۆمەڵگە رووبەرووی تێکچوون و تیاچوون دەبێتەوە، هەر بەو جۆرە گەر خێزان باش و چاك بێت کۆمەڵگە باش و چاك دەبێت و چاکە و فەزیلەت باڵ بەسەر هەمووواندا دەکێشێت.

١٤-هەرکەس بە وردی و بە قووڵی بۆ قورئان و فەرموودە و فتوا و قەزاوەتەکانی خەلیفەکانی راشیدین بگەڕێتەوە یەك دەق نابینێتەوە پەیوەندی هەبێت بە پەیوەستکردنی تەڵاقەوە لەسەر مەرج، هەر بەو جۆرە تەنها رووداوێك نابینیتەوە لە تەڵاقی پەیوەست لەسەر مەرج.

١٥-فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی سوێند بە شتێك جگە لە خودا و سیفەتەکانی خودا پووچ و بێبنەمایە، ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە هەر شتێك لەسەر پووچ بیناکرا پووچە، سەرەڕای ئەوەش سوێندخواردنیان بە تەڵاق رێگە پێدراوە و بڕیاری کەوتنی ئەو تەڵاقەیان داوە گەر سوێندخۆر

---

بەردەوامە لە نێوان سەرخەران و بەرهەڵستکاراندا لە بابەتێکدا هیچ بنچینەیەکی لە ئیسلام بۆ نییە.

یُنظر الإسلام قبل المذاهب عقيدة وشريعة لجماعة من نوابغ العلماء. تصحيح الناشر زكريا علي يوسف، وطبعة الأمّام/ القاهرة ص١٢٠ وما يليها.

سوێندەکەی کەوتبێت، لەمەشدا دژیەکییەکی ڕۆشن هەیە و هیچ پاساوێکی بۆ نییە.

١٦-کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی تەڵاقدانی سێ بە یەك گوزارە و بۆ تەنها یەك جار بیدعەیە، بیدعەش ئەوەیە دەقێکی قورئان یان فەرموودەی پێغەمبەری(ﷺ) لەسەر نەبێت، هەروەها دەڵێن: (هەموو بیدعەیەك گومڕاییە) بەهۆی فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ): ((هەرکەس لەم ئەمر(ئایین)ەی ئێمەدا شتێك دابهێنێت لە ئەو نەبێت ڕەد دەکرێتەوە))[١].

١٧-تەڵاق لە قورئاندا بە "جار" دیاریکراوە نەك بە "ژمارە"، بۆیە تەڵاقی ژمارەئامێز(دوو و سێ) تەنها یەك تەڵاقی دەکەوێت.

١٨-پابەندبوون بە مەزهەبێکی دیاریکراو پێچەوانەی فەرمانی خودایە: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾[٢]، سەرێکێشاوە بۆ وێرانکردن و ڕووخانی زۆرێك لە خێزانەکان لەسەر ئەو بنچینەی کە تەڵاقی سێ (بە یەك گوزارە و یەك جار) دەکەوێت بە کەوتنێکی جیابوونەوەی گەورە(بینونة کبری)، بە جۆرێك بواری گێڕانەوەی ژنەکە لەلایەن مێردەکەیەوە نامێنێت مەگەر مێرد بە پیاوێکی تر بکات و بچێتە لای و لەیەکتر جیاببنەوە و عیدەی تەواو ببێت.

١٩-بە هۆی کەوتنی تەڵاقی "سێ"وە بە یەك جار هەندێك کەس پەنایان بردووە بۆ فێڵ، ئەوەش بڕیاردانە بە پووچەڵ بوونەوەی هاوسەرگیری دامەزراو لەسەر مەزهەبی شافیعی بەهۆی فاسقبوونی شایەتەکانەوە، پاشان تێهەڵچوونەوەی هاوسەرییەکی نوێ بۆ جارێکی تر لەسەر مەزهەبی "أبي حنيفة" کە پێیوایە عەدالەتی شایەتەکان بە مەرج ناگرێت، لە کاتێکدا ئیسلام بە چاخی زێڕینی خۆیدا گوزەری کرد زیاتر لە سەدە و نیوێك و لەو ماوەیەدا مەزهەبێکی دیاریکراو بوونی نەبوو تا موسڵمانان شوێنی بکەون، پاشان بڕیارەکانی

[١] الهيتمي المكي/ الزواجر ١/٩٩

[٢](وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالاً نُوحِي إِلَيْهِمْ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لا تَعْلَمُونَ) (النحل:٤٣)

هاوسەرگیری شەریعەتی خودایە نەك شەریعەتی مەزهەبەکان تا ئەم فێڵە بەکاربهێنرێت کە پێچەوانەیە لەگەڵ قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) و ژێری تەندروستدا.

٢٠-لە نموونەی راستکردنەوەی هەڵە بە هەڵە بڕیاردانە بە کەوتنی تەڵاقی سێ بە یەك جار، پاشان پەنابردن بۆ مارەبەجاش(التحليل) ئەوەش بریتییە لە مارەکردنی ئافرەتە تەڵاقدراوەکە لە نەناسراو(نادیار)ێك بۆ تەنها یەك شەو لەسەر ئەوەی دوای چوونە لای تەڵاقی بدات، بۆ زانیاریت هاوسەرگیری مارەبەجاش پووچەڵە بە چەندین هۆ لەوانە:

أ-هاوسەرگیرییەکی کاتییە و پووچ و بێبنەمایە.

ب-هاوسەرگیرییە بە مەرجی تەڵاقدان دوای چوونە لا ئەمەش دیسان پووچ و بێبنەمایە.

ج-نەبوونی پایە(رکن)ی رازیبوون لە گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەدا، چونکە ژنی تەڵاقدراوی هەژار رازی نابێت هاوسەری ئەم نادیارە بێت بە درێژایی تەمەن، ئەو لەژێر فشاری ناچاریدا لەسەر ئەو هاوسەرگیرییە رازی بووە.

د-فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((خرت(سابرێنگ)ی خوازراوتان پێ نیشان بدەم؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: بریتییە لە حەلاڵکەر، خودا نەفرەتی لە حەلاڵکەر و حەلاڵبۆکراو کردووە))[١].

هـ-نەهاتنەدی ئایەتی: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ﴾[٢]، چونکە حیکمەتەکەی بریتییە لە بەراوردکاری لەلایەن ژنی تەڵاقدراوەوە لە نێوان هاوسەرە نوێیەکەی و مێردەکەی یەکەمجاری، تا هەست بە هەڵەی خۆی بکات گەر ئەو کەمتەرخەم بوو، هەمان شت بڵێ تایبەت بە پیاوی ژنتەڵاقدەر، بەراورد دەکات لە نێوان ژنە نوێیەکەی و ژنە

[١] ابن ماجه، رقم الحديث ١٩٢٦.
[٢] البقرة:٢٣٠

تەڵاقدراوەکەی و هەڵەکەی خۆی بۆ دەردەکەوێت گەر ئەو هەڵەکار بوو یان هەست بەوە دەکات(بەهۆی هەڵەی ئەوەوە) ژنەکەی ئێستا لە ئامێزی کەسێکی تردایە.

بۆ زیادە ڕۆشنکردنەوە و سوود و ئاگادارکردنەوەی شوێنکەوتوانی دەمارگیر بۆ مەزهەبێکی دیاریکراو لەسەر هەڵەکەیان پوختەی ئەوەی لە کتێبی(الإسلام قبل المذاهب عقيدة وشريعة)[1] هاتووە دەخەمە سەر ئەو خاڵانەی پێشوو:

١-پێش چوونە لا تەڵاق بە یەك تەڵاق لە هەر کاتێك بیەوێت دروستە.

٢-تەڵاق لە حەیز و زەیسانیدا ناکەوێت، هەروەها لە پاکێتیدا کە پیاوەکە چووبێتە لای ژنەکەی، مەگەر ئافرەتەکە سکپڕ بێت و سکەکەی دەرکەوتبێت.

٣-تەڵاقی پەیوەست بە هەموو شێوەکانی و گوزارەکانییەوە بە هیچ ڕێگەیەك ناکەوێت.

٤-سوێندخواردن بە تەڵاق ژاوەژاوە(لغو) و تەڵاقی پێ ناکەوێت.

٥-ئافرەت لە باری عیدەدا تەڵاقی پێ ناگات.

٦-تەڵاقی هاوتا بە ژمارە لەڕووی گوزارەوە یان لەڕووی ئامـاژەوە تەنها یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت.

٧-هیچ جۆرە تەڵاقێك ناکەوێت مەگەر بە ئامادەبوونی دوو شایەتی دادپەروەری تێگەیشتوو.

٨-گێڕانەوەی ئافرەت دروست نییە گەر مەبەست پێی زیانگەیاندن بێت بە ژنەکە، لەو زیانگەیاندنانە ئەوەیە بیەوێت بیگێڕێتەوە و مەبەستەکەی خستنی تەڵاقێکی تر بێت لەدوای گێڕانەوە.

لە کۆتایی ئەم پێشەکییەدا وەسێت بۆ زانایانی ئایینی ئیسلامی دەکەم جیاکاری بکەن لە نێوان شەریعەتی ئیسلام کە بریتییە لە دەقەکانی قورئان و فەرموودە

---

[1] المرجع السابق ص١٢٠

دروستەكانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو دەقانەی گۆڕین و ئاڵوگۆڕ قبووڵ ناكەن و قابیلی هەڵە نین لەگەڵ فیقهی ئیسلامی كە بریتییە لە ئیجتیهادەكانی فەقیهان و لێكدانەوەی ئەو دەقانە كە قابیلی گۆڕین و هەمواركردنەوە و ئاڵوگۆڕین لەبەر رۆشنایی گۆڕانكارییەكانی كات و شوێندا، ئەوەی رۆشنە ئەوەیە شەریعەت پێویستە بۆ هەموو مرۆڤێك لەرووی بیروباوەڕ و كردار و پێ پابەندبوونەوە لە هەموو كات و شوێنێكدا، بە پێچەوانەی مەزهەبەكانەوە كە لەرووی بیروباوەڕ و كردارەوە پابەندبوون پێیانەوە پێویست نییە.

دانەر

# پێشەکی

یەکگرتنی پیاو و ژن لە شێوەی هاوسەرگیریدا بنچینەیەکی سروشتییە بۆ دەستەبەری مانەوەی رەگەزی مرۆیی، غەریزەی جووتبوون بۆ ئەوە دروستنەکراوە لە خودی خۆیدا ئامانج بێت، بەڵکو هۆکارێکە بۆ ئامانجێکی بالاتر کە بریتییە لە بەردەوامی ژیانی مرۆیی و مانەوەی رەچەڵەکی یەک لەدوای یەکی مرۆڤ بەجۆرێك تەبابێت لەگەڵ رێز و پلە و پایەی بڕیارلەسەردراوی مرۆڤ لە ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾[1].

وەك راگەیاندنێکی ئەم راستییە لە غەریزەی جووتبوونەوە سێ غەریزەی تر سەرچاوە دەگرن ئەو سیانەش:

أ.غەریزەی حەز و ئارەزووی ئاژەڵیانە لە نێوان دوو رەگەزەکەدا، ئەو فیتنەیەی بە هۆیەوە یەکێکیان ئەویتریان رادەکێشێت.

ب.غەریزەی سۆز و بەزەیی رۆحی پاڵفتەکراو(خۆشەویستی مەعنەوی) لە نێوان ژن و پیاودا و لە رێگەی ژیانی هاوسەرداریییەوە.

ج.غەریزەی خۆشەویستی خێزانی کە دوو دایك و باوکەکە بەیەکەوە گرێ دەدات لە لایەکەوە و نێوان ئەوان و رۆڵەکانیان لە لایەکی ترەوە.

---

[1] ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾ (الاسراء:٧٠)

ئەمـەی سـێیەمیان بـاڵاترین غەریزەیـە، چـونکە بنچـینەیەکی راسـتەقینەیە بـۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و کێڵگەیەکی سروشتی بۆ سەوزبوونی خانەکانی بینای کۆمەڵگە، گەر رووەکێکی چاك و پـاکی رووانـد کۆمەڵگـە چـاك و پـاك دەبێـت، گـەر رووەکێکی خراپ و ناباشی رووائد کۆمەڵگە خراپ و ناباش دەبێت.

بۆیە ئەو کۆتوبەندانەی بەسەر ئاکاری مرۆڤدا سەپاون دەستەبەرییە بۆ مانـەوەی مرۆڤ نەك بۆ ئـەوە بێـت سروشـتی مـرۆڤ بچـەپێنن، بـەڵکو لـە پێویسـتییەکانی ئـەو سروشتەیە، هـەر ئاکارێـك سـنوورەکانی ئـەو کۆتوبەندانـەی بەزانـد ئاکارێکـە دژ بـە سروشتی مرۆڤ.

شـەریعەتی ئیسـلام-هـەروەك تـەواوی شـەریعەتە ئاسمانییـەکان- بـەهۆی خۆڕسکبوونییەوە لە هیچ بارێکدا ناکرێت فەرمانەکان و نەهییەکانی بەوە لێکبدرێتەوە هەوڵێکن بۆ قەلاچۆکردنی سروشتی مرۆڤ، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووە رەنگرێژی بکات بـۆ رێگەیەکی بالأی پەیوەندییە مرۆییەکان تاکو غەریزەی جووتبوون نەگۆڕێت بۆ شتێك کە لە پێناویدا دروستنەکراوە.

ئافرەت شمەکێك نییە بفرۆشرێت و بکڕێت، ئەو هەتا پارێزگاری لەو پلە و پایەیە بکات کە پێیبەخشراوە بەنرخترە لە هەر نرخێکی تر لەڕووی چەندێتی و چۆنێتییەوە.

ئافرەت دروستنەکراوە بۆ ئەوەی لە نێوان پیاواندا ئاڵوگۆڕی پـێ بکرێـت، بـەڵکو ئـەو هاوبەشـە لـە بەشـداربوونی خۆشەویسـتی و تـەبایی و سـۆز و بەزەییـدا، تـاکو مێردەکەی لە سایەیدا سوکنایی و ئارامی وەربگرێت، وەك دوو رۆح لە یەك جەستەدا ژیان بەسەربەرن، لە خۆشی و ناخۆشیدا بەشداری یەکتر بن هەتا ژیانی هاوسـەرییان بەردەوام بێت، وەك چۆن قورئان بە دەق ئەم راستییەی خستۆتە روو و دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[1].

---

[1] سورة الروم: ٢١.

## پێشەکی

ئافرەت بۆ ئەوە دروستنەکراوە کرێکاری کارگە یان فەرمانبەری نووسینگە یان... بێت، بەڵکو ئەو دایکی مرۆڤە، ئەو مرۆڤەی هەموو ئاسمانەکان و زەوی بۆ رامهێنراوە: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مِنْهُ أن فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[1].

گەر ئافرەت نیوەی کۆمەڵگە بێت لەڕووی چەندێتییەوە ئەوا سێ بەرانبەری نیوەکەی ترە لەڕووی چۆنێتییەوە، وەك لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) جێگیر بووە، کاتێ یەکێك پرسیاری لێ کرد و وتی: ((کێ نزیکترین کەسە بە چاکە لەگەڵ کردنی لەلایەن منەوە؟ فەرمووی: دایکت، وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: دایکت، وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: دایکت، وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: باوکت))[2]، بۆیە فەزڵی دایك سێ بەرانبەری فەزڵی باوکە.

لەم روانگەوە و بەپێی ئەو پلە و پایەی پێویستە ئافرەت خاوەنی بێت وەك دایکی کۆمەڵگە و بینا لەسەر ئەو ئامانجە بەرز و بڵندەی لە دروستکردنی قەوارەی هاوسەرگیریدا دانراوە شەریعەتە ئاسمانییەکان و نەریتە مرۆییەکان و یاسا دانرلوەکان لە دێرین زەمانەوە هەوڵی دانانی بنچینە و رێسای توندوتۆڵیان داوە بۆ ئەوەی ببنە بناغەیەك بۆ ئەو تەلارە بە مەبەستی بەردەوامبوون و رێگەبڕینی بە شێوەیەکی تەندروست.

هەر بەو جۆرە لە سەپاندنی کۆتوبەند بەسەر ویستی دوو هاوسەرەکەدا پێداگری کردووە، بەتایبەت بەسەر ویستی مێردەکەدا، ئەوەش وەك ئاگادارکردنەوەیەك لە گرتنەبەری هەر هەنگاوێك بەرەو وێرانکردنی قەوارەی خێزان لەدوای بیناکردنی، چونکە ئاسەواری رمانی خێزان تەنها ژن و پیاوەکە ناگرێتەوە بەڵکو بە پلەی یەکەم

---

[1] سورة الجاثية: ١٣.

[2] لە ئەبی هورەیرەوە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا کێ نزیکترین کەسە بە هاوەڵێکردنی باشی من؟ فەرمووی: دەیکت، وتی: دواتر کێ؟ فەرمووی: دایکت، وتی دواتر کێ؟ فەرمووی: دایکت: وتی دواتر کێ؟ فەرمووی باوکت){البخاري: ٥٥١٤}.

پەل دەهاوێت بۆ سەر منداڵەکان و کەسوکار بە پلەی دووەم و کۆمەڵگە بە پلەی سێیەم.

منداڵەکان سۆز و بەزەیی دایك و چاودێری و سەرپەرشتی باوك لەدەست دەدەن، بۆیە ئەوان و منداڵی بێ باوك وەکو یەکیان لێ دێت لە ئاوارەبوون و بێبەشبوون لە سۆز و بەزەیی و ئاراستەکردن و پەروەردە و چاودێری.

جیابوونەوەی ژن و پیاو لەیەکتر بە تەڵاق زۆرجار سەردەکێشێت بۆ تەنگەژە و پارچە پارچەبوون و دوژمنایەتی نێوان خێزانی دوو هاوسەرەکە و کەسوکاریان.

شتێکی سروشتییە ئەم ئاسەوارە خراپانە و سەرئەنجامە ناباشانە بەسەر کۆمەڵگەدا بشکێتەوە، بەتایبەت لە بواری بڵاوەکردنی نەزانی و نەفامی و هەژاری و پەرەسەندنی تاوانە ئەخلاقی و ئابوورییەکان.

## گرنگی بابەتەکە:

گرنگی لێکۆڵینەوە و باسی بابەتی "رادەی دەسەلاتی ویست لە تەلاقدا" لە دوو خاڵدا خۆی دەبینێتەوە:

١-تەڵاق بووە بە دیاردەیەکی ترسناکی باڵادەست و نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی پەرەسەندوو لە کۆمەڵگەدا، بەجۆرێك سەریکێشاوە بۆ وێرانبوونی چەندین ماڵ و پارچە پارچەبوونی چەندین خێزان و هەڵوەشانەوەی پەیوەندییەکان و ئاوارەبوونی منداڵان و تێکشکانی ئافرەتان... هەموو ئەمانە بەرهەمی رەچاونەکردنی ئەو مەرج و کۆتوبەند و بنچینە بەهەندوەرگیراوانەی لە هاوسەرگیری و لە تەڵاقدا دانراون.

٢-هەندێ لە موسڵمانان و ناموسڵمانان شوێنپێی تراویلکەیان هەڵگرتووە و تانە لە سیستمی تەڵاق دەدەن لە ئیسلامدا، گوایە ئیسلام ئازادی ویست و دەسەڵاتی رەهای بە پیاو بەخشیوە بۆ چوونەپێش لە تەڵاق، ئیسلام وەك شمەکێك کە کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکرێت تەماشای ئافرەت دەکات، ئەو لەژێر بەزەیی پیاودایە گەر ویستی رایدەگرێت و کەی ویستی تەڵاقی دەدات.

بۆیە لەم دانراوەدا هەوڵمداوە سیستمەکانی تەڵاق لەلای گەلانی کۆن بخەمە روو، هەروەها لە دوو شەریعەتی (موسەوی و عیسەویدا)، بەهەمان شێوە لە شەریعەتی ئیسلام و یاسای دانراوی هاوچەرخی دەوڵەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، لەگەڵ چڕبوونەوە لەسەر گرنگترین کۆتوبەندی سەپاو بەسەر ویستی دوو هاوسەرەکە لە تەڵاقدا بەپێی ئەو شەریعەت و یاسا دانراوانە.

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە شەریعەتی ئیسلام بریتییە لە دوایین دەستووری ئەمری ئاسمانی، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾[1]

بینا لەسەر ئەم راستییە رۆشنە لێکۆڵینەوەی تەڵاق لەم شەریعەتە پاکوبێگەردادا بەشێکی زۆری لە گرنگیپێدان و ماندووبوون داگیرکردووە، بەجۆرێك چەندمان توانیبێت یەك بە یەکی ئەو ئایەت و فەرموودانەمان پشکنیوە کە پەیوەندییان بە رێکخستنی حوکمەکانی تەڵاقەوە هەیە، هەروەها هەستاوین بە رێکاری بەراوردکاری لە نێوان بۆچوونەکانی فەقیهانی موسڵمان بەبێ لایەنگری یان دەمارگیری بۆ مەزهەبێکی دیاریکراو، چونکە ئامانجی هەمووان بریتییە لە گەیشتن بە حەق و رازی کردنی خودا و خزمەت بە مرۆڤ.

دوای ئەم لێکۆڵینەوە شیکارییە ئەنجامگیرییە گەیشتینە راستییەك ئەوەش ئەوەیە بۆ هیچ کام لە دوو هاوسەرەکە دروست نییە پەنا ببات بۆ بەکارهێنانی چەکی تەڵاق یان جیابوونەوەی قەزایییانە مەگەر لەدوای کۆتاهاتنی هەموو رێگەکانی چاکسازی نێوان ژن و مێردەکە.

---

[1] (شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَنْ يُنِيبُ) (الشورى:١٣).

**پلانی باسەکە:**

لێکۆڵینەوەی ئـەم بابەتـەمان لـەڕووی شـێوەگرییەوە بـۆ پێـنج دەروازە دابـەش کردووە:

دەروازەی یەکەم: تەڵاق لەلای گەلانی کۆن.

دەروازەی دووەم: تەڵاق لە پەیامی موسەوییدا نزیکەی(١٢ـــــپ. ز.)

دەروازەی سێیەم: تەڵاق لە پەیامی مەسیحیدا.

دەروازەی چوارەم: تەڵاق لە ئیسلامدا.

دەروازەی پێنجەم: تەڵاق لە هەندێ لە یاسا هاوچەرخەکاندا.

لە کۆتاییدا هەستاوین بە پوختەکردنی گرنگترین کۆتوبەندە سـەپاوەکان بەسـەر ویستی تەڵاقدا.

# دەروازەی یەکەم

## تەڵاق لەلای هەندێ لە گەلانی کۆن

پێنج بەش لەخۆ دەگرێت:

بەشی یەکەم: تەڵاق لە دۆڵی رافیدەین(میزۆپۆتامیا)دا

بەشی دووەم: تەڵاق لە دۆڵی نیلدا .

بەشی سێیەم: تەڵاق لە رۆژهەڵاتی دوور .

بەشی چوارەم: تەڵاق لە ئەوروپا .

بەشی پێنجەم: تەڵاق لە نیمچەدوورگەی عەرەبی پێش ئیسلام .

لەم دەروازەیەدا باسەکەمان کورتدەکەینەوە لەسەر تەڵاق لەلای گەلانی کۆن کە شێوازێکی تەشریعی و بەرەوپێشچوونی ژیارییان وەرگرتووە، ئەوانەش:

١.ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست(دۆڵی میزۆپۆتامیا)

٢.لە ئەفریقا(دۆڵی نیل)

٣.لە ڕۆژهەڵاتی دوور(هند و چین و یابان و فارس)

٤.لە ئەورووپا(یۆنان و رۆمان)

٥.لە نیمچەدوورگەی عەرەبی(عەرەبی پێش ئیسلام)

یاسارێژییەکانی ئەم شوێنانەی جیهانی کۆن کاروباری خێزان لە هاوسەرگیری و تەڵاق و کاروبارەکانی تریان لەخۆگرتووە، ئەوەش لەبەر ڕۆشنایی نەریت و بەند و باو و یاساڕێژییە باوەکان لەلایان.

هەیانە تەڵاقی بۆ بێ ئەرزشترین هۆ ئاوەڵا(موباح) کردووە.

هەیانە: دەستی بردووە بۆ بیرۆکەی تەڵاقی کۆتوبەندکراو: بە چەند هۆیەکی سنووردار ڕێگەی پێداوە و لە چەند بارێکی تایبەتیشدا–نەك هەموو بارێك– بە ئاوەڵای داناوە.

هەیانە مافی پیادەکردنی بە ژن و پیاوەکە داوە.

هەیانە: ئەوە تەنها بە مافێکی سروشتی پیاو تەماشا دەکات و کەی بیەوێت بەکاری دەهێنێت.

لەبەر نەگەیشتن بە مێژووی ڕیزبەندی گەشە و بەرەوپێشچوونی تەڵاق لەو شوێنانەدا لە لایەکەوە و لە لایەکی ترەوە لەبەرئەوەی بابەتەکە بریتییە لە "ڕادەی دەسەڵاتی ویست لە تەڵاقدا" بەپێی گەشە و بەرەوپێشچوونی بۆیە لەلای ئەو گەلانە

شوێنی رێگەی رێکخستنی زەمەنی لە تەلاقدا نەکەوتووین، بە پێچەوانەی ئەوەوە لـە شەریعەتە ئاسمانییەکاندا، ریزبەندی لەو شەریعەتانەدا دیار و رۆشنە بەجۆرێك ئەوەی دواتر ئەوەی پێش خۆی تەواو دەکات.

بۆ هەر شوێنێك لەو شوێنانەی جیهانی تەلاق بەشێکی تایبەتمان تەرخان کردووە، داوای کۆمەکی و یارمەتی لە خودا –عزوجل– دەکەم.

(وهو ولي التوفيق)

# بەشی یەکەم:
# تەڵاق لە دۆڵی رافیدەین(میزۆپۆتامیا)دا

بە زیاتر لە دوو هەزار ساڵ عێراقییەکان پێش گەلانی جیهان کەوتن لە بواری ژیاریی و شارستانییدا بەتایبەت لە یاساڕێژییەکاندا بەپێی ئەو زانیاریانەی لێکۆڵینەوە شوێنەواری و مێژووییەکان تۆماریان کردووە[1].

سیستمی تەڵاق لە عێراقی کۆن و لە سەردەمی سۆمەرییەکانەوە ناسراوبووە[2] واتە بە نزیکەی چوار هەزار ساڵ پێش زایین.

یاساڕێژییە عێراقییە کۆنەکان دەستیان بردووە بۆ بیرۆکەی تەڵاقی کۆتوبەندکراو(سنووردار)، زۆر بە دەگمەن رێگەی داوە بە ئازادی دەسەڵاتی ویستی دوو هاوسەرەکە لە تەڵاقدا، ئەوەش وەك هەوڵێك بۆ بەرتەسککردنەوەی بواری تەڵاق لەڕوویەکەوە و دەستەبەرکردنی مافی ژنان دژ بە هەڵسوکەوتی زۆردارانەی مێرد لەلایەکی ترەوە.

---

[1] ینظر الدکتور فوزي رشید: الشرائع العراقیة القدیمة. طبعة دار الحریة بغداد ١٩٧٩ ص١٤ وما بعدها.

[2] لە خوارووی عێراق دەوروبەری(٤٠٠٠پ.ز) چەند گەل و هۆزێك نیشتەجێبوون کە سۆمەرییەکان لەناویاندا بە میراتی ئایینی و سەروەتی بیری باڵا جیادەکرێنەوە. ینظر الاستاذ عمر فروخ: الاسرة في الشرع الاسلامي (ص١٢). والاستاذ فاروق الدملوجي: الالوهیة في المعتقدات الوثنیة ١٥/٢.

سەرەڕای ئەوەش خاڵێکی جەوهەری هەیە پێویستە ئامازەی پێ بکرێت ئەوەش جیاکارییە لە نێوان کۆتوبەندێکدا رەچاونەکردنی دەبێتە پووچەڵکردنەوە بۆ تەلاق لەگەڵ کۆتوبەندێکدا سەرپێچی لێیان تەلاق پووچەڵ ناکاتەوە، بەڵکو ئاسەواری دارایی و سزای جەستەیی پێویست دەکات کاتێك ئەوانەی بەبێ بوونی پاساو دەستی بۆ دەبەن رووبەڕووی دەبنەوە، یاسارێژییە عێراقییەکان دەستی بۆ جۆری دووەم لە کۆتوبەند بردووە، هەندێ جار–هۆی تەلاقەکە هەرچییەك بێت– دەگاتە رادەی دڵرەقی و پلەی سزادان بە مردن.

ئەوەی ئامازە بەو راستییە دەکات ئەوەیە لە مادەی (٥)ی تەبەڵەی حەوتەم لە زنجیرەی(أنا ایتشو)دا هاتووە کە دەڵێت: (گەر ژنەکە لە مێردەکەی بێزار بوو و پێی وت: تۆ مێردی من نیت، ئەوا پێویستە لەسەریان هەڵیبدەنە ناو رووبارەوە)[١]

بەلام یاسای حامورابی[٢] دابەزاندنی ئەم سزایەی کۆتوبەند کردووە بە پێویستبوونی بریارێکی قەزاییەوە و هاوسەرە ژنەکەش کارێکی ئەنجام دابێت شەرەفی پیاوەکەی لەکەدار کردبێت.

لە مادەی (٦) هەمان تەبەڵەدا هاتووە: (گەر پیاوێك وتی بە ژنەکەی: تۆ ژنی من نیت، ئەوا دەبێت نیوەی مەنێك(نزیکەی ٥٠٥ گرام) لە زیو بدات)

"ول دیورانت" دەڵێت: (لە ئافرەتی سۆمەری چاوەڕوان دەکرا منداڵی زۆر بۆ مێردەکەی و بۆ دەوڵەت بخاتەوە، بۆیە گەر نەزۆك بوایە بەو هۆیەوە دەتوانرا تەلاق بدرێت، بەلام گەر دایك بێزاربوایە لەوەی بە ئەرکی دایکایەتی هەڵبستێت ئەوا بە خنکان دەکوژرا...)

هەروەها دەڵێت: (نەزۆکی ئافرەت و زیناکردنی و ناتەبایی لەگەڵ مێردەکەی و خراپ رێکخستنی ماڵ و حاڵی، هەموو ئەمانە بە بڕیاری یاسا پاساو بوو بۆ تەلاقدانی)[١].

---

[١] ینظر الدکتور صبیح مسکوني تاریخ القانون العراقي القدیم ص٣٢٠.

[٢] ینظر المادتین (١٤٢،١٤٣) من قانون حمورابي.

بەهۆی نەبوونی جیاکاری هەندێك لە لێکۆڵەران[2] لە نێوان ئەو دوو جۆرە کۆتوبەندە باسکراوانەدا تێکەڵییان لە نێوانیاندا بۆ دروستبووە و بەهەڵە گەیشتوونەتە وتنی ئەوەی: یاسارێژییە عێراقییەکان دەستی بۆ بڕیۆکەی تەڵاقی ڕەها بردووە.

لەبەر گرنگی ئەم پرسە هەوڵدەدەین لێکۆڵینەوەی بابەتی ئەم بەشە بەسەر شەش باسدا دابەش بکەین لەگەڵ ڕەچاوکردنی ڕێکخستنی زەمەنی لە خستنەڕووی بابەتەکە، بەم جۆرە:

---

(1) ينظر قصة الحضارة تأليف ول ديورانت، ترجمة محمد بدران ٢٣٢/٢.

(2) وەك دکتۆر ابراهیم عبد الکریم الغازي في کتابە (تأريخ القانون في وادي الرافدين والدولة الرومانية (ص١٣٣) دەڵێت: (تێبینی دەکرێت یاسارێژی عێراقی کە تا ئێستا پێمان گەیشتووە دەسەلاتی بە پیاو دلوە بۆ خستنی تەلاق بەشێوەیەکی ڕەها بەبێ ئەوەی سنوورێك بۆ ویستی پیاوەکە لەسەر ئەو کارە دابنێت).

# باسی یەکەم:
# تەلآق لە یاسای ئوورنمۆدا[(١)]

زانایانی شوێنەوارناس و مێژووناسان پێیانوایە پادشا(أور–نمو) بە دامەزرێنەری یەکەمی زنجیرەی ئووری سێیەم دادەنرێت کە فەرمانڕەوایی شاری ئووریان کردووە، یەکەمین یاسادارێژەری کۆنترین شەریعەتی سۆمەریە کە تا ئێستا پەردەی لەسەر لادراوە، ئەو پێش یاسای حامورابی کەوتووە بە سێ سەدە، کۆنترین یاسایەکە نەک تەنها لە عێراقدا بەڵکو لە هەموو جیهاندا.

لە ساڵی ١٩٥٢ز زانای نووسینیی مسماری(صمئيل كريمر) لە مۆزەخانەی شوێنەواری رۆژهەلآت لە ئەستەنبوڵ رێکەوت لە تەبەڵەیەکی مسماری بە زمانی سۆمەری کە لە شاری "نوفەر" دۆزرابوویەوە، پاشان دوو تەبەڵەی قوڕی شکاو لە شاری "ئوور" لەلایەن دەستەیەکی ئینگلیزییەوە دۆزرایەوە.

سەرەڕای ئەوەی کەموکورتی هەبوو لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی مادەکاندا لەگەڵ ئەوەش دەتوانرێت ئەوەی ماوەتەوە بۆ چەند کۆمەڵەیەکی جیاکراوە پۆلێن بکەین، هەر کۆمەڵەیەك بابەتێکی سەربەخۆ چارەسەر دەکات.

---

(١) سەرچاوەکان جیاوازیان لە نێواندا هەیە لە دیاریکردنی فەرمانڕەوایەتییەکەی و دەسەلآتی رەچەڵەکەکەی، لە شەریعەتە کۆنەکانی عێراقدا: المرجع السابق (ص٢٢٣): (پادشا ئۆرنۆ لە (٢١١١—٢١٠٣ پ.ز.) فەرمانڕەوایەتی کردووە، وفي تاريخ القانون العراقي القديم المرجع السابق (ص٩٣): (صدر قانون الملك أورنمو (٢٠٦١ـ٢٠٤٣ ق.م). وفي تاريخ القانون في وادي الرافدين والدولة الرومانية المرجع السابق (ص٦٠): (حكمت سلالة أور الثالثة بين (٢١٥٠ـ٢٠٠٥ ق.م). وأورنمو تولى الحكم (٢١١١ ق.م). وفي القانون في العراق القديم للدكتور عامر سليمان (ص١٩١): (یاساکە دەدرێتە پاڵ پادشا ئۆرنۆ(٢١١٣ـ٢٠٩٥ق.م) ئیتر بەم جۆرە...

کۆمەڵەی یەکەم لە (٤–١٢) بە خستنەسەری مادەی(٣٤) دەربارەی یاسای باری کەسێتییە، و دەستی بۆ تەڵاقی کۆتوبەندکراو بردووە، و دانی نەناوە بە ئازادی دەسەڵاتی ویست لە تەڵاقدا، بەڵام تاکو ئێستا بە شێوەیەکی ورد ئەو بوارانە ڕۆشن نەبوونەتەوە تیایاندا ماف بە پیاو دراوە ژنەکەی تەڵاق بدات، هەروەها ئەو بوارانە دیاری نەکراوە تیایاندا ڕێگە بە ژنەکە درابێت داوای تەڵاق بکات.

لەگەڵ ئەوەش پێداگری دەکات لەسەر دەستەبەرکردنی مادیانە بۆ ئافرەتەکە لە باری تەڵاقدانیدا لەلایەن مێردەکەیەوە بەبێ هۆ.

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەم یاسایەدا ئەوەیە جیاوازی کردووە لە نێوان تەڵاقدراو لە مێردی یەکەم و تەڵاقدراو لە مێردی دووەم لەمەڕ ئەو دەستەبەرە داراییەی تەڵاق بۆ ژنەکەی دابین دەکات، ئەوەی دووەمیان نیوەی ئەوەی یەکەمی شایستە دەبێت، لەسەر ئەو پیاوەی ژنە بنەڕەتییەکەی خۆی(پێش هێنانی بێوەژن نەبووبێ) تەڵاق دەدات پێویستە مەنێك[1] لە زیوی پێبدات، بەڵام گەر تەڵاقیدا و پێش هێنانی بێوەژن بوو ئەوە پێویستە نیو مەن[2] لە زیوی پێبدات.

هەندێ لە لێکۆڵەران پێیانوایە[3]: ئەم جیاکردنەوە بەهۆی جیاوازی نێوان دوو تەڵاقدراوەکەوە نییە لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا، بەڵکو بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە تەڵاقدراو لە مێردی یەکەم–گەر تەڵاق درابێت– مەنێك زیوی وەرگرتووە، خۆ گەر مێردی یەکەمی مردبێت ئەوا مافی خۆی لە میرات بەدەستهێناوە، ئەم شیکردنەوە گرنگی خۆی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش گومانبڕ نییە لە ئەگەری بوونی چەندین هۆی تر.

---

(1) المادة (٦) من قانون أورنمو تنص على ما يلي: (گەر پیاوێك ژنە بنەڕەتییەکەی خۆی تەڵاقدا– مێردی بە پیاوێکی تر نەکردبێت– دەبێت مەنێك لە زیوی پیێ بدات).

(2) تنص المادة (٧) على أنه (گەرپیاوێك ژنەکەی تەڵاقدا–کە بەر لەوەی هاوسەری لەگەڵ بکات بێوەژن بوو بێت– دەبێت نیو مەن لە زیوی پیێ بدات).

(3) ينظر الدكتور فوزي رشيد المرجع السابق ص٤٦.

یاسای "ئۆرنۆ" جیاوازی کردووە لە نێوان تەڵاقدراو لە هاوسەری یاسایی و تەڵاقدراو لە هاوسەری تێکچوو(نایاسایی)، بۆیە بڕیاریداوە ئەوەی دووەمیان شتێك لە دەستەبەری دارایی شایستە نییە لە باری تەڵاقدانیدا[1].

شایانی باسە هاوسەرگیری لە یاساڕێژییە عێراقییە کۆنەکاندا بە شێوەیەکی گشتی ڕازیبوونی دایك و باوکی ئافرەتەکە و شایستەبوون و تۆمارکردنی ژمارەی تەبەڵە قوڕی[2] تێدا بەمەرج گیرابوو، سەرباری لە ئامێزگرتنی ئەم خاڵانە:

١.ناوی دوو هاوسەرەکە.

٢.هەدیەی هاوسەرگیری(مارەیی)

٣.ناوی شایەتەکان و بەرواری نووسینی گرێبەستەکە.

٤.پەیماننامە بە سوێندخواردن لەسەر نەبوونی کەمتەرخەمی بەرانبەر پابەندبوونە هاوسەرگیرییەکان کە لەسەر پیاو سەرهەڵدەدەن.

٥.ئەو سزایانەی لایەنی بەرانبەر شایستەی دەبێت لەباری پێشێلکاری پەیوەندی هاوسەرگیریدا.

---

[1] تنص المادة (٨) علی ما یلي: (گەر پیاوێك چووە لای ژنێك بەبێ گرێبەستی هاوسەرگیری بنەڕەتی ئەوا پێویست ناکات هیچی پێ بدات لەسەر تەلاقەکەی لە باری تەلاقدانیدا)... لە تێگەیشتنی پێچەوانەی وشەی "بێوەژن"ەوە تێدەگەین، حوکمی چوونە لای کچ جیاوازە، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە بێوەژن خاوەن ئەزموونە و شارەزایە بە مەرجەکان و حوکمەکانی هاوسەرگیری بۆیە بە بێبەشبوون سزا دەدرێت.
بەڵام مادەی (٣٤) لە یاسای ئۆرنۆ و مادەی (٣٤) لە یاسای ئاشووری ناوەند بە دەق دەڵێت هاوسەرگیری تێکچوو بەهۆی سەنووسنەکردنی گرێبەستەکەوە دەبێتە هاوسەرگیرییەکی دروستی ڕەوا بە تێپەڕبوونی کات واتە بە گوزەرکردنی دوو ساڵ بەسەر تێکەڵی هاوسەریدا.

[2] مادەی(٢٨) لە یاسای ئەشنونا بە دەق دەڵێت: (گەر پیاوێك ژنێکی بەبێ پرسی باوك و دایکی ژنەکە مارە کرد و ئاهانگی شەوی بووك و زاوایی بۆ نەگێڕا و بەوەش گرێبەستێکی مۆرکراوی بۆ نەنووسرا لەگەڵ دایك و باوکی ژنەکە ئەو ژنە بە هاوسەری شەرعی دانانرێت).بە هەمان مانا لە یاسای حامورابیدا هاتووە(م١٢٨).

# باسی دووەم:
# تەلاق لە یاسای "لبت-عشتار"دا[1]

"لبت عشتار" پێنجەمین پادشای زنجیرەی ئەیسن بووە(٢٠١٧–١٧٩٤ پ. ز.) لە نێوان ساڵی(١٩٣٤–١٩٢٤ پ. ز.) فەرمانڕەوایی کردووە، یاساکەی دوایین یاسایە کە بە نووسینی مسماری و زمانی سۆمەری نووسراوە[2]، تاکو ئێستا (٣٧) مادە لەو یاسایە زانراوە، یاساکە دابەش دەبێت بۆ حەوت کۆمەڵە، هەر کۆمەڵەیەك جۆرێکی تایبەت لە بڕیار چارەسەر دەکات، کۆمەڵەی شەشەم(٢٠–٢٢) پەیوەندی هەیە بە باری کەسێتییەوە لەناویاندا بڕیارەکانی تەلاق.

ئەوەی ڕۆشنە لە دووتوێی دەقەکانی ئەم یاسایەدا ئەوەیە کە دانی نەناوە بە ئازادی ویست لە تەلاقدا هەرچەند تاکو ئێستا پێوەری جیاکەرەوەی بوارەکان کە ڕێگەیان بە تەلاق تێدا دەدرێت یەکلانەبووەتەوە، ئەوەی تاکو ئێستا جێگیر بووە ئەوەیە ناپاکی پیاو لە ژنەکەی پاساوی ئەوە دەدا بەدەستەوە ژنەکە داوای تەلاق

---

[1] لە هەندێ سەرچاوەی (لبت عەشتار)دا. ینظر الدکتور محمود الأمین، قوانین حمورابي ص٧. ولا نجد ایضا في الشروح والترجمات تاریخا محددا لهذا المشرع وسلالته. ففي قوانین حمورابي المرجع المذکور: (١٨٧٥-١٨٦٥ق.م) حکم لبت عشتار. وفي تاریخ القانون في وادي الرافدین والدولة الرومانیة المرجع السابق (ص٦٥): لبت عەشتار لە دەوڵەتی "ئەیسن" فەرمانڕەوایی گرتە دەست لە دەورووبەری(١٩٠٠ پ.ز). وفي القانون في العراق القدیم المرجع السابق (ص١٩٩): (لبت عەشتار پێنج مەلیکی ڕەچەڵەکی ئەیسن(٢٠١٧–١٩٢٤پ.ز). وفي الشرائع العراقیة القدیمة المرجع السابق (ص٥٤): (ڕەچەڵەکی ئەیسن(٢٠١٧–١٧٩٤پ.ز.) و حوکمی لەبت عەشتار(١٩٣٤–١٩٢٤پ.ز.) یاساکەی دوایین تۆمارکراوە بە نووسینی بسماری و زمانی سۆمەری.

[2] ساڵی ١٩٤٧ز یاساکە دۆزرایەوە لە "تل حرمل" لەسەر چوار تەبەڵی قوڕینە تۆمارکرابوو کە لە پێشەکییەك و کۆتاییەك و (٣٧) مادە پێکهاتبوو، هەندێ لە زانایانی ئاسار وەك "درایڤەر" و "مایلز"باوەڕیان وایە ئەو مادانە بەشێکن لە یاسا بنەڕەتییەکانی کە نزیکەی سەد مادە لەخۆ دەگرن. ینظر الدکتور صبیح مسکوني المرجع السابق ص٩٨.

بکات و بچێتە ناو قەزاوە، سەرباری پێدانی مارەیی تەواو بە ژنەکە، و بێبەش کردنی پیاوەکە لە هاوسەرگیری ژنە زیناکەرەکە وەك سزایەکی تر بۆی[1].

لەم یاسایەدا رێگە نەدراوە بە تەلاقدانی ژن بەهۆی نەزۆکییەوە، هەر بەو جۆرە دانینەناوە بە هاوسەرگیری دووەمدا بۆ پیاوەکە بەهۆی نەزۆکی ژنی یەکەمییەوە تا ژنی یەکەم لە ژیاندا بێت[2]، بە هەمان شێوە ئاوەڵای نەکردووە بۆ پیاوەکە ژنەکەی تەلاق بدات بەهۆی نەخۆشییەکەوە هیوای چاکبوونەوەی لێ ناکرێت، بەڵکو تەنها رێگەی پێداوە هاوسەرگیری بکات لەگەڵ ژنی دووەمدا بەمەرجی دڵڕاگرتن و چاودێری ژنە تووشبووەکە لەلایەن مێردەکە و ژنی دووەمیەوە[3]

شایانی باسە ئەوەی تێدەگەین لە یاسارێژییە عێراقییە کۆنەکان نادروستی فرەییە لە ژندا مەگەر بە پاساوێك ئەویش لەباری پێویستدا[4].

---

[1] مادەی(۳۰) بە دەق دەڵێت: (گەر لاوێکی خاوەن ژن لەسەر شەقامەکان لەگەڵ سۆزانییەك خەوت و قەزا فەرمانی پێکرد سەردانی ئەو سۆزانییە نەکات، پاشان ژنەکەی خۆی تەلاقدا و مارەییەکەی پێدا ئەوا مافی ئەوەی نییە لەگەڵ سۆزانییەکە هاوسەرگیری بکات) ینظر الشرائع العراقية القديمة المرجع السابق ص٦٥.

[2] مادەی (۲۷) لە یاسای لبت عەشتار بە دەق هاتووە: (گەر ژنەکە منداڵی نەدەبوو، بەلام سۆزانییەکی سەر شەقام منداڵی بۆ هێنایە دی ئەوا لەسەر پیاوەکە پێویستە دانەوێڵە و زەیت و پۆشاك بە سۆزانییەکە بدات(واتە گرنگی بە بەخێوکردنی بدات) ئەو منداڵانەی سۆزانییەکە بوویەتی دەبن بە میراتگری پیاوەکە(منداڵی شەرعی)، لەبەر ئەوەی ژنەکەی(کە منداڵی نابێت) لە ژیاندایە بۆ سۆزانییەکە دروست نییە لە یەك ماڵدا لەگەڵ ژنی یەکەم تر بژی).

[3] مادەی (۲۸) دەقەکەی دەڵێت: (گەر ژنی پیاوێك چاوی لەدەستدا یان تووشی شەلەل بوو دروست نییە لە ماڵ دەربکرێت(لە ماڵی مێردەکەی) گەر مێردەکەی ژنێکی تری هێنا ئەوا لەسەر ژنی دووەم پێویستە کۆمەکی ژنی یەکەم بکات(کە تووشی کوێری و شەلەل بووە) لەسەر پیاوەکەش پێویستە کۆمەکی ژنی دووەم و ژنی یەکەمی بکات)

[4] ينظر المادة (٣٤) من قانون (لبت عشتار)، والمادة (٦٠) من قانون (ايشنونا)، والمادة (١٦٧) من قانون حمورابي.

# باسی سێیەم:
# تەڵاق لە یاسای "ئەشنۆنا"دا[1]

یاسای "بیلالاما" پادشای ئەشنۆنا(١٨٦٠ پ.ز.) بۆ پێش فەرمانڕەوایی حامورابی دەگەڕێتەوە، پێکدێت لە پێشەکییەك کە بە زمانی سۆمەری نووسراوە لەگەڵ (٦٠) مادە بە زمانی بابلی[2] تۆمارکراون، دابەشکراون بۆ حەوت کۆمەڵە، کۆمەڵەی چوارەم(٢٥–٣٢) حوکمەکانی خێزان چارەسەر دەکات، سەرباری دوو مادەی تر(١٧ و ١٨) پەیوەست بە دیاریکردنی ئاست و پایەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە لەباری مردنی ئەویترياندا، بەڵام ئەو دوانە لەئامێزی کۆمەڵەیەکی تایبەتی تردا دانراون کە پەیوەستە بە سزای بازرگانییەوە، هەر بەو جۆرە مادەی(٦٠) پەیوەست بە تەڵاق لە کۆتایی مادەکانی یاساکەدا دانراوە جیا لە مادەکانی تر پەیوەست بە باری کەسێتییەوە، ئەم یاسایە لەمەڕ جیابوونەوەی ژن و مێرد دوو بابەت دەست بۆ دەبات: یەکەمیان تەڵاق بەبێ هۆ و سزایەکەی، ئەویتریان هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیری لەلایەن ژنەکەوە بەهۆی دیارنەمانی مێردەکەیەوە.

## یەکەم: تەڵاق بەبێ هۆ:

ئەم یاسایە هەرچەند هۆیەکانی تەڵاقی ڕۆشن نەکردووەتەوە، بەڵام پێداگری لەسەر توندکردنەوەی ئازادی ویستی دوو هاوسەرەکە لە تەڵاقدا کردووە، بەتایبەت

---

[1] لە هەندێ سەرچاوەدا(ئیشنونا) لە جێگەی (ئەشنۆنا) و (بیلالەئما) ينظر قوانين حمورابي المرجع السابق ص٨. والشرائع العراقية القديمة المرجع السابق ص٨٣ .

[2] بەتەواوی نازانرێت ژمارەی مادە یاساییەکانی یاسای ئەشنۆنا چەند بووە، زانایانی شوێنەوار و مێژوونووسان پێیانوایە ژمارەیان نزیکەی (١٠٠) مادەیە، بەڵام تەبەڵە دۆزراوەکان و وەرگێڕراوەکان تاکو ئێستا (٦٠) مادە لەخۆ دەگرێت.

دوای لەدایکبوونی منداڵ، بەجۆرێك سزایەکی توندی مادی و ئەدەبی خستۆتە سەر هەر مێردێك ژنەکەی تەڵاق بدات دوای ئەوەی منداڵی لێی دەبێت و ژنی دووەم دەهێنێت، ئەم سزایە دەرکردنی لە ماڵەوە و بێبەشکردنی لە هەموو ئەوەی هەیەتی لە ماڵ و سامانی گوازراوە و نەگوازراوە دەگرێتەوە[1]

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر رادەی گرنگی پێدانی یاسادانەری عێراقی کۆن بە جێگیربوونی پەیوەندی هاوسەرگیری و پارێزگاری لێی دژ بە بەکارهێنانی چەکی تەڵاق تا رێگەی تر بۆ چاککردن و رێکخستنەوەیان بوونی هەبێت.

## دووەم: هەڵوەشاندنەوەی تەڵاق بە دیارنەمان:

گەر پیاوەکە بزر بوو بەجۆرێك چارەنووسی ژیان و مردنی دیار نەما وەك ئەوەی لە کاتی جەنگدا یان پەلاماری دوژمندا فڕێنرابێت یان بەدیلگیرابێت و دیارنەمانەکەی بەردەوام بێت بۆ ماوەیەکی دوور بەپێی عورفی باو ئەوا ژنەکە مافی خۆیەتی بە ویستێکی تاکلایەنە پەیوەندی ژن و مێردایەتی هەڵبوەشێنێتەوە و مێرد بە پیاوێکی تر بکات، یاسای "ئەشنۆنا" دانی بەمەدا ناوە و ژنەکە بە گوناهبار نازانێت، بەڵام ماف داوە بە مێردی یەکەمی نادیار-گەر گەڕایەوە- ژنەکەی بگێڕێتەوە با منداڵیشی لە مێردی دووەمی هەبێت بە مەرجێك بزربوونەکەی بە پاساوێکی رەوا بێت[2]، بەڵام گەر

---

[1] مادەی(٦٠) لە یاسای ئەشنۆنا دەڵێت: (گەر پیاوێك ژنەکەی تەڵاقدا دوای ئەوەی منداڵی لێی هەبوو و ژنی دووەمی گرت ئەوا لە ماڵەکەی دەردەکرێت(واتە پیاوەکە) و هەموو پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوەی ئەو خاوەنییەتی دەبڕێت هەرکەسیش ئەوی دەوێت با شوێنی بکەوێت). ویلاحظ أن رقم المادة (٦٠) في بعض المصادر هو (٥٩).

[2] لە مادەی(٣٠)ی یاسای ئەشنۆنادا بە دەق هاتووە(گەر پیاوێك لە کاتی جەنگ یان شەیەخون(بەسەرداداان)دا رفێنرا یان بە دیلگیرا و لە وڵاتەکەی تر (وەك غەریبێك) بۆ ماوەیەکی دووردرێژ مایەوە و ژنەکەی پیاوێکی تر مارەی کردەوە و منداڵی لێ هەبوو کاتێك دەگەڕێتەوە ژنەکەی خۆی دەگێڕێتەوە)

دەقەکە ئاماژەی بە بابەتی خەرجی نەکردووە وەك چۆن دەقەکانی تر ئەنجامی دەدەن، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دروستی هەڵوەشانەوە و هاوسەرگیری یەکسانە مێردە بزرەکە خەرجی ←

بزربوونەکەی ناڕەوا بوو بەوەی بێزار بووبێت لە نیشتمان و پادشاکەی و هەڵهاتبێت ئەوا لە هیچ بارێکدا مافی گێڕانەوەی ژنەکەی بۆ نییە[1].

## باسی چوارەم:
## یاسای حامورابی

حامورابی پادشای شەشەمە لە پادشاکانی بابلی یەکەم(١٨٩٤–١٥٩٤پ.ز.) فەرمانڕەواییەکەی لە (١٧٩٢–١٧٥٠پ.ز.)[2] بەردەوام بوو، یاساکەی بە زمانی بابلی

بۆ بەجێهێڵابێت یان نە، هەر بەو جۆرە ئەو ماوەیەی دیارینەکردووە کە ماف دەدات بە ژنەکە تیایدا هاوسەرگیری دووەم بکات وەك چۆن یاساکانی تر لە یاسا عێراقییە کۆنەکان دیاریدەکەن بەڵکو ئەوەی بۆ عورفی بالادەست بەجێهێلاوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دروستی هەڵوەشانەوە تا درێژی ماوەکە یان کورتی ماوەکە بڕیاری لێ دەدرێت.

(1) لە دەقی مادەی(٣١)دا دەڵێت: (گەر پیاوێك بێزاربوو لە شارەکەی(نیشتمانەکەی) و سەردارەکەی(مەلیکەکەی) و هەڵهات، پاشان پیاوێکی تر ژنەکەی گرت کاتێك دەگەڕێتەوە مافی گێڕانەوەی ژنەکەی نییە).

(2) الشرائع العراقية القديمة ٢٢٣. تیایدا ناکۆکی هەیە لە دیاریکردنی بەرواری فەرمانڕەوایی حامورابی و دەسەلاتی ڕەچەڵەکەکەی.
ففي الموسوعة العربية الميسرة (ص٧٤٠) حامورابی دەوروبەری(٢١٠٠ق.م) ژیاوە، هەروەها لە: قوانين حمورابي المرجع السابق (ص٢): حكم حمورابي (١٧٢٨–١٦٨٦ق.م). وفي الاسرة في الشرع الاسلامي المرجع السابق (ص١٥) جاء حمورابي (١٩٤٨–١٩٠٥ق.م). وفي (الطلاق في الشريعة الاسلامية والقانون) للدكتور احمد الغندور (ص١٨): (شريعة حمورابي كانت معمولا بها في بابل في الدولة الكلدانية قبل (٢٠٠٠ق.م). وجاء في (التوراة والتاريخ) العدد (١٤) سلسلة كلام الله، تعريب عمانۆیل (ص٦): (حامورابی بەکەمێك دوای ئیراهیمی پێغەمبەر(علیه السلام) هاتووە، بە بەڵگەی ئەوەی ئەو زانیاریانەی زانستی ئەرکۆلۆژی (١٣٢ز–١٩٥٠ز) دەستیان کەوتووە ئاماژە دەکات بۆ لێکچوونی نێوان ئەخلاق و ئادابی بابلییەکان لەگەڵ ئەوەی ئیبراهیم و یەعقوب هێنایان لە ئەخلاق و ئاداب وەك کتێبی پیرۆز ڕیوایەتی دەکات)
بەم جۆرە فرەبۆچوونی لەم دیاریکردنەدا هاتۆتە ئاراوە و هەر ئاراستەیەك بەڵگەی تایبەت بەخۆیان هەیە، خودا زاناترە بەڕاستی.

لەسەر عەمودێکی بەردین لـە شـاری "سوسـە" پایتـەختی ولاتـی عیلام(خوزسـتان) تۆمارکراوە، ئەوەش لـە کـاتی هـەڵکۆڵینی دەسـتەیەکی ئەرکۆلۆژی(شـوێنەوارناس) فەرەنسی لە ساڵی(١٩٠١–١٩٠٢ن)

وادەردەکەوێت یاساکەی حـامورابی هەموارکـەرەوەی یاسـا عێراقییـەکانی پـێش خۆی بووبێت، بە لابردنی هەندێکیان و خستنەسەری هەندێکی تریان، ئەم یاسایە لـە (٢٨٢) مادە پێکدێت، بەڵام باوەڕ وایە ئەم یاسایە زیاتر لە (٣٠٠) مـادە بێـت، ئـەوانی تری بەهۆی گواسـتنەوەی لـە بابلـەوە بـۆ شـاری "سوسـە" تیاچـووە یـان بـەهۆی وێرانکارییەکەوە لە عەموودە بەردینەکەدا روویدابێت.

ئـەم یاسـایە بـۆ سـیازدە بـەش دابـەش دەبێـت، هـەر بەشـێك تایبـەتکراوە بـە رێکخستنی لایەنێکی دیاریکراوی پەیوەندییەکانی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ، بەشـی هەشـتەم کە مادەکانی(١٢٧–١٩٤) لەخۆ دەگرێت تایبەتکراوە بە کاروباری خێزان، ئەم مادانـە حوکمەکانی هاوسەرگیری و تەڵاق و میرات و بەرۆڵـەکردن(تبنی) و پـەروەردە لـەخۆ دەگرن، هەروەها هەموو ئەوەی پەیوەندی بە گرێدانی خێزانی ئەو سەردەمەوە بووە.

## جیابوونەوەی هاوسەرگیری لە یاسای حامورابیدا:

فرەیی لە هۆ و رێگـەی جیابوونـەوەی دوو هاوسـەرەکە و کۆتاهـاتنی پەیوەنـدی هاوسـەرگیری لـە یاسـای حامورابیـدا بـوونی هەیـە، بـەهۆی گرنگییەکەیـەوە بـە دوورودرێژی باسیان دەکەین لەگەڵ پێداگری لەوەی ئەم یاسایە دەسـتی بـۆ تـەڵاقی کۆتوبەندکراو بردووە و دەستەبەریی تایبەتی دژ بە تەڵاقی زۆردارانـە بـۆ ژنـی بـابلی دەستەبەر کردووە، گرنگترین رێگەکانی جیابوونەوەی ژن و مێرد ئەمانەن:

### یەکەم-تەڵاق:

یاسای حامورابی تەڵاقی بەسەر ئەم بارانەدا دابەش کردووە: (کەمتەرخەمی مێرد، و کەمتەرخەمی ژن و نەزۆکی و پێش چوونە لا):

**أ. تەڵاق بە کەمتەرخەمی پیاو:**

(واتە بەبێ هۆ) یاسای حامورابی بڕیاریداوە هەر پیاوێك بەبێ هۆ ژنەکەی تەڵاق بدات لە شاندانە ژێر سەرئەنجامەکەی بە کەمتەرخەم و بەرپرسیار دایبنێت لە ئەسەری دارایی کە بە دەستەبەر بۆ ژنەکە دادەنرێت لەلایەکەوە و سزایەك بۆ مێردەکە لەلایەکی ترەوە[1].

**ب-تەڵاق بە کەمتەرخەمی ژنەکە:**

گەر لە ژنەکەوە هەڵسوکەوتێکی نەشیاو ئەنجام درا پاساو بێت بۆ تەڵاقدانی ئەوا پیاوەکە هەڵبژاردەی بۆ هەیە و دەتوانێت تەڵاقی بدات و لە هەموو مافەکان بێبەشی بکات یان هێڵانەوەی لە ماڵدا وەك کەنیزەك و ژنی دووەمی بەسەردا بهێنێت[2].

---

[1] مادەی(٣٧) لە یاسای حامورابی بەدەق هێناویەتی: (گەر پیاوێك بڕیاریدا "شکوکیتوم" تەڵاقبدات کە منداڵی بۆ هێناوەتە دی یان "نادیاتوم" تەڵاقبدات کە بە منداڵ کۆمەکی کرد ئەوا لەسەریانە هەدیەکانیان بۆ بگێڕنەوە(ئەوەی لە ماڵی باوکییەوە هێناویەتی) و نیوەی بەرهەمی کێڵگە و بیستانەکە و نیوەی ماڵە گوازراوەکەی پێبدات، لەسەر ژنەکەش پەروەردەی منداڵەکان پێویستە، لەدوای پەروەردەکردنی منداڵەکانی لەسەر پیاوانە بەشی یەك میراتگری لە هەموو شتێك کە بە منداڵەکانیان داوە پێ بدەن، بۆ ژنەکەش هەیە ئەو پیاوەی پێی رازییە هەڵیبژێرێت)
شۆکیتوم (یان شوکیتم) یان نادیتوم لە جۆرەکانی کاهینە ژنەکانن، ئەوانە پلەیان کەمترە لە کاهینی باڵا، و ژنی ئاسایی. القانون في العراق القديم المرجع السابق ص٢٥٣.
کاهین "النادیتوم" مافی هاوسەرگیری بۆ هەیە بەڵام مافی منداڵبوونی بۆ نییە، پێدانی منداڵ بە مێردەکەی بەوە دەبێت ئافرەتێکی کاهینی "شوکیتوم"ی پێشکەش بکات بۆ ئەوەی منداڵی بۆ ببینێت. أنظر التشريعات العراقية القديمة ص١٤٣.

[2] مادەی(١٤١) بەدەق هێناویەتی: (گەر ژنی پیاوێك کە لە ماڵی پیاوێکدا دەژی(واتە ماڵی مێردەکەی) بڕیاریدا لە ماڵ بچێتە دەرەوە و کارێك ئەنجام بدات ماڵەکەی خۆی پێ بڕوخێنێت و لە شانوشکۆی مێردەکەی کەم بکاتەوە ئەوا پێویستە لەسەریان ئەوا بەسەریدا بسەپێنن، گەر وتی(پیاوەکە) لە داهاتوودا تەڵاقی دەدات ئەوا بۆی هەیە تەڵاقی بدات و لە داهاتوودا پارەی تەڵاقەکەی پێ نادات، گەر پیاوەکەی وتی: لە داهاتوودا تەڵاقی نادات ئەوا مێردەکەی مافی ئەوەی هەیە ژنی دووەم بهێنێت و ئەو ژنە(ژنی یەکەم) لە داهاتوودا وەك کەنیزەکی ماڵی مێردەکەی لێ دێت)

**ج-تەلاق بە هۆی نەزۆکییەوە:**

گەر ژنەکە نەزۆك بوو و منداڵی نەدەبوو پیاوەکە بۆی هەیە تەلاقی بدات و بەرانبەر ئەوە دەبێت هەدیە(مارەیی) پێ بدات لەگەڵ گێڕانەوەی هەموو ئەوەی لە ماڵی باوکییەوە(ژنەکە) هێنابووی[1].

گەر ژنەکە هەدیە(مارەیی) نەبوو ئەوا لەسەریەتی برێك لە ماڵ و سامانی پێبدات گونجاو بێت لەگەڵ باری داراییدا وەك قەرەبوویەك بۆ ژنەکە بە تەلاقدانی، گەر پیاوەکە "ئۆیلەم" بوو(واتە لەڕووی داراییەوە بەدەسەڵات بوو) پێویستە لەسەری مەنێك لە زیوی پێبدات، بەلام گەر پیاوەکە "مشکینم" بوو(واتە گەدا(مسکن) بوو و لەڕووی داراییەوە بەدەسەلات نەبوو) پێویست دەبێت لەسەری سێیەکی مەنێك زیوی پێبدات[2] .

---

[1] مادەی(١٣٨) دەقەکەی: (گەر پیاوێك ویستی ژنەکەی تەلاق بدات کە منداڵی نابێت ئەوا پێویستە لەسەری بە پارە قەرەبووی بکاتەوە بە ئەندازەی مارەییەکەی و ئەو هەدیانەی لە ماڵی باوکییەوە هێناویەتی مێردەکە رادەستی بکات و پاشان تەلاقی بدات)

[2] مادەی(١٣٩) دەقەکەی: (گەر مارەیی نەبوو پێویستە یەك مەن زیوی پێ بدات بەرانبەر بە تەلاقەکەی)

مادەی(١٤٠) نص هذه المادة في الشرائع العراقية القديمة للدكتور فوزي رشيد (ص١٤٣) كما يلي (گەر مێردەکە خزمەتکار بوو ئەوا لەسەریەتی سێیەکی مەنێکی لە زیو پێ بدات و پاشان تەلاقی بدات)

وفي ترجمة الاستاذ عبده حسن الزيات المنشورة في مجلة القضاء السنة الثانية العدد الخامس كانون الأول ١٩٣٦ كما يلي: (گەر لە تاکە گشتییەکان بوو سێیەکی مەنێکی پێ دەدات).

وفي ترجمة الدكتور عامر سليمان (القانون في العراق القديم (ص٢٥٤) كما يلي: (گەر هەدیە بۆ هاوسەرگیرییەکە نەبوو ئەوا لەسەریەتی برێك لە ماڵی پێبدات گونجاو بێت لەگەڵ باری دارایی پیاوەکەدا وەك قەرەبوویەك بۆ نەکە بەرانبەر تەلاقدانی، گەر لە "ئوەیلم" بوو ئەوا پێویستە مەنێك زیوی پێبدات(م١٣٩)، بەلام گەر "مشکینم" بوو ئەوا پێویستە سێیەکی مەنێك زیوی پێبدات(م١٤٠)، بە باوەڕی من ئەم وەرگێڕانە دروستترە، مەبەست بە "ئوەیلم" ئەو کەسەیە لەڕووی داراییەوە توانادارە، وەك چۆن مەبەست بە "مشکینم" کەسی مسکێن و هەژار بووە. (من يكون من الطبقة المتوسطة أو دون المتوسط).

**د-تەلاق پێش چوونە لا:**

بەپێی یاسای حامورابی پیاو مافی ئەوەی هەیە ژنەکەی تەلاق بدات پێش چوونە لا و گواستنەوەی بۆماڵی هاوسەری، با هۆیەکیش بوونی نەبێت تەلاقەکە پاساو بدات، ئەوەش سەرباری دامەزرانی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە.

وا دەردەکەوێت گواستنەوە بۆ ماڵی هاوسەرداری و چوونە لا لە تەولوکارەکانی هاوسەرگیری کاملی دامەزرلو بووبێت بەجۆرێك لەدوای ئەوە پیاوەکە بەبێ هۆ مافی تەلاقدانی نەبێت[1].

**دووەم-هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیری بە بزربوون:**

مادەکانی(١٣٣–١٣٦)ی یاسای حامورابی چارەنووسی پەیوەندی هاوسەرداری چارەسەر دەکات لە بارێکدا پیاوەکە بزر بێت(یان نادیار بێت بە نادیارییەکی بڕاوە و بێسۆراخ)، ئەم یاسایە ئەو حاڵەت و رەوشانە دیاری دەکات کە تیایاندا ژن مافی ئەوەی هەیە هاوسەرگیری هەڵبوەشێنێتەوە و مێرد بە پیاوی دووەم بکات، هەر بەو جۆرە ئەم مادانە جیاکارییان کردووە لە نێوان حوکمی بزربوونی رەوا و بزربوونی ناڕەوا، هەروەها جیاکاری لە نێوان خەرجی بۆ کردن و نەکردنیدا، ئەمەش بەم جۆرە رۆشن دەکەینەوە:

---

[1] مادەی(١٥٩) دەقەکەی: (گەر پیاوێك هەدیەی دلخوازی هێنا بۆ ماڵی مامی و مارەییەکەی دا و لەدوای ئەوە سەیری ئافرەتی دووەمی کرد و بە مامی وت: "کچەکەی تۆ ناهێنم" ئەوا بۆ باوکی کچەکە هەیە هەموو ئەو شتانەی کەسەکە(برازاکەی) هێناویەتی هەڵیبگرێت بۆ خۆی)
پێشکەش کردنی هەدیە و مارەیی وەك گرێبەستی هاوسەرگیری وابووە و پشت هەڵکردن لە ژنەکە وەك تەلاق وابووە لە یاسای حامورابیدا لەلای لێکۆڵەران و زانایانی شوێنەوارناس، وتقدیم الهدیة والمهر یعتبر بمثابة عقد الزواج والاعراض عن الزوجة یعتبر طلاقا في قانون حمورابي عند الباحثین وعلماء الآثار. أنظر الدکتور عامر سلیمان المرجع السابق (ص٢١٧). بەڵام لە رووالەتی دەقەکەوە بۆم دەردەکەوێت ئەو کارە هەڵوەشانەوەی داخوازییەکەیە مەگەر بڵێین پێشکەش کردنی مارەیی ئاماژەیە لەسەر دامەزرانی گرێبەستەکە، شایانی باسە تەلاقدان(یان جیاکردنەوەی قەزایی) بەر لە چوونە لا یاسای باری کەسێتی عێراقی راستکراوە دانیپیاداناوە لە مادەی(٤٣) بەڵام ئەو مافە بۆ ژنەکە جێگیرکراوە نەك بۆ مێردەکە.

**أ– لە باری بوونی خەرجی تەواو بۆ ژنی پیاوە بێسەروشوێنەکە:** مافی ئەوەی نییە هاوسەرگیرییەکە هەڵبوەشێنێتەوە و مێرد بە پیاوی دووەم بکات[1]

گەر پارێزگاری لەخۆی نەدەکرد لەباری فەراهەمبوونی خەرجیدا، بەڵکو ماڵی مێردەکەی بەجێهێڵا و ڕۆیشت بۆ ماڵی مێردی دووەمی و شووی پێکرد بە مردن سزا دەدرێت بە خستنە ناو ڕووبارەوە، چونکە مافی هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیری لەدەستدا نییە لەباری بوونی خەرجی پێویست و بێسەروشوێن بوونی پیاوەکە بە پاساوێکی ڕەوا.

**ب.گەر مێردە بزرەکە سەرچاوەیەکی بەجێنەهێڵا بوو** ژنەکەی بتوانێت لەسەری بژی ئەوا بۆی هەیە هاوسەرگیرییەکە هەڵبوەشێنێتەوە بە ویستی تاکلایەنە و مێرد بە پیاوی دووەم بکات[2].

بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەڵوەشاندنەوە و مێردکردن بە پیاوی دووەم لە یاسای حامورابیدا ڕاشکاوانە دانپیادانراوە، سەرباری ئەوەش مافی داوە بە هاوسەرە بزرەکە–دوای پەیدابوونەوەی– بە گێڕانەوەی ژنەکەی گەر بزربوونەکەی بە هۆیەکی ڕەوا بوو یەکسانە مێردی دووەم چووبێتە لای یان نە، هەروەها یەکسانە منداڵی لێی بووبێت یان نە[3].

---

[1] مادەی(١٣٣/أ) دەقەکەی: (گەر پیاوێك بەدیلگیرا و لە ماڵەکەیدا خۆراکی تەواو هەبوو ئەوا لەسەر ژنەکەیەتی پارێزگاری لە نەفسی خۆی بکات(واتە پاکدڵوێنی) لەو ماوەیەدا مێردەکەی بزر و نادیارە و مافی ئەوەی نییە بچێتە ماڵی پیاوێکی تر)

[2] امادەی(١٣٤) دەقەکەی: (گەر مێردەکەی بەدیلگیرا و خۆراکی تەولو لە ماڵەکەیدا نەبوو و ژنەکە ڕۆیشتە ماڵی پیاوی دووەم ئەوا ئەو ژنە هیچ گوناهێکی نییە)

[3] مادەی(١٣٥) دەقەکەی: (گەر پیاوێك بەدیلگیرا و لە ماڵەکەیدا خۆراکی تەولو نەبوو و ژنەکەی ڕۆیشتە ماڵی پیاوی دووەم و منداڵی لێی بوو و لەدوای ئەوە مێردەکەی گەڕایەوە و گەیشتە شارەکەی، ئەوا لەسەر ژنەکە پێویستە بگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی و منداڵەکان هەریەکەیان دەچێتەوە بۆ لای باوکی خۆیان)
ئەمە لەگەڵ مادەی(٣٠) یاسای ئەشنۆنا پێکدێتەوە.

ج-گەر دیارنەمانی پیاوەکە بەهۆیەکی ناڕەواوە بوو بەوەی لە شارەکەی هەڵهاتبێت و لێی بێزار بوو بێت و بەدنەمەك بێت بەرانبەر چاکەکانی ئەوا بۆ ژنەکە هەیە مێرد بە پیاوی دووەم بکات لەدوای هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیرییەکەی لەلایەن خودی خۆیەوە، و بۆ پیاوی یەکەم نییە بیگێڕێتەوە گەر گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی یەکسانە خەرجی پێویستی بۆ بەجێهێلاَ بێت یان نە، هەروەها یەکسانە منداڵی لە مێردی دووەم بووبێت یان نە، ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەو دەقەی دان دەنێت بە هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیرییەکە و نەگەڕانەوە بۆ لای هاوسەری یەکەم رەهایە، و رەهاش هەڵدەدرێتە سەر رەهاییەکەی گەر بەڵگەیە بوونی نەبێت لەسەر سنووردارکردنی[1].

**سێیەم-جیابوونەوە بە دانانی دادوەر:**

لە یاسای حامورابیدا دانانی دادوەر زانراو بووە و دان دەنێت بە خستنەڕووی ناکۆکی و نەسازانی ژن و مێردەکە بەسەر دوو دادوەردا بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە لە ناکۆکی و جیاوازییەکە بکەن، و لایەنی کەمتەرخەم لە دوو هاوسەرەکە دیاری بکەن و پاشان بەپێی ئەوە بریار لە کارکردن بدەن.

أ.گەر سەلمێنرا پیاوەکە کەمتەرخەمە ئەوا رێگە بە ژنەکە دەدرێت بە بەکارهێنانی مافی خۆی لە تەڵاقدا و وەرگرتنەوەی هەموو ئەوەی لەگەڵ خۆی هێناویەتی بۆ ماڵی مێردەکەی و گەڕانەوە بۆ لای خانەوادەکەی[2].

---

[1] مادەی(١٣٦) دەقەکەی: (گەر پیاوێك بێزار بوو لە شارەکەی و هەڵهات و لەدوای ئەوە ژنەکەی رۆیشتە ماڵی مێردی دووەم گەر ئەو پیاوە گەڕایەوە و ژنەکەی خۆی لە ماڵی مێردی دووەمدا بینییەوە ئەوا ژنی پیاوە هەڵهاتووەکە ناگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی، ئەوەش بەهۆی بێزاربوونی لە شارەکەی و هەڵهاتنی لێی)

حوکمی ئەم مادەیە لەگەڵ ئەوەی لە مادەی(٣١)ی یاسای ئەشنۆنادا هاتووە هاوڕایە.

[2] مادەی(١٤٢) دەقەکەی: (گەر ژنێك لە مێردەکەی بێزار بوو و پێی وت دەستم بۆ مەبە(لەگەڵ مەخەوە) لە فەرمانگەی شارۆچکەکەی لێکۆڵینەوە لە ئاکاری دەکرێت گەر خۆپارێزبوو و هەڵەیەکی ئەنجام نەدابوو لە کاتێکدا مێردەکەی زۆر لە ماڵەوە دەردەچوو و لە شکۆی ژنەکەی
←

ب.گەر سەلمێنرا بۆ دادوەرەکان ژنەکە کەمتەرخەمە ئەوا بە کوشتن بڕیار بەسەریدا دەردەکرێت، ئەوەش بە هەڵدانە ناو ئاو تا دەخنکێت[1].

**چوارەم-جیابوونەوە بە بوونی هۆیەک:**

وا دەردەکەوێت لایەنی بەزەیی و مرۆیی پەیوەست بە ژنی نەخۆش لە یاسای حامورابیدا ڕۆشن بێت، بەجۆرێك ئەم یاسایە لەسەر پیاوەکە حەرامی دەکات تەڵاقی بدات با نەخۆشەکەش هیوای چاکبوونەوەی لێ نەکرێت، هەر بەو جۆرە لەسەر پیاوەکەی پێویست کردووە هەستێت بە دڵڕاگرتن و چاودێری کردنی تا ژنەکە لە ژیاندا بێت[2].

بەڵام ڕێگە بە پیاوەکە دەدات ژنی دووەم بهێنێت.

لەدوای هێنانی ژنی دووەم یاسا مافی تەڵاقی بە ژنە نەخۆشەکە داوە گەر ئارەزوومەند بوو بگەڕێتەوە بۆ لای خانەوادە و کەسوکاری[3].

ئەمەش بە پێچەوانەی یاسای هاوچەرخەوە کە ئەو مافە بە پیاو دەدات، نەك پێدانی بە ژنە نەخۆشەکە.

---

کەم دەکردەوە ئەوا تاوانێك لەسەر ئەو ژنە نییە، دەتوانێت هەدیەکانی خۆی وەربگرێتەوە(کە لە ماڵی باوکییەوە هێناویەتی) و بچێتەوە بۆ ماڵی باوکی)

(1) مادەی(١٤٣) دەقەکەی: (گەر ژنەکە خۆپارێز نەبوو و زۆر دەچووە دەرەوە و بەوەش ماڵەکەی خۆی وێران دەکرد و لە شکۆی مێردەکەی دادەبەزاند ئەوا پێویستە ئەو ژنە هەڵبدەنە ناو ئاوەوە)

(2) مادەی(١٤٨) دەقەکەی: (گەر پیاوێك ژنێکی هێنا و ژنەکە تووشی نەخۆشییەکی ترسناك بوو گەر پیاوەکە بڕیاری هاوسەری لەگەڵ ژنی دووەم دا ئەوا دروست نییە ژنە تووشبووەکە بە نەخۆشییە ترسناکەکە تەڵاق بدات، بۆی لەوەی ماڵەی خۆی بینای کردووە نیشتەجێ ببێت و پیاوەکەش لە شاندانە ژێر بەرپرسیارێتی خۆی بەردەوام دەبێت تا ئەو ژنە لە ژیاندا بێت)

(3) مادەی(١٤٩): دەقەکەی: (گەر ئەو ئافرەتە تووشبووە بە نەخۆشییەکە حەزی نەکرد لە ماڵی مێردەکەی بژی(لەدوای هێنانی ژنی دووەم) ئەوا لەسەر پیاوەکە پێویستە ئەو هەدیانەی لە ماڵی باوکییەوە هێنابووی بۆی بگێڕێتەوە و بۆ ژنەکە هەیە بڕوات)

**پێنجەم -جیابوونەوە بە خزمایەتی:**

یاسای حامورابی خزمایەتی بە ڕێگری هاوسەرگیری داناوە، هەر بەو جۆرە بە هۆیەکانی کۆتاهاتنی پەیوەندی هاوسەرگیری تەماشای دەکات گەر لەدوای هاوسەرگیرییەکە دەرکەوت و هاتە پێشەوە، با ئەو خزمایەتییەش لە ڕێگەی ناڕەواوە هاتبێتە ئاراوە، گەر باوکێك چووە لای ژنی کوڕەکەی بەر لەوەی کوڕەکە بچێتە لای ئەوە پەیوەندی هاوسەرگیری نێوان کوڕەکە و ژنەکەی کۆتا پێ دەهێنێت، بۆیە لەسەر باوك پێویستە باجێکی دارایی بدات بە ژنەکە، و هەموو ئەوەی لە ماڵی باوکییەوە هێناویەتی رادەستی بکاتەوە[1].

شایانی باسە هەندێ لە فەقیهانی موسڵمان دانیان ناوە بە خزمایەتیدا لە ڕێگەی زیناوە[2].

بەڵام گەر باوك هەستا بە پەیوەندییەکی جووتبوون لەگەڵ ژنی کوڕەکەیدا لەدوای چوونە لای لەلایەن کوڕەکەوە ئەوا بڕیاری مردنی بەسەردا دەدرێت و دەخرێتە ناو ئاوەوە تا دەخنکێت[3].

بەڵام حامورابی لەدوای ئەوە چارەنووسی پەیوەندی هاوسەرگیری کوڕەکە و ژنەکەی بۆ دیاری نەکردووین، وەك چۆن ئاماژەی نەکردووە بە بەرپرسیارێتی ژنەکە وەك هاوبەشێکی تاوانەکە، لەوانەیە بێدەنگبوونی یاسای حامورابی لە سزای ژنی

---

[1] مادەی(١٥٦): دەقەکەی(گەر پیاوێك ژنێکی بۆ کوڕەکەی هەڵبژارد، بەڵام کوڕەکەی لەرووی جووتبوونەوە پێیەوە پەیوەست نەبوو و لەگەڵ ئەوەش لە باوەشی ژنەکەیدا نووست، ئەوا لەسەریەتی نیو مەن زیوی پێبدات و هەموو ئەو شتانەی لە ماڵی باوکییەوە هێنابووی بەتەواوی رادەستی بکاتەوە و بۆی هەیە پیاوێك هەڵبژێرێت لەگەڵ حەزی خۆی گونجاو بێت)

[2] وەك: أبي حنيفة، والثوري، والأوزاعي، وقول لمالك. ينظر بداية المجتهد ونهاية المقتصد لابن رشد ٢/٢٩.

[3] مادەی(١٥٥) دەقەکەی: (گەر پیاوێك بوکێکی بۆ کوڕەکەی هەڵبژارد و لەگەڵ جووتبوو، دواتر پیاوەکەیان(باوکی مێردەکە) بینی لەگەڵ ژنەکە خەوتووە ئەوا پێویستە لەسەریان ئەو پیاوە کۆتوبەند بکەن و هەڵیبدەنە ناو ئاوەوە )المادة (١٥٥)
ينظر الشرائع العراقية القديمة للدكتور فوزي رشيد ص١٤٦.

کوڕەکە بەوە لێکبدرێتەوە لەو بارەدا(لەو تاوانەدا) ناچارکرابێت لەسەر تاوانەکە مادی بێت یان ئەدەبی بەوەی باوکەکە هێز و دەسەلاتی خۆی لەسەر ژنەکە بەکارهێناوە.

## باسی پێنجەم:
## تەڵاق لە یاسای حیسیدا

لە وێرانەکانی "حەتوش"دا پایتەختی حیسییەکان کە دەکەوێتە خۆرهەلاتی ئەنقەرەوە ژمارەیەکی زۆر لە تەبەڵەی قوڕینەیان دۆزییەوە، لەسەر هەندێکیان بە نووسینی مسماری و زمانی حیسی(یان ئەکەدی) کۆمەڵێك یاسای تۆمارکراو لە (٥٦) بەشدا نووسرابوون، تاکو ئێستا بەتەواوی بەروار و ناوی یاسادانەرەکە کە دەریکردوون نەزانراوە، باوەڕوایە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سیازدەهەم یان چواردەهەمی پێش زایین، یاسای حیسییەکان گرنگی زۆری داوە بە پرسە تاوانکارییەکان سەرباری رێکخستنی نرخی مادە خۆراکییەکان و پیشەسازییەکان، هەروەها کەمترین ئاستی بۆ کرێی کرێکار داناوە لەگەڵ هەندێ لە بەرژەوەندییەکانی پیاوانی سوپا.

بەلام ئەو حوکمانەی تایبەتن بە کاروباری خێزان و باری کەسێتییەوە وادیارە بەجێهێلاوە بۆ رێسا عورفییە بالادەستەکانی ئەو کاتە، تاکە دەقێکی بەدەستهێنراوی تایبەت بە تەلاق بریتییە لە مادەی(٣١) کە بە دانپیانەری راستەقینەی تەنها مافێك دادەنرێت تاکو ئێستا لە یاساڕێژییە عێراقییە کۆنەکاندا جێگیر نەبووە.

ئەو حوکمەش بریتییە لە رێکەوتنی ژن و پیاوەکە لەسەر کۆتا پێ هێنانی پەیوەندی هاوسەرێتی بەرانبەر بریتییەك، ئەمە لای فەقیهە موسڵمانەکان پێی دەوترێت خولع، ئەو مادەیە بە دەق هێناویەتی: (گەر پیاوێکی ئازاد کەنیزەکێکی خۆشویست و وەك هاوسەری خۆی چووە لای وماڵێکیان پێکهێنا و مندالیان

خستەوە و لەو بارەیەوە جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە و لەسەر جیابوونەوە رێکەوتن و ماڵەکەیان بەش کرد ئەوا پیاوەکە منداڵەکان دەبات، بەلام دانەیەکیان بۆ ژنەکە بەجێدەهێڵێت)[1].

# باسی شەشەم:
# تەلاق لە یاسای ئاشوری ناوەند و قەزای عێراقی کۆندا

**أ- تەلاق لە یاساکانی ئاشووری ناوەندا:**

هەندێ تەبەڵەی قوڕی کۆن لەلایەن کۆمەڵەی رۆژهەلاتی ئەڵمانی دۆزرایەوە لە کاتی کاری هەڵکۆڵیندا لە ماوەی نێوان ساڵەکانی (١٩٠٣ بۆ ١٩١٨) لە قەلای شەرقاتی ئاشووری کۆن.

ئۆ تەبەڵەی مسماری دۆزرایەوە کە مادەی یاساییان لەخۆ گرتبوو، مێژووەکەی بۆچاخی ئاشووری ناوەند دەگەڕایەوە، ئێستا لە مۆزەخانەی نیشتمانی لە بەرلینی خۆرهەلات پارێزراوە، زانایانی شوێنەوارناس باوەڕیان وایە بەروارەکەی بۆ ماوەی نێوان(١٣٥٠–١٢٥٠پ.ز.) دەگەڕێتەوە.

مادەکانی(٢٥–٤٦) حوکمەکانی باری کەسێتی لەخۆ دەگرن، مادەکانی(٣٦–٣٨) تایبەتکراون بە حوکمەکانی تەلاق.

لەم مادانەوە: لەوە تێدەگەین توندکردنەوە لە سنووردارکردنی ئازادی ویست لە تەلاقدا لەو چاخەدا وەکو پێش خۆی نەماوەتەوە.

---

[1] ینظر الدکتور صبیح مسکوني المرجع السابق ص٢١٩.

چونکە ئەم یاسایە ماف دەدات بە مێرد بەبێ هۆ ژنەکەی تەڵاق بدات، هەروەها بۆی هەیە لە مافەکانی سەرهەڵدراو لەسەر تەڵاق بێبەشی بکات یا کەمتەرخەمییەکیش لە ژنەکەوە بوونی نەبێت تەڵاقدانەکە پاساودار بکات[1]، چونکە دەقەکە بەرەهایی هاتووە، رەهاش کار بە رەهاییەکەی دەکرێت گەر بەڵگەیەکی پێچەوانەی ئەوە راست نەبێتەوە، هەر بەو جۆرە مافی بە مێرد داوە پێش چوونە لا ژنەکەی تەڵاق بدات و ئەو خشڵانەی بۆی کردووە لێی وەربگرێتەوە، بەڵام مافی وەرگرتنەوەی هەدیەکانی نییە[2].

ئەوەی لەم یاسایەدا سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە کە لە مادەی(٣٦)دا پێداگری لێ دەکات زیاتر لە هەر یاسایەکی عێراقی کۆن: لەسەر ژن پێویستە لەباری بێسەروشوێنی یان بزربوونی مێردەکەیدا پابەند بێت بە پەیوەندی هاوسەرداریییەوە سەرەرای بەجێنەهێڵانی هیچ سەرچاوەیەك بۆ خەرجی لەلایەن مێردە نادیارەکەیەوە.

گەر منداڵی هەبوو دەیانتوانی کار بکەن لەسەریەتی چاوەڕوان بێت هەرچەند درێژەبکێشێت، ئەگەر نە، مێردکردنی بۆ هەیە دوای پێنج ساڵ لە بزربوونی مێردەکەی.

گەر پیاوە بزربووەکە گەڕایەوە و توانی هۆی بزربوونەکەی بسەلمێنێت بەوەی لە دەرەوەی ویستی ئەو بووە ئەوا بۆی هەیە ژنەکەی بگێڕێتەوە بە مەرجێك ژنێك بدات بە پیاوەکەی دووەم لە جێگەی ژنەکەی خۆی و لێی وەربگرێتەوە.

---

(1) مادەی(٣٧) دەقەکەی: (گەر پیاوێك ژنەکەی تەڵاقدا گەر ویستی شتێکی پێ دەدات، گەر نەویست هیچی پێ نادات و لێی دەگەرێت بە دەستی خاڵی بڕوات)

(2) مادەی(٣٨) دەقەکەی: (گەر ژنەکە بەردەوام لە ماڵی باوکیدا دەژیا و مێردەکەی تەڵاقی دابوو بۆ پیاوەکە دروستە بۆ پیاوەکە هەموو خشڵ و زێرەکان بگێڕێتەوە کە پێشکەشی کرد بوو، بەڵام مافی ئەوەی نییە هەدیەی هاوسەرگیری کە پێیدابوو لێی وەربگرێتەوە، هیچ مافێکی تر بە پیاوەکە نادرێت لەسەر ژنەکە)

گەر بزربوونەکەی بە کارێك بوو پادشا داوای لێ کرد بوو ئەوا بە ڕەهایی شووکردنی بۆ نییە، گەر سەرپێچی کرد و پێش تێپەڕبوونی پێنج ساڵ مێردی کرد و منداڵی لە مێردی دووەم هەبوو، ئەوا بۆ مێردەکە(مێردی یەکەم) هەیە کاتێك گەڕایەوە ژنەکەی بگێڕێتەوە و منداڵەکانی لێ وەربگرێت، چونکە پابەند نەبووە بە یاساوە.

بەلام مادەی (٤٥)ی ئەم یاسایە بەرهەڵستی دەکات، پێموایە وەك هەموارکردنەوەی مادەی(٣٦) هاتبێت کە بە دەق هێناویەتی: گەر پیاوەکە بە دیل گیرا و ژنەکە کوڕی نەبوو یان خەزووری نەبوو ئەوا بۆی هەیە ماوەی دوو ساڵ دڵسۆز بێت بۆ مێردەکەی، گەر شتێکی نەبوو لەسەری بژی بۆی هەیە بچێت بۆ کۆشك و ئەوە ڕابگەیەنێت و ببێت بە یەکێك لەوانەی لەژێر وەسێتداری پادشادان، گەر مێردەکە ماڵێك یان کێڵگەیەکی لە شاردا بۆ دابینکرابوو(بۆ بژێوییەوە) ژنەکە بۆی هەیە داوا لە قەزا پێشکەش بکات و داوای خانووەکە و کێڵگەی مێردەکەی بکاتەوە، هەروەها بۆی هەیە چواریەکی خانوو و کێڵگەکە ببات و لەسەر سەرچاوەکەی بۆ ماوەی دوو ساڵ بژی، دوای ئەوە بۆی هەیە مێرد بە هەر پیاوێك بکات خۆی دەیەوێت، ئافرەتەکە بۆ مێردەکەی یەکەمی وەك بێوەژنی لێ دێت، بۆیە گەر گەڕایەوە بۆی هەیە ژنەکە بەدەستبهێنێتەوە، بەلام بۆی نییە منداڵەکان لە مێردی دووەمی وەربگرێتەوە، هەروەها بۆی هەیە خانووەکە و کێڵگەکە کە درابوو بە مێردی دووەمی دوای هاوسەرگیری وەربگرێتەوە، بەلام گەر مردنی مێردە نادیارەکە سەلمێنرا ئەوا پادشا بۆی هەیە چۆنی بوێت موڵك و ماڵەکەی دابەش بکات[1].

---

[1] ینظر الدکتور عامر سلیمان المرجع السابق ص٢٨٧. j. vandijk, neusu merische gerichtsurkunden in baghdad znfxxi (1963) p. 7077 نقلا عن الدکتور فوزي رشید الشرائع العراقیة القدیمة ص٤٥.

**ب-تەلاق لە قەزای عێراقی کۆندا:**

لە هەندێ لە پیادەکردنەکانی قەزای سۆمەریدا ئـەوە هـاتووە کـە ژن مـافی داوای تەلاقدانی هەیە(یان مافی جیابوونەوەی قەزاییانە) گەر مێردەکـەی ناپـاکی هاوسـەری لەگەڵ کرد.

لەو بەڵگانەی لەسەر ئەم بابەتە هاتوون بڕیـارێکی قەزاییانەیـە کـە لـە سـەردەمی پادشا "ئیشـمی-دوگـان"دا دەرچـووە(١٩٥٣-١٩٣٥پ.ز.) یەکێکـە لـە پادشـاکانی زنجیرەی ئەیسن(٢٠١٧-١٧٩٤پ.ز.)

پوختـەی بابەتەکـە: ژنێـك بـە ناوی(ئەشـتار-ئـۆمی)ەوە داوایـەکی لـە قـەزای شارەکەی تۆمارکردووە دژ بە پیاوەکـەی بـەهۆی کـاری نێربازیـیەوە، دوای ئـەوەی ژنەکە توانیویەتی لەبەردەم قەزادا بیسـەلمێنێت کـە ئـەو مێردەکـەی خـۆی بینیـوە نێربازی لەگەڵ پیاوێکی تردا کردووە قەزا حوکمەکەی بەناوی پادشاوە دەرکردووە و سەری پیاوەکەیان تاشیوە و لوتیان کون کردووە و ماوەیەك بـە نـاو خەڵکیـدا-وەك رسواکردن- گێڕاویانە و ڕێگەیان بە ژنەکەش داوە بە تەلاق.

**ئەنجامگیری:**

لەوەی لە یاساڕێژییە عێراقییە کۆنەکانەوە خستمانە روو-ئەوەی پەیوەسـتە بـە رادەی دەسەڵاتی ویستەوە لـە تەلاقـدا- دەتـوانین ئـەنجامگیری بکـەین: ئـەو یاسـا ڕێژییانە با ڕێگەشیان بە تەلاق دابێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەش کۆمەڵێك کۆت و بەنـدی زۆریان لەسەر ویستی دوو هاوسەرەکە لە تەلاقدا داناوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١-بە کۆیلەکردنی ژنەکە گەر رەوشتی خراپ بوو وەك لـە مـادەی(١٤١)ی یاسـای حامورابیدا هاتووە.

٢-سـزادانی ژنەکـە بـە مـردن گـەر تـەلاقی لـە مێردەکـەی ویسـت وەك لـە زنجیرەی(ئەنا ئیتشۆ)دا هـاتووە لـە سـەردەمی سـۆمەرییەکاندا مـادەی (٥)، بـەڵام یاسـای حـامورابی دابەزانـدنی ئـەم سزایەتی سـنووردار کـردووە بـە پێویستبوونی دەرکردنی بڕیارێکی قـەزایی، هـەروەها بـەوەی ژنەکـە کـارێکی

ئەنجام دابێت شەرەفی پیاوەکەی لەکەدار کردبێت، وەك لە مادەی(١٤٣)ی یاسای حامورابیدا هاتووە.

هەر بەو جۆرە بە مردن سزا دەدرێت گەر هاوسەرگیرییەکەی هەڵوەشاندەوە و مێردی بە پیاوی دووەم کرد لە باری دیارنەمانی مێردەکەیدا و فەراهەمبوونی خەرجی تەولو(م١٣٣/ب) یاسای حامورابی.

٣-دەرکردنی مێرد لە ماڵەکەی و بێبەش کردنی لە هەموو موڵکێکی گوازراوە و نەگوازراوە گەر ژنەکەی تەڵاقدا لە بارێکدا منداڵی لێی هەبوو و ژنی دووەمی بەسەردا هێنا، وەك لە مادەی(٦٠)ی یاسای "ئەشنۆنا"دا هاتووە.

٤-سەپاندنی باجێکی دارایی بەسەر مێردەکەدا کە ژنەکەی بەبێ هۆ تەڵاق دەدات، ئەوەش وەك دەستەبەرییەك بۆ ژنەکە و سزایەك بۆ مێردەکەی وەك مادەی(١٣٧) و (١٤٢)ی یاسای حامورابی و مادەی (٦)ی یاسای (ئەنا ئیتشو) رایدەگەیەنن.

٥-دابەشکردنی ماڵ و سامانی خێزانەکە نیوە بە نیوە لە نێوان ژن و مێردەکەدا لە باری تەڵاقدا بە رێکەوتنی هەردووکیان وەك لە مادەی(٣١)ی یاسای حیسیدا هاتووە.

# بەشی دووەم:
# تەلاق لە دۆڵی نیلدا
# (٣٠٠٠-٣٠پ.ز)

میسرییە کۆنەکان سیستمێکیان بۆ هاوسەرگیری ڕێکخستبوو کە لەسەر ئازادی تەواوی ئافرەت لە مێردکردندا بیناکرابوو، هەروەها لەسەر فەراهەم بوونی داراییانە وەك سزایەك دژ بە تەلاق بەکاردەهێنرا، هاوسەرگیری بە ویستی دوو هاوسەرەکە بوو، بۆیە زۆرلێکردن لە هاوسەرگیریدا بوونی نەبوو، هەر بەو جۆرە هاوسەرگیرییەکە دروست نەبوو گەر ئارەزوویەکی تێر و تەواو و ڕازیبوونێکی کامڵ لە پشتییەوە نەبوایە، شێوازی ئەرێکردن و قبووڵ کردن دەستەبەری داراییانەی لەخۆ دەگرت تا ڕێگر بێت لە چوونە بەرەوە لە تەلاق گەر پێویستییەك بوونی نەبێت بیسەپێنێت و گونجاوییەکەی پاساو بدات.

**دارشتنی گوزارەی هاوسەرگیری:**

مێردەکە لە کاتی سەرهەڵدانی گرێبەستی هاوسەرگیریدا بە ژنەکەی دەوت: (مارەییەکت پێ دەدەم برەکەی ئەوەندەیە گەر رقم لێت بوو و هاوسەرگیریم لە ژیانی تۆدا لەگەڵ ژنێکی تر ئەنجامدا برێکی تر زیاد لە مارەییەکە بە تۆ دەبەخشم، بۆیە مارەیی ئێستا و داهاتوو دەبێتە دابینکاری بۆ تۆ و دەستەبەرکردنی وەفاداری بەم پەیمانە)

ژنەکەش لە قبووڵ کردنی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەدا دەیوت: (هاوسەرگیری تۆ و مارەییەکەی تۆم قبووڵ کرد و بووم بە هاوسەری تۆ، گەر رقم لێت بوو و

کەسێکی ترم خۆشویست مارەییەکەت بۆ دەگێڕمەوە و لە هەموو ماڵ و سامانی خۆم دادەبەزم(خۆش دەبم)[1].

**ڕەوایەتی تەڵاق:**

لای میسرییە کۆنەکان تەڵاق ڕەوا بوو لە کاتی ڕاستبوونەوەی هۆیەکەیدا، بەڵام لەباری نەبوونی پاساوێکدا وەك تاوانێك تەماشا دەکرا و مێردەکەی ڕووبەڕووی بەرپرسیارێتییەکی گەورە دەکردەوە لەبەردەم خودا و ڕای گشتیدا، ئەمە بە ئاشکرا ڕۆشن دەبێتەوە لە قسەکەی "فەتاخ سوحبەت"-یەکێکە لە کۆنترین ئەدیبەکانی میسر: تۆ ئەی لاو کە ئەم کیژە تازە لاوەت خۆشویستووە، بزانە گەر دوای هاوسەرگیری لەگەڵی وازت لێهێنا گەورەترین تاوانت لەبەردەم خودا و خەڵکیدا ئەنجامداوە)[2]

**دەگمەنی تەڵاق:**

بەهۆی دەستەبەریی داراییانەوە کە گرێبەستی هاوسەرگیری لە ئامێزی دەگرت و تەڵاقی -وەك سزایەکی دارایی- بەسەر هەر کەسێکدا دەسەپاند بەبێ هۆ لە تەڵاق دەچووە بەرەوە، هەروەها بەهۆی هێزی زاڵبوونی ژنان بەسەر پیاواندا تەڵاق لە دۆڵی نیلدا بە درێژایی ماوەیەکی زەمەنی زۆر دەگمەن یان نەبوو بوو.

خاوەنی (المقارنات والمقابلات) دەڵێت: (هەندێ لە لێکۆڵەرانی جێمتمانە لە فەقیهان باسی ئەوەیان کردووە: تەڵاق لای میسرییە کۆنەکان ڕێگەپێدراو بووە، هەر بەو جۆرە فرەیی لە هێنانی ژندا، بەڵام ژنان بە ژیری و لێزانینی خۆیان بەسەر پیاواندا زاڵ بووبوون تا وای لێهاتبوو تەڵاق و فرەیی لە ژندا سڕابوویەوە بە چەندین ڕێگەی لێزانانە کە زاڵبوونی ئەوانی بەسەر پیاواندا دەستەبەر دەکرد و بە ماڵ و سامان دەیانبەستنەوە، بۆیە وای لێهاتبوو پیاوان لەناو لەپی دەستی ژناندا بوون بە حوکمی

---

[1] ينظر الزواج والطلاق في جميع الاديان المرجع السابق ص٥٠٠.

[2] المرجع السابق ص٥٠١.

یاسا)[1].

"سۆلۆ سەقەلی" دەڵێت: (گوێڕایەڵی مێرد بۆ ژنەکەی لە دۆڵی نیلدا لەو مەرجانە بوو بەدەق لە گرێبەستی هاوسەرگیریدا هاتبوو )[2].

کـەوابوو گوێڕایـەڵی مێـرد و دڵسـۆزییەکەی، و زاڵبـوونی ژنـان و لێزانینیـان، و دەستەبەری داراییانە و قورساییەکەی لەسەریان... لە گرنگترین ئەو کۆت و بەندانـە بوون کە "دەسەلاّتی ویست"یان لـە تەلاّقـدا سـنووردار دەکـرد، بـەجۆرێك وایلێهـات دەگمەن بێت و تەنها لە باری پێویسـتدا پـەنای بـۆ ببرێـت، هـەروەها لـەباری چـەند هۆیەکی دیاریکراودا لەوانە ناپاکی هاوسەرگیری.

"وۆڵ دیۆرانت" دەڵێت: (ژیانی خێزانی لە دۆڵی نیلـدا رێکخـراو بـوو، لـە دیـدگای ئەخلاقییەوە و لەڕووی دەسەلاّتی دایك و باوکەوە خاوەنی ئاستێکی بالاّ بوون، تەلاّق زۆر دەگمەن بووە مەگـەر لـە دۆخـی پووکانـەوەدا، بـۆ مێردەکـە هـەبوو ژنەکـە لـە ماڵەکەی دەربکات بەبێ قەرەبووکردنەوەی بە شتێك گەر زینای بکردبایە، بەلاّم گـەر بەبێ ئەم هۆیە تەلاّقی بدابایە ئەوا لەسـەری بـوو بەشـێکی گـەورە لـە موڵـك و مـاڵی خێزانەکەی بۆ تایبەت بکات)[3].

**مافی تەڵاق بۆ ژنەکە:**

ژنی دۆڵی نیل ماف ئەوەی هـەبوو خـۆی لـە مێردەکـەی تـەلاّق بـدات لـە بارێکـدا پاساوێك بوونی هەبوایە، گەر ئەو مەرجەی بۆ خۆی بگرتبایە لـە کـاتی سـەرهەڵدانی گرێبەستی هاوسەرگیری و داوای بکردبایە بەستنەوە و گرێدانی لەدەسـتی ئـەودابێت ئەوا لە کاتی پێویستدا دەیتوانی خۆی تەلاّق بدات[4].

---

[1] ينظر كتاب المقارنات والمقابلات للاستاذ محمدحافظ صبري الطبعة الأولى١٣٢٠هـ/١٩٠٢م ص٣٤٤

[2] ينظر قصة الحضارة تأليف ول ديورانت ترجمة محمد بدران ٩٧/٣.

[3] ينظر قصة الحضارة، المرجع السابق ٩٥/٣.

[4] الزواج والطلاق في جميع الاديان المرجع السابق ص٥٠١.

شایانی باسە ئەو مافە لای فەقیهە موسڵمانەکان بۆ ژنەکە جێگیرکراوە بە هەمان ئەو مەرجە باسکراوە و مەرجی تریش، مێردەکە خاوەنی ئەو مافە بوو یان دەیتوانی دوای هاوسەرگیری ژنەکەی تێدا سەرپشك بکات[1].

**مافی هاوسەرگیری لەگەڵ خزم و کەسی نزیک:**

میسرییە کۆنەکان-بەرهەمی دەستەبەری داراییانەی بڕیارلێدراو بۆ بەرژەوەندی ژنەکە- ئەوپەڕی هەوڵیان دەدا دڵسۆز بن بۆ ژنەکانیان، چونکە ئاست و دەسەڵاتی ئافرەت لای ئەوان باڵاتر بوو لە ئاست و دەسەڵاتی ئافرەتانی گەلانی تر لەو رۆژگارەدا.

لێکۆڵەران ئەم دڵسۆزی و گەردنکەچییەی پیاوان بۆ ژنان وا لێکدەدەنەوە کە ئافرەتی میسری بەپێی گرێبەستی هاوسەرگیری و مەرجەکانی هەموو ماڵ و سامانی مێردەکەی دەکەوتە ژێر دەست، ئەوەش وایکردبوو پیاوانی میسر پاڵبنێت بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ خوشکانیان، چونکە بەو کارەیان دەیانویست میراتی خێزانەکەیان بەدەست بهێنن کە لە دایکەوە دەگوازرایەوە بۆ کچ و نەیان دەویست کەسی بێگانە دەست بەسەر ئەو ماڵ و سامانەدا بگرێت.

هەر بەو جۆرە پادشا لە دۆڵی نیلدا هاوسەرگیری لەگەڵ خوشکی خۆی دەکرد، بەڵکو هەندێ جار روویدەدا کچەکەی خۆی مارە بکات بۆ ئەوەی پارێزگاری بکات لە خوێنی پادشایی پاك و پاڵفتەکراو و دوور لە خەڵتە[2].

**سیستمی دارایی دوو هاوسەرەکە:**

سیستمی دارایی دوو هاوسەرەکە لە دۆڵی نیلدا لەسەر جیاکردنەوەی ماڵ و سامانی هەر یەکێکیان لەویتر بونیادنرابوو، هەروەها سەربەخۆیی هەریەکەیان لە هەڵسوکەوت لە ماڵ و سامانەکەیدا و هەڵسوڕانی بەو جۆرەی دەیەوێت، بەڵام مافی

---

[1] ینظر بدایة المجتهد ونهایة المقتصد لابن رشد ٢/٥٩.

[2] قصة الحضارة المرجع السابق ٢/٩٥.

هەڵسوکەوتی رەها تەنها بۆ ژنەکە بوو نەك بۆ پیاوەکە، بۆیە بۆی هەبوو هەڵسوکەوت لە ماڵ و سامانەکەیدا بکات بەبێ گەڕانەوە بۆ مۆڵەتی مێردەکەی.

بە پێچەوانەی ئەوەوە پیاوەکە هەڵسوکەوتی بۆ نەبوو لە ماڵ و سامانەکەیدا گەر مۆڵەتی پێشینەی لە ژنەکەوە بەدەست نەهێنابایە، ئەوەش لەبەر ئەوەی هەموو ماڵ و سامانەکەی وەك بارمتە وابوو بۆ دەستەبەری پارێزگاری لە پەیوەندی هاوسەرگیری، ئەو ماڵ و سامانە بارمتەکراوە دەچوو بۆ ژنەکە گەر مێردەکەی بەبێ هۆیەك تەڵاقی بدابایە.

هەندێ لە لێکۆڵەران پێیانوایە ئەم سیستەمە داراییە وەك سیستەمی دارایی ژن و مێرد وایە لە فەرەنسا و دەوڵەتانی تری گەلانی لاتینی، بەجۆرێك ئافرەت بۆی هەبوو لە گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەیدا شتێك بە مەرج بگرێت زیانی تەڵاقی لێ بەدوور بگرێت و لەسەر پیاوەکە بوو سزایەکی دارایی پێ بدات گەر تەڵاقیدا، هەروەها بارمتەی گشتی لەسەر هەموو ماڵ و سامانەکەی بۆ هەبوو.

گەر ژنەکەی تەڵاقدا سەرپەرشتیارییەکەی لەسەر کوڕە گەورەکە هەڵدەگیرێت و ئەوکات دەبێت بە بریکاری شەرعی بۆ ژنەکە[1].

**سەردەمی پووکانەوە و ئازادی ویست لە تەڵاقدا:**

میسر مەزنی خۆی لەدەستدا و گەلانی پێشبڕکێکار و ململانێکار پێی یەك لە دوای یەك روویان لە زەوییەکەی کرد، زەوییەکەیان تالاّن کرد و ژیار و شارستانی مادی و مەعنەوییان خاپوور کرد، ساڵی (٩٤٥پ.ز.) لوبییەکان لە خۆرئاواوە هاتن و ئەحباشەکان لە باشوورەوە لە ساڵی(٧٢٢پ.ز.) و ئاشوورییەکان لە باکوورەوە لە ساڵی(٦٧٤پ.ز.)، فارسەکان لە دیواری "سویس" ساڵی(٥٢٥پ.ز.) پەڕینەوە، ئەسکەندەریش لە ساڵی(٣٣٢پ.ز.) لە ئاسیاوە داگیری کرد و هێنایە ژێر

[1] ينظر قصة الحضارة المرجع السابق ٢/٩٥ـ٩٩. تأريخ القانون في مصر تأليف بواقيم ميخائيل ص٢٣ـ٢٥.

فەرمانڕەوایی مەقدۆنیاوە، لە ساڵی(٤٨پ.ز.) قەیسەر دەستی گرت بەسەر ئەسکەندەریەدا و کردی بە پایتەختی میسری نوێ.

لە ساڵی(٣٠پ.ز.) میسر بوو بە ویلایەتێکی پاشکۆ بۆ رۆما بەم جۆرە لە مێژووی کۆن سڕایەوە و دیارنەما[1].

ئەم هێرشە یەك لەدوای یەکانە وایکرد مرۆڤی میسری کاریگەر بێت بە نەریت و بەندوباوی داگیرکەران و وابکات ئافرەتی میسری ئاست و پلە و پایەی خۆی لەدەستبدات کە رۆژگارێك بەسەر ئافرەتانی جیهاندا شانازی پێوە دەکرد و خۆی پێهەڵدەنا، لەوێوە دەسەڵاتی ویستی مێرد بۆ تەڵاق ئازاد بوو، گەر بویستبایە لای خۆی دەیهێڵایەوە، ئەگەر نە، تەڵاقی دەدا، با پاساوێکیش بۆ ئەوە بوونی نەبوایە، بۆیە دیاردەی زۆری تەڵاق و هەڵوەشانی خێزان بڵاوبوویەوە.

جێگەی داخە ئەو دیاردەیە تاکو ئێستا لە میسردا ماوەتەوە سەرەڕای رزگاربوونی لە کۆلۆنیالیزمی بیانی، هەرچەند ئافرەتی میسری هەندێك لە هێز و دەسەڵاتی خۆی بەسەر پیاواندا بەدەست هێناوەتەوە.

باشە بوترێت تەڵاق لە دۆڵی نیلدا تایبەت بە موسڵمانان چووەتە ژێر دەسەڵاتی شەریعەتی ئیسلامەوە لە سەرەتای فەتحی ئیسلامییەوە بۆ ئەو وڵاتە، هەروەها چووەتە ژێر پەیامی مەسیحییەوە لەبەر رۆشنایی مەزهەبی باڵادەستی کاسۆلیك و ئەرسۆزکس و پرۆتستانت تایبەت بە مەسیحییەکان لەو کاتەوەی ئەو ئایینەیان وەرگرتووە، درێژەی ئەمە لە دوو دەروازەی "سێ و چوار"دا بە پشتیوانی خودا باس لێوە دەکەین.

---

[1] قصة الحضارة المرجع السابق ١٨٤/٢.

# بەشی سێیەم:
# تەڵاق لە ڕۆژهەڵاتی دوور

ئەم بەشە چوار باس لەخۆ دەگرێت:

باسی یەکەم تایبەتکراوە بە تەڵاقی هندی کۆن.

دووەم بۆ تەڵاقی چینی کۆن.

سێیەم بۆ تەڵاقی فارسی کۆن.

چوارەم بۆ تەڵاقی یابانی کۆن.

# باسی یەکەم:
# تەڵاقی هندی کۆن

هند یاساڕێژی و شارستانی لە (٣٠٠٠پ.ز.)ەوە ناسیوە و بە فرەیی ئایین و بیروباوەڕ ناسراوە، بە جۆرێك لە زۆریدا لە زمانەکانی هند زۆرترن، بۆیە نامۆ نییە دژیەکی تێدا بێت لە سیستمی هاوسەرگیری و تەڵاقدا.

بەناوبانگترینی ئەو ئایینانە بریتین لە هندۆسی(هندۆکی)[1] و جیینی[2] و بوزی[3] و بەراهیمی و مانەوی.

---

[1] دامەزرێنەرێکی نییە بتوانرێت بچێتەوە سەری وەك سەرچاوەیەك بۆ پەیامەکان و حوکمەکانی، بەڵکو هندۆسییەت ئایینێکە گەشە و گۆڕانی بەخۆوە بینیوە لە کۆمەڵێك نەریت و ترادسیۆنی رێکخەر بۆ ژیانی ئەوە لەدوای ئەوەی ئارییەکان پێکئێت، هەندێ پێیانولیە: هندۆسی فەلسەفە بێت، یان تێڕوانینێکە بۆ ئەودیوی سروشت زیاتر لەوەی ئایین بێت، لەگەڵ ئەوەش بۆ تایەفەیەکی گەورە لە بیروباوەڕ و هەڵوێستی ئایینی بەکاردەهێنرێت. ینظر النظام السياسي في الهند تأليف نورمان د. بالمر. ترجمة وتقديم الدكتور محمود فتح الله تصدير حسن جلال العروصي ص٢٨-٢٩.

[2] دامەزرێنەر و پێشەواکەی بریتییە لە مهاویرا ٩٩٥پ.ز. لە بنەما بنچینەییەکان بۆ پاکێتی رۆح لای جینییەکان بریتییە لە خۆڕزگارکردنەوە بە دە خەسڵەت: لێبوردن، راستگۆیی، راستوەستان، تەولزوع، پاکژی، دەستگرتن بەسەر نەفسدا، زوهد و خۆگرتنەوەی دەرەکی و ناوەکی، و کۆچکردن لە ئافرەتان، و فیداکاری.

[3] دامەزرێنەرەکەی بریتییە لە بودا(سودهاتا)(٥٩٩–٥٤٤پ.ز.) بودا گرنگی بە قسەکردن لەسەر "خودا" نەداوە، بۆیە خۆی لادلوە لە هەر باسێکی لاهوتی و میتافیزیکی، ئەو پێیوابوو رزگاری مرۆڤ لەسەر مرۆڤ وەستاوە نەك لەسەر خودا، پێیوابوو مرۆڤ چارەنووسی خۆی دیاریدەکات، لە قسەکانی: (بۆ خۆتان ببن بە دوورگە کە بۆخۆی راوەستاوە) (بۆ نەفستان ببن بە ئەشکەوت و پەناگا)، هەروەها(پەنا مەبەن بە دالدەی دەرەکی) (كونوا لانفسكم جزائر قائمة بنفسها).

**هاوسەرگیری هندی کۆن:**

بڵاوبوونەوەی سێکسی بەسەر هەندێ لە هۆزە کۆنەکانی هیندا گوزەری کردووە، بۆیە ئافرەتانی هۆزێك موڵکی پیاوانی هەموو هۆزەکە بوون، دوای ئەوەی هەندێ لە بەرەوپێشچوونی بەخۆوە بینی سیستەمی دایکایەتی پیادە کرد و فرەیی مێرد بۆ یەك ژن هاتە ئاراوە، لە پاڵ ئەمەدا جۆرێکی تر لە هاوسەرگیری هەبوو ئەویش تەنهاکەوتنەوەی یەك پیاو بوو لەگەڵ یەك ژن، بەڵام ماوەی ئەم جۆری دووەمەیان کەم و کورت بوو، پیاوی داخوازیکەر ملموانکەیەکی دەکردە گەردنی کچەکە لەسەر ئەوەی لە گەردنی نەکاتەوە، تا ئەو ملوانکەی قبووڵ بوایە و پارێزگاری لێ بکردبایە هاوسەرگیرییەکەیان بەوەوە بەردەوام دەبوو، لێرەوە مافی تەڵاق بۆ ئافرەت هاتە ئاراوە، هەندێ کات چوار مێرد یان پێنج مێردی یەك لە دوای یەکی دەکرد، بۆیە هەر مێردێکی دواتر دەبوا ئەوەی مێردی پێشتر بە ژنەکەی داوە بۆی بگێڕێتەوە[1].

بەم جۆرە ئافرەت بوو بە خانمی راستەقینەی خێزان، هەڵدەستا بە دەسەڵاتی خێزانەکە بە کۆمەکی کچە گەورەکەی، و مێردی هەڵدەبژارد و لێی جیادەبوویەوە بە ئازادییەکی تەواو، بەڵام ئەم دیاردەیە بە تەواوی وەرچەرخانی بۆ دروست بوو لەدوای هاتنە ئارای دەسەڵاتی باوکایەتی لە جێگەی دەسەڵاتی دایکایەتی لەلایەکەوە و دەرکەوتنی ئایینی مانەوی و بوزی و ئایینەکانی تر لە لایەکی ترەوە.

خەسڵەتی گشتی یاساڕێژییەکانی "مانو" دژ بە ئافرەت ئاراستەکرابوو، وەك لە برگەکانی ئەو یاساڕێژییەوە دەردەکەوێ: (سەرچاوەی شوورەیی بریتییە لە ئافرەت، سەرچاوەی ئازارەکان لە هەوڵ و کۆشاندا بریتییە لە ئافرەت، سەرچاوەی بوونی نزمی و پەستی بریتییە لە ئافرەت، بۆیە خۆت لە ئافرەت بپارێزە، دەسەڵاتی ئافرەت لەم ژیانەدا تەنها لەوەدا کورتنابێتەوە کەسی گەمژە لە رێگەی دروست لادەدات، بەڵکو دەسەڵاتی ئەوەی هەیە کەسی داناش لابدات..)[2].

---

[1] الزواج والطلاق في جميع الأديان المرجع السابق ص٥٤٨ـ٥٤٩.

[2] قصة الحضارة المرجع السابق ٣/١٧٨.

لە پەیامی هیندۆسیدا: ئافرەت دەژی و هیچ هەڵبژاردەیەکی بۆ نییە، یەکسانە منداڵێکی بچووك بێت یان کچێکی لاو، یاخود پیرەژنێك بێت، کچ لەژێر هەڵبژاردەی باوکیدایە، ئافرەتی شووکردوو لەژێر هەڵبژاردەی مێردەکەیدایە، بێوەژن لەژێر هەڵبژاردەی کوڕەکانیدایە، هەرگیز بۆی نییە سەربەخۆ ببێت[1].

ئاینی بوزی دواکەوتووتر و زۆردارانەتر بوو لە تێڕوانینی بۆ ئافرەت، وەك لەم گفتوگۆیەوە لە نێوان بودا و ئامۆزاکەیدا(ئەنەندا) ڕۆشن دەبێتەوە:

ئەنەندا: چۆن مامەڵە لەگەڵ ئافرەتدا بکەین ئەی گەورە و سەروەرمان؟

بودا: تەماشایان مەکە.

ئەنەندا: بەڵام گەر ناچاربووین تەماشایان بکەین؟

بودا: قسەیان لەگەڵ مەکەن.

ئەنەندا: بەڵام گەر قسەمان لەگەڵ کردن؟

بودا: کەوابوو ئاگات لە خۆت بێت، گەر ئافرەتمان لە ئامێز نەگرتبایە ئاینی پاڵفتە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ دەمایەوە، بەڵام ئێستا و دوای هاتنە ناوەوەی ئافرەت بۆ نێوانمان پێموانییە ئاینی پاڵفتە زۆر درێژە بکێشێت[2].

**تەڵاق لە پەیام و نەریتی هندۆکییەکاندا:**

پەیامی هندۆکییەکان(هندۆسییەکان) بڕیاری لەوە داوە ئافرەت پێویستە ڕازی بێت بەوەی باوکی وەك هاوسەر بۆی هەڵدەبژێرێت و بە درێژایی تەمەنی خزمەتی بکات و لە دوای مردنی مێردەکەی بیر لە پیاوێکی تر نەکاتەوە، با مێردەکەشی گرنگی پێ نەدات و بزانێت ئافرەتێکی تری خۆشدەوێت نابێت ڕقی لێ هەڵبگرێت، و کەمتەرخەمی نەکات لە خزمەتی و بەدەستهێنانی ڕازیبوونی، چونکە بەهەشتی ئافرەت بە ڕازیبوونی مێردەکەیەوە گرێدراوە.

---

(1) مقارنة الاديان (اديان الهند الكبرى) المرجع السابق ص٧٢.

(2) مقارنة الاديان المرجع السابق ص١٧٥ـ١٧٦.

گەر پیاوێك بە ئافرەتێکی شەڕەنگێزی فێڵبازی دڵڕەق.. گرفتار بوو ئەوا بۆی هەیە تەڵاقی بدات و لە ماڵەکەی دەریبکات، گەر هۆیەك نەبێت تەڵاق بسەپێنێت ئەوا جیابوونەوە دەستەبەر نابێت، بەڵکو پێویستە لەسەریان بە خۆشەویستی و وەفاوە لەگەڵ یەکتر بژین، چونکە کاتێك بە ناوی خوداوە بوون بە هاوسەری یەکتر بۆ ئەوە نەبوو لەیەکتر جیاببنەوە و رق و کینە بکەوێتە نێوانیانەوە[1].

لە رێنموونییەکانی هندۆکییەکاندا: هاوسەرگیری پیرۆزی بیروباوەڕە و نابێت پێشێلکاری تیادا بکرێت، ئافرەتی بەدکار دەتوانرێت لە پلە و پایەی بێبەش بکرێت و لە تایەفەکەی دەربکرێت، بەڵام تەڵاق بە مانا ئاساییەکەی تەنانەت لەو بارەشدا ئەستەمە، ژنەکە ناتوانێت پەیوەندییەکی نوێ ببەستێت، هەروەها بۆیشی نییە لە ماڵی مێردەکەیدا بمێنێتەوە لەسەر ئەو بنچینەی کەنیزەك بێت، وەك یاسای حامورابی یاسارێژی بۆ کرد بوو.

تەنها چارەسەرێك لە دەستی ژنەکەدا بۆ ئەوەی لۆمە نەکەوێتە سەری دژ بە مێردەکەی کە رقی لێیەتی و سوکایەتی پێ دەکات ئەوەیە مۆڵەتی جیابوونەوەی لێوە بەدەست بهێنێت، ئەم مۆڵەتی جیابوونەوە وەك بڕیاری قەزاییانە وایە بە جیابوونەوەیان، لەگەڵ ئەوەش تەڵاق کە بە رێکەوتنی ژن و مێردەکە دێتە ئاراوە یاسای هندۆکییەکان دانی پیادا دەنێت یەکسانە نەرێتەکەیان رێگەی پێ بدات یان نە[2].

**تەڵاق لە یاسارێژییەکانی "مانۆ"دا:**

ئەم یاسایە فەرمان دەکات دایك و باوك کاروباری هاوسەرگیری کوڕەکەیان لەدەست بگرن بەر لەوەی ئارەزووی جووتبوون زاڵ ببێت بەسەریدا، و خۆی هەڵبداتە ناو هاوسەرگیرییەکەوە چارەنووسەکەی بێهیوایی و تاڵاوی رەشبینی بێت، "مانۆ"

---

(1) المرجع السابق ص٧٢ـ٧٣.

(2) ينظر قصة الزواج تأليف (ادوارد وسترمارك) ترجمة عبد المنعم الزيادي ص٢١٠.

هاوسەرگیری "جانزرفا"(هاوسەرگیرییەك بە ڕێكەوتنی ژن و پیاوەكە بەبێ مۆڵەتی دلیك و باوك) بەم جۆرە وەسف دەكات: "بریتییە لە لەدایكبوونی حەز و ئارەزوو".

دەڵێت: باشترین هاوسەرگیری كە مایەی بەردەوامییە و رووبەڕووی روخان نابێتەوە بریتییە لەو هاوسەرگیرییەی باوكان بەڕێوەی دەبەن و هەموو ڕێساكانی هاوسەرگیری لە ناوەوە یان لە دەرەوە تێدا رەچاو دەكەن، گەنجان دەبێ لەناو چینە كۆمەڵایەتییەكەی خۆیدا هاوسەرگیری بكات، بەڵام لە دەرەوەی كۆمەڵە خێزانییەكەیەوە ژنەكەی هەڵدەبژێرێت، مەبەستی بەوە هاوسەرگیرییە لەگەڵ بێگانە جیا لە كەسوكاری، لەوانەی لەڕووی كۆمەڵایەتییەوە لە ئاستی ئەودان تاكو هاوسەرگیرییەكەیان دووربێت لە روخان بەهۆی تەڵاقەوە.

یاسای مانۆ بڕیار دەدات دەبێت ژن مێردەكەی خۆی خۆشبوێت، بەڵام لە مێرد چاوەڕوان ناكرێت خۆشەویستی بۆ ژنەكەی نیشان بدات، بەڵكو تەنها چاودێری باوكانە بەسە بۆ ئەو، چونكە خێزانی هندی چووەتە ناو كرۆكی شێوازی باوكانەوە، باوك بریتییە لە سەرداری سەروەری كامڵ بەسەر ژنەكەی و منداڵەكانی و كۆیلەكانیدا.

یاسای مانۆ فەرمان بە ژن دەكات بە ئەدەب و ترسەوە لەگەڵ مێردەكەی گفتوگۆ بكات و بە "سەردارم" یان "گەورەم" یان "خودانی من" بانگی بكات.

لە یاسای مانۆدا ئەوەی تەڵاق پاساو دەدات و ڕێگەی پێ دەدات تەنها یەك هۆیە ئەویش بریتییە لە ناپاكی هاوسەرگیری، مێرد ژنەكەی تەڵاق دەدات گەر ناپاكی لێ كرد، بەڵام ژنەكە ناتوانێت تەڵاق بدات یان داوای تەڵاق بكات گەر پیاوەكە ناپاكی لێ كرد، هەروەها بۆ مێرد هەیە ژنی دووەم بهێنێت بەسەر ژنەكەیدا(بەڵام تەڵاقی نەدات) گەر ژنەكە ئارەقی دەخواردەوە، یان نەخۆش بوو، یان گوێڕایەڵی مێردەكەی نەبوو، یان دەستبڵاو بوو یان شەڕەنگێز بوو.

**سووتاندنی ئافرەت لەگەڵ مێردەکەی دوای مردنی مێردەکەی:**

بـۆ پێـداگری و دڵنیابوونــەوە لەســەر پەیوەســتبوونی چارەنووســی ژن بــە پیاوەکەیەوە لە هندستان نەریتی ژن سوتان لەگـەڵ جەسـتەی مێردەکـەی لـە دوای مردنی پیاوەکە بلاو بوویەوە، چونکە دەبێت لە ژیانەکەی تردا بگەڕێتەوە بۆ لای.

"ویل دیورانت" دەڵێت: (نەریتی بێوەژن سوتان بـەو کۆمـا ئـاگرەی مێردەکـانی لەسەر دەسوتێنرێت هاتە ناو هندییەکانەوە، لە سەرەتاوە بەراهیمەکان بەرهەڵستیان دەکرد بەلام پاش ماوەیەك دەقیان لەگەڵ گرت و قبوولیان کرد، دواجار پیرۆزییەکی ئایینییان بەبەردا کرد تاکو بپارێزرێت لە یاریکردن پێی، ئەوەش بەوەی پەیوەستییان کرد بە هەتاهەتایی بوونی پەیوەندی هاوسەرییەوە، بۆیە گـەر ئافرەتێـك مێـردی بـە پیاوێك بکردبایە ئەوا لەســەری بـوو لەگـەڵی بمێنێتــەوە و لـە ژیانەکـەی داهاتووشـدا پەیوەندی هاوسەرگیرییان بۆ بگەڕێتەوە)[1]، بەلام ئەم نەریتە کەم بوویەوە و دواجار کۆتایی پێهات بەهۆی چوونی ئیسـلام بـۆ ولاتــی هنـد و تێکـەڵبوون لەگـەڵ جیهـانی شارستانیدا.

**مامەڵەی باش لەگەڵ ئافرەت لە ڕێنموونییەکانی ئایینی هندیدا:**

سەرەڕای ئەوەی ڕێنموونییەکانی ئایینی هندی لەسەر ئافرەت پێویستی دەکـات بە شێوەیەکی تێر و تەواو گەردنکەچـی مێردەکـەی بێـت لەگـەڵ ئـەوەش فـەرمانی کردووە بە مامەڵەی باش لەگەڵی:

لە یاسارێژییەکانی مانۆدا هاتووە: (دروست نییە لە ژن بدرێت با بە گوڵیش بێت)

لە دروشمەکانی هندۆس: (ئەو خێزانەی ڕێز لە ئافرەت دەگرن خواوەنـدەکان بـە سۆز و بەزەیی تایبەتیان دەکەنەوە، بەلام ئەو خێزانانەی سـووك تەماشـای ئـافرەت دەکەن چاکەکانیان بە بێ پاداشت دەڕۆن)[2]

---

[1] المرجع السابق ٣/١٨١.

[2] قصة الحضارة المرجع السابق ٣/١٧٢ وما بعدها.

**ئەنجامگیری:**

لەم خستنە رووەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی ژیانی هاوسەرداری لە هندی کۆندا بە سیٚ قۆناغدا گوزەری کردووە:

١-لە قۆناغی یەکەمدا هاوسەرگیری و تەلاق بوونی نەبووە، بەلکو جووتبوونی بە کۆمەلٚ هەبووە لەلای هەندێکی کەم لە هۆزەکان.

٢-لە قۆناغی دووەمدا تەلاق بە دەستی ژنەکە بووە و لە پیاوەکە جیادەبوویەوە و مێردی بە پیاوێکی تر دەکرد، ئەمە لە قۆناغی دەسەلاتی دایکسالاریدا بووە.

٣-لە قۆناغی سێیەمدا: کە بریتییە لە قۆناغی زالبوونی ئایینەکان و دەسەلاتی باوکسالاری تەلاق کۆتوبەند کراوە و لە چەند بارێکی تایبەتی دیاریکراودا ئەنجامدراوە کە ئەمانەن:

أ.باری سەلماندنی ناپاکی هاوسەرگیری لە ژنەکەوە.

ب.تەلاقی رێکەوتن بە رێکەوتنی ژن و پیاوەکە.

ج.بەدەستهێنانی تەلاق لەلایەن ئافرەتەکەوە بە جیابوونەوەی قەزاییانە لەباری خراپی مامەلەی مێرد لەگەلٚ ژنەکەیدا.

د.کاتێك ژنەکە شەڕەنگێز و دلڕەق بێت.

# باسی دووەم:
# تەلاقی چینی کۆن

ئـاییني ناسـراو لای چـينييه کۆنـەکان پـێش ئيسـلام بریتییـە لـە ئـاییني "کۆنفۆشیوسـی"[1] و ئـاییني لاوتسـو(تاوییەکان)[2] و ئـاییني بوزی(بـودا) کـە لـە سەرەتای سەدەی سێی پێش زایین چووەتە چینەوە بەهۆی بازرگانە هندییەکانەوە.

له ساڵی ٧٠٦ی زاییني پێشەوای ئیسلامی (قتيبة بـن مسـلم البـاهلي) چـووه نـاو وڵاتی چینەوە و فەتحی کرد، چاخی عەباسییەکان کۆتایی نەهاتبوو ئیسـلام شـان و شکۆیەکی مەزنی له چین پەیدا کرد.

**هاوسەرگیری چینی کۆن:**

باوکی مێردەکە بەر لەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری بۆ کوڕەکەی بکات دەچوو بۆ لای باوکی کچەکە و داوای ناوی کچەکە و ڕۆژی لەدایکبوونی دەکرد، پاشان بەراوردی دەکرد لە نێوان ناوی کچەکە و ناوی کوڕەکەی و ڕۆژی لەدایکبوونیدا، گـەر بـەختیان تەبا و گونجـاو بوایـە لەگـەڵ یـەکتر لـە گرێبەسـتی هاوسـەرگیرییەکە بـۆ کوڕەکـەی دەچووە بەرەوە ئەگەر نە، نەدەچووە پێشەوە.

---

[1] درلوەتە پاڵ کۆنفۆشیوس(٥٥١–٤٧٨پ.ز.) شوێنی لەدایکبوونی شاری(تشو–فو)ە. أنظر قصة الحضارة ٤١/٤.

[2] هاوچەرخی کۆنفۆشیوس بوو، مەزهەبێکی لەدوای خۆی بـەجێهێڵا بـەناوی(تاوی) وەك دانـەپاڵ ناوەکـەی(تاو) بـە مانـای ڕێگـە، مەزهەبەکـەی لەسـەر پاکبوونـەوەی دەروون و داڕنـینی لـە ئارەزووەکان وەستاوە. أنظر الاسرة في الشرع الاسلامي للاستاذ عمر فروخ ص٢٤.

کاتێك هەڵبژاردنیان دەکەوتە سەر کچەکە کەسوکاری کوڕەکە(ژنانیان) لەگەڵ کچەکە دەچوون بۆ حەمام بۆ بینینی جەستەی کچەکە، لە کاتێکدا ئەو پۆشاکی بە بەرەوە نەبوو.

لەدوای ئەوە مێردەکە مارەییەکەی دەدا بەبێ ئەوەی رێگەی پێ بدرێت بووکەکەی خۆی ببینێت، لە رۆژی دیاریکراو بۆ گواستنەوەی نزیك بە ماڵی بووك دوو سینی پڕ لە گەنم و جۆ دادەنران لە ئاهەنگێکی مەزندا کەس و کار و خانەوادەیان لەم گەنم و جۆیەیان دەکرد بە سەریاندا تا دەگەیشتنە ماڵی زاوا، هەردوو پێکەوە لەسەر سفرەیەك دادەنیشتن و هەندێکیان لێ دەخوارد، بەوەش گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەیان تەواو دەبوو[1].

شایانی باسە کۆنفۆشیوس پێیوابوو شتێك لە دژیەکی لە نێوان فەلسەفە و هاوسەرگیریدا بوونی هەیە.

کۆنفۆشیوس لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا ژنی هێناوە و لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا تەلاقیداوە، لێکۆڵەران پێیانوایە جارێکی تر هاوسەرگیری نەکردۆتەوە[2].

**پلە و پایەی ژنی چینی:**

ژنی چینی بۆ مێردەکەی بە کۆیلەکرابوو، گەر خراپ مامەڵەی لەگەڵ مێردەکەی بکردبایە بە لێدانی سەد دار سزا دەدرا، لە کاتێکدا هیچ سزایەك لەسەر خراپ مامەڵەکردنی پیاوەکە دانەنرابوو.

خانمی چینی(بان هو) –لە نامەیەکدا کە پلە و پایەی ئافرەتی ئەو کاتەی تێدا باس دەکات– دەڵێت: (ئێمەی ئافرەت دوایین پێگە لە رەگەزی مرۆیی داگیر دەکەین، ئێمە لاوازترین بەشی مرۆڤین، بۆیە دەبێت چارەنووسمان خراپترین و بێڕێزترین کار بێت چەند دادپەروەر و راستگۆیە ئەوەی دەیڵێت لە کتێبی "یاسای

---

(1) الزواج والطلاق في جميع الاديان المرجع السابق ص٥٥٨.
(2) ينظر قصة الحضارة ٤١/٤.

دوو رەگەزەکە"دا: گەر ئافرەت پیاوێکی هەبوو دڵی پێی رازی بوو پێویستە ژنەکە بەدرێژایی تەمەن لەگەڵی بمێنێتەوە، هەروەها گەر ئافرەت مێردێکی هەبوو دڵی پێی رازی نەبوو پێویستە بەدرێژایی تەمەن لەگەڵی بمێنێتەوە)[1].

شایانی باسە ئافرەتی چینی پلە و پایەیەکی بەرزی هەبووە لەو سەردەمانەی دەسەلاتی دایك لە خێزاندا لە دەسەلاتی باوك بالاتر بوو، دوای ئاوەژووبوونەوە(پێچەوانەبوونەوە)ی ئەم دیاردە کۆمەلایەتییە و جێگرتنەوەی دەسەلاتی باوکسالاری بۆ دەسەلاتی دایکسالاری و هاتنی ئایینی کۆنفۆشیوسی بە شێوەیەك پلە و پایەی ئافرەت وردە وردە پووکایەوە تا کارەکە گەیشتە ئەوەی رێگریان لێ بکەن لە یەك ژووردا لەگەڵ پیاوان بژین یان پێیان تێکەڵ بن، بۆیە ژن لە پیاو دابڕابوو تەنانەت لە ماڵی هاوسەریدا.

سەرباری ئەوە پێویست بوو لەسەری بە درێژایی تەمەنی بە بێوەژنی بمێنێتەوە گەر مێردەکەی بمردبایە، بەڵکو هەندێ جار داوای لێدەکرا خۆی بسووتێنێت وەك رێزلێنانێك لە مێردەکەی[2]

## تەلاقی چینی کۆن:

سەرەرای ئەوەی ژنی چینی لەسەر گەردنکەچی تەواو بوو بۆ مێردەکەی لەگەڵ ئەوەش پیاو ئازاد نەبوو لە دەرکردنی ژنەکەی لە ماڵەکەی یان تەلاقدانی، بەڵکو پیاوەکە بە سەد دار سزا دەدرا گەر تەلاقی بدابایە یان دەریبکردبایە بەبێ ئەوەی ژنەکە پەیوەندی هاوسەرگیری-بە تاوانێك یان هەر کارێکی تر- بشێواندبایە، یان بەبێ ئەوەی هۆیەك لە هۆیەکانی پاساودەر بە تەلاقی بۆ پیاوەی دروستبکردبایە.

ئەو هۆیانەی مافی تەلاقی ژنەکەی بە پیاو دەبەخشی ئەمانە بوون:

١-نەزۆکی(منداڵ نەبوون)

---

[1] قصة الحضارة ٢٧٣/٤.

[2] الزواج والطلاق في جميع الاديان ص٥٦٣.

٢-لادان(ناپاکی لە هاوسەرگیری)

٣-ڕێزنەگرتن لە دایك و باوکی مێرد.

٤-دزی(دزینی شتێك لە مێردەکەی)

٥-دڵپیسی(دڵپیسی لێی لە هاوسەرگیری مێردەکەی لەگەڵ ئافرەتێکی تر)

٦-نەخۆشی کوشندە کە هیوای چاکبوونەوەی لێ نەدەکرا.

٧-ئاکاری شك و گومان

٨-زماندرێژی(زۆری قسە بە دووبارەکردنەوە و تێکەڵ کردن)[1].

سەرەڕای ڕاستبوونەوەی یەکێك یان زیاتر لەم هۆیانە-جگە لە ناپاکی هاوسەرداری- تەڵاق بە تەواوی ڕەد دەکرایەوە لەم بارانەدا:

أ.گەر ژنەکە سێ ساڵ خەم و نیگەرانی دایك و باوکی مێردەکەی داگیری کردبێت.

ب. گەر ژنەکە ژیانی لەگەڵ خێزانەکە هەڵبژاردبێت لەو کاتەوەی مێردی کردووە لە باری هەژاریدا، بەوەی ویستبێتی لەناو خێزانەکەدا بمێنێتەوە لەباری نەبوونی و نەدارییدا، وەك چۆن مانەوەی پێ باش بێت لەباری دەوڵەمەندیدا.

ج-گەر ژنەکە باوك یان دایکی لە ژیاندا نەمابوون بتوانێت بگەڕێتەوە بۆ لایان.

نهێنی نادروستی تەڵاق لە دوو حاڵەتی یەکەمدا بۆ ئەو بیرۆکەیە دەگەڕێتەوە کە ژنەکە ئازار و مەینەتی هەژاری و بێبەش بوونی لەگەڵ مێردەکەیدا چەشتووە تا ئەو ڕادەیەی ماف گرنگپێدانی لەلایەن مێردەکەیەوە پێ دەدرێت.

بەڵام تەنانەت بە بوونی ئەو سێ بارە ژنەکە لە تەڵاقدان ناپارێزێت گەر گوناهی بەدڕەفتاری(ناپاکی هاوسەری) ئەنجامدا، بەڵکو مانەوەی ئەو پیاوە لەگەڵ ئەو جۆرە ئافرەتەدا ڕووبەڕووی سزای دەکردەوە[1].

---

[1] قصة الزواج المرجع السابق ص٣٠٤.

الزواج والطلاق في جميع الاديان ص٥٤١-٥٦٢.

سەرباری ئەو هەشت هۆ باسکراوەی پاساودەر بە تەڵاق شێوازێکی تری ڕێگەپێدراو هەبوو ئەوەش بریتی بوو لە تەڵاق بە ڕێکەوتنی دوو هاوسەرەکە، ئەمە ئەوەیە ئایینەکان و یاساکان دانیان پێداناوە بەدەر لە جیهانی کاریگەر بە مەزهەبی کاسۆلیکی لەدوای بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی، وا دەردەکەوێت–بە باوەڕی من–ئافرەتی چینی ڕێگەی پێ نەدراوە مێردەکەی تەڵاق بدات یان داوای جیابوونەوە بکات(جیابوونەوەی قەزاییانە).

# باسی سێیەم:
# تەڵاقی فارسی کۆن[2]

ئایینەکانی فارس زۆرن بەناوبانگترینیان:

١–**زەردەشتی:** زەردەشت یان زەرادەشت یان زەرشتر لەدوای ئایینی مەجوسی(٦٦٠–٥٨٣پ.ز.) هاتووە.

لە پەیامەکانی: (بە ئەندازەی کار و کردەوەکانی مرۆڤ لە ژیانیدا پاداشت و سزا لە ژیانەکەی تر وەردەگرێت لە ڕۆژی دواییدا)

"وۆل دیورانت" دەڵێت: (کاتێك زەردەشت هات فارسەکان "مەسرا"(خودای خۆر) و "ئەنیتا"(خودای فەڕ و پیت و زەوی) و "هوما"(گای پیرۆز)یان دەپەرست.

زەردەشت لە مەجووس راپەڕی و ئازایانە کە هیچی لە هاوچەرخەکانی خۆی وەك "عاموس" و "ئەشعیا" کەمتر نەبوو رایگەیاند لە جیهاندا تەنها یەك خودا بوونی هەیە

---

(1) أنظر ادولرد وسترمارك: قصة الزواج المرجع السابق ص٣٠٤، ٣٠٥ ول ديورانت: قصة الحضارة المرجع السابق ٢٧١/٤، المقارنات والمقابلات المرجع السابق ص٣٥٨، قانون الصين تأليف تونجي خانكدي لمبراطور الصين ترجمة سعيد العسلي الطرابلسي الشامي طبعة ١٩٠٦م، ١٣٢٤هـ.

(2) فارسەکان: ئەوانەی لە ئێریان–فیجو(واتە نیشتمانی ئارییەکان) ژیان کە ئێستا پێی دەوترێت ئێران.

ئەویش بریتییە لە "ئاهورا–مەزدا"(خودای نوور و ئاسمان)، کۆمەڵێك نووسراوی لێ بەجێماوە پێی دەوترێت ئاڤێستا(یان ئەبستان)[1]، لەم ئایینەدا ئافرەت پلە و پایەیەکی بەرز و مەزنی هەبووە و بۆی هەبووە ئەرکەکانی کەهەنوت لەدەست بگرێت.

٢–**مانەوی:** مانی(٢١٥ز.) بەدەرکەوت، مەزهەبەکەی تا سەدەی دەی زایینی مایەوە، زۆر لە ڕێنموونییەکانی زەردەشت دەرنەچووە، کتێبێکی هەیە بە ناوی"زرماساسترا" بە شەریعەتی مانو ناسراوە.

٣–**مەزدەکی:** مەزدەك(٤٨٧ز.) پەیدابووە، لە بنەماکانی ئەوە بوو مرۆڤ بە یەکسانی لەدایك بووە و دەبێت بە یەکسانی بژین، هاوسەرگیری نێوان کەسوکاری بە ئاوەڵا(موباح) دادەنا، بەڵکو باوەڕی بە هاوبەشی ژن و ماڵ و سامان هەبوو[2].

لە ساڵی ٦٥١ی زایینییەوە وڵاتی فارس هاتە ژێر دەسەڵاتی حوکمی ئیسلامییەوە.

**هاوسەرگیری فارسی کۆن:**

فارسە کۆنەکان فرەیی ژنیان لا پەسەند بوو لە نێوانیاندا ژنی سەرە(تایبەت و قەشەنگ) ئەوەش زۆرجار بریتی بوو لە ژنی یەکەم، ژنی قەشەنگ بەڕێوەبەری ماڵ بوو، لە جێگەی پیاوەکە دادەنیشت لە بەڕێوەبردنی ماڵ و سامانی خێزان و لە کاتی تووشبوونی بە نەخۆشییەکی ئەقڵی.

لە هەندێ لە ئایینەکاندا وەك مەزدەکی ڕێگە بە هاوسەرگیری کەسوکار دراوە، لەوانە باوك کچەکەی خۆی دەهێنا و کوڕ دایکی دەهێنا و برا خوشکی مارە دەکرد.

لەلای فارسە کۆنەکان کچ بۆی نەبوو هاوسەرەکەی خۆی هەڵبژێرێت بەڵکو باوك یان ئەو کەسەی لە جێگەی باوك دادەنیشت لە سەرپەرشتیاریدا هەڵدەستا بە هەڵبژاردنی مێرد بۆ کچەکە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ناچار نەدەکرا بەو هاوسەرگیرییە،

---

(1) ينظر قصة الحضارة ٢/٤٢٤ـ٤٢٦. وتعرف هذه الكتب عند العالم الغربي باسم (الزند ـ أبستا) بناء على خطأ وقع فيه احد العلماء المحدثين.

(2) ينظر قصة الحضارة ٢/٤٣٨ وما بعدها. الزواج والطلاق في جميع الاديان: المرجع السابق ص٥٣٥ـ٥٣٦، فجر الاسلام للاستاذ احمد أمين ص٩٨ـ١١٢.

زۆرجار داخوازی لە منداڵییەوە دەستی پێ دەکرد و لە تەمەنێکی زوودا هاوسەرگیری رێکدەخرا.

لەسەر پیاوەکە پێویست بوو بڕێك لە ماڵ و سامان بدات بە باوکی کچەکە، هەروەها بۆی هەبوو لە هەندێ باردا ئەو بڕە لە ماڵ وەربگرێتەوە لەوانە لەباری نەزۆکی ئافرەتەکە، بۆ نموونە، بۆ پیاوەکە هەبوو ژنەکە بکات بە هاوبەشی خۆی لە ماڵ و سامانەکەیدا، هەروەها بۆی هەبوو ئەو هاوبەشییە هەڵبوەشێنێتەوە هەرکات بیەوێت.

لەدوای هاوسەرگیری شایستەبوونی هەستان بە کاری خێر و چاکە لە ژنەکەوە دەگوێزرایەوە بۆ پیاوەکە.

**تەلاقی فارسی کۆن:**

سیستمی تەلاق لای فارسەکان سەرلەبەر جیاوازی هەبوو لە سیستمی تەلاق لە شەریعەتەکانی تری ئەو سەردەمە، تەلاق لای ئەوان وەك کارێك نەبوو پەیوەندی هاوسەرگیری بەیەکجاری کۆتایی پێ بهێنێت، بەڵکو دەتوانین وێنای تەلاق لەلایان بەم حاڵەتانە بکەین:

١- **تەلاق لەگەڵ پێدانی ئازادی هەڵسوکەوت:** گەر پیاو بە ژنەکەی خۆی بوتبایە: "تۆ تەلاقدراوی لە ئێستاوە دەتوانی هەڵسوکەوت بکەیت ئازادانە لە خودی خۆتدا" ئەمە مانای ئەوە نەبوو ژنەکە دەگەڕێتەوە بۆ باری یەکەمجاری کە لەسەری بوو پێش هاوسەرگیری لە پلە و پایەی کۆمەڵایەتی نێوان ئافرەتان، بەڵکو بە مۆڵەتێك دادەنرا ژنەکەی ببێت بە خزمەتکاری مێردێکی تر.

٢- **تەلاق بەبێ ئازادی:** گەر تەنها تەلاقدان بوایە، بە شێوەیەکی راشکاوانە مافی هەڵسوکەوتی لە خودی خۆیدا پێ نەدابایە، ئەوا مافی ئەوەی هەبوو مێرد بکاتەوە، بەڵام منداڵەکانی لە مێردە نوێیەکەی بە منداڵی مێردەکەی یەکەمی دادەنرا گەر ئەو کاتەی لەدایك دەبن مێردی یەکەم لە ژیاندا بوایە، ئەمەش مانای ئەوەیە مانەوەی پەیوەندی ژنەکە لەگەڵ مێردی یەکەمی بەهێزتر بووە.

**٣-تەڵاق بە ڕێگەی دابەزین:** بۆ مێردەکە هەبوو بە پاڵنەری چاکە و خۆبەخشی بۆ برا ئایینییەکەی لە ژنەکەی دابەزێت، ئەگەر برا ئایینییەکەی هەژار کەوت بەبێ کەمتەرخەمی لە ئەوەوە، و ئاتاج بوو بە هاوکاری ژنێك یارمەتی بدات لەسەر بەدەستهێنانی پارووەنانی ژیان و چاککردنی باری گوزەرانی.

ئەم دابەزینە بە گرێبەستێکی یاسایی ئەنجام دەدرا و مێردە نوێیەکە پەیمانی دەدا هەستێت بە چاکە و چاودێری لەگەڵ ژنەکە و دەستنەبردن بۆماڵ و سامانەکەی.

شایانی باسە ڕازیبوونی ژنەکە لەم دابەزینەدا بە مەرج نەگیرابوو[١]

وا دەردەکەوێت ئەم کارە لە یەك کاتدا تەڵاق و هاوسەرگیری کاتی بووبێت، بۆ مێردی یەکەم هەبووبێت ژنەکەی بگێڕێتەوە گەر مێردە نوێیەکەی ئاتاجییەکەی خۆی پێ تەواو کرد.

لێرەوە ئاشکرا دەبێت پەیوەندی هاوسەرگیری ژنەکە لەگەڵ یەکەمین مێردیدا لەم باری سێیەمەدا(گەڕانەوەی بۆ لای مێردی یەکەمی) بەهێزتر بووبێت لە دوو بارەکەی تر.

لەوەی باسمان کرد تێدەگەین پیاوی فارسی خاوەنی ئازادی ویست بووە لە تەڵاقدانی ژنەکەی و هەڵسوکەوت پێیەوە چۆنی بوێت.

---

[١] ینظر كتاب قادة الفكر في الشرق والغرب تأليف حامد عبد القادر ص٩٢. فجر الاسلام احمد امين ص٩٩ وهو ينقل عن جاكسون. الزواج والطلاق في جميع الاديان، المرجع السابق ص٥٣٥ وما بعدها. ايران في عهد الساسانيين للدكتورين: يحيى الخشاب، وعبد الوهاب عزام ص٣٠٨. الاسرة في الشرع الاسلامي: المرجع السابق ص٢٥. قصة الحضارة المرجع السابق ٢/٤٤٠ وما بعدها.

# باسی چوارەم:
# تەلاق لە یاباندا

یابان یەکێکە لەو گەلانەی لە ژیار و شارستانێتدا کۆنن، شارستانییەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ(٣٠٠پ.ز.)، بە فەلسەفە و زانست و هونەر و پیشەسازی بەناوبانگ بووە، لە کۆمەڵێك دوورگە پێکدێت لە ڕۆژهەڵاتی چینەوە لەناو دەریای ئارامدا کە بە ڕۆژهەڵاتی دوور ناسراوە.

**ئایین:**

یابانییەکان بە عیبادەتی هێزی سروشت بەناوبانگن، بۆیە خۆر و هەسارەکان دەپەرستن، چونکە نوور و ڕۆشناییان پێ دەبەخشن، هەروەها پەرستنی دارستان چونکە ڕۆزی لێوە بەدەست دەهێنن.

ئایینی یەکەم بریتییە لە "شەنتەوی" کە لەسەر عیبادەتی ڕۆحی مردووەکان و هێزی سروشت بیناکراوە، بەدوایدا ئایینی بوزی دێت کە ساڵی (٥٥٢ ز.) چووەتە یابانەوە، پاشان ئایینی مەسیحی لە ڕێگەی دەستە مزدەدەرەکانی مەسیحییەوە گەیشتنە ئەو وڵاتە، هەیانە مەزهەبی کاسۆلکی وەرگرتووە، هەشیانە خۆیانداوەتە پاڵ مەزهەبی پرۆتستانتی[1].

بەڵام مەسیحییەکان -گەر بەراورد بکرێن بە شوێنکەوتەی ئایینەکانی تر- زۆر کەمن.

---

[1] ینظر دائرة معارف القرن العشرين ٩٠١-٨٨٧/١٠، قصة الحضارة: المرجع السابق ٤٥/٥ وما بعدها.

**هاوسەرگیری:**

پیاوی ئاسایی لە گەلی یابانی بەزۆری تەنها یەك ژنی دەهێنا، منداڵەکانی چینی باڵا بۆیان هەبوو خۆشەویستی ئافرەتیان هەبێت، ئیمپراتۆر مافی ئەوەی هەبوو چەندی بوێت مارەی بکات، و چەند کەنیزەك ئارەزوو دەکات بەدەستیان بهێنێت، ئافرەتی یابانی خاوەنی ئازادی تەواوی خۆی بووە تا بیردۆزەی چینییەکان لە ناویاندا پەرەیسەند لە گەردنکەچبوونی ئافرەت بۆ پیاو، بۆیە ناچارکران بە سێ جۆر لە گوێڕایەڵی: گوێڕایەڵی بۆ باوك و مێرد و کوڕ، دەسەڵاتی باوك بوو بە دەسەڵاتێکی زۆردارانە، بۆی هەبوو مێردی کچەکەی یان ژنی کوڕەکەی لە خێزانەکە دەربکات.

ناپاکی لە هاوسەری: گەر پیاوەکە ژنەکەی خۆی بە تاوانی زیناوە بینی مافی ئەوەی هەبوو لە جێگەدا و راستەوخۆ لەگەڵ دۆستەکەی بیکوژێت، پاشان مافێکی تر خراوەتە پاڵ ئەم مافە(یاسۆ) ئەوەش ئەوەیە گەر لەو بارەدا پیاوەکە ژنەکەی خۆی کوشت و رێگەی بە پیاوەکە(دۆستی ژنەکە) دا بڕوات ئەوا سزای مردن بەسەر خۆیدا دەسەپێنرێت[1].

**تەڵاق:**

پیاو ئازادی ویستی هەبوو بۆ تەڵاقدانی ژنەکەی بە تەنها یەك وشە، و بە بێ بوونی بێئەرزشترین هۆ، بەڵام مافی تەڵاق بۆ ژنەکە نەبوو.

لە وەسێتەکانی فەیلەسوف(ئەکن) بۆ پیاوەکە هەیە ژنەکەی تەڵاق بدات گەر لە قسەدا زیادەڕەوی دەکرد لەڕووی بەرزکردنەوەی دەنگ و درێژەدان بە قسە، بەڵام گەر پیاوەکە کەمڕەوشت بوو، سروشتێکی دڕندانەی هەبوو ئەوا لە دیدی "ئەکن"ەوە ژنەکە پێویستە گوێڕایەڵی زۆرتر و زیاتری بۆ نیشان بدات.

---

(1) قصة الحضارة ٥/٦٣-٦٩. الزواج والطلاق المرجع السابق ص٥٧٢.

وستر مارك[1] دەڵێت: (یاسای تـەڵاق لـە یابـان لـە یاسـاڕێژی "تـایهۆ"دا لـەڕووی مانیەوە(بیربۆزەییـەوە) هـەمان یاسـای باڵادەسـت بـووە لـە چـین، بـەڵام لـەڕووی کردارییەوە دەتوانرا ژن تەڵاق بدرێت گەر مێردەکە ئەوەی بویستبایە و بە هەر هۆیەك بێت با هۆیەکی بێ بایەخیش بێت، هۆی باو بریتی بوو لەوەی "ژنەکە شیاو نەبێت بۆ خزمەتی خێزانەکەی"، بەڵام ژنی یابانی مافی ڕەوای ئەوەی نەبوو داوای تەڵاق بکات لە مێردەکەی وەك ئەوەی لە چین باوبوو هۆیەکە هەرچییەك بێت، ئەم بارە تا ساڵی ١٨٧٣ زایینی مایەوە، کاتێك یاسایەك دەرکـرا بـۆ یەکـەمجار ڕێگـەی بـە ژن دا داوای تەڵاق دژ بە مێردەکەی بەرز بکاتەوە.

یاسـای مـەدەنی کـە لـە نێـوان سـاڵانی ١٨٩٦-١٨٩٨ی زایـینی دەرکـراوە پێشکەوتووترە لەڕووی کۆتوبەند کردنی ویستی مێردەکە و پێدانی مافی داوای تـەڵاق بە ژنەکە.

پرۆفیسۆر (هـۆزۆمی) لەسـەر ئـەم یاسـایە دەڵێـت: (هەریـەك لـە ژن و پیاوەکـە لەبەردەم یەکسانیدا دادەنێت لەوەی پەیوەندی بە مافی تەڵاقەوەیە، بەڵام پێموانییـە تەنها لادان(فسق) لە مێردەکەوە مافی تەڵاق بە ژنەکە بدات، هەرچەند پیاوەکـە بـۆی هەیە ژنە ناپاکەکەی تەڵاق بدات)[2].

بە سەرنجدان لـە دەسـەڵاتی پیـاوی یابـانی لـە ئـازادی ویسـتی تەڵاقـدا ڕووداوی تەڵاقدان پەرەی سەندووە.

بەڵام لەو کاتەوەی یاسای مەدەنی نوێ جێبەجێ کراوە ڕێژەی ڕووداوی تەڵاق بە شێوەیەکی بەرچاو دابەزیوە، ڕێژەی تەڵاق بەرانبەر هاوسـەرگیری لـە سـاڵی ١٨٧٩ی زایینیدا ٣٤٪ بووە، لـە کاتێکدا لـە سـاڵی ١٩٠٠ی زایینیـدا بـووە بـە ١٨,٥٪ ئـەوەش بەهۆی سەپاندنی کۆتوبەندەوە بەسەر ویستی پیاو لە تەڵاقدا.

---

[1] قصة الزواج ص٣٠٥.

[2] قصة الزواج المرجع السابق ص٣٠٦.

شایانی باسە ئایینی مەسیحی کاریگەری گەورەی بووە لەسەر کۆتوبەند کردنی ئازادی ویستی یابانییەکان لە تەلاقدا بۆ ئەوانەی مەزهەبی "کاسۆلیکی یان پرۆتستانت"یان وەرگرتووە.

# بەشی چوارەم:
# تەلاق لە ئەوروپا

ئەم بەشە دەست بۆ تەلاق دەبات لە یۆنانی کۆن و رۆماندا ئەوەش لە دوو باسی سەربەخۆدا، فاکتەری سەرەکی بۆ کورتهەڵهێنانی لێکۆلینەوەی تەلاقی ئەوروپی لەو دوو شوێنەدا بۆ گرنگی ژیاری و یاساڕێژی ئەو دوو وڵاتە دەگەڕێتەوە.

# باسی یەکەم:
# تەڵاق لە یۆنانی کۆندا

**یۆنان:** وڵاتێکی ئەوروپییە دەکەوێتە بەشی خوارووی نیمچە دوورگەی بەڵقانەوە.

**یۆنانییەکان:** لە ڕەگەزی سلاڤین، زۆرینەیان مەزهەبی ئەرسۆزکسییان وەرگرتووە..

**شارستانێتی یۆنانییەکان:** لە بەناوبانگترین شارستانێتی گەلانی جیهانە لەڕووی پێشکەوتن و هێز و خۆڕاگری و هونەر و پیشەسازییەوە.

**ئایینەکەیان:** بەر لە تەشەنە سەندنی مەسیحییەت بریتی بوو لە بەخوداکردنی هێزی سروشت.

**لە بواری فەلسەفەدا:** لە پێشەنگی فەیلەسوفانی جیهان بوون، جەنگ لە نێوان ئایین و فەلسەفەدا بەردەوام بوو، جارێك ئایین سەردەکەوت و جارێکیش فەلسەفە.

**هاوسەرگیری:**

پەیوەندی جووتبوون لە یۆناندا جۆراوجۆر و فرە شێوە بوو، لاشەفرۆشی گەیشتبووە ئاستی پیشە و بازرگانی، هاوسەرگیری لە ڕێگەی کڕینی ژن بۆ پیاوەکە سازدەدرا وەك لە قۆناغی دەسەڵاتی باوکسالاریدا، هەروەها لە ڕێگەی کڕینی پیاو بۆ ژنەکە وەك لە دوای یاساڕێژی حوکمەکانی میرات و پەرەسەندنی نەریتی دابەشکردنی ماڵ و سامان بەسەر منداڵەکاندا -لە ژیانی باوکاندا- ڕوویدا[1]، لە شێوازی یەکەمدا مێردەکە دەسەڵاتی ڕەهای هەبوو بەسەر ژنەکەی و منداڵەکانیدا بە فرۆشتنیان یان بە

---

[1] المقارنات والمقابلات المرجع السابق ص٣٢٥.

هەر دابەزینێکی تر بە وەرگرتنی بەرانبەرێك یان بێبەرانبەر، وەك چۆن لە باری دووەمدا ئازادی رەها بۆ ژنەکە هەبوو لە تەڵاقدانی مێردەکەیدا.

کاتێك "وارکون" یاساکەی خۆی دارشت(٦٢١پ.ز.) یۆنانییەکان تەڵاقیان ناسی، بیست ساڵ دوای ئەوە "سۆلۆن"[١] یاساکانی ئەسینای دارشت و دانینا بە مافی تەڵاقدا بۆ هەردوو هاوسەرەکە، بەڵام "لیکەرغۆس" ئەو مافەی تەنها بە پیاو بەخشی.

**مەراسمی هاوسەرگیری:**

پیاو ژنەکەی خۆی هەڵدەبژارد و پاشان رێکدەکەوتن لەسەر مارەیی، بە فەرمی لە ماڵی بابی داوا دەکرا، بەدوای داخوازیدا قۆناغی دووەم دەهات ئەوەش بریتی بوو لە سازدانی خوانێك لە ماڵی کچەکە، هەریەك لە دوو هاوسەرەکە لە ماڵی خۆی حەمامی دەکرد پێش ئامادەبوونی خوانەکە.

پیاوانی دوو خێزانەکە لە بەرێکی دیوەخانەکەوە دادەنیشتن و ئافرەتانیش لە بەرێکی ترەوە، پاشان هەموویان کێکی زەماوەندیان دەخوارد، زاوا دەستی بووکی دەگرت کە پۆشاکێکی داپۆشراوی سپی لەبەر دەکرد، لەوانەیە روخساری نەبینرابێت-وەك لە چاخی کلاسیکیدا- لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ لای ترشقەیەك(عربە) تاکو بیانگوێزێتەوە بۆ ماڵی باوکی زاوا لە کەژاوەیەکی شکۆدار بە هاوەڵی دۆستان و خزمان و کەسوکار، باوك و دایکی زاوا بەخێرهاتنی بوکەکەیان دەکرد بە پێشوازییەکی ئایینی گەرموگوڕ تاکو بیانبەن بۆ خانەی خێزانی[٢].

---

[١] سۆلۆن(٦٣٨-٥٥٦ق.م) بە یاسادانەری ئەسینا و یەکێك لە حەوت حەکیمەکانی یۆنان دادەنرێت، لە ساڵی (٥٩٠ پ.ز.)، ینظر دائرة المعارف للبستاني ٢٤١/١٠ موسوعة تاريخ العالم، وليام لانجر. اشرف على ترجمته الدكتور محمد مصطفى زيادة ١٢٩/١.

[٢] ينظر الزواج والطلاق في جميع الاديان: المرجع السابق ص٥٨٦.

فرمیی ژن:

هاوسەرگیری تەنها لەسەر یەك ژن كورتبوو‌بوویەوە، بەلام پیاو دەیتوانی دۆستێكی هەبێت وەك هاوسەرەكەی لەگەڵی بژی سەرباری ژنە فەرمییەكەی.

دوای ئەو هێرش و پەلامارەی كرایە سەر سەقەلییە ساڵی(٤١٥پ.ز.) جەنگ زۆرێك لە پیاوانی تیابرد، بۆیە یاسا راشكاوانە دەرگای بەرووی هاوسەرگیری دوو ژنەدا ئاوەلا كرد، فەیلەسوفی یۆنانی سوقرات ئەم فرەییە سنووردارەی لا پەسەند بووە[١].

تەڵاقیش چووەتە ژێر چەندین سیستمی جۆراوجۆرەوە لەبەر رۆشنایی ئەو رەوشانەدا كە بەسەر یۆناندا تێپەریوە، بۆیە لێكۆڵینەوەكەی بۆ سێ قۆناغی سەربەخۆ و لە سێ لقدا دابەش دەكەین:

## لقی یەكەم:
## تەڵاق لای یۆنانییەكان لە چاخی كۆندا

كاتێك هاوسەرگیری لە رێگەی كرین و فرۆشتنەوە ئەنجام دەدرا كریار ژنەكە بێت یان پیاوەكە ئازادی تەواوی هەبوو لە تەڵاقدا.

ئەم مافە شێوەیەك لە شێوەكانی مافی مولكداری وەرگرت بوو، وەك چۆن خاوەن موڵك مافی تاكەكەسی یان بنەرەتی هەبوو بۆ دابەزین لە موڵكەكەی بەرانبەر بریتییەك یان بەبێ بریتی، بۆ پیاویش–لە ماوەی باوكسالاریدا– ئەو مافە هەبوو تاكو لە مولكداری ژنەكەی دابەزێت بە تەڵاق بەبێ هیچ مەرز و سنوورێك، هەر بەو جۆرە دەیتوانی مارەی بكات لە پیاوێكی تر لە ژیانی خۆیدا یان لە دوای مردنی وەسێتی پێ بكات بۆ كەسێكی تر، هەروەها مافی هەمان هەڵسوكەوتی هەبوو بە فرۆشتن و وەسێت

---

[١] المرجع السابق.

تایبەت بە منداڵی ژنەکەی[1].

سەرەڕای ئەم ئازادییە رەهایە بۆ پیاو رووداوی تەڵاق لەو سەردەمەدا زۆر نەبووە.

"جۆسل" دەڵێت: (لە "ئیلیادە" یان "ئۆدیسە"دا هیچ ئاماژەیەك بە تەڵاق نەکراوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دەگمەن بوونی)[2].

لێکۆڵەران ئەم دەگمەنییەیان بەوە شیکردۆتەوە بەرهەمی چەندین هۆکارە گرنگترینیان:

١-تێکەڵی دوو رەگەزەکە لە چاخی کۆنی ژیانی یۆناندا، بەجۆرێك هەریەك لە دوو هاوسەرەکە توانای ئەوەیان هەبوو یەکتر بناسن بەر لە هاوسەرگیری، و لە حاڵ و باری یەکتر بکۆڵنەوە و بزانێت چی بۆ ئەوە و چی لەسەریەتی.

٢-نزیکی ئاستی رۆشنبیری(یان لێهاتووی لە پلە و پایەی کۆمەڵایەتیدا) ئەوەش بەهۆی سادەیی و ساکاری ژیانەوە و پەرەنەسەندنی رۆشنبیری بە شێوەیەکی پێشکەوتووی گەشەسەندوو.

٣-مارەیی(یان ئەوەی لەو کاتەدا پێی دەوترا نرخ) زۆر یارمەتیدەر بووە لەسەر کەمی رووداوی تەڵاق، پیاو پابەند بوو بەوەی برێکی تر لە ماڵ و سامان وەك مارەیی(یان نرخێکی تر) بدات بە خانەوادەی ژنە نوێیەکە سەرباری پێدانی مافی تەواوی ژنەکە[3].

٤-هۆیەکی تر بوونی هەیە ئەوەش ئەوە بوو باوکی کچی یۆنانی ماڵ و پۆشاك و خشڵ و کۆیلە و کەنیزەکی بۆ کچە داواکراوەکەی ئامادە دەکرد، هەموو ئەو شتانە بە بەردەوامی وەك موڵکی ژنەکە دەمانەوە و گەر لە پیاوەکە جیاببوایەتەوە ئەو شتانەی بۆ دەگەڕانەوە.

---

[1] ينظر المرأة عند قدماء اليونان للدكتور محمود سلام زناتي المرجع السابق ص١١٧، المقارنات والمقابلات المرجع السابق ص٣٣٥.

[2] المرأة عند اليونان: المرجع السابق.

[3] المرجع السابق ص١٢٦-١٢٩.

پارێزگـاری کـردن لـە مـاڵ و سـامانەکەی بـاوکی ئەگـەری تەڵاقـدانی لەلایـەن مێردەکەیەوە کەم دەکردەوە بەهۆی ئاتاجی پیاوەکە بە ژنەکە[1].

**گرنگترین هۆکارەکانی تەڵاق لەو چاخەدا:**

ئەو هۆکارە سەرەکیانەی پیاوەکەیان پاڵدەنا بۆ دەستبەرداربوون لە ژنەکەی بە تەڵاقدانی ئەمانە بوون:

١-**ناپاکی هاوسەری:** گەر پیاوەکە دڵنیابوایە لـە ناپـاکی ژنەکـەی مـاف ئـەوەی هەبوو تەڵاقی بدات، لەگەڵ گێڕانەوەی ئەوەی پێیدابوو بەهۆی هاوسـەرگیرییەکەوە، ئەوەش لەبەر ئەوەی وادادەنرا ئافرەت بـەو کـارەی مەبەسـتی بـە مـەرامگیراوی لـە هاوسەرگیری پێشێل کردووە کە بریتییە لە منداڵبوونی شەرعی.

٢-**نەزۆکی ژن:** گەر ژنەکە نەزۆك بوو بۆ پیاوەکە هەبوو تەڵاقی بدات، بەڵام گەر نەزۆکییەکە لـە پیاوەکـەوە بـوو ئـەوا بـۆی هـەبوو کومـەکی لـە یـەکێك لـە خزمـانی وەربگرێت بۆ ئەوەی لەڕووی جووتبوونەوە پەیوەندی بە ژنەکەیەوە بکات و منداڵەکە بۆ مێردەکە بێت.

"وێل دیورانـت" دەڵێـت: (پێیـانوابوو نـەزۆکی ئـافرەت هۆیـەکی بـەس بێـت بـۆ تەڵاقدانی، چونکە مەرام لە هاوسەرگیری لەدایکبوونی منداڵ بووە، بەڵام گەر خـودی پیاوەکە نەزۆك بوایە ئەوا یاسا رێگەی دەدا و رای گشتیش لایان پەسەند بوو پیاوەکە لەو کارەدا یارمەتی لە یـەکێك لـە خزمـانی وەربگرێـت، ئـەو منداڵـەی بەرهـەمی ئـەو پەیوەندییە لەدایك دەبوو دەدرا پاڵ خودی مێردەکە)[2]

---

[1] الزواج والطلاق في جميع الاديان: المرجع السابق ص٥٨٥.

[2] قصة الحضارة ١١٥/٧.

## لقی دووەم:
## تەڵاق لە چاخی ناوەنددا

لەم چاخەدا شێوەی هاوسەرگیری گۆڕانی بەسەردا هات، لە ڕێگەی کڕین و فرۆشتنەوە ئەنجام نەدەدرا، وا پێویست بوو لەگەڵ بزربوونی وێنای کۆن بۆ هاوسەرگیری مافی ڕەها بۆ پیاو لە تەڵاقدا بزر ببوایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لەژێر کاریگەری کۆمەڵێك بنەمای تری نوێدا وەك خۆی مایەوە، لەم چاخەدا ڕووداوی تەڵاق زۆربوو، ئەوەش بەرهەمی چەندین هۆکار بوو گرنگترینیان:

١-بنەما لە چاخی کلاسیکیدا -پێچەوانەی چاخی کۆن- بریتی بوو لە دابڕانی تەواو لە نێوان دوو ڕەگەزەکەدا، پیاو تەنها لە شەوی زاوابیدا ژنەکەی خۆی دەبینی، بۆیە گونجانی ژن و مێردەکە لەڕووی ڕووالەت و ئەخلاقەوە کارێك بوو درابووە دەست ڕێکەوت، وادەردەکەوێت پیاوەکە زۆرجار بۆ بیانوو گەڕابێت بۆ ڕزگاربوون لە ژنەکەی تاکو جارێکی تر بەختی خۆی تاقیبکاتەوە.

٢-تێڕوانینی یۆنانییەکەن بۆ ژن ڕێگەی ئەوەی نەئەدا هەلێك بۆ دروستبوونی پەیوەندی خۆشەویستی نێوان ژن و پیاوەکە بڕەخسێت، بەڵکو مێرد وەك کارەکەر سەرنجی ژنەکەی دەدا لە بەڕێوەبردنی ماڵەکەیدا، بۆیە ئاسان بوو لەسەری بە یەکێکی تر ئاڵوگۆڕی بکات[1].

٣-ڕاگەیاندنی یاسای "کچی میرات": مەبەست بە "کچی میرات" ئەوە بوو باوکی خێزان گەر کچی بەجێبهێڵایە و کوڕی نەبوایە ئەوا مارەی دەبڕی لە نزیکترین کەسی خۆی، و کوڕی یەکەمی ئەو هاوسەرگیرییە بە کوڕی ئەو(باوکی ژنەکە) دەدەنرا و ناوی ئەوی هەڵدەگرت و ماڵ و سامانەکەی بۆ ئەو دەگەڕایەوە و ئایینی ئەوی بە

[1] ینظر المرأة عند الیونان ص١٢٨. قصة الحضارة ١١٥/٧ وما بعدها.

میرات بۆ بەجێدەما[1]

ئەو کەسەی مافی هاوسەرگیری هەبوو لەگەڵ "کچی میرات" یاسا پابەندی دەکرد بە تەڵاقدانی ژنی یەکەمی گەر ژنی هەبوایە، یان ئەو لە ڕێگەی خۆیەوە پەلەی لەو کارە دەکرد گەر لێجێماوەکە سامانێکی زۆربوایە، بەڵام گێڕانەوەی دووتە(مارەیی)[2] لە کاتی پچڕانی پەیوەندی هاوسەریدا وایکرد بوو پیاوەکە پەلە نەکات لە تەڵاق(تەڵاقدانی ژنی یەکەمی).

"ئیدوارد وستر مارك" دەڵێت: (وا دەردەکەوێت تەڵاق لای ئیغریقییەکان لە چاخی "هۆمیرۆس"دا نەزانراوبوو(نەناسراوبوو)، دواتر بوو بە ڕووداوێکی ڕۆژانە لە وڵاتی یۆناندا، یاسای "ئەتیکا" بڕیاری دابوو مێرد دەتوانێت هەر کات بیەوێت و بەبێ باسکردنی پاڵنەر ژنەکەی دەربکات، بەڵام ناچارە ژنە تەڵاقدراوەکەی لەگەڵ مارەیی و ماڵ و سامانەکەیدا بگێڕێتەوە بۆ ماڵی باوکی(باوکی ژنەکە)[3]

**مافی ژن لە تەڵاقدا:**

لە چاخی کلاسکیدا ژنەکە مافی ئەوەی هەبوو داوای جیابوونەوە قەزایی بکات، ئەوەش بە بەرزکردنەوەی داوای تەڵاق بۆ بەردەم ئەرکون(قازی)[4] لە دوو باردا[5]:

١-گەر پیاوە لە بەدڕەوشتیدا نغرۆ بوو بوو بە جۆرێك خێزانەکەی پشتگوێ خستبێت و کۆچی لە ژنەکەی کردبێت.

---

[1] المرأة عند اليونان ص٩٠.

[2] واتە مارەیی و ئەوەی باوکی ژنەکە دەیدات بە کچەکەی لە ماڵ و سامان لە کاتی هاوسەرگیریدا پێشی دەوترێت: "بائینە".

[3] قصة الزواج ص٣١٠-٣١١.

[4] ارکون یان (ارخون) واتە قازی، بەپێی چاکسازی دەستووری ئەسینا نۆ قازی(ئەرخون) بە قورعە دادەمەزران لە نێوان ٥٠٠ کاندیدا کە شارەوانییەکان هەڵیاندەبژاردن یعني القاضي. أنظر موسوعة تاريخ العالم ١٢٩/١.

[5] قصة الحضارة ١١٥/٧ وما بعدها. قصة الزواج ص٢١١. والمرأة عند اليونان ص١٣٠.

٢-گەر کەسێکی دڵڕەق و مامەڵە خراپ بوو لەگەڵ ژنەکەی، بەڵام پێویستبوونی ڕۆیشتنی خودی ژنەکە بۆ لای ئەرکۆن بۆ بەرزکردنەوەی داواکەی گرنگی ئەم مافەی کەم کردبوویەوە، چونکە زۆرجار مێردەکەی بە زەبر و زۆر ڕێگری لەو کارەی دەکرد.

**تەڵاق بە ڕێککەوتنی هەردوو لا:**

شێوەیەکی تر لە تەڵاقی ئاوەڵا(موباح) بوونی هەبوو ئەوەش بریتی بوو لە تەڵاق بە ڕازیبوونی هەردوو هاوسەرەکە، بە شێوەیەکی فەرمی لەلای ئەرکۆن گوزارەیان لەم ڕازیبوونەی خۆیان دەدا و ڕێکەوتنەکەیان لەسەر تەڵاق و جیابوونەوە ڕۆشن دەکردەوە.

کاتێك لەیەکتر جیادەبوونەوە مافی بەخێوکردنی منداڵ بۆ باوك بوو، منداڵ لەلای دەمایەوە با زیناشی لەسەر(لەسەر پیاوەکە) جێگیر بووبێت.

شایانی باسە لەبەر ئەوەی یۆنان هەرێمێکی دەوڵەتی بیزەنتی بوو بۆیە ڕێکخستنی تەڵاق چووبووە ژێر یاساکانی "جستنیان"ەوە بە شێوەیەکی تایبەت یاسای ژمارە(١١٧)، ئەم یاسایانە تەڵاقیان ئاوەڵا دەکرد بۆ یەك لایەن(پیاوەکە) لەگەڵ کۆتوبەندێکی زۆر کە سەرپێچی لێیان تەنها سەریدەکێشا بۆ سزای دارایی لەسەر سەرپێچیکار، لە یۆناندا تەڵاق لە سەدەی دوازهەمی زایینییەوە کەوتە ژێر باری پێویستی دانپیادانان بە حوکمێکی قەزاییانە، پاشان کەنیسەی ئەرسۆزکسی- کاتێك یۆنان کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەوە- توانی ڕێساکانی تەڵاق هەموار بکاتەوە و تەڵاقی بە نەشیاو دانا مەگەر بەهۆکەلێکی بەهەندگیراو لە یاسای جستنیان تا وای لێهات تەڵاق ڕوونەدات گەر پاساوێك بوونی نەبێت، پێچەوانەی ئەوەی پێشتر لەسەری بوو لە کەوتنی تەڵاق و سەرهەڵدانی سزا لەسەر سەرپێچیکار[1]

[1] أنظر أنحلال الزواج في حياة الزوجين واسبابه في التشريعات الأوربية مستخرج من مجلة القانون والاقتصاد العددين (٣،٤) لسنة (٢٨) لاستاذنا الدكتور جميل الشرقاوي، مطابع دار الكتاب العربي بالقاهرة ص٢٩٣.

## لقی سێیەم:
## تەڵاق لای یۆنانییەکان لە چاخی نوێدا

یۆنان ساڵی ١٨٢١ز سەربەخۆیی وەرگرت، لە دەستووری ١٨٢٢، ١٨٢٣ بڕیاریدا یاسای مەدەنی بیزەنتی یاسای یۆنان بێت، بەپێی ئەو یاسایە تەڵاق بە هەند وەرنەدەگیرا گەر هۆیەك لە هۆیەکان کە تیایدا دیاریکرابوون پاساوی نەدات، پاشان لە ساڵی ١٩٢٠ یاسای ژمارە(٢٢٢٨) دەرکرا، بەپێی ئەم یاسایە گۆڕانکاری لە ڕێسای هۆیەکانی تەڵاقدا کرا لەبەر ڕۆشنایی کۆمەڵەی مەدەنی ئەڵمانی.

کار بەو یاسایە کرا تا کۆمەڵەی مەدەنی یۆنانی دەرکرا لە ساڵی ١٩٤٦ کە بەپێی ئەم کۆمەڵە یاسایە هۆیەکانی تەڵاق بە شێوەیەکی سنووردارکراو دیاریکران، بەم جۆرە:

(زینا، فرەژنی، هەوڵی دەستدرێژی بۆ سەر ژیان، کۆچکردنی بەئەنقەست، لەرزۆکی پەیوەندی ژن و مێردی، نەخۆشی ئەقڵی، گولی، بێسەروشوێنی، لاوازی جووتبوون) بەپێی ئەم درێژەپێدانە:

**١-زینا[1]:**

زینا لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە بە پێشێلکارییەکی ترسناکی هاوسەرداری دادەنرێت، بۆیە بە یەکێك لە هۆ پاساودەرەکان دادەنرێت، بەڵکو پێویستە لەسەر لایەنی بێگوناه داوای تەڵاق بکات لەباری فەراهەمبوونی ئەم مەرجانەدا:

أ.کارەکە بە ئازادی ویست ئەنجامدرابێت لەباری بوونی بەرهەڵستی زۆرلێکردندا بە هۆ دانانرێت.

ب–کارەکە بە ڕازیبوونی هاوسەرەکەی تر نەبێت ئەگینا گوێ بۆ داواکەی ناگیرێت.

---

(1) أنظر المادة (١٤٣٩). من المجموعة المدنية اليونانية لسنة ١٩٤٦.

ج-کارەکە بە تەواوی ئەنجام درابێت، بەڵام دەستپێکردن نابێتە هۆیەکی پابەندکەر، بەڵکو پاساوێکە هەڵبژاردەی بۆ هەیە بەپێی مادەی(١٤٤٢) لە کۆمەڵەی مەدەنی یۆنانی.

د-لە ماوەی ساڵێکدا داوایەکە پێشکەش بە قەزا بکرێت لە بەرواری ئاگاهی بە هۆیەکە[1].

شایانی باسە یاسادانەری یۆنانی ئاماژەی نەکردووە بۆ حوکمی ئەنجامدانی زینا لە هەردوو هاوسەرەکەوە، پێویست بوو-بە بۆچوونی من- لایەنی پێشکەشکاری داوای تەلاق وەلامی داواکەی نەدرێتەوە گەر بە هەمان ناپاکی تێوەگلابوو.

٢-فرەیی ژن[2]:

تەنها گرێبەستی هاوسەرگیری دووەم داوای ژنەکە پاساو دەدات بۆ تەلاق گەر بە ئاگاهی و رازیبوونی ئەو نەبووبێت، بە مەرجێك هاوسەرگیری دووەم رووالەتێکی یاسایی هەبێت، پیاوەکەش کە ئەنجامیداوە مەرام و نیەتی خراپی هەبووبێت بەوەی بزانێت هاوسەرگیری دووەم دروست نییە بەهۆی پەیوەندی لەگەڵ ژنی یەکەم.

گەر هاوسەرگیری دووەم بە نادروست دابنێین بەپێی حەرامبوونی فرەژنی یاسای یۆنانی ئەوا دەتوانرێت ئەم هۆیە بخرێتە پاڵ هۆی یەکەم بەڵام تەنها لەوەدا لەگەڵ هۆی یەکەم جیاوازە کە تەنها مەبەست(مەرام) تەلاق پاساو دەدات با نەشچووبێتە لای ژنی دووەم.

---

[1] لە هەموو بارێکدا بە تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر راستبوونەوەی هۆیەکەدا بەردەبێتەوە، مادەی (١٤٣٩)

[2] المادة (١٤٠٠) من نفس المجموعة.

**٣-هەوڵی دەستدرێژی بۆ سەر ژیان[١]:**

بۆ هەریەك لە دوو هاوسەرەکە هەیە داوای تەڵاق بکات گەر لایەکەی تر دەستدرێژی کردە سەر ژیانی، کارێکی سروشتییە ئەم دەستدرێژکارییە بە دەستبردن بۆ کوشتن دەستپێدەکات، بە مەرجێك لەباری بەرگری رەوادا نەبوویێت و نەکەوتبێتە ژێر شێوانی ئەقڵییەوە.

بەڵام تەنها هەرەشە بە هۆ دانانرێت لە دیدگای یاسادانەری یۆنانییەوە، وەك چۆن پێویستە داوایەکە لە ماوەی ساڵێکدا پێشکەش بکات لە بەرواری ئاگاهی بە دەستدرێژکارییەکەی.

**٤-کۆچکردنی بەئەنقەست:**

بۆ هەریەك لە دوو هاوسەرەکە هەیە داوای تەڵاق بکەن گەر ئەویتر بە ویستی خۆی کۆچی لێکرد، و بەبێ پاساوێك و بە رازیبوونی لایەکەی تر نەبێت، ئەو رۆژەی بڕیاری تەڵاقەکە دەردەچێت بەلانی کەمەوە دوو ساڵ بەسەر کۆچکردندا تێپەڕ بوویێت، با ماوەکەش کاتی بەرزکردنەوەی دلوا تەواو نەبوویێت.

**٥-لەرزۆکی پەیوەندی ژن و مێردی[٢]:**

بۆ هەریەك لە دوو هاوسەرەکە هەیە داوای تەڵاق بکات گەر پەیوەندی ژن و مێردی رووبەڕووی لەرزۆکییەکی ترسناك بوویەوە بە کەمتەرخەمی لایەکەی تر و فەراهەمبوونی ئەم مەرجانە:

أ.لایەنی دلوا لەسەر تۆمارکرلو کەمتەرخەمییەکی هەبێت لە ویستێکی بەهەستی زانراوەوە سەریهەڵدابێت، بەڵام گەر ئەو کەمتەرخەمییە لە نەخۆشییەوە یان تێکچوونێکی ئەقڵییەوە یان هەر هۆیەکی تر بێت ئەوا پاساو بۆ داوای تەڵاق بوونی

---

[١] ينظر المادة (١٤٤١) من المجموعة المدنية اليونانية.

[٢] ينظر المادة (١٤٤٢).

نییە.

ب.لەرزۆکی و پچڕان و لەتبوون لە قەوارەی هاوسەرداریدا بوونی هەبێت.

ج.پەیوەندییەکی هۆگەرایی لە نێوان لەرزۆکی ژیانی هاوسەریی و کەمتەرخەمی(یان هەڵە)دا راستبووبێتەوە.

د.لە ماوەی ساڵێکدا داواکە بەرزکرابێتەوە لەو کاتەوە ئاگاهی بە هۆیەکە پەیدا بووە[1].

**پرسیارێك لەبەردەمماندا دەمێنێتەوە، ئەویش:**

گەر خراپی پەیوەندی هاوسەریی لە کەمتەرخەمی هەردوو لایەنەکەوە بوو حوکمەکەی چییە؟

وەڵام بۆ ئەم پرسیارە ئەوەیە: پێویستە وەڵامی داواکە نەدرێتەوە گەر ئەو کەسەی داواکە تۆمار دەکات بە هەمان هۆ تێوەگلابێت، مەگەر لە بارێکدا رۆڵ و کاریگەری هەڵەی دلوا لەسەر تۆمارکراو گەورەتر و بەهێزتر بێت.

شایانی باسە قازی بابەت لەم جۆرە پرسانەدا خاوەنی دەسەڵاتی خەملاندنە، بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێیدراوە دەتوانێن ئەسەری کردارەکان لەسەر ژیانی هاوسەری و بەسبوونی بۆ پاساوی تەڵاق بخەملێنێت.

**٦-نەخۆشی ئەقلی[2]:**

هەریەك لە دوو هاوسەرەکە مافی ئەوەی هەیە دلوای تەڵاق بکات گەر لایەکەی تر تووشی نەخۆشی ئەقڵی بوو و چوار ساڵ بەسەریدا گوزەری کرد بەبێ چارەسەر، ئەوەش سەریکێشا بۆ نەگونجانی تێگەیشتنی هاوسەری.

[1] لە هەموو بارێکدا بە تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر راستبوونەوەی هۆیەکەدا.

[2] ينظر المادة (١٤٤٣).

۷-گولی[1]:

یاسادانەری یۆنانی تەنها بوونی ئەم نەخۆشییە بە پاساو دادەنێت بۆ داوای تەڵاق بەبێ مەرج و کۆتوبەند.

۸- بێسەروشوێنبوون(بزربوون)[2]:

هەریەك لە دوو هاوسەرەکە مافی ئەوەی هەیە داوای تەڵاق بکات گەر هاوسەرەکەی تر بێسەروشوێن بوو، ئەوەش بە بڕیاری قازی[3]، بەڵام مافی ئەوەی نییە هاوسەرگیری بکات دوای دەرچوونی بڕیاری تەڵاق تا حوکمەکە پلەی یەکلابوونەوە وەردەگرێت، گەر بێسەروشوێنەکە پێش ئەوە دەرکەوتەوە ئەوا ڕێکارەکانی تەڵاق بەردەبنەوە بە حوکمی یاسا[4].

شایانی باسە مادەی(٤٨) لە کۆمەڵەی مەدەنی یۆنانی داوا دەکات بڕیاردان لە بێسەروشوێنی وەك بڕیاردان وایە لە حوکمی مردن و ئاساری مردنی لێوە سەرهەڵدەدات، بینا لەسەر ئەوە ئاتاج بە حوکمی تەڵاق نییە.

بەڵام مادەی(١٤٤٥) لەو کۆمەڵە یاسایە ئەم حوکمە تەنها بە هۆیەکی پاساودەر دادەنێت بۆ داوای تەڵاق و بڕیار لەسەردانی، بینا لەسەر ئەمە ئەم مادەیە دەبێتە هەڵواردن و تایبەتکردنی حوکمی گشتاندنی مادەی(٤٨)

۹-پەککەوتنی جووتبوون[5]

تووشبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە پەککەوتنی جووتبوون ماف دەدات بە لایەنەکەی تر داوای تەڵاق بکات بە دوو مەرج:

---

(1) المادة (١٤٤٤).

(2) المادة (١٤٤٥).

(3) المواد (٤٠-٥٠) من المجموعة اليونانية تنظم حكم الغيبة.

(4) ينظر الدكتور جميل الشرقاوي المرجع السابق ص٣٠١.

(5) المادة (١٤٤٦).

١-پەککەوتنەکە لە کاتی سەرهەڵدانی گرێبەستی هاوسەرگیری راستبووبێتەوە بەبێ ئەوەی داواکەری تەڵاق ئاگاهی پێی هەبێت.

٢-بەلانی کەمەوە سێ ساڵی بەسەردا تێپەڕی بێت لە بەرواری بۆنەی هاوسەرگیرییەوە.

ئەم تۆ هۆیە تەڵاق پاساو دەدەن بەپێی یاسای یۆنانی نوێ، بەڵام هەندێ لە فەقیهانی یاسا رەخنەیان لەم دیاریکردن و سنووردارکردنە گرتووە بە چەندین تێبینی:

١.لەرزۆکی ژیانی هاوسەری -وەك هۆیەك لە هۆیەکان- تێگەیشتنێکی گشتی گشتگیرە و زۆرێك لە شێوازی تەڵاق لەژێریدا جێگەیان دەبێتەوە ئەمەش سەردەکێشێت بۆ روخاندنی سوودی دیاریکردن و سنووردارکردنەکە.

یاسادانەری یۆنانی کاریگەری هەندێ لە هۆیەکانی لەسەر راستبوونەوەی رەگەز(عنصر)ی هەڵە(کەمتەرخەمی) بیناکردووە وەك لە زینا و دەستدرێژی بۆ سەر ژیان.. لە کاتێکدا هەندێکی تریان پاساوی تەڵاق دەدەن بە چاوداخستن لە بوونی ئەو رەگەزە یان نەبوونی لەلای "داوالەسەرکراو" وەك گولی و پەککەوتنی هێزی جووتبوون.. دانانی ئەوەی دواییان(پەککەوتنی هێزی جووتبوون) لە هۆیەکانی تەڵاق دەبێتە رێکخستن بۆی لەو سۆنگەیەوە چارەسەرە بۆ پەیوەندی هاوسەرگیرییەك توانای مانەوەی تێدا نەماوە.

٣-یاسادانەری یۆنانی هەندێ لەم هۆیانەی بە پابەندکەری قازی داناوە بۆ بڕیاردان لە تەڵاق وەك لە باری زینا و دەستدرێژی و کۆچلێکردندا.. لە کاتێکدا لە هەندێکی تریدا قازی پابەند نەکراوە بە بڕیاردان لە تەڵاق وەك لەرزۆکی ژیانی هاوسەری و نەخۆشی ئەقڵی.

٤-ئەم هۆیانە لە هێز و ئاساردا یەکسان نین، ئامارەکان سەلماندوویانە داواکارییەکانی تەڵاق بەهۆی کۆچلێکردن و لەرزۆکی ژیانی هاوسەری ٨٠٪ی تەڵاق پێکدەهێنن، لە کاتێکدا داواکاری بە هەموو هۆیەکانی تر ٢٠٪ پێکدەهێنن.

# باسی دووەم:
# تەڵاق لای ڕۆمانەکان

ڕۆمان بە وڵاتی یاسا دەناسرێت، زۆربەی یاسا دانراوەکان لەو شوێنەوە وەرگیراون، خاڵی وەرچەرخانە بۆ بزاڤی یاسارێژی و ژیاری ئەورووپای کۆن و نوێ.

یاسای ڕۆمانی تاکو ئێستا پێگەیەکی دیاری هەیە لە زانکۆکانی جیهاندا، لێکۆڵینەوە دەکەن لەسەر سەرهەڵدان و ریشە و بنەڕەت و گەشە و پەرەسەندن و کاریگەرییان لەسەر تەواوی یاساکانی تر.

بۆیە نامۆ نییە گەر هاوسەرگیری و تەڵاقی ڕۆمانی شێوازێکی ڕێکخستنی وای بەدەستهێنابێت هیچ ڕێکخستنێکی تری یاسایی ئەو سەردەمە شان نەدات لە شانی.

**هاوسەرگیری ڕۆمانی:**

ڕۆمانەکان لە هەموو چاخەکانیاندا پارێزگارییان کردووە لە پابەندبوون بە بنەمای نەبوونی فرەژنی، بەڵام بە دوو جۆری سەرەکی هاوسەرگیری ناسراون: هاوسەرگیری بە سەروەرییەوە، لەگەڵ هاوسەرگیری بێ سەروەری، ئەم دوو جۆرە بەپێی یاسای ڕۆمانی دروست و ڕەوا بوون، بەڵام جیاوازی بنەڕەتی نێوانیان ئەوە بوو ژن لە جۆری یەکەمیاندا گەردنکەچی دەسەڵات و سەروەری مێردەکەی بوو یان سەروەری خاوەن دەسەڵات لەسەری، ئەو وەك مردووی لێ دەهات لە پەیوەندی لەگەڵ کەسوکار و خانەوادەکەی.

بەڵام لە جۆری دووەمیاندا ژنەکە لەسەر باری پێش هاوسەرگیری خۆی دەمایەوە لەڕووی گەردنکەچبوون بۆ سەروەری دەسەڵاتی مێرد و سەربەخۆییەکەی لە مافەکانیدا، بەڵام منداڵەکانی لەم پیاوە دەچوونە ژێر سەروەری دەسەڵاتی باوکیانەوە یان دەسەڵاتی ئەو کەسەی سەروەری بەسەریەوە هەبوو.

**١-هاوسەرگیری بە سەروەری:**

بە یەکێك لەم رێگانە دادەمەزرا:

**أ.رێگەی ئایینی:**

ئەمە لە یەك کاتدا بریتی بوو لە هاوسەرگیرییەکی فەرمی ئایینی، لە پەرستگای ژوپیتێر ئەنجام دەدرا بە پێشکەشکردنی قوربانییەك(کێکێك) لەلایەن زلاوە بۆ خواوەندی خوداکان(ژوپیتێر) هاوتا لەگەڵ خوێندنەوەی کۆمەڵێك گوزارەی ئایینی لەبەردەم دە کەس لە شایەتەکان و سەرپەرشتیاری حیبری مەزن و کاهینی پەرستگا بە مەرجێك لەم جۆرە هاوسەرگیرییە لەدایك بووبن و بە هەمان شێوە هاوسەرگیرییان کردبێت.

**ب-رێگەی کڕین و فرۆشتن(هاوسەرگیری مەدەنی):**

بە رێگەیەك ئەنجام دەدرا ماڵ و سامانی بەنرخی پێ بەدەستبهێنرێت، ئەوەش بریتی بوو لە رێگەی شایەتەکان[1].

**ج-هاوسەرگیری بە رێگەی تێکەڵاوی و چوونەلا:**

پیاوێك دەچووە لای ئافرەتێکی مێردنەکردوو خاڵی لە رێگرەکانی هاوسەرگیری بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو، پیاوەکە سەروەری بەسەر ژنەکەدا بەدەست دەهێنا و چوونەلاکە سیفەتی هاوسەرگیری رەوای بەدەست دەهێنا هەروەك بەدەستهێنانی مولکداری بە پێشکەوتن(التقادم)، بەلآم بزربوونی ژنەکە لە ماڵی هاوسەری بۆ ماوەی سێ شەوی بەدوای یەکدا هاتوو ماوەکەی دەبڕی(مەبەستی یەك ساڵەکەیە) بۆ ئەوەی پیاوەکە سەروەری بەسەر ژنەکەدا بەدەست نەهێنێت.

---

[1] شایەت کارێکی فەرمی رۆمانی ئاڵۆز بوو بۆ گواستنەوەی مولکداری شتی بەنرخ، ئەوەش دلوای ئامادەبوونی پێنج شایەتی رۆمانی باڵغی نێری دەکرد، لەگەڵ ئامادەبوونی ترازوو هەڵگر و گوازرەوە و بەدەستهێنرلو کە لەسەری بوو بە گوزارەی فەرمی و جووڵەی رووالەتی قسە بکات. ينظر مبادئ القانون الروماني (تاريخه ونظمه) تأليف الدكتور عبد المنعم البدر والدكتور عبد المنعم البدرأوي، طبع دار الكتاب العربي بمصر ١٩٥٤م ص٢٣٢، ٣٧٢.

**٢-هاوسەرگیری بەبێ سەروەری(هاوسەرگیری عورفی):**

هاوسەرگیرییەك بوو بە ڕێكەوتنی دوو لایەنەكە بەبێ دەستێوەردانی پیاوانی ئایین و دەوڵەت(قەزا)، داواكارییەك لە نێوان ژن و پیاوەكە یان لە نێوان پیاوەكە و باوكی كچەكەدا پێشدەكەوت، پاشان ژنەكە لە ئاهەنگێكی میللیدا دەگوێزرایەوە، ئاو و ئاگری پێشكەش دەكرا و بەچوونە ناو ماڵی هاوسەرییەوە هاوسەرگیرییەكە تەواو دەبوو، پێشكەش كردنی مارەیی یان ئەوەی پێیدەوترا "دووتە" هاوتابوو لەگەڵی(دووتە: ئەو ماڵ و سامانە بوو لەگەڵ ژنەكەدا لە ماڵی باوانییەوە دەهێنرا بۆ ئەوەی سوودی لێ ببینێت لە ماڵی هاوسەرداریدا بەبێ ئەوەی دەستێوەردان بكات لە ماڵە سەرەكییەكە)، ژنەكە مافی ئەوەی هەبوو ئەو ماڵ و سامانە وەربگرێتەوە گەر بەبێ هۆیەك لە ئەوەوە تەڵاقبدرابایە، هەموو ئەو ماڵ و سامانەشی لەدەست دەدا گەر بەهۆی هەڵەیەكەوە لە ژنەكەوە تەڵاقبدرابایە[١].

ئەمە ئەوە بوو پەیوەندی بە هاوسەرگیری ڕۆمانییەوە بوو بە شێوەیەكی كورت و پوخت.

**دەربارەی تەڵاقیش:** هەر لە دێرینەوە ڕۆمانەكان وەك هۆكارێك بۆ كۆتاهێنانی پەیوەندی ژن و مێردی تەماشایان كردووە، تەڵاق بەدرێژایی چاخە یەك لەدوای یەكەكانی مێژووی دوور و درێژیان لەسەر یەك شێواز بەردەوام نەبووە، بەڵكو جێگەی گۆڕان و بەرەوپێشچوونی چەندین قۆناغ بووە، بەجۆرێك دەستی گۆڕان و چاكسازی بۆ درێژكراوە جارێك بە ئاوەڵا كردنی ڕەها و جارێكیش بە كۆتوبەند كردنی.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستییەدا لێكۆڵینەوەی بابەتەكە-لەڕووی ڕادەی دەسەڵاتی ویستەوە لە تەڵاقدا- بەسەر سێ چاخدا دابەش دەكەین: كۆن و كلاسیكی و ئیمپراتۆرییەتی خوارووی، ئەمەش لە سێ لقدا:

---

[١] ينظر الدكتور عبد المنعم البدر والدكتور عبد المنعم البدرأوي المرجع السابق ص٢٣٤.
القانون الروماني للدكتور عمر ممدوح مصطفى الطبعة الثالثة ١٩٥٩م ص٢٠١. القانون الروماني للدكتور صبيح مسكوني، مطبعة شفيق بغداد ١٩٦٨م. ص٢٠١.

# لقی یەکەم:
# تەڵاق لە چاخی کۆندا

ئەوەی سەرنجی لێکۆڵەر و خوێنەر رادەکێشێت ئەوەیە تەڵاق لەو چاخەدا زۆر دەگمەن بووە سەرەڕای نەبوونی یاسایەك بۆ رێکخستنی، یان بوونی پەیامێکی ئایینی کۆتوبەندی لەسەر دابنێت، سەرەڕای ئەوەی سەرۆکی خێزان دەسەڵاتی کۆتاهێنانی پەیوەندی هاوسەرگیری نێوان کچەکەی و مێردی کچەکەی یان نێوان کوڕەکەی و ژنی کوڕەکەی پێدرابوو لەگەڵ ئەوەش هەریەك لە دوو هاوسەرەکە خاوەنی ئازادی ویست بوو بۆ هەڵوەشانەوەی پەیوەندی هاوسەرداری هەرکات بیەوێت.

وا دەردەکەوێت نهێنی ئەم دەگمەنبوونەی تەڵاق -لەو چاخەدا- بۆ چەند هۆیەك بگەڕێتەوە: رێزگرتن لە رای گشتی کە بێزیان لە تەڵاقدان دەکردەوە، هەروەها پاڵنەری ویژدانی ناخی مرۆڤ کە دەترسا لە ئەوەی پێی دەوترێت "ئەنگی و شوورەیی"، هەروەها کارکردن بە بنەمای راوێژ بەر لە چوونە بەرەوە لە تەڵاق.

ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەم بۆچوونە ئەوەیە مێژوونووسە رۆمانییەکان گواستوویانەتەوە لەوەی مێرد پابەند بووە بە بانگهێشی دەستەی خێزانی کە خزمان و دۆستانی لەخۆ دەگرت، بۆ ئەوەی را و بۆچوونی ئەوان وەربگرێت بەرلەوەی پەنا بۆ تەڵاقدانی ژنەکەی ببات، ئەو پیاوەی ژنەکەی بەبێ پاساو تەڵاق دەدا ئەگەری ئەوەی هەبوو لە پاڵ ناوەکەیدا لیستی هەژماری تێبینیکراو دابنرێت کە لێدانی مۆرێك بوو لێی و سەریدەکێشا بۆ بێبەشبوونی لە مافە گشتییەکانی[1]

(1) ینظر المرأة عند الرومان للدكتور محمود سلام زناتي طبعة دار الجامعات العربية للطباعة ١٩٥٨ص٢٣١. حقوق الرومانيين تأليف توفيق السويدي العباسي مطبعة الفلاح - بغداد ١٩٢٢م ص٨٦.

بۆیە بەزۆری تەڵاق وەك سزایەك بۆ ژنەكە –بەهۆی هەڵەیەكی مەزنەوە ئەنجامی دابێت– روویداوە

دەوترێت یەكەمین كەسێك ژنی خۆی تەڵاقداوە لە چاخی رۆمانی كۆندا بریتی بووە لە "كارفیلیوس رۆجا" ساڵی(٢٣٥پ.ز.) سەرەڕای ئەوەی خۆشیدەویست و ئەخلاق و ئاكاری جێگەی سكاڵای مێردەكەی نەبوو، بەڵام ئافرەتێكی نەزۆك بوو، ئەم كارەی "كارفیلیوس" بێزاری و نارەزایی هاوڵاتیان و خزم و دۆستانی لێكەوتەوە[1].

"ئیدوارد وستر مارك" دەڵێت: (مافی مێرد(واتە لە تەڵاقدا) لەرووی كردارییەوە بێ هیچ گومانێك رای گشتی و چاودێران دیاریان دەكرد، وترلوە پێنج سەد ساڵێك تێپەڕیوە بەبێ ئەوەی یەكێك مافی تەڵاق پێشێل بكات! ! ئەوەش بۆمان رۆشن دەكاتەوە لەو رۆژگارانەدا لە رۆما تەڵاق زۆر دەگمەن بووە)[2]

وا بۆم دەردەكەوێت هۆكەلێكی تر بوونیان هەبوویێت بۆ دەگمەنی تەڵاق ئەوەش ئەوەیە رۆمانییەكان لە چاخی كۆنیاندا هەستێكی ناوەكیان هەبووە بەوەی ئامانجی یەكەم و سەرەكی بریتییە لە لەدایكبوونی منداڵ و پەروەردەكردنیان بۆ ئەوەی لەدوای خۆیان كەسێك هەبێت گرنگی بە گۆڕەكانیان بدات، سەرباری ئەركی نیشتمانی، لەسەریان پێویست بوو منداڵەكانیان بە پەروەردەیەكی دروست پەروەردە بكەن، بەڵام تێركردنی ئارەزووی جووتبوون ئامانجێكی مام ناوەند بوو لە هاوسەرگیری، بۆیە پاڵنەری نەوە لە هاوسەرگیری، و سۆز و بەزەیی باوكان و دایكان لەسەر منداڵەكانیان، و پێویستی پەروەردەی منداڵەكان بۆ نیشتمان.. هەموو ئەمانە سەریانكێشا بۆ پتەوبوونی پەیوەندی ژن و مێردی و دوورخستنەوەی لە تراژیدیای جیابوونەوە.

---

[1] المرأة عند الرومان المرجع السابق.

[2] قصة الزواج المرجع السابق ص٣١١.

قسەکەی "وۆل دیورانت" بەڵگەیە لەسەر ئەم راستییە کاتێک دەڵێت: (پەروەردەی منداڵەکان بۆ دەوڵەت لە چاخی یەکەمدا ئەرکی سەر شانی باوان بوو، مەردی و جوامێری (شەرەف) ئەوەی بەسەردا دەسەپاندن و رای گشتی پێویستی دەکرد لەسەریان، بەلأم ئێستا[1] بێماناترین شت ئەوەیە دلوا لە باوکان بکرێت تاکو ژمارەی دانیشتوانی شار زیاد بکرێت کاتێک دەبینین شار بە دانیشتوان تەنگی پێهەڵچنراوە).

رێگرەکانی سکپڕی بە هەردوو جۆرەکەیەوە ئامرازی و کیمیایی زۆر باڵادەست بوون، گەر ئەو دوانە سەرکەوتوو نەبوون منداڵەکان لەباری خۆیان دەبەن، بەڵێ، سەرەڕای ئەوەی فەیلەسوفان و یاسادانەران قەدەغەیان کردووە، بەلأم باڵاترین خێزان پەنای بۆ دەبەن)[2].

بەم جۆرە "ویلێ دیورانت" بەراورد دەکات لە نێوان بە شانازی کردن بە منداڵان و پەروەردەکردنیان بۆ خزمەتی نیشتمان لە چاخی کۆندا لەگەڵ بێمانایی ئەوە و پەروەردەی نەوەیەك لە چاخی کلاسیکیدا کە لە لقی دووەمدا باسی لەبارەوە دەکەین.

---

[1] مەبەست پێی چاخی کلاسیکییە بەتایبەت رۆمە ئەبیقوری ٣٠ پ.ز.–٩٦پ.ز. ینظر قصة الحضارة ٢/٣٠٢.

[2] قصة الحضارة المرجع السابق.

## لقی دووەم:
## تەڵاق لە چاخی کلاسیکیدا

ژن مافی تەڵاقی بەدەستهێناوە سەرباری پارێزگاری مێرد لە مافی تەڵاق بۆ خۆی، بەخێوکەری خێزان دەسەڵاتی خۆی بۆ کۆتاهێنان بە پەیوەندی ژن و مێردی کوڕ و کچەکانی لەدەستدا، گۆڕانێکی نامۆ بەسەر دیاردەی تەڵاقدا هات، بە شێوەیەکی وێنانەکراو رووداوی تەڵاق زۆر بوو، ئەو دیاردەیە تەنها خەڵکی بەگشتی نەگرتەوە بەڵکو پیاوە دیارەکان کە زیاتر لە یەك جار ژنیان دەهێنا و تەڵاقیان دەدان ژمارەیان نەدەهاتە هەژمارکردن.

بۆ نموونە "یۆلیۆس قەیسەر" چوار جار ژنی هێناوە و تەڵاقیداوە، فەیلەسوف "سنیکا" گاڵتە بە زۆری تەڵاق دەکات لە چاخی خۆیدا و دەڵێت: (هەندێ لە خانمانی چینە باڵاکان بە ژمارەی قونسوڵەکان تەمەنی خۆیان نازمێرن، بەڵکو بە ژمارەی مێردەکانیان، ئەوان تەڵاق دەدرێن بۆ ئەوەی مێرد بکەن و مێرد دەکەن بۆ ئەوەی تەڵاق بدرێن)!!![1].

بەم جۆرە خەڵکی لە تەڵاقدا خراپ مامەڵەیان لەگەڵ ئازادی ویستدا کرد، بە بێبایەخترین هۆ و لاوازترین بیانوو تەڵاق دەدەن، ژنەکەی تەڵاق دەدا، چونکە چووە بۆ تەماشاکردنی یاری بەبێ مۆڵەتی ئەو، ژنەکە پیاوەکەی تەڵاق دەدات چونکە لەگەڵ ئافرەت قسەی کردووە!!!

هیچ هۆیەکی دەرەکی یان ناوەکی بوونی نەبوو رێگر بێت لەبەردەم زۆری رووداوی تەڵاقدا، ئایین و یاسا دەسەڵاتیان نەبوو، هەر بەو جۆرە ویژدانی زیندووی بەئاگاهاتوو بوونی نەبوو، لەمەشەوە وێرانبوونی ماڵ و خانەوادەکان و هەڵوەشانەوەی خێزان و ئاوارەبوونی منداڵەکان و پەرەسەندنی فەساد سەریهەڵدا.

---

[1] المرأة عند الرومان المرجع السابق ص٣٢٢.

"ویل دیورانت" دەڵێت: (ئەوەی بۆ باوك هەبوو لە دەسەڵاتی تەواو بەسەر خێزانەکەیدا ئازادی نوێ تێکوپێکی شکاند، هەر بەو جۆرە دەستی بە وێرانکردنی سەرلەبەری قەوارەی خێزان کرد، ژنانی رۆمانی کەوتنە ناو بەرەڵاییەوە، ئەو ئازادییەی بە پیاوان درابوو بە ژنانیش درابوو، وەکو یەك یەکسان بەیەکتر، پۆشاکی ئاورشمی تەنك و سەرنجڕاکێشیان لەبەر کرد کە لە هند و چینەوە ئاوەردە دەکرا...)

پاشان بەردەوام دەبێت لە وتن و دەڵێت: (زینا بووە بە کارێکی ئاسایی، خەڵکی دەقیان پێوە گرتووە، هیچ ئافرەتێکی دەوڵەمەند نییە جارێك –بەلانی کەمەوە– تەڵاق نەدرابێت، لەم کارەدا تەنها ئافرەتان سەرزەنشت ناکرێن، چونکە گەورەترین هۆی پەرەسەندنی تەڵاق ئەوەیە هاوسەرگیری لای چینە باڵاکان چووەتە ژێر دەسەڵاتی پارە(ماڵ و سامان) و سیاسەتەوە...)[1].

بوستانی[2] دەڵێت: (هۆیەکانی زیادەڕەوی لە خۆشگوزەرانی سەریکێشا بۆ زۆری تەڵاق، پیاو پشتی لە ژنەکەی دەکرد بۆ ئەوەی ژنێکی تر بهێنێت، ژن لە مێردەکەی جیادەبوویەوە بۆ ئەوەی پەیوەندی بکات بە دۆستەکەیەوە)، هیچ کام لە ژنەکە یان پیاوەکە لە بەرزکردنەوەی داوای تەڵاقدا بەرپرسیار نەبوو لە رۆشنکردنەوەی هۆی تەڵاقەکە نە لەبەردەم یاسادا نە لەبەردەم رای گشتیدا.

بۆ نموونە: کاتێك "پۆلس ئەمیلیۆس" ژنەکەی(کە ناوی بابیریا بوو) تەڵاقدا، دۆستانی سەرزەنشتیان کرد و مەدح و سەنای ژنەکەیان کرد بەوەی ئافرەتێکی جوانە و ژیر و خۆشەویستە، ئەویش بەرپەرچیدانەوە و وتی: (پێڵاوەکانم تازەن و لەرووی دروستکردنەوە زۆر باشن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش من ناچارم بە گۆڕینیان، هیچ کەس جگە لە خۆم نازانێت لە کوێوە ئازارم دەدەن)!!![3].

---

[1] ينظر قصة الحضارة الجزء الأول من المجلد الثالث (قيصر والمسيح، أو الحضارة الرومانية) ص٢٧٨-٢٧٩.

[2] دائرة المعارف للبستاني ١١/٣٢٦.

[3] المرأة عند الرومان المرجع السابق ص٢٣٣.

ئازادی ویست لە تەڵاقدا لە چاخی کلاسیکیدا لە سیستمی گشتی دادەنرا، بۆیە هەر ڕێکەوتنێك لە نێوان دوو هاوسەرەکەدا لەسەر مەرجێك ئەو ئازادییە کۆتوبەند بکات پووچ و بێبنەما بوو، بەڵکو پێچەوانەی سیستمی گشتی بوو.

سەریاری ئەوە ڕازیبوونی هەریەك لە دوو هاوسەرەکە وەك چۆن بە پایەیەك لە پایەکانی دامەزرانی هاوسەرگیری دادەنرا هەر بەو جۆرە بە پایەیەك لە پایەکانی بەردەوامبوونی هاوسەرداری دەزانرا[1]، بۆیە نەمانی ڕازیبوون لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە لە بەردەوامی ژیانی هاوسەریدا هۆیەکەی هەرچییەك بێت مانای نەمانی ئەو پەیوەندییەی دەگەیەنێت لە دیدگای ڕەوایەتییەوە.

ئازادی ویستی دوو هاوسەرەکە لە تەڵاقدا ئەنجامێکی سروشتی بوو بۆ بنەمای ڕازیبوون لە گرێبەستی هاوسەرگیریدا، نەك تەنها لە کاتی دامەزرانیدا بەڵکو لە هەموو قۆناغێك لە قۆناغەکانی مانەوەیدا، بەڵام ئەم ئازادییە لە تەڵاقدا لە چاخی ئیمپراتۆریەتی خۆراوادا گۆڕانێکی بەرچاوی بەسەردا هات ئەوەش بەهۆی پەیامی ئایینی مەسیحییەوە و دەستتێوەردانی دەسەڵات بۆ دانانی سنوورێك لە خراپ بەکارهێنانی مافی تەڵاقدا لە پیاوەکەوە یان لە ژنەکەوە، ئەمەش لە لقی سێیەمدا ڕۆشن دەکەینەوە.

---

[1] مبادئ القانون الروماني المرجع السابق ص٢٤٧.

## لقی سێیەم:
## تەڵاق لە چاخی ئیمپراتۆرییەتی خوارووودا

لەم چاخەدا دەسەڵاتی ویست لە تەڵاقدا گۆڕانی بەسەردا هات لەو ئازادییە ڕەهایەی لە چاخی کلاسیکیدا لەسەری بوو بەرەو کۆتوبەندکردن بە کۆتوبەندگەلێك یاسا و دەستووری ڕۆمانی-بە کاریگەری ئایینی مەسیحی- دەیسەپاند، لەو کاتەوەی ئیمپراتۆرەکانی ڕۆمان ئەو ئایینەیان وەرگرت و ڕاستەوخۆ لەگەڵ بەدەستهێنانی ئەرکی دەسەڵات ئەم دروشمانەی مەسیحی لە هەموو ڕۆمادا بڵاو بوویەوە:

(هاوسەرگیری پەیوەندییەکە پچڕانی بۆ نییە)

(ڕۆڵەکان دەتوانن هاوسەرگیری بکەن یان هاوسەرگیری نەکەن، بەڵام گەر هاوسەرگیرییان دامەزراند ناتوانن هەڵیبوەشێننەوە)

(ئەوەی خودا پەیوەستی کردووە(گرێیداوە) مرۆڤ ناتوانێت هەڵیبوەشێنێتەوە)

(هاوسەرگیری گرێبەستێکە لەسەر بنچینەی ڕازیبوون، فەراهەمبوونی ئەو ڕازیبوونە تەنها لە کاتی دامەزراندنیدایە و بۆ بەردەوامبوونی هاوسەرگیرییەکە پێویست نییە)، ئیتر بەم جۆرە..

بۆیە کەنیسە گەر لە یاساڕێژی کاتیدا سەرکەوتوو نەبووبێت بۆ بەیاسایی کردنی بنەمای هەڵنەوەشانەوەی هاوسەرگیری ئەوا توانی سنوورێك دابنێت بۆ خراپ بەکارهێنانی مافی تەڵاق و کۆتوبەند کردنی ئازادی ویست تیایدا لەگەڵ جیاوازی لە ڕادەی ئەو کۆتوبەندکردنەدا لەبەر ڕۆشنایی ئەو قۆناغانەی یاساڕێژی تایبەت بە سیستمی تەڵاق پیایدا گوزەری کردووە، هەروەها لەبەر ڕۆشنایی ئەو گۆڕانانەی بەسەر سیتمی تەڵاقدا هاتووە، بەم جۆرە:

أ-سەردەمی قوستەنتین:

لەم سەردەمەدا گۆڕان لە سیستمی تەڵاقدا دەستی پێکرد بە دەرکردنی دەستووری ۲۳۱ زایینی که لە پێشەکییەکەیدا ڕاگەیەنرابوو: (دروست نییە هیچ کام لە مێرد و ژنەکە تەڵاقی یەکتری بدەن لەباری تووڕەییدا یان بە بیانووی لاواز و بێنەرزش)[1].

دەستوورەکە دیاریکردنی هۆیە پاساودەرەکانی تەڵاق بۆ هەریەك لە دوو هاوسەرەکە لەئامێز دەگرێت، بەم جۆرە:

**یەکەم–بۆ پیاو هەبوو ژنەکەی تەڵاق بدات** لەباری فەراهەم بوونی یەکێك لەم هۆیانەدا:

١–زینا: تێبینی دەکرێت زینای ژنەکە هۆیەك بووە مافی بە پیاوەکە دلوە تەڵاقی بدات، بەڵام زینای پیاو پاساوی نەدلوە بەدەست ژنەکەوە پیاوەکە تەڵاق بدات بەپێی دەستوور.

٢–حوکم بەسەر ژنەکەدا بەهۆی هەستان بە تاوانی ژەهرلویکردن.

٣–هەستان بە پیشەی دەلالّی(بەیەکتر گەیاندنی ژن و پیاو) لەلایەن ژنەکەوە.

**دووەم–بۆ ژنەکە هەبوو پیاوەکەی تەڵاق بدات** گەر لە یەکێك لەم دوو هۆیەوە گلابوو:

١–هەستان بە تاوانی ژەهرلوی کردن.

٢.روخاندنی گۆڕستان یان پێشێلکاری ڕێز و پایەی گۆڕستان.

شایانی باسە سەرپێچی لەم هۆیانە واینەدەکرد تەڵاق نەکەوێت، بەڵکو تەڵاق دەکەوت، بەڵام سزایەکی دارایی لەسەر پەیدا دەبوو کە خۆی دەبینییەوە لە بێبەشبوونی ژنەکە لە مارەییەکەی گەر بەبێ هۆ مێردەکەی تەڵاق بدابایە، هەروەها

---

[1] راجع المرأة عند الرومان ص٢٣٤ وما بعدها.

لە پابەندکردنی پیاو بە گێڕانەوەی مارەیی تەولو بۆ ژنەکەی گەر بەبێ هاتنەدی هۆیەك لە هۆ باسکراوەکان ژنەکەی تەڵاق بدابایە.

ب-سەردەمی جۆلیانووس:

چاکسازی یاساڕێژی تایبەت بە سیستمی تەڵاق لە ئیمپراتۆر "قوستەنتین"ەوە بە هەنگاوێکی پەلە و کارێکی پێشوەخت تەماشا دەکرا و بڕیارێك بوو بە نەرێت و بەندوباوی ریشەداری رۆمانەکانیدا دەکێشا لە ئاوەڵا بوونی تەڵاق بەبێ مەرج و کۆتوبەند، بۆیە کاتێك جۆلیانووس دەسەڵاتی گرتە دەست هەستا بە هەڵوەشاندنەوەی ئەم یاسایە و گێڕانەوەی ئازادی تەڵاق وەك جێبەجێ کردنی ئارەزوو و داوای گەل[1].

ج-سەردەمی تیۆدۆزیۆس و فانتیانۆس:

دوای مردنی جۆلیانووس و گەڕانەوەی ئیمپراتۆرە مەسیحییەکان بۆ سەر دەسەڵات هەوڵی تازە درا بۆ کۆتوبەند کردنی ویست لە تەڵاقدا، بۆیە ئەو دوو ئیمپراتۆرە ناوبراوە (تیۆدۆزیۆس و فانتیانۆس) دەستووری "٤٤٩ی زایینی"یان دەرکرد کە دیاریکردنی هۆیەکانی تەڵاق لەخۆ دەگرێت.

"تیۆدۆزیۆس" —لە هۆهێنانەوە بۆ ئەم سنووردارکردنە— دەڵێت: (ئەوەی پاڵیناوە بۆ ئەم دیاریکردنە بەرژەوەندی منداڵەکانە کە ئەوان قوربانی راستەقینەن لە زۆربەی بارەکانی جیابوونەوەی باوك و دایك)[2]

بەڵام ئەم دەستوورە کۆمەڵێك هۆی نوێی تایبەت بە تەڵاقی پیاو و ژن خستە سەر ئەو هۆیانەی دەستوورەکەی "قوستەنتین"، بەم جۆرە:

---

[1] المرجع السابق ص٢٣٥. الدكتور احمد الغندور الطلاق في الشريعة الاسلامية والقانون، الطبعة الأولى ١٩٦٧م ص٢٣.

[2] المرأة عند الرومان المرجع السابق ص٢٣٦.

**یەکەم-بۆ ژن هەیە پیاوەکەی تەڵاق بدات:**

گەر یەکێك لەم هۆیانە هاتە دی:

١-حوکم بەسەر پیاوەکەدا درابوو بەهۆی ساختەکاری یان دزی یان هەر تاوانێکی ترەوە.

٢-هەوڵی پیاو بۆ دەستدرێژیکردنە سەر ژیانی ژنەکەی وەك هەوڵدان بۆ کوشتنی.

٣-خراپی پیاو لە مامەڵەکردنی ژنەکەیدا.

٤-ناپاکی هاوسەری لەلایەن پیاوەکەوە.

**دووەم-بۆ پیاو هەیە ژنەکەی تەڵاق بدات لە یەکێك لەم بارانەدا:**

١-ژنەکە رێز و پایەی گۆڕستان پێشێل بکات.

٢-حوکمدان بەسەریدا بەهۆی دزییەوە.

٣-هەوڵدان بۆ دەستدرێژیکردنە سەر ژیانی پیاوەکەی.

٤-بە ژیانێکی ئازادانەی زیاد لە پێویست بژی.

دەستووری ناوبراو بڕیاریدا گەر ژنەکە پیاوەکەی تەڵاق بدات بەبێ هۆیەك لەو هۆیانە ئەوا مافی خۆی لە گێڕانەوەی دووتە(مارەیی و ئەو ماڵ و سامانەی لە ماڵی باوکییەوە لەگەڵ خۆی دەیهێنا) لەدەست دەدات.

هەر بەو جۆرە گەر پیاوەکە ژنەکەی تەڵاق دا بەبێ هۆیەك لەو هۆ باسکراوانە مافی گێڕانەوەی مارەیی لەدەست دەدات کە بە بۆنەی هاوسەرگیرییەوە بە ژنەکەی دابوو[1].

---

[1] المرجع السابق ص٢٣٧. قصة الزواج المرجع السابق ص٣١٠-٣١١ الدكتور شاب توما القانون الروماني ص٧٢ الدكتور جميل الشرقاوي المرجع السابق المقارنات والمقابلات المرجع السابق ص٣٥٩. جبرائيل البناء القانون الروماني ص١٠١. الدكتور ممدوح عمر مصطفى القانون الروماني ص٤.

د-سەردەمی جۆستنیان:

جۆستنیان لە ئیمپراتۆریەتی رۆژهەلاتدا سالی(٥٢٧–٥٦٥)ی زایینی دەسەلاتی گرتە دەست، کۆمەلێك گۆرانکاری لە سیستمی تەلاقدا هێنا ئاراوە کە دەتوانین بۆ چوار جۆر جیایان بکەینەوە، بەم شێوەیە:

**١-تەلاق بە هۆیەکی رەوا:**

ئەوەش ئەو تەلاقە بوو بە ویستی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە دەکەوت لەگەلْ راستبوونەوەی هۆیەکی پاساودەر لەلای هاوسەرکەی ترەوە، کۆمەلێك هۆی دیاریکراوی تر بۆ هەریەك لە دوو هاوسەرەکە بریار لێدابوو ئەو هۆیانە رێگەیان پێدەدا پەنا بۆ تەلاق ببات لەباری فەراهەمبوونی یەکێك لە هۆیەکان:

**أ.بۆ پیاوەکە هەیە ژنەکەی تەلاقبدات بە یەکێك لەم هۆیانە:**

١–گەر بەبێ مۆلەتی پیاوەکە رۆیشت بۆ گەرماوی گشتی.

٢–گەر خواردنی لە شوێنە گشتییەکان خوارد.

٣–گەر رۆیشت بۆ یاریگا بە هاوەلی کەسێکی نامەحرەم.

٤–گەر زینای کرد.

٥–گەر پیشەیەکی ئەنجامدا سەرەرای بەرهەلستی پیاوەکەی.

٦–گەر دەستدرێژی کردە سەر ژیانی پیاوەکەی.

**ب–بۆ ژنەکە هەیە پیاوەکەی تەلاق بدات لە یەکێك لەم بارانەدا:**

١–گەر بەشداری کرد لە پیلانێك دژ بە سەلامەتی دەولەت.

٢–گەر لەگەلْ ئافرەتێکی بێگانە خەوت لە مالەکەی خۆیدا(مالی هاوسەرداری)

٣–گەر دەستدرێژی کردە سەر ژیانی ژنەکەی.

٤–گەر کۆچی کرد لە خانەی هاوسەری.

گەر تەلاق لە پیاوەکەوە یان ژنەکەوە ئەنجام درا بە یەکێك لەو هۆ باسکراوانە ئەوا ئەو کەسەی هەستاوە بە هەلەکە و پاساوی تەلاقدانی لەسەر پەیدا بووە رووبەرووی سزایەك دەکرێتەوە لانی کەم لەدەستدانی مافی دارایییە کە لەسەر تەلاق

سەرهەڵدەدات، گەر هەڵەکەش لە پیاوەکەوە نەبوو ئەوا ژنەکە مافی خۆی لە وەرگرتنەوەی "دووتە" لەدەست دەدات هەر بەو جۆرە بێبەشبوونی لە هەدیەی هاوسەرگیری.

سەرباری ئەوەی ژنی زیناکەر کە بەهۆی ئەنجامدانی ئەو کارەوە تەلاق دراوە بە بەندکردنی هەتاهەتایی لە دێرێکدا حوکم بەسەریدا دەدرا، ئەوەش وایدەکرد بێبەش بێت لە هاوسەرگیرییەکی تر[1].

بەلآم ئەو پیاوەی ژنەکەی تەلاقی دەدا بە بوونی هۆیەك لە هۆ پاساودەرەکان تیایدا لە دووتە و هەدیەی هاوسەرگیری بێبەش دەکرا.

**٢-تەلاق بێ پاساوێکی ڕەوا:**

شایانی باسە کۆتوبەندی سەپاو بەسەر ویستی دوو هاوسەرەکە لە تەلاق-لە یاسای "جستنیان"دا بێت یان لە یاساکانی پێش ئەو- سەرپێچی لێیان سەرینەدەکێشا بۆ نەکەوتنی تەلاق، بەلکو تەلاق دەکەوت، بەلآم سزای لەسەر پەیدا دەبوو بۆ ئەو هاوسەرەی لە کاری تەلاق دەچووەپێش سەرەڕای نەبوونی هۆیەکی ڕەوا پاساوی بدات وەك کارێکی موباح:

١-ئەو ژنەی بەبێ هۆ مێردەکەی تەلاق دەدا ماف وەرگرتنەوەی "دووتە"ی لەدەست دەدا کە لە ماڵی باوکیەوە لەگەڵ خۆی هێنا بووی و موڵکدارییەکەی بەتەواوی دەدرا بە مێردەکەی گەر منداڵیان نەبولیە، ئەگەر نە، موڵکداری سەرەماڵ(واتە خودی ماڵەکە) دەچوو بۆ منداڵەکان و موڵکداری قازانجەکەی بۆ پیاوەکە، هەر بەو جۆرە بێبەش دەکرا لە هەموو جۆرە بەخشین و هەدیەیەك کە بە بۆنەی هاوسەرگیرییەوە پێشکەشیان کرابوو، بە هەمان شێوە هەموو ماڵ و سامانەکەی لەدەست دەدا، سێیەکی ئەو ماڵ و سامانە دەچوو بۆ "دێر" کە بەسەر

[1] ینظر مبادئ القانون الروماني المرجع السابق ص٢٥٠. الدكتور الشرقاوي المرجع السابق ص٢٢٩.

ژنەکـەدا دەسـەپا تیایـدا بمێنێتـەوە، دوو بەشـەکەی تـر دەچـوون بـۆ لقـەکان و بنەڕەتەکان(لە میراتگرانی ژنەکە).

ب-بەڵام گەر پیاو بەبێ هۆ ژنەکەی تەڵاق بدابایە ئەوا مافی خۆی لە دووتە(مارەیی و ماڵی هێنراو لەگەڵ ژنەکـە لـە باوانـەوە) لەدەسـت دەدا و ژنەکـە بـە تـەواوی لێـی وەردەگرتەوە، هەر بەو جۆرە لەو هەدیە و بەخشینانەی بە بۆنەی هاوسـەرگیرییەوە پێیان بەخشرا بوو بێبەش دەکرا.

هەر بەو جۆرە بەشێك لە ماڵ و سامانی لەدەست دەدا کـە سـێیەکی بەخشـین و خەڵاتەکانی هاوسەرگیری بوو، ئـەو بەشـە دەبـوو بـە مـافێکی پاڵفتـەی ژنەکـە گـەر منداڵیان نەبوایە، ئەگەر نە مولکداری سەرەماڵ دەچوو بـۆ منداڵـەکان و مـافی سـوود لێبینین بۆ ژنەکە.

لەباری نەبوونی دووتە و خەڵات و بەخشیندا چارەکی ئەسـتۆگری مێردەکـە بـۆ ژنەکـە هـەبوو لـە جێگـەی ئـەو بـڕە لـە مـاڵ و سـامان بـەپێی یاسـای جۆسـتنیان ژمارە(١١٧)[1]

بەم سزایانە جۆستنیان توانی قەدەغەکردنێکی توند بخاتـە سـەر تـەڵاق لـە یـەك لایەنەوە بەبێ بوونی هۆیەك.

٣-تەڵاقی ناوەڵا(موباح):

ئەو تەڵاقە بوو هۆیەکی ڕەوا کە لە لایەکەی تردا بوونی هەبوو بەبێ کەمتەرخەمی یان هەڵە لە ئەمەوە پاساوی دەدا.

یاسای ژمارە(١١٧)ی جۆستنیان ئەو پاساوانەی لەم خاڵانەدا کورت کردبووەوە:

---

(١) ينظر الزواج والطلاق في جميع الاديان المرجع السابق ص٦٢١.

بوتييه فقرة (٢٢١) نقلا عن الدكتور الشرقاوي المرجع السابق ص٢٢٩ هامش (٢).

الدكتور عبد المنعم البدر والدكتور البدرأوي المرجع السابق ص٢٦٥.

القانون الروماني للدكتور عمر ممدوح المرجع السابق ص٢٠٥.

١- نەزۆی پاکداوێنی(چوونە ناو رەهبانیەتەوە)، گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە ئەوەی هەڵبژارد بە کەمتەرخەمی و هەڵە دانانرێت، بەڵکو پاساو دەدرێت بە لایەکەی تر تەڵاقی بدات و هیچ سزایەکی لەسەر پەیدا نەبێت.

٢- شێتێتی لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە پاساو دەداتە دەستی ئەویتر تەڵاقی بدات.

٣- گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بەدیلگیرا و لە ژیان و مردن چارەنووسی دیارنەبوو بۆ لایەکەی تر دروستە تەڵاقی بدات گەر ماوەیەك گوزەری کرد گومانی زاڵ بەلای ئەوەدا بچێت کەسەکە لە ژیاندا نەمابێت.

٤- پەککەوتنی هێزی جووتبوون: گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە رووبەرووی پەککەوتنی هێزی جووتبوون بوویەوە ئەوا بۆ ئەویتر هەیە تەڵاقی بدات.

٥- نەزۆکی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە، گەر یەکێکیان نەزۆك بێت، ئەویتریان دەتوانێت تەڵاقی بدات.

تەڵاق لە هەموو ئەو بارانەدا ئاوەڵا بوو بۆ هەریەك لە پیاوەکە و ژنەکە و هیچ سزا و سەرزەنشتێکی لەسەر پەیدا نەدەبوو، چونکە بە هۆیەکی رەوا بووە و ئەو کەسەی هۆیەکەی پێوە راست بووەتەوە هیچ کەمتەرخەمی و هەڵەیەکی تێدا نەبووە.

**٤- تەڵاق بە رێکەوتنی ژن و پیاوەکە :**

وا دەردەکەوێت ئەم جۆرە لە تەڵاق لە هەموو چاخەکانی رۆماندا رێگەپێدراو بووە، ئەم جۆرە تەڵاقە راستبوونەوەی هەڵە لە یەکێکیانەوە و شێوەیەکی تایبەتی داوا نەدەکرد، بەڵام فەراهەمبوونی هەندێ مەرجی پێویست دەکرد، لەوانە:

أ- ئەو لایەنەی ئارەزووی خۆی بۆ تەڵاق نیشان دەدا بە رێکەوتنی هەردوو لا پێویست بوو راشکاوانە لەبەردەم حەوت شایەتی رۆمانی هاونیشتمانی باڵغدا رایبگەیەنێت.

ب- لایەنی ئارەزوومەند بە تەڵاق پیاوێکی دەنارد بۆ لای لایەنەکەی تر بۆ ئەوەی بڕیارەکەی پێبگەیەنێت تاکو رازیبوونی لێوە بەدەست بهێنێت.

ئەم دوو مەرجە شێوەگرییە یاسای جۆستنیان دایهێنان[1].

**ئەنجامگیری:**

لەم باسە کورتەوە لەمەڕ حوکمەکانی تـەڵاق لـە گۆشـەنیگانی(رادەی دەسـەڵاتی ویست لە تەڵاقدا) دەگەینە ئەم سەرئەنجامانە:

١- ئەخلاقی ناوەکی و هەستی ویژدانی بە بەرپرسیارێتی لەبـەردەم خـودا و رای گشتیدا رۆڵی گەورە و کاریگەری هەبووە لە کەمکردنەوەی روودانی تەڵاق وەك لە چاخی کۆنی رۆمانیدا، بە جۆرێك پێـنج سـەد سـاڵێك بەسـەر تەمـەنی ئـەو گەلەدا گوزەری کردووە بەبێ ئەوەی تەنها یەك رووداوی تەڵاق روویدابێت.

چاوچنۆکی مادی و جیـاوازی چـینایەتی و ململانێـی سیاسـی و رێگـەدان بـە ئـازادی زیـاد لـە پێویسـت و تێکەیشـتنی هەڵـە لـە دیـاریکردنی ئامـانجی هاوسەرگیری رۆڵی گەورە و کاریگەریان هەبووە لە زۆربوونی رووداوی تەڵاق و وێرانکردنیماڵەکان و روخاندنی ئـافرەت و ئـاوارەبوونی منـداڵان، لەوێشـەوە پەرەسەندنی خراپە و وێرانبوونی کۆمەڵگـە وەك چـۆن لـە چـاخی کلاسـیکی ژیانی رۆماندا روویدا.

٣- زیـاد لـە پێویسـت پێـدانی مـافی تەڵاقـدان بـە ژن(یـان دلوای جیابوونـەوەی قەزاییانە) سەردەکێشێت بۆ زۆری رووداوی تەڵاق.

٤- هۆشـیاری ئـایینی و رێکخسـتنی یاسـاییانە بـۆ هاوسـەرگیری و تـەڵاق بـە رێکخستنێکی ماقووڵی دادپەروەری بێلایەن-نەك لایـەنگر بـۆ ژنەکـە یـان بـۆ پیاوەکـە- لەگـەڵ سـەپاندنی سـزاگەلێکی جەسـتەیی و دارایـی بەسـەر هـەر کەسێکدا پەنا بـۆ بـەکارهێنانی چـەکی تـەڵاق دەبـات دژ بـە لایەکـەی تـر لـە هاوبەشـی ژیـانی هاوسـەریدا بـەبێ هۆیـەکی رەوا، هـەموو ئەمانـە کاریگـەری

---

[1] حقوق الرومان المرجع السابق ص٨٨.

گەورەیان دەبێت لە دانانی سنوورێك بۆ ئاشووب و ئاڵۆزیگەلێك كە زاڵە بەسەر هەندێ لە خێزانەكانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا.

وەك چۆن سەركەوتنی ئەم ئەزموونە لە چاخی ئیمپراتۆرییەتی خواروی چاخەكانی رۆمان روویدا.

دیمەنی ئازاربەخش و دیاردەی رسواكەر لە دادگا شەرعییەكانی هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتە ئیسلامییەكان و عەرەبییەكان باشترین گەواهیدەرێكە لەسەر رادەی پشتگوێخستنی رێكخستنی ژیانی خێزان و دەستبەرداربوونی ژن و پیاوەكە بۆ بڕیاردان و هەڵسوكەوت بەو پێیەی ئارەزوو و ویستیان داوای دەكەن لەژێر دروشمی(ئازادی ویست لە تەڵاقدا).

# بەشی پێنجەم:
# تەڵاق لەلای عەرەب پێش هاتنی ئیسلام

بۆ هاوسەرگیری و رێگەی هەڵوەشانەوەی چەندین جۆر هەبوو، بۆیە ناوەڕۆکی ئەم بەشە بەسەر دوو باسدا دابەش دەکەین:

یەکەمیان جۆرەکانی هاوسەرگیری لەخۆ دەگرێت.

دووەمیان رێگەکانی جیابوونەوەی ژن و مێرد لەیەکتری.

# باسی یەکەم:
# هاوسەرگیری و جۆرەکانی
# لەلای عەرەب پێش ئیسلام

عەرەب پێش ئیسلام چەندین جۆری هاوسەرگیری زانیوە، ئەو هاوسەرگیرییانە لە نێوان خۆرسکی نزیک بە بەرەڵایی و نێوان ئەوەی لە هاوسەرگیری شەرعی دەچێت لەم سەردەمەدا هاتوچۆیان دەکرد.

گرنگترین مەرامەکانی هاوسەرگیری لەلایان-وەك لە هەموو كۆمەڵگەكانی تردا- بریتی بوو لە منداڵبوون و نەوە خستنەوە، سەرباری ئەوەی لەپشت پەیوەندی خزمایەتییەوە ئامانجیان بوو پەیوەندییە تیرەیی و هۆزایەتییەکانیان پتەو بکەن، کاتێك ژنەکە لە هۆز و تیرەیەکی تر بوو.

بەڵام نەریتی باڵادەستی بڕیاردەر لەوەی کچی مام تەنها کوڕی مام دەتوانێت بیهێنێت و کچەکە هیچ هەڵبژاردەیەکی نەبوو جگە لە مێردکردن بە کوڕی مامەکەی لە گرنگی ئەم ئامانجەی کەم کردبووەوە.

ئەم نەریتە پەرەی سەند بەجۆرێك وای لێهات کچی مام لە هۆزەکەی تر هاووتا بوو لەگەڵ ژنی کوڕی مامدا، ئەم ڕۆحە جێگەی شانازی بوو، پێچەوانەکەشی جێگەی سووك تەماشاکردن و سەرسوڕمان بوو[1]، تاکو ئێستا کاریگەری ئەم دیاردە کۆمەڵایەتییە نەریتییە لەلای هەندێ لە هۆز و عەشایەرە عەرەبەکان ماوەتەوە.

---

[1] ینظر الآلوسي (محمود شكري): بلوغ الأرب في معرفة احوال العرب ط/٢ القاهرة ١٣٤٧هـ ٢/٣، ٣٢، ١٧٤/٣.

مەرجەکانی هاوسەرگیری:

لە هەندێ مەرجەکانی جۆرەکانی هاوسەرگیری هاتنەدی رازیبوون و فەراهەمبوونی مارەیی بەمەرجگیرا بوو.

أ-رازیبوون:

لەلای زۆرێك لە هۆزەکان رازیبوونی پیاو و سەرپەرشتیار باوکی کچەکە بێت یان برا یان باپیر یان مام یان کەسێکی نزیك و نزیکتر لە کەسوکاری بەهەندگیرابوو، بۆ کەسی سەرپەرشتیار هەبوو ئافرەتەکە لەسەر هاوسەرگیری ناچار بکات.

بەڵام هەندێ لە هۆز و تیرەی تر لەپاڵ رازیبوونی سەرپەرشتیار و پیاوەکەدا رازیبوونی ژنەکەیان بە مەرج دادەنا و هاوسەرگیرییان بە هاوتابوونی رازیبوونی ئەو دوانەوە گرێدابوو.

ب-مارەیی:

بریتی بوو لە برێك لە ماڵ و سامان پیاوەکە دەیدا بە سەرپەرشتیاری ژنەکە، هەر هاوسەرگیرییەك بەبێ مارەیی جێگەی گاڵتەجاڕی بوو، بەڵکو رسوایی و سەرشۆڕی بوو بۆ ژنەکە و هۆزەکەی.

لە هەندێکدا دابەش دەکرا بۆ دوو بەش "دواخراو و خێرا"، دواخراو دەبووە قەرزێك لە ئەستۆی پیاوەکەدا و لەدوای مردنی لە لێجێماوەکەی دەردەکرا، وەك چۆن لە ئێستادا باوە لە هەندێ لە وڵاتان لەوانە عێراق.

لە نەرێتی عەرەبەکاندا برێکی دیاریکراو بۆ مارەیی بوونی نەبوو، بەڵکو لەرووی چەندێتی و چۆنێتییەوە بە رێکەوتنی دوو لایەنەکە دیاریدەکرا، ئەوەش لەبەر رۆشنایی توانای دارایی و پلە و پایەی کۆمەڵایەتی هەریەك لە دوو هاوسەرەکە، هەندێ کات دەگەیشتە (١٥٠) وشتر واتە نزیك بە خوێنی(قەرەبووی) کوژراوێك، بەڵکو

زۆرتر لەوە[1]، مارەییش زۆربوایە یان کەم بوایە بە موڵکی سەرپەرشتیار دادەنرا نەك موڵکی ژنەکە.

دوای ئەوەی ئیسلام هات ئەم نەریتەی هەڵوەشاندەوە و بڕیاریدا مارەیی موڵکی ژنەکە بێت و حەڵاڵ نەبێت بۆ کەسێکی تر مەگەر بە رازیبوون و دڵاوایی ژنەکە، بۆیە خودا -ﷻ- دەفەرموێت: ﴿وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ نَفْساً فَكُلُوهُ هَنِيئاً مَرِيئاً﴾[2]

**حەرامکراوەکان لە هاوسەرگیریدا:**

نەریتی عەرەبەکان وابوو هاوسەرگیری لەگەڵ دایك و کچ و خوشك و پوور(لە دایك و لە باوکەوە) بە حەرام دەبینرا، هەر بەو جۆرە حەرام بوو لەسەر ئافرەت مێرد بە بنەڕەتەکانی یان لقەکانی یان براکانی یان مامەکانی خۆی بکات[3].

**شێوەگری هاوسەرگیری:**

هاوسەرگیری لەلای عەرەب هیچ رەنگێك لە رەنگەکانی شێوەگری وەرنەگرتبوو، بەڵکو گرێبەستێکی رازیبوونانە بوو بە رازیبوونی پیاوەکە و سەرپەرشتیاری ژنەکە و دیاریکردنی مارەیی ئەنجام دەدرا، بەڵام لە نەریتەکانیاندا ئەنجامدانی دوو خوانی تێدا بوو: (خوانی داخوازی و خوانی بوکێنی)

---

(1) الميداني (ابو الفضل احمد بن محمد النيسابوري) مجمع الأمثال طبعة القاهرة ١٣٤٢هـ ١٠٢/٢.
المحمصاني (الدكتور صبحي المحمصاني): الأوضاع التشريعية في الدول العربية ماضيها وحاضرها ط/٣ بيروت ١٩٦٥م ص٦٠.

(2) سورة النساء: ٤.

(3) المحمصاني المرجع السابق ص٦٠.

**فرەژنی:**

فرەژنی عورفێکی بالآدەستی باو بوو لەلای عەرەب بەر لە هاتنی ئیسلام، هەموو خاوەن دەسەلآتێك(دەوڵەمەندێك) مافی ئەوەی هەبوو چەندی بوێت لە ئافرەتان مارەی بکات بەبێ ئەوەی بەرپرسیار بێت لەبەردەم شەریعەت و یاسا و عورفێکدا.

نهێنی ئەوەش بۆ چەندین هۆ دەگەڕایەوە گرنگترینیان کەمی ڕێژەی پیاوان بەهۆی جەنگ و هێرش و پەلاماری بەردەوامی هۆزە عەرەبەکان بۆ سەر یەکتری.

کاتێك ئیسلام هات دوورترین رادەی دیاریکرد بە چوار ژن لەباری ویستی هاوسەرگیری بە زیاتر لە یەك ژن بە بیانوویەکی رەوا لەگەڵ دڵنیابوونەوە لە هاتنەدی دادپەروەری، ئەگەر نە، پێویستە خۆی لەسەر تەنها یەك ژن کورتبکاتەوە، خودا- ﷻ- دەفەرموێت: ﴿فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ فَان خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً﴾[1].

قەیسی کوڕی حارس دەڵێت: موسڵمان بووم و هەشت ژنم هەبوو، گەیشتم بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەوەم پێ وت: ئەویش فەرمووی: ((چواریان لێ هەڵبژێرە))[2]، غەیلانی کوڕی سەلەمە: موسڵمان بوو، دە ژنی هەبوو، هەموویان لەگەڵی موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ کرد لەناویاندا چوار ژن هەڵبژێرێت[3].

ئیسلام دانی بە دروستی هاوسەرگیری هەموو ئەوانەدا ناوە موسڵمان بوون و فەرمانی پێ نەکردوون بە دووبارەکردنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری لە دوای

---

[1] (وَان خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ فَان خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَو مَا مَلَكَتْ أَيْمَانكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلَّا تَعُولوا) (النساء:٣)

[2] (عَنْ قَيْس بْن الْحَارِث قَالَ أَسْلَمْتُ وَعِنْدِي ثَمَانِي نِسْوَةٍ فَأَتَيْتُ النبي ﷺ فَقُلْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ اخْتَرْ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا) {ابن ماجه ١٩٤٢}.

[3] لمزيد من التفصيل ينظر ابن قدامة (عبدالله بن محمد بن قدامة المقدسي) (ت ـ ٦٢٠هـ): المغني. مطبعة عاطف ٦/٦٢٠، ٦٢١.

موسڵمان بوون.

کۆکردنەوەی دوو خوشك لەگەڵ یەکتر لە هاوسەرگیریدا لە لای عەرەب دروست بوو، ئیسلام هات و حەرامی کرد بە ئایەتی: ﴿وَأَن تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾[1]، ئەمە رستەیەکی عەتفکراوە(معطوف) بۆ سەر (أمهاتكم)، واتە حەرامکراوە لەسەرتان دوو خوشك لە هاوسەرگیریدا کۆبکەنەوە.

**جۆرەکانی هاوسەرگیری:**

عەرەبی پێش ئیسلام چەندین جۆر لە هاوسەرگیری هەبوو، لەوانە:

**أ. هاوسەرگیری زانراو و باو لە ئێستادا:**

هاوسەرگیری بە رازیبوونی سەرپەرشتیار و هەردوو هاوسەرەکە و پێدانی مارەیی تەواو دەبێت، لە نموونەکانی ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە ئەوەیە "أبو الفرج الأصفهاني"[2] گواستوویەتەوە: محمد بن البشير الخارجي دوو ژنی هەبوو، بەڵێنیان پێدا بوو لە شوێنێك پێی بگەن کە رانەمەڕەکەی بۆ دەبات، هەردووکیان لە هاتنەکەیان دواکەوتن، ئەویش دەچووە سەر بەرزاییەکان و دادەبەزی و تەماشای دەکرد بزانێت بەڕێوەن یان نە، بەڵام هیچ یەکێکیانی نەبینی، ئەو لەو بارەدا بوو لەناکاو دوو ژنی بینی لە چیاکەوە دادابەزین، وتی دادەبەزم و قسەیان لەگەڵ دەکەم، بینی ئافرەتێکی بەتەمەنە و کچێکی لاوی لەگەڵدایە، بۆیە پێیەوە سەرسام بوو، وتی بە ئافرەتە بە تەمەنەکە: ئەم کچەی خۆتم لێ مارە دەکەی؟ وتی: گەر شایستە بیت، ئەویش رەچەڵەکی خۆی بۆ باس کرد، وتی: رەچەڵەکەکە دەناسم بەڵام روخسارەکە ناناسم، بەڵام باوکی ئەم کچە بۆخۆی دێت، باوکی کچەکە هات و پیاوەکەی ناسی و

---

[1] (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ مِنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُمْ مِنْ نِسَائِكُمُ اللَّاتِي دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلابِكُمْ وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُوراً رَحِيماً)(النساء:٢٣).

[2] علي بن الحسين الاصبهاني (ت ٣٥٦هـ): كتاب الأغاني مصور عن طبعة دار الكتب ١٥/١٠٨.

ژنەکەی هەواڵی داواکارییەکەی پێدا، وتی: باشە، کچەکەی خۆی لێ مارە کرد و ئەویش بەشێك لە ئاژەڵەکەی خۆی پێدا(واتە وەك مارەیی پێیدا)، پیاوەکە(محمد) چووە لای ژنەکەی خۆی و پاشان گەیشت بە دوو ژنەکەی تری.

ئەم رووداوە لەو دەشت و کێوانە بەڵگەیە لەسەر وێنەیەکی سادەی هاوسەرگیری کە تەنها بە رازیبوونی دوو لایەنەکە و پێدانی مارەیی بەبێ شایەت و کاهین و قازی و داخوازی یان خوان و ئاهەنگ، یان شتانی تر لە رێکاری ئاڵۆزی هەبوو لەم سەردەمەدا.

ئیسلام دانی بەم جۆرە سادە لە هاوسەرگیریدا ناوە، بەڵام مەرجی ئامادەبوونی دوو شایەتی خستۆتە سەر وەك خۆپارێزییەك لە سەرئەنجامی نەرێنی.

**ب-هاوسەرگیری بێزراو:**

ئەوەش بریتی بوو لە هاوسەرگیری ژن بە یەکێك لە کوڕی مێردەکەی دوای مردنی مێردەکەی(ئەو کوڕانەی لە ژنەکە نین) یان بە میراتی دەگرت بەبێ ویستی ژنەکە، لەم رووەوە ئافرەتەکە وەك بەشێك لە لێجێماو تەماشا دەکرا، بۆیە مافی هاوسەرگیری تری نەبوو لەگەڵ کەسانێك جگە لە میراتگران، گەر مێردەکەی بمردبایە ئەوا بۆ کوڕە گەورەکەی(لە ژنێکی تر) هەبوو ژنەکەی باوکی مارە بکاتەوە، ئەوەش بە هەڵدانی پۆشاکێك بۆ سەر ئافرەتەکە.

گەر پیاوەکە ئارەزووی هاوسەرگیری لەگەڵی نەبوایە ئەوا مافەکە دەگوازرایەوە بۆ براکانی تری یان بۆ کەسوکاری تر، ئیسلام ئەم نەریتەی پووچەڵ کردەوە، خودا- ﷻ- دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنْكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ أَنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتاً وَسَاءَ سَبِيلاً﴾[1].

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهاً﴾[2]

---

[1] سورة النساء: ٢٢.

[2] (النساء:١٩).

**ج-هاوسەرگیری کینە :**

جەنگاوەر لە جەنگدا ژنێکی بەدیل دەگرت و بەبێ مارەیی و بەبێ رازیبوونی ئافرەتەکە و سەرپەرشتیاری ئافرەتەکە هاوسەرگیری لەگەڵ دەکرد، چونکە بەدیلگرتن لە هۆیەکانی بەکۆیلەکردن بوو، کۆیلە بەندە بێت یان کەنیزەك مولکی سەردارەکەیەتی، ئەم مولکدارییە بە جۆرێك لە هاوسەرگیری دادەنرا و چوونە لای ژنەکەی موباح دەکرد.

ماوەیەکی کاتی لە سەرەتای ئیسلامەوە کار بەم نەرێتەکراوە، پاشان ئیسلام چەندین بنچینە و رێگەی گرتەبەر بۆ کۆتاهێنان بە سیستمی کۆیلایەتی بێزراو، زۆرێك لە ئایەت دابەزی کە ئاشکرای ئایەتەکان ئاماژە دەکەن بە حەرام بوونی کۆیلەکردنی مرۆڤ بۆ برا مرۆڤەکەی هۆیەکەی هەرچییەك بێت، لەوانە ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أنا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذكَرٍ وَانثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا أن أكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أتْقَاكُمْ﴾[1].

**د-هاوسەرگیری موتعە :**

ئەوەش هاوسەرگیرییەکی کاتی بوو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، تەنها مارەیی و رازیبوونی ژنەکە و دیاریکردنی کاتەکەی تێدا بەمەرج دەگیرا، ئەم هاوسەرگیرییە بە کۆتاهاتنی کاتەکەی کۆتایی پێ دەهات بەپێی رێکەوتنی هەردوو لا، ئەم جۆرە لە هاوسەرگیری میراتی پێ جێگیر نەدەبوو گەر یەکێکیان لەو ماوەیەدا بمردبایە، گەر ئەوە لە گرێبەستەکەدا بەمەرج نەگیرابایە، بەڵام رەچەڵەکی پێ دادەمەزرا و "عیدە"ی پێوە پێویست دەبوو.

---

یقول القرطبي (٥/٩٤): گەر پیاوێك مرد کەسوکاری هەبوو ئەوان لەپێشترن بە مارەکردنەوەی ژنەکەی گەر بیانەوێ مارەی دەکەنەوە گەر نەیانویست مارەی ناکەنەوە.

(١) (يَا أَيُّهَا النَّاسُ أنا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذكَرٍ وَانثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا أن أكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أتْقَاكُمْ أن اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)(الحجرات:١٣).

لە سەرەتای ئیسلامەوە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ چەند بارێکی پێویست دانیپیادانا، پاشان نەسخی کردەوە و پووچەڵ بوویەوە لەسەر رای جمهووری فەقیهانی موسڵمان، بەڵام هەندێك پێیانوایە(وەك ئیمامییەکان) ئەم هاوسەرگیرییە بەردەوامە، چونکە لەلایان بە بەڵگەیەکی جێگیر نەسڕاوەتەوە[1].

**هـ-هاوسەرگیری ژن بە ژن:**

ئەوەیە بۆ نموونە کچەکەی یان خوشکەکەی بکاتە هاوسەری کەسێکی تر و ئەویش کچەکەی یان خوشکەکەی بکاتە هاوسەری ئەو، و لە نێوانیاندا مارەیی نەبێت و هەریەکەیان ببێتە مارەیی ئەویتر[2]، ئیسلام ئەمەی پووچ کردەوە لەبەر ئەو گرفتە خێزانی و کۆمەڵایەتیانەی لەسەر ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە سەریان هەڵدەدا، هەروەها لەبەر ئەوەی مارەیی دەبێت شتێك بێت قابیلی مامەڵە پێکردن بێت، بۆیە دروست نییە هەریەکەیان ببنە مارەیی ئەویتریان.

**ئاساری هاوسەرگیری:**

لە گرنگترین ئاسارەکانی هاوسەرگیری لای عەرەب پێش ئیسلام لەدوای سەرهەڵدانی مافی ئاڵوگۆڕکراوی هەریەك لە دوو هاوسەرەکە ئەوەیە ژنەکە بە مێردکردنی پەیوەندی خۆی بە خانەوادەکەیەوە دەپچڕی و لە هۆزەکەیەوە دەگوێزرایەوە بۆ ناو هۆزی مێردەکەی، ئەمەش تا رادەیەکی زۆر لە هاوسەری دەچێت لەگەڵ سەروەریدا لەلای رۆمانەکان وەك پێشتر باسمان کرد، بەڵام ئیسلام ئەم ئەسەرەی پووچ کردەوە و فەرمانی کرد بە سیلەی رەحم و بەردەوامی پەیوەندی ژنەکە بە خانەوادە و کەسوکاریەوە.

---

[1] ينظر جعفر بن الحسن الحلي: المختصر النافع في فقه الأمّامية طبعة ١٣٨٣هـ ص٢٠٧ وما بعدها. العيني شرح البخاري المرجع السابق ١١١/٢٠.

[2] العيني المرجع السابق ١٠٨/٢٠. سبل السلام ١٥٩/٣.

# باسی دووەم:
# ڕێگەی کۆتاهاتنی هاوسەری
# لەلای عەرەب پێش ئیسلام

هاوسەری لەلای عەرەب-لەپاڵ هۆی مردندا- بەم ڕێگانە کۆتایی پێ دەهات: (تەڵاق، و خولع، و پشتتێکردن(الإيلاء) و پشتهەڵکردن(الظهار)، و بەدیلکردن، و کۆتاهاتنی ماوە)

**یەکەم- تەڵاق:**

تەڵاق لە زاراوەکانی عەرەبی کۆنە، و بریتییە لە کۆتاپێهێنانی پەیوەندی هاوسەرگیری بە ویستی تاکلایەنە.

بەپێی ئەوەی لێی بەئاگام لەلای عەرەب شێوازێکم لە تەڵاقی کۆتوبەندکراو نەبینییەوە بەر لە ئیسلام، هەرکەس تەڵاقی بەدەست بێت لە پیاو-کە زۆرینە بوو- یان ژن خاوەنی ئازادی تەواو بووە لە جێبەجێ کردنی دەسەڵاتی تەڵاقدان با بۆ بێبایەخترین شتیش بێت، هەر بەو جۆرە شێوەگرییەکی تایبەتمان لە تەڵاق نەبینییەوە، بۆیە تەڵاق نەچووەتە ژێر هیچ ڕێکارێکی شێوەگرییەوە، هەر بەو جۆرە داڕشتنێك لە داڕشتنە زانراوەکانی ئەم سەردەمە لەو کاتەدا بوونی نەبووە، بەڵکو داڕشتنگەلێکی زۆری سەرەتایی ئاڵوگۆڕپێکراو بوونی هەبووە، لەوانە(بچۆرەوە بۆ لای خانەوادەکەت)، (حەبلت لەسەر شانتە)،( بڕۆ و کەس بە دەم بانگی ناخۆشییەکانتەوە نەیەت)، (ئاسکت بەسەر مانگادا هەڵبژارد)،(چۆنت دەوێ بەو جۆرە و بڕۆ)، (تۆ لە کۆتوبەند ئازادیت) یان(تۆ بەریت)[1]، بەم جۆرە چەندین گوزارەی تر کە شایستە نەبوون بە پلە و پایەی ئافرەت وەك دایکێك لە کۆمەڵگەدا.

---

[1] ينظر الميداني المرجع السابق ١/١٧٩، ٢٥٣، ٤٠٨. المحمصاني المرجع السابق ص٦٦.

شتێکی نامۆیە هەندێ لە فەقیهان[1] دانیان بە دروستی تەڵاقدا ناوە بە رستەیەك لەم رستانە و وایاندناوە ناڕاشکاوگەلێك بن کە تەڵاقیان پێ دەکەوێت گەر نیەتی لە پاڵدا بێت، هەرچەند ئەوەی لە قورئاندا هاتووە بریتییە لە "الطلاق" و "الفراق"، و "السراح" و داتاشراوەکانیان.

**ژمارەی تەڵاق:**

هەندێ هۆزی عەرەبی ئەوەیان دەزانی تەڵاق بە سێ جار سنووردار بکەن، لەوانەیە لە رێگەی شەریعەتی گەورەمان ئیسماعیلەوە –ع– ئەوەیان زانیبێت.

پیاو خاوەنی سێ تەڵاقی لەیەکتر دابڕاو بوو لە سێ جاردا، لەلایان کۆکردنەوەی هەر سێ تەڵاقەکە لە یەك جاردا بوونی نەبوو(وەك بوترێت تۆ سێ تەڵاقەکەت کەوتووە)، بەڵام بۆ پیاوەکە هەبوو لە یەك دانیشتندا بە سێ ئاوازی جیاواز کۆتایی پێ بهێنێت، "الأعشى"[2] کاتێك ئافرەتێکی مارەکرد و هۆزەکەی نەیانویست بیدەنێ و هەڕەشەیان لێکرد بە ئازاردانی گەر تەڵاقی نەدات.

ئەویش –لەکاتی تەڵاقداندا– بە ژنەکەی وت:

أيا جارتي بيني فانك طالقة      كذاك أمور الناس غاد وطارقة

بۆ جاری دووەم وتی:

وبيني فان البين خير من العصا      وألا ترين لي فوق رأسك بارقة[3]

بۆ جاری سێیەم وتی:

وبيني حصان الفرج غير نميمة      وموموقة[4] فينا كذاك ووامقة[5]

ونوقي فتى قـــوم فاني ذائق      فتاة أناس مثل ما أنت ذائقة

---

[1] ينظر الميداني المرجع السابق ١/١٧٩، ٢٥٣، ٤٠٨. المحمصاني المرجع السابق ص٦٦.

[2] ينظر ابن حبيب (أبو جعفر محمد بن حبيب البغدادي): المحبر مطبعة حيدر آباد الدكن الهند ١٣٦١هـ ص٣٠٩.

[3] لە هەندێ سەرچاوەدا: ولا تزال فوق رأسك بارقة.

[4] واتە خۆشەویست.

[5] لە هەندێ سەرچاوەدا: وموموقة كنت فينا ووامقة.

ئەم شێوازە لە تەڵاقدان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تەڵاقی زۆرلێکراو لەلای عەرەب پێش ئیسلام دەکەوت.

سەرباری ئەوە هەندێ هۆزی عەرەبی سنوور و ڕادەیەکی ژمارەی تەڵاقی نەزانیوە، بەڵکو پیاو ژنەکەی تەڵاق دەدا و وازیلێدەهێنا تا عیدەکەی کۆتایی پێ دەهات جارێکی تر دەگەڕایەوە بۆ لای وەك ئازاردان و کۆتوبەندکردنی، عائشە -خوا لێی ڕازی بێت- دەفەرموێت: (خەڵکی بەم جۆرە بوو: پیاو چەند بیەوێت ژنەکەی تەڵاق دەدا و هەر ژنی ئەو بوو گەر لە عیدەدا بگەڕابایەتەوە بۆ لای با سەد جاریش تەڵاقی بدابایە یان زیاتر...)[1]

ئیسلام هات و دانی بە سێ تەڵاقدا نا لە سێ جاردا و ڕێگری کرد لە پیاوەکە زیاتر لە دوو جار گەڕانەوە بۆ ژنەکەی بکات و دەفەرموێت: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾[2]. لە جاری سێیەمدا خودا -ﷻ- دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ﴾[3].

---

[1] (كَانَ النَّاسُ وَالرَّجُلُ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ مَا شَاءَ أَنْ يُطَلِّقَهَا وَهِيَ امْرَأَتُهُ إِذَا ارْتَجَعَهَا وَهِيَ فِي الْعِدَّةِ وَإِنْ طَلَّقَهَا مِائَةَ مَرَّةٍ أَوْ أَكْثَرَ حَتَّى قَالَ رَجُلٌ لامْرَأَتِهِ وَاللَّهِ لا أُطَلِّقُكِ فَتَبِينِي مِنِّي وَلا آوِيكِ أَبَدًا قَالَتْ وَكَيْفَ ذَاكَ قَالَ أُطَلِّقُكِ فَكُلَّمَا هَمَّتْ عِدَّتُكِ أَنْ تَنْقَضِيَ رَاجَعْتُكِ فَذَهَبَتْ الْمَرْأَةُ حَتَّى دَخَلَتْ عَلَى عَائِشَةَ فَأَخْبَرَتْهَا فَسَكَتَتْ عَائِشَةُ حَتَّى جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَأَخْبَرَتْهُ فَسَكَتَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ قَالَتْ عَائِشَةُ فَاسْتَأْنَفَ النَّاسُ الطَّلاقَ مُسْتَقْبَلا مَنْ كَانَ طَلَّقَ وَمَنْ لَمْ يَكُنْ طَلَّقَ) رواه الترمذي ١١١٣. والبيهقي في السنن الكبرى ٧/٣٣٣ والحاكم في المستدرك ٢/٢٧٩.

[2] (الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلَّا أَنْ يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ)(البقرة:٢٢٩).
واتە گێڕانەوەی بەر لە تەواوبوونی عیدەکەی یان تەڵاقکەوتنی. وقوله تعالى (أو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) يعني الطلقة الثالثة. ينظر في تفصيل هذا الموضوع تفسير القرطبي ٣/١٣٢.

[3] (فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يَتَرَاجَعَا إِنْ ظَنَّا أَنْ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ)(البقرة:٢٣٠).

بەوەش ئیسلام تەڵاقی سنووردار کرد کە تەنها دوو جار گێڕانەوەی تێدا دروستە، لە هەر جارێکدا هەریەکێك لە دوو هاوسەرەکە پێداچوونەوە بە خودی خۆیاندا دەکەن و هەست و نەستی خۆی بەرانبەر هاوسەرەکەی تاقیدەکاتەوە، گەر پیاوەکە بۆ جاری سێیەم ژنەکەی تەڵاقدا هاوسەرداری بە جیابوونەوەیەکی تەواو کۆتایی پێ دێت و پیاوەکە هیچ ڕێگەیەکی بۆ نامێنێتەوە بۆ سەر ژنەکە مەگەر هاوسەرگیرییەکی سروشتی شەرعی تر بکات و ئەو هاوسەرگیرییە بە مردن یان تەڵاق کۆتایی پێ بێت و عیدەی تەواو بکات، ئەوکاتە گەر هەردووکیان ئارەزووی گەڕانەوەیان کرد بۆ ژیانی هاوسەری پێشتریان ئەوا دەتوانن ئەو کارە بکەن گەر وایان دەزانی ژیانی هاوسەرییان دێتە ڕاستە وەك خودا فەرمانی پێکردووە، هەندێ لە هۆزە عەرەبەکان[1] فێڵێکیان داهێنابوو بۆ گێڕانەوەی ژنەکە دوای سێ جار تەڵاقدانی، موباحیان کرد بوو بۆ پیاوەکە -کە سێ جار ژنەکەی تەڵاقداوە- ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ لای خۆی دوای ئەوەی لە پیاوێکی تر مارەیان دەکرد بە مەرجێك دوای چوونە لا تەڵاقی بدات.

لەگەڵ ئەوەش حەڵاڵێکی بێزراو بوو لەلایان و زۆربەیان ئەنجامیان نەدەدا[2].

کاتێك ئیسلام هات ئەم فێڵە بێزراوەی ڕەد کردەوە و لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی نەفرەتی کرد لە مێردی یەکەمی بۆحەلاڵکراو و مێردە نوێیە حەلاڵکەرەکە.

ئیبن مەسعود دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) نەفرەتی کردووە لە حەلاڵکەر و بۆحەلاڵکراو، مێردە کاتییەکەی بە سابرێنگ(خرت)ی خوازراو ناوبردووە و دەفەرموێت: ((دەتانەوێ هەواڵتان پێبدەم دەربارەی سابرێنگی خوازراو؟ وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: بریتییە لە حەلاڵکەر، خودا نەفرەتی کردووە لە حەلاڵکەر و حەلاڵ بۆکراو))[3].

---

[1] کە باوەڕی هێنا بوو بە گەورەمان ئیسماعیل کە ژمارەی تەڵاقی بە سیان دیاریکرد.

[2] ينظر الدكتور احمد الغندور: الطلاق في الشريعة الاسلامية والقانون ص٢٦.

[3] ابن ماجه: ١٩٣٦.

"الصنعاني"[1] دەڵێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری حەڵاڵکردن، چونکە نەفرەت تەنها بۆ بکەری حەرامکراوە، هەموو حەرامکراوێك نەهیلێکراوە، نەهیلێکراویش داوای تێکچوونی گرێبەستەکە دەکات

درێژەی ئەمە بە پشتیوانی خودا لە شوێنی خۆی دێت.

**دووەم -خولع:**

ڕێگەی دووەم بۆ کۆتاهێنان بە پەیوەندی ژن و مێردی لەلای عەرەب بریتی بوو لە خولع، ئەوەش بریتی بوو لە جیابوونەوەیەك ژن و مێردەکە لەسەری ڕێکەوتبوون بەرانبەر پابەندبوونی ژنەکە بە پێدانی بریتییەك بە مێردەکە یان دابەزین لەو مافەی لەسەر پیاوەکە هەیبوو، ئەوەش بەرانبەر تەڵاقدانی و گەڕانەوەی ژنەکە بۆ ئەو ئازادییەی بەر لە هاوسەرگیری لەسەری بوو.

أبوبكر بن دريد لە "أمالي"ەکەیدا[2] دەڵێت: زانایان پێیانوایە یەکەمین خولع لە عەرەبدا ئەوە بوو: "عامر بن الظرب" کچەکەی دا بە برازاکەی خۆی "عامر بن الحارث" کاتێك چووە لای ژنەکە لە پیاوەکە بێزار بوو، لای باوکی سکاڵای خۆی کرد، باوکی کچەکە بە برازاکەی خۆی وت: جیابوونەوە لە خانەوادە(ژنەکە) و لەدەستدانی ماڵ و سامانەکەت لەسەر کۆناکەمەوە، ئەوا کچەکەم لە تۆ دادەڕنم لەسەر ئەوەی پێتداوە(مەبەستی مارەییەکەیەتی).

دوای ئەوەی ئیسلام هات تەڵاقی خولعی ڕێکخست و لە خەڵتە و پیسی کڕین و فرۆشتن پاکی کردەوە، خودا-ﷻ- دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾[3]، درێژەی ئەمە بە پشتیوانی خودا لە دەروازەی

---

(1) سبل السلام المرجع السابق.

(2) ينظر بلوغ الأرب المرجع السابق ٢/٢٩.

(3) (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلَّا أَنْ يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ)(البقرة:٢٢٩).

چوارەم باس لێوە دەکەین.

### سێیەم-هاوسەرگیری پشتتێکردن:

ئەوەش ئەوەیە پیاوەکە سوێند بخوات لەسەر هاوسەری نەکردنی ژنەکەی بۆ ماوەی ساڵێك یان دوو ساڵ، پاشان ئەوە بە کۆتاهاتنی پەیوەندی ژن و مێردی کۆتایی پێ دێت، پشتتێکردن لای عەرەب تەڵاق بوو[1]، پاشان ئیسلام هات و دوورترین ماوەی پشتتێکردنی بە چوار مانگ دیاریکرد، پاش ئەوە پێویستە لەسەر مێردەکە یان هاوسەری لەگەڵ ژنەکەی بکاتەوە یان تەڵاقی بدات، خودا-ﷻ- دەفەرموێت: ﴿لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[2].

هەندێ فەقیهان لە هاوەڵان وەك ئیبن مەسعود و زەیدی کوڕی سابت دەڵێن: گەر ماوەکە تەواو بوو و پیاوەکە هاوسەری لەگەڵ نەکرد راستەوخۆ تەڵاقەکە دەکەوێت، دواتر رۆشنکردنەوەی ئەمە بەدرێژی باس لێوە دەکەین.

### چوارەم-پشتهەڵکردن(الظهار):

ئەوەیە مێردەکە ژنەکەی بە کەسێك(ئافرەتێك) بچوێنێت کە لەسەری حەرامە بە حەرامێکی هەتاهەتایی[3] وەك دایك یان وەك خوشك، و کەسانی تر لە ئافرەتانی حەرامکراو بە حەرامێکی هەتاهەتایی.

ئەم چواندنە واتە نایەوێت جارێکی تر لێی نزیك ببێتەوە[4]، پشتهەڵکردن تەڵاق بوو تا خەولەی کچی مالیکی کوڕی سەعلەبە ژنی ئەوسی کوڕی صامت کە مێردەکەی

---

(1) تفسير القرطبي ٣/١٠٣. الانوار في الفقه الشافعي ٢/٢٩٠.

(2) سورة البقرة: ٢٢٦.

(3) ينظر العيني على البخاري ٢٠/٢٨٠.

(4) ينظر مفاتيح الغيب للأمام فخر الرازي ٢/٢٦٠ وفيه (زيهار لە خراپترین تەڵاقەکانی سەردەمی نەفامی بوو چونکە لە ئەویەڕی حەرامکردندا بوو).

پشتی لێهەڵکرد بوو هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، سکاڵای لەدەست پیاوەکەی کرد و وتی((ئەی پێغەمبەری خودا، گەنجێتی خواردم، سکمی هەڵگووشی، تا چووم بەساڵدا و لە منداڵ چوومەوە پشتی لێ هەڵکردم، خودایە من سکاڵا لای تۆ دەکەم، زۆری پێنەچوو جبریل-ع- بەم ئایەتانەوە دابەزی﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ﴾))[1]

خودا-ﷻ- دەفەرموێت:﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِيناً﴾[2]

ئەم دەقە ئەم حوکمانەی راگەیاندووە:

١-پووچەڵکردنەوەی ئەوەی عەرەب پێش ئیسلام لەسەری بوون لە دانانی پشتهەڵکردن بە تەڵاق.

٢-ئەو پیاوەی پشت لە ژنەکەی هەڵدەکات یەکێك لەم سزانەی لەسەرە:

أ.ئازادکردنی مرۆڤێکی کۆیلە، گەر نەیبینییەوە:

ب.رۆژووی دوو مانگ لەسەر یەك، گەر نەیتوانی:

ج-پێدانی خواردن بە شەست گەدا(مسکین).

**پێنجەم-سەبی(ئافرەتی دیل):**

"سەبی" بریتییە لە ئافرەتێك بە دیلگیرابێت، ئەوەش هۆیەك بوو لە هۆیەکانی بە کۆیلەکردنی دیل، بەدیلگیراو دەبووە موڵکی ئەو کەسەی بەدیلی گرتبوو، ئەم موڵکدارییە پێچەوانەی ویلایەتی مێردە پێشووەکەی بوو، بۆیە هاوسەرگیرییەکەی لە مێردی یەکەم تەنها بە دیلکردن کۆتایی پێ دەهات.

---

[1] ابن ماجه: ٢٠٥٣

[2] سورة المجادلة: ١-٤.

**شەشەم -کۆتاهاتنی هاوسەرگیری کاتی بە کۆتاهاتنی ماوەکەی:**

چونکە هاوسەرگیری کاتی(موتعە) بە تەڵاق تەواو نابێت، بەڵکو بە کۆتاهاتنی ماوە دیاریکراوەکەی، بەپێی ڕێکەوتنی دوو لایەنەکە[1].

ئەم جۆرە لە هاوسەرگیری لەسەر بۆچوونی جمهووری فەقیهانی موسڵمان کۆتایی پێهاتووە وەك باسمان کرد.

**حەوتەم -تەڵاقدانی پیاوەکە لەلایەن ژنەکەیەوە:**

عەرەب تەڵاقی بە مافێکی سروشتی داناوە بۆ پیاو نەك بۆ ژن، بەڵام ئەم مافەیان دانپیادانـاوە گـەر ئافرەتەکـە ئـەوەی بەمـەرج گـرت لـە نـاوەڕۆکی گرێبەسـتی هاوسـەرگیرییەکەیدا، لـەو بـارەدا کاروبـاری بەدەسـت خۆیـەتی و هـەرکات بیـەوێت هاوسەریکردنی مێردەکەی واز لێ دەهێنێت و تەڵاقی دەدات.

پێدانی ئەم مافە بە ژنەکە لە هۆیەکانی زۆری ڕووداوی تەڵاق بوو لەو کاتەدا.

ئەو ژنانەی ئەم مەرجەیان دەگرت بـەزۆری لەوانـە بـوون پێگـە و پلـە و پایـەی کۆمەڵایەتی دیاریان هەبوو، وەك "سلمى الخزرجيـة و فاطمـة الأنماريـة و ماريـة بنـت الجعيد و عاتكة بنت مرة و أم خارجـة(کـە بـەوە ناسـرابوو ئـافرەتێکی بـەزەوق بـوو، پیاوێکی ئەزموون دەکرد و تەڵاقی دەدا و مێردی بـە پیـاوێکی تـر دەکـرد تـا چـل و ئەوەندە مێردی کرد)"[2]

ئەم دیاردەیە لای ڕۆمانەکان باو بوو لە چـاخی کلاسـیکدا وەك پێشـتر ڕۆشـنمان کردەوە.

**ڕێگەی تەڵاقدانی پیاو لەلایەن ژنەکەیەوە:**

کاتێك ژنی عـەرەب دەیویسـت مێردەکـەی تـەڵاق بـدات ئـەو دارِشـتن و شـێوازە باوانەی بەکارنەدەهێنا کە پیاوان ژنیان پێ تەڵاق دەدا، بەڵکو تەڵاقی ئەو کردەیەکی

---

[1] ينظر السيد حسين يوسف مكي العاملي، المتعة في الاسلام ص٨٨.

[2] احمد الغندور الطلاق في الشريعة الاسلامية والقانون المرجع السابق ص٣٦.

کرداری ڕووتبوو دوور لە بەکارهێنانی ئەو گوزارانە: گەر لە دەواردابوونایە(ڕەشماڵ) خۆیان دەشاردەوە، گەر دەرگاکەی ڕوو بە خۆرهەڵات بوایە دەیانگۆڕی ڕوو بە خۆرئاوا، گەر ڕوو بە لای ڕاست بوایە دەیانگۆڕی بۆ لای چەپ، گەر پیاوەکە ئەوەی ببینیبایە دەیزانی ژنەکە تەڵاقیداوە و ئیتر نەدەهاتەوە بۆ لای، هەر کات ژنەکە تەڵاقی پیاوەکەی دەدا ماڵەکە و گەڕەکی نیشتەجێبوونەکەی بەجێدەهێڵا و دەگەڕایەوە بۆ لای خانەوادە و ئەو گەڕەکەی خۆی دەدایە پاڵی[1].

---

[1] الآلوسي: بلوغ الأرب المرجع السابق ٢/٣٠ وما بعدها.
البستاني: دائرة المعارف ١١/٣٢٦.
المحمصاني: الأوضاع التشريعية في الدول العربية ماضيها وحاضرها ص٦٥ وما بعدها.
الاصفهاني: الاغاني المرجع السابق ١٦/١٠٢ وما بعدها.
الدكتور جواد علي: تاريخ العرب قبل الاسلام ٥/٣٦٩، ٧٠، ٧١.

# دەروازەی دووەم

## تەڵاق لە پەیامەکانی ئایینی موسەویدا

## نزیکەی(١٢٠٠ پ.ز.)

ئەم دەروازەیە دوو بەش لەخۆ دەگرێت:

بەشی یەکەم: تەڵاق لە مەزهەبی قوڕائییەکاندا

بەشی دووەم: تەڵاق لە مەزهەبی ڕەبانییەکاندا

## حوکمی تەڵاق لای یەهود:

لە "سفری تەسنییە"دا هاتووە[1]: (گەر پیاوێك ئافرەتێکی کرد بە هاوسەری خۆی و بوو بە مێردی پاشان چارەنووسی لەگەڵ نەبوو بەهۆی نەنگییەك تیایدا[2] با نووسراوی تەڵاقی بۆ بنووسێت و بیداتە دەستی، و لەماڵەکەی رەوانەی بەرێبکات، کاتێك لە ماڵەکەی چووە دەرەوە و رۆیشت و بوو بە هاوسەری پیاوێکی تر، پیاوەکەی تریش رقی لێیبوویەوە و نووسراوی تەڵاقی بۆ نووسی و دایە دەستی و لە ماڵەکەی دەریکرد یان پیاوەکەی تر کە کردوویەتی بە ژنی خۆی مرد، ئەوا مێردی یەکەم کە تەڵاقی دابوو بۆی نییە بیگەڕێنەوە و بیەوێت بیکاتەوە بە هاوسەری خۆی دوای ئەوەی ژنەکە پیس بوو).

لە "نیگای مەلاخی"دا[3](رۆحی خۆتان بپارێزن با هیچ کەس لە ئێوە غەدر لە ئافرەتێکی گەنج نەکات، چونکە ئەو تەڵاقی پێخۆش نییە)

لە سفری ئەحباردا[4](هاوسەرگیری ناکەن لەگەڵ ئافرەتێکی بەدکاری بەدڕەوشتدا، هەروەها هاوسەرگیری ناکەن لەگەڵ ئافرەتێکی تەڵاقدراو، چونکە ئەوان(پیاوان) بۆ خواوەندەکانیان پیرۆزراگیراون)

دیسان لە سفری ئەحباردا[5]: ( بێوەژن و تەڵاقدراو و بەدڕەوشت یان بەدکار هەموو ئەوانە دەست بۆ مەبەن)

هەروەها فەقیهەکانیان دەڵێن[6]: (شیاو نییە بۆ پیاو یەکەمین ئافرەتی بەبێ پاساو تەڵاق بدات)

---

[1] الاصحاح (٢٤) العدد (١-٤).

[2] لە نوسخکەیەکدا: گەر نیعمەتی لە چاویدا نەبینییەوە چونکە نەنگییەکی تێدا بینییەوە.

[3] الاصحاح (٢) العدد (١٥، ١٦).

[4] الاصحاح (٢١) العدد (٧).

[5] الاصحاح (٢١) العدد (١٤).

هەروەها دەڵێن[٢]: (لە ڕۆژی شەممە و جەژنە ئایینییەکان و جومعەدا بەڕەهایی و لە شەودا تەڵاق دروست نییە، مەگەر زۆر پێویست بێت) پێشتر بۆ دروستی تەڵاق جێگیر کردنی بەرواری وێرانکردنی دووەمی "بیت المقدس"یان لە لاپەڕەی تەڵاقدا بەمەرج دەگرت وەك ئاماژەیەك بە وێرانکاری تەڵاق بۆ قەوارەی خێزان[٣].

لەوەی باسمان کرد دەگەینە ئەو سەرئەنجامەی تەڵاق لە ڕێنموونییەکانی یەهوددا-هەرچەند ڕەوا بوو- بەڵام لەگەڵ ئەوەش بێزراو بوو گەر بۆ پێویستییەك نەبوایە، لەوێشەوە ئافرەتی تەڵاقدراو ئاست و پلە و پایەی نزمتر بوو لە ئافرەتانی تر، بەڵام لەگەڵ ئەوەش بۆ دوو قوتابخانە دابەش بوون:

**قوتابخانەی شما:** پێیوایە مێرد بەپێی ڕێنموونییەکانی کتێبی پەیامە نەرێتییەکان لای یەهود بۆی نییە ژنەکەی تەڵاق بدات گەر تاوانی فیسقی ئەنجام نەدابێت.

**قوتابخانەی هەلیل:** ئەمەش پشتیوانی ئەو بیرۆکەیە دەکات کە پیاو دەتوانێت ژنەکەی تەڵاق بدات بە بێبایەخترین هۆش بێت[٤].

ئەم دوو قوتابخانەیە لەمەڕ بەرتەسك کردنەوە و فروانکردنی ئاسۆی تەڵاق بریتین لە دوو مەزهەب: مەهەبی قوڕائییەکان و مەزهەبی ڕەبانییەکان، یەکەمیان بیرۆکەی تەڵاقی کۆتوبەندکراوی وەرگرتووە و تەنها بە چەند هۆیەکی دیاریکراو پاساوداری کردووە، دووەمیان تەڵاقی موباح کردووە با هۆیەکیش(پێویستبوون) ڕاست نەبووبێتەوە.

## دوو مەزهەبە یەهوودییەکە(قوڕائییەکان و ڕەبانییەکان):

لە سەدەی هەشتی زاینییەوە فەقیهە یەهودییەکان بەسەر خۆیاندا دابەش بوون بۆ قوڕائییەکان و ڕەبانییەکان[١]، سەرچاوەی جیاوازییەکەیان ئەوەیە قوڕائییەکان

---

[١] ينظر المادة (٣٢٨) من كتاب ابن شمعون.
[٢] ينظر المادتان (٣٣٤، ٣٣٥) المرجع السابق.
[٣] الباهو بشيامي، شعار الخضر في الاحكام الشرعية الاسرائيلية للقرائين ترجمة مراد فرح ص١٣٤.
[٤] ينظر ادولرد وسترمارك قصة الزواج المرجع السابق ص٣٠٧.

دان بە سەرچاوەیەکی ئاسمانیدا نانێن بۆ حوکمە شەرعییەکان جگە لـە تـەورات، لـە کاتێکدا رەبانییەکان تەلموود[٢] بە سەرچاوەی دووەم دادەنێن و پێیانوایـە تـەوراتی دووەمە، جیاوازی لە نێوان ئەو دوو تەوراتەدا نییە جگە لە پێشکەوتنی تۆمـارکردن، تەلموود لە کاتی خۆیدا وەك تـەورات تۆمارنـەکرا، بـەڵکو نـەوەکان بـەدوای یـەکتردا سـەرزارەکیانە گواسـتیانەوە و لـە کۆتاییـدا تۆمـارکرا لـە ترسـی لەبیرچـوون و دەسـتێوەردان بـۆی، قوراِئییـەکان پێیانوایـە تـەلموود دانـراوی دەسـتی فەقیهـە ئیسرائیلییەکانە، لەسەر ئـەم جیاوازییـە جیاوازییـان لەمـەڕ دروسـتی ئیجتیهـاد بینـا دەکەن، رەبانییەکان لایەنی چەقبەستنیان گرتووە بەو بەڵگەیەی ئەوەی لە تەورات و تەلمووددا هاتووە ئابلۆقەی هەموو بابەتەکان و حوکمە بەشەکییەکان دەدات.

بە پێچەوانەی ئەوانەوە قوراِئییەکان مافی ئیجتیهاد کردن و هەڵهێنجانی حوکمەکان لە رێسا گشتییەکانی تەوراتەوە –بەپێی کات و شوێن– بە خۆ داوە.

هەروەها لەسەر ئەم جیاوازییە جیاوازیان لە زۆرێك لە بابەتە فیقهییەکانـدا لەوانـە بابەتی تەلاق سەریهەڵداوە، بۆیە پێویستە رۆشنکردنەوەی حوکمـەکان تـەلاق لـەلای هەر مەزهەبێك لە بەشێکی تایبەتدا بخەینە روو[٣].

---

(١) راجع قصة الزواج المرجع السابق ص٣٠٧.
القرلؤون والربانيون ص٤٢ وما بعدها. الموسوعة العربية الميسرة ص١٣٧٤.
شعار الخضر مراد فرح ص١ وما بعدها. الاحوال الشخصية الدكتور احمد سلامة ص٧٥ وما بعدها.

(٢) جمع التلمود ٢٨٠م-٥٠٠م. راجع قصة الحضارة ١١/١٤ وما بعدها.

(٣) رووی ناونانیان بە "قوراِئییەکان" چونکە خۆیان لەسەر خوێنـەرانی تـەورات کـورت کردۆتـەوە، "الرابنون أو الربانيون أو الربيون أو روبانيم" بە عیبری کۆی "ربان"ە واتـە ئیمـامی فەقیـە لـە قورئاندا هاتووە: (إنا أنزلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدىً وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النبِـيونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالْأَحْبَارُ)(المائدة:٤٤). وفي تفسير القرطبـي(١٨٩/٦):(الربـانيون هـم الـذين يسوسـون النـاس بـالعلم ويربـونهم بصـغاره قبـل كبـاره). وقـال أبـو رزيـن: الربـانيون: العلمـاء والحكمـاء والأحبار.

# بەشی یەکەم:
# تەڵاق لە مەزهەبی قوڕائییەکاندا
# مەرجەکان و هۆیە پابەندکەرەکانی

ناونیشانی ئەم بەشە بەسەر دوو باسدا دابەش دەبێت:

یەکەم: مەرجەکانی تەڵاق

دووەم: هۆیەکانی تەڵاقی پابەندکەر

# باسی یەکەم:
# مەرجەکانی تەڵاق

تەڵاق لەلایان تەنها بەم مەرجانە دروستە:

**مەرجی یەکەم: دارشتن[1]:**

لە دارشتنی گوزارەی تەڵاقدا پێویستە یەکلاکەرەوە و ڕەها و خاڵیکەرەوە بێت لە لاپەڕەیەکی نووسراودا بە گوزارە و ڕێنووسی عیبری تایبەت بە تەنها یەك ژن و مەرامەکە بگەیەنێت و خاڵی بێت لە لێڵی و تەمومژ، هاوتا بێت بە نووسینی لاپەڕەکە بەلانی کەمەوە لەبەردەم دوو شاهیددا کە میللەتی یەهود بن، نووسینی لاپەڕەکە لەو ڕۆژانەدا نەبێت کارکردن تیایدا دروست نییە وەك شەممە و جەژنە ئایینییەکان و ڕۆژی هەیینی، هەر بەو جۆرە لە شەودا نەبێت، مەگەر بۆ پێویستی زۆر.

**مەرجی دووەم: پاساو[2]:**

لەلایان تەڵاق دروست نییە مەگەر پاساوێك هەبێت دەسەڵاتی ئایینی دانی پیادا بنێت ئەمەش وەك کارکردن بەوەی لە تەوراتدا هاتووە: (گەر پیاوێك ژنێکی هێنا و نیعمەتی لە دوو چاوانیدا نەبینییەوە لەبەر ئەوەی نەنگییەکی تێدا بینییەوە نووسراوی تەڵاقی بۆ دەکات و دەیداتە دەستی و لە ماڵەکەی دەریدەکات)

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پاساوی تەڵاق لای قوڕائییەکان بریتییە لە نەبوونی خۆشی و ئارامی بە مەرجی بوونی نەنگییەك.

---

(1) یراجع المقارنات والمقابلات حافظ صبري ص٤٠٩، شعار الخضر المرجع السابق ص١٣٢. وما بعدها.

(2) یراجع سفر التثنیة الاصحاح (٢٤) العدد (١). شعار الخضر ص١٣٦ وما بعدها. المقارنات والمقابلات المرجع السابق ص٤٠٦ وما بعدها.

**نەنگییەکان( عەیبەکان ):**

١–ئەوەی لە خودی کەسەکەدا بێت و پەیوەندی بە ئایینەوە هەبێت:

أ.یان تایبەتە بە ژنەکەوە وەك خۆ رووتکردنەوە لە رۆژە پیرۆزەکاندا یان خواردنی حەرام یان شتی پیس.

ب.یان تێدەپەڕێتە سەر کەسانی تر جگە لە خۆی وەك شاردنەوەی حەیز لە مێردەکەی یان پێدانی خواردنی حەرام و پیس بە کەسانی تر.

٢–ئەوەی لە خەلق و ئەخلاقی(جەستە و رەوشتی) ژنەکەدا بێت، ئەوەش:

أ.لە روواڵەتی ژنەکەدا: نەنگییەکی سووك بێت وەك هەڵگرتنی ئاوڵە، یان گران وەك ئافەتێك هیوای چاکبوونەوەی لیّ نەکرێت وەك کوێری و کەڕی و لاڵی و هەر ئافەتێك هیوای چاکبوونەوەی نەکرێت و نەتوانرێت شانبدرێتە ژێری(لەلایەن پیاوەکەوە).

ب.مامەڵەی خراپ: بەهۆی زۆری کێبەرکیّ و توندی سەرپێچی و بەدکارییەوە.

ج.هەستان بەکارێك شەرەف و ئابڕوو لەکەدار بکات، وەك خۆڕووتکردنەوە لە رێگە و بان و بازاڕ بەبیّ رازیبوونی مێردەکەی[1].

**پاساوەکانی تەڵاق لەم نەنگییانەدا :**

قوڕائییەکان پێیانوایە پاساوی تەڵاق لەو نەنگییانەدا هەیانە ئاسان نین و ناتوانرێت شان بدرێتە ژێریان، بەڵام بەهۆی جیاوازی سروشتەکان و بوونی رەوشەکان و بارودۆخە جۆراوجۆرەکان پێوەرێکی وردیان نەبینییەوە پاساو لە بێپاساو جیابکرێتەوە، بۆیە دەسەڵاتی شەرعییان سەرپشك کردووە بە چاودێری قەزاییانە لەسەر پاساودارەکان لەگەڵ رەچاوکردنی نەریتی باو، و کات و شوێن، و باری

---

[1] القراؤون والربانون المرجع السابق ص١٣٢. وما بعدها. المقارنات والمقابلات المرجع السابق ص٤٠٧.

کۆمەڵایەتی دوو هاوسەرەکە، بۆیە پاساو بۆ تەڵاق ئەوەیە دەسەڵاتی ئایینی دانی پیادا دەنێت نەك ئەوەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بانگەشەی بۆ دەکات.

ئەم دەسەڵاتە وەك چۆن ڕێگە دەدات بە پیاوەکە ژنەکەی خۆی تەڵاق بدات بەهۆیەکی پاساودار وەك زیناکردنی و هەستان بە کارێك جێگەی گومان بێت و سوکایەتی ئەو بێت بە شەرع و شتانی تر لە هۆ باسکراوەکان، هەر بەو جۆرە مافی تەڵاق بە ژنەکە دەدات لە کاتی جێگیربوونی یەکێك لە پاساوەکاندا[1].

ئەوەی لە کتێبی "المقارنات والمقابلات"دا[2] هاتووە، بەوەی(بۆ ئافرەت نییە داوای تەڵاق بکات نەنگی مێردەکەی هەرچییەك بوو تەنانەت گەر زینای لەسەر جێگیر بوو) هەڵدەدرێتە سەر ئەوەی لە مەزهەبی ڕەبانییەکاندا هاتووە بە نادروستی جیاکردنەوەی قەزاییانە وەك لە شوێنی خۆی باسی لەبارەوە دەکەین.

**مەرجی سێیەم: دەستتێوەردانی دادگا:**

ئەم مەرجە لەسەر مەرجی دووەم سەرهەڵدەدات، چونکە قازی سەرپشك کراوە بە دەسەڵاتی خەملاندن بۆ بڕیاردان لە بوونی پاساو یان نەبوونی، کاتێك بوونی پاساو بە مەرج ناگیرێت دەستتێوەردانی دادگا پێویست نییە وەك لەباری تەڵاقدا بە ڕێکەوتن و ڕازیبوونی هەردوو لا.

لە "المقارنات والمقابلات"دا هاتووە[3]: (دوای واژووی شاهیدەکان لەسەر لاپەڕەی تەڵاق دەخرێتە روو بۆ "الراب" بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی بۆ بکات و بزانێت تەبایە لەگەڵ بنەڕەتی شەرعیدا یان نە)

لە "شعار الخضر"دا هاتووە[4]: (تەڵاق تەنها لەسەر شەرع دەبێت، ئەوەش بە بوونی پاساوەکان، مەگەر لە بارێکدا ڕازیبوونی هەردوو لای تێدا بێت).

---

(1) یراجع شعار الخضر المرجع السابق: ص١٢٠ـ١٢٨.

(2) یراجع المقارنات والمقابلات ص٤٠٨ نقلا عن بیئر هیطیب علی فتاوی هرشباه فصل ٤٠٦.

(3) المرجع السابق ص٤١٠.

(4) المرجع السابق ص١٢٧ وما بعدها. کتاب ابن شمعون المادتان (٣٣٦، ٣٣٧).

دکتۆر ئەحمەد سەلامە دەڵێت[1]: (قەزای ئێمە(واتە قەزای میسری) ئاراستەی وەرگرتووە و ئاراستەکەشی دروستە لەوەی باوەڕمان وایە ئەو تەڵاقەی بەبێ رازیبوونی قەزا دەخرێت وا دادەنرێت وەك ئەوەی نەخرابێت و هاوسەرگیری بەردەوامە سەرەڕای ئەوە)

لەڕاستیدا قازی دەستتێوەردان دەکات بۆ ئەوەی چاودێری بوونی پاساو و نەبوونی پاساو بکات، گەر وترا تەڵاقە بەبێ هۆ دروستە، ئەوا پێویست بەو دەستتێوەردانەی قازی ناکات.

**مەرجی چوارەم: رادەستکردنی بەڵگەنامەکە[2]:**

ئاگاهی ژنەکە بە تەڵاق-نەك قبووڵ کردنی- مەرجی بنەڕەتییە، بۆ کەوتنی تەڵاق ئاگاهی ژنەکە لە رادەستکردنی بەڵگەنامەکە یان لە بریکارەکەیەوە بەرهەم دێت، لەسەر ئەوەش ئەم خاڵانە سەرهەڵدەدەن:

١-گەر بەڵگەنامەکەی بۆ هەڵدا و بە رێکەوت کەوتە ناو ئاگرێکەوە و سووتا یان کەوتە ناو ئاوێکەوە و سڕایەوە یان بە نامەبەرێکدا یان بە پۆستەدا بۆی رەوانە کرد و تیاچوو ئەوا تەڵاق نەکەوتووە، بەڵام تیاچوون لە نێوان ژنەکە و بریکارەکەیدا کاریگەری نییە لەسەر دروستی کەوتنی تەڵاقەکە.

٢-پیاوەکە مافی پەشیمانبوونەوە و شایەت لەسەری بۆ هەیە بەر لە رادەستکردنی بە ژنەکە.

٣-زانیاری و ئاگاهی کەسی رادەستکراو لە ئەوپەڕی گرنگیدایە، لەوەدا بەهەند وەرگرتن بیروباوەڕی مێردەکەیە نەك واقیع:

---

[1] يراجع الأحوال الشخصية للمواطنين غير المسلمين والأجانب في مصر للدكتور احمد سلامة ص٨٦٤.

[2] يراجع المادة (٣٢٥) كتاب لبن شمعون. المقارنات والمقابلات المرجع السابق. الأحوال الشخصية المرجع السابق ص٨٦٥. شعار الخضر المرجع السابق ص١٣٧ وما بعدها.

گەر کەسەکە بریکار بوو ئەویش پێیوابوو پەیامهێنە دەتوانێت لە تەڵاقەکەی خۆی لابدات بەر لە گەیشتنی بەڵگەنامەکە بە دەستی ژنەکە، بە پێچەوانەی ئەوەوە پیاوەکە بۆی نییە.

تەڵاق لای قوڕائییەکان دەکەوێت گەر ئەو چوار مەرجە فەراهەم بوون ئەگەر نە، ژنەکە پەیوەست دەبێت بە هاوسەرگیرییەکەیەوە.

## باسی دووەم:

# هۆیەکانی تەڵاقی پابەندکەر

دەتوانرێت هۆیە پابەندکەرەکان بۆ تەڵاق بۆ دوو بار بگێڕینەوە:

**باری یەکەم:** ترس لەسەر ژیانی هاوسەری-کە قازی خەملاندوویەتی- بوونی هەبێت، وەك بوونی یەکێك لەم هۆیانە[1]:

١-بە غەدر ژنی بەسەردا هێنرابێت، بەبێ هاندەرێکی شەرعی کە لە تەوراتدا هاتووە[2] (ڕۆحی خۆتان بپارێزن، با هیچ کەس غەدر لە ئافرەتێکی گەنج نەکات).

٢-کەمتەرخەمی پیاوەکە لە مافە هاوسەرییەکاندا و زۆردارانە مامەڵەکردنی ژنەکە.

٣-نەخۆشییەکی درێژخایەنی کوشندە بەجۆرێك هیوای چاکبوونەوەی لێ نەکرێت.

٤-لاساری یان نەخۆشییەك کە ڕێگرە لە چوونە لای ژنەکە بۆ ماوەیەك لە شەش مانگ کەمتر نەبێت.

---

[1] يراجع شعار الخضر المرجع السابق ص١١٩ وما بعدها.

[2] يراجع سفر التثنية الاصحاح (٢) العدد (١٥).

٥-بۆنی ناخۆش وەك بۆنی دەم و لووت و شوێنانی تر كە مرۆڤ ناتوانێت لەگەڵ بژی.

**باری دووەم:** راستبوونەوەی ئەوەی سەردەكێشێت بۆ پووچەڵبوونەوەی هاوسەرگیری، لەگەڵ ئەوەش پێیان باش بوو پابەند بن بە تەڵاقدانەوە لە دادگا تا بڕیاردان بە پووچەڵبوونەوەی هاوسەرگیرییەكە وەك لەم شێوازانەدا:

١-گەر هاوسەرگیری كرد بە ئافرەتێك لەسەری حەرام كرابوو.

٢-گەر پیاوەكە پیاوەتی تێدا نەبوو.

٣-گەر هاوسەرگیری پیاوەكە لە ژنە تەڵاقدراوەكەی خۆی بوو لەپاش مێردكردنی بە كەسێكی تر، چونكە گەر تەڵاقدراو مێردی بە پیاوی دووەم كرد ئەوا لەسەر مێردی یەكەم حەرام دەبێت بە حەرامبوونێكی هەتاهەتایی، پیاوی دووەم چووبێتە لای یان نە، لای رەبانییەكان تەنها بە چوونە لا لە مێردی یەكەم حەرام دەبێت[1]

**جیابوونەوەی قەزاییانە:**

گەر یەكێك لەو هۆ باسكراوانە هاتە دی و دادگا داوای لە پیاوەكە كرد هەستێت بە تەڵاق لەسەر داوای ژنەكەی، بەڵام پیاوەكە نەیویست ئەو كارە بكات، ئایا دادگا مافی ئەوەی هەیە خۆی لە جێگەی پیاوەكە دابنێت و ژنەكە تەڵاق بدات؟

ئەمە یەكێكە لەو كارانەی دوو مەزهەبەكە جیاوازییان لەسەری هەیە، رەبانییەكان-وەك لە جێگەی خۆی باسی لەبارەوە دەكەین- تەنها لە خودی

---

[1] لە "سفر التثنية الاصحاح (٢٤) العدد (٢-٣)دا هاتووە: (هەر ژنێك لەماڵەكەی خۆی بچێتە دەرەوە و بڕوات و ببێت بە ژنی پیاوێكی تر، گەر پیاوەكەی دووەم رقی لێیبوو و نووسراوی تەڵاقی بۆ كرد و دایە دەستی و لە ماڵەكەی دەریكرد، گەر ئەو پیاوەی دوایی كە كردی بە ژنی خۆی مرد، ئەوا مێردی یەكەم كە تەڵاقیدا ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ژنەكە بكاتەوە بە هاوسەری خۆی لەدوای ئەوەی هەڵگیرا.

مێردەوە تەڵاق دەناسن، ئەمە تەبایە لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە فەقیهە موسڵمانەکان گرتوویانەتە بەر لەوەی تەڵاق بەدەستی کەسێکە بەڕێوەبردنی بەدەست بووە.

قوڕائییەکانیش-وەك پێشتر باسمان کرد- ئیجتیهادیان بۆ خۆیان ئاوەڵا کردووە، و لەوێشەوە دەستبردن بۆ بنەماکانی دادپەروەری و یەکسانی و هەڵگرتنی زیان، بینا لەسەر ئەم ئاراستەیە دەڵێن: لەڕووی شەرعەوە پیاو داوای تەڵاقی لێ دەکرێت لەباری راستبوونەوەی هۆیەکی پاساودار و بە داوای ژنەکە، گەر پیاوەکە نەیویست تـەڵاقی بدات ماوەیەکی پێ دەدرێت و ئاگادار دەکرێتەوە، گەر بەردەوام بوو ئـەوا شـەرع لـە جێگەی ئەو لە تەڵاقداندا راست دەبێتەوە، ئەمەش وەك دادپەروەری و ویـژدانێك بـۆ ئافرەتەکە، بەڵکو بۆ لادانی زیانێك لەسەری، بەڵام لە عەهدی کۆندا(العهد القـديم) بـۆ ئەمە بەڵگەیەك بوونی نییە، چونکە هیچ باسێکی تێدا نەهاتووە لەمەڕ هەڵوەشانەوەی گرێی هاوسەرگیری گەر ئافرەتەکە ئەوەی ویست، هەرگیز لە یاساڕێژی یەهودیدا مافی تەڵاق بە ژنەکە نەدراوە، بـەڵام کتـێبی رێنموونییـە نەرێتییـەکان لای یـەهود رێگـەی پێداوە داوای تەڵاق بکات[1].

**پیاو لە دوو باردا مافی تەڵاقدان لەدەست دەدات[2]:**

**باری یەکەم:** گەر پێش هاوسەرگیری دەستدرێژی جووتبوونی کردبووە سەر(واتە پەردان) و دواتر ناچارکرابێت هاوسەرگیری لەگەڵ بکات و ژنەکە مەرجی بێبەش کردنی پیاوەکە لە تەڵاق بگرێت، کاریگەری ئەم مەرجە بە درێـژایی ژیـان بـەردەوام دەبێـت مەگەر لە بارێکدا ژنەکە زینا بکات.

**باری دووەم:** گەر پیاوەکـە ژنەکـەی بـە لەشفرۆشـی تۆمـەتبار کردبێـت بـەر لـە داخوازی کردنی، و رۆژی چوونە لا بانگەشەی ئەوە بکات ئافرەتەکە ژنە(کچ نییـە) و دواتر درۆکەی دەربکەوێت.

---

[1] يراجع قصة الزواج وسترمارك ص٣٠٦. شعار الخضر ص١٢٩. المادة (٤١٤) من كتاب ابن شمعون.

[2] يراجع قصة الزواج المصدر السابق ص٣٠٦ وما بعدها.

# بەشی دووەم:
# تەڵاق لە مەزهەبی رەبانییەکاندا
## مەرجەکانی، هۆیە پابەندکەرەکانی، و
## ئەسەرەکەی(کاریگەرییەکەی) لەسەر مافەکانی ژن

لای رەبانییەکان مافی تەڵاق بۆ پیاو خەریکە دەبێتە مافێکی رەها و خاوەنی ویستێکی ئازاد، بۆی هەیە هەرکات بیەوێت تەڵاق بدات بەبێ ملکەچبوون بۆ هیچ هۆیەك لە هۆ پاساودەرەکان یان چوونە ژێر چاودێری قەزاییەوە.

مەزهەبەکە بۆچوونەکەی لەسەر هەمان گوزارەی هاتوو لە تەوراتدا بیناکردووە: (گەر پیاوێك ژنێکی گرتەدەست و کردی بە هاوسەری خۆی ئەگەر خۆشی و ئارامی لە دوو چاوانیدا نەبینییەوە بەوەی نەنگییەکی تێدا بێت ئەوا نووسراوی تەڵاقی بۆ دەکات و دەیداتە دەستی و لە ماڵەکەی دەریدەکات) رەبانییەکان دەقەکەیان بە پێچەوانەی قورائییەکانەوە لێکداوەتەوە، رێکخستنی ئەم بەشەی دەقەکەیان بەم جۆرە لێکداوەتەوە:(ئەگەر خۆشی و ئارامی لە دوو چاوانیدا نەبینییەوە یان نەنگییەکی تێدا بێت) لەسەر ئەو بنچینەی وشەی "بەوەی" مانای وشەی "یان"ی هەبێت لە زمانی عیبریدا، هەروەها دەڵێن: تەڵاق لەسەر دوو خاڵە: یان ژنەکە جێگەی خۆشی و ئارامی نەبێت لەبەرچاوی مێردەکەیدا، یان پیاوەکە نەنگییەکی تێدا بینیبێتەوە، بۆیە خێر و خۆشی لێ نەبینین بەسە بۆ تەڵاقدانی، با سەرچاوەکەشی ئارەزووی پیاوەکە بێت لە ئافرەتێکی جوانتر لە ئەو، لێکۆڵینەوەی هەریەك لە مەرجەکان و هۆیەکان و کاریگەری تەڵاق لەسەر مافەکانی ژن لە باسێکی تایبەتدا دەخەینە روو.

# باسی یەکەم:
# مەرجەکانی تەڵاق

لای رەبانییەکان بۆ دروستی تەڵاق سێ خاڵ بە مەرج دەگیرێن:

**مەرجی یەکەم-گوزارەی دارشتن:**

لە گوزارەی دارشتندا دەبێت لە پیاوێکەوە دەرچووبێت پەیبردن(بیر و هۆش)ی تەواو بێت، لاڵی و نەخۆشی کاریگەریان نابێت گەر کوتوپری بن و هێزە ئەقڵییەکانیان پەکنەخستبێت، بۆیە تەڵاق لە کەسانی ترەوە جگە لە مێردەکە دروست نییە، هەر بەو جۆرە لە هاوسەرێکی منداڵەوە یان لە شێتەوە یان لە گێلەوە یان لە سەرخۆشەوە یان لە لاڵەوە گەر لاڵییەکەی کوتوپری نەبوو، پێمانوایە ئەمە پێچەوانەی دەقی راشکاوی تەوراتە کە رێگری تەڵاق ناکات لە کەسی لاڵ و کەسانی تر، بەجۆرێك بەرەهایی تەڵاقدانی بۆ پیاو ئاوەڵا کردووە لەباری نەبینینەوەی خێر و خۆشی لە چاوی ژنەکەیدا، هەروەك چۆن بە داگیرکردنی مافێکی سروشتی کەسێك دەزانرێت کە دەتوانێت بە ئاماژە گوزارەی خۆی بدات[1]

**مەرجی دووەم بەڵگەنامە:**

بۆ دروستی تەڵاق بە مەرج دەگیرێت لە بەڵگەنامەیەکدا تۆمار بکرێت کە دوازدە دێر بێت نە زۆر نە کەم[2]، ئەمەش بە ئامادەبوونی دوو شایەت لە میللەتی یەهود.

ئەم دیاریکردنە لە وشەی "جط" وەرگیراوە واتە بەڵگەنامە بە زمانی عیبری، "جیم" سێیە و "ط"یش نۆیە بەپێی ژمارەی ئەبجەدی.

دەڵێن: حیکمەتی ئەم دیاریکردنە بریتییە لە گرانکردنی کاری تەڵاق و

---

[1] يراجع المواد (٣٢١، ٣٤٠، ٣٤١، ٣٤٢، ٣٤٣)، من كتاب ابن شمعون.

[2] يراجع المقارنات المقابلات المرجع السابق ص٤٠٩.

بەرتەسکردنەوەی پانتایی بازنەکەی[1]، پێویستە بەڵگەنامەکە رادەستی ژنەکە بکرێت و پێی بوترێت: (بەڵگەنامەی تەڵاقەکەت وەربگرە، تۆ تەڵاقدراوی و حەلاڵی بۆ کەسێکی تر جگە لە من)

تەڵاقدانی ژنی شێت و هاوشێوەکانی لەوانەی خاوەنی شایستەیی تەواو نین دروست نییە، ئەوەش بە هۆی نەبوونی لێوەشاوەییەوە بۆ وەرگرتنی ئەو بەڵگەنامەیە، بۆی هەیە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتی شێتدا بکات گەر هاوسەرگیرییە نوێیەکە کارنەکاتە سەر حاڵ و بار و چارەسەری ژنەکە، ئەمەش لەگەڵ شەریعەتی حامورابیدا تەبایە[2]

دروست نییە بەڵگەنامەکە لەو رۆژانەدا بنووسرێت کارکردن تیایاندا رێگەپێنەدراوە، هەروەها دروست نییە لە شەودا بنووسرێت، مەگەر زۆر پێویست بێت، رازیبوونی ژنەکە بە تەڵاق و قبووڵ کردنی بە مەرج ناگیرێت، بەڵکو ئەوەندە بەسە ئاگاهی پێی هەبێت.

**مەرجی سێیەم -دەسەڵاتی شەرعی:**

لەڕووی شەرعەوە -لەلایان- تەڵاق تەنها لەبەردەم دەسەڵاتێکی ئایینیدا دروستە، بەڵام کاری ئەم دەسەڵاتە تەنها بریتییە لە تۆمارکردنی تەڵاق لە بەڵگەنامەکەدا، بۆیە مافی چاودێری قەزاییانەی لەسەر هاندەرەکانی تەڵاق بۆ نییە وەك چۆن لای قوڕائییەکان ئەو مافەی پێدراوە، چونکە مانایەکی بۆ نامێنێتەوە گەر بوونی پاساوێك بۆ تەڵاق بەمەرج نەگرێت، واتە رۆڵەکەی تەنها وەك متمانەگر وادەبێت کە لە بەردەم شایەتەکاندا ئەنجام دەدرێت هەتا رێنموونییەکانی رەبانییەکان بوونی پاساو بە مەرج نەگرن وەك چۆن قوڕائییەکان بە مەرجی دەگرن.

---

[1] پێمانوایە ئەم پێناسەیە پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو قسەیان بە موباحکردنی تەڵاق با بۆ بێبایەخترین "هۆ"ش بێت.

[2] ینظر المادة (١٤٨) من قانون حمورابي.

# باسی دووەم:
# هۆیەکانی تەڵاقی پابەندکەر

ڕەبانییەکان خۆیان بە پاساوەکانی تەڵاقەوە نەبەستۆتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش تەڵاق بە ئەرکێکی شەرعی دەزانن لەم بارانەدا:

١–**دەرکەوتنی خوێنی حەیز:** گەر خوێنی حەیز سێ جار بەدوای یەکدا پاش چوونە لای مێردەکەی دووبارە بوویەوە و سەلمێنرا ئەوە خوێنی کچێنی نییە ئەوا تەڵاقدانی پێویست دەبێت با یەکەمین چوونە لاش خوێن بەدەرکەوتبێت[1].

٢–**نەزۆکی ژن:** گەر دە ساڵ بەسەر هاوسەرگیریدا گوزەری کرد گەر بە کچی هێنابووی، پێنج ساڵ گەر بە بێوەژنی هێنابووی، بەبێ ئەوەی لەو ماوەدا منداڵی ببێت تەڵاقدانی پێویست دەبێت.

٣–**بێزاری ژنەکە یان پیاوەکە:** گەر خۆی گرتەوە لە مێردەکەی ئەوا شەرع چوار جار بەدوای یەکتردا لەمەڕ تیابردنی مافی مێردەکەی ئاگاداری دەکاتەوە، هەر هەفتەیەك یەك جار، گەر بەردەوام بوو ساڵێك مۆڵەتی پێ دەدرێت بەبێ خەرجیکێشانی، گەر ئەوەش بەری نەدا تەڵاقدانی پێویست دەبێت، هەر بەو جۆرە لەسەر مێردەکە پێویست دەبێت تەڵاقی بدات گەر ئافرەتەکە بەبێ هۆیەك خۆی گرتەوە لە هاوسەری کردنی[2].

٤–**گەر پێش هاوسەرگیری چووبووە لای ژنەکە:** لەسەری حەرام دەبێت، گەر گرێبەستی هاوسەرگیری لەگەڵ بەست لەڕووی شەرعەوە داوای لێدەکرێت تەڵاقی بدات.

٥–**زینای ژنەکە:** گەر لەڕووی شەرعەوە زیناکردنی ژنەکە بە ڕازیبوونی خۆی جێگیر

---

[1] یراجع المواد (١٥٥، ١٥٦، ١٥٧) من كتاب ابن شمعون.

[2] یراجع المادة (١٩٠) المرجع السابق.

بوو لەسەر مێردەکەی حەرام دەبێت و پێویست دەبێت لەسەری بەبێ هیچ مافێك تەڵاقی بدات، مەگەر زیناکردنەکەی مەبەست تیایدا رزگاربوون بێت لە دەستی پیاوەکەی لەو بارەدا کاریگەری نابێت، وەك چۆن کاریگەری زینا بە زۆر چوونە لا(پڕدان) کاریگەری نییە، جگە لەسەر کاهین، لەسەر ئەو حەرام دەبێت و پێویست دەبێت لەسەری تەڵاقی بدات لەگەڵ مانەوەی مافەکانی(مافی ژنەکە)، هەروەها وەك زینا لە حوکمی تەنهاکەوتنی لەگەڵ پیاوێك و مانەوەی لەگەڵی دوای ئاگادارکردنەوەی لەلایەن مێردەکەیەوە بە ئامادەبوونی دوو شایەت[1].

٦-**گواستنەوە:** بۆ دەسەڵاتی شەرعی هەیە رێگری لە سەفەری پیاوەکە بکات تا ژنەکەی تەڵاق دەدات، گەر ئەو ئاراستەیەی بۆی دەگواستەوە ژنەکە لەسەری رازی نەبوو، مەگەر هۆی سەفەرەکەی سەختی و دژواری ژیان و گوزەران بێت[2].

٧-**نەخۆشی مێردەکە:** گەر لە دوای هاوسەرگیری نەخۆشییەکی کوشندەی گوازراوە بۆ پیاوەکە هاتە ئاراوە پێویستە لەسەری تەڵاقی ژنەکەی بدات، خۆ گەر نەخۆشییەکە فێداری بوو ئەوا تەڵاقی لەسەری پێویستە، یەکسانە ژنەکە فێدار بێت یان پیاوەکە[3].

٨-**نەزۆکی ژنەکە:** گەر نەزۆکی ژنەکە راستەقینە بوو تەڵاقی لەسەر پێویست دەبێت و ژنەکە مافی خۆی وەردەگرێت[4].

٩-**نەبوونی پیاوەکە:** گەر پیاوەکە نەدار بوو و نەیدەتوانی قوتی گوزەرانی پێویستی خۆی بەدەست بهێنێت تەڵاقدان لەسەری پێویست دەبێت و مافی ژنەکەی وەك قەرز لە گەردنیدا دەمێنێتەوە[5].

---

[1] يراجع المواد (١٨٠، ١٨٢، ١٨٤، ١٨٥، ١٨٦، ١٨٨) المرجع السابق.

[2] يراجع المادتين: (١٩٢-١٩٥) كتاب ابن شمعون.

[3] يراجع المادتين (٢٠٤-٢٠٥) المرجع السابق. شعار الخضر المرجع السابق ص١٢٨.

[4] يراجع المادة (٢١٣) المرجع السابق.

[5] يراجع المادة (٢١٥) المرجع السابق.

**١٠-دەستدرێژی پیاوەکە بۆ سەر ژنەکە:** گەر پیاوەکە بەردەوام لە ژنەکەی خۆی دەدا شەرع دەمکوت و سەرزەنشتی دەکات و سوێندنی دەدات جارێکی تر نەگەڕێتەوە بۆ ئەو کارەی، گەر سوێندەکەی خوارد و گەڕایەوە بۆ سەر لێدانی ژنەکەی تەڵاق و پێدانی مافی ژنەکەی لەسەر پێویست دەبێت مەگەر لێدانەکە بە پاڵنەرێکی شەرعی بێت[1].

**١١-تەڵاقدراو بە هۆی زیناوە:** گەر پیاوەکە هۆی تەڵاقدانی ژنەکە بوو لە پیاوەکەی تری بە زیناکردن لەگەڵی ئەوا تەڵاقدان لەسەری پێویست دەبێت کاتێک-دوای پیاوەکەی تر- کردی بە ژنی خۆی با منداڵیشی لێی هەبێت[2].

**١٢-ژنی حەرامکراو:** گەر ژنەکە لەسەری حەرام کرابوو بەهۆی ڕێگرێکەوە لە ڕێگرەکانی هاوسەرگیری تەڵاقدان لەسەری پێویست دەبێت[3].

**ئایا دەسەڵاتی جیاکردنەوە بۆ قەزا هەیە؟**

گەر پیاوەکە نەیویست تەڵاقی بدات سەرەڕای پێویستوونی تەڵاق لەسەری بە هۆیەك لە هۆیەکانی پابەندکەری پێشوو، ئایا قازی لە جێگەی ڕاستدەبێتەوە لە تەڵاقدان وەك لە مەزهەبی قورئانییەکاندا ئەنجام دەدرێت؟ وەڵامەکەی: نەخێر.

مادەی(٣٢١)ی کتێبی ئیبن شەمعون:(تەنها بە تەڵاق کۆتوبەندی هاوسەرگیری هەڵدەگیرێت)، مادەی(٣٣٧):(هەر تەڵاقێك لە دەسەڵاتێکی بێگانەوە(واتە جگە لە مێردەکە) لەڕووی شەرعەوە بەهەند وەرناگیرێت)، مادەی(٤٣٨):(پیاوی هاوسەردار لەگەڵ ئافرەتی مەحرەم داوای لێدەکرێت تەڵاقی بدات، گەر وەستا(لە تەڵاقدانی دروستە شەرع کەناگیری بکات و بێبەشی بکات لە دروشمەکان و مافە دارایبەکان تا تەڵاقی دەدا)

لە هەموو ئەم دەقانەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی تەڵاق هەر دەبێ لە خودی

---

[1] یراجع المادتین (٢٧١، ٢٨١) المرجع السابق.
[2] یراجع المادة (٣٤٧) المرجع السابق.
[3] یراجع المادة (٣٤٨) المرجع السابق.

پیاوەکەوە دەریچێت، جا یەکسانە بیەوێت پەیوەندی هاوسەرگیری کۆتایی پێ بهێنێت یان دەیەوێت وەك ژنی خۆی بیهێڵێتەوە، یان سیستمی گشتی داوای بکات.

گەر پیاوەکە نەیویست تەڵاقی بدات ئەوا هیچ دەسەڵاتێك لە تەڵاقداندا جێگەی ئەو ناگرێتەوە، پاڵپشت بەوەی لە تەوراتدا هاتووە کە پیاو:(بەڵگەنامەی تەڵاق بۆ ژنەکە دەنووسێت و رادەستی ژنەکەی دەکات)

بۆیە دەڵێن: ئەم دەقە ئاشکرایە لەوەدا پێویستە تەڵاق لە خودی پیاوەکەوە دەربچێت، بۆیە هەر بۆچوونێك بەوەی قازی دەتوانێت لە جێگەی پیاو ژنەکە تەڵاق بدات دوورە و لەسەر بەڵگەیەکی شەرعی شانیدانەداوە.

**پیاو لەم بارانەدا لە مافی تەڵاقدان بێبەش دەکرێت:**

١-**شێتی:** گەر ژنەکە تووشی شێتی بوو لەدوای هاوسەرگیری تەڵاقدانی لەسەر پیاوەکە حەرام دەبێت، و گەرەکە گرنگی پێبدات لەڕووی خەرجی بۆ کردن و چارەسەرەوە، بەڵام بۆی هەیە ژنێکی تر بەسەریدا بهێنێت گەر هێنانی زیانی بە ژنی یەکەم نەدەگەیاند[1]

٢-**بەدیلگیرانی ژنەکە:** گەر ژنەکە بە دیلگیرا پێویستە لەسەر پیاوەکە بە موڵك و پارەی تایبەتی خۆی چەند دەتوانێت هەوڵی ئازادکردنی بدات، تەڵاقدانی حەرامە لەسەری بەر لە رزگاربوونی لە دیلی[2].

٣-**هەتککردنی پەردەی کچێنی:** گەر هەتکی پەردەی کچێنی ئافرەتێکی کرد و ناچارکرا لەسەر هاوسەرگیری لەگەڵی بۆ ئافرەتەکە هەیە تەڵاقنەدانی لەلایەن ئەو پیاوەوە بە مەرج بگرێت، کاریگەری ئەم مەرجە دەمێنێتەوە بە درێژایی ژیان مەگەر ژنەکە زینا بکات[3].

---

(1) يراجع المادتين (٣٣٢، ٣٣٣) من كتاب ابن شمعون.

(2) يراجع المادة (١٣٣) المرجع السابق.

(3) يراجع المادتين (٤١١، ٤١٤) المرجع السابق.
قصة الزواج ص٣٠٦ وما بعدها.

# باسی سێیەم:
# ئەسەری تەڵاق لەسەر مافەکانی ژن

**أ.بێبەشبوونی ژنەکە لە هەموو مافەکانی یان لە بەشێکی گەر بە هۆیەك لەم هۆیانە بوو:**

١-هەڵسوکەوتی ژنەکە لەگەڵ کچێنی خۆی بە رێگەیەکی ناڕەوا بسەلمێت.

٢-نەشیاوی ژنەکە بۆ پیاوان.

٣-نەنگی لە ژنەکەدا گەر پیاوەکە پێش هاوسەرگیرییەکە پێی نەزانی بوو.

٤-ژنەکە رێگری بکات لە خۆی بۆ مێردەکەی بەهۆی رق و بێزارییەوە لە مێردەکەی.

٥-رقی ژنەکە لە مێردەکەی لەگەڵ رەدکردنەوەی ژنەکە بۆ جیابوونەوە.

٦-قسەی ژنەکە لەگەڵ کەسێك مێردەکەی رێگری لێ کردبێت پەیوەندی پێوە بکات و لەسەر ئەوە سوێندی دابێت.

٧-ژنەکە نەیەوێت لەو شوێنە نیشتەجێ ببێت پیاوەکەی لێ نیشتەجێ دەبێت.

٨-سووربوونی ژنەکە لەسەر سەربەخۆی لە شوێنی نیشتەجێبووندا لە کەسوکاری مێردەکەی بەبێ ئەوەی ژنەکە بچەوسێننەوە.

٩-زینای ژنەکە یان سەرپێچی ژنەکە لە شەرع و ئاداب.

١٠-پشتهەڵکردنی ژنەکە دوای تووشبوونی مێردەکەی بە نەنگییەك یان ئافەتێك لەدوای هاوسەرگیری.

١١-چەندبارەبوونەوەی جنێوی ژنەکە بۆ مێردەکەی لەدوای ئاگادارکردنەوەی ژنەکە بە بەربوونەوەی مافەکانی.

١٢-گەر مێردەکە نەدار بوو، بەڵام چاوەڕوانی دەروو و کرانەوەی ژیان بوو.

**ب-گەر ژنەکە بەم هۆیانە تەلاق درا مافەکانی خۆی وەردەگرێت:**

١-دەرکەوتنی نەبوونی پەردەی کچێنی، بەلاَم هەڵسوکەوتی ژنەکە بە رێگەیەکی ناشەرعی لەو کارەدا ساغ نەبوویەوە.

٢-دەرکەوتنی خوێنی حەیز-وەك پێشتر باسمان کرد-(چەند بارەبوونەوەی خوێنی حەین)

٣-دەرکەوتنی نەنگییەك نەشارێتەوە یان ئاشکرابێت بۆ مێردەکە بەر لە هاوسەرگیری.

٤-نەزۆکی ژنەکە.

٥-لەبارچوونی منداڵ سێ جار لەسەر یەك.

٦-بێزاری ژنەکە بە مەرجێك ئارەزووی ئاشتەوایی هەبێت بەر لە حوکمی تەلاقەکە بەلاَم مێردەکە رەدی بکاتەوە.

٧-زینای ژنەکە بە پڕدان(بەزۆر کارەکەی لەگەڵ کرابێت)

٨-تووشبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە فێداری.

٩-بۆنی ناخۆشی ژنەکە.

١٠-پیاوەکە رێگری لە خۆی بکات لە چوونە لای ژنەکەی.

١١-پیاوەکە بەردەوام بێت لە دەستدرێژیکردنە سەر ژنەکە.

١٢-گەر مێردەکە بەبێ نەوە مرد و ژنەکە نەیویست شوو بە براکەی بکاتەوە بەهۆی نەنگییەك لە پیاوەکەدا.

**بەراورد لە نێوان دوو مەزهەبەکەدا:**

دوو مەزهەبەکە لە زۆرێك لە حوکمەکانی تەلاقدا تەبان وەك ئەوەی باسمان کرد لە رۆشنبوونەوە و هۆیەکان و ئاساری تەلاق لەلای هەردووکیان، بەلاَم لە هەندێ خاڵدا جیاوازن گرنگترینیان:

**١- پاساوی تەڵاق:**

لای رەبانییەکان پێچەوانەی قورائییەکان بوونی پاساو بە مەرج ناگیرێت، ئەوەش بۆ جیاوازیان دەگەڕێتەوە لە لێکدانەوەی دەقە هاتووەکە لە تەوراتدا وەك پێشتر باسکرا.

**٢-چاودێری قەزاییانە:**

لای رەبانییەکان چاودێری لەسەر پاڵنەری تەڵاق بوونی نییە لەبەر بێبایەخی پاڵنەر لەلایان لە دروستی تەڵاقدا، بەڵکو کار و ئەرکی دەسەڵاتی شەرعی لەلایان لەسەر پڕکردنەوەی بەڵگەنامەی تەڵاق کورتدەبێتەوە، وەك باسمان کرد، لە کاتێکدا ئەم چاودێرییە لای قورائییەکان پێویستە.

**٣-جیابوونەوەی قەزاییانە:**

لای رەبانییەکان دروست نییە دەسەڵاتی قەزا جێگەی مێرد بگرێتەوە لە تەڵاقدانی ژنەکەی، گەر هۆیەکی پاساودەر بۆ ئەوە هەبوو، لە کاتێدا لای قورائییەکان ئەوە دروستە، سەرچاوەی جیاوازییەکان کۆتوبەندبوونی رەبانییەکانە بە رواڵەتی ئەوەی لە تەوراتدا هاتووە لە دانەپاڵی نووسینی بەڵگەنامەی تەڵاق بۆ لای خودی پیاوەکە و پابەندنەبوونی قورائییەکان بەو جۆرە تێڕوانینەوە.

**٤-بەڵگەنامە:**

هەردوو مەزهەبەکە هاوڕان لەسەر ئەوەی بەڵگەنامە مەرجی بنچینەییە بۆ دروستی تەڵاق، بەڵام لەسەر چۆنێتی رێکخستنی جیاوازیان لە نێواندا هەیە، رەبانییەکان پێیانوایە دەبێت بە دوازدە دێڕ دیاریبکرێت، لە کاتێکدا قورائییەکان گرنگی بەوە نادەن.

**٥-دارشتن:**

لەلای قوڕائییەکان دارشتن دەبێت یەکلاکەرەوە بێت هەڵنەپەسێرابێت بە مەرجێکەوە و نەدرابێتە پاڵ ماوە(کات)، لە کاتێکدا ئەوانە لای رەبانییەکان بە مەرج ناگیرێن.

**٦-تەلاقی ژنی شێت:**

لای رەبانییەکان تەلاقی ژنی شێت بەر لە چاکبوونەوەی گونجاو نییە بە پێچەوانەی قوڕائییەکانەوە.

**تێبینییەکانمان لەسەر نیزامی تەڵاقی یەهودی:**

لەوەی پێشەکەش کرا لەمەڕ حوکمەکانی تەلاق لای یەهود ئەنجامگیری ئەم تێبینیانە دەکەین:

١-زۆرێك لەو حوکمانە سەرچاوەیەك یان پاڵپشتێکیان لە "عەهدی کۆن"دا نییە، بەڵکو ئەوانە یان لە شەریعەتی ئیسلامەوە وەرگیراون وەك جیاکردنەوە بە هۆ، یان لە یاساکانی حامورابییەوە وەرگیراون وەك نادروستی تەلاقی ئافرەتی شێت بەر لە چاکبوونەوەی[1]، یان لە یاساکانی رۆمانەوە وەرگیراون وەك تەلاقدان بەهۆی زیناوە.

٢-لە زۆرێك لەو حوکمانەدا دیاردەی زۆرداری بە مافی دوو هاوسەرەکە یان بە مافی یەکێکیان دەبینرێتەوە، لە شێوازەکانی:

أ.وەرگرتنەوەی هەڵبژاردن لە تەلاقدا لە دوو هاوسەرەکە لە چەندین بواردا، دوازدە حاڵەتمان لە مەزهەبی رەبانییەکان باس کرد کە تەلاقیان بە پێویستبوونێکی پابەندکەر تێدا پێویست دەبێت، لە کاتێکدا شەریعەتی ئیسلام ئازادی هەڵبژاردن بە کەسە سەلامەتەکەیان دەدا و بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بکات لە قەزا و دەشتوانێ ئارام بگرێت لەسەر هاوسەرەکەی و

---

[1] یراجع المادة (١٤٨) من قوانین حمورابي.

بەشداری خۆشی و ناخۆشی بکات لەگەڵی، لەگەڵ پاداشتی چاکە لەلای خودا وەك کارکردن بە گیانی مرۆیی پاك و جوان.

ب-پێدانی ماف تەڵاق بە پیاوەکە گەر ژنەکە زینای کرد یان ئاکاری خراپ بوو، و بێبەش کردنی ژنەکە لەم مافە گەر مێردەکەی بە هەمان هۆ تێوەگلا.

ج-فروانخوازی لە هۆیەکانی بوونی تەڵاقدا بە جۆرێك سەریکێشاوە بۆ ئەوەی ئافرەتە هەژارەکە ببێتە قوربانی زۆرێك لەو هۆیانە بەبێ ئەوەی لە ڕوودانیاندا هیچ دەستێکی ئەوی تێدا بێت وەك نەزۆکی و چەندبارەبوونەوەی خوێنی حەیز.

د-دەستێوەردانی دادگا بۆ ناو کاروباری خێزان و چوونە ناو نهێنییەکانی خێزانەوە بەهۆی ئەو دەسەڵاتەی چاودێری یاسایی لەسەر پاساوی تەڵاقدان پێیداوە.

٣-بەرهەڵستکارییەکی ڕۆشن لەلایان لە نێوان حوکمەکانی تەڵاق وەك بوونی شێتێتی پێش هاوسەرگیری وەك هۆیەك بۆ پووچەڵبوونەوەی هاوسەرگیرییەکە لەگەڵ نەبوونی بە هۆ بۆ جیابوونەوە لەلای ڕەبانییەکان گەر لەدوای هاوسەرگیری هاتە ئاراوە، لە کاتێکدا شەریعەتی ئیسلام گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە بە دروست دادەنێت گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە شێت بوو و سەرپەرشتیارەکەی یان قازی لە گرێبەستەکە جێگەی گرتەوە، ئەو کارە وا لێکدەدرێتەوە لەوانەیە هاوسەرگیرییەکەی چارەسەر بێت بۆی، بۆیە گونجاو نییە بێبەش بکرێت لێی، پاشان هاوسەرە سەلامەتەکە گەر بیەوێت مافی داوای جیابوونەوەی لەدەستدایە لەبارێکدا لە چاکبوونەوەی شێتەکە هیوابڕاو بوو.

٤-دابەزینی پلە و پایەی ئافرەتی تەڵاقدراو لە گۆشەنیگای ڕێنموونییەکانی یەهودەوە هۆی تەڵاقەکە هەرچییەك بێت، هەروەها دانانی هاوسەرگیری لەگەڵی بە کارێکی ناپەسەند، ئەوەش وا دەکات داهاتووی ژیانی هاوسەری ئەو ئافرەتە وێران ببێت، لە سفری ئەحباردا، ئەسحاحی(٢١)، ژمارە(٧)دا

هاتووە:(هاوسەرگیری ناکەن لەگەڵ ئافرەتێکی بەدڕەوشت یان پەتیارەدا، هەروەها هاوسەرگیری ناکەن لەگەڵ ئافرەتێکی تەڵاقدراودا) لە هەمان ئەسحاحدا ژمارە(١٤) هاتووە(ئافرەتی بێوەژن و تەڵاقدراو یان پەتیارە یان بەدڕەوشت ئەوانە ناکرێنە هاوسەر) ئەمەش مانای وایە تەڵاقدراو لە ریزی بەدڕەوشت و پەتیارە دانراوە.

سەرباری ئەوە ئەم شەریعەتە رێگەی لە گەڕانەوەی ئافرەتی تەڵاقدراو بۆ لای مێردەکەی پێشووی بڕیوەتەوە، لە سفری تەسنییەدا، ئەسحاحی (٢٤)، ژمارە(٢-٣)دا هاتووە(هەرکات ژنەکە لە ماڵەکەی چووە دەرەوە(بە تەڵاقدان) دەڕوات و دەبێتە ژنی پیاوێکی تر، گەر پیاوەکەی تر رقی لێی بوو و نووسراوی تەڵاقی بۆ کرد و دایە دەستی، و لە ماڵەکەی دەریکرد یان گەر پیاوەکەی دووەم کە کردی بە ژنی خۆی مرد ئەوا مێردی یەکەمی کە تەڵاقیدابوو ناتوانێت بگەڕێتەوە سەری و بیکاتەوە بە ژنی خۆی دوای ئەوەی پیس بوو) لە کتێبی "المقارنات والمقابلات"دا هاتووە:(حەرامە لەسەر پیاوەکە ئەو ژنەی بەهۆی نەزۆکییەوە تەڵاقی دابوو بیگێڕێتەوە گەر ژنەکە مێردی بە پیاوێکی تر نەکردبوو)[1].

هاوشێوەی ئەم زۆردارییە بوونی نییە لە شەرعی ئیسلامیدا.

٥-تەڵاق لە هەندێ حاڵەتدا وەك سزایەك وایە بۆ یەکێك لە دوو هاوسەرەی تێوەیگلاوە، لە کاتێکدا تەڵاق بۆ ئەوە دانراوە دوایین هۆکار بێت بۆ چارەسەری گرفتەکانی ژیانی هاوسەری.

٦-ئەوەی نامۆیە ئەوەیە فیقهی یەهودی رێگرییەکانی دروستی هاوسەرگیری بە هۆی پابەندکەری تەڵاقدان دادەنێت وەك لە دوو برگەی(١١،١٢)دا هاتووە، لە کاتێکدا ئەوانە هۆن بۆ پووچەڵبوونەوەی هاوسەرداری.

---

[1] المقارنات والمقابلات ص٤١١.

# دەروازەی سێیەم

# تەڵاق لە پەیامەکانی مەسیحیدا

سێ بەش لەخۆ دەگرێت:

بەشی یەکەم: تەڵاق لای کاسۆلیك

بەشی دووەم: تەڵاق لای ئەرسۆزکس

بەشی سێیەم: تەڵاق لای پرۆتستانت

مەسیحی وەك یەك میللەت سەریهەڵدا و پاشان دابەشبوون رووی لێکرد[1] و بۆ کاسۆلیك[2] و پرۆتستانت[3] و ئەرسۆزکس[4] دابەش بوون

**بنەما گشتییە هاوبەشەکانی نێوان ئەم سێ مەزهەبە لە هاوسەرگیریدا:**

١-هاوسەرگیری پەیوەندییەکی تاکەکەسییە و تەنها لە نێوان یەك پیاو و یەك ژندا راستدەبێتەوە.

٢-هاوسەرگیری نهێنییەکی پیرۆزە بە نوێژ دادەمەزرێت، هەروەها بە هاتنە ناوەی پیاوی ئایین بۆ کایەکە کە ویستی خودایی دەردەبڕێت، وتنی تەڵاق بە ویستی دوو هاوسەرەکە یان بە ویستی یەکێکیان مانای زاڵبوونی ئەو ویستەیە بەسەر ویستی خودابیدا، وەك چۆن هاوسەرگیری بە هاتنەناوەی دەسەڵاتی ئایینی بۆ

---

[1] کاسۆلیك شوێنی سەرۆکایەتی رۆما دەکەوێت، ئەرسۆزکسییەکان هەندێکیان لە هەندێکی تریان سەربەخۆن، پرۆتستانتیش لە هەر ولاتێکدا سەرۆکایەتییەکی سەربەخۆیان هەیە، تا سەدەی پێنجەم کەنیسە مەسیحییەکان سەربەخۆ بوون و جیاوازیان لە نێواندا نەبوو، یەکێك لە کۆمەڵە ئاینییەکان ساڵی ٤٥١ز بڕیارێکی دەربارەی سروشتی مەسیح-علیە السلام- دەرکرد، تیایدا ئەوەیان راگەیاند مەسیح خاوەنی دوو سروشتە، سروشتێکی مرۆیی و سروشتێکی خواوەندی، کەنیسەی میسری رازی نەبوونی خۆی لەسەر ئەوە راگەیاند و وتی مەسیح یەك سروشتی هەیە ئەویش سروشتی خواوەندییە، پاشان ناکۆکی لەسەر سەرۆکایەتی کەنیسە لە جیهاندا هاتە ئاراوە، ئەسقوفەکانی قوستەنتەنیە دلوای ئەوەیان دەکرد ئەوان سەرۆکایەتی بالای مەسیحییەکان بن، پاپا لە رۆما راستبوویەوە و نارازی خۆی بۆ ئەو کارە دەربڕی، بەرهەمی ئەوە دابڕان لە نێوان دوو کەنیسەکەدا روویدا لە ساڵی ١٠٥٤ز، ناوی کاسۆلیکی (واتە کۆکەرەوە) بەسەر کەنیسەی خۆرئاوایدا سەپێنرا و ناوی ئەرسۆزکسیش(واتە خاوەنی رای دروست) بەسەر کەنیسەی خۆرهەلاتیدا، لە سەدەی شازدەدا مەزهەبی پرۆتستانتیش بلاو بوویەوە.

[2] حەوت تایەفە لەخۆ دەگرێت: ئەقبات لە ئەسڵی میسری، رۆم لە ئەسڵی ئەورووپی، ئەرمەن لە ئەسڵی ئەرمەنی، سریان لە ئەسڵی سوری، مولرەنە لە ئەسڵی لوبنانی، کلدان لە ئەسڵی عێراقی، و لاتین لە ئەسڵی ئەورووپی، هەموو ئەوانە دەژنە ژێر سەرۆکایەتی پاپا لە رۆما.

[3] ئەوان سەرەرای دابەشبوونیان بە یەك تایەفە دادەنرێن.

[4] چوار تایەفە لەخۆ دەگرێت: (ئەقبات و رۆم و ئەرمەن و سریان) لە هەمان ئەسڵی باسکرلو.

کایەکە دادەمەزرێت هەر بەو جۆرە هەڵناوەشێتەوە مەگەر بە هاتنە ناوەی دەسەڵاتی ئایینی بۆ کایەکە، چونکە هەرکەسێك دامەزرانی لەدەستدا بێت هەڵوەشانەوەشی لەدەستدایە.

٣-مانای ئاوەلاگردنی هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیری بە تەنها یەك ویست ئەوە دەگەیەنێت تەنها کەسەکە لە یەك کاتدا نەیار و داوەریش بێت، ئەمەش گونجاو نییە.

٤-هاوسەرگیری سیستمێکی یاساییە و گرێبەست نییە، چونکە بابەتەکەی بریتییە لە خێزان، ئەوەش جێگەی گرێبەستکاری نییە، ئەو رێسایانەی حوکمی ئەم سیستمە دەکەن بە رێساگەلێکی فەرمانکەر دادەنرێن و دوو هاوسەرەکە ناتوانن لەسەر سەرپێچی لێیان رێکبکەون، وتنی گونجاوی تەلاق بە ویستی تاکلایەنە یان تەنها بە رێکەوتنی دوو لایەنەکە بە بنەما بنچینەییەکانی شەریعەتی مەسیحیدا دەکێشێت.

### دەسەڵاتی ویست لە تەلاقدا لەناو شەریعەتی مەسیحیدا

لەو بنەما گشتییە باسکراوانەوە تێدەگەین: تەلاق وەك مافێکی رەوای پاڵفتەی رەها لەدەستی مێردەکەدا، کەی بیەوێت و بە هەر هۆیەك بیەوێت سەربەخۆیانە بتوانێت تەلاقی ژنەکەی بدات، و کۆتاهاتنی پەیوەندی ژن و مێردی لەسەری سەرهەڵبدات، تەلاق بەم مانایە: شەریعەتی مەسیحی-بە هەموو مەزهەبەکانییەوە- نەیناسیوە، بەڵکو دەستیان بۆ تەلاقی کۆتوبەندکراو بردووە کە بە بوونی کۆمەڵێك هۆی پاساودەرەوە بریاری لەسەر دەدرێت، ئەوەش لەبەردەم دەسەڵاتێکی ئایینی پسپۆردا[1].

[1] یراجع الدکتور توفیق حسن فرج الأحوال الشخصیة لغیر المسلمین من المصریین ص٦١٠ وما بعدها.

بەڵام ئەو مەزهەبانە لە نێوان خۆیاندا جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە لەمەڕ گونجاوی تەڵاق و بەرینکردن و بەرتەسککردنەوەی پانتایی بازنەی تەڵاق لەلای ئەوانەی بۆچوونیان لەسەریەتی، هەر بەو جۆرە لە دیاریکردنی هۆیەکانی[1] تەڵاقدا، بۆیە پێویستە ڕۆشنکردنەوەی حوکمەکانی تەڵاق لەلای هەر مەزهەبێك بە بەشێکی سەربەخۆ باس بکەین.

---

[1] يراجع محمد محمود نمر، الأحوال الشخصية للطوائف غير الاسلامية من المصريين (في الشريعتين المسيحية والموسوية). ص٢٨٩. الدكتور احمد سلامة الاحوال الشخصية للمواطنين غير المسلمين والأجانب ص٧٤٩.

# بەشی یەکەم:
# تەڵاق لای کاسۆلیك

کەنیسەی کاسۆلیکی کەنیسەی رۆمایە[1]، ئەو کەنیسە بنەڕەتییەیە کەنیسەی ئەرسۆزکسی و کەنیسەی پرۆتستانتی لیّ جیابووەتەوە، زانراو و ئاشکرا لە کەنیسەی کاسۆلیکی ئەوەیە: تەنها بە مردن دان بە هەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەرگیریدا دەنێت، بەڵام جیاوازی کردووە لە نێوان هاوسەرگیری دروستی بڕیار لەسەردراوی کامڵ لەگەڵ هاوسەرگیری ناتەواو، بەم جۆرە:

**یەکەم -هاوسەرگیری دروستی بڕیار لەسەردراوی ناتەواو:**

بریتییە لە هاوسەرگیرییەکی دروست کە تێکەڵی جەستەیی نێوان دوو هاوسەرەکە تەواو نەبووە سەرەڕای ئەوەی هاوسەرگیرییەکە دروست و دامەزراوە، ئەم جۆرە هاوسەرییە هەڵوەشانەوە و کۆتاپێهێنانی دروستە، لە دوو باردا:

**باری یەکەم -یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بچنە ناو ژیانی رەهبەنییەوە:**

مەبەست پێی رەهبەنەتی گەورەیە -نەك نەزرێکی سادە- لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە، یەکسانە بە رازیبوونی لایەکەی تر بێت یان نە، ئەمەش وەك

---

[1] کاسۆلیکەکان داندەنێن بە سەرۆکایەتی پاپا و یەکێتی بیروباوەڕی ئایینی لە هەموو بنەما ئایینییەکاندا، جیاوازی رواڵەتی نێوانیان جیاوازی چییەتی تەلاق و بڕیاری تەلاقی لەسەر سەرهەڵنادات.

ڕۆیشتنێك لەگەڵ ڕێنماییەكانی كەنیسە كە ژیانی گۆشەگیری لە هاوسەرداری لە ژیانی هاوسەرگیری پێ باشترە، لەم بارەدا پەیوەندی هاوسەرداری بە هێزی یاسا هەڵدەوەشێتەوە و لایەكەی تر مافی ئەوەی هەیە سەرلەنوێ هاوسەرگیری بكاتەوە، تەنها بە چوونی لایەكەی تر بۆ ناو ژیانی ڕەهبەنی بەبێ پێویستی حوكمێك بۆ كۆتاهێنان بە هاوسەرداری، نهێنی ئەمە بۆ تێكەڵ نەبوونی جەستەیی(تێكەڵ نەبوونی جووتبوونانە)ی نێوان ژن و مێردەكە دەگەڕێتەوە، و بە یەك لاشە تەماشا ناكرێن، بۆیە مافی هەر یەكێكیانە بە هەموو بوونی خۆیەوە بۆ خودا یەكلا ببێتەوە و ئەویتریان سەرلەنوێ هاوسەرێكی تر بگرێتەوە.

**باری دووەم-هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیری بە هۆیەكی ڕاست و ڕەوان:**

هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیری دروستە گەر ئەم سێ مەرجەی تێدا بوو:

١-ڕاستبوونەوەی هۆیەكی ڕاست و ڕەوان، وەك هاتنە ئارای پەككەوتنی جووتبوون لەدوای گرێبەستەكە و پێش چوونە لای یەكتر.

٢-دادوەری هەڵوەشانەوەكە پاپا بێت(حیبری مەزن)، جگە لە ئەو كەس ئەم دەسەلاتەی نییە.

٣-لەبەردەم دەسەلاتی هەڵوەشانەوەدا بسەلمێت هاوسەرگیرییەكە ناتەواوە(واتە چوونە لا و پەیوەندی ناوجێگە لە نێوان دوو هاوسەرەكەدا ڕووینەداوە)[1].

دەسەلاتی خەملاندن بۆ پاپا هەیە لە قبوولّ كردنی هۆیەكە وەك پاساوی هەڵوەشانەوە و حوكمدان پێی.

**دووەم-هاوسەرگیری دروستی بڕیار لەسەردراوی كامل:**

لەم جۆر و بابەتەی هاوسەرگیریدا كاسۆلیك دان بە هەڵوەشانەوەدا نانێت مەگەر بە مردن، بەلام لەسەر جیابوونەوەی جەستەیین.

---

[1] ينظر توفيق حسن فرج، أحكام الأحوال الشخصية لغير المسلمين المرجع السابق ص٣٥٢-٣٥٣.

**جیابوونەوەی جەستەیی:**

کاتێك کاسۆلیك هەستیان بە ترسناکی لێسەندنەوەی مافی سروشتی کردووە لە مرۆڤ کە بریتییە لە تەڵاق، ناچاربوون لەبری ئەوە پەنا بەن بۆ جیابوونەوەی جەستەیی کە بریتییە لە حاڵەتێکی نێوان راستبوونەوەی پەیوەندی هاوسەری و کۆتاهاتنی ئەو پەیوەندییە، ئەوان دوو هاوسەر نین بە جۆرێك هەریەکەیان خۆشی لەویتریان ببینێت، هەر بەو جۆرە لەیەکتریش جیانەبوونەتەوە بۆ هەریەکەیان دروست بێت ژیانێکی هاوسەری نوێ لەگەڵ کەسێکی تر گرێ بدات.

لێکجیاکردنەوەی جەستەیی بە بڕیاری دەستە و لەم بارانەی خوارەوەدا:

١- گەر یەکێکیان بەبێ رازیبوونی ئەویتر زینای کرد، و ئەویتر هەمان تاوانی ئەوی ئەنجام نەدابێت.

٢- گەر یەکێکیان مەزهەبێکی تری وەرگرت جگە لە مەزهەبی کاسۆلیکی.

٣- گەر یەکێکیان منداڵەکانی بە پەروەردەیەك پەروەردە کرد پێچەوانە بێت لەگەڵ بیروباوەڕی کاسۆلیکی.

٤- گەر ژیانی هاوسەرییان تێکچوو بە جۆرێك بەردەوام بوونی دژوار بوو.

٥- گەر یەکێکیان ئاکاری تاوانکارانەی گرتەبەر بەجۆرێك تیابەری رێز و پێگەی مرۆڤ بوو.

٦- هەر بارێك دەستەکە بڕیاری لەسەر دەدات وەك هۆیەکی پێویستکەر بۆ جیابوونەوەی جەستەیی[1].

---

[1] لەوەی باسکرا رۆشن دەبێتەوە: وتنی ئەو قسەی شەریعەتی مەسیحی دەست بۆ تەڵاقی کۆتوبەنکراو دەبات لە دەروازەی زاڵەوە لە کاتێکدا کاسۆلیك تەڵاق لەلایان بوونی نییە، نە تەڵاقی رەها و نە تەڵاقی کۆتوبەندکراو.

**بەڵگەکانی کاسۆلیک:**

کاسۆلیك بەڵگە دەهێننەوە لەسەر هەڵنەوەشانەوەی پەیوەندی هاوسەرداری لە ڕێگەی تەڵاقەوە بەم بەڵگانە:

**یەکەم-ئەوەی لە ئینجیلەکاندا هاتووە:**

لە ئینجیلی لوقادا هاتووە[1] (هەر کەس ژنەکەی تەڵاق دەدات و ژنێکی تر دەهێنێت ئەوە زینا دەکات، هەر کەس ژنێکی تەڵاقدراو لە مێردەکەی دەهێنێت ئەوە زینا دەکات).

لە ئینجیلی مەرقەسدا هاتووە[2]، فەریسییەکان هاتنە بەرەوە و پرسیاریان لێ کرد: ئایا بۆ پیاوێك حەڵاڵە ژنەکەی تەڵاق بدات؟ ئەو پرسیارەیان بۆ ئەوە بوو تاقیبکەنەوە، وەڵامیدایەوە و پێیوتن: موسا بەچی وەسێتی بۆ کردن؟ وتیان: موسا مۆڵەتی داوە نووسراوی تەڵاق بنووسێت و دەستبەرداری ژنەکە ببێت، یوسوع وەڵامیدایەوە و پێیوتن: بەهۆی دڵڕەقیتانەوە ئەو وەسێتەی بۆ نووسین، بەڵام لە سەرەتای دروستبوونەوە خودا بە نێر و مێ دروستی کردن، بۆیە پیاوێك باوك و دایکی واز لێ دەهێنێت و بە ژنەکەیەوە دەنووسێت، و هەردووکیان دەبنە یەك جەستە، ئەو کەسەی خودا بە هاوسەری کردووە مرۆڤ ناتوانێت لێکی جیابکاتەوە، پاشان لە ماڵەوە قوتابییەکانی پرسیاریان لێکرد دەربارەی ئەوە، ئەویش پێیوتن: (هەر کەس ژنەکەی تەڵاق بدات و ژنێکی تر بهێنێت ئەوە زینای بەسەردا کردووە، گەر ئافرەتێك مێردەکەی تەڵاق بدات و مێرد بە پیاوێکی تر بکات ئەوە زیناکەرە).

لە ئینجیلی مەتیدا[3] هاتووە: (وتراوە: هەرکەس ژنەکەی تەڵاق بدات با نووسراوی تەڵاقی بداتە دەست، بەڵام من پێتان دەڵێم: هەر کەس ژنەکەی تەڵاق بدات جگە لە

---

[1] أنجيل (لوقا) الاصحاح (١٦) العدد (١٨).
[2] أنجيل (مرقص) الاصحاح (١٠) العدد (٢-١٢).
[3] أنجيل (متي) الاصحاح (٥) العدد (٣١-٣٢).

هـۆی زینـاکردن ئـەوە وای لێکـردووە زینـا بکـات، هەرکـەس هاوسـەرگیری لەگـەڵ تەلاقدراوێك کرد زینای کردووە)

هەروەها تیایدا هاتووە[1]:(گەر ژنەکەی تەلاقدا-بەبێ هۆی زیناکردن- و ژنێکی تری هێنا زینا دەکات، هەر کەس تەلاقـدراوێکی هێنـا زینـای کـردووە) لـە نامەکـەی بۆلسدا هاتووە: (وەسێت بۆ هاوسەرداران دەکەم-من نە، پەروەردەکارمان- ژن لـە پیاوەکـەی جیانەبێتـەوە، گـەر لێـی جیابوویـەوە بـا مێـرد نەکاتـەوە یـان لەگـەڵ مێردەکەیدا پێکبێتەوە، و پیاوەکەش واز لە ژنەکەی نەهێنێت)[2].

**دووەم-هاوسـەرگیری نهێنییـەکی پـیرۆزە لـە نهێنییـەکانی کەنیسـە، بۆیـە هەڵوەشانەوەی دروست نییە.**

**سێیەم-تەئویلی تەلاق لە ئینجیلی مەتیدا: "هەرکەس تەلاق بدات جگە لە هۆی زینا" بە "جیابوونەوەی جەستەیی" تەئویل کراوە.**

دەڵێن: گەر مەبەستی بە تەلاق تێگەیشتنە باوەکە بوایە ئەوا بەرهەڵستی دەکرد لەگەڵ ئایەتی:(هەر کەس تەلاقدراوێك بهێنێت زینـای کـردووە)، هـەروەها پێویسـت دەبوو تەلاق لە یـەك کاتـدا موبـاح بێـت و حـەرامیش بێـت، بۆیـە دەبێـت تـەلاق بـە جیابوونەوەی جەستەیی لێکبدرێتـەوە، ئەمـەش دەقـەکانی ئینجیـل کۆدەکاتـەوە و بەرهەڵستی نێوانیان هەڵدەگرێت.

**چوارەم-بەوەی لە تەوراتدا هاتووە(سفری تەکوین):** باسی ئەوە دەکات خودا حەوای دوای ئادەم دروست کرد، چونکە خودا-ﷻ- بینی باش نییە ئادەم بەتـەنها بێت، و دوای "دروستکراوەکەی خودا" لەسەر زمانی ئادەم ئەم وشانە دانران:(ئەمـە ئایەتێکە، ئێسك لە ئێسکی من، گۆشت لە گۆشتی من، لـە پێنـاوی ئەمـەدا مـرۆڤ لـە دایك و باوکی دووردەکەوێتەوە و بە ژنەکەیەوە دەلکێت و دەبن بە یەك جەستە)

---

[1] أنجيل (متي) الاصحاح (٩١) العدد (٩).

[2] ينظر توفيق حسن فرج أحكام ألاحوال الشخصية لغير المسلمين المرجع السابق ص٣٠٤.

دەڵێن: لەم دەقەوە حاڵی دەبین هاوسەرگیری جێگەی هەڵوەشانەوە نییە مەگەر بە مردن.

**پێنجەم بە یاسای سروشتی:** دەڵێن: ڕێساکانی سروشت داوای ئەوە دەکەن هاوسەرگیری تەنها لە پەیوەندییەکی هەمیشەیی و گرێدانێکی نەپساودا ئامانجەکانی خۆی بەدیبهێنێت[1].

**گفتوگۆ لەسەر ئەم بەڵگانە:**

١-دەقە هاتووەکان لە ئینجیلدا بۆ ڕۆشنکردنەوەی حوکمی تەڵاق هەندێکیان ڕەهان و هەندێکیان سنووردارن بە دۆخی زیناوە، بۆیە ڕەهاکان هەڵدەدرێنە سەر سنووردارەکان، تەڵاق لەڕووی بنەماوە بۆ هۆی زینا موباحە، ئەم هۆیە هەرچەند لە گوزارەیدا ڕەهایە، بەڵام لە تێگەیشتن لێی گشتییە و هەموو ئەو هۆیانە دەگرێتەوە جوانی و پاکێتی ژیانی هاوسەرداری تێکدەدەن، یان شك و گومان لە پەیوەندی هاوسەرداریدا دروست دەکەن و پیرۆزی پەیوەندییەکە دەشێوێنن، ئەوەش لەبەرئەوەی گەورەمان مەسیح-ع- یاسادانەرێکی یاسای دونیایی نەبووە و هەموو ڕووداوێك بە دەقێکی تایبەت باس بکات، بەڵکو پێغەمبەرێك بووە و ژیانی نموونەیی مرۆڤی لەسەر کلێشەی ڕێسا گشتییەکان نەخشاندووە، نموونەی ئەو لەوەدا وەك نموونەی براکانی تری وایە لە پێغەمبەران، لە قورئاندا نەهیکردن لە کردنی ئۆف بەرانبەر دایك و باوك هاتووە ﴿فَلَا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ﴾ مەبەست پێی هەر جۆرە ئێش و ئازارێکە ڕووبەڕووی دایك و باوك بکرێتەوە، هەروەها لە قورئاندا ئارەق حەرامکراوە و مەبەست پێی هەموو مادە سەرخۆشکەرەکانە، بینا لەسەر ئەمە دەتوانین بڵێین: تەڵاق لە شەریعەتی گەورەمان مەسیحدا-ع- موباح بووە بە هەر هۆیەك پیرۆزی هاوسەرداری

---

[1] راجع نمر وألفي المصدر السابق ص٣١١ وما بعدها.
الدكتور إهاب حسن اسماعيل أنحلال الزواج في شريعة الاقباط الارثوذكس ص٨٧ وما بعدها.

تێکبدات، بە وەرگرتنی ئەم تێگەیشتنە گشتییە بۆ زینا یان وەك پێوانە بۆ سەری لە هەر شتێك پەیوەندی و گونجانی هاوسەری بشێوێنێت.

٢-وتنی ئەوەی هاوسەرگیری نهێنییەکی پیرۆزە و هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیری قبووڵ ناکات قسەیەکی دروستە گەر دوو هاوسەرەکە پیرۆزییەکەیان راگرت، چونکە رێگری بە پیرۆزییەکەوە پەیوەستە و هۆیە بۆ بەردەوامی ژیانی ژن و مێردی، بۆیە بە تیاچوونی ئەو هۆیە(پیرۆزی پەیوەندی هاوسەرداری) هاوسەرگیرییەکە تیادەچێت.

٣-تەئویلی تەڵاق بە جیاکردنەوەی جەستەیی دوورە لە واقیعەوە، چونکە وشە لە مانای راستەقینەی خۆی لا نادرێت مەگەر گونجاو نەبێت، بەرهەڵستی نێوان دەقەکان هەڵدەگیرێت بە هەڵدانی رەها بۆ سەر سنووردار، چونکە ئەم تەئویلەیان دوو هاوسەرەکە ناچار دەکات بۆ بەربوونەوە بۆ ناو بەدبەختی و ژیانی کوێرەوەری بە هەموو تەمەنیان، سەرباری ئەمە خراپی ئاکار و لادانی جووتبوون بۆ هەریەك لە دوو هاوسەرەکە سەرهەڵدەدات، مەگەر کەسێك خودا بەزەیی پێ بکات.

٤-دروست نییە بەڵگە بهێنرێتەوە بەوەی لە تەوراتدا هاتووە، چونکە موسەوییەکان خۆیان پابەند نەبوون پێیەوە، ئیتر چۆن کەسانێك پێیەوە پابەند دەبن باوەڕیان بە تەورات نییە وەك سەرچاوەیەك بۆ حوکمە شەرعییەکانیان.

٥-یاسای سروشتی: ئەم یاسایەش رێگری ناکات لە هەڵوەشانەوەی گرێی هاوسەرداری لە کاتی پێویستدا، چونکە ئەم یاسایە هەرچەند بە تێگەیشتنی جۆرلوجۆر هاتووە وەك فەلسەفە لای ئیغریقیەکان و یاسا لای رۆمانەکان و "حسن و قبح"ی زاتی لای موعتەزیلە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش بە هەموو ماناکانییەوە بانگ بۆ شتێك دەکات بەرژەوەندی مرۆڤی تێدا بێت، بۆیە تەڵاق مەفسەدەیە گەر بە پاساوێك و بەرژەوەندییەك بوونی نەبێت کە پێویستییەکی زۆر زەروور پێداگری لەسەر کردبێت.

## بەشی دووەم:
## تەڵاق لای ئەرسۆزکس

کەنیسـەی ئەرسۆزکسـی لـە سـەدەی پێنجـەمی زایـینی لـە کەنیسـەی رۆمـا جیابوویـەوە، پاشـان کەنیسـەی قوسـەتەنتەنییە(بیزەنتی) لـە سـاڵی ١٠٥٤ز لێجیابوویەوە، ئەوەش لەبەر ناکۆکی سەرۆکایەتی کردنی جیهانی مەسیحی، پاشان کەنیسە رۆژهەلاتییە ئەرسۆزکسییەکانی تـر-سـەربەخۆ لـە دوو کەنیسـەکەی تـر- سەریانهەڵدا، بەلام ئەوەی هەموان کۆدەکاتەوە کاریگەربوونیانە بە یاسای رۆمانی و فیقهی ئیسلامی لە رێکخستنی حوکمەکانی هاوسەرگیری و تەلاقدا، بەجۆرێك ئەم کەنیسانە تەلاقیان تەنها لەسەر حاڵەتی زینا کورتنەکردۆتەوە، زینا تـەنها حاڵەتێکە مۆڵەت بە تەلاق دەدات و دەقەکەی لە ئینجیلی "مەتی"دا هاتووە، بەڵکو لە کەنیسە رۆژهەلاتییەکاندا ئاراستەی بەرەو لێکدانەوە و شرۆڤەکردنی بەرینتر بۆ ئەم تەنها هۆیەی لە ئینجیلدا هاتووە(هۆی زینا) تەشەنەی سەند، ئەو هۆیەشیان هەڵدایە سەر ئەوەی مەبەست پێی هەر شتێکە دەبێتە مایەی لێڵی و تەمومژ بۆ رۆشنی و پاکێتی ژیانی هاوسەری، بۆیە سەرۆکەکان و فەقیهەکانی ئەم مەزهەبە رێسا رۆمانییەکانیان وەرگرت و پاڵفتە و پوختەیان کردن و وەك یاسای کەنیسە بەهەندوەرگیران[1]، هەر بەو جۆرە زۆرێك لە هاندەرەکانی تەلاقیان لە فیقهی ئیسلامی وەرگرت، وەك:

---

[1] استاننا الدكتور الشرقاوي، الاحوال الشخصية لغير المسلمين الوطنيين والاجانب ص١٣٠، ١٣١.

شــێتێتی و نــەبوونی پیاوەتی(نــەبوونی توانــای جووتبــوون)، و خەســان و رەتق(ئێســکداری ژن) و قــەرن(داخرانی رەحــم) و بێسەروشــوێنی یــەکێك لــە هاوسەرەکان، و گولی و بەڵەك و پشتتێکردن و نشوز و تۆمەتی زینا.

"اهــاب حســن إسماعيــل" لــە کتێبەکەیــدا(انحــلال الــزواج في شــريعة أقبــاط الأرثونكس)دا[1] دەڵێت: (بەتریریك "كيرلس بن لقلق" فەرمانی خـۆی بـۆ یـەکێك لـە کاهینەکان دەرکرد[2] کە بریتی بوو لە "ابن العسال" کۆمەڵەیەکی کامڵ و تێر و تەواو بۆ فیقهی مەسیحی قیبتی دابنێت، ئەویش کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی دانا بـە نـاوی "المجموع الصفوي" لەناو ئەم کتێبـەدا رێسـا شـەرعی و یاسـاییەکانی وەرگـیراو لـە سەرچاوەی جۆراوجۆر، هەروەها گەڕاوەتەوە بۆ لای فیقهی ئیسلامی و بەتایبەت بـۆ لای کتێبەکانی ئیسحاق شیرازی لەسەر فیقهی شافیعی.

لەگەڵ ئەوەش کەنیسەکانی مەزهەبی ئەرسۆزکسی بەردەوام بوو لـە دەسـتگرتن بە بنەمای"هاوسەرگیری نهێنییەکی پـیرۆزە" کـە پاسـاوی ئـەوە دەدات سـەرەڕای موباح بوونی تەڵاق و هەندێ جار لـە ئاسـۆیەکی بەرینـدا بنـەڕەت بریتییـە لـە(قابیل نەبوونی هاوسەرگیری بە هەڵوەشانەوە).

ئەم مەزهەبە چوار تایەفە لەخۆ دەگرێت:(ئەقبات و ئەرمەن و سریان و رۆم)

لەبەر ئەوەی ئەم تایەفانە لەسەر دیاریکردنی هۆیە دیاریکراوەکانی تـەڵاق کـۆك و تەبا نین باشترە حوکمی تەڵاق لای هەر تایەفەیەك لە باسێکی سەربەخۆدا باس لێوە بکەین.

---

[1] ينظر ص٣٨.

[2] واتە لە سەدەی سیازدەی زایینییدا.

# باسی یەکەم:
# تەڵاقدان لە پەیامەکانی ئەقباتی ئەرسۆزکسدا

لەم پەیامانەدا لەسەر کۆمەڵێك هۆ بۆ ئاوەڵاکردنی تەڵاق کۆك و تەبان و لەسەر کۆمەڵێك هۆی تریش جیاوازیان هەیە، تەنها باسی ئەوانە دەکەین لەسەری کۆك و تەبان بەهۆی کەمی بوارەوە، ئەوانەش:

(زینا و ئاکاری خراپ و رەهبەنەت و دیارنەمان و حوکمدان بە سزایەك ئازادی کۆتوبەند بکات و نەخۆشی و دەستدرێژی و کۆچلێکردن).

**یەکەم-زینا:**

زینا لە گۆشەنیگای شەریعەتی قبتییەکانی ئەرسۆزکسەوە وشەیەکی جیرە و توانای کشانی تێدایە،، زینای راستەقینە(چوونە لا) و بارەکانی پێش زیناش دەگرێتەوە، هەروەها ئەوەی مرۆڤ وا لێدەکات گومان ببات یان باوەڕی وابێت سەردەکێشێت بۆ زینا، لە بوون بە هۆ جیاوازی نییە لە نێوان مێردەکە و ژنەکەدا.

زینای راستەقینە بە هۆیەکی راستەقینە دادەنرێت بۆ تەڵاقدان، گەر قازی دڵنیابوویەوە لە روودانی و لەوەی وەك دەستدرێژییەك بۆ سەر مافی هاوسەری دووەم لێیوەشاوەتەوە ئەوا پابەند دەبێت(واتە قازی) بە حوکمدانی تەڵاقدانەوە گەر هاوسەرە بێگوناهەکە داوای تەڵاقی کرد، لەو بارەدا هیچ دەسەڵاتێك بۆ قازی نییە لە لادان لەو بڕیارە، تەڵاقدان بەهۆی زیناوە بە سزایەك دادەنرێت بۆ کەمتەرخەمی ئەو هاوسەرەی هەڵنەستاوە بە ئەرکی خۆی بەرانبەر هاوسەرەکەی تر لە دڵسۆزی و ئەمانەت و پاکداوێنی[1].

---

[1] يراجع اهاب حسن اسماعيل المرجع السابق ص١١٠ وما بعدها.

دووەم -رەهبەنەت[1]:

رەهبەنەت سیستمێك بوو لەژێر سێبەری مەسیحییەتدا لەدایك بوو، ئەوەش بریتییە لە کەنارگرتن و گۆشەنشینی لە جیهان و خۆشییەکانی و دڵسۆزی و یەکلابوونەوە لە عیبادەتدا، لە داواکارییەکانی بریتی بوو لە خۆگرتنەوە لە هاوسەرگیری، کۆمەڵە ڕێسا تایبەتەکانی تایەفەی ئەقباتی ئەرسۆزکس لە ساڵی ١٩٣٨ز دەرچوو، لە مادەی(٥٨)دا بە دەق هێناویەتی: تەڵاق دروستە گەر دوو هاوسەرەکە یان یەکێکیان بوو بە راهیب بە رازیبوونی ئەویتریان، لەگەڵ ئەوەش پرۆژەی ساڵی ١٩٥٥ز رەهبەنەتی بە هۆی تەڵاقدان دانەناوە، بۆ ئەو هۆیە دوو مەرج هەیە:

١-چوونە ناوی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بۆ رێگەی رەهبەنەت بە چوونەناوێکی دروست بەوەی بەپێی رێساکانی کەنیسە جێبەجێ کرابێت، وەك ئەوەی تەمەنی لە (١٧) ساڵ کەمتر نەبێت و مەرامەکەی زەلیل کردنی دەروون و عیبادەتی خودا بێت.

٢-رازیبوونی لایەکەی تر کە رەهبەنەتی هاوسەرەکەی تری نەگرتوتە بەر گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بوو بە راهیب، تەڵاقدان بۆ ئەو هۆیە دەبێتە چارەسەر نەك سزا، لەو بارەدا تەڵاقەکە پابەندکەرە و هەڵبژاردنی تێدا نییە، پێویستە لەسەر قازی دڵنیا ببێتەوە لە فەراهەمبوونی هۆیەکە و تەواوبوونی مەرجەکانی[2].

---

[1] جیاوازی لەوەدا نییە گەر دوو هاوسەرەکە پێکەوە بوونە راهیب، بەڵام لە بارێکدا یەکێکیان بوو بە راهیب پێویستە ئەو کارە بە رازیبوونی هاوسەرەکەی تر بێت. ینظر الدکتور توفیق حسن فرج، أحکام الأحوال الشخصیة لغیر المسلمین ص٣٤٨.

[2] یراجع ملحق المجموع الصفوي ص٢٤.

**سێیەم-بێسەروشوێنبوون(بزربوون):**

لە کۆمەڵەی سەفەویدا هاتووە[1]: گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بەدیلگیرا و حەوت ساڵ بزر بوو، نەزانرا ئایا کەسەکە زیندووە یان مردووە ئەوا بۆ ژنەکەی هەیە مێرد بە پیاوێکی تر بکاتەوە، بۆ ئەمەش سێ مەرج هەیە:

١-دیارنەمان بۆ ماوەیەك: کۆمەڵە شەرعییەکان پێنج ساڵ تا حەوت ساڵیان بۆ دیارنەمانی پیاوەکە پارسەنگداوە، بەڵام وادیارە ئەوەی دواجار کاری لەسەر بیناکراوە بریتی بووە لە پێنج ساڵ.

٢-نەبوونی زانیاری دەربارەی ژیانی کەسی نادیارەکە و مردنی بەوەی شوێنی کەسەکە ئاشکرا نەبێت.

٣-دەرچوونی حوکم بە جێگیربوونی بێسەروشوێن بوونی.

تەڵاقدان بە ئەو هۆیە چارەسەری و هەڵبژاردەییە، چونکە مەبەست پێی رزگارکردنی مێردی ئێستایە لە ژنەکەی کە بەهۆی بزربوونەوە مەرامەکانی هاوسەرداری تێدا نەماوە[2]، ئەمەش دەکەوێتە ژێر خەملاندنی تەواوی قازییەوە لە سنووری دەسەڵاتی بابەتیانەی ماقووڵی خۆیدا.

**چوارەم-حوکمدان بەسەر یەکێک لە دوو هاوسەرەکەدا بە سزایەک ئازادی کۆتوبەند بکات:**

ئەم هۆیە بەراورد بە هۆیەکانی تر بە نوێ دادەنرێت، لە کۆمەڵە شەرعییەکانیاندا وەك: "المجموع الصفوي و مصباح الظلمة" و لە کۆمەڵەکانی تردا ئەم هۆیە نەهاتووە، مادەی(٥٢) لە پرۆژەی کۆمەڵەی(١٩١٧ز) بە دەق ئاماژە بە گونجاوی تەڵاقدان دەکات گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە سزایەکی ئازادی کۆتوبەندکەر بۆ ماوەی پێنج ساڵ سزا درا.

---

[1] یراجع ملحق المجموع الصفوي ص٢٤. الدکتور توفیق حسن فرج المرجع السابق ص٣٢٠.

[2] یراجع الدکتور احمد سلامة المرجع السابق ص١٤٣.

شرۆڤەکارانی ئەقبات لە سەرەتاوە ئەم دەقەیان بە پێچەوانەی یاسای کەنیسە تەماشا دەکرد و پێیانوابوو لە یاسای مەدەنی فەرەنسی[1] داتاشراوە، پاشان کۆمەڵەی(١٩٣٨) بەم شێوەیە دانی پیادانا:

حوکمدان بەسەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکەدا بە سزای کاری قورس یان چوونە ناو بەندیخانە یاخود بەندکردن بۆ ماوەی حەوت ساڵ و بەرەوژوور، هاوسەرەکەی تر پاساوی بە دەستەوەیە داوای تەڵاق بکات، مادەی(٥١) لە پرۆژەی ساڵی ١٩٥٥ز بەدەق هێناویەتی، بۆ ئەم هۆیە دوو مەرج هەیە:

١-حوکم بە سزایەکی ئازادی کۆتوبەندکەر بەسەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکەدا دەرکرابێت بۆ ماوەیەك لە حەوت ساڵ کەمتر نەبێت[2].

٢-حوکمەکە پلەی کۆتایی وەرگرتبێت.

بەم هۆیە تەڵاقدان پاداشتێکی ناچارکەرە، چونکە سزای کۆتوبەندکەری ئازادی ئازار و زیانی بۆ کەسی بەرانبەر تێدایە، بەهۆی ناپابەندی "حوکم بەسەرداکراو" بە ئەرکەکانی ناوبانگ و ئەمانەت و شتانی ترەوە کە یاسا و هاوسەرگیری چاودێری کردنیان بە پێویست دەزانن.

بۆ مێردە حوکم بەسەرداکراوەکە نییە سزاکە لەسەر خۆی لابدات بە تێکەوتنی هاوسەرەکەی بە تاوانێکی هاوشێوەی تاوانەکەی ئەو، چونکە لەم کاروبارانەدا باربووکردنەوە نییە.

**پێنجەم-نەخۆشی(شێتی، نەخۆشی گوازراوە، و نەخۆشییەکانی تر):**

کۆمەڵە شەرعیەکانیان وەك "المجموع الصفوي و الخلاصة القانونية" ئەو قسەیان تێدایە کە لە هۆیەکانی تەڵاقدان بریتییە لە شێتێتی و نەبوونی پیاوەتی و نەخۆشی کە ڕێگرن لە هاتنەدی ئامانجەکانی هاوسەرگیری.

---

[1] يراجع جرجس فيلو تأوس مشروع قانون الاحوال الشخصية طبعة القاهرة ١٩١٨ ص٢٩.

[2] يراجع الدكتور احمد سلامة المرجع السابق ص١٨٧.

شرۆڤەکارانی مەسیحی لەسەر ئەو قسەیە راهاتوون کە دەڵێن ئامانجگەلێك بۆ هاوسەرگیری بوونی هەیە دەیەوێت بەدیانبهێنێت، لەوانە: داوای نەوە، پارێزگاری لە دوو هاوسەرەکە لە ئازاری حەز و ئارەزوو، هاوکاری و هاریکاری لەسەر ژیان.

نەخۆشی سەردەکێشێت بۆ ئەوەی هاوسەرگیری نەتوانێت مەرامەکانی بهێنێتە دی، مادەی(٥٥) لە پرۆژەی ساڵی ١٩١٧ز بە دەق هێناویەتی تووشبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە شێتێتی یان گولی یان نەبوونی پیاوەتی تەڵاق موباح دەکات گەر پێنج ساڵ بەسەر نەخۆشییەکە گوزەری کرد و ئەوە سەلما نەخۆشییەکە هیوای چاکبوونەوەی نییە و رێگرە لە تێکەڵی جووتبوون، مادەی (٥٤) لە کۆمەڵەی ساڵی ١٩٣٨ز بە دەق ئاماژەی بە دروستی تەڵاقدان بۆ هەر نەخۆشییەکی گوازراوە کردووە تیایدا ترسی سەلامەتی هاوسەرەکەی تر بوونی هەبێت، بۆ شێتێتی تەواو گەر سێ ساڵ بەسەر نەخۆشییەکەیدا تێپەڕی و ئەوە سەلما قابیلی چاکبوونەوە نییە[١].

بەڵام کۆمەڵەی ١٩٥٥ز تەنها لەسەر شێتێتی و نەبوونی پیاوەتی کورت بووەتەوە، لە مادەی(٥٢)دا کە بە دەق هێناویەتی گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە شێتێتی بەردەوام تووش بوو بۆ ئەوی تریان دروستە داوای تەڵاق بکات گەر پێنج ساڵ بەسەریدا گوزەری کرد و سەلمێنرا کەسەکە قابیلی چاکبوونەوە نییە، هەر بەو جۆرە بۆ ژنەکە هەیە داوای تەڵاق بکات گەر پیاوەکە هێزی پیاوەتی لەدەستدا، و سەلمێنرا قابیلی چاکبوونەوە نییە، و ژنەکەش لە تەمەنێکدا بوو ترسی ئەوەی لێدەکرا رووبەڕووی فیتنە ببێتەوە، و بەسەر هاوسەرگیرییەکەیاندا پێنج ساڵ گوزەری نەکردبێت.

---

[١] يراجع اهاب اسماعيل المرجع السابق ص١٥٩ وما بعدها.
الدكتور توفيق المرجع السابق ٢٣٠.

**مەرجەکانی تەڵاقدان بەهۆی نەخۆشییەوە:**

١–تووشبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە نەخۆشی.

٢–سەختی و دژواری ژیانی هاوسەری و نەهاتنە دی مەرامەکانی هاوسەرگیری.

٣–تێپەڕبوونی ماوەیەکی ماقووڵ بۆ دڵنیابوونەوە لە چاکبوونەوە.

٤–نەخۆشییەکە لە پلەیەکی ترسی زۆردا بێت بەجۆرێك مانەوە لەگەڵ نەخۆشەکە تەنها زیانی لێ بکەوێتەوە.

تەڵاقدان لەلایان بەهۆی نەخۆشییەوە بە هەموو شێوازەکانییەوە چارەسەری و هەڵبژاردەییە، بۆ قازی هەیە ڕۆڵێکی گەورە ببینێت لە خەملاندنی نەخۆشییەکاندا[1].

**شەشەم-دەستدرێژی یەکێک لە دوو هاوسەرەکە بۆ سەر ئەویتریان:**

شەریعەتی قبتییە ئەرسۆزکسییەکان لە کۆمەڵە شەرعییەکانی خۆیاندا وەك "قوانين الملوك و المجموع الصفوي و والخلاصة القانونية"دا[2] ئەم هۆیەیان دان پیادا ناوە، کۆمەڵەی ساڵی ١٩٣٨ز بە دەق ئاماژەی بەوە داوە گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە دەستدرێژی کردە سەر ژیانی ئەویتریان یان دەقیگرت لەگەڵ ئازاردانی بە ئازاردانێکی گەورە بەجۆرێك تەندروستی ڕووبەڕووی مەترسی بکاتەوە بۆ هاوسەرە "تاوان دەرحەقکراوەکە" هەیە داوای تەڵاق بکات، هەروەها نموونەی ئەم دەقە لە مادەی(٥٣)ی پرۆژەی ساڵی (١٩٥٥ز) دا هاتووە، بۆ ئەم هۆیە سێ مەرج دانراوە:

١–دەستدرێژی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بۆ سەر ئەویتریان بەدەستدرێژییەکی دیاری بەرچاوی بەرجەستە یان ئەدەبی(یان مەعنەوی) لەسەر بوونی ناکۆکی لەسەر ئەوەی ئایا دەتوانرێت لێکۆڵینەوە لە دەستدرێژی بکرێت بە هۆکارە ئەدەبییەکان.

٢–ئەو دەستدرێژییە بگاتە ڕادەیەك لە مەترسی و هەڕەشە.

---

(١) يراجع الدكتور توفيق حسن فرج المرجع السابق ص٣٣١.

(٢) يراجع المرجع السابق ص١٨٨.

٣-ئەو هاوسەرەی دەستدرێژی کراوەتە سەر ژیانێکی بەڕوودا شکابێتەوە ژیانی هاوسەری لەگەڵی ئەستەم بێت[١].

ئەم هۆیە لە هۆیەکانی سزایی و هەڵبژاردەیی بۆ تەلاقدان دادەنرێت، قازی بە دەسەلاتی خەملاندنی خۆی دەستێوەردان دەکات بۆ خەملاندنی ترسناکی و کاریگەری لەسەر ژیانی هاوسەری[٢].

**حەوتەم - لەیەکدابڕانی ژن و مێردەکە(کۆچکردن و بێزاری لەیەکتر):**

کۆمەڵە یاساییەکانیان گرنگییان داوە بە لەیەکتر دابڕانی ژن و پیاوەکە وەك هۆیەك لە هۆیەکانی تەلاقدان گەر ئەم مەرجانە فەراهەم بوون:

١-لەیەکتر دابڕان لە کۆمەڵەی ١٩٣٨ز لە مادەی (٥)دا، هەروەها لە "الخلاصة القانونية"دا ماوەکەی بەلانی کەمەوە بە سێ ساڵ دیاریکراوە.

٢-هۆی دابڕانەکە هەڵەیەك بێت لەسەر "داوا لەسەرکراو"، کۆمەڵەی ١٩٣٨ گوزارەی لێداوە بەوەی بریتییە لە کەمتەرخەمی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە ئەرکەکانی بەرانبەر ئەویتریان یان خراپ مامەڵە لەگەڵ کردنی.

٣-ئەستەبوونی ژیانی هاوسەری، واتە حاڵیان بگاتە رادەیەك مانەوەی ژیانی هاوسەریان نەشیاو بێت.

تەلاقدان بەم هۆیە پاداشت و سزایە و دەکەوێتە سەر شانی ئەو هاوسەرەی بووەتە هۆی ئەوە، بە کەمتەرخەمی بەرانبەر ئەرکەکانی هاوسەرداری کە سەریکێشاوە بۆ دابڕان لەیەکتر، بەلام تەلاقدان لەم بارەدا هەڵبژاردەییە نەك پابەندکاری، قازی "دەسەلاتی ویست"ی بۆ هەیە لە رەدکردنەوەی تەلاقدان سەرەڕای فەراهەمبوونی رووداوگەلێك بۆ پێکهێنانی هۆی بانگەشەپێکراو.

---

[١] يراجع نمر والفي المرجع السابق ص٣٦١.

[٢] الدكتور جميل الشرقاوي المرجع السابق راجع اهاب اسماعيل المرجع السابق ص٢٠٢.

### هەشتەم -دەرچوون لە ئایینی مەسیحی:

مادەی(٥١) لە کۆمەڵەی ڕێساکانی ١٩٣٨ بە دەق ئاماژە دەکات بەوەی گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە لە ئایینی مەسحی دەربچێت[1]، لەمەوە دەردەکەوێت دەرچوون لە ئایین هۆیەکە بۆ هەڵوەشانەوەی هاوسەداری بە حوکمی یاسا، واتە راستەوخۆ هاوسەرداریەکە هەڵدەوەشێتەوە.

### ئاسارەکانی تەڵاق لای قبتییەکانی ئەرسۆزکس:

أ.تیاچوونی پەیوەندی ژن و مێردی.

ب–عیدە: ئەوەش بریتییە لەو ماوەیەی ژنەکە تیایدا چاوەڕوان دەبێت دوای هەڵوەشانەوەی هاوسەرداری، ئەو ناتوانێت هاوسەرگیری بکات تا دڵنیا دەبێتەوە لە خاڵیبوونەوەی رەحمی لە منداڵی مێردە پێشووەکەی، مادەی(٢٦) لە کۆمەڵەی ١٩٣٨ بە دەق هێناویەتی ماوەی عیدە بریتییە لە دە مانگی زایینی تەواو لە بەرواری مردنەوە یان بەرواری تەلاق، دواجار ئەم کۆمەڵەیە بڕیاری ئەوەی دا عیدەی ئافرەتی دووگیان تا ئەو کاتەیە سکەکەی دادەنێت، ئەوەش وەك وەرگرتنی ئەوەی لە شەریعەتی ئیسلامدا هاتووە.

ج–بۆ هەبوونی گرێبەستێکی هاوسەرگیری نوێ، بۆ هەریەکێك لەو دوو هاوسەرەکە هەیە ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ هاوسەرێکی تر دەستپێبکاتەوە.

[1] اهاب اسماعيل المرجع السابق ص٢٣٢.
توفيق حسن فرج، لحكام الأحوال الشخصية لغير المسلمين ص٣١٨.

# باسی دووەم:
# هەڵوەشانەوەی هاوسەرداری
# لای ئەرمەنی ئەرسۆزکس

پەیوەندی هاوسەری لەلایان بە دوو رێگە کۆتـایی پـێ دێـت: (پووچەڵکردنەوە و تەڵاق)

أ-پووچەڵکردنەوە:

لە دادگای تایبەتکراو حوکم بـە پووچـەڵکردنەوەی هاوسـەرگیری دەدرێـت گـەر یەکێك لەم هۆیانە لەلای جێگیر بوو:

١-ناسـەلامەتی ڕازیبـوونی یـەکێك لـە دوو هاوسـەرەکە بـە هەڵەیـەك یـان بـە زۆرلێکردن.

٢-تەواونەکردنی تەمەنی یاسایی گەر هاوسەرییەکە لەلایەن دەسەڵاتی کەنیسەوە بەپێی مۆڵەتێکی تایبەت رێگەی پێنەدرابێت.

٣-پەککەوتنی جووتبوون بە هۆیەکی سروشتی یان هۆیەکی لابەلا لە یەکێکیانـدا یان لە هەردووکیاندا.

٤-پەیوەستبوونی یەکێکیان بە هاوسەرگیرییەکی پێشترەوە.

٥-بوونی خزمایەتی رێگر لە هاوسەرگیری.

٦-ناڕازیبوونی سەرپەرشتیار لەسەر هاوسەرگیرییەکە.

٧-گەر پیاوەکە بە مەبەستی هاوسەرگیری فڕاندبێتی.

هەروەها بە کۆمەڵە هۆیەکی تر کـە نـەرێتی دەوروبـەری ئەرمـەنی ئەرسـۆزکس تیایدا دەژین.

ب-تەڵاق:

بۆ هەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە ماف داوای تەڵاقدان لای قازی هەیە، ئەمەش بە یەکێك لەم هۆیانە:

١-یەکێکیان زینای کردبێت[١].

٢-هەوڵی یەکێکیان بۆ کوشتنی ئەویتریان[٢].

٣-حوکمدان بەسەر یەکێکیاندا شەرەف(ناوبانگ) لەکەدار بکات بە ماوەیەك کەمتر نەبێت لە سێ ساڵ[٣]

٤-خراپ مامەڵەکردنی یەکێکیان لەگەڵ ئەویتریان.

٥-هەڵنەهاتنی یەکێکیان لە ژیانی هاوسەری و نیشتەجێبوون لەگەڵ ئەویتریان.

٦-گۆڕینی ئایین[٤].

٧-شێتێتی یەکێکیان گەر پێنج ساڵ بەسەریدا گوزەری کرد، یان لەڕووی پزیشکییەوە چاکنەبوونەوەی سەلمێنرا[٥].

٨-بزربوونی یەکێکیان بۆ ماوەی پێنج ساڵ.

---

[١] يراجع المادة (٣٨) من قواعد الأرمن الارثونكس. اهاب اسماعيل.

[٢] يراجع المادة (٤١) المرجع السابق.

[٣] يراجع المادة (٤٠) المرجع السابق.

[٤] يراجع المادة (٤٢) المرجع السابق.

[٥] يراجع المادة (٣٦) المرجع السابق.

# باسی سێیەم:
# هەڵوەشانەوەی هاوسەرداری
# لە لای سریانی ئەرسۆزکس

پەیوەندی هاوسەرداری لای سریانی ئەرسۆزکس بە دوو ڕێگە کۆتایی پێ دێت: ڕێگەی هەڵوەشانەوە(الفسخ) و ڕێگەی هەڵوەشاندنەوە(الإنفساخ)[1]، دەسەلات بۆ ویستی دوو هاوسەرەکە لە داوای کۆتاهێنانی پەیوەندی هاوسەری بەم دوو ڕێگەیە بوونی نییە مەگەر دوای هاتنەدی هۆیەك لە هۆیە دیاریکراوەکانی ناو ئەو دوو ڕێگەیە.

سەرباری ئەوە شەریعەتی سریانییەکان دانی بە بیرۆکەی جیابوونەوەی جەستەییدا ناوە لە چەند بارێکی تایبەت و بۆ چەند هۆیەکی دیاریکراو، باسی ئەم سێ شێوازە دەکەین لەگەڵ ڕۆشنکردنەوەی کورتەیەك لە هۆیەکانیان:

**أ.هەڵوەشانەوە بە حوکم:**

هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیری بە بڕیاری دادگا و داوای یەکێك لە دوو هاوسەرەکە دروستە، ئەوەش لە یەکێك لەم بارانەدا:

١–گەر ژنەکە دەستێوەردانی بۆ کچێنی خۆی کردبێت و لەڕووی پزیشکییەوە سەلما و لەگەڵ یەکەمین چوونە لا بۆی دەرکەوت.

٢–گەر ژنەکە بە ڕازیبوونی خۆی زینای کرد لە تەمەنێکدا زیاتر بێت لە تەمەنی چواردە ساڵ.

---

[1] هەڵوەشاندنەوە(الانفساخ) جیاوازە لە هەڵوەشانەوە(الفسخ)، لە یەکەمیاندا بە ئەسەرێکی گەڕاوە دەسڕێتەوە، و وەك ئەوە وایە لە بنچینەدا بوونی نەبووبێت، لە کاتێکدا هەڵوەشانەوە وەك تەلاق پەیمانی هاوسەرگیری لە داهاتوودا هەڵدەوەشێنێتەوە و بەزۆری دەست بۆ رابردوو نابات.

٣-گەر یەکێکیان لە ئایین(مەزهەب) پاشگەزبوویەوە و ماوەیەك مۆڵەتی پێدرا بە مەبەستی گەڕانەوە و هیوای گەڕانەوەی نەما.

٤-گەر ئاکاری ژنەکە خراپ بوو وەك ئەوەی بخواتەوە یان رابوێرێت لەگەڵ خەڵکی بێگانەدا بەبێ رازیبوونی مێردەکەی، رێنموونی ئایینی ئاراستەکرابێت و ساڵێك لە یەکتری جیاکرابنەوە، سەرەڕای ئەوەش لە لادان و سەرلێشێوانی خۆی نەگەڕابێتەوە.

٥-دەسەڵاتی خەملاندن بۆ بەتریرِیك هەیە لە خستنەسەری کۆمەڵێك هۆی تر یان سڕینەوەی هەندێ لە هۆیە باسکراوەکان بەپێی سیستمی کەنیسە.

**ب-هەڵوەشاندنەوەی راستەوخۆ:**

هاوسەرداری بەبێ بڕیاری دادگا لەم بارانەدا هەڵدەوەشێتەوە:

١-گەر یەکێکیان پەیوەست بێت بە هاوسەرگیرییەکی پێشترەوە.

٢-گەر یەکێکیان بەر لە گرێبەستی هاوسەرگیری لە رەهبەنەتدا بوو، و مۆڵەتی هاوسەرگیری لە بەتریارکەوە بەدەست نەهێنابێت.

٣-گەر یەکێکیان وا نیشان بدات کەسێکی نەصرانییە و لە راستەقینەدا بەو جۆرە نەبێت، چوونە ناو نەصرانی بۆ خرابێتە روو و ماوەیەکی بۆ دیاریکرابێت و پاشان نەیەوێت، لەو بارەدا هاوسەرگیرییەکەی هەڵدەوەشێتەوە.

٤-گەر لە یەکێکیاندا پەککەوتنی جووتبوون بوونی هەبوو، لەڕووی پزیشکییەوە سەلمێنرا چارەسەری نییە لەدوای ساڵێك لە چاوەڕوانی.

**ج-جیاکردنەوەی جەستەیی:**

لەم بارانەدا بڕیار بە جیاکردنەوەی جەستەیی دەدرێت:

١-گەر لە ماڵی هاوسەریدا مێردەکە زینای کرد، یان دۆستەکەی رووی لە ماڵی هاوسەرەکەی کرد.

٢-گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە لەگەڵ کەسێکی تر رێکەوتن زیان بە ژیانی هاوسەرەکەی تر بگەیەنن، ئەویش بەوەی زانی و بێدەنگ بوو.

٣–گەر ژنەکەی هانبدات بۆ تێکچوون لە نامووس و ئاییندا.
٤–گەر یەکێکیان بۆ ماوەس سێ ساڵ کۆچی لەویتریان کرد بەبێ بوونی پاساوێك و رازی نەبوو لەو کارەی بگەڕێتەوە سەرەڕای چەندبارەبوونەوەی پێدانی ڕێنموونییە ئایینییەکان.
٥–دادگای تایبەتکراو دەسەلاتی بڕیاری جیاکردنەوەی جەستەیی بۆ هەیە بە کۆمەڵە هۆیەکی تری لابەلا بەپێی سیستمی کەنیسە.

## ئاساری هەڵوەشانەوە و هەڵوەشاندنەوە:

١–بۆ هەریەکێ لە دوو هاوسەرەکە هەیە ژیانێکی هاوسەری نوێ لەگەڵ هاوسەرێکی تر تێهەڵبکاتەوە، گەر هۆیەکە بریتی نەبوو لە زینا یان پاشگەزبوونەوە(لە ئایینی نەصرانی).
٢–ژنەکە شایستەیە بە هەموو مافەکانی مەگەر لەم بارانەدا:
أ.گەر بەر لە هاوسەرگیری بە پەککەوتنی جووتبوون مێردەکەی زانی بێت، و ئەو(ژنەکە) داوای هەڵوەشانەوە بکات.
ب–گەر پەککەوتنی جووتبوون لە ژنەکەوە بوو، پیاوەکە بەر لە هاوسەرگیری پێی نەزانی بوو.
ج–گەر هەڵوەشانەوە بە هۆیەکی ترەوە بوو لە ژنەکەوە.
٣–گەر پیاوەکە بە هۆی ژنەکەی زانی بەر لە گرێبەست ئەوا مارەیی و پیتاکی دوو بەرانبەر پێدەدات لە بارێکدا ئەو(پیاوەکە) داوای هەڵەوەشانەوە بکات.
٤–گەر هۆیەکە لە ژنەکەوە بوو شیردان لەسەر دایکە و خەرجی و پەروەردە لەسەر باوك.

## ئاساری جیاکردنەوەی جەستەیی:

١–گەر هۆیەکە لە ژنەکەوە بوو ئەوا خەرجی و مافی هامسەرینی(چوونە لا) بە درێژایی ماوەی دابڕان لەدەست دەدات.

٢–گەر هۆیەکە لە پیاوەکەوە بوو ئەوا خەرجی ژنەکەی لەسەرە و ناتوانێت دلوای هامسەرینی(چوونە لا)ی لێ بکات.

٣–گەر هۆیەکە لە ژنەکەوە بوو ئەوا شیردان لەسەر دایکە و خەرجی و پەروەردە لەسەر باوك.

## باسی چوارەم:
## هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیری
## لەلای رۆمی ئەرسۆزکس[1]

پەیوەندی هاوسەری لەلایان بە یەکێك لەم سێ رێگەیە کۆتایی پێ دێت:(پووچەڵکردنەوە، هەڵوەشانەوە، تەڵاق):

**یەکەم-پووچەڵکردنەوە:**

بڕیار لە پووچەڵکردنەوەی هاوسەرگیری دەدرێت گەر پێچەوانە بە حوکمەکانی کەنیسەی ئەرسۆزکسی گوزەری کرد.

**دووەم-هەڵوەشانەوە:**

هاوسەرگیری بە بڕیاری دادگا و بە دلوای یەکێك لە دوو هاوسەرەکە هەڵدەوەشێتەوە، لە یەکێك لەم بارانەدا:

١–گەر یەکێکیان پاشگەزبوویەوە[2].

٢–گەر یەکێکیان هەوڵیدا ژیانی ئەویتریان کۆتایی پێ بهێنێت.

---

[1] ئەم مەزهەبە ساڵی ١٩٠٥ز سەریهەڵداوە.

[2] یراجع المادة (١٤) من قواعد الروم الارثونکس. راجع اهاب اسماعیل المرجع السابق ص٢٤٣.

٣-گەر یەكێكیان شێت بوو بە شێتبوونێكی بەردەوام و بە بەڵگەنامەی پزیشكی قابیلی چاكبوونەوە نەبوو و سێ ساڵ بەسەریدا گوزەری كردبێت.

٤-گەر یەكێكیان تووشی نەخۆشی گولی بوو.

٥-گەر یەكێكیان بە ماوەیەك كەمتر نەبێت لە سێ ساڵ حوكم درابێت بە هۆی تاوانێكەوە پێشێلی شەرەف(ئابڕوو) و نامووس بكات.

٦-گەر یەكێكیان ئەویتریان بۆ ماوەی سێ ساڵ پشتگوێ بخات لەگەڵ مەرامی خراپدا.

٧-گەر یەكێكیان رێگەی رەهبنەتی گرتەبەر.

٨-گەر پەككەوتنی جووتبوون لەلای یەكێكیان بوونی هەبێت و سێ ساڵی خایاندبێت یان لەڕووی پزیشكییەوە بەردەوامبوونی سەلمابێت.

٩-گەر هاوسەرگیرییەكە بەزۆر ئەنجام درابێت.

سێیەم-تەلاق:

أ- بۆ هەریەكێك لە دوو هاوسەرەكە هەیە داوای تەلاق بكات گەر زیناكردنی ئەویتریان سەلمێنرا، یان دەستدرێژیكردن بۆ سەر ژیانی سەلمێنرا[١].

ب- مێردەكە دەتوانێت داوای تەلاق بكات لەم بارانەدا:

١-گەر بینی ژنەكە كچێنی لەدەستداوە و پێش هاوسەرگیری ئەوەی نەزانیبوو، راستەوخۆ هەواڵەكەی بەرزكردەوە بۆ سەرۆكایەتی رۆحی لۆكاڵی لەدوای زانینی كارەكە.

٢-گەر ژنەكە بە كارێك هەستا جێگەی تۆمەت بوو، بە هۆی چوونی بۆ شوێنی خراپ و شەویردنە سەر لە دەرەوەی ماڵ بەبێ مۆڵەتی مێردەكەی و بوونی مەحرەمێك لەگەڵی.

٣-گەر سكەكەی لە مێردەكەی لەبار ببات.

---

(١) المادة (٨) من قواعد الروم الارثونوكس رلجع اهاب اسماعيل ص١٩١.

٤-گەر سەفەری لەگەڵ مێردەکەی نەکرد بۆ شوێنی نیشتەجێبوونی دوای بڕیاری دادگا بەو کارە.

ج-بۆ ژنەکە هەیە لە دوو باردا داوای تەڵاق بکات:

١-گەر مێردەکەی پاڵی پێوەنا بۆ زیناکردن.

٢-گەر لەبەردەم دەسەڵاتی فەرمیدا بە زینا تۆمەتباری کرد و نەیتوانی بیسەلمێنێت.

## ئاساری پچڕانی هاوسەرداری:

١-شتومەکەکانی بۆ خۆیەتی گەر منداڵی نەبوو، ئەگەر هەیبوو بۆ مێردەکە بەجێی دەهێڵێت لەپێناوی پەروەردەی منداڵەکاندا.

٢-سەبەبکار خەرجی ئەویتری لەسەرە بەپێی توانای خۆی گەر کەسەکە ئاتاج بوو، مەگەر هۆیەکە بریتی بێت لە شێتێتی، لەو بارەدا کەسە ساغەکەیان خەرجی شێتەکەی لەسەرە.

٣-هاوسەرگیری بۆ جاری دووەم دروست نییە تا جیابوونەوەکە نەگاتە پلەی بڕاوە و کۆتایی و تێپەڕینی ساڵێك تایبەت بە هۆی تەڵاق، و بە وەرگرتنی مۆڵەت لە سەرۆکایەتی ڕۆحییەوە.

٤-عیدە چوار مانگ بێت گەر دووگیان نەبوو، ئەگینا عیدەکەی بە دانانی سکەکەی کۆتایی پێ دێت.

٥-بەخێوکردن بۆ ئەو کەسەیە نەبووبێتە هۆی تەڵاقەکە.

٦-خەرجی منداڵەکان لەسەر دایك و باوکە بەپێی توانا[1].

---

[1] يراجع نادر ميخائيل الاحوال الشخصية للمصريين غير المسلمين ص١٢٩ـ ص١٢٨. أنطوان قسيس الأحوال الشخصية لغير المسلمين ص١٠٤ـ١٠٧. يراجع المواد ٦ـ١٢ من قانون الزواج والطلاق للروم الأرثونوكس الصادر سنة ١٩٣٧م والمعول عليه في الوقت الحاضر.

**هەڵسەنگاندنی مەزهەبی ئەرسۆزکسی:**

**أ.ئەم مەزهەبە کۆمەڵێك باشەی تێدایە، لەوانە:**

١–وتنی موباحکردنی تەلاق لە سنوورێکی ماقووڵ و بە کۆمەڵێك هۆی زانراوەوە، ئەوەش کارێکە لەگەڵ ڕۆحی هەموو شەریعەتە ئاسمانییەکان پێکدێتەوە، ئەو شەریعەتانەی بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و ڕاکێشانی سوود و قازانج بۆیان و لادانی زیان لەسەریان و دابین کردنی بەختەوەری دونیا و دوارۆژ هاتوون.

تەلاق لە هەندێ باردا هۆکارێکە بۆ لادانی زیانێکی راوەستاو لە ژیانی هاوسەریدا.

٢–کاریگەربوونی هەندێ لە فەقیهانی مەزهەبی ئەرسۆزکسی بە فیقهی ئیسلامی و ڕێکخستنی حوکمەکانی تەلاق و هاندەرەکانی لەبەر ڕۆشنایی ئەم کاریگەربوونەدا لە خەسڵەتەکانی وازهێنانی ئەو فەقیهانەیە لە خراپەی دەمارگیری، چونکە دەمارگیری سەرچاوەکەی هەرچییەك بێت و ڕەنگەکەی هەرچۆنێك بێت بە سیفەتێکی خراپی مرۆڤ دادەنرێت کە لە دایك و باوکێك دروستکراون، بەتایبەت لە بواری یاسارێژییە ئاسمانییەکاندا کە پاشینەکەیان تەواوکاری پێشینەکەیان بووە، هەموو پەیامە ئاسمانییەکان–بەدەر لەوەی دەستی گۆڕینی پێگەیشتووە– لە یەك دەسەلاتی تەشریعییەوە هەلگوزراون ئەوەش بریتییە لە دەسەلاتی خودایی، وەك چۆن قورئانی پیرۆز ئەو ڕاستییە لەم ئایەتەدا رادەگەیەنێت: ﴿شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَن أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾[1].

---

[1] (شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَن أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَنْ يُنِيبُ)(الشورى:١٣).

**ب–هەروەها دەتوانرێت هەندێ تێبینی ئاراستە بکرێت، لەوانە:**

١–هەمان رەخنە کە ئاراستەی کاسۆلیك و پرۆتستانت کرا ئاراستەی تایەفەی ئەرسۆزکس دەکرێت تایبەت بە جیاکردنەوەی جەستەیی(حاڵەتێکە لە نێوان ناهاوسەرداری و ناتەڵاقدا)، ئەمەش بەهۆی ئەو خراپە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییانەی لەسەر ئەم جیاکردنەوە جەستەییە سەرهەڵدەدەن و راستەوخۆ زیان بە ژیانی هەردوو هاوسەرەکە دەگەیەنن و ناڕاستەوخۆش زیان بە کۆمەڵگە.

٢–هەندێ دەستەی ئەرسۆزکسی لە هۆیەکانی تەڵاقدا زیاد لە پێویست پێیان راکێشاوە و تەنها وەك بەکارهێنانی هۆکاری تەڵاق بۆ چارەسەری گرفتە هاوسەرییەکان بەکاریان نەهێناوە، لە کاتێکدا ئەم بەرینخوازییە لەڕووی بنەماوە بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ بنەڕەتی بیری پیرۆزی هاوسەرگیری و قابیل نەبوونی بە هەڵوەشانەوە مەگەر بۆ پێویستییەکی پێداگر.

٣–گەر شوێنپێی تەڵاق لە مەزهەبی ئەرسۆزکسیدا هەڵبگرین(هەموو تایەفەکانی) دەبینین تەڵاق لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئاقارێکی سزایی وەردەگرێت لە کاتێکدا رێکخستنێکە–وەك دوایین هۆکار– دانراوە بۆ چارەسەری گرفتی هاوسەرداری دژوار.

٤–دەرچوون لە ئایین ببێتە پاساو بۆ تەڵاقدان یان راستەوخۆ تەڵاق پێویست بکات وەك هەندێك دەیڵێن پیادەکردنی حوکمی ئەم رێسایە پەکدەخات، رێساکە:"پاڵپشت لە ناکۆکی نێوان شەریعەتە ناوەکییەکان بۆ باری کەسێتییە".

لە باری موسڵمانبوونی مێردی مەسیحی و دەستگرتنی ژنە مەسیحییەکە بە ئایینی خۆیەوە جیاوازی ئایین لەو بارەدا نابێتە هۆیەك بۆ جیاکردنەوەی قەزاییانە یان راستەوخۆ پێویستکەری تەڵاق لە هەموو یاساکانی باری کەسێتی موسڵماناندا.

# بەشی سێیەم:
# تەڵاق لەلای پرۆتستانتەکان[1]

کەنیسەی مەسیحی لە سەرەتاوە یەك کەنیسە بوو، بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ بەو شێوەیە مایەوە تا کەنیسەی ئەرسۆزکسی لە سەدەی یازدەی زایینی و کەنیسەی پرۆتستانتی لە سەدەی شازدەی زایینی لێ جیابوویەوە، ئەو جیاوازییەی جیابوونەوەی کەنیسەی پرۆتستانتی لە کەنیسەی کاسۆلیك لەسەر وەستابوو رێگری لە رێسا دانراوەکانی مەزهەبە نوێیەکە نەکرد بە شێوەیەکی بەرفراوان کاریگەر بێت بە بنەماکانی یاسای کەنیسەی کاسۆلیکییەوە، لەگەڵ ئەوەش مەزهەبی پرۆتستانتی کۆمەڵێك گۆڕانکاری لە رێکخستنی هەندێ بابەتدا هێنا ئاراوە کە یاسای کەنیسە فەرمانڕەوایی دەکرد، لەوانە وتنی: (هاوسەرگیری سیستمێکی مەدەنییانەیە و هیچ پیرۆزییەکی نییە).

ئەم تێڕوانینە بۆ هاوسەرگیری ئەو بنچینەیە بوو هەندێ لە یاسا کاریگەرەکان بە پەیامی مەسیحییەت لە دانان بە ئاوەڵاکردنی تەڵاقدا شانیان لەسەر دادابوو، وەك

---

[1] کاتێك دەسەڵاتی مەدەنی لە ئەڵمانیا هەوڵیدا بڕیاری بێبەشکردن جێبەجێ بکات کە پاپا دژ بە مارتن لۆسەر دەریکرد بەهۆی جیابوونەوەی لە کەنیسە هەندێ لە سەرخەرانی لە دەوری کۆبوونەوە و ئیدانەی ئەو کارەیان کرد و ناوی ئیدانەکاران(پرۆتستانت)یان لێنرا.

یاسای ئینگلیزی کە بەپێی ئەو یاسایە تەڵاق نەشیاو بوو تا ساڵی ۱۹۳۷ز مەگەر هۆیەکەی زینا بێت، لەو ساڵەدا پەرلەمانی بەریتانی یاساکەی خستەڕوو.

ئەم یاسایە کۆمەڵێك هۆی تری بۆ تەڵاق داهێنا، دەستەی گشتی لەسەری رازیبوون دوای گفتوگۆیەکی توند کە کاتێکی دوورودرێژی خایاند، لەو کاتەدا لە قبووڵ کردنی دەترسان لەلایەن دەستەی لۆردانەوە، بەڵام هەڵوێستی لۆردەکان لە پیاوانی کەنیسەی پرۆتستانتی هۆیەك بوو بۆ رازیبوونی دەستەکە لەسەر یاساکە، ئەسەقەف "کەنتر بری" وەك سەرۆکی کەنیسەی پرۆتستانتی رایگەیاند کارێکی رەوا نییە، بەڵام وەك پیاوی دەوڵەت ناتوانێت بەرهەڵستی یاسایەك بکات بەشێکی گەورە لە رای گشتی بە رۆشنی داوای دەکات، لەمەدا کەسانی تر لە پیاوانی کەنیسە شوێنی کەوتن[1]، هەموو ئەوانە بۆ ئەو بیرۆکەیە دەگەڕایەوە کە هاوسەرگیری سیستەمێکی مەدەنییە و پیرۆزی حەرامکردن بە درێژایی ژیان هەڵناگرێت.

سەرەڕای ئەو گۆڕانەی مەزهەبی پرۆتستانتی هێنایە ئاراوە بابەتی تەڵاق لە بازنەیەکی بەرتەسکدا کورتبوویەوە کە بواری هۆ پاساودەرەکان بۆ تەڵاق بوو، کۆی ئەو هۆیانە لەلای هەموو ئەو تایەفانەی خۆیان دەدەنە پاڵ پرۆتستانت لە سێ هۆ بەدەر نین: (زینا، پاشگەزبوونەوە لە ئایینی مەسیحی، پشتتێکردنی بەئەنقەست)، بەڵکو هەندێکیان لەمەڕ حەرامبوونی تەواوی تەڵاق-هۆیەکەی هەرچییەك بێت- بەردەوام دەستیان بە هەمان هەڵوێستی کاسۆلیکییانەوە گرتووە وەك لەم درێژەپێدانەدا دەردەکەوێت:

أ. دەستەی چاولێکەران دەستیان گرتووە بەوەی کەنیسەی کاسۆلیکی رایگەیاندووە لەمەڕ تەڵاق، بۆیە لەم ئاراستەیە بە قەدەر تاڵە موویەك لایان نەداوە.

ئەوانەش بریتین لە تایەفەی یۆنانی و ئەسقوفی و ئینجلیکانی و یەعقوبی و نستووری و کلدانی[2].

---

(1) أنحلال الزواج المرجع السابق ص١٨.

(2) ينظر فاروق الدملوجي، حياة السيد المسيح ص٢٣٠.

ب.دەستەیەك لە پرۆتستانت تەڵاقیان لە یەك باردا كورت كردۆتەوە ئەوەش بریتییە لە باری ناپاكی هاوسەری(زینا)، گەر یەكێك لە دوو هاوسەرەكە زینای كرد ئەویتریان دروستە داوای تەڵاق بكات.

ج.هەندێكی تریان هۆیەكی تریان خستۆتە پاڵ زینا ئەوەش بریتییە لە پاشگەزبوونەوە لە ئایینی مەسیحی، ئەوانەش بریتین لە ئینجیلییەكانی دەستگرتوو بە تەنها ئینجیلەوە، دان بە هیچ شتێكی تردا نانێن جگە لەوەی تیایدا هاتووە، ئەمەش پێچەوانەی مەزهەبی كاسۆلیكە بە دانانی قسەكانی پاپا وەك یاساڕێژی ئایینی لەدوای دەقەكانی كتێبی پیرۆز لە پلە و پایەدا، ئەوەی زانراوە ئەوەیە ئینجیلییەكان بریتین لە لۆسەرییەكان و گەردوونییەكان و كلیتانییەكان.

مادەكانی(١٧–١٩)ی یاسای باری كەسێتی تایەفەی ئینجیلییەكان لە میسر بە دەق ئاماژە دەكەن بۆ حوكمەكانی تەڵاق، مادەی(١٨) لەو یاسایە بە دەق دەڵێت:(تەڵاق دروست نییە مەگەر بە حوكمێك لە دەستەی گشتییەوە، ئەوەش لەم دوو بارەدا:

**یەكەم**–گەر یەكێك لە دوو هاوسەرەكە زینای كرد و ئەویتریان داوای تەڵاقی كرد.

**دووەم**–گەر یەكێك لە دوو هاوسەرەكە چووە ناو ئایینێكی ترەوە جگە لە ئایینی مەسیحی و ئەویتریان داوای تەڵاقی كرد)

ئەوان بۆ وتنی موباحبوونی تەڵاق بەهۆی زیناوە پشت بەوە دەبەست بە دەق لە ئینجیلی "مەتی"دا هاتووە، پێویست بە رۆشنكردنەوە ناكات زینای راستەقینە(پەیوەندی جووتبوونانەی یەكێك لە دوو هاوسەرەكەیە بە كەسێكی ترەوە لەباری راستبوونەوەی پەیوەندی ژن و مێردیدا) هۆیەكە مافی داوای تەڵاق دەدات بە هاوسەرەكەی تر، هەر بەو جۆرە رۆشنە ئەو پەیوەندییە بە زینا دادەنرێت با

---

الدكتور الشرقاوي، محاضرات في الاحوال الشخصية لغير المسلمين والاجانب ص١٣٠، ١٣١.

گرێبەستی هاوسەرگیری لەگەڵ بێت، چونکە هاوسەرگیری دووەم لە دیدگای شەریعەتی مەسیحییەوە بە پووچ دادەنرێت هەتا هاوسەرگیری یەکەم بەردەوام بێت.

بەلام ئەوەی گومان دروست دەکات ئەوەیە ئایا دەتوانرێت وشەی(زینا) بە مانایەکی بەرینتر لێکبدرێتەوە، بە جۆرێك ئاکاری خراپیش بگرێتەوە با ئەو ئاکارە خراپەش نەگەیشتبێتە ئاستی پەیوەندی جووتبوون؟ دەربارەی پرۆتستانت رێگەم لەمە نەکەوتووە، بەلام لای قیبتییە ئەرسۆزکسییەکان وەلامەکە بەڵێیە، لە بابەتی(٢٥)ی "الخلاصة القانونية للأقباط الأرثونكس"دا هاتووە: (گەر ژنەکە پێی راکێشا لەسەر هەڵسوکەوتێك دەبووە تێکچوونی پاکداوێنی ئەو، وەك ئەوەی سەرخۆش ببێت یان سەردانی شوێنەکانی رابواردنی شەوان بکات بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی و هاوشێوەکانی ئەمانە کە ناموسی لەکەدار دەکەن و رووبەڕووی مەترسی تێکچوونی دەکەنەوە و لەم کارەی نەدەگەڕایەوە و تەوبەی نەدەکرد و دوای ئامۆژگاری و سەرزەنشت و دەکوتکردنی چەندین جارە لەلایەن سەرۆکەوە بەردەوام بوو لە کارە خراپەکانی ئەوە وا دەکات جیابوونەوەی لە پیاوەکە پێویست ببێت و هاوسەرگیرییەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە) ئەمە تایبەت بە ژنەکە.

بەلام تایبەت بە خراپ ئاکاری یەکێك لە دوو هاوسەرەکە مادەی(٥٦) لە کۆمەڵەی ١٩٣٨ی قبتییە ئەسۆزکسییەکان بە دەق هێناویەتی: (گەر ئاکاری یەکێك لە دوو هاوسەرەکە خراپ بوو و ئەخلاقی تێکچوو و لە زەلکاوی خراپەکاریدا نوقم بوو سەرزەنشت و ئامۆژگاری سەرۆکی ئایینی هیچ کاریگەرییەکی نەبوو ئەوا بۆ هاوسەرەکەی تر هەیە داوای تەلاق بکات) لەمەوە دەردەکەوێت کارەکە تەنها لە زینادا بە مانای پێشوو(پەیوەندی جووتبوون) راناوەستێت، بەلکو خراپبوونی ئاکاریش دەگرێتەوە، دەشتوانرێت بوترێت دادگاکان لە ئێستادا لەسەر ئەمە جێگیر بوون[1].

---

[1] ينظر الدكتور توفيق حسن فرج، احكام الاحوال الشخصية لغير المسلمين المرجع السابق ص٣١٦-٣١٧.

لەمەڕ دەرچوون لە ئایینی مەسیحیش ئینجیلییەکان ئەو دەرچوونە بە زینای ڕۆحی یان مردنی حوکمی(کەسەکە لە حوکمی مردوودا بێت) دادەنێن، بەم تەئویلە پێیانوایە لەوە دەرنەچوون لە ئینجیلدا هاتووە، بینا لەسەر ئەوە گەر هاوسەرگیری لە نێوان دوو مەسیحیدا ئەنجام درا پاشان یەکێکیان لە ئایینەکەی دەرچوو ئەوە دەبێتە هۆ بۆ کۆتاهێنان بە پەیوەندی هاوسەری لە ڕێگەی تەڵاقدانەوە، ئەم هۆیە لە نێوان تایەفە مەسیحییەکاندا کە تەڵاقدان ئاوەڵا دەکەن هاوبەشە، پێیانوایە هەرکەس لە ئایینەکەی دەرچوو و ڕووی لە ئایینێکی تر کرد لە ڕیزی باوەڕداران نییە و لە حوکمی مردوودایە[1] تەماشا دەکرێت، لە کۆمەڵە کۆن و نوێکاندا بە دەق ئەم هۆیە باسی لەبارەوە کراوە.

د-هەندێ لە تایەفە پرۆتستانتییەکانی تر هۆیەکی تریان داهێناوە سەرباری زینا، ئەوەش بریتییە لە کۆچلێکردنی بەئەنقەست، بۆیە دەڵێن: تەڵاق تەنها لە دوو باردا دروستە:

١-حاڵەتی زینا پاڵپشت بە ئینجیلی مەتی.

٢-حاڵەتی کۆچلێکردنی بەئەنقەست بەوەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە پشت لە ئەویتریان بکات.

لە سەرچاوە پەیوەندارەکان بە مەزهەبی پرۆتستانتی دیاریکردنی ماوەی ئەو کۆچلێکردنەم نەبینیەوە.

### هەڵسەنگاندنی مەزهەبی پرۆتستانتی لە تەڵاقدا:

### أ.لە باشیەکانی ئەم مەزهەبە ئەم خاڵانەیە:

١-گرتنەبەری هەڵوێستێکی مامناوەندی میانەگیر لە نێوان ڕەدکردنەوەی کاسۆلیك بۆ تەڵاق بە ڕەدکردنەوەیەکی یەکلاکەرەوە لەگەڵ بەرینکردنی ئەرسۆزکس بە بەرینکردنێکی دەرچوو لە سنووری پێویستی.

---

[1] المرجع السابق ص٣١٨.

٢-دانانی هاسەرگیری بە سیستمێکی مەدەنی دوور لە هەر پیرۆزییەك سیفەتی بەردەوامی و هەڵنەوەشانەوەی بە درێژایی ژیان پێ دەبەخشێت.

بەو کارەش دەرگای خستە سەر پشت بۆ هەندێ لە دەوڵەتانی کاریگەر بە پەیامی مەسیحی تاکو بتوانن کۆمەڵێك هۆی تر دابهێنن پاساوی تەڵاق بدەن، وەك لە ئینگلتەرا ئەو کارە ئەنجامدرا.

**ب-هەندێ تێبینیش ئاراستەی ئەم مەزهەبە دەکرێت:**

١-بوونی جۆرێك لە دژیەکی لە نێوان دانانی هاوسەرگیری بە سیستمێکی مەدەنی و بەرتەسککردنەوەی بواری تەڵاق تا رادەیەکی دوور، چونکە کردنی هاوسەرگیری بە سیستمێکی مەدەنی واتە پێدانی مافی جیاکردنەوە بە دەسەڵاتی کاتی لە داوای تەڵاق و حوکمدان پێی هەرکات پێویستی داوای ئەوەی کرد.

٢-داننان بە جیاکردنەوەی جەستەییدا لە لایەن مەزهەبی پرۆتستانتییەوە[1] لە پاڵ بۆچوونی تەڵاقدا گەڕانەوەیە بۆ هەمان قەدەغەکرلو کە لێی دوورکەوتەوە لە ڕێگەی داننان بە تەڵاقدا، ئەمەش لە ڕێگەی خۆیەوە هەندێ جار وەك حاڵەتێکی راستبووەوە لەسەر "ناهاوسەرداری و ناتەڵاق" تێکچوونی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی سەرهەڵدەدەن.

---

[1] وەك لە مادەکانی(١٤-١٦)ی یاسای ئینجیلییە نیشتمانییەکانی میسردا هاتووە.
ينظر الشرقاوي، محاضرات الأحوال الشخصية لغير المسلمين الوطنيين والاجانب ص١٣١.

# دەروازەی چوارەم

# تەڵاق لە ئیسلامدا

ئەم بەشانە لەخۆ دەگرێت:

بەشی یەکەم: تەڵاق

بەشی دووەم: دارشتنی گوزارەی تەڵاق

بەشی سێیەم: تەڵاقدەر

بەشی چوارەم: تەڵاقدراو

بەشی پێنجەم: تەڵاق بە ویستی دوو هاوسەرەکە

بەشی شەشەم: جیاکردنەوەی قەزاییانە.

# بەشی یەکەم:
# تەڵاق

لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە بەسەر چوار باسدا دابەش دەکەین:

باسی یەکەم: پێناسەکەی.

باسی دووەم: حیکمەتی یاسارێژی تەڵاق

باسی سێیەم: کێ مافی تەڵاقی بۆ هەیە

باسی چوارەم: هەنگاوەکانی تەڵاق

# باسی یەکەم:
# پێناسەکەی و ڕەوایەتی و حوکمەکەی

## پێناسەکەی:

لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە هەڵگرتنی(رفع) کۆتوبەندی بەهەست یان مەعنەوی.

لەڕووی شەرعەوە: هەڵگرتنی کۆتوبەندی هاوسەرداری لە ئێستادا یان لە داهاتوودا، بە گوزارەیەکی تایبەتکراو یان گوزارەیەك لە جێگەی ئەو گوزارە راستبێتەوە.

ئەمە پێناسەی ئەوانەیە پێیانوایە تەڵاق گەر "بائین-جیاکەرەوە" بێت هەڵوەشانەوەی گرێی هاوسەری لە ئێستادا لەسەر پەیدا دەبێت، لەدوای ئەوە لەسەر مێردەکە حەرام دەبێت خۆشی لە ژنەکەی وەربگرێت، گەر تەڵاقە "رجعی-گەڕاوە" بوو هەڵوەشانەوەی گرێی هاوسەرگیری لە داهاتوودا لەسەر پەیدا دەبێت، واتە کاتی تەواوبوونی عیدەکەی، ژنەکە لە ماوەی عیدەکەدا هاوسەری پیاوەکەیەتی و لەسەری حەرام نییە خۆشی لێ وەربگرێت، ئەوەش ئەوەیە " حەنەفییەکان [1] و جەعفەرییەکان [2] وجمهووری حەنبەلییەکان [3] و زەیدییەکان [4] و ئیباضییەکان [5]"

---

[1] يراجع شرح فتح القدير لابن الهمام ٢/١٦١.

[2] يراجع الخلاف للطوسي ٢/٩٨.

[3] يراجع المغني والشرح الكبير ٨/٤٧٧.

[4] يراجع التاج المنهب ٢/١٢٩.

[5] يراجع النيل وشفاء العليل ٣/٥٢١ نقلا عن احمد الغندور الطلاق في الشريعة الإسلامية والقانون ص٣٤.

لەسەرینی، ئەوانەش لەسەر حەرامبوونی خۆشی لێوەرگرتنن وەك شافیعییەکان[1] و هەندێك لە حەنبەلییەکان پێیانوایە تەڵاق بریتییە لە هەڵگرتنی کۆتوبەندی هاوسەرگیری لە ئێستادا، ئەمەیان بریتییە لە پارسەنگدراو، پێویست لەسەر ئەم بۆچوونەی دوایی ئافرەتی تەڵاقدراو بە تەڵاقی رجعی تەڵاقی پێناگات، واتە بەر لە گەڕانەوە تەڵاق نادرێت، چونکە هاوسەری پیاوەکە نییە، تەڵاق شوێنکەوتەی هاوسەرداریە، هاوسەرداریەکە بە تەڵاقی رجعی هەڵگیراوە، بۆیە تەڵاقێکی تری پێناگات بەر لە هەوڵی گەڕانەوە، سەرەڕای کۆتاهاتنی عیدەکەی، ئەوەش پڕاوپڕە لەگەڵ ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النبي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[2] پیتی "اللام" لە کەلیمەی "لعدتهن"دا بۆ "توقيت"ە، واتە لەو کاتەوەی راستەوخۆ عیدەکەیان دەست پێدەکات لەدوای تەڵاق، بینا لەسەر ئاشکرای ئەم ئایەتە ئافرەتی تەڵاقدراو بە تەڵاقی رجعی تەڵاقی پێناگات مەگەر لەدوای هەوڵی گێڕانەوەی، چونکە تەڵاقدانی ئافرەتی تەڵاقدراو و دەستپێکردنی ئافرەتی عیدەدار بە عیدەکەی لەدوای تەڵاقە تازەکەی بەدەستهێنانی بەدەستهێنراوە، ئەوەش پووچە بەڵکو ئەستەمە بە کۆدەنگی زێرمەندان.

## تەڵاق دوو جۆرە:

رجعی(گەڕاوە): لەڕووی چییەتی(الماهية)ەوە بریتییە لە هەر تەڵاقێك لەدوای چوونە لا بەبێ بریتییەك بۆ دوو جار(یەکەم و دووەم) بەر لە کۆتاهاتنی عیدەکەی.

لەڕووی حوکمەوە: بریتییە لەو تەڵاقەی تیایدا پیاوەکە مافی گێڕانەوەی ژنەکەی هەیە هەتا لە عیدەدا بێت بەبێ گرێبەستێکی نوێ و مارەیی نوێ و بە ئامادەبوونی دوو شایەت.

---

[1] يراجع المهذب لأبي اسحاق الشيرازي ٢/١٠٢.

[2] سورة الطلاق: ١.

بائین(جیاکەرەوە): لەڕووی چییەتییەوە بریتییە لە هەر تەڵاقێك پـێش چـوونە لا یان بە بریتییەك یان بۆ جاری سێیەم یان دوای کۆتاهێنانی عیدەی تەڵاقدراو.

لەڕووی حوکمەوە ئەوەیە پیاوەکە ناتوانێت ژنەکە بۆ لای خۆی بگێڕێتەوە مەگەر بە گرێبەستێکی نوێ و مارەییەکی نوێیەوە.

تەڵاقی بائین بە تەڵاقخستنی یەکەم و دووەم بریتییە لە "بەینوونەی بچووك"، بۆ پیاوەکە حەڵاڵە ژنەکـەی بگێڕێتـەوە بـە گرێبەسـتێکی نـوێ بـەبێ پێویسـتبوون بـە گرتنەبەری ڕێکاری تر.

تەڵاقی بائین بـە تەڵاقخسـتنی سـێیەم "بەینوونـەی گەورە"یـە، لـە دوای ئـەوە ژنەکەی بۆ حەڵاڵ نییە تا مێردێکی تر-بە پیاوێکی تر- نەکات، پاشان بە هۆیەك لـە هۆیەکانی جیابوونەوە لە یەکتر جیاببنەوە و عیدەکەی کۆتایی پێ بێت، لەدوای ئـەم ڕێکارانە گەر مێردی یەکەم ویسـتی پەیوەنـدی هاوسـەرگیری لەگـەڵی تێهەڵبکاتـەوە ئەوەی بۆ هەیە.

بینا لەسەر ئەوەی باسمان کرد تەڵاق رجعییە جگە لەم بارانەدا:

١-تەڵاق بەر لە چوونە لا بە کۆدەنگی فەقیهانی ئیسلام.

٢-تەڵاقی تەولوکراو بە سێ جار بە کۆدەنگی فەقیهان.

٣-تەڵاق بەرانبەر بریتییەك(خولع) لای جمهووری فەقیهان[1].

٤-تـــەڵاق بـــە هەنـــدێ شـــێوازی داڕشـــتنی نووســـراو لای حەنەفییـــەکان و مالیکەیەکان[2]

٥-جیاکردنەوە بە جیاکردنەوەی قەزاییانە لە هەندێ باردا لای ئەوانەی بە تەڵاقی دادەنێن نەك هەڵوەشانەوە[3].

---

(1) پێچەوانەی هەندێ لە فەقیهانی زەیدی. ینظر الدراري المضیئة للشوکاني ٢/٧٤.

(2) ینظر المبسوط للسرخسي ٦/٧٣.

(3) ینظر فرق الزواج للاستاذ الشیخ علي الخفیف ص١٩٦ وما بعدها.

**ئەو بەرەی کە بە هۆی جیاکاری نێوان تەڵاقی بائین و تەڵاقی رجعییەوە بەرهەم دێت:**

١-لە تەڵاقی رجعیدا گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بەر لە کۆتاهاتنی عیدە مرد ئەویتریان میراتی لێ دەگرێت، بە پێچەوانەی تەڵاقی بائینەوە لە چرکەساتی یەکەمەوە پەیوەندی هاوسەری بە هۆیەوە کۆتایی پێ دێت.

٢-گەر پیاوەکە چووە لای یان ماچی کرد یان یاری لەگەڵ کرد یان خۆشی لێوەرگرت بە هەر رێگەیەکی تر هەموو ئەوانە بە گێڕانەوەی ژنەکە دادەنرێت بۆ ژێر دەسەڵاتی هاوسەرداری خۆی بەرەهایی لای جمهووری فەقیهان و لەگەڵ نیەت لای مالیکییەکان، چونکە تەڵاقی رجعی گرێبەستی هاوسەریی هەڵناگرێت لای جمهووری فەقیهان، بە پێچەوانەی شافیعییەکانەوە لای ئەوان گرێبەستی هاوسەری هەڵدەگرێت و ناتوانێت بچێتە لای مەگەر دوای گێڕانەوەی بە شێوازی رجعی و بە ئامادەبوونی دوو شایەت، بەپێی ئایەتی: ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾[١]، لای ئیمامییەکان شایەتگرتن پایەی تەڵاق و گێڕانەوەیە، هەر ئەمەش دروستەکەیە، لای شافیعییەکان شایەت تەنها بۆ گێڕانەوەیە، ئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو رێسا نەحویەدا کە دەڵێت: گەر کۆتوبەندێك لە نێوان دوور و نزیکدا دەسوڕایەوە ئەوا بۆ نزیکەکە دەگەڕێتەوە گەر بەڵگەیەك پێچەوانەی ئەوە راست نەبێتەوە.

تەڵاقی بائینیش ژنەکەی پێی حەرام دەبێت لە پیاوەکەی بە کۆدەنگی فەقیهان، یەکسەر و لە کاتی تەڵاقدانیدا، و بۆی حەڵاڵ نابێتەوە مەگەر دوای گرێبەستێکی نوێ وەك گرێبەستی یەکەمجاری گەر تەڵاقەکە بائین بوو بە بەینوونەی بچووك، سەرباری ئەو رێکارانەی کەمێك بەر لە ئێستا لە بەینوونەی گەورەدا ئاماژەمان پێدان.

---

[١] (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا) (الطلاق:٢).

٣-لە تەڵاقی رجعیدا ژنەکە لە ماڵی هاوسەریدا دەمێنێتەوە تا عیدەکەی تەواو دەبێت، بە پێچەوانەی تەڵاقی بائینەوە، ئەوەش بەپێی ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلا يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا﴾[1].

٤-تەڵاقێکی تر هەیە دەبێتە پاشکۆ بۆ تەڵاقی رجعی لای ئەوانەی پێیانوانییە هەڵگرتنی گرێبەستی هاوسەرگیری بە تەڵاقی رجعی هەڵدەگیرێت، واتە گەر لە کاتی عیدەکەیدا تەڵاقێکی تری بدات لای جمهوور تەڵاقەکە دەکەوێت بە پێچەوانەی تەڵاقی بائینەوە بەهۆی پچڕانی پەیوەندی هاوسەرییەوە بە تەڵاقی بائین، ئەو بۆچوونە پشتیوانی دەکەین پێیوایە تەڵاقی رجعی هاوسەری هەڵدەگرێت، بۆیە تەڵاقدراو بە تەڵاقی رجعی بەر لە گێڕانەوە تەڵاقی تر نادرێت وەك تەڵاقدراو بە تەڵاقی بائین[2]

**کەی جیابوونەوە دەبێتە تەڵاق و کەی دەبێتە هەڵوەشانەوە؟**

**أ.ئەو جیابوونەوەی بە تەڵاق دادەنرێت:**

١-ئەو تەڵاقەی لە پیاوەکەوە دەردەچێت، یان لەو کەسەوە پیاوەکە تیایدا رادەستی دەکات یان لە کەسێکەوە نوێنەرایەتی ئەو دەکات.

٢-خولع(خۆدارنین) لای جمهووری فەقیهان، ئەوەش ئەو تەڵاقەیە بە رێکەوتنی دوو هاوسەرەکە دێتە ئاراوە بەرانبەر بریتییەك ژنەکە یان ئەو کەسەی

---

[1] سورة الطلاق: ١.

[2] جاء في كتاب القواعد للعلامة الشيخ عبدالله بن سعيد، القاعدة الحادية عشرة، ص٩٤.
ئایا تەڵاقی رجعی هاوسەری دەبڕێت یان نە؟ دوو قسە هەیە: "الرافعي" دەڵێت تەڵاق نادات، پارسەنگانی یەکێك لەو دوانە بەهۆی جیاوازی پارسەنگانەوە لە لقەکانیدا، شرۆڤەکارەکەی دەڵێت: لایەنی پچڕان زاڵە تیایدا، واتە ئەوەی جێی متمانەیە تەڵاقی رجعی هاوسەری دەپچڕێنێت.

نوێنەرایەتی ئەو دەكات پێیەوە پابەند دەبێت.

٣-جیابوونەوە بە لەعنكردن(نەفرەتكردن) یەكسانە راستەوخۆ بەرهەم هاتبێت یان بە حوكمی قەزا، لەسەر جیاوازی تیایدا.

٤-جیابوونەوە بە هۆی سوێندەوە، جا بە شێوەیەكی راستەوخۆ بێت دوای كۆتاهاتنی ماوەی سوێندەكە وەك هەندیك دەیڵێن، یان بە بڕیاری قەزا وەك چۆن ئەوە رای جمهوورە.

٥-جیاكردنەوەی قەزاییانە لە زۆربەی حاڵەتەكاندا دواتر باسی دەكەین.

**ب-ئەو جیابوونەوەی بە هەڵوەشانەوە دادەنرێت:**

١-گەر گرێبەستێكی هاوسەرگیری نادروست سەریهەڵدا بەهۆی دواكەوتنی یەكێك لە مەرجەكانی دروستییەوە.

٢-گەر بۆ یەكێكیان یان بۆ هەردووكیان هەڵبژاردنی هەڵوەشانەوە بە باڵغبوون یان بە هۆشكردنەوە بوونی هەبێت.

٣-خولع لای هەندێ لە فەقیهان[1].

٤-جیابوونەوە بەهۆی بەرهەڵستی سەرپەرشتیارەوە لەبەر كەمی مارەیی لە مارەیی هاوشێوە یان بەهۆی نەبوونی هاوتاییەوە.

٥-جیابوونەوە بەهۆی پاشگەزبوونەوەی یەكێك لە دوو هاوسەرەكە لە ئیسلام، لای هەندێ لە فەقیهان پاشگەزبوونەوەی مێرد بریتییە لە تەلاق.

٦-جیابوونەوە بەهۆی خزمایەتییەكی لەناكاو لەلای ئەوانەی پێیانوایە بە زینا جێگیر دەبێت وەك حەنەفییەكان، گەر چووە لای دایكی ژنەكەی یان كچی ژنەكەی لە مێردێكی تر یان ژنەكە لەگەڵ یەكێك لە ئەسڵەكان یان لقەكانی مێردەكە هاوسەری كرد ئەوا جیابوونەوە بە شێوەیەكی راستەوخۆ جێگیر

---

[1] شەوكانی دەڵێت: خولع هەڵوەشانەوەیە و عیدەكەی حەیزێكە. ینظر الدراري المضیئة شرح الدرر البهیة كلاهما للأمام محمد بن علي الشوكاني ٢/٧٤.

دەبێت.

٧-جیابوونەوە بەهۆی خۆگرتنەوەی ژنە هاوەڵدانەرەکە لە هاتنە ناو ئیسلام یان هەر ئایینێکی ئاسمانی تر دوای موسڵمانبوونی مێردەکەی.

**ئاساری سەرهەڵدراو لەسەر جیابوونەوە لە نێوان تەڵاق و هەڵوەشانەوەدا:**

١-تەڵاق جۆراوجۆرە بۆ بائین و رجعی، هەڵوەشانەوە جیابوونەوەی تەڵاقی بائینە و گێرانەوەی تێدا نییە، چونکە لەو کاتەدا پەیوەندی هاوسەری دەپسێ و کۆتایی پێ دێت.

٢-جیابوونەوە کە بە تەڵاق دادەنرێت تەنها لە هاوسەرگیری دروستدایە، هەڵوەشانەوە لە هاوسەرگیری دروست و نادروستدایە لای جمهووری فەقیهان.

٣-تەڵاق لە ژمارەی ئەو سێ تەڵاقەی پیاوەکە هەیەتی کەم دەکاتەوە بە پێچەوانەی هەڵوەشانەوەوە.

٤-تەڵاق بریتییە لە کۆتاپێهێنانی گرێبەستێك نەك بە ئەسەری گەڕاوە، هەڵوەشانەوە شکاندنی گرێبەستەکەیە و بۆی هەیە ئەسەری گەڕاوەی هەبێت، گەر بەهۆیەکەوە بوو پەیوەست بە سەرهەڵدانی گرێبەستەکە وەك هەڵبژاردەی هەڵوەشانەوەی گرێبەستەکە لە بنەڕەتیدا، مارەییش لە حوکمەکانی گرێبەستەکەیە.

٥-کۆتاهاتنی هاوسەریی بە تەڵاق بۆ بوونی شتێك ناگەڕێتەوە لەگەڵ گرێبەستی هاوسەریدا-لەرووی دروستی یان پێویستییەوە- نەرێکار بێت، بەڵکو مافێکی جێگیرە بۆ پیاوەکە لەسەر خودی گرێبەستەکە سەرهەڵدەدات، بەڵام هەڵوەشانەوە بەهۆیەکەوەیە هاوەڵ لەگەڵ گرێبەستەکە یان هاتوو لەدوای گرێبەستەکە[1].

---

[1] الاستاذ محمد سلام مدكور المرجع السابق ٢/١٧.

## بەڵگەکانی ڕەوایەتی تەڵاق:

ڕەوایەتی تەڵاق بە قورئان و سوننەت و ئیجماع جێگیر بووە:

أ.قورئان: زۆرێك لە ئایەتی ڕۆشن بوونیان هەیە بە دەق ئاماژە بە پەنابردن بۆ تەڵاق دەکەن، کاتێك پێویستییەکی پێداگر دلوای بکات، لەوانە ئایەتی: ﴿لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أو تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾[1] ، هەروەها ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النبي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[2]. ، هەروەها: ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾[3].

ب—سوننەت: ڕەوایەتی تەڵاق بە کردار و گوفتاری پێغەمبەر(ﷺ) جێگیر بووە، ئەوەش دووپاتی ئەوە دەکاتەوە لە قورئاندا هاتووە، کرداری پێغەمبەر(ﷺ): حەفصەی تەڵاقدا و پاشان گێڕایەوە، لە فەرموودەکانیشی: ((خراپترین حەڵاڵ بۆ لای خودا تەڵاقە))[4].

دانپیادا نانی پێغەمبەر(ﷺ) بە تەڵاقدا: لە سەردەمی خۆیدا دانی ناوە بە تەڵاقی هاوەڵەکانیدا.

ج—ئیجماع: فەقیهانی موسڵمان لە هەر چاخێکدا کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی پیاو مافی ئەوەی هەیە ژنەکەی تەڵاق بدات گەر پاساوێك ڕاستبوویەوە بانگی بۆ

---

(1) ﴿لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أو تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ مَتَاعاً بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾(البقرة:٢٣٦).

(2) ﴿يَا أَيُّهَا النبي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلا يَخْرُجْنَ إِلَّا أن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً﴾(الطلاق:١).

(3) ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلا يَحِلُّ لَكُمْ أن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلَّا أن يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾(البقرة:٢٢٩).

(4) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (خراپترین حەڵاڵ بۆ لای خودا تەڵاقە—أَبْغَضُ الْحَلَالِ إِلَى اللَّهِ الطَّلَاقُ) {رواه أبو داود وابن ماجة. نيل الأوطار للشوكاني ٦/٢٤٩}.

بکات.

**بەری ناکۆکی:**

لەسەر وتنی "موباحکردنی تەڵاق" پیاوەکە دەبێتە خاوەنی ویستێکی ئازاد لە تەڵاقداندا، بۆی هەیە تەڵاق بدات کەی بیەوێت و بە بێبایەخترین هۆ، ژنەکە لەژێر بەزەیی ویستی ئەودایە و گەر بیەوێت رایدەگرێت و گەر بیەوێت تەڵاقی دەدات.

لەسەر وتنی "قەدەغەبوونی تەڵاق"-کە ئەمەیان رێگە دروستەکەیە- ویستی مێردەکە بە چەندین کۆتوبەند پێوەندکراوە، ناتوانێت تەڵاق بدات مەگەر بۆ پێویستییەکی زۆر پێویست پێی و لە هەندێ کاتی تایبەتدا.

گەر سەرپێچی کرد کارەکەی حەرامە یان مەکروهە بە کەراهەتی حەرامکردن، بۆیە بەو کارەی لەبەردەم خودادا گوناهبارە و لەبەردەم رای گشتیدا لۆمەکراوە با بیشڵێین تەڵاقەکەی دروستە.

**حوکمی تەڵاق:**

بۆ کاری کەسی داوالێکراو(مکلف) دوو حوکم هەیە[1]: بەرایی(سەرەتایی) و ناوەندی:

**حوکمی بەرایی(سەرەتایی):** ئەو حوکمەیە لە سەرەتاوە بۆ شتێك دانراوە بە دیاریکراوی بێ تێبینی کردنی ئەوەی بەسەریدا دێت لە بەرهەڵستکارییەکان.

**حوکمی ناوەندی:** ئەو حوکمانەی بۆ شتێك دادەنرێن بە تێبینی کردنی ئەوەی بەسەریدا دێت، بۆ نموونە خواردنەوەی ئاو حەڵاڵە بە ناونیشانی بەرایی خۆی، بە ناونیشانی قوتارکردنی ژیان دەبێتە واجب[2].

---

[1] واتە جگە لە حوکمی دانراو.

[2] یرلجع الاصول العامة للفقه المقارن للاستاذ محمد تقي الحكيم ص٧٣.

**حوکمــە بەرایییەکەی(ســەرەتاییەکەی): فــەقیهان جیاوازیــان تیایــدا هەیــە،** دەستەیەکیان دەڵێن: تەڵاق بە چاوداخستن لەو رەوشانەی ئابلۆقەی دەدەن موباحە، و زۆرینەشیان پێیان وایە قەدەغەکراوە.

**بەڵگەی ئەوانەی لەسەر موباحبوونی تەڵاقن:**

١-قورئان: خودا-ﷻ- دەفـەرموێت: ﴿لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أو تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾، بۆیە دەڵێن: نەرێکردنی گوناه و هـەلگرتنی حەرەج لە خاوەن شەرعەوە بەڵگەی موباحکردنییەتی.

٢-ســوننەتی پێغەمبــەر(ﷺ): پێغەمبــەر(ﷺ) حەفصــەی تەڵاقــدا و پاشــان گێڕایەوە[1]، ئەو(ﷺ) لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی مەعسوومە لە کارێك ناچێتە پێشەوە قەدەغـەکراوبێت، بۆیـە چـوونەبەرەوەی لـە تـەڵاقی حەفصـە بەڵگەی موباحکردنییەتی.

٣-کاری هاوەڵان: هەندێ لە هاوەڵان ژنەکانیان تەڵاقداوە، عمر-خوا لێی رازی بێت- "أم عاصـم"ی تەڵاقــدا، هــەروەها عبــدالرحمن بــن عــوف-خوا لێی رازی بێت- "تماضر"ی تەڵاقدا[2]... ئەو کارەی لە چاخی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەنجام درابێـت بـە دانپیادانــانی پێغەمبــەر دەژمێررێــت، ئــەوەش لــە دوای پێغەمبــەر(ﷺ) ئەنجامدرابێت بە کاری هاوەڵان دادەنرێت و کارەکـەیان بەڵگەیـە لـەو شـوێنەدا رێگەی بۆچوونی تێدا نییە، چونکە هەر دەبێت هەڵوێسـتێکیان بـۆ هـەبووبێت، هەڵوێستیش بۆ ئەوان تەنها پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووە.

٤-ئیجماع: فەقیهانی موسڵمان لە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ کۆدەنگییان هەیە لەسەر رەوایەتی تەڵاق لە کاتی پێویستدا.

---

[1] سنن ابن ماجة ٣١٨/١. رواه ابـو داود (رقـم ٢٢٧٣)، وابـن ماجـة (رقـم ٢٠١٦)، والـدارمي (٢١٣/٢)، والبيهقي (٣٢١/٧-٣٢٢) كلهم من طريق يحيى بن زكريا بن أبي زائدة عن صالح بن صالح بن يحيـى عن سلمة بن كهيل عن سعيد بن جبير عن ابن عباس عن عمر بن الخطابﷺ.

[2] يراجع الصابوني مدى حرية الزوجين في الطلاق ٨٠/١.

٥-پێوانە(قیاس): تەڵاق سڕینەوەی موڵکە بە ڕێگەی بەردانەوە، بۆیە لە بنەڕەتدا موباحە، وەك ئازادكردنی بەندە.

**بەڵگەكانی ئەوانەی لەسەر قەدەغەكردنن:**

١-**قورئان:** لە قورئاندا چەندین ئایەت هاتوون بەڵگەن لەسەر كەراهەت(ناپەسەند)ی تەڵاق، لەوانە: ﴿فان أطَعْنَكُمْ فَلا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً﴾[1]، بۆیە تەڵاق بەبێ پێویستی و زەروورەت ناحەزی و دەستدرێژكارییە.

هەروەها ئایەتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِه أن خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أنفُسِكُمْ أزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾[2]، تەڵاق بەبێ هۆ كوفركردنە بەو نیعمەتە و گوێنەدانە بەو پەیوەندییە پیرۆزە، هەموو كوفركردنێكیش بە نیعمەت قەدەغەكراوە، بۆیە تەڵاق قەدەغەكراوە.

٢-**سوننەت:** فەرموودەگەلێكی زۆر هەن بەڵگەن لەسەر ئەوەی تەڵاق بەبێ پاساو كاری خەشملێگیراوانە، لەوانە: ((خراپترین حەڵاڵ بۆ لای خودا تەڵاقە))[3]

هەروەها: ((هەر ئافرەتێك داوای تەڵاقی لە مێردەكەی كرد بەبێ خراپەیەك بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرامە))[4].

٣-**بەڵگەی ماقوول(ئەقڵی):** سیستمی هاوسەرگیری بۆ بەرژەوەندی تاك و خێزان و كۆمەڵگە و مانەوەی ڕەگەزی مرۆڤ دارێژراوە، تەڵاق پووچەڵكردنەوەی ئەو

---

(١) (الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَان أَطَعْنَكُمْ فَلا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً أن اللّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً) (النساء:٣٤).

(٢) (وَمِنْ آيَاتِه أن خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أنفُسِكُمْ أزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً أن فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) (الروم:٢١).

(٣) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ : (أبْغَضُ الْحَلَالِ إلَى اللهِ الطَّلَاقُ) {ابن ماجه: ٢٠٠٨}.

(٤) عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ : (أيُّمَا إمرأة سَأَلَتْ زَوْجَهَا الطَّلَاقَ فِي غَيْرِ مَا بَأْسٍ فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ) {ابن ماجه: ٢٠٤٥}.

بەرژەوەندییەیە و لە پووچەڵکردنەوەیدا خراپە(مەفسەدە) سەرهەڵدەدات و خراپەش بنچینەی هەموو قەدەغەکراوێکە.

لە " بدائع الصنائع[1]"دا هاتووە: (ماقوولێش: لە چەند روویەکەوە:

یەکەمیان: هاوسەرگیری گرێبەستی بەرژەوەندییەکە لەبەرئەوەی هۆکارێکە بۆ بەرژەوەندییە ئایینی و دونیاییەکان، تەڵاق پووچەڵکردنەوەی ئەو بەرژەوەندییانەیە، پووچەڵکردنەوەی بەرژەوەندیش بریتییە لە مەفسەدە، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ لا يُحِبُّ الْفَسَادَ﴾[2].

دووەمیان: هاوسەرگیری گرێبەستێکی سوننەتییە، بەڵکو پێویستە، تەڵاق پچڕانی سوننەت و تیاچوونی واجبە، بۆیە لە بنەڕەتدا قەدەغە و ناپەسەندە، بەڵام بۆ ئەدەبدادان و رزگاربوون لە تەنگەژە رێگەی پێدراوە.

**پارسەنگدان:**

رای پارسەنگدراو ئەو قسەیە کە تەڵاق لە خودی خۆیدا قەدەغەکراوە:

**یەکەم:** بەهۆی دروستی بەڵگەکانییەوە.

**دووەم:** بەهۆی ئەو بەڵگانەی رووبەرووی ئەوانە دەبنەوە لەسەر موباحکردنی تەڵاقن، لەم خاڵانەدا درێژەی پێ دەدەین:

أ.ئایەتی " لَـا جُنَـاحَ عَلَـيْكُمْ" ئاماژە دەکات بۆ نەرێکردنی "جناح" لە باری تەڵاقدانی ئافرەتدا بەر لە چوونە لا(دەستبۆبردن) یان فەرزنەکردن بۆی، بەڵگەکە تایبەتە و حوکمێکی گشتی پێ جێگیر نابێت، سەرباری ئەوە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بە حاڵەتی بوونی پێویستییەکی بانگکەر بۆ تەڵاق دەیبەستێتەوە، پاشان نەرێکردن روو لە پابەندبوونەکان دەکات-کە لەسەر تەڵاق سەرهەڵدەدەن- نەك روو بکاتە حوکمی تەڵاق.

---

[1] بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع لأبي بكر بن مسعود الكاساني (ت ـ٥٨٧هـ).

[2] (وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللَّهُ لا يُحِبُّ الْفَسَادَ) (البقرة:٢٠٥).

ب–نە سەلماوە تەڵاقی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی بەبێ هۆ بووبێت، نەبوونی ئاگاهی بە هۆیەکە نەبوونی لە واقیعدا پێویست ناکات.

ج–پێوانەی تەڵاق بۆ سەر ئازادکردنی بەندە دروست نییە، چونکە لە ئازادکردنی بەندەدا بەرژەوەندی و سوودی گشتی و تایبەت بوونیان هەیە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) خەڵکی هانداوە و رێگەکەی بۆ تەخت و ئاسان کردوون، بە پێچەوانەی تەڵاقەوە کە لە زیان خاڵی نییە گەر بۆ پێویستییەك نەبێت، پاشان هاوسەرگیری مانای موڵك ناگەیەنێت، ئەگینا هەڵسوکەوتی مێرد بە ژنەکەی و بەکارهێنانی و پێشێلکاری بۆی دروست دەبوو، هەروەك هەڵسوکەوتی خاوەن موڵك لە موڵکەکەیدا، کەس ئەمەی نەوتووە، بەکارهێنانی موڵکداری بۆ ئەم شوێنە گونجاو نییە لەگەڵ ئەو پلە و پایەی ئیسلام بە ئافرەتی بەخشیوە.

د–هەرکەس شوێنی ئایەتەکانی حوکمی تەڵاق بکەوێت بۆی رۆشن دەبێتەوە ئایەتەکان بانگ بۆ ئەوە دەکەن تەڵاقی ناپێویست یان مەکروهە(ناپەسەند) یان حەرام(قەدەغەکراو)، لە نموونەی ئەو ئایەتانە: ﴿وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً﴾[1]. ﴿وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنْكُمْ مِيثَاقاً غَلِيظاً﴾[2]. ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً﴾[3]. ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ

---

(1) (الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنْفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً) (النساء:٣٤).

(2) (وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنْكُمْ مِيثَاقاً غَلِيظاً) (النساء:٢١).

(3) (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهاً وَلا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً) (النساء:١٩).

وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا أن يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا أن اللَّهَ كَان عَلِيماً خَبِيراً﴾ (1).
﴿وَان إمرأة خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزاً أو إِعْرَاضاً فَلا جُنَاحَ عَلَيهِمَا أن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحاً وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾(2). ئەم ئایەتانە و زۆرێك لە ئایەتی تر هەرهەموو بە شێوازێکی رۆشن بانگ دەکەن بۆ ئاگاهیبوون و خۆپارێزی و لەسەرخۆیی و پەلەنەکردن، بۆیە بەکارهێنانی تەلاق وەك دوایین دەرمان بۆ چارەسەری نەخۆشییەك کە هەموو رێگەکانی چارەسەری لێ داخراوە بەکاردەهێنرێت، دوایین دەرمانیش بریتییە لە داخکردن.

هـ-سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) وەسێت دەکات بەوەی قورئان وەسێتی پێکردووە و پێداگری لەوە دەکات تەلاق کارێکە لەلای خودا خۆشەویست نییە گەر بۆ زەرورەت نەبێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((تەلاق مەدەن، چونکە خودا پیاوانی چێژوەرگر و ژنانی چێژوەرگری خۆشناوێت))(3)، هەروەها-لەمەڕ قەدەغەکراوی تەلاق- دەفەرموێت: ((تەلاق مەدەن، چونکە تەلاق عەرشی پێ دێتە لەرزە))(4)، هەروەها دەفەرموێت: ((أبغض الحلال الى الله الطلاق- خراپترین(بوغزاوترین) حەلاڵ بۆ لای خودا تەلاقە))، مەبەست بە "حەلاڵ" ئەوەیە بەرانبەر حەرام دەوەستێ لە موباح و مەندوب و واجب و مەکروە، دژیەکی نییە لە نێوان "البغض" و "الحل"دا.

و-بەڵگەی ماقووڵ(ئەقڵی): بەرژەوەندی بنچینەی یاسارێژی ئیسلامییە بە بەڵگەی رێسا هەمووەکییەکانی، لەوانە ئایەتی: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾. ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ)

---

(1) سورة النساء: ٣٥.

(2) (وَان إمرأة خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزاً أو إِعْرَاضاً فَلا جُنَاحَ عَلَيهِمَا أن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحاً وَالصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتِ الأنفُسُ الشُّحَّ وَان تُحْسِنُوا وَتَتَّقُوا فَان اللَّهَ كَان بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيراً) (النساء:١٢٨).

(3) كشف الخفاء ٢/٣٠٢.

(4) المرجع السابق.

دەفەرموێت: ((نە زیان و نە زیانگەیاندن))، فەقیهان لەم فەرموودەیەوە چەندین لقیان لێداوە و رێسا فیقهییە هەمووەکییەکانیان دارشتووە، لەوانە: (بارگرانی ئاسانکاری رادەکێشێت)، (زیان لادەدرێت)، (زیان بە هاوشێوەی خۆی لانادرێت)، (شان دەدرێتە ژێر زیانی تایبەت بۆ لادانی زیانی گشتی)، (زیانی گەورەتر بە زیانی سووکتر لا دەدرێت)، (زەروورەتەکان بە ئەندازەی خۆیان ئەندازەگیرییان بۆ دەکرێت)، (زیان بەپێی توانا لادەدرێت)، دروست نییە هیچ کەس بڵێت بەرژەوەندییەك لە تەڵاقدا بوونی هەیە گەر بۆ پێویستییەکی پێداگر نەبێت بانگی بۆ بکات.

ز–زۆرینەی فەقیهان لە مەزهەبە جیاجیاکان ئەم رایەیان هەڵبژاردووە.

"ابن الهمام"[1] دەڵێت: هۆیەکە بریتییە لە پێویستی بۆ رزگاربوون دوای جیاوازی ئەخلاق و هاتنە ئارای رق و کینە بە جۆرێك سەریکێشێت بۆ پارێزگاری نەکردنی سنوورەکانی خودا.

لە "الجوهرە[2]"دا هاتووە: بنەڕەت لە تەڵاقدا قەدەغەکردنە لەبەر ئەوەی پەتی هاوسەرگیری دەپچڕێنێت کە بەرژەوەندییە ئاینی و دونیاییەکانی پێوە بەستراوەتەوە.

"ابن تیمیة" لە "الفتاوی"دا دەڵێت: (گەر پێویستی بانگی بۆ تەڵاق نەکردبایە بەڵگە داوای حەرامبوونی دەکرد وەك چۆن ئاسار و ئوسوڵ(بنەڕەت) بەڵگەن لەسەری)

لە " الروضة الندیة[3]"دا هاتووە: بە دەقی قورئان و سوننەتی متەواتیر و ئیجماعی موسڵمانان رێگە پێدراوە، بەڵام بە نەبوونی پێویستی بۆ ئەو کارە کەراهەتی هەیە(ناپەسەندە).

---

[1] یراجع شرح فتح القدیر ٣/٢١.

[2] الجوهرة النیرة علی مختصر القدوري ٢/١٠٠.

[3] الروضة الندیة شرح الدرر البهیة للبخاري ٢/٤٥٠.

غەزالی دەڵێت: تەڵاق کاتێك ئاوەڵایە گەر ئازارگەیاندنی بە ناحەق بۆ کەسی تر لێوە پەیدا نەبێت، هەر تەڵاقی بدات ئازاری ژنەکەی داوە و ئازاردانی خەڵکی موباح نییە مەگەر تاوان و خراپەیەك لەلای ئەو کەسەوە ئەنجام درابێت یان پێویستییەك لەلای پیاوەکەوە، خودا دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً﴾.

## حوکمی ناوەندیی تەڵاق:

تەڵاق لەو رووەوە کە هۆیەکە بۆ کۆتاهێنان بە پەیوەندی ژن و مێردی حوکمێکی دانراوە، لەو رووەوەش کە هەڵسوکەوتێکی ئاکالایەنەیە یان رێکەوتنێکی نێوان دوو هاوسەرەکەیە لەسەر کۆتاهێنان بە پەیوەندییەکە حوکمی داواکراوی پێوە پەیوەست دەبێت لە واجبوون یان حەرامبوون یان حوکمەکانی تر، بۆیە تەڵاق بەم جۆرە و تایبەت بە هۆیەکانی و رەوشەکانی پێنج حوکمەکە رووی لێ دەکات:

١-پێویست(واجب) وەك تەڵاقی پشتتێکەر گەر مەرجەکانی فەراهەم بوون.

٢-پەسەند(مەندوب) وەك تەڵاقی ئەو ژنەی ئاکار و رەفتاری خراپ دەبێت.

٣-حەرام وەك تەڵاقی حەیزدار و سکپڕ و زەیسان بەبێ پاساوێك.

٤-ناپەسەند(مەکروە) وەك تەڵاقێك هیچ داواکارییەکی بۆ نەبێت.

٥-موباح وەك تەڵاق لە باری پێویستدا.

ئەمە ئەوەیە هەندێ لە فەقیهان بۆی دەچن وەك: " شافیعیەکان[١]و حەنبەلیەکان[٢]"

کەسانی تر وەك " مالیکیەکان[٣]و جەعفەریەکان[٤] والنووی لە شافیعییەکان[٥]" دەڵێن: تەڵاق موباح نابێت هۆیەکەی هەرچییەك بێت، چونکە ناکرێت هەردوو

---

[١] يراجع مغني المحتاج ٣٠٧/٣.

[٢] يراجع المغني والشرح الكبير ٢٣٤/٨. الاقناع ١٢/٣.

[٣] يراجع الدردير علي خليل ٤٢٣/٢.

[٤] يراجع الروضة البهية ١٥١/٢.

[٥] يراجع شرح النووي على مسلم ٦١/١١.

لایەکە(پیاوەکە و ژنەکە) یەکسان بن، بەڵکو یان پارسەنگرلوە(پێویست و پەسەند) یان پارسەنگنەدراوە(حەرام و ناپەسەند).

وایدەبینین ئەم بۆچوونەی دووەم لەوەی یەکەم پارسەنگدارترە، چونکە تەڵاق لە ئیسلامدا قەدەغەیە مەگەر بۆ پێویست، لەو بارەدا یان پێویستە یان پەسەند، بۆیە بوار بۆ حوکمی موباحکردن نامێنێتەوە.

# باسی دووەم:
# حیکمەتی پاسارێزی تەڵاق

هاوسەرگیری گرێبەستێکە لە هیچ گرێبەستێکی تر ناچێت لەڕووی سروشتی جێگەکەوە، و مافەکان و ئەرکەکان کە لەسەری پەیدا دەبن، هەروەها لەڕووی ئامانجی لەبەرچاوگیراو لە پێکهێنانی.

جێگەی گرێبەستی هاوسەرگیری مافێکی دارایی مادی نییە، بەڵکو جێگەیەکە وا دەکات هەریەکێك لە دوو هاوسەرەکە خۆشی لەویتریان وەربگرێت، ئاساری سەرهەڵدراو لەسەر هاوسەرگیری مافە مادییەکان نین، بەڵکو بریتییە لە بەزەیی و خۆشەویستی، و تەبایی و گونجان و هەماهەنگ بوون و خۆشەویستی ئاڵوگۆڕکراو، و هاوبەشی لە خۆشی و ناخۆشی یەکتردا، ئامانجی بە مەرامگیراو لە دروستکردنی هاوسەرگیری بریتی نییە لە بەدەستهێنانی قازانجی داراییانە یان لادانی زیانێکی مادیانە، بەڵکو بریتییە لە نەوە خستنەوە و منداڵبوون و بەشداری لە بەردەوامی ژیانی رەگەزی مرۆڤدا بە جۆرێك تەبابێت لەگەڵ رێز و پلە و پایە و سەروەری مرۆڤ لەم گەردوونە بێسنوورەدا، بەڵام سەرەڕای ئەم گرنگیانە و ترسناکی هاوسەرگیری هەندێ جار سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت.

لیس کل ما يتمنى المرء يدركه تجري الرياح بما لا تشتهي السفن

(هەموو ئەوەی مرۆڤ ئاواتی بۆ دەخوازێت پێی ناگات، بە پێچەوانەی ئارەزووی کەشتییەکانەوە با هەڵدەکات)

هەندێ جار چاوەکان ناپاکی دەکەن و هەستەکەن فریو دەخۆن لە هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیاندا، هاوملبوونەکە هەندێ جار لەسەر هەڵبژاردەیەکی هەڵە یان خەملاندنێکی ناتەندروست بینا دەکرێت، لە میانەی ژیانی هاوسەریدا رۆژگار بۆ هەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە شتێك دەردەخات ئەویتریان پێی رازی نییە، لە سروشت و ئاکار و ئەخلاق لەدوای ئەوەی هەلیان پێدرا هەریەکەیان راستەقینەی ئەویتریان ببینێت بەبێ فریوخواردن و رووالەتکاری.

یان لەدوای هاوسەرگیری شتێك دێتە ئاراوە لە دەرەوەی دەسەلاتی ژن و مێردەکەوە، بۆیە پاکێتی ژیانی هاوسەرییان لێ لێل دەکات یان دژواری و پشتتێکردن سەرهەڵدەدات بە دەستتێوەردانی خانەوادە و کەسوکار و دۆست و برادەر بەناوی بەرژەوەندییەوە یان بە ناوی ئامۆژگارییەوە، لەوێوە بناغەی قەوارەی ئەو ژن و مێردە دەبێتە قوڵنگێکی روخێنەر و دلآنیان لەیەکتر وەردەگەرێن و خۆشەویستی دەبێت بە رق و تەبایی و گونجان دەبێت بە هەلوەشان و خۆشەویستی و ئارامی دەگۆڕێت بۆ پشێونکە.. یان هەندێ جار شك و گومان گوزەر دەکات بۆ بەلگەنەویستە جۆراوجۆرەکان و متمانە لە نێوانیاندا دەسڕێتەوە، وەهەم و ئەندێشە بەرجەستە دەبێت و درۆ و بوختان و ناڕاستی لێ دەگۆڕێت بە حەقیقەت، هەموو شتێك لەبیری ئەم دوو هاوسەرەدا بۆ پێچەوانەکەی پێچەوانە دەبێتەوە، بۆیە راستی و دروستی لە هەموو گەورە و بچووکێکدا لەدەست دەدەن.

دوای هەموو ئەمانە حیکمەت نییە لایەنێك ناچار بکەیت لەسەر قبوولّ کردنی بەردەوامی ئەم قەوارەی هاوسەرگیرییە لەرزۆکە بێ بناغەیە، کە رۆژ لە دوای رۆژ شەڕ لە نێوانیاندا زیاد دەکات و کارەکەیان دژوارتر دەبێت، و لەوانەیە یەکێکیان یان هەردووکیان بەرەو ئاکارێکی تاوانکارانە هەڵبنێت، یان بەرەو لادانێکی ئەخلاقی هانی

بدات، یان هەر دیاردەیەکی تری تەندروستی و کۆمەڵایەتی کە ژیانیان رووبەرووی مەترسی دەکاتەوە.

بۆ ئەم مەبەستە بەڵکو بۆ زۆرتر لەم مەبەستە تەڵاق بووەتە کارێکی پێویست و زۆربەی گەلانی کۆن و نوێ پەنایان بۆ بردووە و شەریعەتە ئاسمانییەکان دانیان پیادا ناوە و یاسای دانراویش کاری پێکردووە مەگەر کەمێکی زۆر کەم کە شاز بوونەتەوە.

ئیسلام لەو سۆنگەیەوە کە ئاینێکی خۆڕسکە ئاساییە گەر دان بنێت بەم سیستمەدا بە دانانی یاساڕێژییەك بۆی بەرژەوەندی خێزان و ئومەتی تێدا دەستەبەر ببێت، بە شێوەیەك دوور بێت لە زۆرداری، ئیسلام رێگەی بە پیاو نەداوە ئافرەت بە شمەك دابنێت و کڕین و فرۆشتنی پێوە بکات، بەڵکو پلە و پایەی ئافرەتی بەرز راگرتووە و دانی بە مافە سروشتییەکانیدا ناوە کە لە زۆربەیان بێبەش بوو.

پایە و مەرجی بۆ تەڵاق داناوە، سنوورەکانی بۆ دیاریکردووە، کۆت و بەندی خستۆتە سەر ویستی پیاوەکە، بە جۆرێك نەتوانێ بە کارێکی هەوانتەی تەماشا بکات و کەی بیەوێت لێی بچێتە پێش و بە هەر پاساوێك دەیەوێت تەڵاق بدات، بەمەش رێگەیەکی مام ناوەندی لە نێوان زیادەڕەوی و کەمڕەوییدا گرتۆتە بەر کە لە دوو سیستمی تەڵاقی کاسۆلیك و پرۆتستانتی مەسیحی و سیستمی تەڵاقی رەبانییەکان لە موسەوییەکان بەرجەستە دەبێت، ئیسلام تەڵاقی بە دەوایەکی خەست و چڕ داناوە و نەخۆش لە هەندێ باری زۆر پێویستدا دەیخواتەوە، گەر باش بەکاریان هێنا سەردەکێشێت بۆ سەرئەنجامێکی باش، گەر خراپ بەکاریان هێنا -وەك چۆن دۆخی ئێستای جیهانی ئیسلامی داگیرکردووە- ئاشووب و تراژیدیا و کارەسات بەسەر تاك و کۆمەڵگەدا دەهێنێت.

# باسی سێیەم:
# ئەوانەی مافی تەڵاقیان هەیە

هەندێك پێیوایە تەنهاکردنەوەی پیاو بە مافی تەڵاق زۆرجار داگیرکاری تیانـەنجام دەدات با بۆ ئافرەتەکـەش را و بۆچـوون بڕیاردرابێـت، یـان بـە سەرپەرشـتی دادگـا بەدوور بگیرێت لە بوارەکـانی زۆرداری، لێـرەدا مـرۆڤ دەپرسـێت: گـەر کارەکـە بـەو جۆرەیە بۆچی پیاو لە ئیسلامدا بە تەڵاق تایبەتکراوە سەرەڕای ئیدانەکردنی هـەموو کار و فەرمانێك زیان و زۆرداری تێدا بێت؟

بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئەم ڕاستییە پێویستە لەسەر بەشە وێناکراوەکانی ئەم بابەتە گفتوگۆ بکەین، ئەگەرە ئەقڵییەکانی پێنجن:

١-یان تەڵاق تەنها بە دەستی ژن بێت.

٢-یان تەنها بە دەستی پیاو بێت.

٣-یان بە ڕێکەوتنی هەردوو لا بێت.

٤-یان لە ڕێگەی دادگاوە بێت.

٥-یان بە دەستی پیاوەوە بێت و هەڵی تەڵاقیش بە ئافرەت بدات.

**١-تەڵاق تەنها بە دەستی ئافرەتەوە بێت:**

ئەم بەشە نایەتە راستە لەبەر زۆرێك لە هۆ، لەوانە:

أ.تـەڵاق و هاوسـەرگیری دوو سیسـتمن لـە کۆمەڵگـە سـەرەتاییەکاندا بینـاکراون لەسەر نەرێتە خۆڕسکەکان: نێر داوای مێ دەکات، بەڵام ئەو (مێ) داوای پیاو ناکات، پیاو دەچێتە داخوازی ژن، بـەڵام ژن پیـاو ناخوازێـت، لـەڕووی سروشـتییەوە را لـە وازهێناندا بۆ ئەو کەسەیە رای لە داواکردندا هەیە، لەسەر ئەم نەرێتە خۆڕسکە ئیسلام گوزەراندوویەتی و ئەم مافەی تەنها بە ژن نەداوە.

ب–تەڵاق هەڵسوکەوتێکە ئەرکی داراییانەی بە دوادا دێت– پیاو پابەند دەکات بە پێدانی مارەیی تەواو بە ژنەکەی، هەروەها بە پێدانی خەرجی عیدە و منداڵ و کرێی بەخێوکردن سەرباری خەرجییەکانی هاوسەرگیری نوێ گەر بیەوێت.

بۆیە ویژدان و دادپەروەری رێگە نادەن کەسێك پابەند ببێت بەوەی لەسەر کاری کەسانی تر سەریهەڵداوە و ئەرکەکانی ببن بە ماف بۆ کەسەکەی تر، پاشان ئەم ئەرکە داراییانە پیاوەکە هەڵدەنێت بۆ لەسەرخۆیی و خۆڕاگری و وردبوونەوە لە کارەکە بەر لە چوونە بەرەوە لە تەڵاق، وای لێدەکات سووربێت لەسەر مانەوەی هاوسەرداری گەر زەروورەتێکی پێداگر بوونی نەبێت.

ت–ئافرەت بە حوکمی سروشتی خۆی زۆرتر و زیاتر لە پیاو بەو بەرهەڵستی و رەوشانەی رووبەڕووی دەبێتەوە لە ژیاندا کاریگەر دەبێت و هەڵدەنرێت، گەر بە تەنها مافی تەڵاقی لەدەستدا بوایە خراپ بەکاری دەهێنا و هەندێ جار بیری لە سەرئەنجامەکان نەدەکردەوە بەتایبەت ئەو کاتانەی لە هەڵچوون و تووڕەبووندا بوایە. ئەو ئەزموونانەی هەندێ لە گەلانی کۆن پیایاندا گوزەریان کردووە ئەوەی سەلماندووە پێدانی مافی تەڵاق بە ئافرەت هۆکارێکی کاریگەر بووە لە زۆربوونی رووداوی تەڵاق وەك لە رۆمان و چاخی کلاسیکدا روویدا، هەروەها لە هەندێ هۆزی عەرەبی سەردەمی نەفامیدا.

### ٢-تەنها بەدەستی پیاو بێت

هەندێ جار بەرهەڵستی ناچاری یان هەڵبژاردەیی روو لە ژیان دەکات زیان بە بەرژەوەندی ژنەکە دەگەیەنێت گەر ئەو دۆخە بەردەوام بێت، وەك بزربوونی مێردەکەی، یان حوکمدانی بە حوکمێکی داگیرکەری ئازادی ئەو، یان تووشبوونی بە نەخۆشییەکی گوازراوە کە هیوای چاکبوونەوەی لێ ناکرێت، یان خۆگرتنەوەی لە خەرجی ژنەکەی یان خراپ مامەڵەکردنی لەگەڵی... گەر ژنەکە لە مافی تەڵاق دابڕنین و لەم بوارانەدا تەنها بیدەن بە پیاوەکە ئەوا ئافرەتەکە دەبێتە قوربانی ئەو رووداوانە.

بۆیە ئیسلام لەم حاڵەتانەدا مافی دلوای تەڵاقی لە قەزا بە ژنەکە بەخشیوە وەك پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانی خۆی بە تەڵاقدانی، هەروەها بۆ بەرژەوەندی پیاوەکە بە دەستتێوەردانی دادگا لە کێشەکەیان.

۳-بە دەستی ئافرەت و پیاوەکە بێت پێکەوە:

ئیسلام دان بە تەڵاقدا دەنێت بە رێکەوتنی ژن و پیاوەکە وەك لە شێوازی خولعدا گەر دووربێت لە زۆرداری، بەڵام هاتنەدی رێکەوتنی هەردوو لا لەسەر تەڵاق لە هەموو بوارەکاندا خەریکە دەگاتە ئاستی ئەستەم، چونکە زۆرجار یەکێکیان بە مەبەستی زیانگەیاندن بەوی تریان لوتبەرزی و سەرپێچی دەنوێنێت.

٤-تەڵاقدان لە دادگا:

ئەم رێگەیە لە هەردوو شەریعەتی موسەوی و عیسەویدا(مەسیحیدا) گیراوەتە بەر، هەروەها لە زۆرێك لە یاسا دانراوەکاندا، تەڵاق تەنها لەبەردەم دادگای تایبەتکراودا و بە سەرۆکاری ئەو دروستە.

بەڵام ئیسلام دانی بەوەدا نەناوە بەهۆی زۆرێك لە خراپەوە لەوانە: دەرکەوتنی نهێنییەکانی ژن لەبەردەم قەزا و پارێزەری هەردوولادا، لەوانەیە ئەو نهێنیانە شەرمەزارکەر بن و ناو و ناوبانگی خێزانەکەی بشێوێنن و داهاتووی ژنەکە تێکبشکێنن، یا وا دابنێین پیاوێك لە ئاکاری ژنەکەی گومانی بۆ دروست بوو، ویستی لە رێگەی سەرۆکاری دادگاوە تەڵاقی بدات، ئایا ئابڕووچوونی ئەم کارە تا چ رادەیەکە؟ یا تا چەند کار دەکاتە سەر ناو و ناوبانگی هەردوو هاوسەرەکە و کەسوکاریان؟ پاشان پاڵنەری تەڵاق هەندێ جار کۆمەڵێك شتی ناوەکییە وەك خۆشنەویستن و رق لێبوونەوە، ناتوانرێت بە بەڵگە و نیشانە ئاماژە بکرێتە سەریان و تەنها خاوەنەکەیان دەیانزانێت، بەوەش کارەکە لە دەرەوەی بواری دەسەڵاتی دادگاوەیە.

**٥-بەدەستی پیاو بێت و پێدانی هەل بە ئافرەت لە کاتی پێویستدا:**

ئیسلام ئەم رێگە تەندروستەی دوایی دانپیادا ناوە و تەڵاقی بە مافێکی سروشتی پیاو داناوە چونکە لەگەڵ پابەندبوونەکانی بەرانبەر بە ژنەکەی و منداڵەکانی و خانەوادەکەی تەبا و گونجاوە.

لەبەرئەوەی پیاوەکە پابەندە بە پێدانی مارەیی و خەرجکردن بۆیە مافی خۆیەتی کۆتاهێنانی پەیوەندی هاوسەری لەدەستدا بێت وەك کارکردن بە رێسای (الغرم بالغنم) هەروەها لەبەرئەوەی زۆرجار خۆ ڕاگرترە و زیاتر بیر لە سەرئەنجامەکانی تەڵاق دەکاتەوە لە تووڕەیی و هەڵچوونەکاندا، بۆیە ئەم مافە بەکارناهێنێت مەگەر بێهیوا بێت لە سەرکەوتنی بەختەوەری هاوسەری.

ئیسلام لەم بارە ترسناکەدا کە چارەنووسی دوو هاوسەرەکە دیاریدەکات مافی ژنەکەی لەبیر نەچووە، بەڵکو مافی داوای تەڵاقی لە دادگای تایبەتکرلو بە ژنەکە داوە لەباری ڕوودانی شتێك زیان بە بەرژوەندییەکانی بگەیەنێت لەڕووی زیندەگی و گوزەران یان تەندروستی یان جووتبوون.

هەروەها مافی تەڵاقدانی هەیە لە رێگەی پێدانی مافەکە بە ئەو(بە ژنەکە)، یەکسانە ئەو مافەی پێدرابێت لە کاتی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەدا وەك هەندێ لە فەقیهان دەیڵێن یان لە دوای گرێبەستەکە لە کاتی ڕاستبوونەوەی حاڵەتی هاوسەرگیرییدا.

لە کاتێکدا ئیسلام مافی تەڵاق بە مێردەکە دەدات لە ویست و بڕیاریدا ئازادی نەکردووە تا چۆنی بوێت بەپێی ئارەزوو هەڵسوکەوت بەم مافەوە بکات، بەڵکو سنووری بۆ دیاریکراوە و رێکاری شێوەگری بۆ دانراوە و پێویستە شوێنیان بکەوێت، لەوانە ئەو قۆناغانەی کە قورئانی پیرۆز ڕۆشنی کردوونەتەوە.

# باسی چوارەم:
# هەنگاوەکانی تەڵاق

وەك خەمخۆری بۆ بەردەوامی ژیانی هاوسەری و دانەرمانی دامەزراوەی خێزان بەسەر ئەوانەی تیایدا دەژین لە گەورە و بچووك ئەوانەی گوناهێکیان نییە، هەروەها وەك هاندانێك لەسەر خۆڕادەست نەکردن بۆ دەرکەوتەکانی نشوز و خۆشنەویستن و جیاوازی و تەنگەژە و دابڕان... بە پەلەکردن لە پچڕاندن و پساندنی پەتی هاوسەری، خودا -ﷻ- لە دوایین دەستووری خۆیدا (قورئان) کۆمەڵێك هەنگاو و قۆناغی هێواشی بۆ کۆتاهێنان بە پەیوەندی هاوسەری بڕیارداوە، هەروەها بڕیاری شوێنکەوتنی داوە بە شێوەیەکی پلە بە پلە و قۆناغبەندیانە، بەڵکو ببێتە هۆی گێڕانەوەی پاکی و ڕۆشنییەکی لێڵ بوو و خۆشەویستییەکی بەفیڕۆچوو تاکو ژیانی هاوسەری ڕاستەڕێگە بگرێت و دامەزراو و بەردەوام ببێت.

قۆناغەکان وەك قورئان دیاریکردوون ئەم هەشتەن:

**قۆناغی یەکەم -ئامۆژگاری (فَعِظُوهُنَّ):**

لەباری ناچیزەیی (نشوز) ژنەکەدا قورئان فەرمانی بە مێردەکە کردووە: دەست بیات بۆ ڕێگەی ئامۆژگاری و ڕێنموونی و ئاراستەکردن و ووریاکردنەوە لەسەر هەڵەکانی، لە جێگەی پەنابردن بۆ تەڵاق، خودا -ﷻ- دەفەرموێت: ﴿وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ﴾[1].

---

[1] ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾ النساء: ٣٤.

ئەم رێگەیە یەکەمین ئەرکی خاوەن خێزانە بۆ چاککردنەوەی هەموو ئەوەی رووبەرووی تێکچوون بووەتەوە، چونکە کارێکی پەروەردەکارییە و بۆ هەموو خێزانەکە پێویستە، خودا -ﷻ- دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾[1]، خودی ئامۆژگاری لێرەدا بە مەرامگیراوە بۆ ئامانجێکی دیاریکراو ئەوەش بریتییە لە چارەسەری دەرکەوتەکانی ناچیزەیی ژنەکە بەر لەوەی کارەکە لەدەست دەربچێ و سەرئەنجامی خراپی لێوە سەرهەڵبدات، بەلام هەندێ جار بە جوانییەکەی یان بە ماڵەکەی یان بە پلە و پایەکەی یان بە شتانی تر لە سنووری خۆی دەردەچێت، وەك قورئان دەفەرموێت:﴿كَلَّا أن الانسَان لَيَطْغَى * أن رَآهُ اسْتَغْنَى﴾[2]، بۆیە بە ئامۆژگاری چاك و پاك کاریگەر نابێت، لەو بارەدا پیاوەکە گەرەکە شێوازی خۆی بگۆرێت و روو لە قۆناغی دووەم بکات:

**قۆناغی دووەم -کۆچلێکردن لە جێگەی نووستن(وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ)،**

جێگەی نووستن شوێنی هەڵنانە(إغراء)، کۆچلێکردن شێوازێکی دەروونییە پیاوەکە دەیگرێتە بەر بۆ ئاگادارکردنەوەی ژنەکەی بەوەی لە داهاتوودا رووبەرووی بێبەشبوون دەبێتەوە لە جێگەی نووستنی کە لوتکەی پەیوەندی هاوسەری دەنوێنێت لە خۆشەویستی و بەزەیی و سوکنایی و ئارامی، وەك دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[3]

بەلام پەروەردەی ئەخلاقی ئیسلامی فەرمان بە مێردەکە دەکات پابەند بێت بەم خاڵانەوە:

١-کۆچکردنەکە لە شوێنی نووستنی ژن و پیاوەکە بێت.

---

[1] ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ التحريم: ٦.

[2] سورة العلق: ٦-٧.

[3] سورة الروم: ٢١.

٢–لەبەردەم منداڵەکاندا کۆچی لیٚ نەکات تا کار نەکاتە سەر ئاکاریان و لە دەروونیاندا شەڕ و خراپە سەرهەڵنەدات.

٣–کۆچکردنەکەی لەبەردەم خەڵکی نامۆ و بێگانەدا نەبێت بۆ ئەوەی ئافرەتەکە شەرمەزار بکات و لە شانوشکۆی دابەزێنێت یان ڕێز و پایەی لەکەدار بکات و ئەوەندەی تر بەرەو ناچیزەیی هەنگاو هەڵبگرێت، چونکە مەبەستەکە چارەسەری ناچیزەییە نەك شەرمەزارکردنی ژنەکە، و تێکدانی منداڵەکان.

گەر ئەم ڕێگەیەش شکستی خوارد بەهۆی ئەو دەروونە شەڕەنگێزەی ئافرەتەکە هەڵیگرتووە ئەوا پێویستە پیاوەکە پەنا ببات بۆ شێوازێکی تر گونجاو بێت لەگەڵ ئەم دەروونەدا ئەوەش بریتییە لە:

**قۆناغی سێیەم -لێدان(وَاضْرِبُوهُنَّ):**

وەك چۆن بۆ هەموو دەردێك دەوایەکی تایبەت هەیە، چارەسەری هەموو یاخیبوونێکیش شێوازێکی تایبەتی پێویستە، گونجاو بێت لەگەڵ بڕ و ڕادەی یاخیبوونەکەدا، خودا فەرمانی بە لێدان کردووە، چونکە پیاوەکە لەبەردەم سیٚ هەڵبژاردەدایە و چوارەمی بۆ نییە: یان پەنابردن بۆ قەزا کە ئاشکرابوونی نهێنییەکانی خێزانی تێدایە یان تەڵاق و هەڵوەشانەوەی خێزان یاخود لێدانێك ئازار و ئێش و برینی تێدا نەبێت، لێدانەکە ڕاستترین و باشترین چارەسەرە.

هەندێك وا بانگەشە دەکەن گوایە شێوازی لێدان حیکمەتی تێدا نییە، پێیان دەڵێم، بەڵیٚ، لێدان بە تێگەیشتنی دەردلوی ئەوان حیکمەتی تێدا نییە، بەڵام ئەم ڕێگەیە جەنگ نییە لە نێوان پیاو و ژندا بەو شێوازە بیەوێت سەری ئافرەتەکە بشکێنێت کاتێك بە ناچیزەیی تۆمەتبار دەکرێت، ئەوە بیٚ هیچ گومانێك لە ئیسلام نییە، بەڵکو نەرێتی هەندیٚ سەردەمە لەگەڵ ڕسولی مرۆڤدا سەریهەڵداوە، بۆیە بڕیاری ئیسلام لە شێوە و شێواز و ئامانج و مەرامیدا جیاوازە.

لێدان هەروەك تەڵاق بێزراوە، بەڵام سووکترین شەڕیانە، پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەکانیدا پێداگری لەوە کردووە و دەفەرموێت: ((هیچ کام لە ئێوە ژنەکەی

دارکاری نەکات وەك دارکاری کردنی کۆیلە پاشان لە کۆتایی ڕۆژەکەدا بچێتە لای))[1]، هەروەها دەربارەی ئەوانەی لە ژنەکانیان دەدەن دەفەرموێت: ((ئەوانە لە چاکانی ئێوە نین))[2]، هەروەها دەفەرموێت: ((تەنها خراپەکان لە ئێوە لێدان بەکاردەهێنێت))، لەم فەرموودە بەرز و بڵندانەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی لێدان تەنها سزایەکە بۆ ژنەکە، کارێکی ئەنجام داوە پێچەوانەی ئەخلاق و ئادابی گشتییە، ئەم سزایە نابێت بە تەڵاق بێت، چونکە پێویستە سزا تەنها لەسەر کەسە تاوانکارەکە کاریگەری بەجێبهێڵێت، لە کاتێکدا تەڵاق ئاساری نەرێنی لەسەر دوو هاوسەرەکە و منداڵەکان -گەر هەبوون- و خانەوادەکانیان بەجێدەهێڵێت، ئەمەش پێچەوانە دەوەستێتەوە لەگەڵ ئایەتی: ﴿وَلا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾[3]، هەر بەو جۆرە سزاکە نابێت لە دادگاوە بێت چونکە گەیشتنی کارەکە بەوان سەردەکێشێت بۆ بڵاوەپێکردنی و لەوێشەوە زڕاندنی ناو و ناوبانگی خێزانەکە، پێشینی چاکان لەم ڕاستییە حاڵی بووبوون، قازی "شورەیح" کە عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی ڕازی بێت) وەك قازی لەسەر شاری بەصرە دایمەزراندبوو و (٦٣) ساڵ کاری قەزای بەڕێوە بردبووە: کاتێك تووشی تووڕەبوون و هەڵچوون دەبوو لە ژنەکەی(زەینەب) نیگەران دەبوو سیواکەکەی کە دەم و ددانی لە نوێژدا پێ پاك دەکردەوە دەردەهێنا و هەڕەشەی پێ دەکرد لە هاوسەرەکەی و دەیوت:

رأيت رجالا يضربون نساءهم    فشلت يميني حين أضرب زينبا

کەوابوو ئەو لێدانەی قورئان فەرمانی پێکردووە جیایە لەو لێدانەی نەفامان لێی حاڵی دەبن، هاوەڵی ئامانجەکە لەم ڕێکارانەدا ڕێگەنادات لێدانەکە ئێشگەیاندن و

---

[1] ينظر فتح الباري بشرح صحيح الأمّام ابي عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري للأمّام الحافظ احمد بن علي بن حجر العسقلاني (٧٧٢-٨٥٢هـ)، باب ما يكره من ضرب النساء وقوله تعالى (واضربوهنَّ) اي ضرباً غير مبرح، (٩/٣٠٢).

[2] الشوكاني، نيل الأوطار (٦/٢٣٨).

[3] (الانعام: ١٦٤).

تۆڵەسەندنەوە و خۆخاڵیکردنەوە بێت، هەروەها ڕێگری دەکات لەوەی سوکایەتی پێکردن و شەرمەزار کردن و کەم تەماشاکردنی ئافرەت بێت، هەروەها ڕەدی دەکاتەوە لێدانەکە بۆ ناچارکردنی ژنەکە بێت لەسەر قبووڵ کردنی ژیان و گوزەرانێك پێی ڕازی نییە[1]، شایانی باسە لێدان تەنها کاتێك ڕێگەپێدراوە ژنەکە تاوانێکی ئەخلاقی ئەنجام دابێت، وەك لە سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەوە جێگیر بووە.

ئەو سێ هەنگاوە دەگیرێتە بەر گەر ناچیزەیی لە ژنەکەوە بوو، بەڵام گەر لە پیاوەکە بوو قورئان فەرمانی بە گرتنەبەری ئەم هەنگاوانە کردووە:

**قۆناغی چوارەم -ئاشتەوایی (والصُلْحُ خَيْرٌ):**

قورئان دوو هاوسەرەکە ئاراستە دەکات بۆ ئاشتەوایی و سازان و دانوستان و تێگەیشتن لەیەکتر هەرکات دەرکەوتەکانی ناچیزەیی لە پیاوەکەوە سەریهەڵدا، دەفەرموێت: ﴿وَإِن إمرأة خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أو إِعْرَاضًا فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أن يُصلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾[2].

ئەمە باشترین ڕێگەیە بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی لە بازنەی خێزاندا کاتێك ترسی ئەوە هەیە دیاردەی ناچیزەیی و پشتهەڵکردن لەلایەن پیاوەکەوە سەرهەڵبدات، بە جۆرێك ببێتە هەڕەشە بۆ سەر شوێن و پێگە و ڕێزی ئافرەت و ئاسایشی خێزان و تۆکمەیی و دامەزراوییەکەی.

بەر لەوەی کارەکە بگاتە تەڵاق کە خراپترین حەڵاڵە بۆ لای خودا یان بەر لەوەی دەستبەرداری ژنەکە ببێت تاکو لە نێوان باری مانەوە و تەڵاقدا ژیان بەڕێ بکات، قورئان پیاوەکەی هانداوە بۆ لێتێگەیشتن و قبووڵ کردنی ئاشتەوایی و سازان کە بۆ خۆی و ژنەکەی و منداڵەکانی باشترە، چونکە لەوانەیە لە خۆشنەویستنی ژنەکەدا بە هەڵەدا چووبێت، خودا-ﷻ- دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا

[1] ينظر سيد قطب، في ظلال القرآن ٦٤/٥.
[2] (النساء: ١٢٨).

النِّسَاءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾[1]

ئەو چوار هەنگاوە دەگیرێنە بەر کاتێك لایەنی کەمتەرخەم لە دوو هاوسەرەکە ئاشکرا بێت.

بەڵام لە باری دابڕان و لێکترازاندا هەریەکەیان ئەویتر بە کەمتەرخەم و هۆکار لە تەنگەژەکاندا تۆمەتبار دەکات، لەم بارەدا قورئان فەرمان بە هاتنە ناوەی لایەنی سێیەم دەکات لە خانەوادە و خزم و کەسوکار بۆ ئەوەی نێوانیان پێکبهێننەوە لە رێگەی داوەرییەوە.

**قۆناغی پێنجەم-داوەری(فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا)[2]:**

کاتێك دەرکەوتەکانی دابڕان و لێکترازان نێوان دوو هاوسەرەکە دەرکەوت لەسەر خانەوادەی هەردوو لایان یان سەرپەرشتیاران یان قازی یان هەر دەستەیەکی موسڵمان پێویستە بێنە ناوەوە بۆ پێشکەش کردنی یارمەتی و کۆمەکی تاکو بتوانن زیانی دابڕان و لێکترازان بەو شێوازەی قورئان فەرمانی پێکردووە هەڵبگرن، خودا-ﷻ- دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا أَن يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا أَن اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا﴾[3]

جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانە خوداییە بۆ لێکۆڵینەوەی لێکترازانی دوو هاوسەرەکە داوای فەراهەمبوونی ئەم خاڵانە دەکات:

أ.داوەرێك لە خانەوادەی ژنەکە پێی رازی بێت و داوەرێك لە خانەوادەی پیاوەکە پێی رازی بێت رەوانە دەکرێن.

---

[1] النساء: ١٩.

[2] النساء: ٣٥.

[3] سورة النساء: ٣٥.

ب. دوو داوەرەکە دوو کەسی راستڕەو و دادپەروەر بن، شارەزابن لە کاروباری خێزان و گرفتەکانی.

ج.هەتا بکرێت لە خزم و کەسە نزیکەکانی دوو هاوسەرەکە بن، گەر کەسوکار و خانەوادەیان نەبوو، یان هەیانبوو بەڵام کەسێکی تێدا نەبوو بۆ ئەو ئەرکە شیاو بێت بەهۆی نەبوونی شارەزاییەوە یان نەبوونی دادپەروەرییەوە یان شتانی تر.. پەسەندە دوان لە هاوسێکان بن[1]، حیکمەتی ئەوەی دوو داوەرەکە لە خانەوادە و کەسوکار بێت بۆ فراوانی ئاگاهی و زانیارییان دەگەڕێتەوە بە گرفتەکانی دوو هاوسەرەکە و خەمخۆرییان بۆ ئابڕو و ناوبانگی دوو خێزانەکە و زۆری بەزەییان بە منداڵەکان و زۆری ئەگەری سەرکەوتنیان لە کارەکەدا.

د-بێلایەن بن و مەبەست و ئامانجیان چاککردن بێت بەبێ جیاکاری لایەنگری بۆ یەکێکیان.

هـ-هەردوو داوەرەکە لەگەڵ دوو هاوسەرەکە کۆببنەوە لە شوێنێکی ئارامدا دوور لە هەڵچوونە دەروونییەکان و لیتە نیشتووەکانی پێشوو لە هەست و دەروویندا و دوور لە چەندوچوونەکانی ژیان و گوزەران و هۆکەلێکی تر کە سەردەکێشن بۆ لێڵکردنی پاکی و رۆشنی ژیانی هاوسەری.

و-راپۆرتێکی راستگۆیانەی ئەمیندارانەی پاك بەرزبکەنەوە تیایدا هۆی راستەقینەی جیاوازی و لێکترازانی دوو هاوسەرەکە لەخۆ بگرێت، هەروەها لایەنی کەمتەرخەم لە دوو هاوسەرەدا دیاریبکرێت.

گەر ئەم پێنج هەنگاوە شکستی خوارد لەو بارەدا رۆشن دەبێتەوە کۆمەڵێك گرفت هەیە ناهێڵێت ژیانی هاوسەری راستەڕێگە بگرێت و بە دامەزراوی بمێنێتەوە، لەو بارەدا حیکمەت ئەوەیە گەردنکەچ بین بۆ واقیعی تاڵی تەلاق کە لای ئیسلام بێزراو و نەویستراوە، چونکە خراپترین حەڵاڵێکە بۆ لای خودا.

---

[1] ینظر احكام القرآن لإبن العربي (ابي محمد بن عبدالله). تحقيق علي محمد البجأوي، الطبعة الثانية، عيسى البابي الحلبي، ١/٤٢٤.

**قۆناغی شەشەم -تەڵاق بۆ جاری یەکەم:**

لەباری زەروورەتی پێداگردا ئیسلام رێگە دەدات پەنا ببرێت بۆ تەڵاق کە بە سێ جار دیاریکراوە لە ئایەتی: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَان فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾[1]، واتە ئەو تەڵاقەی هێشتا رێگەی تێهەڵکردنەوەی ژیانی هاوسەری تێدا ماوە بە گێڕانەوەی ژنەکە لە تەڵاقی رجعیدا[2] هەروەها بە گرێبەست و مارەییەکی نوێوە لە تەڵاقی بائیندا (مرتان-دوو جارە)، لەباری گێڕانەوە و گرێبەستی نوێدا بۆ سەرپەرشتیار نییە بەرهەڵستی بکات بەپێی ئایەتی: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنْكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ﴾.[3]

زۆرێك لە فەقیهان و ئەهلی تەفسیر پێیانوایە مەبەست پێی بریتییە لە تەڵاقی رجعی دوو جارە لە دوای هەر جارێك (إمساك بالمعروف) گێڕانەوەی ژنەکەیە بەبێ گرێبەست، (أو تسريح بإحسان) دەستبەرداربوون لە ژنەکە بەبێ گێڕانەوە بۆ جیابوونەوەی تەواو لەدوای کۆتاهاتنی عیدە.

لەگەڵ رێزی زۆرم بۆ پلە و پایەی ئەو زانا بەرێزانە قسەکانیان پێچەوانەیە لەگەڵ ئاشکرای ئایەتی ئاماژەبۆکراودا بەم هۆیانە:

١-وشەی "تسريح" لە زاراوەی قورئانی پیرۆزدا تەنها مانای تەڵاقی هەیە بەو بەڵگەیەی لە سورەتی (الأحزاب/٢٨)دا هاتووە: ﴿يَا أَيُّهَا النبي قُلْ لأَزْوَاجِكَ أَن كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً﴾ هەروەها ئایەتی: (٤٩): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ

---

[1] البقرة: ٢٢٩.

[2] تەڵاقی رجعی بریتییە لە هەر تەڵاقێك لەدوای چوونە لا بەبێ بەرانبەر و بۆ جاری سێیەم نەبێت و تەڵاقدراوەکە هێشتا لە عیدەدا بێت، گەر یەکێك لەم چوار مەرجە دواکەوت تەڵاقەکە دەبێتە بائین.

[3] البقرة: ٢٣٢.

قَبْلِ أن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلا﴾.

٢-وێناناکرێت "السراح" لەو دوو دەقەدا بە وازهێنان تا عیدە کۆتایی پێ دێت لێکبدرێتەوە، بە تایبەت لە دەقی دووەمدا تەڵاقەکە بائینە، چونکە بەر لە چوونە لایە، ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە قورئان هەندێکی هەندێکی تری تەفسیر دەکات.

٣-ڕای جمهووری فەقیهانی موسڵمان لەسەر ئەوە جێگیر بووە "الطلاق و السراح و الفراق" و داتاشراوەکانیان لە دەبڕینە ڕاشکاوەکانی تەڵاقن.

٤-"التسريح" کارێکی ئەرێنییە لە مرۆڤێکەوە دەردەچێت بە ویستێکی تاکلایەنە، "الترك"یش کارێکی نەرێنییە بۆیە ناکرێت یەکەم بە دووەم لێکبدرێتەوە.

٥-گەر مەبەست لە (الطلاق مرتان) بریتی بێت لە تەڵاقی رجعی حوکمی بائین لە کوێدایە، حوکمەکە کامەیە گەر تەڵاقی یەکەم بەر لە چوونە لا بێت؟

٦-"القرطبي" دەڵێت: ((ئەبو عمر دەڵێت: زانایان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی (أو تسريح بإحسان) بریتییە لە تەڵاقی سێیەم لەدوای دوو تەڵاقەکە[1]، ئەم ئایەتە: ﴿فَإن طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعد حَتَّى تَنْكِحَ زَوجاً غَيْرَهُ﴾ مەبەست پێی ئەو تەڵاقی سێیەمەیە)).

٧-هەروەها دەڵێت: (لە "أبي رزين"ەوە دەڵێت: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا ئەم ئایەتە: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾تەڵاقی سێیەمەکەی لە کوێدایە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾[2]

---

[1] احكام القرئن لابى عبدالله محمد بن احمد الانصارى القرگبى، الگبعه الپالپه ٣/١٢٧.

[2] عمدة القارئ بشرح صحيح البخاري ٢٠/٢٣٤.

لـە "أحكـام القـرآن"ی "الجصـاص"دا[1] و "أحكـام القـرآن"ی "ابـن العربی"دا[2] پشتیوانی ئەم بۆچوونە هاتووە.

بۆیە (أو تسريح باحسان) راستەقینەیە لە تەڵاقدانی سێیەمدا و بەڵگەیـەك بـوونی نییە لە مانای راستەقینە لای بدات، هەروەها ئایەتی: ﴿فَان طَلَّقَهَا فَلا تَحلُّ لَهُ منْ بَعد حَتَّى تَنْكحَ زَوجاً غَيْرَهُ﴾ رۆشنكردنەوەی ئەو حوكمەیـە كـە لەسـەر تـەڵاقی سـێیەم سەرهەڵدەدات نەك تەڵاقەكانی تر، ئەم حوكمە ئەوەیە ژنەكە بۆ پیاوی یەكەم حەڵاڵ نییە تا مێرد بە پیاوێكی تر نەكات، بچێتە لای بە چـوونە لایـەكی شـەرعی، گـەر بـە مردن یان تەڵاق یان جیاكردنەوەی قەزاییانە جیابوونەوە و عیدەكەی تەواو بكات لەو بارەدا مێردی یەكەم بـۆی هەیـە هاوسـەرگیری لەگـەڵ بكاتـەوە گـەر هـەردوو لایـان كارەكەیان لا پەسەند بوو.

**پابەندبوونەكانی تەڵاقدەر لە كاتی تەڵاقدا:**

گەر ئیسلام رێگەی بە پیاوەكە داوە پەنا بۆ تەڵاق ببـات وەك دوایـین چارەسـەر ئەوا وازی لێ نەهێناوە لەم مافەدا چۆنی بوێت و كـەی بیـەوێت هەڵسـوكەوت بكـات، بەڵكو ناچاری كردووە بە پابەندبوون بەم خاڵانەوە:

**یەكەم-جیاكردنەوەی سێ تەڵاقەكە لەیەكتری و دابەش كردنی بۆ سێ جار:**

ئەمەش ئەوەیە بـە دەق ئایـەتی: ﴿الطَّـلاقُ مَرَّتَـان فَإمْسَـاكٌ بِمَعْـرُوفٍ أو تَسْـرِيحٌ بِإحْسَان﴾ ئاماژەی پێدەكات.

"الجصاص" دەڵێت: خودا دەفەرموێت: (الطلاق مرتان) بۆیە بـێ هـیچ گومانێـك داوای جیاكردنەوە دەكات، چونكە گەر بە یەكەوە دوو تەڵاقەكە بدات دروست نییـە بوترێت دوو جار تەڵاقی داوە، هەر بەو جۆرە گەر پیاوێك دوو درهەم بدات بە كەسێك

---

[1] الأمّام ابو بكر احمد بن علي الرازي الجصاص، لحكام القرآن تحقيق محمد صادق قمحأوي نشر دار المصحف ٢/٨١.
[2] المرجع السابق ١/١٩١.

دروست نییە بوترێت دوو جار پێیداوە، دەبێ جارەكان جیابكرێنەوە ئەو كاتە ئەو گوزارەی بۆ بەكاردەهێنرێت[1]

هەروەها دەڵێت: (ماناكەی بریتییە لە فەرمان)

درێژەی ئەم بابەتە لە باسی تەلاقی هاوتا بە ژمارەدا دێت.

**دووەم- دیاریكردنی كات:**

لەسەر پیاوەكە پێویستە لە تەلاقەكەیدا پابەند بێت بە كاتی دیاریكراوەوە بۆی لە قورئاندا و لە ئایەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا النبـي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾.[2]، لەم ئایەتەدا رووی گوتاری لە پێغەمبەرەكەیەتی بەهۆی گرنگیدان بە بابەتەكە و بەرجەستەكردنی گەورەیی و مەزنی لە كارەكەدا.

كاتی عیدەی ئافرەتان سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) دیاریكردووە بە جگە لەم كاتانە:

١-كاتی حەیز: تەلاقدانی ژن دروست نییە گەر لە حەیزدا بوو.

٢-كاتی زەیسانی: تەلاق دروست نییە گەر ئافرەتەكە زەیسان بوو.

٣-كاتی پاكی و چووبێتە لای: تەلاقدانی دروست نییە لەبەر بوونی ئەگەری سك[3]

**سێیەم-دەرنەكردنیان لەماڵەكانیان(ماڵی هاوسەری):**

گەر تەلاقەكە رجعی بوو تا عیدەكەی تەواو دەبێت، ئەوەی پێویستییەتی بۆی دابین دەكات تا لە عیدەدا بێت لە خواردن و خواردنەوە و شوێن و پۆشاك.

---

[1] احكام القرآن للجصاص المرجع السابق ٢/٧٣-٧٤.

[2] الطلاق: ١.

[3] لمزيد من التفاصيل فتح الباریٔ بشرح صحيح البخاري المرجع السابق (٩/٣٤٥) كتاب الطلاق، باب قوله تعالى: ﴿يَا أَيُّهَا النبـي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ﴾ ويراجع زاد المعاد في هدى خير العباد محمد خاتم النبـي ين وأمام المرسلين للأمام العلامة ابن قيم الجوزية (٤/٤٣) وما بعدها تحت عنوان (حكم رسول الله (ﷺ) في تحريم طلاق الحائض والنساء والموطئة في طهرها وتحريم ايقاع الثلاث جملة). المدونة الكبرى في فقه المالكي (٥/١٠٤)، المحلى في الفقه الظاهري (١٠/١٦٤)، الشوكاني نيل الأوطار (٦/٢٢٦).

ئەوەش لەبەر ئایەتی:﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلا يَخْرُجْنَ إِلا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا﴾.[1]

هەروەها فەرمان بە ترسان لە خودا و خۆپارێزی تێدایە بەر لە فەرمان بە دەرکردنیان، ئاگادارکردنەوەیەکە ئاراستەی پیاوان کراوە، هەروەها لەو بەشەی ئایەتەکەدا: (وتلك حدود الله) پاشان گوزارەی (مِن بيوتهنّ) بۆ پێداگری لەسەر مافی ژنان لە هەستان بەو مافانە دوای ماوەی عیدە.

لە برگەی کۆتاییدا: ﴿لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا﴾.[2]هۆمێنانەوەیە بۆ دەرنەکردنیان ئەوەش لەبەر پێدانی هەلێك بۆ گێڕانەوە و پێکهاتنەوە، هەروەها بۆ تێهەلکردنەوەی سۆزی خۆشەویستی و تەبایی بە بیرکردنەوە لە سەرئەنجامی جیابوونەوەکە و یادەوەرییەکانی ژیانی هاوبەشیان لە کاتێکدا ژنەکە بە حوکمی تەڵاق دوورە و لەگەڵ ئەوەش نزیك و لەبەر چاوە.

لە ماوەی عیدەدا پیاوەکە مافی ئەوەی هەیە ژنەکە بگێڕێتەوە بەبێ گرێبەستێکی نوێ بە کردار و گوفتار لەلای هەندێك لە فەقیهان، بە تەنها قسە وەك(ئەوە تۆم گێڕایەوە) لای هەندێکی تر لە فەقیهان، یان بە تەنها کردار وەك چوونە لای ژنەکە، گەر عیدەکەی تەواو بوو مافی ئەوەی نییە بیگێڕێتەوە مەگەر بە گرێبەستێکی نوێ.

**چوارەم-شایەتگرتن لەسەر تەڵاق و گێڕانەوە:**

لەسەر مێردەکە پێویستە بە ئامادەبوونی دوو شایەت ژنەکەی تەڵاق بدات، هەر بەو جۆرە بە ئامادەبوونی دوو شایەت ژنەکەی بگێڕێتەوە تا دووربێت لە جێگەی تۆمەت، شایەت لەو دوو بارەدا قورئان بە دەق ئاماژەی پێداوە: ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَو فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنكُمْ﴾.[3]، فەرمانەکە بە

---

[1] (الطلاق: ١).

[2] الطلاق: ١.

[3] الطلاق: ٢.

ئامادەبوونی دوو شایەتی راسترەو و دادپەروەر بۆ پێویستبوون(وجوب)ە، چونکە پێویستبوون دلواکاری فەرمانی خودایە گەر بەڵگەیەك پێچەوانەی ئەوە راست نەبێتەوە.

**پێنجەم-زۆرنەکردن لە ژنەکە :**

لەسەر ئەوەی شتێك لە مارەییەکەی بۆ مێردەکەی بگێڕێتەوە یان خەرجییەکەی بۆ بگێڕێتەوە کە لە کاتی ژیانی هاوسەریدا بۆی خەرج کردووە لەبەرانبەر تەلاقدانی ژنەکە گەر ژیانی لەگەڵ پێکنەهێنایەوە، بەلاّم گەر شتێك لەوە بە رازیبوونی خۆی ببەخشێت بە مێردەکەی بەرانبەر بە تەلاّق لەبەرئەوەی ژنەکە حەز لە پیاوەکەی ناکات و دەیەوێت بە هەر نرخێك بووە لە دەستی رزگاری بێت ئەوە کارێکی خراپ نییە، ئەم جۆرە تەلاّقە لە زاراوەی فەقیهەکاندا پێی دەوترێت "خولع".

خودا-ﷻ- دەفەرموێت: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَان فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَان ولَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلا أَن يَخَافَا أَلا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّه فَـان خِفْـتُمْ أَلا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّه فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِه تِلْكَ حُدُودُ اللَّه فَلا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّه فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾.(1)

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر رادەی ویستی ئیسلام لەسەر پارێزگاری ژن لە ستەم کە لەوانەیە لە کاتی تەلاّقدا رووبەرووی ببێتەوە.

گەر ژیانی هاوسەریان دەستپێکردەوە لە دوای تەلاّقی یەکەم پاشان جیاوازی و لێکترازان و تێنەگەیشتن لە یەکتری رووی لێکردنەوە ئەوا لەسەر مێردەکە پێویستە پێنج هەنگاوەکە کە پێش تەلاّقی یەکەم کەوتن بە هەمان رێکخستن دووبارە بکاتەوە، گەر هەوڵەکان شکستیان خوارد بۆ مێردەکە دروستە تەلاّقی دووەمی بدات.

---

(1) البقرة: ٢٢٩.

**قۆناغی حەوتەم -تەڵاقدان بۆ جاری دووەم:**

لەم جارەدا لەسەر پیاوەکە پێویستە رەچاوی هەموو ئەو کۆتوبەندانە بکات کە لە تەڵاقی یەکەمدا بەسەر ویستی ئەودا سەپابوو لە جیابوونەوە و دیاریکردنی کات و دەرنەکردنی ژنەکە لە ماڵی هاوسەری گەر تەڵاقەکە رجعی بوو تا عیدەکەی تەواو دەبێت.

گەر گەڕانەوە بۆ سەر ژیانی هاوسەرییان لەدوای تەڵاقی دووەم جا یان بە گێڕانەوە گەر تەڵاقە رجعی بوو یان بە گرێبەستێکی نوێ گەر تەڵاقەکە بائین بوو، پاشان گەڕانەوە بۆ هەمان دۆخی ئازار و مەینەتی ئەوا لەسەر پیاوەکە پێویستە شوێنی پێنج هەنگاوەکەی یەکەم بکەوێت، گەر سوودێکی نەبوو ئەوا بۆی هەیە پەنا ببات بۆ تەڵاقی سێیەم و کۆتایی.

**قۆناغی هەشتەم: تەڵاقدانی جاری سێیەم:**

گەر سێ تەڵاقەکە تەواو بوو ئەم حوکمانەی لەسەر پەیدا دەبێت:

١-نادروستی مانەوەی ژنەکە لە ماڵی هاوسەریدا، چونکە بە تەواوی لەیەکتر جیابوونەتەوە و لە یەکتر حەرام بوون.

٢-نادروستی گێڕانەوەی ژنەکە نە بە رجعی و نە بە گرێبەستی نوێ، چونکە تەڵاقەکە بەینوونەی گەورەیە.

٣-بۆ ژنەکە هەیە-دوای کۆتاهاتنی عیدەکەی- مێردێکی تر هەڵبژێرێت و بیکات بە هاوبەشی ژیانی هاوسەری خۆی.

٤-بۆی هەیە بگەڕێتەوە بۆ لای مێردی یەکەم بەم مەرجانە:

أ.بە هاوسەرییەکی شەرعی مێردی بە پیاوێکی تر کردبێت.

ب-مێردی دووەم چووبێتە لای بە چوونە لایەکی شەرعی سروشتی.

ج-جیابوونە لە نێوانیان رویدابێت بە مردن یان بە تەڵاق یان بە جیاکردنەوەی قەزاییانە.

د-عیدەکەی لەو جیابوونەوەدا کۆتایی پێ هاتبێت.

گەر ئەم مەرجانە فەراهەم بوون ڕێگە دەدرێت بە مێردی یەکەم هاوسەرگیری لەگەڵ بکاتەوە گەر هەردوو لایان بە پەسەندیان زانی، چونکە هەریەکەیان بە ئەزموونێکی کرداریدا گوزەریان کردووە، بۆیە پێشبینی دەکرێت هاوسەرگیرییەکەیان دوای ئەو ئەزموونە سەرکەوتوو بێت.

**حیکمەتی ئەم ڕێکارانە:**

١-تەڵاقی سێیەم بە هۆی گەورەبوونی نەیاری نێوان دوو هاوسەرەکە بە ئەنجامێکی چاوەڕوانکراو دادەنرێت، پێدانی بوار بەو ژن و مێردە زیاتر لەوەی خاوەن شەرعی حەکیم پێیداون(تەڵاق دواتر لە ئامێزگرتنەوە ئەوجا لەیەکتر دابڕان پاشان گەڕانەوە و دیسان دەستبەردان لەیەکتر) بێمانییە و بەردەوامبوونی و تەنگەژە و دژوارییەکە سنوورێکی بۆ نییە.

٢-هەڵپەساردنی گونجاویی گەڕانەوە-دوای تەڵاقی سێیەم- بە مێرد کردن بە پیاوی دووەم کۆتوبەندێکی ترە خاوەن شەرعی دانا خستوویەتە پاڵ کۆتوبەندەکانی تر بۆ سەر ویستی تەڵاق، ئەوەش وەك بەرتەسککردنەوەی بازنەکەی.

٣-ئەزموونی ژنەکە لەگەڵ پیاوە نوێیەکەدا لەوانەیە لەبەردەمیدا هەموو ڕاستییەکان ئاشکرا بکات، ئەوکات دروستەکان لە نادروستەکان جیابکاتەوە دوای بەراوردی نێوان دوو ژیانەکەی هاوسەرداری، هەمان شتیش بڵێ تایبەت بە پیاوەکە.

لە کۆتایی ئەم باسەدا دەگەڕێمەوە و دەڵێم بە خوێنەری بەڕێز ئەمانە کۆمەڵێك بنەمای گشتین لە ڕێکارەکانی تەڵاق قورئان بە ڕۆشنی دانیان پیادا دەنێت، ئەو بنەمانە پڕن لە دانایی و تەندروستن و ڕێگە بە پیاو نادەن پەلە بکات و راستەوخۆ و بە بێبایەخترین پاساو پەتی هاوسەرگیری بپسێنێت، ڕێگە نادەن ئەم پەیوەندییە پیرۆزە ڕۆحییە لە تەوەرە دەربچێت مەگەر لە دوای هەوڵێکی زۆر و بێهیوا بوون لە

پێکهاتنەوەیان، خودا بانگ لە پیاوان دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾.[1]

بەڵام جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان ئەوەی قورئان فەرمانی پێکردووە و ئەوەی زۆربەی موسڵمانان لە جیهانی ئیسلامیدا ئەنجامی دەدەن.

بە تاڵاوێکی زۆرەوە –ئێوەش لەگەڵمن– دەڵێم: (ئەم دەستووره مەزنە نەمرە لە پیادەکردنەوە بەسەر زیندووەکاندا گۆڕا بۆ سروتی گۆڕستان و ئاوازی مردووەکان)؟؟؟

**حوکمی هاوسەرگیری تەحلیل(مارە بە چاش):**

ئەم بابەتە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەیە لەگەڵ ئەوەی پێشتر لە کۆتاهاتنی پەیوەندی هاوسەرداری بە تەڵاقی سێیەم و حەرامبوونی ژنەکە و نادروستی تێهەڵکردنەوەی ژیانی هاوسەری مەگەر دوای ئەوەی مێرد بە پیاوێکی تر دەکات.

ئەوەش چونکە تەحلیل: ئەوەیە تەڵاقدراوەکە بە تەڵاقدانی سێیەم جار مێرد بە پیاوێکی تر بکاتەوە لەدوای عیدە بە ڕێکەوتنێك ناوەڕۆکەکەی ئەمەیە: مێردی دووەم لەدوای چوونە لای ئافرەتەکە تەڵاقی بدات تا بۆ مێردی یەکەم حەڵاڵ ببێتەوە بە گرێبەستێکی نوێ.

فەقیهانی موسڵمان لەمەڕ حوکمی ئەم هاوسەرگیرییە جیاوازیان لە نێواندایە، بەم جۆرە:

أ.ئەبو حەنیفە و هاوەڵەکەی محمد دەڵێن گرێبەستەکە بەڕەهایی دروستە یەکسانە مەرجی تەڵاقدان لە گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەدا باسکرابێت یان پێش گرێبەستەکە یاخود باس نەکرابێت، چونکە مەرجەکە پووچە، بەڵام پووچکەرەوە نییە، بینا لەسەر ئەو ئەسڵەیان: (مەرجی تێکچوو کارناکاتە سەر دروستی گرێبەستێك کە تیایدا بە مەرج دەگیرێت) گەر گرێبەستی بریتیدان(معاوضة) نەبوو.

---

[1] النساء: ١٩.

تایبەت بە حەلاڵ بوونی ژنەکە بۆ مێردی یەکەم لە ئەبی حەنیفەوە دوو ریوایەت هەیە: یەکەمیان هاوسەرگیری تەحلیل رەد دەکاتەوە سەرەڕای دروستی هاوسەرگیرییەکە[1]، محمد(هاوەڵی ئەبی حەنیفە) لەسەر نەکردنی هاوسەرگیری تەحلیلە نەك لەبەر پووچی هاوسەرگیرییەکە، بەڵکو لەبەر ئەوەی هاوسەرگیری گرێبەستی تەمەنە، حەلاڵبوونی بۆ مێردی یەکەم کاتێکە مێردی دووەم بمرێت یان تەلاقی بدات بە تەلاقدانێکی ئاسایی، بۆیە بە مەرجی حەلاڵکردنەوە دەبێتە پەلەکەر لە حەلاڵبوون، بۆیە بە رێگری لێی و نەگەیشتنە مەرامەکەی سزا دەدرێت، وەك لە بێبەشبوونی میراتگری بکوژ بۆ میراتلێگیراوەکە لە میرات.

ب-ئیمامی مالیك و فەقیهەکانی[2] و ئیمام ئەحمەد و فەقیهەکانی[3] بە ئاراستەی پێچەوانەی ئەوەی ئەبی حەنیفە رۆیشتوون لە دروستی هاوسەرگیرییەکە بەرەهایی، بۆیە دەڵێن: بەرەهایی هاوسەرگیرییەکی تێکچووە(فاسد) یەکسانە مەرجەکە لە گرێبەستەکەدا باس بکات یان نە، چونکە پەند بە نیەتە و نیەتیش لە هاوسەرگیری تەحلیلدا ئاراستەی کات بۆ دیاریکردن کراوە هەروەها ئاراستەی مەرجی تەلاقدان کراوە، لە فەرموودەیەکدا:

(پێغەمبەر نەفرەتی کردووە لە حەلاڵکەر و بۆحەلاڵکراو)[4]، لەعنەتیش بەڵگەی حەرامبوون و تێکچوونە.

---

[1] ينظر الميزان للأمّام سجيد عبدالوهاب الشعراني (٢/٩٩) وفيه: (قال ابو حنيفة: اذا تزوجها على أن يحلها لمطلقها ثلاثا وشرط أنه اذا وطئها فهي طالق أو فلا نكاح، أنه يصح النكاح دون الشرط، وفي حلها للأول عنده روايتان).

[2] ينظر شرح الموطأ الأمّام مالك (رحمه الله) للقاضي ابي وليد سليمان الباجي (٣/٢٩٨). بداية المجتهد ونهاية المقتصد للأمّام ابن رشد (٢/٠٤٨) شرح الخرشي (ابي عبدالله محمد الخرشي) على مختصر خليل لأبي ضياء سعدي خليل طبعة بولاق (١٣١٧هـ، ٣/٢١٦).

[3] ينظر التاج المنهب شرح متن الازهار في فقه أئمة الاطهار للعلامة احمد بن القاسم العنسي اليماني الصنعاني الطبعة الأولى، (٢/٢٨-٢٩).

[4] عن ابن عباس قال: (لعن رسول الله (ﷺ) المُحَلِّلَ والمُحَلَّلَ له) (ابن ماجة: ١٩٢٤).

ج-" شافیعیەکان [1] و "ابو یوسف" لە حەنەفییەکان[2] و جەعفەریەکان[3] و ظاهریەکان [4]" ئاراستەی درێژەپێدانیان وەرگرتووە، و دەڵێن: گەر مەرج لەگەڵ گرێبەستدا باسکرا دەبێتە تێکچوو(فاسد)، بۆیە ژنەکە بۆ هاوسەری یەکەم حەلاڵ نابێت لەدوای جیابوونەوە، چونکە مەرجێکی تێکچوو و تێکدەرە.

بەڵام گەر باس نەکرێت گرێبەستەکە دروستە و مەرامی حەلاڵکردنەکە دێنێتە دی، گەر لەدوای چوونە لا تەڵاقی بدات، چونکە نیەت کاریگەری نییە لەسەر دروستی و تێکچوونی هەڵسوکەوتەکان.

**پارسەنگدان:**

پارسەنگدراو لە دیدگای منەوە رای ئەوانەیە کە دەڵێن گرێبەستی تەحلیل بەرەهایی تێکچووە، بەم هۆیانە:

١-تەحلیل نەریتێکی نەفامی بوو، ئیسلام لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) رسوای کردووە بە وتنی((خودا نەعلەتی کردووە لە حەلاڵکەر و حەلاڵبۆکراو)) [5]

٢-تەحلیل پێچەوانەی رۆشنی قورئانە لە چەند روویەکەوە، لەوانە:

---

[1] یقول الشافعي (رحمه الله) في كتاب الام (٥/٨٠): (گەر مارەی کرد و نیەتی پیاوی یەکەم و نیەتی ژنەکە و نیەتی پیاودی دووەم ئەوە بوو دەستی بۆ نەبات و تەنها بە ئەندازەیەك بچێتە لای بۆ مێردەکەی حەلاڵ بکاتەوە هاوسەرییەکە جێگیر دەبێت).

[2] ينظر شرح فتح القدير، والجوهرة، والهداية، المراجع السابقة.

[3] ينظر شرائع الاسلام (٢/٣٣)، وفيه: (بەڵام گەر لە گرێبەستەکەدا باسی مەرجەکە نەکرێت و ئەوە لە نیەتیدا هەبێت یان لە نیەتی ژنەکەدا هەبێت یان لە نیەتی سەرپەرشتیاردا گرێبەستەکە تێکنەچووە).

[4] ينظرمعجم فقه ابن حزم الظاهري، (٢/٧٢٥) المحلى لابن حزم (١٠/١٨٠) وفيه: (گەر سێ بەسێ تەڵاقیدا بۆ ئەو کەسەی مارەی دەکات بۆ ئەوەی بۆی حەلاڵ ببێتەوە رێگەپێدراوە گەر بەبێ مەرج هاوسەرگیری لەگەڵ کرد لە هەمان گرێبەستی هاوسەرگیری لەگەڵی...گەر لە گرێبەستەکەدا بەمەرجی گرت کاتێك چووە لای بۆی تەڵاق بدات ئەوە گرێبەستێکی تێکچووە).

[5] عن عليٍّ (ﷺ) قال اسماعيل وإراه قد رفعه الى النبي (ﷺ) أن النبي (ﷺ) قال: (لعن الله المحلِّلَ والمحلَّلَ له) ابو دأود: (١٧٧٨).

أ–سووربوونی تێدایە لەسەر هاوسەرگیری بەر لە کۆتاهاتنی عیدە بە ڕێکەوتنی ژێربەژێری، خودا–ﷻ– دەفەرموێت: ﴿وَلا تَعْزِمُوا عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ﴾.[1]

ب–گرێبەستێکی کاتییە و خەریکە تەڵاق تیایدا یەکلابوویێتەوە لە کاتێکدا ئەوەی لە قورئاندا هاتووە گرێبەستێکی هەمیشەییە و تەڵاقێکە ئەگەری تێدایە، دەفەرموێت:﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا أَن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ﴾.[2]

گەر تەحلیل دروستبوایە قورئان دەیفەرموو: (وإذا طلقها)، چونکە کەلیمەی "إن" لە کارێکدا بەکار دێت شکی تێدا بێت، بەڵام وشەی "إذا" لە کارێکدا بەکاردەهێنرێت دڵنیایی تێدا بێت و یەکلابوویێتەوە.

ج–هاوسەرگیری بۆ بەرژەوەندییەکی ئاشکرایە و بۆ ئامانجێکی بەرز و باڵایە، بۆیە بەکارهێنانی لە تەحلیلدا بەکارهێنانە لە جگە لە حەقیقەتی شەرعی و یاریکردنە بە ئایەتی خودا، خودا–ﷻ– دەفەرموێت: ﴿وَلا تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا﴾.[3]

٣–تەحلیل پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خودایە(ﷺ):

أ.لە "الترمذي" و "مەسنەد"دا لە ئیبن مەسعوودەوە–خوا لێی ڕازی بێت– فەرمووی: ((پێغەمبەر نەفرەتی کردووە لە حەڵاڵکەر و حەڵاڵبۆکراو))[4]

"الترمذي" دەڵێت: ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە، هەروەها لە "مەسنەد"دا لە ئەبی هورەیرەوە–خوا لێی ڕازی بێت– بەرزکراوەتەوە: ((خودا

---

[1] (البقرة: ٢٣٥).

[2] ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا أَن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ (البقرة: ٢٣٠).

[3] (البقرة: ٢٣١). ينظر فتاوى ابن تيمية (٣٣/٦) اعلام الموقعين لابن قيم الجوزية (٣/٤٣).

[4] عن ابن عباس قال: (لعن رسول الله (ﷺ) المُحَلِّلَ والمُحَلَّلَ له) (ابن ماجة: ١٩٢٤).

نـەفرەتی کـردووە لـە حەلالّکـەر و حـەلالّبۆکراو))، دەڵێـت: ئیسـنادەکەی حەسەنە، هەروەها تیایدا هاتووە لە "عەلی"ەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) هەمان فەرموودە ریوایەتکراوە.

ب-لە سونەنی ئیبن ماجەدا لە فەرموودەکەی عوقبەی کوڕی عامرەوە، دەڵێـت: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: ((دەتانـەوێ هـەواڵتان پـێ بـدەم بـە سـابرێنگ(خرت)ی خـوازراو؟ وتیـان: بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: حەلالّکەر، خودا نەفرەتی لە حەلالّکەر و حەلالّبۆکراو کردووە))[1]

ئیبن قیم دەڵێت: (ئەو راویانە لە گەورە هاوەڵانن، شایەتیان داوە بە نـەفرەت لێکردنی خاوەن تەحلیلەکان ئەوانـەش بـریتین لـە حەلالّکـەر و حـەلالّبۆکراو، ئەمەش ئەوەیە خودا هەواڵی دەربارەی داوە و هەواڵێکی راستگۆیە)[2]

ج-لە ئیبن عەباسەوە پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا دەربارەی حەلالّکـەر فەرمووی: نیکاحی رەغبەت نەك نیکاحی درۆ و دەلەسە، گاڵتە بە کتێبی خودا ناکرێت، پاشان تامی شیرینییەکەی بکات[3]

## ٤-پێچەوانەیە بە ئاساری هاوەڵان:

أ-عومەری کوڕی خەتاب-خوا لێی رازی بێت- (حەلالّکەر و حەلالّبۆکراو بهێنرێنە لام رەجمیان دەکەم)

ب-عەلی کوڕی ئـەبی تالـب-خوا لێـی رازی بێـت-: (مەگەڕێنـەوە بـۆی مەگـەر بـە هاوسەرگیرییەك رەغبـەتی تێدا بێـت نـەك دەلەسـە و گاڵتـەکردن بـە کتـێبی خودا)[4]

---

[1] قال عقبة بن عامر: قال رسول الله (ﷺ): (الا أُخْبِرُكُمْ بِالتَّيْسِ الْمُسْتَعَارِ) قالوا: بلى يا رسول الله قال: (هو المحَلِّلَ لعن الله المحَلِّلَ والمُحَلَّلَ له). (ابن ماجة: ١٩٣٦).

[2] اغاثة اللهفان لابن قيم الجوزية (١/٢٨٥).

[3] اغاثة اللهفان (١/٢٨٧).

[4] المرجع السابق (١/٢٨٩).

٥-**پێچەوانەیە بە رای شوێنکەوتووان**: "عبدالرزاق" دەڵێت: "ابن جریج" هەواڵی پێـداین وتـی: وتم بـە "عطـاء": حەلالکەرەکـە تـەلاقی دەدات و مێردەکـەی دەیگێڕێتەوە، وتی: دەبێ لەیەکتر جیابکرێنەوە، "بکر بن عبدالله المزنـی" دەڵێت: (ئەوانە لە سەردەمی نەفامیدا پێیان دەوترا سابرێنگی خوازراو)

٦-**پێچەوانەیە بە بۆچوونی شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوان**: ئیسحاق دەڵێت: بۆی نییە دەستی بۆ ببات، چونکە حەلالکەر گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەی بۆ تەواو نەبووە[1]، ئیمامی مالیك دەڵێت: (لەیەکتر جیادەکرێنەوە)

٧-**نەهاتنەدی حیکمەتی بەمەرامگیراو** لە ئایەتی: ﴿حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ﴾.

ئـەوەش ئەوەیـە تـامی تێکـەلاوی مێـردە تازەکـەی بکـات تـاکو مـافی مێـردە پێشووەکەی بزانێت گەر ژنەکە ناچیزە بوو، هـەروەها تـا پیاوەکـە ژنەکـەی لـەژێر دەسەلاتی پیاوێکی تردا ببینێت کە وەك مێرد مامەڵەی لەگەڵ دەکات، ئـەوەش لـە ناخیدا هاندەری پەشیمانی دروست دەکات گەر ئەو ستەمی لێکرد بوو بە تەلاقـدانی، گـەر جـارێکی تـر بڕیـاری تێهەڵکردنـەوەی هاوسـەری نوێیـان کـرد لـەدوای ئـەوە هەریەکەیان مافی هاوسەرەکەی بە جوانی پارێزگاری لێ دەکات و نیعمـەتی خـودا لـە تێکـەڵ بـوون پێـی دەناسـێتەوە و خۆشەویسـتی نێوانیـان بـەردەوام دەبێـت، ئـەم حیکمەتەش نایەتـە دی گـەر هاوسـەرگیری دووەم هاوسـەرگیری ئـارەزوو و ویسـت نەبێت دوور لە هیچ جۆرە رێکەوتنێکی ژێربەژێری[2]

٨-**هاوسەرگیری کاتییە**: چونکە لەسەر ئەو بنچینەیە کاتێك حەلالکەر تێکەڵ بـە ئافرەتەکە دەبێت راستەوخۆ تەلاقی دەدات، هاوسەرگیری کاتی بە کۆدەنگی پووچ و بێبنەمایە.

٩-**هاوسەرگیری بە مەرجە**: لەسەر حەلالکەر بە مەرج دەگیرێت لـەدوای تێکـەڵ بوون پێی تەلاقی بدات وەك حەلال کردنێك.

---

[1] اغاثة اللهفان لابن قيم الجوزية (١/٢٨٥).

[2] ينظر الاستاذ زكي الدين شعبان، الزواج والطلاق في الاسلام (ص: ١٠٧).

١٠-**هاوسەرگیرییەکە پایەی رازیبوونی تێدا نایەتە دی**، چونکە ژنەکە قبوڵی ناکات و رازی نابێت بەوەی حەڵاڵکەرەکە هاوسەری ئەو بێت بە شێوەیەکی هەمیشەیی.

١١-**قسەی**" شافیعیەکان و جەعفەریەکان و ظاهریەکان " **پێچەوانەیە** لەگەڵ ئایەتی: ﴿وَإِن تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ﴾[1]، هەروەها پێچەوانەیە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ):(انمَا الأعْمَالُ بالنِّيَّاتِ وَانمَا لِكُلِّ امْرِيءٍ مَا نَوَى)[2]

ئیبن قیم دەڵێت: (لای ئەهلی مەدینە و ئەهلی فەرموودە و فەقیهەکانیان جیاوازی نییە لە نێوان بەمەرج گرتنی ئەوە بە قسە یان بە رێکەوتنی ژێریەژێری و مەرام، چونکە مەرام بەهەندوەرگیراوە، و کاروکردەوەکانیش بە نیەتن، وشەکان لە خۆیاندا بەمەبەست نەگیراون بەڵکو بۆ ئاماژەکردنە سەر ماناکانن، بۆیە حوکمەکان لەسەر ماناکان سەرهەڵدەدەن[3]

گەر ماناکان و مەرامەکان دەرکەوتن ئەوا پەند بە وشەکان نییە، چونکە ئامرازگەلێکن و مەرامەکانیان هاتوونەتە دی.

---

[1] (لِّلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِن تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (البقرة:٢٨٤).

[2] صحيح البخاري: (١).

[3] ينظر زاد المعاد المرجع السابق (٤/٦).

# بەشی دووەم:
# داڕشتنی گوزارەی تەڵاق

بوارەکانی، هاوملبوونی بە ژمارە، هەڵپەساردن، و سوێندخواردن پێی.

لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتانە بە سەر سێ باسدا دابەش دەکەین:

باسی یەکەم: بواری داڕشتن(گوزارە)ی تەڵاق.

باسی دووەم: حوکمی داڕشتنی تەڵاق

باسی سێیەم: حوکمي هەڵپەساردن لە داڕشتنی تەڵاق.

# باسی یەکەم:
# بواری دارشتنی گوزارەی تەلاق

فەقیهانی موسڵمان لەسەر ئەوە رێکەوتوون دارشتنی تەلاق لەرووی گوزارەوە یان نووسینەوە یان ئاماژەوە پایەیەکە لە پایەکانی تەلاق، بەڵام لەگەڵ ئەوەش جیاوازیان لە نێواندا هەیە لەرووی بەرتەسککردن و بەرفراوان کردن لەم چوار لقەدا:

## لقی یەکەم:
## دارشتنی گوزارەی تەلاق لە بەرتەسکترین سنووریدا

فەقیهانی شێعەی ئیمامی دارشتنی گوزارەی تەلاقیان لە بازنەیەکی بەرتەسکدا کورتکردۆتەوە و لە دەرەوەی ئەوە دانیان بە کەوتنی تەلاقدا نەناوە.

"الطوسي"[1] لە کتێبی "الخلاف"دا[2] دەڵێت: (راشکاوی تەلاق یەك گوزارایە ئەوەش وتنی "تۆ تەلاقدراوی" یان "ئەو تەلاقدراوە" یان "فلانە کەس تەلاقدراوە" لەگەڵ هاوتابوونی نیەت لەگەڵی، گەر لە نیەتەکە دابرنرا هیچ شتێکی پێ ناکەوێت، گوزارەی ناراشکاو هیچ شتێکی پێ ناکەوێت نیەتی لەگەڵ بێت یان لەگەڵ نەبێت).

"المحقق الحلي"[3] دەڵێت: (لە شەریعەتی ئیسلامدا[4] دەبێ بوترێت: "فلان ئافرەت تەلاقدراوە" یان ئاماژەی پێ بکات بە جۆرێك ئەگەری تێدا هەڵبگیرێت، گەر

---

(1) الأمام ابو جعفر محمد بن الحسن بن علي الطوسي.

(2) الخلاف في الفقه الطبعة الثانية مطبعة تابان/طهران ١٣٨٢هـ ٢/٢٣١.

(3) هو جعفر بن الحسن بن أبي زكريا يحيى بن الحسن بن سعيد الملقب بالمحقق وبالمحقق الحلي (٦٠٢-٦٧٦هـ).

(4) ٢/٥٤-٥٥.

تـەنها یـەك ژنـی هـەبوو بڵێـت: "ژنەکـەم تەڵاقـدراوە" دروسـتە بـەهۆی هـەڵگرتنی ئەگەرەوە... بۆیە داڕشتنی وەرگیراو بۆ سڕینەوەی کۆتوبەندی هاوسەرگیری بریتییە لە: (تۆ تەڵاقدراوی، یان فلان ئافرەت تەڵاقدراوە، یان ئەم ئافرەتە تەڵاقدراوە) ئەمانە و هاوشێوەکانی ئەمانە لە گوزارەی ئامازە بە دیاریکردنی تەڵاقدراوەکە).

لە " المختصر النافع[1]": (پایەی سێیەم بریتییە لە داڕشتن، کورت دەبێتەوە لـە گوزارەی "تەڵاقدراوی" وەك بەدەستهاتوو بۆ شوێنی ڕێکەوتنەکە)

" العاملی[2]" لە "الروضة البهیـة شـرح اللمعـة الدمشـقیة" دەڵێـت: (گوزارەیـەکی ڕاشکاو لە داڕشتن: (تۆ، یان ئەمە، یان فلان ئافرەت–ناوی دەهێنێت کە ئامازە بکات بە دیاریکردن– یان ژنەکەم تەڵاقدراوە) لەلای ئێمە لەم گوزارەدا کورت دەبێتەوە).

هەروەها دەڵێن: تەڵاقی لاڵ بە ئامازەیەکی حاڵیبوون لە مێردەکەوە، هەروەها بە هەڵدانی ڕووپۆشێك(دەمامك) بەسەر سەریدا بۆ ئەوەی ئامازە بێت بە پێویسـتبوونی خۆ داپۆشین لە ژنەکەوە[3].

ئەوان پێیانوانییە تەڵاق بە نووسـین بکـەوێت بـەبێ گـوزارە لەلایـەن کەسـێکەوە بتوانێت بە زمان گوزارە لێ بدات، یەکسانە نووسەرەکە ئامادە بێت یان بزر و نادیـار بێـت، ئەمــەش بەناوبانگترینــە لــەلای فــەقیهان بــەهۆی بنــەڕەتیبوونی مانــەوەی هاوسەرگیرییەوە، لە "محمد بن مسلم"ەوە لە "الباقر"ەوە: (تەڵاق ئەوەیە بوترێت: تۆ تەڵاقدراوی) بەڵام گەر نەیتوانی بە زمان دەریببڕێت بینوسێت و نیەتی تەڵاق بێت دروستە[4].

تەڵاقیان بە گوزارەی ناڕاشکاو ڕەد کردۆتەوە، بۆیە دەڵێن: هیچ شتێك لە تەڵاقی پێ ناکەوێت یەکسانە ئاشکرا بێت یان شـاراوە، هـەروەها یەکسـانە مەبەسـتی پێـی

(1) ص٢٢٢.

(2) الشهید السعید زین الدین الجبعي العاملي ١٤٧/٢.

(3) الروضة البهیة ١٤٧/٢.

(4) شرائع الاسلام المرجع السابق ٥٥/٢.

تەڵاق بێت یان نە[1].

دەرئەنجام: تەڵاق لەلایان بە رستەیەك دەكەوێت تیایدا ژنەكە دیاریكرابێت وەك ناوەكەی یان جێناوەكەی یان ئاماژە هەروەها لەگەڵ وشەی "تەڵاقدراوە" لەسەر ئەوەی نیەتی تەڵاق لەلای مێردەكە ئامادە بێت لە كاتی دەربڕینی گوزارەكەدا.

ئاماژەیان بە زۆر بەڵگە كردووە گرنگترینیان ئەمانەن:

١-كۆدەنگی ئەو دەستەیە و هەواڵەكانیان.

٢-تەڵاق حوكمێكی شەرعییە ئاتاجە بە بەڵگەیەكی شەرعی تاكو بە شێوەیەكی راشكاوانە ئاماژە بكات پێی، لە شەرعدا شتێك بوونی نەبێت ئاماژە بكات بە شتێك جگە لە ئەوە.

٣-بۆگەڕاوە(مرجع) لەوەدا ئەوەیە خەڵكی پێی ئاشنان و لەسەری راهاتوون، خەڵكیش تەنها بە وشەی "تەڵاق" ئاشنابوون و بارهاتوون.

٤-راشكاو ئەوەیە تەنها یەك مانا هەڵبگرێت یان دوو مانا هەڵبگرێت كامەیان ئاشكراتر و نزیكتر بوو پێی ئەوەیان دەبینرێتەوە، هەموو گوزارەكان جگە لە گوزارەی تەڵاق دوو مانا و بەرەو سەر هەڵدەگرن لە یەك رادەدا[2].

٥-پەند بە وشەی "السراح" و "الفراق" نییە با ئەو وشانەش لە قورئاندا بۆ تەڵاق بەكارهێنرا بن، وەك لە ئایەتی: ﴿أو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ و﴿أو فَارِقُوهُنَّ﴾ چونكە لە كاتی بەكارهێناندا تەڵاقیان پێ ناكەوێت ئەو دوو وشەیە ناڕاشكاون بۆ تەڵاق و راشكاوییان تێدا نییە، بۆیە گوزارشت بەو دوانە نابێتە بەڵگە لەسەر كەوتنی تەڵاق پێیان.

٦-بنەڕەت مانەوەی هاوسەرگیرییە تا لەڕووی شەرعەوە سڕانەوەی دەسەلمێت، چونكە جگە لە وشەی "تەڵاق" بەو جێگیرە لێكنادرێتەوە كە ئەم بنەڕەتە دەسڕێتەوە[1].

---

[1] الخلاف في الفقه المرجع السابق ٢/٢٣٢.

[2] الخلاف في الفقه المرجع السابق، ٢/٢٣١-٢٣٢.

بۆ ئەم دیاریکردنە لەلایەن فەقیهانی ئیمامییەکانەوە گرنگی گەورە هەیە بۆ بەرتەسککردنەوەی بواری رووداوی تەلاق، ئەوە کۆتوبەندێکە ویستی پیاو سنووردار دەکات، بەلام هەندێ تێبینی رووبەڕوو دەکرێتەوە:

١-ئەو گوزارانە تەنها لە جیهانی عەرەبیدا دەتوانرێت شان بدرێتە ژێریان، یان بۆ کەسێك شارەزای بەکارهێنانی هەبێت، چونکە هەر گەل و نەتەوەیەك هاوسەرگیری و تەلاقی خۆیان بە زمانی تایبەتی خۆیان هەیە گەر وشەکە ئاماژە بێت بە مەبەستەکە.

٢-لە بەلگەکانیان ئاشنایی خەلکە لەسەر وشەی "تەلاق" ئەمەش ئامازە بەوە دەکات هەر وشەیەکی تر خەلك پێی ئاشنابوون دروستە تەلاقی پێ بدرێت، لەگەلّ ئەوەش ئەوان لەم بوارەدا عورف بەهەند وەرناگرن.

## لقی دووەم:

## کورتکردنەوەی دارشتن لە "طلاق و فراق و سراح" و داتاشراوەکانیاندا

فەقیهانی زاهیری دارشتنی گوزارەی تەلاقیان لە چەند گوزارەیەکی دیاریکراودا کورتکردۆتەوە، و لەلایان تەلاق تەنها بەوانە دەکەوێ، ئەوانەش بریتین لە "طلاق و سراح و فراق" و داتاشراوەکانی ئەمانە لە فەرمانی رابردوو و رانەبردوو، یان "إسم فاعل" یان "إسم مفعول"، وەك: (أنت طالق أو مطلقة، أو طلقتك، أو أنت طلاق. أو أنت مسرحة، أو سرحتك، أو أنت السراح، أو أنت مفارقة، أو فارقتك، أو أنت الفراق)

سەرباری کۆتوبەندکردنی ویستی پیاوەکە بەوەی لە سنووری ئەم گوزارانە دەرنەچێت لێیان بە مەرج گرتووە نیەتەکەی لە کاتی بەکارهێنانی گوزارەکەدا

---

(١) الروضة البهية المرجع السابق، ١٤٧/٢.

ئاراستەی کۆتاهێنانی پەیوەندی هاوسەرداری کرابێت، گەر گوزارەکە هاوملی ئەم نیەتە نەبێت تەڵاق ناکەوێت.

بینا لەسەر ئەوە دەڵێن: گەر پیاوەکە وتی: نیەتم تەڵاق نەبووە بە رەهایی لە فتوادا لێی وەردەگیرێت، بەڵام لە قەزادا و لەدوای ناکۆکی و نەیاری گەر داڕشتنی گوزارەی "تەڵاق" یان گوزارەیەکی تر لە داتاشرلوەکانی بەکارهێنا ئەوا بانگەشەی نەبوونی مەبەست بۆ کەوتنی تەڵاقی لێ قبووڵ ناکرێت، چونکە ئەم گوزارارەیە(تەڵاق) لە زاراوەی شەرعدا تەنها بۆ هەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەریی بەکاردەهێنرێت.

بەڵام گەر گوزارەکە یەکێك لە گوزارەکانی (السراح و الفراق) و داتاشراوەکانی ئەمانە بوو ئەوا ئەو بیانووەی لەڕووی قەزاوە لێ قبووڵ دەکرێت، چونکە ئەم گوزارانە لە یەك کاتدا بۆ هەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەریی و مانای تریش بەکاردەهێنرێن[1]..

ئیبن حەزمی زاهیری بەرگری کردووە لە کورتکردنەوەی داڕشتنەکە لەو گوزارە باسکراوانەدا هەروەها بەرگری کردووە لە بە مەرجگرتنی نیەتی هاومل بە داڕشتنەکە، هەر بەو جۆرە بایەخنەدان بەو داڕشتنانەی فەقیهانی تر بەکاریان دەهێنن بە بەرگرییەکی دوورودرێژ لە کتێبەکەیدا "المحلی" کە دەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورتیان بکەینەوە:

أ.ڕووی هەڵبژاردنی ئەو گوزارانە هاتنیانە لە قورئاندا بە مانای پسان و پچڕانی گرێبەستی هاوسەریی، خودا ـﷻـ دەفەرموێت: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ﴾[2]. ﴿وَإن

[1] المحلی ١٠/١٨٥ وما بعدها.

[2] (الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلَّا أَن يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِن خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (البقرة:٢٢٩).

طَلَّقْتُمُوهُنَّ﴾[1] ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[2] ﴿وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ﴾[3]. ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾[4]. ﴿فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً﴾[5]. ﴿فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ﴾[6]. ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾[7]. ﴿وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ اللَّهُ كُلاًّ مِنْ سَعَتِهِ﴾[8].

ب–بە مەرجگرتنی نیەت لە تەڵاقدا پیادەکردنی ڕێسا شەرعییە گشتییەکەیە کە لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) جێگیر بووە: ((انمَا الأعْمَالُ بالنِّيَّاتِ وَانمَا لكلِّ امْرِيءٍ مَا نَوَى)).

ج–بایەخ نەدان بە گوزارەکانی تر جگە لەو گوزارانەی لە قورئاندا هاتوون نە لەگەڵ نیەت و نە بەبێ نیەت، نە لە فتوادا و نە لە قەزادا، چونکە حەرامکردنی حەڵاڵکراو بە حوکمی خودا و حەڵاڵکردنی حەرامکراو بە حوکمی ئەو–ﷻ– بە گوزارەی دارشتنێك دروست نییە گەر بە دەق جێگیر نەبووبێت، وەك

---

(1) (وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّا أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ وَأَن تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَلَا تَنْسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ أَن اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ) (البقرة:٢٣٧).

(2) (يَا أَيُّهَا النبي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً) (الطلاق:١).

(3) (وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ) (البقرة:٢٤١).

(4) (البقرة:٢٢٩).

(5) (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً) (الأحزاب:٤٩).

(6) (يَا أَيُّهَا النبي قُلْ لِأَزْوَاجِكَ أن كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً) (الأحزاب:٢٨).

(7) (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجاً) (الطلاق:٢).

(8) (وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ اللَّهُ كُلاًّ مِنْ سَعَتِهِ وَكَانَ اللَّهُ وَاسِعاً حَكِيماً) (النساء:١٣٠).

گوزارەكانی: "خلیة، وبریة، وانت مبرأة، وبارأتك، وحبلك علی غاربك، الحقي بأهلك" ئەمانە و گوزارەگەلێكی تر كە ئاساری جۆراوجۆری لە فتوادا لەسەر هاتووە، ئەوانە نە لە قورئان و نە لە سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) جێگیر نەكراون و بەڵگەش بۆ جگە لەو دوانە بوونی نییە.

پاشان ئیبن حەزم دەڵێت: سەرقاڵبوون بە گوزارەگەلێكەوە كە فتوای فەقیهانی وڵاتان بە بۆچوونی خۆیان هێناویانە مانای تێدا نییە، چونكە جیابوونەوەی هاوسەری پیاوی موسڵمان حەڵاڵ ناكەن، حەڵاڵ كردنی ژنی موسڵمانە بۆ كەسانێك بەدەر لەوانەی خودا بۆی موباح كردوون، ئەمە تەنها لە كەسێكی چاولێكەری گومڕا بە چاولێكەرییەكەی و بەكاریەرێكی تیاچوو دەوەشێتەوە.

هەروەها دەڵێت: ئەو گوزارانەی لە پێغەمبەری خوداوە گوازراونەتەوە ناكرێنە بەڵگە بەهۆی نەبوونی متمانە بە راوییەكەی، یان بەهۆی لەرزۆكی ریوایەتەكەوە یان بە هۆی نەبوونی تێگەیشتن لە مەرامی ریوایەتكراوەكە.

بۆ نموونە: لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ریوایەتكراوە كە لە تەڵاقدانی " الجوینیة بنت الجون"دا فەرموویەتی: (الحقي باهلك)، ئیبن حەزم دەڵێت: بەڵگەی تێدا نییە، چونكە پێغەمبەر(ﷺ) هاوسەرگیری لەگەڵ نەكردبوو تا تەڵاقی بدات، هەروەها لەبەر ئەوەی هیچ ئافرەتێكی تەڵاق نەداوە جگە لە حەفصە –خوا لێی رازی بێت– ئەویش تەڵاقیدا و گێڕایەوە[1].

**هەڵسەنگاندنی رای زاهیرییەكان:**

لە دیاریكردنی گوزارەكانی داڕشتنی تەڵاق و بەمەرجگرتنی نیەت گرنگی گەورە هەیە لە كەمكردنەوەی ڕوودراوەكانی تەڵاق، بەڵام هەمان رەخنەی ئاراستەكراو بۆ شێعەی ئیمامی ئاراستەی ئەمانیش دەكرێت، لە بایەخنەدان بە عورفی دروستی باو و پشتگوێخستنی ڕۆشنكردنەوەی حوكمی داڕشتنی تەڵاق جگە لە زمانی عەرەبی، گەر

---

[1] ینظر المحلی ١٨٦/١٠.

بۆچوونی زاهیرییەکان(یان ئیمامییەکان) وەربگرین دارشتنی گوزارەی تەڵاق وەك وشەکانی سورەتی "الفاتحة"ی لێ دێت، نوێژ دروست نییە گەر سورەتی "الفاتحة" بە زمانی عەرەبی تیایدا نەخوێنرێت، هەر بەو جۆرە تەڵاقی کەسی نا عەرەب -وەك کەسی عەرەب- ناکەوێت لە ڕێگەی یەکێك لەو زاراوە باسکرلوانەوە نەبێت، خودا -ﷻ- دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾.

## لقی سێیەم:

## دارشتنی تەڵاق هەموو راشکاوێکی رەهایە هەروەها هەموو ناڕاشکاویەک لەگەڵ نیەتدا

جمهووری فەقیهانی حەنەفی و زۆربەی مالیکییەکان و شافیعییەکان و حەنبەلییەکان و زەیدییەکان و ئیبازییەکان بۆ ئەوە دەچن دارشتنی تەڵاق بریتییە لە هەر گوزارەیەکی راشکاو لە تەڵاقدا یەکسانە لەگەڵ نیەتی پچڕانی گرێبەستی هاوسەریدا بێت یان بەبێ ئەو نیەتە، هەروەها هەموو نووسینێك (نووسینی گوزارەی تەڵاق) لەگەڵ بوونی نیەت.

ئەم پوختەیە برێکی هاوبەشە لە نێوان هەمواندا، بەڵام لە درێژەپێداندا جیاوازیان لە نێواندا هەیە وەك لەم رۆشنکردنەوەدا:

### حەنەفییەکان

دارشتنی تەڵاقیان بۆ راشکاو و ناڕاشکاو دابەش کردوەو بۆ هەریەکەیان پێوەرێکیان داناوە:

**أ. پێوەری راشکاو:**

بریتییە لە زاڵبوونی بەکارهێنانی وشەکە لە تەڵاقدا یەکسانە ئەو بەکارهێنانە راستەقینە بێت یان مەجازی، زمانەوانی بێت یان عورفی، دەقێك لەسەری هاتبێت یان

نە، وتنی پیاوەکە: (الحرام یلزمني، أو عَلَيَّ الحرام –حەرام پابەندم دەکات(پێمەوە بەندە)، یان حەرامە لەسەرم)، تەڵاقی پێ دەکەوێت بەبێ نیەت بەهۆی زاڵبوونی بەکارهێنانی عورفییەوە تیایاندا، لە کاتێکدا گوزارەکانی "السراح و الفراق" و داتاشراوەکانیان کە لە قورئاندا هاتوون تەڵاقیان پێ ناکەوێت مەگەر نیەت لەگەڵیان بێت لەبەر فەراهەم نەبوونی زاڵی بەکارهێنانیان بۆ تەڵاق.

لە "المبسوط"دا هاتووە: (گەر بە ژنەکەی بڵی "سرحتك" یان "فارقتك" نیەتی تەڵاق نەبێت لەلای ئێمە شتێك لە تەڵاق ناکەوێت)[1].

لە " الدر المختار شرح تنویر الأبصار"دا هاتووە: (لە گوزارە بەکاربراوەکان: "الطلاق یلزمني، والحرام یلزمني، وعليّ الطلاق، وعليّ الحرام" تەڵاقیان پێ دەکەوێت بەبێ نیەت بەهۆی عورفەوە)[2].

"الزیلعي" دەڵێت: (ئاشکرا ئەوەیە مەرامی بە ڕۆشنی تێدا دەربکەوێت تا وای لێ دێت ببێتە "پەردەلەسەرلادراو"ی مەرامەکە بە جۆرێك تەنها بە بیستنی لەلایەن گوێگرەوە تێگەیشتنی ئەو مەرامەی بۆ دروست ببێت جا لەڕووی حەقیقەتەوە بێت یان لەڕووی مەجازەوە)[3].

حوکمی ڕاشکاو لەلایان تەڵاقی پێ دەکەوێت بەبێ نیەت[4].

---

[1] ینظر المبسوط للسرخسي ٧٧/٦، ٧٨. وفیه: (لەلای شافیعی تەڵاقەکە دەکەوێت–واتە بەبێ نیەت– ئەو دوانە لەلای ئەو ڕاشکاون چونکە لە قورئاندا هاتوون، بەڵام دەڵێین: ڕاشکاو ئەوەیە تایبەتکرابێت بە دلنەپالی بۆ لای ئافرەتان و لە جگە لە هاوسەریی بەکارنەهێنرێت، ئەمەش لەو دوو گوزارەدا نابینرێتەوە، چونکە پیاو دەڵێت: "سرحت إبلي و فارقت غریمي–حوشترەکەم بەرەڵاکرد و لە نەیارەکەم جیابوومەوە" هەروەك وشە ناڕوونەکانی تر تەنها بە نیەت تەڵاقیان پێ دەکەوێت).

[2] الدر المختار شرح تنویر الابصار مع حاشیة ابن عابدین ٢٥٢/٣.

[3] تبیین الحقائق شرح کنز الدقائق للزیلعي.

[4] یرلجع البحر الرائق ١٦٩/٣. شرح فتح القدیر ٤٤/٣. الدر المختار شرح تنویر الأبصار ٢٥٢/٣.

**ب- پێوەری ناڕاشکاو:**

بریتییە لە هەر گوزارەیەك مانای تەڵاق و هاوواتاكانی تەڵاق بگەیەنێت، تەڵاقی پێ دەكەوێت بە تەڵاقی بائین وەك: "الحقي بأهلك، أنت خلية بتة"، "السرخسي" دەڵێت: (هەندێ لە مامۆستاكانمان لە پاشین ئەم گوزارانە بە ناڕاشكاو ناودەبەن، ئەوانە رێگەپێدراون، چونكە ئەم وشانە بۆ راستەقینەی داواكارییەكانیان بەكاردەهێنرێن، بۆیە تەڵاقێكی بائینی پێ دەكەوێت)

لەو رێسایە سێ گوزارە جیادەكرێتەوە كە تەڵاقی پێ دەكەوێت بە تەڵاقی رجعی، ئەو سیانەش:" اعتدي، استبرئي رحمك. أنت واحدة–عیدە بگرە، رەحمت بەریبكە، تۆ یەك تەڵاقت كەوتبێت(یان تۆ تەنها كەوتووی)"، تەڵاق بە گوزارەی ناڕاشكاو ناكەوێت مەگەر نیەتی لەگەڵدا بێت، یان شتێك لە نیمچەبەڵگە(ئاماژە) لە جێگەی ئەو راستببێتەوە[1]، رۆشنكردنەوەی ئەوە: حاڵەتی بەكارهێنانی ناڕاشكاو لەم سیانە بەدەر نییە:

١–حاڵەتی رازیبوون و دەستپێشخەری پیاوەكە بە تەڵاق.

٢–حاڵەتی یاداشتی تەڵاق و داواكردنی.

٣–حاڵەتی تووڕەبوون و نەیاری و ناكۆكی.

**بەشەكانی ناڕاشكاو تایبەت بە تێگەیشتنەكانی سیانن:**

١–تەنها گونجاوە بۆ وەڵامی پرسیاری تەڵاق، وەك: (كارەكەت بەدەست خۆتە) واتە لە كار و لە تەڵاقدا.

٢–گونجاوە بۆ وەڵام و رەدكردنەوەی، وەك: (دەرچۆ لەلام) واتە لەبەرئەوەی تەڵاقمداوی یان داوای تەڵاق مەكە.

٣–گونجاوە بۆ وەڵام و جنێو، وەك: (تۆ خاڵیبوویتەوە) واتە لە هاوسەری خاڵیبوویتەوە یان لە ئەدەب خاڵیبوویتەوە.

---

[1] یراجع بدائع الصنائع ٢/١٠٦.

گەر ئەم بەشانە بەو حاڵەتانە بەراورد پێ بکەین:

١- لە حاڵەتی یەکەمدا نیەت پێویست دەبێت لە هەموو بەشەکاندا بەهۆی هەڵدانی بۆ سەر تەڵاق و جگە لە تەڵاق.

٢- لە حاڵەتی دووەمدا نیەت پێویست نابێت تەنها لە بەشی دووەمدا نەبێت لەبەر نەبوونی هەڵدان لە یەکەم و سێیەمدا

٣- لە حاڵەتی سێیەمدا نیەت لە یەکەمدا پێویست نابێت بە هەمان هۆ.

حوکمی راشکاو لای حەنەفییەکان: تەڵاقی پێ دەکەوێت یان ئەوەی لە جێگەی ئەو دادەنیشێت.

**مالیکییەکان:**

مەزهەبی ئیمام مالیك(رەحمەتی خودای لێ بێت) -بەپێی ئەوەی لێی وردبوومەتەوە- لە هەموو مەزهەبەکان زیاتر لەرزۆکی و دژیەکی تێدایە لە بیروڕاکانی تایبەت بە دارشتنی گوزارەی تەڵاق، هەیانە دەستی بردووە بۆ ئەوپەڕی سنووری بەرتەسککردنەوەی دارشتنی گوزارە، هەشیانە دەستی بردووە بۆ ئەوپەڕی سنووری بەرینکردنی دارشتنی گوزارە.

بەناوبانگ(مەشهوور) لەلایان: گوزارەی راشکاو کە گرێبەستی هاوسەرگیری پێ دەپچڕێت(پێ هەڵدەوەشێتەوە) نەك گوزارەکانی تر ئەوەیە کە دوو مەرجی تێدا بێت: مادە(پیت)ی (ط، ل، ق) لە گوزارەکەدا، هەروەها دانانی عورفی کە دارشتنەکە لە هەواڵەوە دەگوێزێتەوە بۆ دانان(سەرپێهەڵدان)، وەك: (أنت طالق-تۆ تەڵاقدراوی).

لە "بدایە المجتهد"دا هاتووە: (مالیك و هاوەڵەکانی دەڵێن: راشکاو تەنها بریتییە لە وشەی تەڵاق، جگە لەو وشەیە هەموو وشەکانی تر ناڕاشکاون، لەلای ئیمام مالیك دوو جۆرن: ئاشکرا و هەڵدراو)[1].

لە "الفروق"دا: ("تۆ تەڵاقدراوی" مانای تەڵاق دەگەیەنێت بە دانانی عورفی)[1].

---

[1] بدایة المجتهد ونهایة المقتصد لابن رشد ٢/٦١.

بەڵام فەقیهانی مالیکی گوزارەکانی داڕشتنی تەڵاقیان لەڕووی ئاماژەوە بۆ سەر ژمارەی تەڵاقەکان دابەش کردووە بۆ پێنج بەش[2]:

١-ئەوەی تەنها یەك تەڵاقی پێ پێویست دەبێت گەر پیاوەکە نیەتی لەوە زیاتر نەبێت، وەك : تۆ تەڵاقدراوی، یان ئەوا تەڵاقمدای.

٢-ئەوەی سێ تەڵاقی پێ پێویست دەبێت گەر نیەتی خوار سێ تەڵاق نەبێت(دوو و یەك) یەکسانە چووبێتە لای ژنەکە یان نەچووبێت، وەك: پەتت لەسەر شانتە(حبلك على غاربك)

٣-ئەوەی سێ تەڵاقی پێ پێویست دەبێت لەگەڵ نیەتی تەڵاق لەوانەی نەچوونەتە لایان وەك وتەی پیاوەکە بە ژنەکەی: "أنت ككلبة أو كالدم أو وهبتك أو رددتك لأهلك" مەگەر بڵێت نیەتم هێنا کەمتر لە سێ بێت ئەوا لەو بارەدا ئەوەی نیەتی لێهێناوە بۆی پێویست دەبێت، بەڵام گەر پیاوەکە چووە لای ژنەکە و بە یەکێك لەم گوزارانە قسەی لەگەڵ کرد ئەوە سێی پێ پێویست دەبێت، گەر بانگەشەی ئەوەی کرد نیەتی کەمتر لەوە بووە قسەکەی بەڕاست نازانرێت، چونکە سێی پێ پێویست بووە.

٤-ئەوەی سێی پێ پێویست دەبێت لەگەڵ نیەتی تەڵاق لەوانەی چوونەتە لایان و کەسانی تریش وەك: "خليت سبيلك أو ادخلي الدار، أو الحقي بأهلك، أو تستري، أو أخرجي-ڕێگەم پێداوی، یان بچۆ ژوورەوە، یان بچۆرەوە بۆ لای خانەوادەکەت، یان خۆت لێم داپۆشە، یان بچۆ دەرەوە"

٥-ئەوەی نیەتی لێهێناوە لە ژمارەی تەڵاق دەکەوێت، وەك: برۆ و پشتهەڵکە(برۆ و لەبەرچاوم ونبە)[3].

---

[1] الفروق للقرافي ٣٨/١. حاشية العدوي ٤٣/٤.

[2] ينظر شرح الخرشي للأمّام سيدي ابي عبد الله محمد الخرشي على مُختصر خليل للأمّام ابي ضياء سيدي خليل، طبعة بولاق ١٣١٧هـ٤٣/٤.

[3] شرح الخرشي المرجع السابق ٤٣/٤-٤٤.

لە لقی چوارەمدا بۆچوونەکانی تری مالیکیەکان کە زیاتر لەمەیە بۆی دەچن دەخەینە روو.

وا دەردەکەوێت: ئەم فەقیهانە لە ژینگەیەکدا ژیاون عورفەکەی دلوای ئەوەی کردووە(واتە ئەو گوزارانە) کە ئەوان لە ئیجتیهادەکانیاندا رایانگەیاندووە، بە بەڵگەی ئەوەی لە "تهذیب الفروق"دا هاتووە لەوەی پابەندکردنی گرێبەستەکان لە تەڵاق و شتانی تر لە فتوادا لەسەر نیەتی قسەکەر یان لەسەر عورفەکەی بینا دەکرێن، نەك لەسەر زمان و عورفی کەسانی تر، بەڵام لە قەزادا بەهۆی ناکۆکی کەسانی تر لەگەڵی لەسەر عورفی کەسەکە بینا دەکرێت نەك لەسەر نیەتی[1].

شافیعییەکان:

بەناوبانگ لەلایان: راشکاو بریتییە لە "الطلاق و السراح و الفراق" و داتاشراوەکانی ئەمانە.

لە "الأم"دا هاتووە: (شافیعی-رەحمەتی خودای لێ بێت- دەڵێت: خودا لە کتێبەکەیدا تەڵاقی بە سێ ناو ناوهێناوە: "الطلاق و الفراق و السراح")[2].

هەروەها لە "المهذب"دا[3] هاتووە: (راشکاو سێ وشەیە: "الطلاق" ئەمەیان بە عورفی شەرع و زمان جێگیر بووە، "السراح" و "الفراق" بە عورفی شەرع جێگیر بوون، گەر بڵێت بە ژنەکەی: "طلقتك أو سرحتك أو فارقتك" تەڵاقەکەی دەکەوێت بەبێ نیەت، گەر بانگەشەی لە زمان دەرچوون(لە دەم دەرچوون) بکات لەڕووی قەزاییەوە قبووڵ ناکرێت، چونکە بانگەشەی پێچەوانەی ئاشکرا و دیار دەکات و لە نێوان خۆی و خودادا قەرزدار دەبێت)

[1] تهذيب الفروق هامش الفروق ١/٣٩.
[2] الأم للشافعي ٥/١٩٧.
[3] المهذب لابي اسحاق الشيرازي ٢/٨٢.

شافیعییەکان راشکاوی تەڵاقیان بەرین کردووە دوای دابەشکردنی بۆ راشکاو لە خۆیدا و راشکاو بە جگە لە خۆی، بۆیە دەڵێن: راشکاو پێنج وشەیە: "الطلاق، والفراق، والسراح، والخلع، والمفادة" لەگەڵ باسی دارایی یان نیەتەکەی، هەروەها وشەی "بەڵێ" گەر لە وەڵامی پرسیاری تەڵاقدا هاتبوو لەگەڵ مەبەستی هەولی سەرهەڵدانی تەڵاق[1]، لە نامەشهووردا وشەی "السراح و الفراق" ناڕاشکاون.

حوکمی راشکاو ئەوەیە تەڵاقی پێ بکەوێت بەبێ نیەت[2].

ناڕاشکاویش: بریتییە لە هەر گوزارەیەك هەڵبدرێتە سەر تەڵاق و گوزارەکانی تری تەڵاق، ئەمانە تەنها لەگەڵ نیەتدا تەڵاقیان پێ دەکەوێت[3].

لە هاوملبوونی نیەتدا جیاوازیان لە نێواندا هەیە: لە "المهذب"دا[4] هاتووە: (هەیانە دەڵێت گەر نیەت هاوملی هەندێ گوزارە بوو لە سەرەتایەوە یان لە کۆتاییەوە تەڵاق دەکەوێت، هەشیانە دەڵێت: دروست نییە تا نیەت لەگەڵ کۆی گوزارەکاندا هاومل نەبێت، ئەوەش ئاشکرای دەقە، چونکە هەندێ گوزارە بۆ تەڵاق شیاو نییە)

لەوەی باسکرا حاڵی دەبین بواری داڕشتنی تەڵاق لای شافیعییەکان–لەسەر بەناوبانگ– بەرینترە لەوەی جمهووری مالیکی، چونکە ئازادی ویستی تەڵاق لە داڕشتندا لەلایان زۆرترە.

**حەنبەلییەکان:**

حەنبەلییەکان لەگەڵ جمهووری مالیکیدا لە پێوەری راشکاوی تەڵاقدا هاوڕان لە بەمەرجگرتنی ماوەی تەڵاق و دانانی عورف، لە "الاقناع[5]"دا هاتووە: (راشکاو ئەوەیە جگە لە خۆی مانای تری نییە، راشکاوی بریتییە لە وشەی "تەڵاق" و ئەوەی لەوەوە

---

[1] یراجع حاشیة الباجوري علی شرح الغزوي ٢/١٤١.
[2] المرجع السابق ٢/١٤١. نهایة المحتاج ٦/٤١٦.
[3] یراجع المهذب ٢/٨٢.
[4] المرجع السابق.
[5] الاقناع ٣/٩.

داتاشراوە، جگە لە فـەرمانی داخـوازی وەك "طلقـي" هـەروەها فـەرمانی رانـەبردوو وەك"أطلقك" هەروەها وشەی "مطلقة" وا دەردەکەوێ رووی هەڵواردنی ئـەو وشـانە بریتییە لە مەشهوورنەبوونیان لە تەڵاقدا)

لەسەر ئەو پێـوەرە باسـکراوە دەگەینـە ئـەو ئەنجامـەی "السـراح و الفـراق" بـە ناڕاشکاو دادەنرێن، با لە قورئانیشدا هاتبن، لە "المغني"[1] دا هاتووە: (راشـکاو لـە شتێکدا ئەوەیە دەق بێت تیایدا و جگە لەو مانایە مانـای تـر هـەڵناگرێت، مەگـەر بـە هەلگرتنێکی دوور، هەردوو وشەی "الفراق و السراح" هەرچەند لە قورئاندا بـە مانـای جیابوونەوەی نێوان دوو هاوسەرەکە هاتوون، بەڵام بۆ جگە لەو مانایەش بەکاربراون، و لە عورفیشدا بەزۆری، خودا-ﷻ-دەفەرموێت:﴿وَاعْتَصِـمُوا بِحَبْـلِ اللَّـهِ جَمِيعـاً وَلَا تَفَرَّقُوا﴾.

وشەی "بەڵێ" لەلایان راشکاوە گەر لە وەڵامدا هاتبوو[2].

"الخرقي[3]" لە حەنبەلییەکان هاوڕایـە لەگـەڵ شـافیعییەکان لـەوەی "السـراح و الفراق" لە گوزارەکانی راشکاوی تەڵاقن، چـونکە لـە قورئانـدا بـۆ هەڵوەشـاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری هاتوون، هەنـدێکیان دەڵـێن[4] راشـکاوی تـەڵاق بریتییـە لـە وشەی "تـەڵاق" بەتەنها و ئەوەی لێیەوە دادەتاشرێت نەك شتانی تر، بەڵام "الفراق و السراح" و ئەوەی لێیانەوە دادەتاشرێت لە ناڕاشکاوەکانن، ئەمەش لەگەڵ مەزهـەبی ئەبی حەنیفە و مالیك یێکدێتەوە.

حوکمی راشکاو لەلایان: ئەوەیە کە تەڵاقی بەبێ نیەت پێ دەکەوێت.

---

[1] المغني والشرح الكبير، ٨/٢٦٤.
[2] الانصـافْ ٨/٤٦٧. وفيـه (گـەر بوترێـت پێـی: ژنەکـەی خـۆت تەڵاقـدا؟ ئـەویش بڵـێ: بـەڵێ، و مەبەستی دڕۆبێت تەڵاقەکەی دەکەوێت).
[3] ينظر المغني لابن قدامة ٧/١٢١.
[4] المرجع السابق.

لە "الاقناع[1]"دا هاتووە: (گەر تەڵاق بە راشکاوی هات دەکەوێت، نیەتی لێ بێنێت یان نە، یاخود بە شۆخی و گاڵتە و هەڵەوە بێت)

لە ریوایەتێکی ئیمام ئەحمەددا تەڵاقی پێ ناکەوێت مەگەر لەگەڵ نیەت، ئەمەش لەگەڵ ئیمامییەکان و زاهیرییەکاندا پێکدێتەوە.

لە "الانصاف[2]"دا هاتووە: (ناکەوێت مەگەر بە نیەتێك یان نیمچەبەڵگەی تووڕەبوون یان داوای ژنەکە، یان هاوشێوەکانی ئەمانە)

بینا لەسەر ئەم ریوایەتە تەڵاقی کەسی شۆخیکەر یان گاڵتەکەر یان هەڵەکار ناکەوێت.

**حوکمی ناڕاشکاو:**

ناڕاشکاو ئەوەیە مانای تەڵاق و مانای تر لەخۆ بگرێت، تەڵاقی پێ ناکەوێت مەگەر لەگەڵ نیەت یان شتێك لە جێگەی نیەت دابنیشێت لە تووڕەبوون یان ناکۆکی یان داوای تەڵاق.

ئیبن رەجەب دەڵێت: (ناڕاشکاوەکانی تەڵاق لەباری تووڕەبوون و ناکۆکیدا تەنها ویستی تەڵاقدانی ژنەکە قبوڵ دەکەن، ئیبن عەقیل-لەگەڵ بوونی بەڵگەی حاڵ لەسەریان- لە راشکاوی داناون)[3]، لەمەدا لەگەڵ حەنەفییەکاندا هاوڕا دەبن لە راستبوونەوەی نیمچەبەڵگە لە شوێنی نیەت، و هاوملبوونی نیەت لەلایان بە مەرج دەگیرێت.

لە "الإقناع"دا هاتووە: (تەڵاق ناکەوێت مەگەر نیەتی لێ بێنێت بە نیەتێك هاومل بێت لەگەڵ گوزارەکەدا) بەمەش لەگەڵ شافیعییەکاندا هاوڕا دەبن.

تەڵاقی کەوتوو بە ناڕاشکاو تەڵاقی رجعییە گەر سیانی نەگەیاندبێت ئەمەش لە ئاشکرای ئیمام ئەحمەد و قسەیەکی شافیعیدا هاتووە.

---

[1] ٢/١١.

[2] ٨/٤٦٥.

[3] القواعد لابن رجب القاعدة (١٥١) ص٣٢٣.

ئەبو حەنیفە دەڵێت هەموو راشکاوەکان تەڵاقی بائینن جگە لە "(اعتدی)، و(استبرئی رحمك)، و(انت واحده)[1]."

**ئیبازییەکان:**

لەوەی لە "جوهر النظام[2]"دا هاتووە تێدەگەین راشکاو ئەوەیە دوو شتی تێدا بەدی بێت: دانانی عورفی و مادەی "الطلاق" کە تیایدا هاتووە:

راشکاو ریتییە لە هەر وشەیەك لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە تەرخان کرابێت و دانرابێت و گوازرابێتەوە، راشکاو ئەوەیە بڵێت: "قد طلقتك" جیاوازیان هەیە لەوەدا بڵێی: "فارقتك"، وتراوە لە گوزارەی راشکاوە، هەروەها وتراویشە ناڕاشکاوە وەك دروستترین را.

بەمەش بۆچوونەکەیان هاوڕا دەبێت لەگەڵ مەشهووری مالیکییەکاندا.

**زەیدییەکان:**

ئاراستەی فەقیهانی زەیدی لە داڕشتنی تەڵاقدا تارادەیەك وردترە بەراورد بەوەی وتراوە لە مەزهەبەکانی تردا، ئەوان گوزارەی داڕشتنیان بۆ راشکاو و ناڕاشکاو دابەش کردووە، بەم جۆرە:

**أ.راشکاو و حوکمەکەی:**

راشکاو ئەوەیە تەنها مانای تەڵاقی هەبێت[3]، ئەمە ئەو پێناسەیە لەسەری پێکهاتوون، بەڵام لە قسەکەی "الصنعانی[4]"وە ئەوە حاڵی دەبین ئەم تێگەیشتنە

---

(1) المغني لابن قدامة، ٧/١٣٣.

(2) جوهر النظام في علمي الاديان والأحكام لأبي محمد عبد الله بن حميد السالمي، الطبعة السلفية ١٣٤٦هـ ٢/٢١٥.

(3) التاج المنهب لأحكام المنهب شرح متن الانصاف في فقه الائمة الاطهار القاضي الصنعاني ٢/١٢٠.

(4) الصنعاني (القاضي العلامة احمد بن قاسم العنسي اليماني الصنعاني).

تەنها لە وشەی تەلاق و داتاشراوەکانییەوە بەدییێت، کاتێك دەڵێت: (بەوەی وشەی تەلاق پیتە بنەڕەتییەکانی تەلاق لەخۆ بگرێت کە ئەمانەن: "ط، ل، ق")[1].

بەلام بە باوەڕی من مەبەستەکە گشتگیترە لەوە، هەر گوزارەیەك تەنها مانای تەلاق بگەیەنێت راشکاوە بەو بەلگەی خودی "الصنعاني" راستەوخۆ لەدوای ئەم قسەیە وتوویەتی: (گەر بە عەجەمی تەلاقیدا واتە بە گوزارەیەکی دانراو بۆ تەلاقی راشکاو لەو زمانەدا ئەوا تەلاقی پێ دەکەوێت ئەگەر زانی مانای ئەوەی بە زمانیدا هاتووە بریتییە لە تەلاق)[2] هەروەها بەو ئاماژەیەی لە "البحر الزخار"دا هاتووە: (راشکاو ئەوەیە هەڵنادرێتە سەر مانایەکی تر و جگە لە مانای کەوتنی تەلاق هیچ مانایەکی تر ناگەیەنێت)[3].

**حوکمی راشکاو:**

تەلاقی پێ دەکەوێت با بەبێ نیەتیش بێت گەر ئەم مەرجانەی تێدا هاتە دی:

١-سیفەتی راشکاو تیادا بێتە دی بەوەی لای بیسەری شارەزا بە زمان مانایەکی تر جگە لە تەلاق نەگەیەنێت.

٢-کەسی تەلاقدەر بە زمانیدا گوزەر بکات، گەر نووسی-بەبێ ئەوەی بیکات بە قسە- بە ناڕاشکاو دادەنرێت نەك راشکاو، یەکسانە گۆکردنەکە(تلفظ) گوزارەی دارشتن بێت وەك: "ئەو تەلاقدراوە"، یان دانپیادانان بێت یان بانگلێکردن بێت، وەك بلێ: "ئەی تەلاقدراو"، یان هەواڵ بێت وەك بلێت پێی-بۆ نموونە-: "دوێنێ من تۆم تەلاقدا".

٣-گوزارەکە بە مەبەست بگرێت و بزانێت ئەو گوزارەیە بۆ تەلاق دانراوە، یەکسانە مەبەستی ئەو مانایە بێت کە پێی دەوترێت نیەت یان مەبەستی ئەو مانایە

---

(1) التاج المذهب المرجع السابق.

(2) المرجع السابق، ٢/١٢١.

(3) البحر الزخار الجامع لمذاهب علماء الأمصار للأمّام احمد بن يحيى بن المرتضى (ت - ٨٤١هـ) ٣/١٥٥.

نەبێت، بینا لەسەر ئەوە تەڵاقی شۆخیکەر و گاڵتەکەر دەکەوێت، هەر بەو جۆرە تەڵاقی ئەو کەسەی روو بە ئافرەتێك کە گومان دەبات ژنەکەی خۆی بێت و پێی دەڵێت: (تۆ تەڵاقدرواوی) پاشان بۆی دەردەکەوێت ژنەکەی خۆی نییە و بەهەڵەدا چووە، جیاوازی نییە لە نێوان ئەوەی گوزارەکە بە زمانی عەرەبی بێت یان بە هەر زمانێکی تر، چونکە مەبەستی گوزارەکە بووە و زانابووە بەوەی بۆ تەڵاق دانراوە.

**ب-ناڕاشکاو و حوکمی ناڕاشکاو:**

ناڕاشکاو بریتییە لە هەر شتێك مانای تەڵاق و مانای تر لەخۆ بگرێت، ناڕاشکاو ئەمانەیە:

١-هەر گوزارەیەکی ڕاشکاو پیاوەکە لەسەر شتێك نووسیبێتی و بتوانرێت بخوێنرێتەوە بەبێ ئەوەی گوزارشتی لێ بکات.

٢-ئاماژەی کەسی لاڵ و هاوشێوەکانی لەوانەی ناتوانن لەو کاتەدا قسە بکەن بە جۆرێك حاڵیبوونی بۆ تەڵاق تێدا بێت، گەر لە کەسێکەوە بوو دەیتوانی قسە بکات یان بەڕوونی مانای تەڵاقی نەدەگەیاند بە تەڵاق دانانرێت.

٣-هەر گوزارەیەك پیاوەکە دەریببڕێت و ئاراستەی ژنەکە کرابێت و هەڵبدرێتە سەر تەڵاق و مانای تریش وەك(بچۆرەوە بۆ لای خانەوادەکەت)

**حوکمی ناڕاشکاو:**

لەگەڵ بوونی نیەت تەڵاقی پێ دەکەوێت واتە گوزارە و مانای پێکەوە بەمەبەست گرتبێت بە جۆرێك نیەت لەگەڵ سەرەتای گوزارەکە هاومل بێت یان تێکەڵ بێت بە پیتەکانی، گەر نیەت پێشکەوت یان دواکەوت لە گوزارەکە تەڵاقی پێ ناکەوێت[1].

---

[1] ینظر التاج المذهب المرجع السابق ٢/١١٩-١٢٣.
البحر الزخار المرجع السابق ٣/١٥٥ وما بعدها.
الروضة الندية ٢/٥٧ وما بعدها.
نيل الأوطار للشوكاني، ٦/٢٤٢.

←

## لقی چوارەم:
## دارشتنی تەڵاق لە بەرینترین سنووریدا

هەندێ لە فەقیهانی مالیکی و شافعی تا ئەوپەڕی سنوورێك مرۆڤ وێنای دەکات دەربارەی دارشتنی گوزارەی تەلاق رۆیشتوون، بۆیە: تەلاق بە هەموو گوزارەیەك دەخەن بەمەرجێ نیەتی لەگەڵدا بێت، لەم رادەیەشدا نەوەستاون بەڵکو دانیان بەوەدا ناوە بە قسەی ناوەوەی مرۆڤ(ئەوەی بەبیریدا دەگوزەرێت) تەلاق دەکەوێت.

**یەکەم-تەڵاق بە هەر گوزارەیەک لەگەڵ نیەت هاوەل بێت:**

"الدردير" دەڵێت: (گەر بە وتنی "ئاوم بدەرێ" مەبەستی تەلاق بوو یان بە هەر قسە و دەربڕینێکی تر وەك "بچۆ ژوورەوە" یان "نان بخۆ" یان "ئاو بخۆرەوە" ئەوا ئەو مەرامەی پێوە پەیوەست دەبێت لە تەلاق و لە ژمارە)[1] بینا لەسەر ئەم رایە گەر بڵێت بە ژنەکەی :(هەندێك ئاوم بۆ بهێنە) و مەبەستی پێی تەلاقی سێ بەسێ بێت ئەوا هەر سێ تەلاقەکەی دەکەوێت و ژنەکەی بۆ حەلاڵ نابێت تا مێرد بە پیاوێکی تر نەکات.

"الدسوقي" لەسەر قسەکەی "الدردير"(یان بە هەر قسەیەکی تر) دەڵێت: واتە با دەنگێکی سادە یان ئاوازێکیش بێت)[2].

لە "المنتقى"ی شەرحی "الموطأ"دا هاتووە: (هەر کەس بە ژنەکەی بڵێت: بخۆ و بخۆرەوە لەو وشانەی کە لە راستەقینەیاندا یان لە مەجازیاندا بۆ تەلاق بەکارناهێنرێن، مالیك دەڵێت تەلاقی پێوە پێویست دەبێت، ئەبو حەنیفە و شافیعی

---

الدراري المضيئة شرح الدرر البهية كلاهما للأمّام محمد بن علي الشوكاني ٢/٧٢.

(١) الشرح الكبير للدردير ٢/٣٨٣.

(٢) ينظر حاشية الدسوقي على الشرح الكبير شمس الدين الشيخ محمد عرفة الدسوقي على الشرح الكبير لأبي البركات سيدي احمد الدردير، ٢/٣٨٣.

دەڵێن: تەڵاقیان پێوە پێویست نابێت، هەندێ لە هاوەڵانمان دەڵێن: ئەمە لەو شوێنەوە بیناکراوە کە تەنها بوونی نیەت تەڵاقی پێ دەکەوێت) مەزهەبی "ابن القاسم" داوا دەکات تەڵاق لەو بابەتەدا تەنها بە نیەت نەکەوێت، بەڵکو بەو گوزارانەی نیەتیان هاومل دەبێت)[١].

واتە لە کەوتنی تەڵاقدا جیاوازی لە نێوانیاندا نییە، بەڵکو لەوەدا جیاوازیان هەیە ئایا بە نیەتی هاومل بە گوزارەکە یان بە گوزارەی هاومل بە نیەتەکە دەکەوێت یان نە؟

لە "المهذب"دا هاتووە: (جیاوازیان لەوەدا هەیە کەسێك بە ژنەکەی بڵێت: "بخۆ"، "بخۆرەوە" و نیەتی تەڵاقی بێت، هەیانە دەڵێت: ناکەوێت، هەشیانە دەڵێت: دەکەوێت، ئەمە(ئەوەی یەکەم) دروستەکەیە)[٢].

جێگەی سەرسوڕمانە فەقیهێکی مەزن حوکم بدات بەسەر قسەی کەسێکدا بە کەوتنی تەڵاق بە وتنی "بخۆ و بخۆرەوە" و بڵێت ئەمە دروست و راستەکەیە.

ئایا پەیوەندی ژن و مێردی تا ئەو رادەیە سووك و ئاسان و لاواز و لەرزۆکە لە دیدی شەریعەتی ئیسلامەوە تا بە قسەیەك هەڵبوەشێتەوە کە هیچ پەیوەندییەکی دوور و نزیکی لەگەڵ پچڕانی تەڵاقدا نەبێت، ئەو پەیوەندییەی قورئان گرنگییەکی زۆری پێداوە بە جۆرێك لەم دەستوورە نەمردا و لەناو پرس و بابەتەکانی–کە قورئان حوکمەکانیان رۆشن دەکاتەوە– هاوتا و هاوشانی بۆ نییە؟!

**دووەم- تەڵاق بە قسەی ناوەکی:**

واتە گەر مێردەکە لە زەینیدا تەڵاقی پێکهێنا بە قسەیەکی ناوەکی وەك چۆن مرۆڤ بە زمان پێکیدەهێنێت[١] بەبێ ئەوەی قسە ناوەکییەکە بکات بە گوزارشت و دەربڕینی زمان، جیاوازی تێدا هەیە بۆ سێ بۆچوون:

---

[١] المنتقى شرح موطأ الأمام مالك ١٦/٤.

[٢] المهذب لأبي اسحاق الشيرازي - الفقه الشافعي - ٨٢/٢.

یەکەم—ئەوەی مرۆڤ بە زمان گوێ نەکات لە تەلآق عەفوی لێدراوە و تەلآق بە نیەت و مەبەست پێویست ناکات، ئەمە رای جمهوورە.

دووەم—تەلآق بە قسەی ناوەکی دەکەوێت گەر لەناخەوە سوور بوو لەسەری، ئەمە ریوایەتی ئەشهەبە لە مالیکەوە.

سێیەم—تیایدا وەستاون: عبدالرزاق لە مەعمەرەوە دەڵێت: پرسیار لە ئیبن سیرین کرا دەربارەی کەسێك لە دەروونی خۆیدا ژنەکەی تەلآق دەدات، وتی: ئایا خودا ئاگادار نییە بەسەر ناختدا، وتی: بەڵێ، وتی: کەوابوو هیچی تری لەسەر نالێم[٢].

لە "روض النضیر"دا هاتووە: (ئەشهەب لە مالیکەوە ریوایەتی کردووە تەلآق دەکەوێت گەر لە ناخەوە سوور و لێبڕاو بوو، هەر بەو جۆرە لە "الزهري"ەوە ریوایەت کراوە)[٣].

ئەوانەی دەڵێن تەلآق دەکەوێت بە قسەی ناوەکی ئەم بەڵگانە دەهێننەوە:

١ـ خودا—ﷻ—دەفەرموێت: ﴿وَإِن تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ﴾[٤].

٢ـ پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((انمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَانمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى))[٥].

٣ـ پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ان من كفر في نفسه فهو كفر—هەر کەس لە ناخیدا کوفر بکات ئەو کوفرە(یان ئەو کافرە)))[٦].

---

(١) أي ليس معنى الكلام النفسي أن ينوي الطلاق ويصمم عليه ثم يعدله، ولا أن يعتقد الطلاق بقلبه من غير نطق بلسانه فانه لا يلزمه في ذلك طلاق اجماعا. ينظر شرح الخرشي ٤/٤٩.

(٢) ينظر ابن القيم الجوزية، زاد المعاد المرجع السابق ٤/٣٧.

(٣) الروض النضير شرح مجموع الفقه الكبير للصنعاني (ت ١٢٢١هـ) ٤/١٦٣.

(٤) (لِّلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِن تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (البقرة:٢٨٤).

(٥) سنن النسائي ٦/١٥٨.

(٦) يراجع زاد المعاد ٤/٣٨.

٤-کەسی سوور و لێبڕاو لەسەر گوناه و یاخیبوون ڕووبەڕووی لێپرسینەوە دەبێتەوە با ئەنجامیشی نەدابێت.

٥-کارەکانی دڵ لە پاداشت و سزادا وەك کاری ئەندامەکان وایە، بۆیە لەسەر خۆشەویستی پاداشت وەردەگرێت و لەسەر ڕق و کینە سزا دەدرێت، هەر بەو جۆرە لە دۆستایەتی و دوژمنایەتی لە پێناوی خودادا، بە هەمان شێوە لە پشتبەستن بە خودا و ڕازیبوون و ویستی خێر، وەك چۆن سزا دەدرێت لەسەر لوتبەرزی و حەسەد و خۆپەسەندی و ریا و شك و گومانی خراپ بە خەڵکی بێگوناه... لەوەی باسمان کرد بواری داڕشتنی گوزارەی تەڵاق لە لقی چوارەمدا بە ئەندازەیەك بەرینە مێردەکە ئازادی تەولوی هەیە لە هەڵبژاردنی داڕشتنی هەر گوزارەیەك بیەوێت.

**گفتوگۆ لەسەر ئەم بۆچوونانە:**

١-مەرجی لەئامێزگرتنی ڕاشکاوانەی داڕشتنی تەڵاق بۆ مادەی "ط، ل، ق" یان "السراح" یان "الفراق" لەگەڵ ئەو ڕاستییەدا پێچەوانەیە کە دەڵێت: شەریعەتی ئیسلام بۆ هەموو کات و شوێنێك گونجاوە، و بۆ هەموو گەل و نەتەوە و ڕەگەزێکە، هەروەها حوکمە بیناکراوەکانی لەسەر عورف بە گۆڕانی کات و شوێن گۆڕانیان بەسەردا دێت، ئیبن قیم[1] دەڵێت: (خودا-ﷻ- تەڵاقی باس کردووە و گوزارەیەکی بۆ دیارینەکردووە، لەوەوە حاڵی دەبین خەڵکی دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی بە تەڵاقی دەزانن، هەر گوزارەیەك عورفی ئەوان پێی ئاشنایە لەگەڵ بوونی نیەت تەڵاقی پێ دەکەوێت، وشەکان لە خودی خۆیاندا بەمەرام نەگیراون، بەڵکو ئاماژەن بۆ ئەو مانا و مەرامانەی هەڵیانگرتووە، گەر قسەیەکی کرد ئاماژە بوو بۆ ماناکە و مەبەستی ئەو مانایە بوو ئەوا حوکمەکەی لەسەر پەیدا دەبێت، بۆیە تەڵاق لە کەسێکی عەجەمی یان هندی یان تورکی بە

(١) یراجع زاد المعاد، المرجع السابق.

زمانی خۆیان دەکەوێت... بەڵکو گەر کەسێك لەوانە بە ڕاشکاوی تەڵاق لە زمانی عەرەبیدا تەڵاقیدا و ماناکەی نەدەزانی هیچ شتێکی پێ ناکەوێت.

٢-مەرجی نیەت لە ڕاشکاوی تەڵاقدا مەرجێکی سروشتییە، شەریعەت واقیع بە هەند وەردەگرێت و لا بەلای کارێکدا ناکاتەوە و گرنگی پێ نادات خاڵی بێت لە نیەت، فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) (کارەکان بە نیەتن) ڕێسایەکی گشتییە و لە عیبادەتەکان و مامەڵەکاندا ڕەچاو دەکرێت، ئیتر چۆن لە هەڵسوکەوتێکدا پشتگوێ دەخرێت کە ترسی گەورەی تێدایە بۆ قەوارەی خێزان و داهاتووەکەی.

پارسەنگراو ئەوەیە جەعفەرییەکان و زاهیرییەکان بۆیچوون، هەروەها ئەو ریوایەتەی ئیمام ئەحمەد کە تەڵاق تەنها بە نیەت دەکەوێت با گوزارەکەشی ڕاشکاوانە بێت پێی.

٣-دابەشکردنی گوزارەکان بۆ ڕاشکاو و ناڕاشکاو هەرچەند لە بنەڕەتی داناندا دابەشکردنێکی دروستە، بەڵام بە جیاوازی کەسەکان و کات و شوێن و عورف جیاوازی بەسەردا دێت، بۆیە حوکمێکی جێگیر نییە بۆ خودی گوزارەکە، لەوانەیە گوزارەیەکی ڕاشکاو لای گەلێکی تر ناڕاشکاو بێت، یان ڕاشکاو لە کات و شوێنێکدا ناڕاشکاو بێت لە کات و شوێنێکی تردا، ئەوەی دروستە کاری پێبکرێت ئەوەیە حەنەفییەکان و زەیدییەکان و هەندێ لە مالیکییەکان بۆیچوون لەوەی پێوەری ڕاشکاو بریتییە لە زاڵی و زۆری بەکارهێنانی لە عورفی بەکاربراودا، بۆیە سەرقاڵبوونی بیری فەقیە یان مفتی یان قازی بە هەندێ گوزارەوە کە سەدان ساڵ لەمەوبەر بەکاربراون وەك " خلیة، إلحقي بأهلك، اعتدي.." کارێکە مەنتقی تەندروست قبوڵی ناکات و خۆگێلکردنە لە واقیعی کۆمەڵگە و گفتوگۆکانیان.

"القرافي" دەڵێت: لە ئێستادا خەڵکی نابینی ئەو گوزارانەی پێشوو لە تەڵاقدا بەکاربهێنن، بەڵکو تەمەن گوزەر دەکات و پیاوێك نابینیتەوە -گەر بیەوێت تەڵاق

بدات– بە ژنەکەی بڵێت: "أنت خلية" یان بڵێت "وهبتك لأهلك".

٤–وتنی کەوتنی تەڵاق بە هەر گوزارەیەك نیەتی لەگەڵدا بێت لەگەڵ ڕێسا زمانەوانی و شەرعییەکاندا بەرەنگار دەوەستێتەوە، چونکە کەوتنی تەڵاق بە هەڵە پێویست دەکات، ئەوەش بە بەکارهێنانی گوزارەیەکە لە جێگەیەك کە لە زاراوەی گفتوگۆدا بۆ ئەوە دانەنراوە، لەگەڵ نەبوونی پەیوەندییەکی بەهەندگیراو لە نێوان ئەو و ئەوەی بۆی بەکارهێنراوە، لە کاتێکدا زانایانی زمان کۆدەنگیان هەیە بۆ سەرهەڵنەدانی ئاسار لەسەر هەڵە.

هەروەها لەگەڵ ڕێسا شەرعییەکاندا بەرەنگار دەوەستێتەوە کە دەڵێت: هەر وشەیەك چوونە ناوی مەجازی تێدا دروست نەبێت ئەوا نیەت کارناکاتە سەر لادانی لە شوێنەکەی، چونکە نیەت وشەکە لانادات لە ماناکەی(مانا ڕاستەقینەکەی) مەگەر لەبارێکدا لەڕووی زمانەوە لادان بۆ لای مانا(مەجازییەکە) ڕێگەپێدراو بێت[1].

سەرباری ئەوە ئەو قسە ئاماژەبۆکراوە لە گریمانەی قبوولکردنیدا بۆ فتوا دروست نییە، بەڵام بۆ حوکم(قەزا) دروستە، چونکە پابەندکردنی گرێبەستەکان لە تەڵاق و شتانی تردا لەسەر نیەتی قسەکەر یان عورفەکەی بینا دەکرێت لەو شتانەی دەگەڕێتەوە بۆ فتوا، بەڵام ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ حوکم(قەزا) ئەوە لە کێبەرکێی کەسانی تر بۆی تەنها بە عورف حوکمی بۆ دەدرێت نەك بە نیەتەکەی بەهۆی ئەگەری درۆکردنییەوە[2].

٥–وتنی کەوتنی تەڵاق بە قسەی ناوەوەی مرۆڤ بە مەنتقی ئیسلامیدا دەکێشێت و بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ دەقەکانی و ڕێسا هەمووەکییەکانی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خودا بووراوە لە ئومەتەکەم لە هەر شتێك دەروونی لە ناوە دەیڵێت، گەر نەیکات بە قسە یان کاری پێ نەکات) لە ڕیوایەتێکی تردا: خودا لە

[1] سنن النسائي ٦/١٥٦, وما بعدها. المحلى لابن حزم ١٠/١٩٨.
[2] يراجع تهذيب الفروق هامش الفروق ١/٣٩.

ئومەتەکەم بووراوە لەوەی دەروونی وەسوەسەی پیٚ دەکات یان قسەی پیٚ دەکات، گەر نەیلیٚت و نەیکات بە کار[1] پاشان ئەو فەرموودە بەناوبانگەی پیٚغەمبەر(ﷺ): ((کارەکان بە نیەتن)) ریٚسایەکی گشتییە ئەوەی لیٚ هەڵدەگوزین ئیسلام تەنها گرنگی بە نیەت نادات هەروەك چوٚن تەنها گرنگی بە کار نادات.

٦-قورئان بە دەق هیٚناویەتی تەلاق سیٚ بە سیٚ بە سیٚ جار دەکەویٚت و دەفەرمویٚت: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَان فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَان﴾، "التسريح بإحسان" جاری سیٚیەمە، هەموو ئەو بوٚچوونانەی باسکراون و تایبەتن بە تەلاقی سیٚ بەسیٚ پیٚچەوانەی ئەم دەقەی قورئانن.

**ئەو بەلگانەی خراونەتە روو لەلایەن خاوەن ئەم بوٚچوونەوە لەم روانەوە رەد دەکرینەوە:**

أ.بەلگە لە ئایەتەکە بوونی نییە، چونکە ئاماژە بە دادگایی بەندە دەکات بەوەی دەیخاتە دەرەوە و بەوەی دەیشاریٚتەوە، پاشان خودا سزای دەدات یان لیٚی خوٚشدەبیٚت، ئاماژە ناکات بەوەی حوکمە شەرعییەکان پیٚویستن بوٚ ئەوەی مروٚڤ دەیشاریٚتەوە، بوٚیە بە قسەی دەروونی کەوتنی تەلاقی لیٚوە وەرناگیریٚت[2].

ب- فەرموودەی ((کارەکان بە نیەتن)) بەلگەیە لەسەریان نەك بوٚیان، چونکە ئاماژە بەوە دەکات کار لەگەڵ نیەت وەرگیراوە، نەك نیەت بەتەنها.

ج-باوەڕی کوفر کوفرە، چونکە باوەڕ باریٚکی خوٚڕسکە و لە دڵدا راستبووەتەوە، گەر ئەو ئیمانە نەما و ئەویش پیٚی ئاگادار بوو ئەوا بیٚباوەڕی جیٚگەی دەگریٚتەوە.

---

[1] يراجع سنن النسائي ١٥٨/٦. والرواية المتفق عليها هي: (ان الله تجاوز لأمتي عما حدَّثت به أنفسها ما لم تعمل به أو تتكلم). .. نيل الأوطار ٢٧٤/٦.

[2] يراجع زاد المعاد ٣٨/٤.

د- سووربوون لەسەر گوناه و یاخیبوون لادانە، یەکەم بەهۆی کاری یاخیبوونەوە، و دووەم بەهۆی بەردەوامبوون لەسەری، ئەوە کارێکە سووربوون و لێبڕانی پێوە پەیوەست بووە بە دەقگرتن پێیەوە، بەڵام بەتەنها مەبەست بەبێ کار بەریتی نییە لە یاخیبوون با بەردەوامیش بێت لەسەری.

هـ- پاداشت و سزا لەسەر هەندێ لە کاروکردەوەکانی دڵ وەك لوتبەرزی و خۆپەسەندی... لەبەر ئەوەیە ئەم کار و کردەوانە ناون بۆ کۆمەڵێك مانا لە دڵدا راستبوونەتەوە، بە پێچەوانەی تەڵاقەوە ئەمەیان ناوێکە بۆ ناوەرۆکێکی راستبووەوە لەسەر زمان یان ئەوەی جێگەی دەگرێتەوە لە ئاماژە و نووسین، تەڵاق ناوێك نییە بۆ ئەوەی لە دڵدایە و دارێنرلو بێت لە گۆکردن(گوزارشت پێکردن)، لێکچوون لە نێوان دوو حاڵەتەکەدا بوونی نییە تا یەکێکیان بەویتریان پێوانە بکرێت[1].

**دارشتنی تەڵاق لە هەندێ یاسای باری کەسێتیدا هەڵگوزراو لە شەریعەتی ئیسلام:**

یاسای عێراقی[2]: (تەڵاق تەنها بەو گوزارانە دەکەوێت شەرع بۆی تایبەت کردوون)(م٣٤).

**مصري**[3]: (ماڕاشکاوەکانی تەڵاق ئەوەیە تەڵاق و مانای تر هەڵدەگرن، تەنها لەگەڵ نیەت تەڵاقیان پێ دەکەوێت)(م٤).

**مغربي**[4]: (تەڵاق بەو گوزارەی پێی حاڵی دەبین دەکەوێت، هەروەها بە نووسین، ئەو کەسەی دەستەوسانە لە دەربڕینی بە ئاماژەی زانراو تەڵاقی دەکەوێت) الفصل (٤٦).

---

(١) يراجع الروض النضير ١٦٤/٤.

(٢) رقم (١٨٨) لسنة ١٩٥٩ المعدل.

(٣) رقم (٢٥) لسنة ١٩٢٩ المعدل بقانون رقم (٤٤) لسنة ١٩٧٩.

(٤) مدونة الاحوال الشخصية الصادرة ١٩٥٧ والمعمول بها حاليا.

**تونسي**[1]: باسی دارِشتنی تەڵاقی نەکردووە.

**الاردني**[2]: (تەڵاق بە گوزارشت یان بە نووسین دەکەوێت، هەروەها ئەو کەسەی دەستەوسانە لەو دوانە بە ئامازەی زانراو تەڵاقی دەکەوێت)(م٨٦).

**سوري**[3]: (بە گوزارشت و نووسین تەڵاق دەکەوێت، ئەو کەسەش دەستەوسانە لەو دوانە بە ئامازەی زانراو تەڵاقی دەکەوێت)(م٨٧).

**جزائري**[4]: ئامازەی بە رۆشنکردنەوەی دارِشتنی تەڵاق نەکردووە.

نەمتوانی تەماشای هەموو یاساکانی تری وڵاتە عەرەبییەکان بکەم بەهۆی ئاسان نەبوونییەوە.

هەموو ئەم یاسا ئامازەبۆکراوانە بە ناتەواو دادەنرێن تایبەت بە دارِشتنی گوزارەی تەڵاق کە یەکێکە لە پایە گرنگەکانی تەڵاق.

رۆشنی ناتەواوییەکەیان بێنیازمان دەکات لە رۆشنکردنەوە و قسە لەسەرکردنیان.

**بۆیە پێشنیار دەکەم دیاریکردنەکە بەم جۆرە بێت:**

(هەر گوزارەیەك(وشەیەك) راستەقینەیەکی شەرعی یان عورف بێت لە هەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەرگیریدا تەڵاقی پێ دەکەوێت، لەگەڵ بوونی نیەت و هاوملبوونی لە کاتی گوزارشتەکە یان نووسینەکە بە هەر زمانێك بێت، هەروەها ئامازەی ژنەورلو بەهەندوەردەگیرێت لە کەسی دەستەوسان لەو دوانە(قسە و نووسین))

---

[1] مجلة الاحوال الشخصية التونسية الصادرة ١٩٥٦ المعمول بها حاليا.

[2] قانون مؤقت رقم (١٦) لسنة ١٩٧٦.

[3] رقم (٣٤) لسنة ١٩٧٥ المعدل.

[4] المشروع التمهيدي الصادر ١٩٨١.

# باسی دووەم:
# حوکمی دارشتنی هاوتا بە ژمارە

قورئان تەڵاقی بە سێ دیاریکردووە و بەسەر سێ جاردا دابەشی کردووە لە ئایەتی: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾، ئەم دابەشکردنە کۆتوبەندێکی ترە لەسەر ویستی مێردەکە لەباری چوونەبەرەوە لە تەڵاق.

بەڵام گەر پیاوەکە پەلەی کرد و هەر سێ تەڵاقەکەی بە یەکجار خست حوکمەکەی چییە؟ وەك: (انت طالق ثلاثا–تۆ بە سێ تەڵاقدراوی) یان (انت طالق وطالق وطالق–تۆ تەڵاقدراوی، و تەڵاقدراوی، و تەڵاقدراوی) یان (انت طالق ثم طالق ثم طالق–تۆ تەڵاقدراوی، پاشان تەڵاقدراوی، پاشان تەڵاقدراوی) یان (انت طالق، أنت طالق، أنت طالق–تۆ تەڵاقدراوی، تۆ تەڵاقدراوی، تۆ تەڵاقدراوی) یان (انت طالق عشر طلقات–تۆ تەڵاقدراوی بە دە تەڵاق) یان (انتِ طالق مائة طلقة–تۆ تەڵاقدراوی بە سەد تەڵاق)، ئەمانە و هاوشێوەکانی ئەمانە لە گوزارە جۆرلوجۆرەکان؟

لەسەرەتای ئیسلامەوە جیاوازی لەم حوکمەدا کەوتۆتە ناو فەقیهانی موسڵمانەوە، جیاوازییەکە بوو بە پرسێکی دووروودرێژی جۆراوجۆر لە گواستنەوە و بەرفراوان لە بەشەکانیدا، ئابلۆقەدان بە بەڵگەکانیان کاتێکی زۆری دەوێت، و ئاتاجە بە ئینسۆکلۆپیدیایەکی مەزن، تەنها پرسێك نییە کەسە چەقبەستووە چاولێکەرەکان گفتوگۆی لەسەر بکەن، ئەوانەی هێزی دەقی قورئان بە قسە و بۆچوونی فەقیهان دەدەن، هەر بەو جۆرە پرسێك نییە بۆ نوێخوازە هاوچەرخەکان، ئەوانەی لێبووردنی ئیسلام دەکەن بە هۆکارێك بۆ ئاسانکاری لە هەریەك لە بنەڕەتەکان و لقەکاندا، بەڵکو ئەم پرسە باسێکی زانستییە و پێویستە گفتوگۆ تیایدا لەبەر رۆشنایی ئەوەدا بێت لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە، لەگەڵ کۆمەك وەرگرتن لە ئاساری

هاوەڵان و شوێنکەوتووان و را و بۆچوونی هەندێ لە فەقیهان لە مەزهەبە ئیسلامییە تۆمارکراو و ناسراوەکان بەبێ کۆتوبەند یان دەمارگیری بۆ مەزهەبێکی دیاریکراو.

دەتوانین ئەو را و بۆچوونە جیاوازانە بۆ چوار خاڵ بگێڕینەوە، بەم جۆرە:

١-هیچ شتێك ناکەوێت(نە یەك، نە دوو، نە سێ)

٢-ئەوە دەکەوێت مێردەکە دەیخات لەو ژنەی چووەتە لای، هەروەها کەوتنی یەك تەڵاق لەو ژنەی نەچووەتە لای.

٣-بەرەهایی ئەوەی پیاوەکە دەیخات دەکەوێت(لەو ژنەی چووەتە لای یان نەچووەتە لای)

٤-بەرەهایی یەك تەڵاق دەکەوێت.

خستنەرووی ئەم بۆچوونانە-بەپێی ئەو ریزبەندییە ئاماژەبۆکراوە- لەگەڵ رۆشنکردنەوەی بەڵگەکانیان و گفتوگۆ لەسەریان بۆ چوار لق دابەش دەکەین:

## لقی یەکەم:

## ئەو رایەی پێیوایە تەڵاق ناکەوێت

گەر پیاوەکە سێ تەڵاقەکەی کۆکردەوە و ژنەکەی سێ جار تەڵاقدا لە یەك جاردا پێچەوانەی ئەوەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیان پێکردووە، حوکمەکەی لای هەندێ لە فەقیهان نەکەوتنی تەڵاقە.

لە "الروضة البهية"دا هاتووە: (گەر تەڵاق بە زیاتر لە یەك لێکدرایەوە وەك وتنی: (انت طالق ثلاثاً) لێکدانەوەکە دەسڕێتەوە و تەنها یەك تەڵاقی دەکەوێت، وتراویشە هەر هەمووی پووچ دەبێتەوە، چونکە بیدعەیەکە بۆ قسەیەکی راست و رەوان، هەر کەس سێ تەڵاق بخات هیچی نەخستووە، هەر کەس سەرپێچی لە کتێبەکەی خودا

بکات ڕەوانەی کتێبەکەی خودا دەکرێت و هەڵدەدرێتە سەر نەکەوتنی تەڵاقی سێ کە ئەو ویستوویەتی)[1].

ئیبن تەیمییە دەڵێت: (هەر کەس ژنەکەی تەڵاق بدات لە یەك پاکبوونەوەدا بە تەنها یەك وشە یان بە کۆمەڵێك وشە، وەك: "أنت طالق ثلاثا" سێ قسەی لە پێشین و پاشینەوە تێدایە، قسەی چوارەم داهێنراو و بیدعەیە، ئەوەش ئەوەیە هەندێ لە موعتەزیلە و شیعە دەیڵێن، لە هیچ یەکێك لە پێشینەوە ئەوە نەزانراوە و هیچی پێوە پێویست نابێت)[2].

ئیبن قەیم دەڵێت: (ئەم مەزهەبە ئیبن حەزم قسەی لەسەر کردووە و بۆ ئیمام ئەحمەدیان باس کرد بە نەناسراو(منکر)ی زانی)[3].

مامۆستای گەورە علي الخفيف[4] دەڵێت: (ئەمە مەزهەبی دەستەیەك لە شوێنکەوتووانە، وەك " الليث بن سعد، وابن علي، وهشام بن الحكم، وأبو عبيدة، والقاضي الحجاج بن أرطأة[5]" باسی لەبارەوە دەکەن و جمهووری شیعە ئەو ئاراستەیان وەرگرتووە)

ئەوانەی پێیانوایە تەڵاق ناکەوێت بەڵگەیان هێناوەتەوە بەوەی: کۆکردنەوەی نێوان سێ تەڵاقەکە پێچەوانەی دەقی قورئانە: ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾. پێچەوانەی دەقیش بیدعەیە، بیدعەش ڕەدکراوەیە بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): ((هەر کەس کارێك ئەنجام بدات و ئەمری ئێمەی لەسەر نەبێت ڕەدکراوەیە))[6].

---

[1] الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية للشهيد السعيد زين الدين الجبعي العاملي ١٤٨/٢.

[2] مجموع فتأوى ابن تيمية ـ مكتبة المعارف ـ الرباط ـ المغرب، ٩/٣٣.

[3] زاد المعاد لابن القيم، ٥٤/٤.

[4] في كتابه فرق الزواج ص٣٢.

[5] توفي سنة ١٤٥هـ.

[6] وفي رواية فهو مردود.( صحيح مسلم : ٣٢٤٣)

**گفتوگۆ لەسەر ئەم رایە:**

١-پێچەوانەی دەق بریتییە لە زیادە لەسەرو یەکەوە(واتە لەسەرو یەك تەڵاقەوە) نەك هەموو، گەر بڵێت: (تۆ سێ تەڵاقت کەوتووە) یەك تەڵاق دەکەوێت، و زیادەکە دەسڕێتەوە، ئەمەش سروشتی هەر کارێکە قابیلی دابەشکردن بێت، هەندێ لە بەشەکانی رەوایە و هەندێ بەشی تری ناڕەوا.

٢-ئیبن حەزم کە ئەم قسەیەی دەدرێتە پاڵ رای جمهووری وەرگرتووە و وتویەتی ئەوەی پیاوەکە دەیخات بەرەهایی کەوتووە، هەروەها دەڵێت: گەر بیدعە بێت پێویستە رەدبکرێتەوە و پووچ بکرێتەوە، بەڵام بیدعە نییە، بەڵکو پێویستە سیانەکە کۆبکرێنەوە و هەمووی پێ بکەوێت.

٣-ئەم مەزهەبە شازە خەریکە بڵێین پێچەوانەی ئەوەیە موسڵمانان لەسەری کۆدەنگن، ئەوە رای شیعە نییە وەك ئیبن تەیمیە دەیڵێت، پێم وا نییە زۆرینەیان پێیان وابێت وەك مامۆستا "علي الخفيف" وێنای کردووە، بەڵکو زۆرینەیان پێچەوانەی ئەوەن، الطوسي[1] دەڵێت: (گەر بە یەك گوزارە سێ تەڵاقەکەی خست ئەو کەسە بیدعەچییە و تەنها یەك تەڵاقی دەکەوێت لەباری تەواوبوونی مەرجەکانیدا لای زۆرینەی هاوەڵانی ئێمە، لەناو هاوەڵانماندا هەیە دەڵێت: هەر لە بنەڕەتدا تەڵاقی پێ ناکەوێت، "علي" و ئەهلی زاهیر ئەمەیان وتووە)

دانەپاڵی ئەم رایە بۆ لای ئەهلی زاهیر لەیەن "الطوسي"ەوە دروست نییە بەرەهایی وەك باسمان کرد[2].

لە "رياض المسائل"دا هاتووە: (گەر یەك تەڵاق بە دوان یان بە سیان لێکدرایەوە تەنها بە یەك دروستە و زیادەکە پووچەڵ دەکرێتەوە، لێیەوە لاوازی ئەوەی وتراوە

---

(١) ينظر كتاب الخلاف للطوسي، ٢/٨٩.

(٢) ينظر المحلى لابن حزم الظاهري ١٠/١٧٤.

دەردەکەوێت گوایە تەڵاق ڕاستەوخۆ پێی دەکەوێت، مەبەست بە گێڕانەوەی بۆ لای سوننەت گێڕانەوەیە بۆ لای یەك تەڵاق نەك پووچەڵبوونەوە)[1].

بۆیە ئەم ڕایە بەهەند وەرناگیرێت، چونکە سەرباری نەبوونی بەڵگەیەك بۆ پاڵپشت کردنی تەنها دەستەیەکی کەمی نەناسراو وتویانە.

## لقی دووەم:

## جیاکردنەوە لە نێوان تەڵاقی ئەو ژنەی چووەتە لای لەگەڵ ئەوەی نەچووەتە لای

ئەم مەزهەبە دراوەتە پاڵ دەستەیەك لە هاوەڵانی ئیبن عباس و ئیسحاق بن راهەوەی لەوەی لە محمدی کوڕی نەصری مەروزییەوە دەگێڕنەوە لە کتێبی "إختلاف العلماء"دا، دەڵێن: سێ تەڵاقەکەی دەکەوێت گەر تەڵاقدراوەکە چووبێتە لای، یەك تەڵاقی دەکەوێت گەر نەچووبێتە لای.

بۆ ئەمەش کۆمەڵێك بەڵگەیان هێناوە لەوانە:

١- ئەبو داوود لە تاووسەوە ڕیوایەتی کردووە: پیاوێك پێی دەوترا ئەبو سەهبا پرسیاری زۆری لە ئیبن عەباس دەکرد وتی: ئەوە دەزانیت گەر پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و سەردەمی ئەبوبەکر و سەرەتای ئەمارەتی عومەردا ژنەکەی بە سێ تەڵاقبدابایە بەر لەوەی بچێتە لای بە "یەك"یان دادەنا؟ ئیبن عەباس وتی: (بەڵێ، گەر پیاوێك سێ بەسێ ژنەکەی تەڵاقبدابایە بەر لەوەی بچێتە لای بە یەکیان دادەنا لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و سەردەمی ئەبو بەکر و سەرەتای ئەمارەتی عومەردا، کاتێك عومەر بینی خەڵکی

[1] ینظر ریاض المسائل المجلد الثاني - كتاب الطلاق.

تیایدا بەدوای یەکدا دەیهێنن، وتی: لەسەریان کورتی دەکەمەوە(ڕێگەیان لێ دەبڕمەوە)[1].

٢-دەڵێن: ئەو ئافرەتەی نەچووەتە لای بە وتنی(تۆ تەڵاقدراوی) لەلایەن مێردەکەیەوە جیادەبێتەوە، و گوزارشتی "سێ"ی بەردەکەوێت ئەوە تەڵاقی بائینە و دەسڕێتەوە، "العسقلاني" دەڵێت: (ئەو ئافرەتەی نەچووەتە لای گەر مێردەکەی پێی بڵێت: "تۆ تەڵاقدراوی" جیادەبێتەوە، گەر وتی: "بە سێ" ژمارەکە دەسڕێتەوە بەهۆی کەوتنی تەڵاقەوە لەدوای بەینونە[2] لە "المبسوط"دا هاتووە: (گەر بڵێت بە ژنەکەی-ئەگەر نەچووبێتە لای- تۆ تەڵاقدراوی ئەوا لەلای ئێمە بە سێ تەڵاق دەڕوات، ئەمەش قسەی: " عمر وعلي وابن عباس وابي هريرة"یە، "الحسن البصري" دەڵێت: یەك تەڵاق دەکەوێت بە وتنی "تەڵاقدراوی"بۆیە جیادەبنەوە مەگەر لە عیدەدا بێت، وتنی"سێ بە سێ"نامۆیە و هیچ شتێکی پێ ناکەوێت)[3].

**گفتوگۆ لەسەر ئەم بەڵگانە:**

١-وەڵامەکەی ئیبن عباس بەپێی پرسیارەکە بوو، بۆیە حوکمی ئەوەی بۆ باس کرد، ئەمە مانای ئەوە نییە حوکمی ئەو ئافرەتەی پیاوەکەی چووتە لای جیاوازە لە حوکمی ئەوەی نەچووەتە لای، تەڵاقی هاتوو لە فەرموودەکەی ئیبن عەباسدا پشتگیری دەکات: (تەڵاق لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و سەردەمی ئەبو بەکر...تا کۆتاییەکەی کە دواتر ڕۆشنی دەکەینەوە)، سەرباری ئەوەی "الشوكاني في نيل الأوطار (٩/٢٥٩)" دەڵێت: "النسائي" دەڵێت: (ئەمە فەرموودەیەکی مونکەرە)

---

[1] ينظر نيل الأوطار للشوكاني، ٦/٢٥٩.

[2] فتح الباري صحيح البخاري، ٩/٣٦٢.

[3] المبسوط للسرخسي، ٦/٨٨.

٢-ئەو قسەیەی پێیوایە: بە وتنی: (تۆ بە سێ تەڵاقدراوی) تەڵاقەکە دەبێتە بائین و سیانەکە دەسڕێتەوە پێچەوانەی عورف و زمانە، چونکە گوزارەی: "تۆ بە سێ تەڵاقدراوی" پەیوەستە و تێگەیشتن لە سەرەتاکەی لەسەر کۆتاییەکەی دەوەستێت[1]، بەڵگەهێناوە پێی وەك بەڵگەهێنانەوە ولیە بە ئایەتی﴿لا تَقْرَبُوا الصَّلاةَ﴾ و پشتگوێخستنی: ﴿وَأَنتُمْ سُكَارَى﴾، "تۆ بەسێ تەڵاقدراوی" گوزارەیەکی پەیوەستە ناکرێت بکرێت بە دوو گوزارە(دوو وشە) و هەر وشەیەك حوکمێکی پێ بدەی، ئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ وتنی گوزارەی مێردەکە: "تۆ تەڵاقدراوی، تۆ تەڵاقدراوی، تۆ تەڵاقدراوی" چونکە هەر رستەیەك بۆخۆی سەربەخۆیە لەویتریان و تێگەیشتن لە یەکەمیان لەسەر دواهەمینیان نەوەستاوە، لەباری ویستی تێهەڵکردنەوەدا دروستە بوترێت بە یەکەم جیابوونەتەوە، و دووەم و سێەمی سڕیوەتەوە، لە کتێبی: " اختلاف أبي حنيفه وابن أبي ليلى"دا هاتووە: (گەر پیاوێك بە ژنەکەی-کە نەچووبووە لای- وت: "تۆ تەڵاقدراوی، تۆ تەڵاقدراوی، تۆ تەڵاقدراوی" بە یەك تەڵاق تەڵاقدراوە و دوو تەڵاقەکەی تری نەکەوتووە، ئەمەش قسەی ئەبی حەنیفەیە-رەحمەتی خودای لەسەر بێت-

[1] ينظر فتح الباري بشرح صحيح البخاري ٣٦٣/٩، بدائع الصنائع للكاساني ١٨٧٥/٤.

# لقی سێیەم:
# بۆچوونی کەوتنی ئەوەی مێردەکە دەیخات

هەندێ لە هاوەڵان و شوێنکەوتوان و جمهووری فەقیهان لە " حەنەفیەکان[1] و مالیکیەکان[2] و شافیعیەکان[3] و حەنبەلیەکان[4] و هەندێ لە ظاهریەکان[5]" بۆ ئەوە دەچن ئەوەی مێردەکە خستوویەتی بە رەهایی کەوتبێت، یەکسانە چووبێتە لای یان نەچووبێتە لای، هەروەها یەکسانە ژمارەکە یەك بێت یان دوو بێت یاخود سێ، بەڵگەیان بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) و ئیجماع و پێوانە هێناوەتەوە.

---

(1) جاء في المبسوط (٦/٨٨): (پیاوێك نەچووەتە لای ژنەکەی و پێی دەڵێت "تۆ بە سێ تەڵاقدراوی" لەلای ئێمە سێ تەڵاقەکەی دەکەوێت) وفيه ايضا (٦/٩١): (گەر بە چوار ژنی خۆی وت لە نێوانتاندا تۆ تەڵاق کەوتبێت هەریەکەیان سیانی دەکەوێت، چونکە بە دابەشبوون هەریەکەیان دوو تەڵاق و چارەکێکی بەردەکەوێت) واتە بۆ کەرتەکە سەرژمێری یەکی بۆ دەکرێت.

(2) في شرح الخرشي (٤/٣١): (گەر مێردەکە بڵێت بە ژنەکەی تۆ سێ تەڵاقت کەوتبێت بۆ بیدعە، یان تۆ سێ تەڵاقت کەوتبێت هەندێکی سوننەت بێت و هەندێکی بیدعە ئەوا سیانەکەی پێوە پەیوەست دەبێت لەوەی چووەتە لای و نەچووەتە لای).

(3) في المهذب (٢/٨٤): (گەر بەو ژنەی نەچووەتە لای وتی: "تۆ سێ تەڵاقت کەوتووە" هەر سێ تەڵاقەکەی دەکەوێت چونکە هەموویان بەر هاوسەری کەوتووە بۆیە هەموویان دەکەون، وەك چۆن ئەو قسەیە بەو ژنە بڵێت کە چووەتە لای).

(4) في المغني لابن قدامة (٧/١٠٢): (گەر لە یەك پاکێتیدا بە سێ تەڵاقیدا ئەوا بەریناکەوێت ئەوەش نیسان بەهۆی سوننەتەوە).

(5) في المحلى لابن حزم (١٠/١٧٤): (هەر کەس بڵێت: تۆ تەڵاقدراوی و نیەتی دوان یان سیان بێت ئەوە بەپێی نیەتەکەیەتی یەکسانە ئەوەی وتبێت و نیەتی لێهێنابێت لە ئەو ئافرەتەی چووەتە لای یان نەچووەتە لای).

## یەکەم-سوننەتی پێغەمبەر:

بەڵگەیان بە فەرموودەی زۆر هێناوەتەوە گرنگترینیان ئەمانەن:

**١-فەرموودەکەی رکانە :**

لە " رکانە بن عبد زید" وتی: (هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێم وت: ئەی پێغەمبەری خودا من بە تەواوی ژنەکەم تەڵاقداوە، ئەویش فەرمووی: (مەبەستت چی بوو پێی(واتە بە تەڵاقەکەت)؟ وتم: یەك تەڵاق، فەرمووی: سوێند دەخۆی بە خودا؟ وتم: سوێند بە خودا، فەرمووی: دەی ئەوە بەو جۆرەیە تۆ ویستووتە)[1].

رووی بەڵگەهێنانەوە پێی:

أ.گەر "رەکانە" نیەتی زیاتر لە یەك بوایە ئەوا ئەوەی نیەتی لێهێنابوو دەکەوت و پێغەمبەر بە نیەتەکەی پابەندی دەکرد.

ب-گەر کۆکردنەوە لە نێوان سێ دا بە یەك جار دروست نەبوایە پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لە نیەتەکەی نەدەکرد.

**٢-فەرموودەکەی ئیبن عمر :**

ریوایەتکراوە ژنەکەی بە یەك تەڵاق تەڵاقدا-ژنەکە لە حەیزدا بوو- پاشان ویستی بەدوایدا دوو تەڵاقەکەی تر بخات لە دوو "قرء"ی تردا، ئەو هەواڵە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشت و فەرمووی: ((ئەی کوڕی عومەر فەرمانی خودا بەو جۆرە نییە، تۆ لە سوننەت لاتداوە، سوننەت ئەوەیە پێشوازی لە پاکی بکەیت ئەوکات لە هەموو

---

[1] رواه ابو دأود والترمذي والشافعي والحاكم وصححه. يراجع التاج الجامع للأصول في احاديث الرسول ٣١١/٢. وفي نيل الأوطار (٢٥٥/٦): (لە رەکانەی کوڕی عەبدولاوە ژنەکەی کە ناوی "سەهیمە" بوو بە بەتکردن تەڵاقدا و ئەو هەواڵەی بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) راگەیاند و وتی: سوێند بە خودا مەبەستم تەنها یەك تەڵاق بووە، و پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو: سوێند دەخۆی بە خودا تەنها یەك تەڵاقت خستبێت؟ وتی: سوێند بە خودا مەبەستم تەنها یەك تەڵاق بووە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی گێڕایەوە و لە سەردەمی عومەردا تەڵاقی دووەمی دا و لەسەردەمی عوسماندا تەڵاقی سێیەمی دا. رواه الشافعي وابو دأود.

پاکبوونەوەیەکدا تەلاقێك بدەیت..) هەروەها دەفـەرموێت: پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمانی پێکردم و گێڕامەوە، پاشـان فـەرمووی: (گـەر پاکبوویـەوە لـەو بـارەدا یـان تـەلاقی دەدەی یان دەیگریتە خۆ) وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی ئەگەر بـە سـێ تـەلاقی بدەم ئایا بۆم حەلاڵە بیگێڕمەوە؟ فەرمووی: (نەخێر، لە تۆ جیابووەتـەوە و دەبێتـە یاخیبوون))

**رووی بەڵگەهێنانەوە:**

فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): "ئەو(ژنەکە) جیابووەتەوە و یاخیبوونە" بەڵگەیە لەسەر دروستی کەوتنی تەلاقی سێ بە یەك جار، بەڵام بکەرەکەی گوناهبار دەبێت.

**٣-فەرموودەکەی عوبادە بن صامت:**

لە داودەوە لە عوبادە بن صامتەوە ریوایەتکراوە وتویەتی: باپیرم ژنەکەی تەلاقدا بە هەزار تەلاق، باوکم رۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەوەی بۆ بـاس کـرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((باپیرت لە خودا نەترساوە، بەڵام سێی بۆ هەیە، نۆسەد و نەوەد و حەوتەکەی تر دەستدرێژی و ستەمە گەر خودا بیەوێت سزای دەدات و گـەر بیەوێت لێی خۆشدەبێت))[١].

دەڵێن فەرموودەکە راشکاوە لە کەوتنی سێ تەلاق بە یەك جار.

**٤-فەرموودەکەی "عویمر العجلاني":**

لە سەهلی بـن سـەعدەوە ریوایـەتکراوە فـەرمووی: کاتێـك بـرای بـەنی عـەجلان ژنەکەی لەعن کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ستەمم لێکرد گرتمە لای خـۆم، ئـەو تەلاقدراوە، ئەو تەلاقدراوە، ئەو تەلاقدرلوە، لە ریوایـەتێکی تـردا: درۆم لەسـەر کـرد گرتمە لای خۆم پاشان سێ جار تەلاقی دا، لە ریوایەتێکی تردا: پاشان بە سێ تەلاق تەلاقیدا[٢].

---

[١] صحيح مسلم بشرح النووي، ٦٢/١٠ زاد المعاد لابن القيم (٥٦/٤).

[٢] سنن النسائي، ١٤٤/٦.

دەڵـێن: کـەوتنی سـێ تـەڵاق لەبـەردەم پێغەمبـەردا(ﷺ) و ڕەخنەلێنـەگرتنی پێغەمبەر بۆی بەڵگەیە لەسەر دانپیادانانی.

٥-فەرموودەکەی عائشە -خوا لێی ڕازی بێت-

"قاسمی کوڕی محمد" لە عائشەوە -خوا لێی ڕازی بێت- ڕیوایەتی کردووە: پیاوێـك ژنەکەی تەڵاق دا و ژنەکەش مێردی کـرد، و بـۆ جـاری دووەم تەڵاقـدرا، پرسـیار لـە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا ئایا حەڵاڵە بۆ مێردی یەکەمی؟ پێغەمبەر(ﷺ) فـەرمووی: ((نەخێر، هەتا لە شیرینییەکەی دەچێژێت، وەك ئەوەی یەکەم چەشتی))[1].

دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) ئەو کارەی ڕەد نەکردەوە و حەرامی کـرد لەسـەر پیـاوی یەکەم هەتا مێردی دووەم لـە شـیرینی ژنەکـە دەچـێژێت، ئـەوەش بەڵگەیـە لەسـەر دروستی کۆکردنەوەی سێ تەڵاقەکە.

٦-فەرموودەکەی مەحمود بن لەبید:

"النسائي" لە مـەحمود کـوڕی لەبیـدەوە وتـی: پێغەمبـەر(ﷺ) هەواڵیـدا لەمـەڕ پیاوێك ژنەکەی بە یەکجار بە سێ تەڵاقداوە، غەزیان هەستا و پاشان پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئایا یاری دەکەن بە کتێبەکەی خودا و من هێشتا لـە نـاو ئێـوەدام)) تـا پیاوێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا دەتەوێ بیکوژم؟ "ابـن کـثیر" دەڵێـت ئیسنادەکەی باشە، "الحافظ" لە کتـێبی "بلـوغ المـرام"دا دەڵێـت ڕاوییـەکانی جـێ متمانەن[2].

دەڵێن: تووڕەبوونی پێغەمبەر بەڵگەیە لەسەر کەوتنی تەڵاقی سێ بە سێ ئـەگینا پێویست نەبوو تووڕەبوایە لەسەر کارێك نەهاتووەتە دی.

---

[1] فتح الباري بشرح صحيح البخاري ٣٦٢/٩. السنن الكبرى للبيهقي ٣٣٤/٧.

[2] نيل الأوطار للشوكاني، ٢٥٥/٦. التاج المرجع السابق، ٣١٢/٢.

**٧-فەرموودەکەی فاتمەی کچی قەیس:**

ریوایەتکراوە "عمرو بن حفص المخزومي" بە سێ تـەڵاق ژنەکـەی تـەڵاق دابـوو، خالیدی کوڕی وەلید لەگـەڵ چـەند کەسێك لـە بـەنی مـەخزوم بەڕێکـەوتن بـۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر فەرمووی: ئـەبو عمـرو بـن حفـص فاتمـەی سـێ بـە سـێ تەڵاقداوە ئایا خەرجی بۆ بڕیوەتەوە؟ وتی: نە خەرجی و نە شوێنی نیشتەجێبوون[1]

دەڵێن: گەر سیانەکەی نەکەوتبایە خەرجی بۆ هەبوو، چونکە خـەرجی تەڵاقـدراو بە تەڵاقی رجعی پێویستە لەسەر مێردەکەی بە کۆدەنگی فەقیهان، هەر بـەو جـۆرە دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبوونیش[2].

**٨-فتواکەی ئیبن عەباس بە پێچەوانەی ریوایەتەکەی:**

(ئیبن عەباس دەڵێت: لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و سـەردەمی ئەبوبـەکر و دوو ساڵی سەردەمی خەلافەتی عومەردا تەڵاقی سێ بە یەك تەڵاق دەڕۆیشـت، عومـەری کوڕی خەتاب فەرمووی: ئەم خەڵکە لە کارێکدا پەلە دەکەن کـاتی خـۆی هێواشـی و لەسـەرخۆیی بـۆ ئـەوان تێـدابوو، گـەر تێمانپەڕاندبایـە بەسـەریاندا، بۆیـە تێیپەڕانـد بەسەریاندا)[3].

ئـیبن عـەباس بـە پێچـەوانەی ئـەم ریوایەتـە فتوایـداوە: ئـەبو داود لـە رێگـەی موجاهیدەوە فەرموودەیەکی دەرهێناوە کە وتویەتی: لای ئیبن عەباس بووم پیاوێك هات بۆ لای و وتی: ژنەکەی بە سێ تەڵاقداوە، ماوەیەك بێدەنگ بوو تا وا گومانم برد دەیداتەوە بە روویدا، فەرمووی: (یەکێك لە ئێـوە کـاری گەمژانـە[4] ئـەنجام دەدات و پاشان دەڵێت: ئیبن عەباس، ئیبن عەباس(واتە وەرە بە هانامەوە چارەسـەرم بکـە) خودا-ﷻ- فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجاً﴾ تۆ لە خودا نەترسـاوی،

---

(١) سنن النسائي، ٦/١٤٥ صحيح مسلم بشرح النووي، ١٠/١٠٣.

(٢) السنن الكبرى، ٧/٣٣٤.

(٣) صحيح مسلم المرجع السابق، ١٠/٦٩، سبل السلام ٣/٢٢٥.

(٤) وفي رواية لخرى الحموقة وهما لغتان: فعلة ذات حمق وجهالة.

بۆیە دەروویەك بۆ تۆ شك نابەم –لە پەروەردگارت یاخی بوویت و ژنەکەت لێت جیابوویەوە)[1] کاریان بەم فتوایەی کردووە نەك بە ریوایەتەکەی.

وەلامی ریوایەتەکەیان بە چەندین وەلام داوەتەوە، و تەئویلیان کردووە بە کۆمەڵە تەئویلێك هەیانە دوورە و هەیانە نزیك، گرنگترینیان:

١–دەڵێن: (فەرموودەکە: کاتی خۆی تەلاقی سێ یەك بوو) نەسخکراوەتەوە، "العيني" دەڵێت: ("الطحاوي" وەلامی فەرموودەکەی ئیبن عەباسی داوەتەوە پوختەکەی ئەوە دەگەیەنێت فەرموودەکە نەسخکراوەتەوە).

رۆشنکردنەوەی: کە عومەر فەرمووی: خەڵکینە کاتی خۆی لە تەلاقدا لەسەرخۆی و پەلەنەکردن بۆ ئێوە هەبوو، هەر کەس پەلە بکات لەو لەسەرخۆییە ئەوا پێیەوە پابەند دەکەین، هیچ کەسێك لەوانە کارەکەیان بە نەشیاو نەزانی و بەرپەرچیان نەدایەوە، ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر نەسخی ئەوەی خرایە روو.

هەروەها "الطحاوي"–وەك "العيني" گواستوویەتەوە– دەڵێت: گەر بڵێیت رووی ئەم نەسخە لە کوێدایە، عومەر نەسخ ناکاتەوە، چۆن لەدوای پێغەمبەر(ﷺ) نەسخ بوونی هەیە؟ دەڵێم: کاتێك عومەر قسەی لەگەڵ هاوەڵان کرد و کەس کارەکەی بە نەشیاو نەزانی کارەکەی بوو بە ئیجماع، نەسخیش بە ئیجماع هەندێك لە مامۆستایانی ئێمە بە گونجاویان بینیوە، بەو رێگەیە ئیجماع زانستی یەقین پێویست دەکات، پاشان دەڵێت: گەر بڵێیت ئەم ئیجماعە لەسەر نەسخ لە خۆیانەوە بووە و ئەوە کارێکی گونجاو نییە، دەڵێم: ئەگەری هەیە دەقێکیان بۆ دەرکەوتبێت نەسخەکەی پێویست کردبێت و ئەو دەقە بۆ ئێمە نەگوازرابێتەوە)

"البيهقي" لە شافیعییەوە دەگوێزێتەوە وتویەتی: وەك ئەوە وایە ئیبن عەباس شتێکی زانیبێت ئەوەی نەسخ کردبێتەوە[2].

---

(١) عمدة القاري شرح صحيح البخاري ٢٠/٢٣٣.

(٢) السنن الكبرى للبيهقي ٧/٣٣٨. الروض النضير ٣/١٤٨.

٢-هەندێکیان دەڵێن: مانای قسەکەی(کاتی خۆی سێ بە یەك دەرۆیشت): خەڵکی لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) یەك تەڵاقیان دەدا، چونکە هەر لە بنەڕەتدا سیانیان بەکار نەدەهێنا و زۆر دەگمەن بەکاریانهێناوە، بەڵام لە سەردەمی عومەردا بەکارهێنانیان بۆی زۆربوو، "ابن العربي" ئەم تەئویلەی پارسەنگداوە و داویەتە پاڵ "أبي زرعة الرازي" هەر بەو جۆرە "البيهقي" بە سەنەدێکی دروست گەیاندویەتە سەر "أبي زرعة"

"النووي" دەڵێت: لەسەر ئەمە هەواڵەکە لە جیاوازی نەریتی خەڵکەوە روویداوە نەك لە گۆڕانی حوکمەکەوە لە تەڵاقی یەکدا[1].

٣-هەندێکیان وەڵامیان داوەتەوە بەوەی: لە شێوازێکی تایبەتدا هاتووە، "ابن سريج" و کەسانی تر دەڵێن: وەك ئەوە وایە لە دووبارەکردنەوەی قسەدا هاتبێت، وەك ئەوەی بڵێت: "تۆ تەڵاقدراوی"، "تۆ تەڵاقدراوی" لە سەرەتای ئیسلامەوە بەهۆی سەلامەتی سینەیانەوە لێیان وەردەگیرا بەوەی مەبەستیان دڵنیاکردنەوە بووە، کاتێك لە سەردەمی عومەردا خەڵکی زۆربوون و فێڵ و فریودان و هاوشێوەکانیان-کە رێگریان دەکرد لە قبووڵ کردنی ئەو کەسەی بانگەشەی دڵنیاکردنەوەی دەکرد- تیایاندا زۆر بوو عومەر گوزارەکەیانی هەڵدایە سەر ئاشکرای دووبارەکردنەوەکەیان و بەسەریاندا تێپەڕاند، ئەم وەڵامە "القرطبي" پێی رازی بووە، "النووي" دەڵێت: ئەمە راسترین وەڵامە[2].

٤-هەندێك تانەیان لە ریوایەتەکەی ئیبن عەباس داوە، "القرطبي" لە "المفهم"دا-وەك العسقلاني گواستوویەتەوە- دەڵێت: (لەرزۆکی لە گوزارەکەیدا روویداوە لەگەڵ جیاوازی لەسەر ئیبن عەباس، میانەی ئاشکرای ریوایەتەکە داوای گواستنەوە دەکات لە هەموویانەوە(لە هەموو هاوەڵانەوە)، چونکە زۆربەیان

---

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري ٣٦٤/٩.
[2] فتح الباري المرجع السابق.

ئـەوەیان بینیـوە، لـە نموونـەی ئەمانـەدا وا بـاوە حوکمەکـە بـڵاو ببێتـەوە و پەرەبسێنێت بەناو هەموویاندا، ئیتر چۆن دەبێت یەك کەس لە یەك کەسـەوە بە ریوایەتەکە تەنها کەوتبێت؟ دەڵێت: ئـەم رووە داوای وەسـتان دەکـات لـە کـارکردن بـە روواڵـەتی ریوایەتەکـە، گـەر داوای یەکلابوونـەوەی پووچەڵبوونەوەکەی نەکات)[1].

هەروەها دەڵێن: فەرموودەکـە تـەنها "مسـلم" ریوایـەتی کـردووە و "البخـاري" ریوایەتی نەکردووە و ئیبن عەباسیش سەرپێچی لـە ریوایەتەکـەی کـردووە(وەك لـە فتواکەیدا)[2].

وەڵام و تـەئویلی زۆر هـەن بـۆ ریوایەتەکـەی ئـیبن عـەباس، لێـرەدا بـواری خستنەڕوویان نییە هەرکەس درێژەی زۆرتری دەوێت با بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی کتێبی فەرموودە[3].

## دووەم -ئیجماع:

ئەوانەی پێیانوایە تەڵاقی سێ بە یەك جـار دەکـەوێت بەڵگـەیان هێناوەتـەوە بـە ئیجماعی بێدەنگبوونی دامـەزراو لـە سـەردەمی عومـەری کـوڕی خەتابـدا و دەڵێن: هەواڵی ئاحاد گەر بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی تەنها یەك تەڵاق دەکەوێت ئەوا لەبەردەم بەڵگەی ئیجماعدا خۆی ناگرێت.

"ابن حجر العسقلاني" دەڵێت: (ئـەوەی لـەم پرسـەدا روویـداوە وەك ئەوەیـە لـە پرسی موتعەدا روویداوە، هەردوو یەکسـانن، بۆیـە پارسـەنگدراو لـە دوو بابەتەکـەدا حەرامکردنی موتعە و خستنی تەڵاقی سێیە بە یەك لەبەر ئەو ئیجماعەی لە سەردەمی

---

[1] المرجع السابق.

[2] زاد المعاد ٦٠/٤.

[3] مثـل: فـتح البـاري المرجـع السـابق، عمـدة القـاري المرجـع السـابق ٢٣٣/٢٠ـ٢٣٤، نيـل الأوطـار ٢٦٢/٦ـ٢٦٣. سبل السلام ٢٢٦/٢ وما بعدها.

عومەردا لەسەری دامەزراوە، تۆمارنەکراوە کەسێك لەو دوانەدا سەرپێچی کردبێت).

## سێیەم پێوانە:

دەڵێن: تەڵاقی سێ بە یەك مافێکە لە مافەکانی پیاو بۆی هەیە بە یەك جار بکەوێت پێوانە بۆ سەر هەموو مافەکانی تری، لە "المغني"دا[1] هاتووە: (لەبەر ئەوەی هاوسەریی موڵکێکە ناتوانرێت کۆتایی پێ بێت بە بەش بەش یان بە کۆ وەك هەموو موڵکەکانی تر)

هەروەها پێوانەیان کردووە بۆ سەر نەزر و سوێند، "ابن رشد" دەڵێت: (هەر کەس تەڵاقی چوواندووە بە کردارەکان کە لە دروستی رودانیدا شەرعیبوونی مەرجەکان تیایدا بە مەرج دەگیرێت–وەك هاوسەرگیری و کڕین و فرۆشتن– ئەوا دەڵێت پێویست ناکات، هەرکەسیش بە نەزر و سوێند چوواندوویەتی (ئەوەی کەسەکە بە پێویستی گرتووە لەسەری پێویست دەبێت لەسەر هەر سیفەتێك بێت) تەڵاق پابەند دەکات بە هەر شێوازێك تەڵاقدەرەکە لەسەر خۆی پێویست کردبێت).

### گفتوگۆ لەسەر ئەم بەڵگانە:

### ١–بەڵگە لە فەرموودەکەی رەکانەدا نییە:

زۆربەی زانایانی فەرموودە پێیانوایە ریوایەتی "البتة(واتە تەڵاقی سێ)" لەرزۆکە یان نادروستە، لە سەنەدەکەیدا کەسی نەناسراو و تانەلێدراوی تێدایە، هەروەها لەبەر ئەوەی لە ریوایەتی جۆراوجۆردا و بە سەنەدی لەیەکتر جیاواز ریوایەتکراوە.

"الشوکاني" دەڵێت: ("الترمذي" دەڵێت: پرسیارم لە محمد(واتە البخاري) کرد دەربارەی وتی: لەرزۆکی تێدایە، پاشان شەوکانی بەردەوام دەبێت لە قسەکەی و دەڵێت: زیاتر لە یەك کەس بە لاوازیان داناوە، وتراویشە فەرموودەیەکی وازلێهێنراوە(مەتروکە)، هەروەها "الترمذي" لە "البخاري"ەوە باس ئەوەی کردووە

---

[1] المغني والشرح الكبير ٢٤٣/٨.

کە لەرزۆکی تێدایە، جارێك تیایدا دەوترێت: سیٚ، جارێکیش وتراوە یەك.. بۆیە لەگەڵ لاوازییەکەیدا لەرزۆکە...)[1].

ئیبن تەیمیە دەڵێت: (ئیمامە مەزنە عاریفەکان بە لاوازییەکانی فەرموودە و تێگەیشتن لێی وەك ئیمام "أحمد بن حنبل و البخاري"، و کەسانی تریش وەك ئیبن عوبەید و ئیبن حەزم.. فەرموودەی "البتة–تەڵاقی سیٚ بە سیٚ"یان بە لاواز داناوە و ئەوەیان ڕۆشن کردۆتەوە راوییەکانی نەناسراون و راسترەوی و دروست تۆمارکردنیان نەناسراو و نەزانراوە)[2]

لە "إغاثة اللهفان"دا[3] هاتووە: (ئەوە فەرموودەیەکی سەحیح نییە، "أبو الفرج الجوزي" لە کتێبی "العلل"دا دەڵێت: ئەحمەد دەڵێت: (ئەوە فەرموودەیەکە جێگیر نەکراوە) هەروەها "الخلال" لە کتێبەکەیدا(العلل) دەڵێت: لە "الأثرم"ەوە وتم بە ئەبی عەبدولاٚ فەرموودەی رەکانە لە "البتة"دا چۆنە، ئەویش بە لاوازی دانا) لە "زاد المعاد"دا[4] هاتووە: ("البخاري" شایەتیداوە ریوایەتەکە لەرزۆکی تێدایە، ئیمام ئەحمەد دەڵێت: هەرهەموو ڕێگەکانی لاوازن)، لە مەسنەدی ئیمام ئەحمەددا ژمارە (٢٣٨٧): (لە ئیبن عەباسەوە: رەکانەی کوڕی عەبد یەزید برای موتەلیب ژنەکەی تەڵاقدا بە سیٚ لە یەك دانیشتندا دواتر دڵتەنگییەکی زۆر بۆ ژنەکەی رووی لێکرد، دەڵیٚ: پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکرد: چۆن تەڵاقت دا؟ وتی: بە سیٚ تەڵاقمدا، فەرمووی: لە یەك دانیشتندا؟ وتی: بەڵیٚ، فەرمووی: ئەوە یەك تەڵاقە گەر دەتەویٚ بیگێڕەرەوە دەڵێت: منیش گێڕامەوە، لە ریوایەتێکی تردا سیٚ تەڵاق تەنها یەك جار دەکەوێت.

---

[1] لمزيد من التفصيل يراجع نيل الأوطار شرح منتقى الاخبار من احاديث سيد الاخيار للشوكاني، ٢٥٥/٦ وما بعدها.

[2] يراجع مجموع فتاوى ابن تيمية ١٥/٣٣.

[3] ٣٣٣/١.

[4] ٣٣٣/١.

سەریاری هەموو ئەوانە ئەهلی مەدینە بە سێیان دەوت "البتة"، بینا لەسەر ئەوە فەرموودەکەی ڕەکانە ئاماژە ناکات بۆ ئەوەی تەڵاقی سێ لە یەك جاردا سێی خستبێت.

## ٢-فەرموودەکەی ئیبن عمر بەڵگەی تێدا نییە:

چونکە ئەو زیادەی جمهوور بەڵگەیان پێهێناوەتەوە لەسەر کەوتنی تەڵاقی سێ بە یەك جار هیچ کام لە متمانەدارەکان ڕیوایەتیان نەکردووە، لە ڕێگەی مالیکەوە لە نافیعەوە لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: (فەرمانی پێ بکە با بیگێڕێتەوە و پاشان لەخۆیبگرێت تا پاك دەبێتەوە و پاشان دەکەوێتەوە حەیز و پاشان پاك دەبێتەوە پاشان گەر بیەوێت لەخۆی بگرێت و گەر بیەوێت تەڵاقی بدات بەر لەوەی بچێتە لای، ئەوە ئەو عیدەیە کە خودا فەرمانی کردووە ئافرەتی تێدا تەڵاق بدرێت).

لە ڕێگەی "ئەنەس بن سیرین"ەوە: ئیبن عومەر ژنەکەی تەڵاقدا و لە حەیزدا بوو، عومەر ئەوەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد فەرمووی: با بیگێڕێتەوە، وتم: ئەوە حساب دەکرێت؟ فەرمووی: ئەی چی(واتە گەر ئەو تەڵاقە حساب نەکرێت ئەی چی حساب دەکرێت)

لە ڕێگەی ئیبن جوبەیرەوە: (با بیگێڕێتەوە) وتم: حساب دەکرێت؟ فەرمووی: (ئەی ئەگەر دەستەوسان و گەمژە بوو)؟ واتە منداڵ و شێت نییە تا تەڵاقی نەکەوێت[1]، هەر بەو جۆرە لە هەموو ڕێگە دروستەکانی ترەوە ئەم زیادەیە نابینرێتەوە کە بریتییە لە: (ئەی ئەگەر بە سێ تەڵاقتدا) کە جمهوور کردوویانەتە بەڵگە[2].

پاشان لە سەنەدی ریوایەتەکەدا "شعیب بن نریعة" بوونی هەیە کە لاوازە، هەروەها "معلی بن منصور" ئیمام ئەحمەد لەسەری دەڵێت: کەسێکی درۆزنە،

---

(١) المرجع السابق.

(٢) لمزيد من التفصيل وللاطلاع على جميع الروايات لحديث ابن عمر يراجع عمدة القاري المرجع السابق، كتاب الطلاق.

هەروەها "عطاء الخراساني" کەسێکی لاوازە.

## ٣-بەڵگە لە فەرموودەکەی عبادە بن صامتدا نییە:

چـونکە راوییـەکان نەناسـراون یـان لاوازن، ئـیبن قـیم دەڵێـت: (بـەڵام بەڵگەهێنانەوەتان بە فەرموودەکەی عوبادەی کوڕی صامت کە عبدالرزاق ریوایـەتی کردووە هەواڵێکە لە ئەوپەڕی لاوازیدا، چونکە لە سەنەدەکەیدا "یحیی بن العلاء" لـە "عبید الله بن الولید الوصافي"ەوە لە "ابراهیم بن عبد الله"ەوە لاوازە لە "مالـك"ەوە لە نەناسراوێکەوە"، پاشان ئـەوەی بەڵگەیـە لەسـەر درۆ و پووچـەڵییەکەی ئەوەیـە شتێك لە ئاساری فەرموودەی "سەحیح و سـەقیم و متصـل و منقطـع"ی نـەزانیوە، باوکی عوبادەی کوڕی صامت بە ئیسلام گەیشت، ئیتر چۆن باپیری؟!!! ئەمە بـێ هیچ گومانێك ئەستەمە)[1]

## ٤-بەڵگەهێنانەوە بە فەرموودەکەی "عمیر العجلاني" دروست نییە:

چونکە جێ بەڵگەکەی گەر ئەو شوێنە بێت: هەندێك دەڵێن جیابوونەوە راستەوخۆ کەمێك دوای لەعنی یەکەمی مێردەکە روودەدات وەك چۆن ئەوە مەزهەبی شافیعییە یان کەمێك دوای لەعنی دوو هاوسەرەکە وەك چۆن یەکێکە لـە ریوایەتـەکانی ئیمـام ئەحمەد، بۆیە بەڵگەپێهێنانەوەی پووچ و بێبنەمایە، چونکە ئـەوکات تـەڵاق دەبێتـە ژاوەژاو، "الجصاص" دەڵێت: (بـۆ شـافیعی دروسـت نییـە بەڵگـەی پـێ بهێنێتـەوە چونکە لە مەزهەبەکەیدا: جیابوونەوە بە لـەعنی مێردەکـە روویـداوە بـەر لـە لـەعنی ژنەکە بۆیە لەیەکتر پچڕاون و تەڵاق دوای ژنەکە ناکەوێت، ئیتر چۆن تـەڵاقی لەسـەر رەد دەکرێتەوە کە نەکەوتووە و حوکمەکەی جێگیر نەبووە؟)[2]

ئیبن قودامە دەڵێت: (فەرموودەی دوو لەعنکارەکە لەیەکتر پێویست نییە، چونکە جیابوونەوەکە بە تەڵاق نەبووە، بەڵکو تەنها بە لەعنیان روویداوە، لای شافیعی تەنها

---

[1] ینظر زاد المعاد في هدي العباد. محمد خاتم النبي بن وأمّام المرسلين للأمّـام ابـن قـيم الجوزيـة، ٥٩/٤.

[2] يراجع لحكام القرآن للأمّام الرازي الجصاص، ٢/٨٠ـ٨١.

بە لەعنی پیاوەکە روویداوە بۆیە بەڵگەی تێدا نییە)[1].

هەر بەو جۆرە بەڵگە پێهێنانەوەی دروست نییە بۆ ئەوانەی جیابوونەوە لەدوای لەعن لە دادوەر بە مەرج دەگرن، چونکە ئەم هاوسەرگیرییە رێگەیەکی لەبەردەمدا نەماوەتەوە بەڵکو سڕانەوەی پێویست بووە و بۆ هەتاهەتایە حەرامکراوە، ئەمە بریتییە لە رای پارسەنگدراو وەك فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی پێ دەکات: (دوو لەعنکارەکە لەیەکتری هەرگیز کۆنابنەوە)[2]، بەڵام تەڵاقدان بە سێ لە لەعنکارەوە بۆ دڵنیاکردنەوەی رازیبوونی ئەو بووە بە حەرامکردنی سەرهەڵدراو لە لەعنەوە، ئیبن قودامە دەڵێت: (لەعن حەرامبوونی هەتاهەتایی پێویست دەکات، چونکە تەڵاق لەدوای ئەوە وەك تەڵاق وایە لەدوای هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیری)[3].

ئیبن قیم دەڵێت: (بەڵگەهێنانەوەتان بەوەی لەعنکار ژنەکەی بە سێ تەڵاقداوە بە ئامادەبوونی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموودەیەکی سەحیحە و ئێوە بەڵگەیەکی زۆری پێ دەهێننەوە لەسەر دروستی تەڵاقی سێ بە یەك وشە... پاشان بەڵگەهێنەرەوە بەمە گەر لەوانە بوو دەڵێت: جیابوونەوە تەنها کەمێك پاش لەعنی پیاوەکە روویداوە وەك شافیعی دەڵێت یان کەمێك پاش لەعنی هەردووکیان با حاکمیش جیای نەکردبنەوە وەك ئەحمەد دەڵێت لە یەکێك لە ریوایەتەکاندا، بۆیە بەڵگە پێ هێنانەوەی پووچ و بێبنەمایە، چونکە تەڵاقی سێ ئەوکات ژاوەژاوە و هیچ مانایەکی نییە، گەر لەوانەش بوو جیابوونەوە لەسەر جیاکردنەوەی حاکم رادەوەستێنێت نیسان بەڵگە پێ هێنانەوەی دروستە، چونکە ئەم هاوسەرگیرییە رێگەیەك لەبەردەمیدا بۆ مانەوە و بەردەوامی نەماوەتەوە، بەڵکو سڕینەوەی پێویست بووە و حەرامبوونەکەی هەتاهەتاییە، بۆیە تەڵاقی سێ دڵنیاکەرەوەی مەبەستی لەعنەکە بووە و دانپیادانان بووە بۆی...)

---

[1] المغني والشرح الكبير، ٨/٢٤٢.

[2] نيل الأوطار ٦/٢٤٢.

[3] المغني والشرح الكبير المرجع السابق.

## ٥-فەرموودەکەی عائشە(خوا لێی ڕازی بێت):

ئاماژە بەوە ناکات تەڵاقی سێ بە یەك جار کەوتبێت، بەڵکو ئەوەی ئاماژەی پێ دەکات ئەو ژنە مێردەکەی بە سێ تەڵاقی دا، ئەمە قسەیەکی ڕۆشنە لەوەدا لە ڕوویەکی ڕەواوە بووە واتە جار لە دوای جار بووە بە بەڵگەی نەبوونی ڕەخنە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، ئیبن قیم دەڵێت: (لە کوێی فەرموودەکەدا هاتووە ئەو پیاوە بە یەك جار(بە یەك وشە) سێ تەڵاقەکەی خستووە؟ بەڵکو فەرموودەکە بەڵگەیە بۆ ئێمە، ناوترێت ئەو کارەی سێ جار کرد، وتی: سیان جگە لەوەی ئەنجامی داوە، هەروەها وتی جار لە دوای جار ئەمە ئەو ماقووڵەیە لە زمانی گەلان بە عەرەب و عەجەمەوە وەك دەوترێت سێ جار قەزفی کرد، یان سێ جار جنێوی پێدا، یان سێ جار سەلامی لێکرد)[1].

ئیبن حجر العسقلاني لە "فتح الباري"دا[2] دەڵێت: (ئەوە هەڵدەگرێت مەبەست پێی بە تەڵاقدانێك تەڵاقیداوە بڕینی پەتی ژن و مێردی لێوە بەرهەم هاتبێت، ئەوەش گشتیترە لەوە بە یەکەوە یان بە جیا سێ تەڵاقی دابێت، ئەوەی پشتیوانی دووەم دەکات ئەوەیە کە لە "كتاب الأدب"دا دێت لە ڕوویەکی ترەوە کە ژنەکە وتویەتی تەڵاقی دام بە تەڵاقدانی دوایینی سێ تەڵاقەکە)

## ٦-فەرموودەکەی مەحمودی کوڕی لەبید بەڵگەیە لەسەریان نەك بەڵگە بێت بۆیان:

ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر نادروستی کۆکردنەوەی نێوان سێ تەڵاقەکە بە یەك جار و نابێتە پاڵپشت بۆ ئەو کەسەی دەڵێت ئەو کارە ڕێگەپێدراوە، چونکە وێنا ناکرێت پێغەمبەر(ﷺ) دان بە کارێکدا بنێت گاڵتە و یاریکردن بێت بە کتێبەکەی خودا.

---

[1] زاد المعاد المرجع السابق، ٥٩/٤.

[2] بشرح صحيح البخاري، ٣٨٧/٩.

لە "إغاثة اللهفان"دا هاتووە: (بەڵگە پێ هێنانەوەی لەسەر رێگەپێدراوی ئەوە لە دەروازەی هەڵگێڕانەوەی راستییەکان و بەڵگەهێنانەوەیە بە مەزنترین شتێك ئاماژە بە حەرامکردن دەکات نەك ئاماژە بۆ موباحبوون، بەڵگە پێ هێنانەوەی لەسەر کەوتنی تەڵاقی سێ لە دەروازەی رمڵێدان و گومانکارییە، بەڵام کەسی چاولێکەر گوێ بە سەرخستنی چاولێکەرییەکەی نادات بەوەی بۆی رێکدەکەوێت، چۆن دەبێت گومان بە پێغەمبەر(ﷺ) ببرێت گولیە رێگەی بە کارێك داوە و بە راستی زانیوە و بە شەرع و حوکمی داناوە و جێبەجێی کردووە لە کاتێکدا ئەو کارە یاریکردنە بە کتێبەکەی خودا)[1]، سەرباری ئەوەی فەرموودەکە تانەلێدراوە، ئیبن حجر العسقلانی دەڵێت: (مەحمود بن لەبید لەسەردەمی پێغەمبەردا لەدایکبووە ئەوە جێگیر نەبووە گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) گرتبێت، هەرچەند هەندێکیان لە هاوەڵان ناوی دەهێنن هەڵبەت ئەوە بەهۆی بینینەوە بووە، "النسائي"-دوای دەرهێنانەکەی- دەڵێت: (هیچ کەس ناناسم ریوایەتیان کردبێت جگە لە "مخرمة بن بكير" لە باوکییەوە.. وتراویشە لە باوکی نەبیستووە.. پاشان "العسقلانی" بەردەوام دەبێت لە قسەکەی و دەڵێت: لەباری دروستی فەرموودەکەی مەحموددا رۆشن کردنەوەی ئەوەی تێدا نییە ئایا سیانەکەی بەسەردا تێپەڕاند لەگەڵ رەخنە لێگرتنی خستنی سیان بە کۆ یان نە؟)[2].

## ٧-لە فەرموودەکەی فاتیمەی کچی قەیسدا پاڵپشت بوونی نییە:

چونکە تەڵاقەکەی ئەو بە یەك گوزارە نەبووە بەڵکو لەسەر باری رەوا لە یەکتر جیابووە، پرسیار بووە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی خەرجی و شوێنی نیشتەجێبوون لەدوای تەڵاقی سێیەم.

پاشان ئەم فەرموودەیە ئیمامی "مسلم" لە سەحیحەکەیدا ریوایەتی کردووە لەژێر ناونیشانی "المطلقة البائن لا نفقة لها-تەڵاقدراو بە تەڵاقی بائین خەرجی بۆ نییە" نزیکەی بیست ریوایەتی پاڵپشتکەری گێڕاوەتەوە، هەروەها "أبو داود" لە

---

[1] اغاثة اللهفان ١/٣٣٢.

[2] فتح الباري بشرح صحيح البخاري ٩/٣٦٢. ه-

سونەنەکەیدا لەژێر ناونیشانی "نفقة المبتوتة–خەرجی تەلاقدراو بە سێ تەلاق"دا نزیکەی بیست ریوایەتی پاڵپشتکەری ریوایەت کردووە، جگە لەوەی دوو ئیمامەکە لە دەروازەکانی تر ریوایەتیان کردووە، ئەوەی ئیمامی "البخاري" ریوایەتی کردووە دابەشی کردووە بۆ دەروازەکانی فیقھ بە سروشتی خۆی، پوختەی گوزارەی ریوایەتەکان لە سەحیحی "مسلم والبخاري" و سونەنی "أبي داود"دا بەم جۆرەیە:

أ–مێردەکەی فاتیمە تەلاقیدا... و رۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)

ب–مێردەکەی تەلاقیدا و تەلاقەکەی کۆتایی و براوە بوو.

ج–مێردەکەی بە تەواوی و براوە تەلاقیدا.

د–مێردەکەی بە سێ تەلاقیدا.

هـ–مێردەکەی دوایین تەلاقی سێ تەلاقەکەیدا.

و–مێردەکەی ئەو تەلاقەی مابوو بۆی نارد.

لە گوزارەیەکی دروستدا: تەلاقیدا بە دواین تەلاقی سێ تەلاقەکە و سەنەدەکەی سەحیحە.

ئەم ریوایەتە پوختەی "بە سێ تەلاقیدا" لێکدەداتەوە(رۆشن دەکاتەوە) بەمەش فەرموودەکە ئاماژە بەوە ناکات کە هەر سێ تەلاقەکەی بە یەکەوە دابێت.

## ٨–گفتوگۆ لەسەر فتواکەی ئیبن عەباس و تەئویلی ریوایەتەکەی:

کۆمەڵێك تێبینی لەسەر وەرگرتنی فتواکەی ئیبن عەباس و لەسەر تەئویلەکانی ریوایەتەکەی دەخرێتە روو بە جۆرێك بەرھەڵستی نێوان ریوایەتەکە و فتواکە هەڵبگرن، گرنگترینیان:

### یەکەم–کارکردن بە فتواکەی ئیبن عەباس نەك بە ریوایەتەکەی:

وا دەردەکەوێ جمهوور کاریان نەکردووە بەوەی ئیبن عەباس ریوایەتی کردووە لەوەی تەلاقی سێ یەك تەلاق بووە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و سەردەمی ئەبوبەکر و دوو ساڵی سەردەمی خەلافەتی عومەردا، بەڵکو کاریان بەوە کردووە پرسیارکەری فتوا وتویەتی کە ژنەکەی بە سێ تەلاق دابوو: (تۆ لە خودا نەترساوی،

بۆیە دەروویەك بۆ تۆ شك نابەم، لە پەروەردگارت یاخی بوویت و ژنەکەشت لێ جیابووەتەوە) واتە بە بەینوونەی گەورە لێی جیابووەتەوە بە بەلگەی وتنی: (دەروویەك بۆ تۆ شك نابەم) شوێنکەوتنی ئەو فەقیهانە بۆ رێگەی کارکردن بە فتواکە نەك بە ریوایەتەکە لەم بابەتەدا بە بەرهەڵستییەکی راشکاو بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ ئەوەی رای زانایانی ئوسوڵی لەسەر بینابووە لە پێشخستنی ریوایەتی هاوەڵان بەسەر فتواکەیدا لەباری بەرهەڵستی کردنیان بە یەکتری.

بۆ نموونە: ئیبن عەباس فەرموودەیەکی ریوایەت کردووە لە فەرموودەکەی "بورەیرە"وە فرۆشتنی کەنیزەك بریتی نییە لە تەڵاق، پاشان فتوایداوە تەڵاقە، و کاریان بە ریوایەتەکەی کردووە[1].

چوار ئیمامەکە و کەسانی تر کاریان بە هەواڵەکەی عائشە –خوا لێی رازی بێت– کردووە لە حەرامبوونی مێردی ژنێك شیریان خواردبێت[2]، پێچەوانەی ئەمە بەدروستی لێیان گێڕاوەتەوە، چونکە ئەو کەسانەی کچی خوشکەکانی هاوشیریان بوو دەچوونە ژوورەوە بۆ لای نەك ئەوانەی ژنی براکانی هاوشیریان بوو[3].

ئیبن حجر دەڵێت: (خولع هەڵوەشانەوەیە بە فتوای ئیبن عەباس و تەڵاقە بە ریوایەتەکەی، هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) گەر پێچەوانەی ریوایەتەکەی فتوای دا بەهەندوەرگیراو ئەوەیە ریوایەتی کردووە نەك ئەوەی بۆیچووە)[4].

ئەبو هورەیرە فەرموودەی حەوت جار دەرکردنی گڵاوی لە دەمخستنە ناوی سەگ ریوایەت کردووە، پاشان پێچەوانەی ئەوە فتوایداوە، جمهوور کاریان بە ریوایەتەکەی کردووە[5].

---

[1] زاد المعاد ٤/٦٠. اعلام الموقعين ٣/٥١.

[2] أي الرجل الذي هو زوج المرضعة، ونسبة اللبن اليه مجاز لكونه السبب فيه.

[3] فتح الباري شرح صحيح البخاري ٩/١٥٠.

[4] اعلام الموقعين ٣/٥١.

[5] اعلام الموقعين المرجع السابق.

## دووەم-گفتوگۆ لەسەر بانگەشەی نەسخ:

وتنی ئەوەی فەرموودەی(کاتی خۆی تەڵاقی سێ یەك بوو) بەپێی ئەو فەرموودە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و سەردەمی ئەبوبەکر و دوو ساڵی یەکەمی خەلافەتی عومەردا کاری پێکراوە و پاشان نەسخکراوەتەوە قسەیەکی رەدکراوەیە بە کۆمەڵێك هۆ، لەوانە:

١-ئەو رێسا گشتییەی ئومەتی ئیسلام کۆدەنگیان هەیە لەسەری داوای ئەوە دەکات دەق لە قورئان بێت یان لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) تەنها دەق دەیسرێتەوە، و هەموارکردنەوە و گۆڕانی شەریعەتی ئیسلام و حوکمەکانی بە مردنی پێغەمبەر(ﷺ) کۆتاییان پێهاتووە.

٢-عومەری کوڕی خەتاب-خوا لێی رازی بێت- نەسخ ناکاتەوە حاشا ئەو کاری وا بکات و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بە بۆچوونی خۆی نەسخ بکاتەوە، گەر کاری وای بکردبایە هاوەڵان لێی راست دەبوونەوە، حاشا هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دان بە کارێکی لەو جۆرەدا بنێن عومەر ئەنجامی دابێت.

٣-گەر نەسخەکە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بوو چۆن دروستە راویەکە(ئیبن عەباس) هەواڵ بدات لە مانەوەی حوکمەکە لە خەلافەتی ئەبو بەکر و هەندێ لە خەلافەتی عومەردا؟

٤-گەر بوترێت بە کۆدەنگی هاوەڵان نەسخکراوەتەوە ئەوا قبوول دەکرێت گەر ئیجماعەکە لەسەر جێگیرکردنی دەقە نەسخکەرەوەکە بێت، بەڵام ئەو ئیجماعە لە کوێیە؟ ئەو دەقە کامەیە؟ بەڵام گەر ئەوان لەخۆیانەوە نەسخیان کردبێتەوە ئەوا پەنادەگرین بە خودا، چونکە ئیجماعێکە لەسەر هەڵە و ئەوانیش بە کۆ لەو کارە مەعسومن.

٥-گەر بوترێت نەسخکەرەوەکە لە سەردەمی عومەردا دەرکەوتبێت ئەوا رەد دەکرێتەوە بەوەی ئەوەش دیسان هەڵەیە، چونکە داننانە بە ئیجماعی هاوەڵاندا لەسەر هەڵە لە درێژایی ماوەی خەلافەتی ئەبو بەکر و دوو ساڵی یەکەمی

خەلافەتی عومەردا، پاشان چۆن نەسخکەر و نەسخکراو بە شاراوەیی لە ئومەتی ئیسلام دەمێننەوە بە درێژایی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و خەلافەتی ئەبوبەکر و دوو ساڵی خەلافەتی عومەر؟ بە تایبەت لە پرسێکی ترسناکدا کە پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بە حەلاڵ و حەرام و ناموسی موسڵمانانەوە.

٦-وتنی نەسخ بەرهەڵستی دەکات بە بەرهەڵستییەکی رۆشن لەگەڵ قسەکەی عومەری کوڕی خەتاب-خوا لێی رازی بێت-: (خەڵك پەلە دەکەن لە شتێکدا کاتی خۆی هێواشی و لەسەرخۆیی تێدا هەبوو بۆیان) ئایا بۆ ئومەتی ئیسلامی هێواشی و لەسەرخۆی بۆ حوکمێکی نەسخکراو بوونی هەیە؟ سەرباری ئەوە ئاشکرای قسەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کرداری گۆڕینی حوکمەکە لە خودی عومەرەوە بووە لەو سۆنگەیەوە سزایەکی تەمبێکارانە بووە بۆ سەر هەموو ئەوانەی پەلە دەکەن لە کارێك خودا هێواشی و لەسەرخۆیی تێدا داناوە و فەرمانی کردووە پێیەوە پابەند بن[1].

## سێیەم-گفتوگۆی تەئویلی(کاتی خۆی سێ یەك بوو):

تەئویلی فەرموودەی "کاتی خۆی تەڵاقی سێ یەك بوو": بەوەی ئەوان لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) و سەردەمی خەلافەتی ئەبو بەکر و دوو ساڵی خەلافەتی عومەردا سیانیان بەکاردەهێنا، بەڵکو "تۆ هەر سێ تەڵاقەکەت دراوە" لە سەردەمی عومەردا داهێنراوە و ئەویش بە سەریاندا تێپەڕاند وەك سزایەك، ئەمە تەئویلێکی دوورە لە چەند روویەکەوە، لەوانە:

١-ئاشکرای فەرموودەکە وەرناگیرێت، لە مەرجەکانی تەئویلیش ئەوەیە دەقەکە وەربیگرێت.

٢-فەرموودەکە بە چەندین ریوایەت ریوایەتکراوە هەموویان بەرهەڵستی دەکەن لەگەڵ ئەم تەئویلەدا، لەوانە:

---

[1] لمزيد من التفصيل يراجع فتح الباري ٣٦٤/٩.
نيل الأوطار ٢٦٢/٦ .

أ–ریوایەتەکەی "مسلم" و کەسانی تر لە تاووسەوە لە ئەبا سەهبائەوە وتی بە ئیبن عەباس: ئەوە دەزانیت کاتی خۆی سێ بە یەك دادەنرا لـە سـەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر و سێ ساڵ لە ئەمارەتی عومـەر؟ ئـیبن عـەباس وتی: بەڵێ[1].

گوزارەی(بە یەکیان دادەنا) دژایەتی هەیە لەگەڵ ئەم تەئویلەدا.

ب–لە رێگەی موعەمەر و ئیبن جورەیجەوە لە تاووسـەوە لـە باوکییـەوە: ئـەبا سەهبا وتی بە ئیبن عەباس: تۆ ئەوە دەزانی سێ لـەکاتی خـۆی دەکـرا بـە یەك لە سەردەمی پێغەمبەر و ئەبو بەکر و سـەرەتای ئـەمارەتی عومـەردا؟ وتـی: بـەڵێ، "مسـلم" لـە سـەحیحەکەیدا ریوایـەتی کـردووە، هـەروەها لـە گوزارەیەکـدا: دەزانـی سـێ لـە سـەردەمی پێغەمبـەر(ﷺ) و ئـەبو بـەکر و سەرەتای خەلافەتی عومەردا بۆ یەك دەگەڕایەوە؟ وتـی: بـەڵێ[2]، رسـتەی "بۆ یەك دەگەڕایەوە" دیسان گونجاو نییە لەگەڵ تەئویلی باسکراودا.

٣–بە ئەگەری هەڵگرتنی ئەم تەئویلە پێویستە دەسەلاتی تەشریع کردنی حوکمێك –پێچەوانەیە بەوەی خودا و پێغەمبـەر فـەرمانیان پێکـردووە– بـە گـەورەمان عومەر رابیبنین، چونکە داننانە بە داهێنانی گوزارەی "سێ بـە سـێ"دا کـە بـە بیدعەیەکی خراپ دادەنرێـت و پێچـەوانەیە لەگـەڵ ئـەوەی قورئـان و سـوننەت رایانگەیاندووە لە دابەش کردنی تەلاق بەسەر سێ جاردا نەك ژمارە.

چۆن دەبێت نموونەی ئەو جۆرە تەشریعە بدرێتە پاڵ گەورەمان عومەر؟ بـەڵێ عومـەر هەسـتاوە بـە تایبـەتکردنی دەق و سـنووردارکردنی بینـا لەسـەر بەرژەوەندی گشتی و دروستکردنی دامەزراوەی ئیـداری و قـەزایی و سـەربازی وەك داهێنانی دیوان لـەپێناو بەرژەوەنـدی گشـتیدا.. بـەڵام چ بەرژەوەندییـەك بوونی هەیە لە روخانی بینای هاوسەریدا بە چرکەساتێك کە تەمـەنێك لـە ژیـانی

---

[1] مجموع فتأوى ابن تيمية ١٣/٣٣.

[2] زاد المعاد ٥٤/٤.

تێـدا بـەختكراوە؟ چ بەرژەوەندییـەك لـە وێرانكـاری و روخانێكدایـە كـە سەردەكێشێت بۆ هەڵوەشانەوەی خێزان و ئاوارەبوونی منداڵەكان؟

٤-ئەو فەقیهانەی دەڵێن: هەر سێ تەڵاقەكە بە یەك جار كۆتاییان پێ دێت خۆیـان پاڵپشت كردووە بە كۆمـەڵێك فـەرموودە پشـتیوانی لـە بـەكارهێنانی گوزارەی تەڵاقی سێ بە سێ دەكات لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ)

٥-تەئویلی ئەوەی خەڵكی لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا یەك تـەڵاقیان دەدا و لـە سەردەمی عومەردا سێ تەڵاقیان دەدا لە دەروازەی تەومژ و چەواشەكارییە- وەك ئیبن قەیم دەڵێت- نەك لە دەروازەی رۆشنكردنەوەی مەبەست.

## چـوارەم-گفتوگۆ لەسـەر ئـەوەی فەرموودەكـە تایبەتـە بـە بـاری دووبارەكردنەوەی قسە:

پێشتر باسمان كرد هەندێ لەوانەی فتوایان داوە سێ تەڵاقەكە بە یەكجار بكەوێت پێیانوایە فەرموودەكەی ئیبن عەباس لە میانەی حاڵەتی دووبارەبوونەوەی گوزارەی دارشـتنی تەڵاقـدا لـە مێردەكـەوە هـاتووە، بـەوەی بڵێـت: (تـۆ تەڵاقـدراوی، تـۆ تەڵاقدراوی، تۆ تەڵاقدراوی)، بانگەشەی مەبەستی دڵنیاكردنەوە بەهۆی سەلامەتی و خاوێنی دڵ و دەروون لە چاخی یەكەمـدا لـە مێردەكـە قبـووڵ دەكرا، بـەڵام كاتێ: دەروونەكان گۆڕان و ئەمانەت تیاچوو لە سەردەمی عومەردا بڕیاریدا ئەو بانگەشـەیە لێیان قبووڵ نەكرێت.

ئەم تەئویلە لە تەئویلە باسكراوەكانی تر لاوازترە، بەم جۆرە:

١-میانەی فەرموودەكە لە سەرەتایەوە تـا كۆتاییەكـەی رەدی ئـەوە دەكاتـەوە وەك چۆن رۆشنە.

٢-قبووڵ كردنی مەبەستی دڵنیاكردنەوە و قبووڵ نەكردنی حوكمێكی كارپێكراوە لە سەرەتای ئیسلامەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان بەبێ جیاكردنەوەی پیاوێك لـە پیاوێكی تر، هەروەها بەبێ جیاكاری نێوان كەسی بەدكار و كەسی راستڕەو و درۆزن و راسـتگۆ، هـەروەها بـەبێ تایبـەتكردنی بـە كـات و شـوێنێكی

دیاریکراوەوە، قبووڵ کردنی ئەم بانگەشەیە بۆ کەسێك کەمترین دیانەتی هەبێت جێگیرکراوە، گەر نەڵێین لەڕووی قەزاشەوە جێگیرکراوە، بە مەرجێك بەڵگەیەك ڕاست نەبێتەوە دژ بە بانگەشەی مێردەکە.

٣-هەرکەس گوزارەیەکی هێنابێت ئەگەری دڵنیاکردنەوەی تێدا بێت وەك: (تۆ تەڵاقدراوی، تۆ تەڵاقدراوی، تۆ تەڵاقدراوی) بانگەشەی ئەوەی کرد نیەتی دڵنیاکردنەوە بووە بانگەشەکەی بەڕاست دەزانرێت لە هەر کات و سەردەمێکدا بێت، ئەی دەبێ چۆن لە سەردەمی خولەفای ڕاشیدیندا کە باشترین سەدەی ئیسلامە لێی قبووڵ نەکرێ؟

گەر مێردەکە گوزارەیەکی هێنا مەبەستی دڵنیاکردنەوەی هەڵنەدەگرت(وەك تۆ سێ تەڵاقەکەت دراوە) بەراست نازانرێت بە چاوداخستن لە ئەمانەت و ڕاستگۆیی بانگەشەکەرەکە.[1]

## پێنجەم ڕەدکردنەوەی تانە لە ریوایەتەکەی ئیبن عەباس:

"البیهقي" چەند ریوایەتێکی لە ئیبن عەباسەوە خستۆتە ڕوو بە پێویستبوونی سێ بە یەکجار، پاشان لە "ابن المنذر"ەوە گواستوویەتەوە گومان نابرێت بە ئیبن عەباس شتێکی لە پێغەمبەرەوە وەرگرتبێت و پاشان پێچەوانەی ئەوە فتوا بدات، بۆیە پێویستە پارسەنگدان بکرێت بۆ وەرگرتنی قسەی زۆرینە بەسەر قسەی یەك کەسدا گەر پێچەوانەی ئەوان بوو، "ابن العربي" دەڵێت: ئەم فەرموودەیە لە دروستییدا جیاوازی هەیە ئیتر چۆن پێشدەخرێت بەسەر ئیجماعدا؟ هەروەها دەڵێت: فەرموودەکەی مەحمود بن لەبید بەرهەڵستی دەکات، چونکە ڕاگەیاندنی ئەوەی تێدایە گەر پیاوێك بە کۆ سێ تەڵاقەکەی دا پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی پێنەداوە، بەڵکو بەسەریدا تێیپەڕاندووە.

---

[1] لمزيد من التفصيل يراجع نيل الأوطار ٦/٢٦٢. زاد المعاد ٤/١٦.

هەروەها دەڵێن: "مسلم" بە ریوایەتکردنی تەنهاکەوتۆتەوە.. تا کۆتا تانەی ئاراستەکراو بۆ ریوایەتەکەی ئیبن عەباس تاکو هەموو ئەوانە ببنە پاساوێك بۆ کارکردن بە فتواکەی نەك بە ریوایەتەکەی.

لەراستیدا ریوایەتەکەی ئیبن عەباس بەناوبانگە و جێگیربووە و لەلای گەورە پیاوانی ئەهلی فەرموودە وەك "مسلم"–رەحمەتی خودای لێ بێت– بە سەحیح دانراوە.

هەریەك لە ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیم گفتوگۆیان لەسەر ئەوە کردووە هەندێ لە فەقیهان دەستیان پێوەگرتووە کە لە بەهای ریوایەتەکەی ئیبن عەباس کەم دەکاتەوە و بوار دەدات بە کارکردن بە فتواکەی.

ئیبن تەیمیە[1]–رەحمەتی خودای لێ بێت– دەڵێت: (کەسێك نابینینەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) ژنەکەی سێ بە سێ بە یەك وشە تەڵاق دابێت و پێغەمبەر(ﷺ) بە سێ تەڵاقەکەوە پابەندی کردبێت، لەو بارەیەوە فەرموودەیەکی سەحیح یان حەسەن ریوایەت نەکراوە، هەروەها ئەهلی کتێبە بەناوبانگ و متمانەدارەکان لەو بارەیەوە شتێکیان نەگواستۆتەوە، لەو بارەیەوە چەند فەرموودەیەك ریوایەت کراون هەموویان لاوازن بە کۆدەنگی زانایانی فەرموودە، بەڵکو دانراون.

ئەوەی لە سەحیحی "مسلم" و سونەن و مەسانیدەکاندایە لە رێگەی تاووسەوە لە ئیبن عەباسەوە وتوویەتی: (لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر و دوو ساڵی خەلافەتی عومەردا تەڵاقی سێ یەك بوو، عومەر وتی: خەڵکی پەلە دەکەن لە کارێکدا کاتی خۆی هێواشی و لەسەرخۆی بۆ ئەوان تێدا هەبوو، گەر بەسەریاندا تێیبپەرێنین، بۆیە بەسەریاندا تێیپەڕاند)[2]

لە ریوایەتەکەی "مسلم" و کەسانی تردا لە تاووسەوە: ئەبا سەهبا وتی بە ئیبن عەباس: دەزانیت سیان لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر و سێ ساڵ لە ئەمارەتی عومەر بە یەك دادەنرا؟ ئیبن عەباس وتی: بەڵێ.

---

[1] مجموع فتاوى ابن تيمية ٣٣/١٢-١٣.

[2] صحيح مسلم ٢/١٠٩٩

لە ریوایەتێکدا: (ئەبا سەهبا وتی بە ئیبن عەباس: لە زیرەکی و لێوەشاوەیی خۆت بخە روو، ئایا تەلاقی سێ لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ئەبو بەکردا یەك نەبوو؟ وتی: ئەوە بەو جۆرە بوو، کاتێك سەردەمی عومەر بوو خەلکی بەدوای یەکتردا تەلاقیان دەهێنا، ئەویش بە گونجاوی بینی لەسەریان)[1]

ئیبن قەیم–گفتوگۆ لەگەڵ ئەو فەقیهانە دەکات کە تانە لە ریوایەتەکەی ئیبن عەباس دەدەن بە فتواکەی– دەڵێت: (ئایا ئێوە یان هەر کەسێکی تر نموونەی ئەمە لە هەموو فەرموودەیەکی "مسلم"دا کە لە "البخاري" تەنهاکەوتبێتەوە قبوول دەکەن؟ ئایا "البخاري" هەرگیز وتویەتی هەر فەرموودەیەك لە کتێبەکەی مندا نەبێت پووچ و ناڕاستە و نابێتە بەڵگە و لاوازە؟ "البخاري" زۆرجار بەڵگەی هێناوەتەوە بە کۆمەڵێك فەرموودە لە دەرەوەی سەحیح و لە سەحیحەکەیدا باس نەکراوە، زۆر فەرموودەی لە دەرەوەی سەحیحەکەیەوە بە سەحیح داناوە.

پاشان دەڵێت: ئێمە پرسیارتان لێ دەکەین ئایا ئێوە ئەوە وەردەگرن هاوەڵێك ریوایەتی کردبێت یان ئەوەی هاوەڵێك پێیوایە؟ گەر بڵێن: ریوایەتەکەی وەردەگرین ئەمەش قسەی جمهووری ئێوەیە، بەڵکو قسەی جمهووری ئومەتە لەسەر ئەم رایە بارگرانی وەلام لە کۆڵی ئێمە دەکەنەوە.

گەر بڵێن: رایەکەی وەردەگرین دژیەکی بۆچوونەکانتان نیشاندراوە و هیچ چارەسەرێکتان بۆ رەدکردنەوەی نییە، بەتایبەت لە خودی ئیبن عەباسەوەیە...تا کۆتاییەکەی)[2].

**گفتوگۆ لەسەر بەڵگەهێنانەوە بە ئیجماع:**

بانگەشەی ئیجماع بەڵگەنەویست نییە، بەڵکو پێچەوانەی راستی و واقیعە، چونکە زۆرێك لە بەڵگە و ریوایەتی بەناوبانگ هەن دانەمەزرانی ئیجماع دەسەلمێنن –لە چاخێك لە چاخەکاندا– لەمەڕ دروستی کەوتنی سێ تەلاق بە یەك جار لە سەرەتای

---

[1] المرجع السابق.

[2] لمزيد من التفصيل يراجع زاد المعاد لابن القيم ٤/٦٠-٦١.

ئیسلامەوە تا ئەم رۆژگارە.

"ابن حجر العسقلاني"[1] لە شەرحی قسەکەی بوخاری "باب من جوز طلاق الثلاث"دا دەڵێت: (لەو سەردێرەوە ئاماژەی تێدایە لە پێشیندا کەسانێك هەبوون کەوتنی تەلاقی سێی(بە یەك جار) بە گونجاو نەبینیوە)

لە شەرحی فەرموودەکەی "رەکانە"دا: (رەکانەی کوڕی عەبد یەزید ژنەکەی سێ بە سێ لە یەك دانیشتندا تەلاقدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە یەك تەلاقە بگێڕەرەوە گەر دەتەوێت بیگێڕەرەوە)

"العسقلاني" دەڵێت: (لە " علي وابن مسعود وعبد الرحمن بن عوف والزبير"ەوە هەمان شت گوازراوەتەوە، "ابن مغيث" لە "كتاب الوثائق"دا گواستوویەتەوە و داویەتە پاڵ "محمد بن وضاح"، هەروەها "الغنوي" ئەوەی لە دەستەیەك زانای قورتوبەوە گواستۆتەوە وەك: "محمد بن تقي بن مخلد، ومحمد بن عبد السلام الخشني" کەسانی تر، هەروەها "ابن المنذر" لە هاوەڵەکانی ئیبن عەباسەوە گواستوویەتەوە لەوانە: "ابن عباس كعطاء وطاووس وعمرو بن دينار"، هەروەها سەری سوڕدەمێنێت لە "ابن التين" کاتێك پێداگری دەکات لەوەی پێویستبوونی سێ جیاوازی تێدا نییە، بەڵکو جیاوازی لە حەرامکردندایە لەگەڵ جێگیربوونی جیاوازی وەك دەبینی)[2].

"الأمام العيني" لە شەرحی "باب في إجاز الطلاق الثلاث"دا دەڵێت: (واتە ئەم دەروازەیەکە لە رۆشنکردنەوەی ئەو کەسانەی رێگەیانداوە بە تەلاقدانی ژن بە تەلاقی سێ بە سێ بە یەك جار.. "البخاري" ئەم ناونیشانەی داناوە وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی هەندێ لە پێشین کەوتنی سێ تەلاقەی بە گونجاو نەبینیوە، و جیاوازی تێدا هەیە: " طأووس، ومحمد بن اسحاق. والحجاج بن أرطأة، والنخعي، وابن مقاتل" و

---

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري ٣٦٢/٩.

[2] المرجع السابق ٣٦٣/٩.

زاهیرییەکان پێیانوایە گەر پیاوێك ژنەکەی بە سێ بەیەکەوە تەڵاقدا تەنها یەك تەڵاقی کەوتووە.

بەڵگە بەوە دەهێننەوە "مسلم" ریوایەتی کردووە لە فەرموودەکەی تاووسدا: ئەبا سەهبا وتی ئیبن عەباس: ئەوە دەزانیت تەڵاقی سێ بە یەك دادەنرا لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر و سێ ساڵ لە ئەمارەتی عومەردا؟ ئیبن عەباس وتی: بەڵێ [1].

ئیبن تەیمیە دەڵێت: (ئەم قسەیە-واتە تەڵاقی سێ یەك بوو- لە دەستەیەکی گەورەوە لە پێشین و پاشینەوە گوازراوەتەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوداوە، وەك: "الزبیر بن العوام، وعبد الرحمن بن عوف، هەروەها لە"علي وابن مسعود وابن عباس"ەوە لەسەر دوو قسە"[2].

ئیبن قەیم دەڵێت: (ئوممەت کۆنەبوویەوە(واتە لەسەر ئەو پرسە) حەمد بۆ خودا لەسەر جیاوازییەکەی-واتە جیاوازی ئەوەی لە سەردەمی پێغەمبەر و ئەبو بەکر هەبوو بەوەی سێ بە یەك دەکەوت- بەڵکو بەردەوام لەوانەدا هەبوو فتوای پێ دەدا، سەدە لە دوای سەدە هەتا رۆژگاری ئەمڕۆمان، حیبری ئوممەت و تەرجومانی قورئان عەبدوڵای کوڕی عەباس فتوای پێداوە، هەروەها "الزبیر بن العوام، وعبد الرحمن بن عوف" فتوایانداوە سێ بە یەکە، "ابن وضاح" لەو دوانەوە گواستوویەتەوە، هەروەها لە عەلی و ئیبن مەسعود دوو ریوایەت گوازراوەتەوە وەك لە ئیبن عەباسەوە)[3].

بینا لەسەر ئەم سەرچاوە باوەڕپێکراوانە و سەرچاوەی تریش، بانگەشەی ئیجماع لەسەر دروستی کەوتنی سێ تەڵاق بە یەکجار پووچە و هیچ بنچینەیەکی نییە، بەڵکو ئەوە لە دەروازەی تێکەڵیيە لە نێوان ئیجماع و ڕێکەوتنی موجتەهیدانی ئومەتی

---

[1] عمدة القاري شرح صحيح البخاري للعيني ٢٠/٢٣٣.

[2] مجموع فتاوى ابن تيمية ٣٣/٨.

[3] اعلام الموقعين ٣/٤٨ وما بعدها.

محمد(ﷺ) لەگەڵ ئیجماعی فەقیهانی تەنها مەزهەبێك، ئەو دوو ئیجماعە زۆر لەیەكتر دوورن.

**گفتوگۆ لەسەر بەڵگەهێنانەوە بە پێوانە:**

خاوەن رای "كەوتنی سێ تەڵاق بە یەك جار" بەڵگەیان هێناوەتەوە بەوەی نیكاح موڵكی مێردە بۆیە دەتوانێت بە یەكجار لێی دابەزێت پێوانە بۆ سەر دابەزینی هەموو مافەكانی تری.

هەر بەو جۆرە: پێوانەی دەكەنە سەر نەزر و سوێند وەك پێشتر باسمان كرد.

پێمانوایە پێوانە لە هەموو ئەم شێوازانەیدا پووچە بەم بەڵگانە:

**یەكەم:** پێوانە بۆ سەر دابەزین لە هەموو مافەكان: پێوانەیەكی تێكچووە، مرۆڤ ئازاد نییە لە دابەزینی هەموو ئەوەی هەیەتی لە مافەكان، چونكە هەیانە بەرژەوەندی كەسانی تری پێوە بەندە، لە دابەزین لێی زیانگەیاندنی بە ئەوان تێدایە وەك مافی بەخێوكردن ناتوانرێت لە بەخێوكەرەكەی دابرێنیت وەك پارێزگارییەك بۆ بەرژەوەندی منداڵەكە، هەروەها لەبەر ئەوەی مافی هەر كەسێك لە سنوورێكدا كۆتایی پێ دێت كە مافی كەسانی تری لێوە دەست پێ دەكات، بۆیە بۆ پیاو نییە تەڵاقبدات كەی و چۆن بیەوێت لەبەر ئەوەی لەسەر تەڵاقدانەكەی ئاسارێك سەرهەڵدەدات پەیوەندی بە ژن و منداڵەكانەوە هەیە لەوانەیە سەرئەنجامە خراپەكەی تەنها خێزان نەگرێتەوە بەڵكو سەر بكێشێت بۆ هەموو كۆمەڵگە.

ئیسلام هەر لە سەرەتاوە بڕیاریداوە: مافەكان ئەركی كۆمەڵایەتین بۆیە بۆ خاوەنەكانیان نییە هەڵسوكەوتی چۆنێتی پێوە بكەن، دوای هاتنی ئیسلام بە دەیان سەدە پیاوانی یاسا گرنگی ئەم بیرۆكەیان بۆ دەركەوت، یەكەمین فەقیهی فەرەنسی دیكی(Duquit) لە یەكێك لە وانەكانیدا بانگی بۆ كرد، و رایگەیاند موڵكداری ماف نییە، بەڵكو ئەركێكی كۆمەڵایەتییە.

**دووەم:** پێوانەكردنی بۆ سەر رزگاركردنی بەندە: پێوانەیە لەگەڵ جیاوازی، چونكە لە رزگاركردنی بەندەدا سوودی تاك و كۆمەڵگە و ئومەتی تێدایە، بۆیە ئیسلام

هانیداوە و چەندین ڕێگەی گرتۆتە بەر بۆ کۆتاپێهێنانی دیاردەی بە کۆیلەکردنی مرۆڤ لەلایەن برا مرۆڤەکەیەوە کە پێچەوانەیە لەگەڵ بنەمای یەکسانی، قورئان بانگی بۆ ئەم یەکسانییە کردووە و دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أنا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا أن أكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أتْقَاكُمْ﴾[1]، لە کاتێکدا تەڵاق کەمجار خاڵییە لە خراپە و گەیاندنی زیان بە هەردوو هاوسەرەکە یان بە یەکێکیان یاخود زیان بە منداڵەکان.

سێیەم: پێوانەکردنی بۆ سەر نەزر: دووری و تێکچوونی کەمتر نییە لە دوو پێوانەکەی پێشتر، چونکە لە نەزردا پەرسش بۆ خودا بوونی هەیە و کەسەکە دەتوانێت خودی خۆی پێوە پابەند بکات بۆ نزیکبوونەوە لە خودا وەك ئەوەی بڵێت: لەسەرم نەزر بێت فلان شت ببەخشم، یان ئەوەندە ڕۆژ بەڕۆژوو بم، بە پێچەوانەی تەڵاقەوە کە یاخیبوونە و خراپترین حەڵاڵە بۆ لای خودا گەر بۆ پێویستییەکی زۆر و زەرووری پێداگر نەبێت، بەڵام گەر تەنها بۆ پێویستییەك بوو ئەوا تەنها یەك تەڵاقی بەسە، چونکە پێویستییەکان بە بڕی خۆیان ئەندازەگیرییان بۆ دەکرێت.

لە کۆتاییدا بە مفتی و قازی دەڵێم تەنها سەرچاوەیەك بۆ حوکمە شەرعییەکان بریتییە لە قورئان، خودا ﷻ دەفەرموێت: ﴿ان الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ﴾[2]، ڕۆڵی فەرموودە بەرانبەر ئەوەی لە قورئاندا هاتووە لە ڕۆشنکردنەوەدا کورتدەبێتەوە، بۆیە ئەو فەرموودە باسکراوانە لەباری دروستیاندا بەرهەڵستی ناکەن لەگەڵ دەقی قورئاندا کە ئاماژە دەکات بە دابەشکردنی تەڵاق بەسەر سێ قۆناغدا، وەك لە ئایەتی: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾، ئەم ئایەتە بە ئاماژەیەکی بڕاوە ئاماژە دەکاتە سەر ئەوەی تەڵاق دابەشکراوە بەسەر جارەکاندا نەك ژمارەدا، بۆیە ئەو

---

[1] (يَا أَيُّهَا النَّاسُ أنا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا أن أكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أتْقَاكُمْ أن اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) (الحجرات:١٣).

[2] (قُلْ أني عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي وَكَذَّبْتُمْ بِهِ مَا عِنْدِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ أن الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ يَقُصُّ الْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ) (الانعام:٥٧).

فەرموودانـەی کەسـی دەمـارگیر بـۆ مەزهــەب و چـاولێکەر بـە بەڵگـە دەیهێننــەوە پێچەوانەی ئەم ئایەتە و ڕێسا شەرعییە گشتییەکەیە کە هەموو لایەك لەسەری کۆکن و داوا دەکات کارکردن بـە قورئـان بەسـەر کـارکردن بـە فـەرموودە پێشـبخرێت، بـا فەرموودەکەش متەواتیر بێت لە باری بەرهەڵستی نێوانیان، پاشان ئیجمـاع و پێوانـە لـە بەڵگـە ئیجتیهادییــەکانن و ڕێســا شــەرعییە گشــتییە ناوکۆییەکـە داوا دەکـات: (ئیجتیهاد لەباری هاتنی دەقدا بوونی نییە)

## لقی چوارەم:
## دارشتنی هاوتا بە ژمارە
## تەنها یەک تەلاقی پێ دەکەوێت

هەنـدێ لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) و هەنـدێ لـە شـوێنکەوتوان و هەنـدێ لـە شوێنکەتوانی شوێنکەتوان ئەم ئاراستەیان گرتۆتە بەر وەك پێشتر ڕۆشنکرایەوە، لەو فەقیهانەی مەزهەبە ئیسلامییەکان ئەم ئاراستەیان گرتۆتە بەر: "محمد بن مقاتل" لە حەنەفییـەکان و هەنـدێ لـە مالیکییـەکان و هەنـدێ لـە حەنبەلییـەکان و جمهـووری جەعفەری و زەیدی و زاهیرییەکان، زۆربەی زانایانی پاشین دەستیان پێوە گرتووە و یاسای باری کەسێتی هەموو وڵاتە ئیسلامییەکانی لەسەر دامەزراوە.

### حەنەفییەکان:

لە "إغاثة اللهفان"دا هاتووە: ("المـازري" لـە کتـێبی "المعلـم"دا لـە "محمـد بـن مقاتل"ەوە هاوەڵی ئەبی حەنیفە کە لە مەزنترین هاوەڵەکانییەتی لە چینی سێیەمی هـاوەڵانی ئـەبی حەنیفـە، ئـەوەش یەکێکـە لـە دوو بۆچـوونەکەی مەزهـەبی ئـەبی حەنیفە)[1]

---

[1] اغاثة اللهفان من مصايد الشيطان ١/٣٠٨.

لە "إعلام الموقعين"دا: (هەندێ لە حەنەفییەکان فتوایان پێداوە، ئەبوبەکری رازی لە "محمد بن مقاتل"ەوە باسی کردووە)[1].

لە "أحكام القرآن"ی "الجصاص"دا[2] لە تەفسیری: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ﴾دا: (بەڵگە لەسەر ئەوەی مەبەست تیایدا فەرمان کردنە بە جیاکردنەوەی تەڵاق گەر دوو تەڵاقی پێکەوە خست دروست نییە بوترێت دوو جار تەڵاقیداوە)

**مالیکییەکان:**

لە "إغاثة اللهفان"دا[3] هاتووە: ("التلمساني" لە شەرحی لقەکان لە مەزهەبی ئیمام مالیکدا وەك بۆچوونێك لە مەزهەبەکەیدا باسی کردووە، بەڵکو ریوایەتێکە لە مالیکەوە، کەسانی تریش دەڵێن بۆچوونێکە لە مەزهەبەکەدا، بۆیە یەکێکە لە دوو بۆچوونەکە لە مەزهەبی مالیك و ئەبی حەنیفەدا، هەروەها "شيخ الإسلام" لە هەندێ هاوەڵی ئەحمەدەوە باسی کردووە و هەر ئەوەش هەڵبژاردەی خۆیەتی)

لە قسەکەی "ابن رشد المالكي"ەوە پارسەنگدانی ئەم بۆچوونە وەردەگرین کاتێك دەڵێت: (جمهوور حوکمی توندکردنەوەی لە تەڵاقدا زاڵ کردبوو وەك داخستنی دەرگای پاساوی بێجێ(مەفسەدە) بەڵام بەوە روخسەتە شەرعییەکە پووچ دەبێتەوە، هەر بەو جۆرە تیابردنی بەزەیی و نەرمی بە مەبەستگیراو لەوەدا، مەبەستم ئەم ئایەتەیە: ﴿لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً﴾)[4].

---

[1] اعلام الموقعين ٣/٣٥.

[2] احكام القرآن لحجة الاسلام الأمّام ابي بكر محمد بن علي الرازي الجصاص الحنفي ٢/٧٣.

[3] المرجع السابق ١/٣٠٨.

[4] (يَا أَيُّهَا النبي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً) (الطلاق:١). بداية المجتهد ونهاية المقتصد ٢/٥١.

**حەنبەلییەکان:**

ئیبن تەیمیە دەڵێت: (تەڵاقی هاومل(هاوتا) بە ژمارە حەرامکراوە و تەنها یەك تەڵاق پێویست دەکات، ئەم قسەیە پێشین و پاشین لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) گواستوویانەتەوە، وەك: " الزبیر بن العوام، وعبد الرحمن بن عوف" هەروەها لە "علي و ابن مسعود" و لە "ئیبن عەباس"یشەوە بە دوو قسە گوازراوەتەوە، هەر بەو جۆرە لە "محمد بن إسحاق"ەوە، ئەوەش قسەی زۆرێك لە شوێنکەوتوان و ئەوانەی بە دوایاندا هاتن وەك "تاووس و خەلاس بن عەمر"ە، بە هەمان شێوە قسەی داود و هاوەڵەکانییەتی، هەروەها لە " أبی جعفر محمد بن علی بن الحسین و کوڕەکەی "جعفر بن محمد"ەوە ریوایەتکراوە، بۆیە هەندێ لە مەزهەبی شیعەش هەمان بۆچوونیان گرتۆتە بەر، لەگەڵ ئەوەش قسەی هەندێ لە هاوەڵانی ئەبی حەنیفە و مالیك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە)[1]

**جەعفەرییەکان:**

لە "الخلاف"دا[2] هاتووە: (گەر هەر سێ تەڵاقەکەی بە یەك وشە خست ئەو کەسە بیدعەی ئەنجامداوە و تەنها یەك تەڵاقی دەکەوێت لە باری کاملبوونی مەرجەکاندا لەلای زۆرینەی هاوەڵانی ئێمە، لەناویاندا کەسانێك هەن دەڵێن هیچ تەڵاقی ناکەوێت.

عەلی ئەم قسەی کردووە[3] و هەر بەو جۆرە ئەهلی زاهیر، "الطحاوي" لە "محمد بن إسحاق"ەوە باسی ئەوە دەکات و وتویەتی یەك تەڵاقی دەکەوێت، بەڵگەمان کۆکردنەوەی جیاکراوەیە، بنەڕەت بریتییە لە مانەوەی گرێبەستەکە).

---

[1] مجموع فتأوى ابن تيمية ٣٣/٨.

[2] الخلاف في الفقه للعلامة الطوسي ٢/٢٣٦-٢٢٧.

[3] أي بوقوع واحدة.

لە "الروضة البهية"[1]: (گەر تەلاقەکە بە زیاد لە یەك لێکبدرێتەوە وەك وتنی: "تۆ بە سێ تەلاق تەلاقدراوی"، لێکدانەوەکە دەسڕێتەوە و تەنها یەکێکیان دەکەوێت بە بەڵگەی دروستی ئەوەی وتیان: "کەسێك لە یەك دانیشتندا سێ تەلاقەکەی خۆی دەخات" وتی: تەنها یەکێکیان دەکەوێت)

لە "شرائح الإسلام"دا[2]: (گەر تەلاق بە دوو یان بە سێ لێکدرایەوە وتراوە تەلاقەکە پووچ دەبێتەوە، وتراویشە تەنها یەك دانە دەکەوێت)

**زەیدییەکان:**

لە "التاج المذهب"دا هاتووە[3]: (دووەم لە حوکمەکانی تەلاق ئەوەیە بە ژمارە بەدوای یەکتردا نەیەن گەر زیاتر لە تەلاقێکی دا، چونکە دووەم وەك شوێنکەوتنێك بۆ یەکەم ناکەوێت بەبێ ئەوەی گێڕانەوەیەك(رجعة) یان گرێبەستێك لە نێوانیاندا هەبێت، بەڵکو بەو دوو تەلاقە یەك تەلاقی دەکەوێت، یەکسانە بە یەك وشە دووی خستبێت یان زیاتر وەك بڵێت: تۆ سێ تەلاقەکەت کەوتووە، یان گوزارەی وەك: "تۆ تەلاق دراوی، تۆ تەلاق دراوی" تەنها یەك تەلاقی دەکەوێت، چونکە تەلاق لەلای ئێمە شوێنی تەلاقی تر ناکەوێت لە دوو شێوەدا)

هاوشێوەی ئەم ئاراستەیە لە "الدراري المضيَّة[4]، و البحر الزخار[5]، والمنتزع المختار[6]"دا هاتووە.

---

[1] شرح اللمعة الدمشقية ٢/١٤٨.

[2] ٢/٥٦.

[3] التاج المذهب لأحكام المذهب شرح متن الأزهار في فقه الأئمة الأطهار للصنعاني ٢/١٩٩.

[4] شرح الدرر البهية للشوكاني ٢/٧١.

[5] ٣/١٧٤. وفيه الطلاق لا يتبع الطلاق حتى تخلل رجعة أو عقد.

[6] ٢/٤٥٢.

**زاهیرییەکان:**

له "إغاثة اللهفان"دا[1] هاتووه: (ئەوانەی جیاوازییان لەمەدا باس کردووه داود و هاوەڵەکانییەتی، ئەوەیان هەڵبژاردووه سێ تەڵاق بە یەك دەڕوات) لـه " فتـاوى ابـن تيميه[2]"دا: (ئەوەش قسەی داود و زۆرینـەی هاوەڵانییـەتی) زاهیرییـەکان جگـه لـه ئیبن حەزم لەگەڵ ئەو بۆچوونەن تـەڵاقی هاومـل بـه ژمـاره تـەنها یـەك تـەڵاقی پـێ دەکەوێت.

**بەڵگەکانی سەرخەرانی ئەم رایە :**

سەرخەرانی رای تەڵاقی هاومل بە ژمارە تەنها یەك تەڵاق دەخـات بـه زۆر بەڵگـه بەڵگەیان هێناوەتەوە، گرنگترینیان قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) و پێوانەیە.

**یەکەم-قورئان:**

رێسای گشتی لە شەریعەتی ئیسلامدا: هەموو گرێبەستێکی پابەندکەر بۆ هەردوو لا یەکێکیان ناتوانێت یەکلایەنە کۆتایی پـێ بهێنێـت، مەگـەر لـه بـاری هـەڵوەشاندنی و رەوشی پێشهاتدا، گرێبەستی هاوسەرگیریش لە گرێبەستە پابەندکـەرەکانی هـەردوو هاوسەرەکەیە و ماف و ئـەرکی ئـاڵوگۆڕکراوی بـۆ هـەردوولا لەسـەر سـەرهەڵدەدات، بنەڕەت تیایدا ئەوەیە دەسەڵات بۆ هەڵوەشانەوەی تەنها بە دەستی پیاو نییە تا بـه ویستی یەکلایەنەی خۆی هەڵیبوەشێنێتەوە بەپێی رێسا باسکراوەکە، بەڵام خـودا-ﷻ- بۆ حیکمەت و بەرژەوەندییەك ئەم دەسەڵاتەی بە پیـاو داوە وەك هـەڵوەشاندن و روخسەت لەژێر کۆمەڵێك مەرجی تایبەتدا و لە ئامێزی سنوورێکی دیاریکراودا، لەوانە ئەوەیە پچڕانی پەیوەنـدی هاوسـەری بـە سـێ قۆنـاغ بێـت و هـەر قۆناغێـك لەگـەڵ قۆنـاغێکی تـردا ماوەیـەك لـە کـات یـان گێڕانەوەیـەك یـان گرێبەسـتێك بکەوێتـە نێوانیانەوە، وەك هەنـدێك دەیڵێن، ئـەوەش پاڵپشـت بـە ئایـەتی: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَـان

[1] اغاثة اللهفان المرجع السابق ١/٣٠٧.
[2] مجموع فتأوى ابن تيمية ٣٣/٨.

فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾[١].

**رووی بەڵگە:**

دەڵێن: "المرتان-دوو جار" لە زمانی عەرەبدا بەڵکو لە هەموو زمانەکانی تری مرۆڤدا بۆ جار لە دوای جار بەکاردەهێنرێت، لە زاراوەی قورئانی پیرۆزدا باسی وشەی "مرة" تەنها بۆ ئەم مانایە بەکاربراوە وەك لە ئایەتی: ﴿سَنُعَذِّبُهُمْ مَرَّتَيْنِ﴾[٢]، ﴿أَولا يَرَوْنَ أَنهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَرَّةً أَو مَرَّتَيْنِ﴾[٣]، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنْكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنْكُمْ ثَلاثَ مَرَّاتٍ﴾[٤]. ﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَى﴾[٥].

﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ﴾ لە گوزارەدا هەواڵە و لە مانادا فەرمانە بە جیاکردنەوەی تەڵاق هاوشێوەی ئەوەی هاتووە لە حوکمی زۆرێك لە ئایەتەکان، لەوانە: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَولادَهُنَّ﴾ واتە "ليرضعن-با شیریان پێ بدەن"، ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاثَةَ قُرُوءٍ﴾ واتە "ليتربصن-با چاوەڕوان بن"

گوزارشتدان لێی بە هەواڵ بۆ دڵنیاکردنەوە و پێ لەسەرداگرتن و توندکردنەوەی ناوەرۆکی فەرمانەکەیە، فەرمان کردن بە شتێك نەهیکردن لە دژەکەی لە ئامێز دەگرێت، نەهیش تەنها بۆ خراپە(مەفسەدە)یە، کارکردنیش بە پێچەوانەی ئەو

---

[١] (الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلَّا أَن يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِن خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (البقرة:٢٢٩).

[٢] (وَمِمَّنْ حَوْلَكُمْ مِنَ الْأَعْرَابِ مُنَافِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ لا تَعْلَمُهُمْ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ سَنُعَذِّبُهُمْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَى عَذَابٍ عَظِيمٍ) (التوبة:١٠١).

[٣] (أَولا يَرَوْنَ أَنهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَرَّةً أَو مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لا يَتُوبُونَ وَلا هُمْ يَذَّكَّرُونَ) (التوبة:١٢٦).

[٤] (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنْكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنْكُمْ ثَلاثَ مَرَّاتٍ مِنْ قَبْلِ صَلاةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُمْ مِنَ الظَّهِيرَةِ وَمِنْ بَعْدِ صَلاةِ الْعِشَاءِ ثَلاثُ عَوْرَاتٍ لَكُمْ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ طَوَّافُونَ عَلَيْكُمْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) (النور:٥٨).

[٥] سورة طه: ٣٧.

فەرمانەوە داننانە بەو خراپەیەدا.

ئیمام "الفخر الرازي"[1] دەڵێت: (ئـەم کەلامـە هەرچـەند گوزارەکـەی گـوزارەی هەواڵە، بەڵام ماناکەی بریتییە لە فەرمان، دوو جار تەڵاق بدەن واتـە بـە دوو قۆنـاغ، لادان لە گوزارەی فەرمانەکە روویـداوە بـەوەی پێشـتر باسمـان کـرد گوزارشـت لـە فەرمانەکە بە گوزارەی هەواڵ مانای پێداگری لە فەرمانەکە دەگەیەنێت، بۆیە جێگیر بووە ئەم ئایەتە ئاماژە دەکات بە فەرمان بۆ جیاکردنەوەی سێ تەڵاقەکە و پێداگرتن لەو فەرمانە و توندکردنەوە تیایدا، پاشان ئەوانەی لەسەر ئـەم قسـەن بـۆ دوو قسـە جیاوازیان کەوتۆتە نێوانەوە:

یەکەمیان: کە هەڵبژاردەی زۆرێك لە زانایانی ئایینی ئیسلامە ئەوەیە گەر بـە دوو تەڵاق یان بە سێ تەڵاق تەڵاقیدا تەنها یەك تەڵاقی دەکەوێت، ئەم قسەیە پێوانەییـە، چـونکە نـەهی ئامـاژە دەکـات بـەوەی نـەهیلێکراو خراپەیـەکی پارسـەنگدراو لـەخۆ دەگرێت، وتنی کەوتنی تەڵاقەکە هەوڵێکە بۆ بردنەناوەی ئەو خراپەیە بۆ ناو بـوون، ئەوەش رێگەپێنەدراوە، بۆیە پێویست بووە بڕیار بدرێت بە نەکەوتنی.

دووەم: گرێبەستەکان لە سەرپێهەڵدەرەکان بن یان لـە بـەردەرەوەکان چـییەتی مەعنـەوییان بـەدی نایـەت و ئاسـاریان لـە دەرەوە نابینرێتـەوە مەگـەر لـەباری گۆکردن(گوزارشت) بەو گوزارانەی ئاماژە دەکەنە سەریان[2].

ئەو گوزارانەیە سەریان پێهەڵدەدەن و دەیانهێننە بوونەوە، بۆیە قسەی مێردەکە بە ژنەکەی "تۆ تەڵاقدراوی" بەوە لەباری سەرهەڵداندا راستییەکی واتایی واقیعی پێ بەدی دێت کە بریتییە لە تەڵاق، وەسف کردنی ئەم کارە لە دوای ئەوە بە ژمارە دوو جار یان سێ جار وەسفێکی پووچ و بێبنەمایە.

"أبو حيان"[1] دەڵێت: (گەر دوو جار و سێ جار بڵێت: تۆ تەڵاقدراوی، تەنها یەك تەڵاقی دەکەوێت، چونکە چاوگی "مرة" رۆشنکەرەوەی کـاری تەڵاقەکەیـە، و ژمـارە

---

[1] يراجع التفسير الكبير للأمّام الفخر الرازي ١٠٤/٦.

[2] يراجع نظام الطلاق في الاسلام احمد شاكر ص٤٦ وما بعدها.

دەگەیەنێت، دەبێ ئەو فەرمانەی کە تیایدا کارکەرە لەڕووی بوونەوە دووبارە ببێتەوە وەك چۆن دەڵێیت: " ضربت ضربتین أو ثلاث ضربات" چونکە چاوگەکە رۆشنکەرەوەی ژمارەی کردارەکەیە، هەر کات لەڕووی بوونەوە دووبارە نەبوویەوە دەبێتە ئەستەم، بەوەی چاوگەکەی دووبارە بکاتەوە و پلەی ژمارەکەی رۆشن بکاتەوە، گەر بڵێت: تۆ بە سێ تەلاق تەلاقدراوی ئەمە تەنها یەك گوزارەیە و ئامازەکەشی یەکە، بۆیە ئەستەمە یەك سێ بێت یان دوو بێت، هاوشێوەی ئەمە ئەوەیە کەسێك لە نێوان خۆی و پیاوێکی تردا فرۆشتنێك رێکبخات لەسەر شتێك پاشان لە کاتی قسە لەگەڵ کردنی بڵێت: ئەمەم سێ جار پێ فرۆشتی، وشەی سێ ژاوەژاوە و پڕاوپڕ نییە لەگەڵ ئەوەی لە پێشەوەیە.

سەرپێهەڵدراوەکانیش دووبارەبوونەوەیان تێدا ئەستەمە تا هەموو قابیلی ئەو سەرپێهەڵدانە دەبن، ئەمەش پەیبردن پێی گرانە بە تایبەت لەسەر کەسانێك لە قسەی ئەو کەسەی دەڵێت: دوو جار یان سێ جار تەلاقم دای وا تێبگات دوو جار یان سێ جار تەلاقی دەکەوێت) لەمە و لەوەی پێشتریش لە هەنگاوەکانی تەلاق تێدەگەین تەلاق بە ژماردن بەدوای یەکتردا نایەت، گەر بە زیاتر لە یەك تەلاقیدا تەلاقی دووەم و سێیەمی ناکەوێت بەبێ کەوتنە ناوی گێڕانەوەیەك یان گرێبەستێك بۆ نێوان دوو تەلاقکە، یەکسانە بە گوزارەی: "تۆ سێ تەلاقت کەوتبێت" بێت یان بە گوزارەی: "تۆ تەلاقدراوی، تۆ تەلاقدراوی، تۆ تەلاقدراوی".

**دووەم- سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)**

گرنگترین فەرموودەیەك خاوەنی ئەم رایە پشتیان پێبەستووە بریتییە لە فەرموودەکەی ئیبن عەباس کە پێشتر باسکرا لەگەڵ گفتوگۆی ئەوەی لەسەری وتراوە، ئەوە فەرموودەیەکی جێگیرە و ئەهلی فەرموودە بە چەندین ریوایەت و رێگەی جۆراوجۆر گێڕاویانەتەوە، لەوانە:

---

(١) يراجع تفسير البحر المحيط لأبي حيان ١٩٢/٢.

أ-"مسلم" لە سەحیحەکەیدا لە ڕێگەی "عبدالرزاق"ەوە لە "معمر"ەوە لە عەبدوڵای کوڕی تاووسەوە لە باوکییەوە لە ئیبن عەباسەوە فەرمووی: (کاتی خۆی لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر و دوو ساڵ لە خەلافەتی عومەر تەڵاقی سێ یەك بوو، عومەری کوڕی خەتاب فەرمووی: ئەم خەڵکە پەلە لە کارێکدا دەکەن کاتی خۆی هێواشی و لەسەرخۆیی و مۆڵەتی(أناة)[1] بۆ ئەوان تێدا بوو گەر بەسەریاندا تێمانپەڕاندایە(أمضيناه عليهم)[2]، بۆیە بەسەریاندا تێیپەڕاند)[3].

ب-ئەبو داود لە سونەنەکەیدا[4] لە ڕێگەی ئەحمەدی کوڕی صاڵحەوە لە ڕێگەی "عبدالرزاق"ەوە لە "ئیبن جورەیج"ەوە لە "ئیبن تاووس"ەوە لە باوکییەوە لە ئەبا سەهباوە وتی بە ئیبن عەباس: (دەزانی تەڵاقی سێ بە یەك دەدەنرا لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر و سێ ساڵ لە ئەمارەتی عومەر؟ ئیبن عەباس وتی: بەڵێ)

ج-لە ڕێگەی حەمادی کوڕی زەیدەوە لە ئەیوبەوە لە ئیبراهیمی کوڕی مەیسەرەوە لە تاووسەوە: ئەبا سەهبا وتی بە ئیبن عەباس: ئایا تەڵاقی سێ لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) یەك نەبوو؟ وتی: ئەوە وابوو، بەڵام کاتێك سەردەمی عومەر هات خەڵکی بەدوای یەکدا تەڵاقیان دەهێنا بۆیە ئەویش لەسەریان کورتی کردەوە)[5].

د-"الحاكم" لە "المستدرك"دا ڕیوایەتی کردووە: "ئەبا جەوزا" هات بۆ لای ئیبن عەباس و وتی: دەزانی سێ لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بە یەك دەهات،

---

[1] بفتح الهمزة أي مهلة.

[2] اجزناه عليهم(بە گونجاو یان شیاو یان ڕێگەپێدراومان بزانییایە لەسەریان).

[3] فتح الباري شرح صحيح البخاري ٣٦٣/٩. سنن ابي دأود مع حاشية عون المعبود ٢٢٨/٢. نيل الأوطار ٢٥٨/٦. سبل السلام ٢٢٥/٣.

[4] سنن ابي دأود مع حاشية عون المعبود ٢٢٨/٢.

[5] فتح الباري المرجع السابق.

فەرمووی: بەڵێ. "الحاكم" دەڵێ: (ئەم فەرموودەیە سەنەدەکەی سەحیحە)[1].

ه‍-ئەبو داود بە ریوایەتێکی تر دەریهێناوە کە بریتییە لە: (پیاوێك پێی دەوترا ئەبا سەهبا پرسیاری زۆری لە ئیبن عەباس دەکرد، وتی: ئەوەت زانیوە کە پیاو کاتێك بە سێ تەڵاق ژنەکەی تەڵاق دەدا-بەر لەوەی بچێتە لای- لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ئەبو بەکر و سەرەتای ئەمارەتی عومەردا بە یەکیان دادەنا؟ ئیبن عەباس وتی: بەڵێ، پیاو گەر ژنەکەی بە سێ تەڵاق بدابایە بەر لەوەی بچێتە لای بە یەکیان دادەنا لە سەردەمی پێغەمبەر و ئەبو بەکر و سەرەتای ئەمارەتی عومەردا، کاتێك عومەر خەڵکی بینی بەدوای یەکدا دەیهێنن، وتی: لەسەریان کورتبکەنەوە)[2]

ئەهلی فەرموودە و فەقیهان کە دەڵێن سێ بە یەك جار دەکەوێت دەستیان بەم ریوایەتەی کۆتاییەوە گرتووە، لەسەر ئەو بنچینەی فەرموودەکە لەبەر رۆشنایی ئەم ریوایەتەدا بانگبۆکراوەکە ناسەلمێنێت کە بریتییە لە تەڵاقی سێ بە یەك تایبەت بە ئەو ئافرەتانەی چوونەتە لایان و ئەوانی تریش، وەك چۆن ئەوانەی جیاوازی دەکەن لە نێوان ئەو ئافرەتانەی چوونەتە لایان و ئەو ئافرەتانەی نەچوونەتە لایان پشتیان بەم فەرموودەیە بەستووە، دەڵێن لە یەکەمیاندا سێ تەڵاقەکە بە یەك جار دەکەوێت، بەڵام لە دووەمیاندا یەك تەڵاق دەکەوێت.

پێشتر گفتوگۆمان لەسەر ئەم رایە شازە کرد کە لەسەر جیاکردنەوەیە(واتە جیاکردنەوەی ژن و مێرد لە یەکتری بە تەڵاقی سێ بە سێ)، هەروەها گفتوگۆمان کرد لەسەر هەموو ئەوەی لەمەڕ فەرموودەکەی ئیبن عەباس وتراوە لە هەموو ریوایەتەکانیدا، بۆیە نامانەوێ پەنا ببەین بۆ دووبارەکردنەوەی باسەکە، بەڵام پێمخۆشە ئەوەی فەقیهان و زانایانی فەرموودە دەربارەی کۆتوبەندی(قبل أن يدخل بها-بەر لەوەی بچێتە لای) وتویانە بخەمە سەر ئەوەی پێشوو، ئیبن قەیم-رەحمەتی

---

[1] اغاثة اللهفان ١/٣٠٣.

[2] سنن أبي دأود مع حاشية عون المعبود طبعة دار الكتب العربي بيروت ٢٢٨/٢.

خودای لێ بێت– دەڵێت: (ریوایەتەکەی خودی تاووس لە ئیبن عەباسەوە لە هیچ شوێنێکیدا ئەوەی نەهاتووە بڵێت: "قبل الدخول–بەر لە چوونە لا"، باسکردنی ئەم کۆت و بەندە لەسەر پرسیارێکی تایبەت بە تەڵاقی ئەو ئافرەتانەی نەچوونەتە لایان بیناکراوە، ئیبن عەباسیش وەڵامی پرسیارەکەی داوەتەوە لەمەڕ تەڵاق بەر لە چوونە لا، بۆیە کۆتوبەندەکە تێگەیشتنی پێچەوانەی بۆ نییە)

لە " عون المعبود علی سنن ابی داود[1]"دا هاتووە: (ئەوانەی پێیانوایە ئەو تەڵاقدراوەی چووەتە لای تەڵاقی بە سێ دەکەوێت، گەر نەچوویبێتە لای تەنها یەك تەڵاقی دەکەوێت، دەستیان بەم ریوایەتەوە گرتووە، وەڵام دەدرێتەوە کۆتوبەندەکە چوونە لاش قبووڵ دەکات نەرێی و راستگۆیی ریوایەتە سەحیحەکەی تر ناکات کە لەسەر تەڵاقدراو دوای چوونە لا هاتووە، ئەوەی کە لەم ریوایەتەدا هاتووە ئەوەیە بە دەقکردن تیایدا روویداوە لەسەر هەندێ تاکی ئاماژەی ریوایەتە سەحیحە هاتووەکە لە دوای ئەم ریوایەتە، ئەوەش تایبەتکردن بە دەقەکە کە دەقاندن تیایدا روویداوە پێویست ناکات... ئەم فەرموودەیە(فەرموودەکەی ئیبن عەباس) سەحیحە و ئاماژە بەوە دەکات تەڵاق گەر بە کۆ بکەوێت تەنها یەك دانە دەکەوێت)[2].

"العسقلاني" لە "القرطبي"ەوە گواستوویەتەوە: "تۆ بە سێ تەڵاق تەڵاقدراوی" قسەیەکی پەیوەستە و لەیەکتر جیا نییە، ئیتر چۆن دروستە بیکەیت بە دوو گوزارە و هەر گوزارەیەك حوکمێکی پێ بدەیت)[3].

ئیبن قەیم دەڵێت: (فەرموودەی(تەڵاقی سێ یەکە) سێ کەس لە ئیبن عەباسەوە ریوایەتیان کردووە: "تاووس"–لە مەزنترین ئەو کەسانەیە لە ئیبن عەباسەوە ریوایەتی کردووە– و ئەبو سەهبای عەدوی و ئەبو جەوزا)[4].

---

[1] ٢/٢٢٨.

[2] عون المعبود علی سنن ابي دأود ٢/٢٢٨.

[3] فتح الباري شرح صحيح البخاري ٩/٣٦٣.

[4] اغاثة اللهفان ١/٣٠٣.

لە "سبل السلام"دا[1] هاتووە: (ئاشکرای قسەکەی ئیبن عەباس "تەڵاقی سێ یەکە" ئەوە بەو جۆرەیە بە هەر گوزارەیەك وترابێت)

ئیبن تەیمیە(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: (کەسێك نابینینەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) ژنەکەی بە سێ بە یەك وشە تەڵاق دابێت و پێغەمبەر(ﷺ) بە سێ تەڵاقەکەوە پابەندی کردبێت، لەو بارەیەوە فەرموودەیەکی سەحیح یان حەسەن ریوایەت نەکراوە، هەروەها ئەهلی کتێبە خاوەن متمانەکان لەو بارەیەوە شتێکیان نەگواستۆتەوە، بەڵکو لەو بارەیەوە چەند فەرموودەیەك ریوایەت کراون هەموویان لاوازن بە کۆدەنگی زانایانی فەرموودە، بەڵکو دانراون.

ئەوەی لە سەحیحی "مسلم" و سونەن و مەسانیدەکاندایە لە رێگەی تاووسەوە لە ئیبن عەباسەوە وتوویەتی: (لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر و دوو ساڵی خەلافەتی عومەردا تەڵاقی سێ یەك بوو، عومەر وتی: خەڵکی پەلە دەکەن لە کارێکدا کاتی خۆی هێواشی و لەسەرخۆیی بۆ ئەوان تێدا هەبوو، گەر بەسەریاندا تێبپەڕێنین، بۆیە بەسەریاندا تێپەڕاند)[2]

لە ریوایەتەکەی "مسلم" و کەسانی تردا لە تاووسەوە: ئەبا سەهبا وتی بە ئیبن عەباس: دەزانیت سیان لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر و سێ ساڵ لە ئەمارەتی عومەر بە یەك دادەنرا؟ ئیبن عەباس وتی: بەڵێ.

لە ریوایەتێکدا: (ئەبا سەهبا وتی بە ئیبن عەباس: لە زیرەکی و لێوەشاوەیی خۆت بخە روو، ئایا تەڵاقی سێ لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ئەبو بەکردا یەك نەبوو؟ وتی: ئەوە بەو جۆرە بوو، کاتێك سەردەمی عومەر بوو خەڵکی بەدوای یەکتردا تەڵاقیان دەهێنا، ئەویش بە گونجاوی بینی بە سەریاندا تێبپەڕێنێت)[3].

---

[1] سبل السلام شرح بلوغ المرام من جمع ادلة الاحكام للحافظ ابن حجر العسقلاني تأليف الأمّام محمد بن اسماعيل الصنعاني ٢٢٦/٣.

[2] صحصح مسلم ١٠٩٩/٢

[3] مجموع فتأوى ابن تيمية ج٣٣ ص١٢-١٣.

ئیبن قەیم(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (ئەمە کتێبەکەی خودایە، ئەوەش سوننەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەش زمانی عەرەب و ئەمەش عورفی قسەکردن، ئەوەش خەلیفەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هەموو هاوەڵانی سەردەمی ئەو، و سێ ساڵ لە سەردەمی عومەر لەسەر ئەم مەزهەبە (واتە تەڵاقی سێ یەك بێت) گەر ئامارکارێك بە ناوەکانیان یەك یەك ئاماریان بکات دەبینێت هەموو ئەوانە سێیان بە یەك دەبینی جا یان بە فتوا یان بە داننان پیایدا، گەر وا گریمانە بکەین کەسێك پێیوانەبوویێت(سێ یەك بێت) ئەوە رەدی نەکردووەتەوە فتوای پێ بدرێت)[1].

سێیەم- پێوانە:

بەڵگەی کۆتایی کە خاوەنی ئەم رایە دەستیان پێوەگرتووە بریتییە لە پێوانە بۆ سەر هەندێ حوکم کە "المرة" تیایاندا بە "تلو الأخرى" دادەنرێت، بۆ ئەو مەبەستەش نموونەی زۆریان لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) و دارشتنی گرێبەستەکان و شتانی تر هێناوەتەوە، لەوانە:

أ-خودا-ﷻ- دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ[2] وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ أَنَهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ* وَالْخَامِسَةُ أَن لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ أَن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ* وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ أَنَهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ* وَالْخَامِسَةَ أَن غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا أَن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾[3].

گەر مێردەکە لەبەردەم قازیدا وتی: چوار جار خودا دەکەم بە شایەت من راستگۆم، یان ژنەکە بڵێت: چوار جار خودا دەکەم بە شایەت ئەو درۆ دەکات، لە هەردوو بارەکەدا بە یەك شایەتی دەژمێرێت و نابێت بە چوار شایەتی، ئیتر چۆن "تۆ سێ تەڵاقت کەوتووە" بە سێ تەڵاق دەژمێررێت؟

---

[1] ينظر اعلام الموقعين عن رب العالمين للأمّام ابي عبد الله محمد بن ابي بكر المعروف بابن قيم الجوزية المتوفى عام ٧٥١هـ ٣/٣٤.

[2] أي يتهمون زوجاتهم بجريمة الزنا

[3] سورة النور: ٦، ٧، ٨، ٩

ئیبن قەیم دەڵێت: (چ پێوانەیەك لەمە راستترە؟ هەر بەو جۆرە هەر شتێك تیایدا ژمارە بە داننان پیادا تەماشا بکرێت و هاوشێوەکانی، بۆ ئەو مەبەستە گەر کەسی داننەر بە زینادا وتی: من چوار جار دان دەنێم بە زینادا ئەوە بە یەك جار دەژمێررێت، هاوەڵێك بە ماعیزی وت[1]: گەر چوار جار دانی پیادا بنێیت پێغەمبەر(ﷺ) رەجمت دەکات، گەر بیوتبایە: چوار جار دانی پیادا دەنێم بە یەك جار دادەنرا، تەڵاقیش یەکسانە و بە هەمان شێوەیە)

ب-گەر بڵێت: سەد جار "سبحان الله یان الحمد لله" تەنها یەك جار وتویەتی، ئیبن تەیمیە دەڵێت: (ئایەتی: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ﴾ واتە جار لەدوای جار، وەك چۆن بە پیاوێك بوترێت دوو جار "سبحان الله" بکە یان سێ جار یان سەد جار "سبحان الله" بکە.. پێویستە بە ئەندازەی ژمارەکە "سبحان الله" بکات تا ژمارەکە تەواو دەبێت، گەر بیەوێت ئەوە کورتبکاتەوە و بڵێت: دوو جار سبحان الله، سێ جار سبحان الله، یان سەد جار سبحان الله تەنها یەك جار "سبحان الله"ی کردووە، خودا-ﷻ- نەیفەرمووە: تەڵاق دوو تەڵاقە، بەڵکو فەرموویەتی: تەڵاق دوو جارە، گەر بڵێت بە ژنەکەی تۆ دوو تەڵاقت کەوتووە یان سێ تەڵاقت کەوتووە یان دە یان هەزار... تەنها یەك جار تەڵاقیداوە[2].

فەرمودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بە دایکی باوەڕداران جویریە: من لە دوای تۆ چوار کەلیمەم وت گەر بکێشرێت بەوەی تۆ لە سەرەتای رۆژەوە دەیخوێنیت ئەوا کێشیان قورسترە: " سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله رضى نفسه، سبحان الله مداد كلماته"، "مسلم" لە سەحیحەکەیدا ریوایەتی کردووە، ماناکەی ئەوەیە خودا-ﷻ- شایستەی تەسبیحە بە ژمارەی ئەوانە، برەکان هەندێ جار وەسفن بۆ کاری بەندە و کارەکەشی سنووردارە، هەندێ جاریش بۆ مەزنراگرتنی قەدر و شکۆی پەروەردگارە، ئەگەر نە، گەر نوێژخوێن لە نوێژەکەیدا بیوتبایە:

---

[1] هو ماعز بن مالك الاسلمي، اعترف بالزنا عند النبي ﷺ فرجمه.
[2] اغاثة اللهفان المرجع السابق ١/٣٠٧.

"سبحان الله عدد خلقه" تەنها یەك جار "سبحان الله"ی كرد بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) راینەدەگەیاند دوای هەموو نوێژێك نوێژخوێن ٣٣ جار بڵێت سبحان الله، ٣٣ جار بڵێت: الحمد لله، ٣٣ جار بڵێت: ألله أكبر، گەر بویتبایە "سبحان الله، والحمد لله والله أكبر عدد خلقه" تەنها یەك جار تەسبیحی كردووە)[1].

هەندێكیان دەڵێن ئەم رایە ئیجماعی لەسەركراوە لە سەردەمی پێغەمبەر و ئەبو بەكر و دوو ساڵی خەلافەتی عومەر و ئیجماعێكی تر راست نەبووەتەوە تا پووچی بكاتەوە.

ئیبن قەیم دەڵێت: (مەبەست ئەوەیە ئەم قسەیە(تەڵاقی سێ بە یەك دەژمێررێت) كیتاب و سوننەت و پێوانە و ئیجماعی كۆن بەڵگەن لەسەری، لەدوای ئەوەش ئیجماعێك نەهاتووە پووچی بكاتەوە، بەڵام ئەمیری باوەڕداران عومەر پێیوابوو خەڵكی كاری تەڵاقیان لەلا سووك و ئاسان بوو، خستنی تەڵاق لەلایان بە یەكجار زۆر بوو بوو، پێیوابوو لە بەرژەوەندییانە گەر سزایان بدرێت بە تێپەڕاندنی بەسەریاندا بۆ ئەوەی بزانن گەر یەكێكیان بە كۆ تەڵاقی خست ژنەكەی لێ جیادەبێتەوە و حەرام دەبێت لەسەری تا مێرد بە پیاوێكی تر دەكات بە ئارەزووی خۆی نەك هاوسەرگیری تەحلیل)[2].

**پارسەنگدان:**

خۆم بە ئەهلی پارسەنگدان نازانم و بانگەشەی ئەوەش ناكەم، بەڵام ئەم پارسەنگدانەی من تەنها دووبارەكردنەوەیەكی پوختە بۆ ئەوەی پێشین و پاشین وتویانە دەربارەی ئەم پرسە ترسناكە لە ژیانی ملیۆنەها موسڵماندا، سەرەتای ئەوەش بە ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ

[1] مجموع فتاوى ابن تيمية ج٣٣ ص١٢ـ١٣.
[2] اعلام الموقعين ٣/٣٥ـ٣٦.

خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾[1] دەستپێدەکەم.

هەندێ دەڵێن: گوێڕایەڵی بۆ خودا واتە کارکردن بە قورئان و گوێڕایەڵی پێغەمبەریش واتە کارکردن بە سوننەت، گوێڕایەڵی "أولي الأمر"یش واتە کارکردن بە ئیجماع، گێڕانەوە بۆ لای خوداش واتە کارکردن بە قیاس.

بەڵام بە باوەڕی من مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە سەرچاوەی یەکەم و کۆتا بۆ چارەسەری گرفتە سەختەکان -سروشتی گرفتەکە هەرچییەك بێت- بریتییە لە خودا-ﷻ- هاوشێوەی ئەوە لە ژیانی دونیاییماندا هەموو پرسێك دەبزوێت تاکو چارەسەری خۆی بدۆزێتەوە لەلای فەرمانبەرێکی کارگێڕی، گەر دژوار بوو ڕێگەی خۆی دەگرێتە بەر هەنگاو بە هەنگاو تا دەگاتە بالاترین دەسەڵات(سەرۆکی دەوڵەت).

لە پرسێکی لەم چەشنەی تەلاقدا -لەو خستنەڕووەی باسمان لەبارەوە کرد- ڕۆشن دەبێتەوە پرسێکی جێناکۆکە لە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئەم ڕۆژگارەی ئێمە، بۆمان روون دەبێتەوە بەلگەی هەردوو لا بەلگەی گومانئامێزن و ئاماژە ناکەن بۆ حوکمەکە بە ئاماژەیەکی بڕاوە، ڕای هەر لایەکیان ئەگەری هەڵە و ڕاستی تێدایە، بۆیە حوکمی بابەتەکە شتێکە ناکۆکیان تیایدا هەیە، خودا-ﷻ- دەفەرموێت: ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ﴾، با ئەم بابەتە جێناکۆکە بگێڕینەوە بۆ لای خودا(بۆ لای قورئان) بۆ ئەوەی ببینین چی لە قورئاندا هاتووە؟

خودا-ﷻ- دەفەرموێت: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ﴾.

چ نهێنییەك لە پشت هەڵبژاردنی ئەم گوزارەوەیە؟

بۆ نەیفەرموو: دووان یان دوو تەلاق؟

ئایا قورئان ژمارەی هێناوە یان جار، ئایا جیاوازی هەیە لە نێوانیاندا؟

ئایا فەرمانی خودا بۆ واجبوونە گەر بەلگەیەك ڕاست نەبێتەوە پێچەوانەی ئەوە یان بۆ پەسەندبوونە(ندب)؟

---

[1] سورة النساء/٥٩.

ئایا ئیجتیهاد بە بوونی دەقێکی ڕۆشن دروستە؟

ئایا دەقی قورئان تا ئەم رادەیە ناڕوونە بە جۆرێك لەسەری ئەم ململانێ بەردەوامە سەرهەڵبدات؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە و ڕۆشنکردنەوەی پارسەنگدانی تای ترازووی پابەندبوون بە "سێ جارەوە" پێویستە بگەڕێینەوە بۆ لای خودا، بۆ لای قورئان و دەقەکانی بە جۆرێك هەموو مرۆڤێکی شارەزا لە زمانی عەرەبی لێیان حاڵی دەبێت جا کەسەکە موجتەهید بێت یان خەڵکی رەشۆکی بێت:

١–قورئان فەرمانی کردووە بە دابەش کردنی سێ تەڵاقەکە بەسەر سێ جاردا بە دەقێکی ئامـاژەروون و ئاشکرا لەسەر ئەوەی کۆتاپێهێنانی پەیوەندی هاوسەرگیری کاتێك تەواو دەبێت دابەش بکرێت بەسەر سێ جاردا، ئەوەش ئایەتی: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَان فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَان﴾[1].

٢–﴿الطَّلاقُ مَرَّتَان﴾: فەرمان و داوایە بە داواکردنێکی پابەندکەر و بەسەرداسەپێن لە پۆشاکی رستەیەکی راگەیاندندا هێناویەتی، تا ئەم شێوازە ڕەوانبێژییە ئاماژە بێت بۆ دڵنیاکردنەوەی زیاتر و گرنگیدان بەوەی خودا فەرمانی پێکردووە و تێنەڕاندنی سنوورەکانی خودا: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُون﴾[2].

٣–فەرمان بە شتێك نەهیکردنە لە دژەکەی: ئەمە ڕێسایەکی شەرعی جێگیرە، زانایانی ئوسوڵ و فەقیهان دانیان پیادا ناوە، فەرمان بە جار نەهیکردنە لە ژماردن(دوو یان سێ) لەبەر ئەوەی لە یەکەمدا(لە جاردا) بەرژەوەندی هەل و بواری تێهەڵچوونەوەی ژیانی هاوسەری تێدایە، وەك ئەم ئایەتە ئاماژەی پێ

---

[1] (الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلا يَحِلُّ لَكُمْ أن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلا أن يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإن خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (البقرة:٢٢٩).

[2] (البقرة:٢٢٩).

دەکات: ﴿لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً﴾[1]، لە کۆکردنەوەی تەڵاق لە یەك جاردا خراپەی تێدایە ئەوەش بریتییە لە داخستنی ئەم دەرگایە بەڕووی دوو هاوسەرەکەدا.

٤-خودا ویستوویەتی تەڵاق سێ جار بێت، وتنی کۆکردنەوەی لە یەك جاردا بەپێی ویستی پیاوەکە زاڵبوونی ویستی ئەوە بەسەر ویستی خودادا ئەمەش مەنتقی شەریعەتی ئیسلام رەدی دەکاتەوە.

٥-دەقی: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ﴾ بە ئاماژەیەکی بڕاوە ئامـاژە دەکات بۆ دوو جار کە پێویستە ماوەیەك لە کات بکەوێتە نێوانیانەوە، بۆیە لێکدانەوەی بە دوو یان بە دوو تەڵاق یان لێکدانەوەی سێ جار بە سێ تەڵاق لە یەك جاردا بەبێ چوونە ناوی ماوەیەك لە کات زمانی عەرەبی رەدی دەکاتەوە.

٦-وشەی (دوو یان سێ) بیدعەیە، چونکە لە داهێنراوی خودی مرۆڤە، خراپەیەکە پێچەوانەیە بە فەرمانی راشکاوی خودا، بیدعەی خراپ رەدکراوەیە لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((هەر کەس کارێك بکات ئەمری ئێمەی لەسەر نەبێت رەدکراوەیە))[2].

٧-لە دانانی ژمارە لە جێگەی جار تەنگەژە و دژواریە، چونکە رێگە دەبڕێتەوە لە تێهەڵچوونەوەی ژیانی هاوسەری لەدوای پەشیمانی و ئارەزووی هەردوو لایان بۆ گەڕانەوە بە گێڕانەوە یان بە گرێبەستێکی نوێ، ئەمە پێچەوانە دەوەستێتەوە لەگەڵ ئایەتی:﴿مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ﴾[3].

---

[1] (يَا أَيُّهَا النبي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً) (الطلاق:١).

٢)) مسلم : ٣٢٤٣

[3] (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ وَإِن كُنْتُمْ جُنُباً فَاطَّهَّرُوا وَإِن كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيداً طَيِّباً فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ مِنْهُ مَا ←

٨-لە فتوا و قەزادا خستنی سێ بە یەکجار گرانی و دژواری و بێهیوابوونی دوو هاوسەرەکە و روخانی بینایەکە بە یەك چرکە لە چرکەکانی ژیانێکی نا سروشتی کە دروستکردنی چەندین ساڵ لە تەمەنی خایاندووە.

ئەمەش پێچەوانە دەوەستێتەوە لەگەڵ ئایەتی: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾[1] هەروەها پێچەوانە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): ((کارئاسانکەر بن نەك کارگرانکەر))[2]، گەر بوترێت پیاوەکە بە ویستی خۆی گرانی و دژواری هەڵبژاردووە، دەڵێم: مێردەکە نەزان و هەڵەکارە و خوداش گرتن و دادگایی کردنی بە زیاتر لە یەك تەڵاق لەسەر لابردووە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُمْ﴾ هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((خودا لەسەر ئومەتەکەم هەڵە و لەبیرچوون و زۆرلێکردنی لەسەر لابردووە))[3]، لەسەر موفتی و قازی پێویستە بەئاگابێت لەو کارە هەڵە و لەو یاریکردن و گاڵتەکردنە بە کتێبەکەی خودا، سەرمەشقی لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) وەربگرن، کاتێك هەواڵی پێدرا پیاوێك ژنەکەی بە سێ لە یەك جاردا تەڵاقداوە، "غضبان" هەستا و پاشان فەرمووی: ((ئایا یاری دەکرێت بە کتێبەکەی خودا و من هێشتا لە ناوتاندام))[4]!!!

٩-﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ﴾ پوختە نییە تا سوننەتی پێغەمبەر رۆشنی بکاتەوە، گشتی نییە تا تایبەتی بکات و رەها نییە تا سنوورداری بکات، حوکمێکی لێ بێدەنگ

---

يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) (المائدة:٦).

[1] (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدىً لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَنْ كَانَ مَرِيضاً أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) (البقرة:١٨٥).

[2] البخاري : ٦٧

[3] مسلم : ٣٢٤٣

[4] نيل الأوطار للشوكاني ٦/٢٢٥.

بوو نییە تا رابیگەیەنێت، گەر کاری فەرمووده هاتووەکان لەم دەروازەدا بۆ دڵنیاکردنەوەی ئەو حوکمە بێت قورئان هێناویەتی کە بریتییە لە دابەش کردنی سێ تەڵاقەکە بەسەر سێ جاردا ئەوا بۆ فەقیه یان موفتی یان قازی دروست نییە فەرموودە بەکاربهێنێت بۆ لادانی مانای:﴿الطَّلاقُ مَرَّتَان﴾ لە مانا راستەقینە رۆشنە راشکاوەکەی خۆی.

١٠- ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَان﴾ دەقێکی راشکاوی رۆشنە ئاماژە دەکات بۆ سەر حوکمەکەی بە ئاماژەیەکی براوە:

زانایانی موسڵمان لە ئوسولییەکان و فەقیهان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی کە: (لە میانەی بوونی دەقدا ئیجتیهاد رێگەپێدراو نییە)

هەر گفتوگۆ و تەئویل و ئیجتیهادێك لە لێکدانەوەی ئەم دەقەدا رەدکراوەیە بەپێی ئەو رێسایە.

١١-خۆشی وەرگرتنی هەریەك لە دوو هاوسەرەکە لەویتریان حوکمێکی شەرعی جێگیرە بە هۆیەکی شەرعی کە بریتییە لە گرێبەستی هاوسەرگیری دروستی جێگیر بە جێگیربوونێکی براوە، هەڵگرتنی بە بەڵگەیەکی گومانئامێز کە هەندێ لە فەقیهان دەستیان پێوە گرتووە لە فەرموودەی ئاحاد دروست نییە، کۆدەنگی هەیە لەسەر ئەوەی فەرموودەی ئاحاد بەڵگەیەکی گومانئامێزە لەرووی جێگیربوونەوە با ئاماژەکەشی براوە بێت.

١٢-دروست نییە تێکەڵی دروست بکرێت لە نێوان ئیجماع لە یەك مەزهەبدا لەگەڵ ئیجماع بە مانای رێکەوتنی هەموو موجتەهیدەکانی ئوممەتی موحەمەد(ﷺ) لە چاخێك لە چاخەکاندا لەدوای مردنی پێغەمبەر لەسەر حوکمێکی شەرعی ئیجتیهادی، بۆیە دووەم بریتییە لە بەڵگەیەکی براوەی پابەندکەر نەك یەکەم.

١٣-تێکەڵ کردنی شەریعەتی ئیسلام بە فیقهی ئیسلامی دروست نییە، شەریعەت دەقی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرە(ﷺ) ئەمەیان نەمر و پابەندکەرە بۆ هەموو باڵغێکی ژیر لەرووی بیر وباوەڕ و کار و کردار و ئەخلاقەوە، بەڵام فیقهی

ئیسلامی بریتییە لە شەرح و راوبۆچوون و ئیجتیهادی فەقیهانی موسڵمان قابیلی راستکردنەوە و گۆڕانە و پابەندکەر نییە بۆ هیچ کەسێك بـە جۆرێـك بەدرێـژایی ژیانی لە گەردنیدا بێت، ئەمـەش بـەپێی رێسـای: (کەسـی رەشـۆکی مەزهـەبی نییە)

١٤- یەکێك لە ئیمامانی موسڵمانان(رەحمەتی خودایان لەسەر بێت) نەیفـەرمووە هـەموو راستی و دروستییەك لەوەدایە ئەو وتویەتی و رایگەیاندبێت هەڵە بەشی کەسانی ترە، گەر هەموو راستی و دروستی بەشـی تـەنها یـەك ئیمـام بوایـە یـان چـەند ئیمامێکی تایبەتکراو لەو بارەدا سەرپێچی لێـی یـان سەرپێچی لێیـان دروسـت نەدەبوو، بەڵکو بۆ ئەوانیش دروست نەبوو لە نێوان خۆیاندا جیاوازییان هەبێت، بەڵگە بۆ ئەوە ئەم خاڵانەیە:

أ-گەورەمان ئەبوبەکری صدیق یەکەمین جێنشینی پێغەمبـەری خـودا بـوو(ﷺ) کاتێك پرسیاری لێکرا دەربارەی وشـەی "کلالـة" و لێکیدایـەوە بـەوەی (ئـەو کەسەی کەلالە بە میرات بەجێدەهێڵێت ئەوەیە لە ناو میراتگرانیدا کوڕ و باوك بوونیان نییە)[1] پاشان فەرمووی: (ئەمە رای منە گەر پێکابێتم لـە خوداوەیـە گەر هەڵەم کردبێت لە شەیتانەوە).

ب-عەبدوڵای کوڕی مەسعود یەکێکە لە گـەورە هـاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) کاتێـك پرسیاری لێکرا دەربارەی ژنێـك مـارەیی بـۆ دیاریـنـەکراوە و مێردەکـەی بـەر لەوەی بچێتە لای مردووە، فـەرمووی: (بـە رای خـۆم ئیجتیهـاد دەکـەم گـەر پێکابێتم لە خوداوەیە، گەر بە هەڵەدا چوویم لـە کوڕەکـەی ئـوم عەبدەوەیـە: میرات و مارەیی هاوشێوەی میراتەکەی بۆ هەیە، نە کەم و نە زیاد).

ج-ئیمامی گەورە ئەبو حەنیفە(رەحمەتی خودای لەسەر بێت) دەڵێت: (ئەمە رای منە و باشترینی ئەوەیە توانامان بەسـەریدا شـکاوە، هەرکـەس باشـتر لەمـەمان بـۆ

---

[1] الترکة والمیراث في الاسلام للدکتور محمد یوسف موسی ص٢٤٥. کـەواتەبوو کەلالـە میراتـە بـۆ کەسانێك جگە لە باوك و کوڕە.

بهێنێت لێی قبووڵ دەکەین).

ئیمامی مالیك(رەحمەتی خودای لێ بێت) داوای خەلیفەی عەباسی رەدکردەوە بە کردنی کتێبی (الموطأ) بە تەنها سەرچاوەیەك بۆ کارکردن پێی، فەرمووی: وا مەکە ئەمیری باوەڕداران هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)-لەگەڵ ئەو زانست و فیقهەی هەڵیان گرتبوو- بڵاوەیان کردووە بە وڵاتاندا)، ئەو (رەحمەتی خودای لێ بێت) کاتێك حوکمێکی شەرعی دەردەهێنا بە هاوەڵانی خۆی دەوت:( لێی ورد ببنەوە ئەوە ئایینە، هەموو کەسێك بەشێك لە قسەکانی وەردەگیرێت و بەشێکی بەسەردا رەد دەکرێتەوە جگە لە خاوەنی ئەم گۆڕە شەریفە) ئاماژەی بە گۆڕی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەکرد.

هـ-لە شافیعییەوە(رەحمەتی خودای لەسەر بێت): (گەر فەرموودەکە دروست بوو ئەوە مەزهەبی منە و قسەکەی من بدەن بە رووی دیواردا).

و-ئیمام ئەحمەد(رەحمەتی خودای لەسەر بێت) بانگەشەی ئیجماعی لە "شوێنی ئیجتیهاد"دا بە ناپەسەند زانیوە، بەوانە دەڵێت بانگەشەی ئیجماعی بۆ دەکەن: (ئەو چوزانێت، خەڵکی(ئەهلی زانست) جیاوازیان کەوتوتە نێوانەوە و بە ئەو نەگەیشتووە)، سەرباری هەموو ئەمانە فەقیهان لەسەر ئەوە رێکەوتوون حوکمی قازی لە هەر پرسێکی جێناکۆکدا-بینا لەسەر رایەك لە را تیاجیاوازەکان- جیاوازییەکە کۆتایی پێ دەهێنێت، بۆیە لەسەر دوو نەیارەکە پێویستە کار بە حوکمپێکراوەکە بکەن، ئەوەی رۆشنە ئەوەیە حوکمی یاسا لە حوکمی قازی بەهێزترە، یاسای وڵاتە ئیسلامییەکان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی تەلاقی هاوەڵ بە ژمارە تەنها یەك تەلاقی پێ دەکەوێت.

١٥-سەرچاوەی ئیجتیهادەکەی عومەری کوڕی خەتاب-خوا لێی رازی بێت-:

گەورەمان عومەر ئەو مرۆڤە مەزنە بوو پێغەمبەر لەپایدا فەرموویەتی: (گەر لە دوای من پێغەمبەر بوونی هەبوایە عومەری کوڕی خەتاب دەبوو)! ! ئەو مرۆڤە دڵنایەی کە دوژمنان شایەتی زانست و حیکمەت و سیاسەت و زیرەکی بۆ

دەدەن سەریاری پلە و پایەی ئایینی ئەو، وەك لە فەرموودەكەی ئیبن عەباس و قسەی ئەو فەقیهانەوە كە ئەم بابەتەیان بە قووڵی و بەبێ دەمارگیری كوێرانە خوێندووەتەوە رۆشن دەبێتەوە: كاتێك خەڵكی بینی سێ تەڵاقەكە بە یەك جار دەخەن نەهی لێكردن لەو كارە و تەمبێی كردن.

كاتێك سزاكە سوودی نەبوو پابەندی كردن بە سیانەوە، و پێی وتن: هەركەس تەڵاق پێچەوانەی ئەوەی خودا رایگەیاندووە بدات– كە بریتییە لە جار لە دوای جار و هەر سێ تەڵاقەكە بە یەك جار كۆبكاتەوە– ئەوە سزاكەی بریتییە لە نەگێڕانەوەی ژنەكەی تا مێردێكی تر دەكات[1].

(عومەری كوڕی خەتاب بەئاگابوو لە فیقهی ئیسلامی، ئەو موجتەهیدێكی بوێر بوو، بەرژەوەندی گشتی لە ئیجتیهادەكەیدا–كە زۆرتر و زیاترن لەوەی هەژمار بكرێن– لەبەرچاو دەگرت، وەك دروستكردنی دیوان، و دروستكردنی بەندیخانە بۆ تاوانكاران و راگرتنی سەرفكردنی زەكات بۆ "المؤلفة قلوبهم" كاتێك بینی هۆی حوكمەكەی لێ دواكەوتووە، سزای ئارەقخواردنەوەی كرد بە هەشتا دار لە جێگەی چل دار..

بەوەش ئەم كارەی عومەری كوڕی خەتاب لە دەروازەی سیاسەی شەرعی دادەنرێت كە لە خولگەی بەرژەوەندی گشتیدا لەرووی بوون و نەبوونەوە دەسوڕێتەوە، كاری تەشریعی سیفەتی بەردەوامی بۆ نییە، چونكە ئەو سیفەتە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) تەنهادەبنەوە پێی، چوار ئیمامەكە(رەحمەتی

---

[1] يقول ابن تيمية: (كاتێك خەڵكی پابەندنەبوون بە سیانەوە و حەرامكراویان ئەنجام دەدا، عومەر وای بینی بەوەوە پابەندیان بكات، چونكە بە گوێڕایەڵكردنی خودا و پێغەمبەرەوە پابەندنەبوون لەگەڵ مانەوەی هاوسەریدا، بەڵام زۆرێك لە هاوەڵان و شوێنكەوتوان ناكۆكیان هەبوو لەگەڵ ئەوانەی ئەوەیان دەوت، یان لەگەڵ تەمبێكارییەكەدا نەبوون بە نموونەی ئەو كارە، یان لەبەر ئەوەی خاوەن شەرع ئەو سزایەی بەو شێوە دانەناوە، ئەمە لەوانەدا كە شایستەی سزادانن، بەڵام ئەوانەی بە نەزانی یان بە تەئویل شایستەی نین هیچ روویەك بوونی نییە تا پابەندی بكەیت بە "سێ"وە). فتأوى ابن تيمية ٣٣/١٦.

خودایان لێ بێت) بە ئیجتیهادی عومەری کوڕی خەتاب کاریگەر بووبوون، بۆیە فتوایان بەوە دا ئەو فتوای پێدابوو، گەر بۆ گەورەمان عومەری کوڕی خەتاب بنوسرایە جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ دونیا و ئەم پشێوییەی ببینیابایە موسڵمانان لەمەڕ تەڵاق تێیکەوتوون، هەروەها ببینیبایە چۆن لە خستنی سێ تەڵاقەکە بە یەکجار چوونەتە پێشەوە بەو بانگەشەیەی کارێکی رەوایە و قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بۆی موباح کردوون لە ئیجتیهادەکەی پەشیمان دەبوویەوە، و قەزلوەتی بەوە دەکرد لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و خەلافەتی ئەبو بەکر و دوو ساڵی یەکەم لە خەلافەتی خۆی لەسەریبوون(خوا زاناترە بە راستی)

**حوکمی تەڵاقی هاوەل بە ژمارە لە یاسای باری کەسێتی وەرگیراو لە فیقهی ئیسلامی:**

ئەم یاسایانە ئەو قسەیەی وەرگرتووە کە تەڵاقی هاوەل بە ژمارە –ژمارەکەی هەرچەند بێت– تەنها یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت، ئەمەش هەندێ لەو دەقانەیە:

یاسای **عێراقی**: (تەڵاقی هاوەل بە ژمارە لەڕووی گوزارەوە یان ئاماژەوە تەنها یەك تەڵاق دەخات)(م٣٧/٢)

**ئوردەنی**: (پیاو سێ تەڵاقی لەیەکتر جیاوازی لە سێ دانیشتندا بۆ هەیە)(م٨٥)

**سوری**: (تەڵاقی هاوەل بە ژمارە لەڕووی گوزارەوە بێت یان ئاماژە تەنها یەك تەڵاق دەخات)(م٩٢)

مەغربی: (تەڵاقی هاوەل بە ژمارە لەڕووی گوزارەوە یان ئاماژەوە یان نووسینەوە تەنها یەك تەڵاق دەخات)(الفصل ـ٥١)

**سۆدانی**: (سێ تەڵاقەکە بە تەڵاقی رجعی دادەنرێت)(المنشور الشرعي السوداني)

# باسی سێیەم:
# حوکمی پەیوەستکردن
# لە دارشتنی گوزارەی تەڵاقدا

بۆ دارشتنی گوزارەی تەڵاق دوو شێواز هەیە: تێپەڕێنراو و پەیوەستکراو:

**تێپەڕێنراو:** بریتییە لە هەر گوزارەیەك پیاوەکە بیەوێت بەهۆیەوە تەڵاقی خۆی بخات لە چرکەساتی گوزارشتدان لە دارشتنەکە وەك قسەی پیاوەکە بە ژنەکەی: (تۆ تەڵاقت کەوتووە).

**حوکمەکەی:** یەکسەر تەڵاقی پێ دەکەوێت گەر پایەکان و مەرجەکانی فەراهەم بوون، بنەڕەت لە تەڵاقدا ئەوەیە بە گوزارەی تێپەڕێنراو بێت، چونکە بۆ پێویستی دانراوە و داوای ئەوە دەکات، بینا لەسەر ئەم بنەڕەتە هەندێ لە فەقیهان دەڵێن تەڵاق تەنها بە تێپەڕاندن دەکەوێت.

**پەیوەستکردن:** بریتییە لە گرێدانی ناوەرۆکی رستەیەك بە بەدەستهێنانی ناوەرۆکی رستەیەکی ترەوە، وەك قسەی پیاوەکە بە ژنەکەی: (گەر لە مارەیی دواخراو ئەستۆی منت پاك کردەوە تەڵاقت کەوتبێت).

**تەڵاقی سوێند:** ئەمەش بریتییە لەو دارشتنەی مەبەست پێی هاندان بێت لەسەر ئەنجامدانی شتێك یان وازلێهێنان لە شتێك بەبێ ئەوەی پیاوەکە ئارەزووی تەڵاق یان پێویستی هەبێت، وەك ئەوەی بڵێت: (بە تەڵاقم ئەو کارە ئەکەم) ئەمە و چەندین گوزارشتی تری ئاڵوگۆڕ لەناو خەڵکیدا.

بۆ رۆشنکردنەوەی زیاتر لقێکی سەربەخۆ بۆ هەریەك لە پەیوەستکردنی رووت و پەیوەستکردنی سوێندئامێز تایبەت دەکەین.

# لقی یەکەم:
# حوکمی پەیوەستکردنی رووت

فەقیهان جیاوازیان هەیە لە رادەی دەسەلاتی ویستی مێردا-یان ئەو کەسەی لە جێگەی ئەو دادەنیشێت- بۆ پەیوەستکردنی تەلاق، ئەمەش لە چوار رادا:

**رای یەکەم-تەنها تەلاقی تێپەڕێنراو دەکەوێت:**

واتە هەر پەیوەستکردنێك لە تەلاقدا تەلاقەکە پووچ دەکاتەوە، و هیچ ئەسەرێکی شەرعی لە کەوتنی تەلاقی لێوە سەرهەڵنادات، ئەوانەی ئەم ئاراستەیان هەڵبژاردووە بریتین لە جەعفەرییەکان و زاهیرییەکان و "ئەبو عبدالرحمن" لە شافیعییەکان و هەندێ لە فەقیهانی حەنبەلی و ئەشهەب لە مالیکییەکان- گەر ژنەکە پێوەپەیوەستکراو(المعلق علیه)ی ئەنجامدا بە مەبەستی کەوتنی تەلاقەکە.

ئەم رایە دراوەتە پاڵ عەلی کوڕی ئەبی تالب-خوا لێی رازی بێت- و "قازی شریح، وطاووس، وعکرمة، وعطاء، وأبو ثور"یش لەسەر ئەم رایەن.

**جەعفەرییەکان:**

لە "الخلاف"دا هاتووە: (تەلاق ناکەوێت گەر بە مەرجێك لە مەرجەکانەوە یان بە سیفەتێك لە سیفەتە پێشهاتەکانەوە پەیوەستی کرد، ئەو تەلاقە-لە باری بەدەسهاتنی مەرج و سیفەتەکەیدا- لە بنەڕەتدا ناکەوێت نە لە ئێستا و نە لە داهاتوودا)[1].

بەڵگەیان هێناوەتەوە بە چەندین بەڵگە لەوانە:

١-ئیجماعی ئەم دەستەیە و هەواڵەکانیان، چونکە لەوەدا جیاوازیان نییە.

[1] الخلاف في الفقه للطوسي المرجع السابق ٢/٢٣٠.

٢-بنـەڕەت بریتییـە لـە مانـەوەی گرێبەسـتەکە و کـەوتنی ئـەم جـۆرە لـە تـەڵاق پێویستی بە بەڵگەیە و شەرعیش خاڵییە لێی.

٣-ئاشکرای بەڵگەکانی کورتکردنەوە لە "تۆ تەڵاقدراوی" دلوای نەبوونی هۆگەرایی گوزارەی داڕشتنەکە دەکات کە پەیوەستکردن لەسەری لەئامێز گرتووە.

٤-دەڵێن: بەتەنها مەرج ناکەوێت، چونکە پەیوەندی نییە لـە نێوانیانـدا، هـەر بـەو جۆرە بەتەنها ئەنجام ناکەوێت، چونکە پەیوەسـتکراوە لەسـەر مەرجەکـە، بـە هەمان شێوە بە هەردووکیان(مەرج و ئەنجام) ناکەوێت لەبەر نەبوونی مەرج لـە باری ئەنجامدا، بە هەمان ڕێگـە بـە کـارێکی دەرەکـی ناکـەوێت، چـونکە ئـەوە ناژنەورێت تا پووچی بکاتەوە.

٥-دەڵـێن: لـەباری هاتنـە دی مەرجـدا گـوزارەی تـەڵاق نامێنێـت ئـیتر چـۆن دەکەوێت؟[1].

## زاهیرییەکان:

دەڵێن: تەڵاق تەنها بە تێپەڕاندن دەکەوێت، هەر کەس تەڵاقەکەی پەیوەست کرد بە مەرجێکەوە یان دانەپاڵی تەڵاقەکە بۆ لای کاتێك ئەوە پووچ دەبێتەوە، بەڵگەیان:

١-لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) تەڵاقی جگە لە تێپـەڕێنراو نـەهاتووە، وتنی دروستی تەڵاقی پەیوەستکراو دەرچوونە لە سنوورەکانی خودا: ﴿وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ﴾.

٢-هەروەها لەبەر ئەوەی هەر تەڵاقێك لە کاتی خستنیدا نەکەوێت ئەستەمە دوای ئەوە بکەوێت لە کاتێکدا تیایدا(واتە لە کاتەکەی تردا) تەڵاقەکە نەخراوە[2].

---

[1] ينظر: الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية المرجع السابق ٢/١٤٧ـ١٤٨. شرائع الاسلام ٢/٥٦. المختصر النافع ص٢٢٢. مستدرك الوسائل ٣/٦. رياض المسائل المجلد الثاني كتاب الطلاق.

[2] المحلى لابن حزم الظاهري ١٠/٢١٣ وما بعدها.

**شافیعییەکان:**

ئیبن قەیم دەڵێت: ("أبو عبد الرحمن احمد بن یحیی بن عبد العزیز" کە لە مەزنترین هاوەڵەکانی شافیعییە وتویەتی بەرەهایی تەڵاقی پەیوەستکراو ناکەوێت، ئەم مەزهەبە تیایدا تەنها نەکەوتۆتەوە، بەڵکو کەسانی تریش لە ئەهلی زانست وتویانە)[1].

**مالیکییەکان:**

ئەشهەب-کە یەکێکە لە هەرە بەناوبانگترین فەقیهەکانی مەزهەبی ئیمامی مالیك لە تەڵاقدا- دەڵێت: تەڵاقی پەیوەستکراو ناکەوێت گەر ژنەکە-بە مەبەستی کەوتنی تەڵاقەکە- ئەو کارەی ئەنجامدا کە تەڵاقەکەی پێوە پەیوەستکرابوو، ئەمە لە بنەڕەتەکانی مالیکە لە ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤ بە پێچەوانەی مەبەستییەوە وەك بێبەشکردنی بکوژ لە میرات و میراتبردنی ژن گەر مێردەکی لە نەخۆشی مردندا تەڵاقیدا[2].

**حەنبەلییەکان:**

ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیم لەسەرو هەموو ئەوانەوە دادەنرێن کە پێیانوایە تەڵاقی پەیوەستکراو ناکەوێت گەر مەبەست پێی هەڵنان بێت بۆ ئەنجامدانی کارێك یان ئەنجام نەدانی[3]

ئەم رایە دەدرێتە پاڵ عەلی کوڕی ئەبی تالب و هەندێ لە شوێنکەوتوان، مامۆستای گەورە "علي الخفيف" دەڵێت: (دەستەیەك لە فەقیهان پێیانوایە پەیوەستکردن پووچ و بێبنەمایە و تەنها تەڵاقی تێەڕاندن رەوایەتی پێدراوە، ئەوەش ئەوەیە ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ دەکات: ﴿يَا أَيُّهَا النبـي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ

(1) أعلام الموقعين ٤/١٠١.

(2) المرجع السابق ٤/٩٧.

(3) مجموع فتاوى ابن تيمية ٣٢/٢٢٣ وما بعدها اعلام الموقعين ٤/١٠٢ ومابعدها.

لعدّتهنّ﴾ فەرمان كردن بە تەڵاق لە كاتێكی دیاریكراودا دلوا دەكات تەڵاقەكە تێپەڕێنراو بێت لەو كاتەدا، تەڵاقی پەیوەستكراو نارەوایە و رەدكراوەیە بۆ سەر پیاوەكە، و هیچ شتێكی لەسەر پەیدانابێت، ئەمەش لە "علي ، وشريح، وطاووس، وأبي ثور[1]" ریوایەتكراوە.

**رای دووەم -پەیوەستكردنەكە پووچە بەڵام پووچكەرەوە نییە بۆیە لە ئێستادا دەكەوێت.**

سەرخەرانی ئەم ئاراستەیە پێیانوایە پەیوەستكردنی تەڵاق پووچە، چونكە تێكچوون پێویست دەكات بۆیە ئەسەرەكەی دەسڕێتەوە، بەڵام پووچكەرەوە نییە، بۆیە لە ئێستادا و لە ساتی گوزارشت بە دارشتنەكە تەڵاقەكەی دەكەوێت.

ئەوەش یەكێكە لە ریوایەتەكانی ئیمامی مالیك و قسەی دەستەیەك لە شوێنكەوتووان، و مەزهەبی ئیبازییەكان لە هەندێ شێواز و بەڵگەیاندا: (گەر تەڵاقە لە ئێستادا نەكەوێت لێیەوە موباحكردنی چوونە لای كاتی سەرهەڵدەدات، ئەوەش لە شەرعدا رێگەپێنەدراوە، چونكە پیاوەكە موباحیكردووە تا ئەو كاتەی تیایدا تەواو دەبێت، لەبەر ئەوەیە نیكاحی موتعە حەرامكراوە بەهۆی چوونە ناوی كاتەوە(ماوە) بۆ هاوسەرگیرییەكە)

**شوێنكەوتوان:**

ئیبن قودامە دەڵێت: ("سعيد بن المسيب، والحسن، والزهري، وقتادة، ويحيى، الانصاري، وربيعة، ومالك" دەڵێن: گەر تەڵاق پەیوەستكرا بە سیفەتێكەوە كە هەر دەبێت بێتە بەرەوە، وەك "تۆ تەڵاقدراوی گەر خۆر هەڵهات" ئەوا لە ئێستادا(لەو كاتەدا قسەكە دەكات) تەڵاقەكە دەكەوێت، چونكە هاوسەرگیری پەیوەست نییە بە كاتەوە بۆیە دروست نییە بۆ مانگێك هاوسەرگیری لەگەڵ بكات)[2].

---

[1] فرق الزواج للاستاذ الشيخ علي الخفيف ص١١٢.

[2] المغني والشرح الكبير ٣١٨/٨.

**مالیكییەكان[1]:**

دەڵێن تەڵاق بە تێپەڕاندن دەكەوێت گەر پەیوەستكرا بە رابردوویەكەوە لەڕووی ئەقڵ یان عادەت یان شەرعەوە رێگەپێنەدراو بوو(نەگونجاو بوو)، هەر بەو جۆرە گەر پەیوەستكرا بە كارێكی داهاتووەوە كە بە بێ هیچ گومانێك بێتە دی، وەك دوای ساڵێكی تر تەڵاقی كەوتبێت، لەم بارەدا تەڵاقەكەی بەسەردا تێدەپەڕێنرێت، چونكە لەو بارەدا بە هاوسەرگیری موتعە دەچێت، هەر بەو جۆرە گەر پەیوەستی بكات بە شتێكەوە نەتوانێت لەسەری ئارام بگرێت وەك گەر هەڵبستی یان گەر دابنیشی، و كاتێكی بۆ دیارینەكرد، چونكە ئەو شتانەی كە ناتوانی ئارامی لەسەر بگریت وەك ئەوە وایە بە دڵنیاییەوە بێتە دی، هەر بەو جۆرە گەر پەیوەستی كرد بە كارێكەوە نەتوانێت لە ئێستادا لێی بەئاگا بێت، تەڵاقت كەوتبێت گەر سكت بە كچ پڕبێت، هەر بەو جۆرە گەر پەیوەستبكرێت بە ویستێكی پەنهانەوە وەك "تەڵاقی كەوتبێت گەر خودا بیەوێت"

هەروەها دەڵێن: تەڵاق ناكەوێت گەر پەیوەست بكرێت بە داهاتوویەكی نەگونجاوەوە: تەڵاقی كەوتبێت گەر دەستی دا لە ئاسمان[2].

ئەوەی دكتۆر "عبدالرحمن الصابوني" لە كتێبی (مدى حرية الزوجين في الطلاق)دا[3] دەیڵێت: (گەر تەڵاق پەیوەستكرا بە كار و بارێكەوە هاتنەدی ئەستەم بوو لای مالیكییەكان تەڵاقەكە ناكەوێت) قسەیەكی دروست نییە، چونكە جیاوازی نەكردووە لە نێوان پەیوەستكراو بە رابردوویەكی ئەستەم و داهاتوویەكی ئەستەمەوە، لە باری یەكەمدا لە ئێستادا دەكەوێت وەك كەمێك بەر لە ئێستا باسمان كرد، لە ئیمامی مالیكەوە دوو ریوایەت لە پەیوەستكردنی تەڵاقدا بە كارێكەوە كە روودانی

---

(1) شرح الخرشي ٤/٥٤ وما بعدها.

(2) الخرشي المرجع السابق.

(3) الصابوني: مدى حرية الزوجين في الطلاق ١/١٩٣.

گونجاو بێت باسکراوە: یەکێکیان لەگەڵ حەنەفییەکان و شافیعییەکاندا هاوڕایە و تەڵاق لەباری بوونی مەرجدا دەکەوێت، ئەویتریان یەکسەر دەکەوێت[1].

لەوەی خستمانە روو حاڵی دەبین مالیکییەکان هەرچەند لەڕووی بنەماوە لەسەر دروستی پەیوەستکردنن لە تەڵاقدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لە هەندێ شێوەیدا وەك تێپەڕێنراو تەماشای دەکەن و لە هەندێ شێوەی تریدا بە رێگر لە کەوتنی تەڵاق تەماشای دەکەن، وەك پەیوەستکردن لەسەر دلهاتوویەکی ئەستەم یان لەسەر ویستێك نازانی ویستی چییە.

**ئیبازییەکان:**

ئیبازییەکان دەڵێن: تەڵاق یەکسەر(لە ئێستادا) دەکەوێت گەر پەیوەستی کرد بە گونجاوێکەوە لەڕووی شەرعەوە رێگەپێنەدراو بێت یان نەبووبێت یان لەڕووی ئەقڵەوە یان لەڕووی عادەتەوە نەشیاو بێت، لە "جوهر النظام"دا[2]. هاتووە:

وان يعلقــــه بممكـــــن منـــــع — وجـــوده شـــرعا فحـــالا يقــــع
وان بمعــــــــدوم يعلقنــــــا — فانهــــا بالحــــال تطلقنــــا
كقـــول مـــن قـــال اذا شـــربت — مـــا دخـــل الكـــوز فقـــد طلقـــت
ولم يكـــن بـــالكوز شـــيء يشـــرب — فانهـــا تطلـــق ثـــم تـــذهب
اذ يقـــع الطـــلاق والتعليـــق — يلغـــى فـــلا يعلـــق التطليـــق
ومثلـــه الشـــرط الـــذي لم يقـــدر — علـــى وقوعـــه صـــنوف البشـــر

[1] ينظر بداية المجتهد ونهاية المقتصد لابن رشد ٦٥/٢ وما بعدها.

[2] جوهر النظام المرجع السابق ٢٢٠/٢ وما بعدها.

**رای سێیەم: دریژەپێدانی تێدایە و دوو بەرمیە، لە بەرمیەکیاندا لەگەڵ رای دووەم هاورایە و لە بەرمەکەی تریاندا لەگەڵ رای چوارەم[1]:**

ئەوەش گەر تەڵاقی پەیوەستکراو سێ بێت یەکسەر دەکەوێت، گەر تەڵاقی رجعی بێت دوای هاتنەدی پەیوەستلەسەرکراو(المعلق علیە) دەکەوێت، ئەمە یەکێکە لە دوو ریوایەتەکە لە ئیمامی ئەحمەدەوە، رووی ئەم قسەیە ئەوەیە گەر تەڵاقەکە سێ بێت چوونە لای ژنەکە دروست نییە لەدوای ماوەکە، گەر رجعی بێت ئەو کارە دروستە چونکە ئێستا ناکات بە کاتی(مؤقت)، ئیبن قەیم دەڵێت: ئەمەیان لە رای دووەم وردترە[2].

**رای چوارەم: پیاوەکە ئازادی تەواوی هەیە لە هەڵبژاردنی دارشتنی تەڵاقدا وەک پەیوەستکراو یان وەک تێپەڕێنراو:**

بۆیە تەڵاقی پەیوەستکراو لەسەر مەرجێك یان پاڵخراو بۆ کاتێك دوای هاتنەدی لەسەرپەیوەستکراو دەکەوێت، ئەوەش مەزهەبی حەنەفی و شافیعی و جمهووری حەنبەلی و زەیدییەکانە.

**حەنەفییەکان:**

لە" الجوهرة[3]"دا هاتووە: گەر درایە پاڵ مەرجێك کەمێك دوای مەرجەکە دەکەوێت، وەك بڵێت: گەر چوویە ناو خانووەکە تۆ تەڵاقت کەوتووە، ئەمەش بە هاوڕابوونی هەموان لەسەری، چونکە موڵکەکە لە ئێستادا راوەستاوە، ئاشکرا مانەوەی موڵکەکەیە تا کاتی مەرجەکە، چونکە گەر پەیوەستکرا بە مەرجێکەوە لەگەڵ بوونی مەرجەکەدا دەبێت وەك گوزارشتکەر بە تەڵاقی لێ نێت لەو کاتەدا.

---

[1] پێشخستنی رای سێیەم زانستیانەتر بوو، بەڵام لەبەر کورتکردنەوە بەم جۆرە خستمانە روو.

[2] اغاثة اللهفان ٢/١٩٣.

[3] الجوهرة النيرة ٢/١١٠. قارن المبسوط للسرخسي ٦/١٠١ وما بعدها، رد المحتار على الدر المختار شرح تنوير الأبصار ٣/٣٤١ وما بعدها.

**شافیعییەکان:**

لە "المهذب"دا[1] هاتووە: گەر تەڵاق پەیوەستکرا بە مەرجێکەوە کە ئەستەم نەبێت وەك چوونە ناو خانوو و هاتنی مانگ ئەوا پێیەوە پەیوەست دەبێت، گەر مەرجەکە هاتە دی تەڵاقەکە دەکەوێت، گەر نەهاتە دی ناکەوێت، لەبەر ئەو فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ریوایەتکراوە: ((موسڵمانان لە پای مەرجەکانی خۆیانن))[2].

**حەنبەلییەکان:**

لە " المغنی[3]"دا هاتووە گەر تەڵاق بە کاتێك کەوت یان پەیوەستی کرد بە سیفەتێکەوە پێیەوە پەیوەست دەبێت، تەڵاقەکە ناکەوێت تا سیفەتەکە یان کاتەکە دێتە بەرەوە، ئیبن قودامە هۆی بۆ هێناوەتەوە، چونکە سڕینەوەی موڵك پەیوەستکردنی بە سیفەتەوە دروستە، بۆیە هەر کەس تەڵاق بە سیفەتەوە پەیوەست بکات پێش وەخت ناکەوێت.

**زەیدییەکان:**

دەڵێن: (تەڵاقی بەمەرجگیراو کەوتنی لەسەر هاتنەدی مەرجەکە وەستاوە، بۆیە ناکەوێت تا مەرجەکە بە ئەریێ یان نەریێ دێتە بەرەوە، با ئەو مەرجەش ئەستەم بێت، بەڵام گەر پەیوەستی کرد بە شتێکەوە هاتنە بەرەوەی زانراو و ئاشکرا بوو وەك هەڵهاتنی خۆر، گەر بە نەریێ پێیەوە پەیوەست کرد بوو وەك گەر خۆر هەڵنەیەت تۆ تەڵاقت کەوتبێت لەم بارەدا ناکەوێت، هەر بەو جۆرە گەر پەیوەستی کرد بە رابردووەوە، وەك گەر زەید هاتبێت تۆ تەڵاقدراوی، ئەمەش وەك ئەوە وایە بڵێت

---

[1] المهذب ٩٣/٢ ينظر أيضا الانوار المرجع السابق ٢١١/٢ وما بعدها حاشية الباجوري ١٤٧/٢ وما بعدها.

[2] زانستیانەتر بوو سێیەممان دوابخستبایە، بەڵام لەبەر کورتکردنەوە پێشمانخست(پێموایە ئەم پەراوێزە دووبارەیە).

[3] المغني والشرح الكبير ٣١٨/٨.

دوێنێ تەڵاقت کەوتبێت، ئەوە لەلایان پووچ و بێبنەمایە، گەر بە ئەرێوە پەیوەستی کرد وەك گەر خۆر هەڵهات ناکەوێت تا مەرجەکە دێتەدی، گەر پەیوەستی کرد بە ئەستەم یان نائەستەمەوە شتێك لە تەڵاق ناکەوێت)[1].

**مەرجەکانی پەیوەستکردن لەلای ئەوانەی لەسەر کەوتنی تەڵاقی پەیوەستکراون:**

١-بەمەرج دەگیرێت لەسەرپەیوەستکراو بوونی هەبێت لە کاتی سەرهەڵدانی دارشتنی گوزارەکەدا، ئەگەر نە پەیوەستکردنەکە رووالەتی دەبێت و تەڵاقەکە تێپەڕێنراو دەبێت.

٢-هاوسەرگیریی لەراستیدا بوونی هەبێت یان لەڕووی حوکمەوە لە کاتی هاتنەدی "لەسەرپەیوەستکراو" بوونی هەبێت، ئەگەر نە، مەرجەکە و ئەسەرەکەی دەسڕێنەوە.

٣-لەسەرپەیوەستکراو(المعلق علیه) کارێك بێت ئەگەری روودانی هەبێت، گەر کارەکە ئەستەم بوو، ئەم درێژەپێدانەی تێدایە:

أ-حەنەفییەکان دەڵێن پەیوەستکردن بە ئەستەمەوە هیچ ئەسەرێکی لەسەر پەیدا نابێت، لە " الدر المختار[2]"دا هاتووە: (مەرجی دروستی پەیوەستکردنەکە ئەوەیە مەرجەکە نەبوو(معدوم)بێت لەسەر باری(لێواری) بوون، هاتنەدی وەك ئەوەی بڵێت: "ئاسمان لەسەرەوە بێت" تێپەڕێنراوە، ئەستەم وەك: "وشتر بچێت بە کونی دەرزیدا" پووچ و بێ ئەرزشە، جیاوازیان نەکردووە لە نێوان ئەستەم لە رابردوودا و لەگەڵ ئەستەم لە داهاتوودا.

---

[1] یراجع التاج- المذهب ٢/١٣٠.

[2] یراجع حاشیة الطحأوي علی الدر المختار ٢/١٥٠.

ب-مالیکییەکان دەڵێن: گەر پەیوەستی بکات بە داهاتوویەکی ئەستەمەوە ناکەوێت، گەر پەیوەستی کرد بە رابردوویەکی ئەستەمەوە دەکەوێت و تێپەڕێنراوە وەك پێشتر باسمان کرد.

ج-شافیعییەکان دەڵێن: گەر پەیوەستی کرد بە ئەستەمێکی ئەرێوە ناکەوێت، گەر بە نەرێوە پەیوەست بوو یەکسەر(لە ئێستادا) دەکەوێت، لە "نهایة المحتاج[1]"دا هاتووە: گەر پەیوەستی کرد بە ئەستەمێك لەڕووی ئەقڵ یان لەڕووی شەرع یان عادەتەوە لە ئێستادا شتێك ناکەوێت، " المغربی[2]" لەسەر ئەوە دەڵێت: بە پێچەوانەی نەرێوە حوکمەکەی کەوتنە لە ئێستادا، بەڵام پەیوەستکردنی بە نەرێی فەرمانی داخوازی گونجاوەوە وەك گەر نەچینە ناو خانووەکە تۆ تەڵاقدراوی، مەزهەب لەسەر ئەوەیە ناکەوێت مەگەر بە بێهیوابوون لە چوونە ژوورەوە[3].

د-پێشتر باسی ئەوەمان کرد زەیدییەکان دەڵێن بەمەرجگیراو ناکەوێت تا مەرجەکە بەدیدێت بە نەرێ یان بە ئەرێ با ئەو مەرجەش ئەستەم بێت[4].

هـ-ئیبازییەکان دەڵێن: تەڵاقی پەیوەستکراو بە ئەستەمەوە یەکسەر دەکەوێت[5] بەڵام ئەوانە جیاوازیان لە نێواندایە ئایا یەکسەر و لە ئێستادا تەڵاقدەدرێت، هاتنەدی مەرجەکە بۆ جێبەجێ کردنی تەڵاقەکەیە یان لە هاتنەدی مەرجەکەدا تەڵاقدراوە؟ لەسەر یەکەمیان هۆیەکە پێشدەکەوێت و مەرجی کاریگەرییەکەی دوادەکەوێت، لەسەر دووەم هۆیەکە دوادەکەوێت تا دەمی هاتنی کاتەکەی.

---

(1) نهاية المحتاج ٤١/٧. وفي حاشية الباجوري (١٤٨/٢): (گەر پەیوەستکرا بە ئەستەمێکی ئەرێوە نەکەوتووە، بە پێچەوانەی ئەوەی گەر پەیوەست بکرێت بە ئەستەمێکی نەرێوە وەك بڵێت گەر سەرنەکەویت بۆ ئاسمان تۆ تەڵاقدراوی، ئەوە یەکسەر تەڵاقی پێ دەکەوێت).

(2) يراجع حاشية المغربي على نهاية المحتاج ٤٥/٧.

(3) يراجع مغني المحتاج ٣١٨/٣.

(4) يراجع التاج المنهب ١٣٠/٢ وما بعدها.

(5) يراجع جوهر النظام ٢٢١/٢.

رۆشنکردنەوەی ئەوە: گەر پیاوێك وتی بە ژنەکەی "تۆ تەڵاقدراوی گەر لەگەڵ فلأن کەس قسە بکەی" وتنی: "تۆ تەڵاقدراوی" هۆی کەوتنی تەڵاقەکەیە، وتنی "گەر لەگەڵ فلأن کەس قسە بکەی" مەرجی تەڵاقەکەیە، لەمەڕ سروشتی ئەم مەرجە جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە ئایە مەرجێکە بۆ بوونی هۆیەکە یان مەرجێکە بۆ کاریگەری هۆیەکە؟ هەندێ لە فەقیهان وەك حەنەفییەکان دەڵێن: هۆ بوونی نییە پێش هاتنەدی مەرجەکە، دەستەیەك وەك شافیعییەکان دەڵێن: هۆ بوونی هەیە بەر لە مەرج، بەڵام کاریگەرییەکەی لەسەر بوونی مەرج رادەوەستێت.

پێمولیە جیاوازییەکە[1] رووالەتییە لە کاتێکدا مەبەست پێی "هۆی تەواوە" واتە ئەو هۆیەی کە مەرجەکانی هاتوونەتە دی و رێگرییەکانی نەرێکراون، ئەوا بە کۆدەنگی بەر لە مەرج بوونی نییە، گەر مەبەست پێی هۆی ناتەواو بێت ئەوە بەر لە مەرج بوونی هەیە بەبێ جیاوازی، لە کاتێکدا سەرلەنوێ دارشتنی گوزارەکە لای هەمووان دووبارە نابێتەوە دوای هاتنەدی مەرجەکە.

**گفتوگۆی بەڵگەکانی ئەم رایانە:**

١–دەتوانرێ رەخنە لە رای زاهیرییەکان بگیرێت بەوەی سەرچاوەکانی فیقهی ئیسلامی تەنها ئاشکرای قورئان و سوننەت نییە، بەڵکو سەرچاوەی تری ناوەندی بوونی هەیە وەك ئیجماع و پێوانە و عورف و بەرژەوەندی و رێلێبڕینەوە و قسەی هاوەڵان، پاشان وەك چۆن دەقێك لە قورئان و فەرموودە بوونی نییە بەڵگەبێت لەسەر دروستی پەیوەستکردن، هەر بەو جۆرە دەقێك نەهاتووە بەڵگە بێت لەسەر پووچەڵبوونەوەی، مەگەر بوترێت ئەم رایەیان لەسەر ئەوە بیناکراوە بنەڕەت لە مەرجدا نادروستییە، گەر دەقێکی لەسەر نەهاتبوو، بەڵام نەبوونی ئاگاهی بە دەق نەبوونی دەقەکە لە هەمان کاتدا پێویست ناکات.

---

[1] براجع اغاثة اللهفان ١٩٣/١.

٢-بە جەعفەرییەکان دەوترێت: تەلاق بە کۆی مەرج و ئەنجام دەکەوێت، هاوشێوەی ئەوە لە قورئاندا هاتووە: ﴿إن يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ ﴿وَإن جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا﴾ نموونەی ئەوە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) زۆرە، ئەو قسەیان لەباری هاتنەدی مەرجدا گوزارەی تەلاق نامێنێت بەرپەرچدەدرێتەوە بەوەی لەباری رووداني مەرجەکەدا گوزارەکە نوێدەبێتەوە بە خستنی تەلاقەکە بە خەملاندن وەك چۆن لە هەموو پەیوەستبوونێکدا بەو جۆرەیە[1]

٣-قسەکەی ئەشهەب لە مالیکییەکان: تەبایە لەگەڵ رێسای: (مەرامی خراپ دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی) هەروەها لەگەڵ مەنتقی شەریعەتی ئیسلامدا پێکدێتەوە، بەڵام ئاماژە ناکاتە سەر ئەوەی نەکەوتن هۆیەکەی بریتییە لە پەیوەستکردن.

٤-بە خاوەنی رای دووەم دەوترێت: دروست نییە حوکمی بەردەوامی لە حوکمی دەستپێکردن وەربگیرێت بەهۆی ئەو رێسا گشتییەوە: (ئەوەی لە دەستپێکردندا جێگەی لێخۆشبوون نییە لە مانەوەدا جێگەی لێخۆشبوونە) بۆیە فیقهی ئیسلامی لە زۆرێك لە بابەتەکاندا جیاوازی کردووە لە نێوانیاندا، لەوانە: دەستپێکردنی گرێبەستی هاوسەرگیری لە ئیحرامدا تێکچووە نەك لە بەردەوامبوونەکەیدا، دەستپێکردنی گرێبەست لەسەر ئافرەتێك لە عیدەدا بێت تێکچووە نەك لە بەردەوامبوونیدا، دەستپێکردنی گرێبەست لەسەر ئافرەتی زیناکەر تێکچووە لای ئیمام ئەحمەد و ئەوانەی لەگەڵ ئەوون نەك لە بەردەوامییەکەیدا.

پێوانە ناکرێتە سەر هاوسەرگیری موتعە، چونکە ئەو مانایەی لە پێناویدا هاوسەرگیری موتعە حەرامکراوە ئەوەیە کە گرێبەستەکە لە بنەڕەتیدا کاتییە، ئەم

---

[1] یراجع البحر الزخار ١٩١/٣.

گرێبەستە ڕەهایە، بەڵام شتێکی بۆ هاتووەتە پێش تاکو پووچی بکاتەوە و بیبڕێت، بۆیە پووچ نابێتەوە، وەك چۆن گەر تەڵاق پەیوەست بکات بە مەرجێکەوە و بزانێت ژنەکە ئەنجامی دەدات.

سەرەڕای ئەوەی باسکرا لە را و بەڵگە و گفتوگۆ لەسەرکردنیان گومانی زاڵ ئەوەیە تاکو ئێستا هیچ فەقیهێك نەگەیشتووەتە بەڵگەیەکی بڕاوە دروستی پەیوەستکردنی تەڵاق یان پووچەڵبوونەوەی بسەلمێنێت، بەڵام پرسیارێك بە بیری ئەو کەسانەدا دێت دوای ئەم پرسە کەوتوون: بۆچی هاوسەرگیری و کڕین و فرۆشتن و شتانی تریش لە زۆرینەی هەڵسوکەوتە گوتارییەکان بە پەیوەستکردن پووچ دەبنەوە بۆچی تەڵاق نە، لەگەڵ بوونی ترسناکی و گرنگییەکەی لە ژیانی خێزان و کۆمەڵگەدا چی سڕینەوەی ئەمەی پێویست کردووە و دروستی ئەوەی ڕاگەیاندووە؟

ئیبن قەیم[1] لەم بارەیەوە دەڵێت: (ئەو قسەیەمان کە تەڵاق بە مەرجێکەوە پەیوەست دەکات وەك قسەکەی ئێوە وایە لە پەیوەستکردنی ئەستۆپاککردن(گەردنئازادکردن)، یان بەخشین، و وەقف، و فرۆشتن و هاوسەرگیری... یەکسانە، بۆیە هەرگیز ناتوانن جیاوازی بکەن لە نێوان ئەوەی پەیوەستکردنەکەی دروستە لە بەخشینەکان و قەرەبووەکان و بەردانەوەکان بە مەرجەکانەوە لەگەڵ ئەوەی پەیوەستکردنی دروست نییە، ناتوانن قسەی کێبەرکێکارەکانی خۆتان لە دروستی پەیوەستکردن  بە مەرجی شتێکەوە پووچەڵ بکەنەوە چونکە ئەو شتە لە خودی خۆیدا بەڵگەیە لەسەرتان بۆ پووچەڵکردنەوەی قسەکەتان لە ڕێگری دروستی ئەستۆپاککردن و پێدان و وەقف و هاوسەرگیری، چی هەیە سڕینەوەی ئەو پەیوەستکردنە و دروستی ئەو پەیوەستکردنەی پێویست کردبێت؟ گەر بە بڕیتیدان جیاوازیان لە نێواندا بکەن و بڵێن: گرێبەستەکانی بڕیتیدان پەیوەستکردن قبووڵ ناکەن بە پێچەوانەی ئەوانی ترەوە، ئەوا ڕاستەوانە لە

---

[1] اعلام الموقعين لابن قيم الجوزية ٤/١٠٢ وما بعدها.

"الجعالة"دا و پێچەوانە لە "الهبة و الوقف"دا بەرووتاندا هەڵدەگرێتەوە، جیاوازییەکە بە راستەوانە و پێچەوانە بەرووتاندا دەشکێتەوە، گەر جیاوازی بکەن بە موڵککردن و بەردانەوە(الإسقاط) و بڵێن: (گرێبەستەکانی بەموڵککردن پەیوەستکردن قبووڵ ناکات بە پێچەوانەی گرێبەستەکانی بەردانەوەوە) دیسان راستەوانە بە رووتاندا دەشکێتەوە بە وەسێت و پێچەوانە بە ئەستۆپاکی، بۆیە نە راستەوانە و نە پێچەوانە، گەر جیاوازی بکەن بە بردنەناو بۆ ناو موڵکەکەی و کردنەدەرەوە لە موڵکەکەی ئەوا لە دووەمدا پەیوەستکردنەکەتان بەڕاست داناوە نەک لە یەکەمدا، دیسان جیاوازییەکەتان بەڕوودا شکاوەتەوە، چونکە "الهبة" و ئەستۆپاککردن دەرکردنە لە موڵکەکەی و پەیوەستکردنیان لای ئێوە دروست نییە.

گەر جیاوازیتان کرد بەوەی کە ئەگەری فریوکاری تێدایە و ئەوەی ئەگەری فریوکاری تێدا نییە، فریوکاری و مەترسی لە فریوکاری پەیوەستکردنیان بە مەرجەوە دروستە، وەک تەڵاق و ئازادکردن و وەسێت، ئەوەش ئەگەری فریوکاری تێدا نییە وەک کڕین و فرۆشتن و هاوسەرگیری و بەکرێدان پەیوەستکردنیان دروست نییە، بە بڕیکاری بەسەرتاندا دەشکێتەوە، بڕیکاری لەلای ئێوە پەیوەستکردن قبووڵ ناکات و ئەگەری ترسی هەیە..تا کۆتاییەکەی)

## لقی دووەم:
## سوێنخواردن بە تەڵاق

پێشتر پەیوەستکردنمان ڕۆشن کردەوە لەوانەیە هەندێ جار سوێند بێت، بەڵام جیاوازی نێوانیان وردە تەنها بە مەرام و مەبەست و سروشتی "لەسەرپەیوەستکراو" دەزانرێت، بەڵام ئەم تێکەڵییە لە نێوان پەیوەستکردن و سوێند نەهاتووە، گەر مێردەکە گوزارەی سوێندی ئاسایی بەکارهێنا وەك: (بە تەڵاقم ئەوە دەکەم) یان (بە تەڵاقم ئەو کارە ناکەم).

**حوکمی سوێنخواردن بە تەڵاق:**

لەم بابەتەدا جیاوازی هەیە لە نێوان پێشین و پاشیندا لەسەر سێ ڕا[1]:

**ڕای یەکەم:** گەر سوێندەکەی کەوت تەڵاقەکەی دەکەوێت، ئەمە بەناوبانگە لەناو جمهووری فـەقیهانی " حەنەفیـەکان[2]،و مالیکیـەکان[3]، و شـافیعیەکان[4]، وبعـض حەنبەلییەکان[5]، و زەیدیەکان[6]"، تا دەستەیەك لە پاشین باوەڕیان وایە کەوتن بە ئیجماع جێگیر بووە[7]، بەڵگەکەیان: پیاوەکە پابەندبووە بە کارێکەوە لەباری بـوونی مەرجدا، بۆیە پابەند دەبێت بەوەی خۆی پێ پابەند کردووە، ئەم بۆچوونە لە چـەند ڕوویەکەوە گفتوگۆی لەسەر دەکرێت، لەوانە:

١-نە بە دەق و نە بە ئیجماع جێگیر نەبووە.

---

[1] مجموع فتأوى ابن تيمية ٢١٥/٣٣.
[2] حاشية الطحأوي ١٥٠/٢.
[3] شرح الخرشي ٥٤/٤.
[4] نهاية المحتاج ٣٨/٧. مغني المحتاج ٣١٢/٣.
[5] الروض المربع ١٧١/٣ وما بعدها.
[6] التاج المنهب المرجع السابق ١٥٨/٢ وما بعدها.
[7] مجموع فتأوى ابن تيمية المرجع السابق، ٢١٦/٣٣.

٢–سوێند خواردن بە شتێك جگە لە خودا و سیفەتەکانی پووچ و بێبنەمایە، ئەوەش لەسەر پووچ بینا دەکرێت پووچە.

٣–هەڵوەشاوەیە بە نەزری تەڵاق و یاخیبوون و پابەندکردن بە کوفرەوە لەڕووی سوێندەوە.

**ڕای دووەم**: تەڵاق ناکەوێت و کەفارەتیشی لەسەر پێویست نابێت:

ئەم ڕایە لە " علي بن ابي طالب ، القاضي شريح، وطاووس، وعكرمة، مولى ابن عباس" ڕیوایەت کراوە، ئەمە مەزهەبی جەعفەرییەکان و زاهیرییەکان و ئیبازییەکانە.

**جەعفەرییەکان** دەڵێن: تەڵاقی پەیوەستکراو لەسەر مەرج ناکەوێت، هەر بەو جۆرە کردنی بە سوێند لەبەر ئەو ڕیوایەتەی لە جەعفەری کوڕی محەمەدەوە ڕیوایەتکراوە: (هەر کەس بە تەڵاق یان ئازادکردن سوێندی خوارد پاشان سوێندەکەی کەوت ئەوە هیچ شتێك نییە) کەوابوو ژنەکەی لێ تەڵاق نادرێت و بەندەکەی لێ ئازاد ناکرێت.

هەروەها لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کردووە لە سوێندخواردن بە جگە لە خودا و نەهی لە تەڵاق کردووە بە جگە لە سوننەت[1].

زاهیرییەکان دەڵێن: سوێندخواردن بە تەڵاق کەسەکە پابەند ناکات، سوێندەکەی بێتە دی یان سوێندەکەی کەوتبێت تەڵاقی پێ ناکەوێت، تەڵاق بەو جۆرە خودا فەرمانی پێکردووە و سوێند بەو جۆرەیە وەك خودا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) فەرمانی پێکردووە، بەڵگە لەسەر ئەوە ئایەتی: ﴿ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ﴾ هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ((هەر کەس سوێندی خوارد با تەنها بە خودا سوێند بخوات))[2]

بینا لەسەر ئەمە هەموو سوێندێك بە جگە لە خودا یاخیبوونە و سوێند نییە[3].

---

[1] مستدرك الوسائل ٣/٦.

٢)) مسلم : ٣١٠٦

[3] المحلى لابن حزم الظاهري ١٠/٢١١-٢١٢.

**ئیبازییەکان:** دەڵێن سوێندخواردن بە تەلاق یاخیبوونە، وتنی تەلاقی سوێنپێخوراو گەر سوێندەکەی بکەوێت قسەیەکی داهێنراوە، و بیدعەیەکی خراپە لە "جوهر النظام"دا هاتووە:

وحلف الطلاق نوع معصية فاعله ليس لـه من تزكية

لانـه بغير ربـي أقسـما فهـو بغير ربه عظما

والحلف في طلاقها أن حنثا والقول بالطلاق مما أحدثا[1]

مامۆستای خوالێخۆش بوو "محمود شەلتوت" شێخی پێشووی زانکۆی ئەزهەر پارسەنگی ئەم رایەی داوە و دەفەرموێت: سوێندخۆر بە تەلاق کافر نییە پاڵپشت بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): ((هەر کەس سوێند بخوات بە شتێك جگە لە خودا کوفری کردووە)) چونکە ئەم فەرموودەیە مەبەست پێی توندکردنەوەیە بە تەمبێکردن لە سوێند بە جگە لە خودا، ئەو کاتە سەردەمی بە مەزنڕاگرتنی جگە لە خودا بوو لە بوونەوەرەکان یان دروستکراوەکان، سوێند بە تەلاق(لە ئێستادا) مانای ئەو بەمەزنڕاگرتنەی تێدا نییە کە لەو سەردەمەدا تەماشا دەکرا، بەڵکو ئەوە یاریکردنە بە گوزارەکانی سوێند و سوێندخواردن بە شتانێك جگە لەوەی خودا بە رەوای داناوە سوێندیان پێ بخۆیت، هەر کەس دەیەوێت سوێند بخوات با سوێند بە خودا بخوات یان بێدەنگ بێت، راسترین بۆچوون ئەوەیە سوێند بە جگە لە خودا با پێغەمبەرێکیش بێت یان فریشتەیەکی نزیك لە خودا بێت کارێکی حەرامە و سوێندی پێ دانامەزرێ و کەفارەتەکەی تەوبەکردن و داوای لێخۆشبوونە لە خودا[2].

**رای سێیەم:** ئەوە سوێندێکە لە سوێندنی موسڵمانان بۆیە ئەوەی لە سوێندنی کەوتوودا گوزەر دەکات لە کەفارەت بەسەر ئەمیشدا دەگوزەرێت، مەگەر کەسی سوێندخۆر مەبەستی کەوتنی تەلاق بێت لەو بارەدا تەلاقەکەی دەکەوێت و کەفارەتی

---

[1] جوهر النظام ٢/٢٢٢.

[2] أنظر فتأوى الأمّام محمود شلتوت ٣٠/١.

لەسەر پێویست نابێت.

ئیبن تەیمیە[1](ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (ئەوەش ڕاستترین قسەیە و بەڵگەی کیتاب و سوننە و دەستەیەك لە پێشین و پاشینی لەسەرە، هەروەها ئەوە بریتییە لە داخوازی ئەوەی لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە گوازراوەتەوە و زۆریەی مالیکییەکان و کەسانی تریش جگە لەوان فتوا بەمە دەدەن).

**ئەوەی من بەلایدا دەشکێمەوە:**

ئەوەیە نە تەڵاقی تێپەڕێنراو و نە تەڵاقی بەمەرجگیراو و نە بەکارهێنراو بە داڕشتنی گوزارەی سوێند ناکەوێت، بەم هۆیانە:

١-فەقیهان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی هەر هەڵسوکەوتێکی گوفتاری یان کرداری گەر پەیوەستکرابێت بە مەرجەوە بە پووچ دادەنرێت، ئەو قسەشیان تەڵاقی پەیوەستکراو دەکەوێت گەر "لەسەرپەیوەستکراو" هاتەدی هەڵوێشێنەرەوەی ئەم ڕێکەوتنەیە.

٢-تەڵاق ترسناکترین هەڵسوکەوتی گوفتارییە لە مرۆڤەوە دەردەچێت، گەر فرۆشتن و پێدان و هاوشێوەکانی ئەو دوانە پەیوەستکرابن لەسەر مەرج ئەوا پووچ دەبنەوە، پێویستە گەر تەڵاق پەیوەستکراوبێت لەسەر مەرج لەپێشتر بێت بە پووچبوونەوە، چونکە خراپترین حەڵاڵە بۆ لای خودا، هەروەها لەبەرئەوەی هەمیشە ڕووە خراپەکانی زۆرترە لە ڕووە چاکەکانی پەیوەست بە دوو هاوسەرەکە و منداڵەکان و کەسانی تر جگە لە ئەوان.

٣-فەقیهانی ئیسلام کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی سوێندخواردن بە جگە لە خودا و سیفەتی خودا پووچ و بێبنەمایە، بینا لەسەر ئەوە سوێندخواردن بە تەڵاق پووچە، ئەوەش لەسەر پووچ بینادەکرێت دیسان پووچە، بۆیە گەر سوێنخۆر بە تەڵاق سوێندەکەی کەوت تەڵاقەکەی ناکەوێت.

[1] مجموع فتأوى شيخ الاسلام احمد بن تيمية ٣٣/٢١٨-٢١٩.

٤–پێویستە شەریعەت لە سەرچاوەکەی خۆی وەربگیرێت نەك لە ئیجتیهادی فەقیهانی ئیسلامەوە، گەر بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەی شەریعەتی ئیسلام تەڵاقی پەیوەیستکراو یان سوێندخواردن بە تەڵاق نە لە قورئان و نە لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) و نە لە فتوا و قەزاوەتی هاوەڵاندا نابینرێتەوە.

٥–پەیوەستکردن لە تەڵاق و سوێندخواردن پێی لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا داهات، کاتێك بەرپرسان لە خەلافەتی ئەمەوی ئەوانەی بەرهەڵستیان دەکردن لە خەلافەت و سیاسەتدا بە سەرخەرانی عەلەوییەکان تۆمەتبار دەکرد، هەرکات کەسێك بەم تۆمەتە دەگیرا سزایەکی نەرێنی بوونی نەبوو بە بەندکردن یان بە دیلکردنی ئازادییەکەی بۆیە پەنایان دەبرد بۆ سوێند بە قورئان لەسەر ئەوەی ناپاکیان لێ نەکەن و نەبنە سەرخەرانی ململانێکارانی ئەوان، پاشان پێچەوانەی ئەوە دەردەکەوت، بۆیە پەنایان برد بۆ بەکارهێنانی رێگەیەکی تر ئەوەش بریتی بوو لە پەیوەستکردنی تەڵاق یان سوێندخواردن پێی، کەسی تۆمەتبار دەیوت: گەر هاوکاری بەرهەڵستکارانی ئێوە بکەم تەڵاقی ژنەکەم کەوتبێت، یان دەیوت: بە تەڵاقم ناپاکیتان لێ ناکەم و نابمە سەرخەرانی ئەوانەی بەرهەڵستیتان دەکەن، کاتێك درۆی کەسی تۆمەتبار دەردەکەوت حوکمیان بە کەوتنی تەڵاقەکەی و رێگەنەدان بە بەردەوامی هاوسەریی نێوان ئەو و ژنەکەی دەردەکرد، پاشان ئەم رێگەیە بووە جێگەی مشتومڕ و جیاوازی نێوان فەقیهان، هەیانبوو دەیوت تەڵاقی پەیوەستکراو و سوێندخواردن پێی پووچە، لەبەر نەهاتنی ئەم جۆرە تەڵاقە لە قورئان و فەرموودە یان فتوا و قەزاوەتی هاوەڵاندا، هەیانبوو دەیوت کار بەو توانە دەکرێت و گەر مەرجی لەسەرپەیوەستکراو و کەوتنی سوێندەکە هاتنە دی تەڵاقەکە دەکەوێت، هەر بەو جۆرە بەردەوامبوونی جیاوازییەکە هەتا ئەمڕۆمان لە نێوان پشتیوانی لێکردنی و بەرهەڵستکاری بۆی لە بابەتێکدا هیچ بنچینەیەکی لە شەریعەتی

ئیسلامدا بۆ نییە[1]

**پەیوەستکردنی تەڵاق و سوێنخواردن پێی لە یاسای باری کەسێتیدا:**

**عێراقی:** (تەڵاقی تێنەپەڕێنراو و یان بەمەرجگیراو یان بەکارهێنراو بە گوزارەی سوێند ناکەوێت)(م٣٦)

**ئوردەنی:** (تەڵاقی تێنەپەڕێنراو ناکەوێت گەر مەبەستی پێی هەڵنان بێت بۆ کردنی شتێك یان نەکردنی)(م٨٩)

**سوری:** (تەڵاقی تێنەپەڕێنراو ناکەوێت گەر مەبەستی پێی هاندان بێت بۆ کردنی شتێك یان ڕێگری بێت لێی یان وەك سوێند بەکاربهێنابێت بۆ دڵنیاکردنەوە لە هەواڵێك نەك شتێکی تر)(م٩٠)

**مەغریبی:** (تەڵاقی پەیوەستکراو لەسەر کردنی شتێك یان نەکردنی ناکەوێت)(الفصل–٥٢)

**تونسی:** (تەڵاق تەنها لای مەحکەمە دەکەوێت و بە داوای یەکێك لە دوو هاوسەرەکە)(الفصل٣–٣١)

لەم دەقانەوە لەوە تێدەگەین یاسادانەری عێراقی رای جەعفەرییەکان و زاهیرییەکان و ئەوانەی ڕێچکەی ئەوانیان گرتووەتە بەر وەرگرتووە، و یاساکانی تر رای ئیبن تەیمییەیان وەرگرتووە لە حوکمی پەیوەستکردن و سوێنخواردن بە تەڵاق، یاسای تونسی هەرچەند راشکاوانە ئەم حوکمەی رانەگەیاندووە، بەڵام دوای بەرجگرتنی دوو مەرجی رووالەتی بۆ تەڵاق ئەوەی لێ دەخوێنینەوە، ئەو دوو مەرجەش:

بەرزکردنەوەی داوا لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە و خستنی تەڵاقەکە لەبەردەم دادگادا.

---

[1] یُنظر الإسلام قبل المذاهب عقیدة وشریعة، لجماعة من نوابغ العلماء، مطبعة الأمّام ١٣ شارع محمد کریم بالقلعة بالقاهرة. ص ١١١ وما بعدها.

# بەشی سێیەم:
# تەڵاقدەر

پێشتر بەشی دووەم لە دەروازەی چوارەم حوکمەکانی پایەی یەکەم لە پایەکانی تەڵاقی باس لێوەکرد، کە بریتییە لە گوزارەی دارِشتن، ئەم بەشە باسی پایەی دووەم دەکات(تەڵاقدەر) لە حوکمەکان.

فەقیهان کۆدەنگیان هەیە لەسەر دروستی تەڵاق لە کەسێکی باڵغی ژیری خاوەن هەڵبژاردەوە، و لەسەر نادروستی تەڵاق لە شێت و ئەوانەی لە حوکمی شێتدان گەر تەڵاقەکە لە کاتی شێتبوونیدا بوو.

لەسەر تەڵاقی زۆرلێکراو و سەرخۆش و توورە و شۆخیکەر و گێل و هەڵەکەر و منداڵێك جیاناکاتەوە و سەرپەرشتیار و نەخۆش و سەرپەرشتیکراو جیاوازیان هەیە.

سەرچاوەی جیاوازییەکە لە زۆرلێکراو و سەرخۆش و توورە و شۆخیکەر و هەڵەکەردا بریتییە لە جیاوازی لە بەهەندوەرگرتنی مەبەست ئایا رەگەزێکە لە رەگەزەکانی دروستی تەڵاق یا تەڵاقدەرەکە بە دارِشتنی گوزارەیەکی راشکاو یان بە ناراشکاو هێنابێتی؟ هەرکەس بە رەگەزێکی تەڵاقی ببینێت دەڵێت تەڵاقەکە ناکەوێت، چونکە خاوەن شەرع چوار ئاست بە هەند وەردەگرێت:

**یەکەم:** مەبەستی حوکمەکە بێت و گوزارشتی لێ نەکات.

**دووەم:** نە مەبەستی گوزارشتەکە بێت نە مەبەستی حوکمەکە.

**سێیەم:** مەبەستی گوزارشتەکە بێت نەك حوکمەکەی.

**چوارەم:** مەبەستی گوزارشت و حوکمەکە بێت پێکەوە.

هەریەك لە یەکەم و دووەم ژاوەژاوە، سێیەم جیاوازی لەسەر هەیە، و چوارەم رێکەوتنی لەسەر هەیە، بینا لەسەر ئەمە قسەی زۆرلێکراو و سەرخۆش و هاوشێوەکانیان ژاوەژاوە، بەڵام گێل و منداڵی جیاکەرەوە جێناکۆك لە تەڵاقیاندا بریتییە لە رادەی لێوەشاوەیی پێویست بۆ ئەو هەڵسوکەوتە، بەڵام نەخۆش تەڵاقەکەی دروستە گەر لەباری وڕێنەدا نەبێت، جیاوازییەکە لە میراتگرتنی تەڵاقدراوەکەیدایە، سەرچاوەکەی بریتییە لە بەرهەڵستی لە نێوان رادەی کاریگەری خراپی مەبەستی هەڵهاتن لە هاوسەری(الزواج الفار) لەگەڵ سڕینەوەی هۆی میراتگرتنەکە.

دیدگای فەقیهان لەوەی تیایدا جیاوازن لە دە باسدا دەخەینە روو:

# باسی یەکەم:
# تەڵاقی زۆرلێکراو

زۆرلێکردن: بریتییە لە هەڵنانی کەسێك بۆ ئەنجامدانی شتێك پێی رازی نییە، و نایەوێت ئەنجامی بدات گەر سەرپشك بکرێت لەگەڵ خۆی، بۆیە کەسەکە لە رازیبوون و هەڵبژاردن بێبەشە لەلای ئەوانەی-وەك جمهوور- ئەو دوانە(رازیبوون و هەڵبژاردن) بە یەك شت دەبینن، بە نەبوونی رازیبوون نەك هەڵبژاردن لەلای حەنەفییەکان و ئەوانەی رێچکەی ئەوانیان گرتۆتە بەر-وەك ئیبازییەکان- لەسەر ئەو بنچینەی بە هەڵبژاردنی خۆی[1] کارەکەی لێ دەوەشێتەوە بە هەڵبژاردنی لای سووکتر بەسەر لای گرانتردا.

## مەرجەکانی زۆرلێکردن:

ئەو زۆرلێکردنەی دەبێتە بەرهەڵستکارێك لە بەرهەڵستکارەکانی لێوەشاوەیی و کارتێکەر بۆ سەر دروستی هەڵسوکەوتەکان فەراهەمبوونی ئەم مەرجانەی تێدا بە مەرج دەگیرێت:

١-زۆرلێکەر بتوانێت ئەوەی هەرەشەی پێ دەکات جێبەجێی بکات بە سەرپەرشتیاری یان زاڵبوون یان توندی هێرش، و کەسی زۆرلێکرلو ئەوە بزانێت.

٢-هەرەشەپێکراو زیانێکی دارایی یان دەروونی یان ئەدەبی بێت.

٣-کەسی زۆرلێکراو دەستەوسان بێت لە لادانی زۆرەکە بە هەڵهاتن یان بە بەرگری کردن یان کۆمەك وەرگرتن لە کەسانی تر.

---

[1] شرح طلعت الشمس على الالفية للاباضية ٢/ ٢٧١

٤-بەسەر گومانیدا زاڵ ببێت گەر نەیەوێت ئەوەی زۆری لێکراوە لەسەری ئەنجامی بدات شتێکی بەسەر بێت.

٥-بە سزایەکی خێرا و دەمودەست هەڕەشەی لێکرابێت.

٦-شتێك لە زۆرلێکراوەوە دەرنەکەوتبێت بەڵگە بێت لەسەر رازیبوونی، بەڵکو ئەوە ئەنجام دەدات کە زۆرلێکراوە لەژێر کاریگەری ترس و هەڕەشەدا.

٧-ئەوەی هەڕەشەی پێکراوە شتێك بێت مرۆڤ خۆی لێ لابدات، ئەوەی داوای لێکراوە ئەنجامی بدات وەك خۆ لادان لەو هەڕەشەپێکراوە وەك ترساندنی بە کوشتن، و بڕینی ئەندامێکی، و لێدانی توند و بەندکردنی دووروودرێژ و تیابردنی ماڵ بۆ کەسێك ئەو تیابردنە کار بکاتە سەری، و سوکایەتی بە کەسایەتی و دوورخستنەوەی لە وڵات.

٨-زۆرلێکردنەکە ناحەق بێت، گەر پیاوەکە پشتیکردبووە ژنەکەی و چوار مانگ بەسەر ئەو پشتێکردنەدا تێپەڕی بوو، قازی ناچاری دەکات بۆ چوونە لای ژنەکەی یان تەڵاقدانی، تەڵاق لەژێر ئەم زۆرلێکردنەدا دەکەوێت چونکە رەوایە.

## حوکمی تەڵاقی زۆرلێکراو:

فەقیهان لە حوکمی تەڵاقی زۆرلێکراودا بۆ دوو دەستە دابەش بوون: حەنەفییەکان و جمهوور، بۆ رۆشنکردنەوەی زیاتر لقێك تایبەت دەکەین بە دیدگای هەر دەستەیەك:

## لقی یەکەم:
## رای حەنەفییەکان لەسەر تەلاقی زۆرلێکراو

**زۆرلێکردن لای حەنەفییەکان:** یان تەواوە: ئەوەش بریتییە لە هەڕەشە بە کوشتن و هاوشێوەکانی کە هەڵبژاردن تێکدەدات و رازیبوون ناهێڵێت.

یان ناتەواوە: ئەو هەڕەشەیە رازیبوون ناهێڵێت بەڵام هەڵبژاردن تێکنادات.

لە دیدگای ئەوانەوە هەردوو جۆرەکە کارناکەنە سەر دروستی تەلاق، چونکە ئەوەی زۆرلێکردنەکەی بەسەردا دەکەوێت یان لە کاروبارە بەرهەستەکانە (هەڵسوکەوتە کردارییەکان) وەك زۆرلێکردن لەسەر کوشتن و دزی و خواردنەوەی ئارەق.. یان لە کاروبارە شەرعییەکانە(هەڵسوکەوتە گوفتارییەکان) وەك زۆرلێکردن لەسەر فرۆشتن و تەلاق و هاوسەرگیری..لەوبارەدا:

أ- گەر هەڵسوکەوتی زۆرلەسەرکراو ئەگەری هەڵوەشانەوەی بۆ هەبوو و رازیبوونی تێدا بە مەرج دەگیرا وەك کڕین و فرۆشتن و بەکرێگرتن و شتانی تر ئەوە تێکچووە(فاسد)، مانای موڵك دەگەیەنێت گەر رادەستکردنی پێوە پەیوەست بوو، ئەگەر نە، نەخێر، لای "زفر" وەستاوە لەسەر مۆڵەتی زۆرلێکراوەکە لەدوای سڕانەوەی زۆرلێکردنەکە.

ب- گەر هەڵسوکەوتەکە هەڵوەشانەوە هەڵنەگرێت وەك تەلاق و ئازادکردن... لەلایان هەڵسوکەوتەکە جێبەجێ دەکرێت.

دەڵێن: تەلاق گەر پێش چوونە لای ژنەکە بێت نیوەی مارەیی ناوهێنراوی بۆ پێویست دەبێت، خەرجیش بۆ مارەیی ناونەهێنرلو لەسەر کەسی زۆرلێکەر، چونکە ئەو کارە بەهۆی زۆرلێکردنەکەی ئەوەوە پێویست بووە، گەر لە دوای چوونە لا بوو

لەسەر مێردەکە مارەییەکە پێویستە سەرەڕای زۆرلێکردنەکەی، چونکە قازانجی خۆشی وەرگرتنی لە ژنەکە بینیوە[1].

پوختەی قسان زۆرلێکردن لەلایان هیچ جۆرە کاریگەرییەکی لەسەر دروستی تەڵاق و کەوتنی تەڵاق نییە، "الكاساني" دەڵێت: پیاوەکە هەڵبژاردەی بۆ هەبێت لەلای هاوەڵانی ئێمە بە مەرج نەگیراوە–تەنها لەلای شافیعی بە مەرج گیراوە– تا تەڵاقی زۆرلێکراو لەلامان بکەوێت)[2]، "السرخسي" دەڵێت: (خولع و تەڵاقی کەسی زۆرلێکراو لەلای ئێمە رێگەپێدراوە، لەلای شافیعی پووچە، کاریگەری زۆرلێکردن لەلای ئەو لە سڕینەوەی گوزارەی زۆرلێکراودا وەك زۆرلێکردنی منداڵ و شێت وایە، لەلای ئێمە کاریگەری زۆرلێکردن لە تیابردنی رازیبوون بەفیڕۆدانی قسەیە[3]، "الشعبي، والنخعي، والثوري" هەمان رای حەنەفییان هەیە.

بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەر کەوتنی تەڵاقی زۆرلێکراو بە چەندین بەڵگە گرنگترینیان:

١–گشتاندن و رەهاکردنی ئایەتەکانی حوکمەکانی تەڵاق، بەجۆرێك جیاوازیان نەکردووە لە نێوان تەڵاقی زۆرلێکرلو و تەڵاقی زۆرلێنەکراودا.

٢–کەسی زۆرلێکرلو مەبەستی کەوتنی تەڵاقی ژنەکەی بووە لەباری لێوەشاوەیدا، چونکە هەردوو شەڕەکەی ناسیوە و ئاسانەکەیانی هەڵبژاردووە، هەڵبژاردنی ئاسانترین شەڕ نیشانەی رازیبوون و هەڵبژاردنیەتی.

٣–پێوانەی تەڵاقی زۆرلێکرلو بۆ سەر تەڵاقی شۆخیکەر کە بە فەرموودەی: (سیان سووربوونیان سووربوونە و شۆخیکردنیان سووربوونە: تەڵاق و هاوسەری و

---

[1] علاء الدين السمر قندي، تحفة الفقهاء تحقيق وتعليق الدكتور محمد زكي عبد الله ط/١/ ١٣٩٧هـ ـ١٩٥٩م مطبعة جامعة دمشق.٣/٤٥٩ـ٤٦٥.

[2] بدائع الصنائع للكاساني ٤/١٧٩٢.

[3] المبسوط للسرخسي ٦/ ١٧٦.

گێڕانەوە(رجعة))[1]، کۆکەرەوەی نێوانیان ئەوەیە زۆرلێکراو و شۆخیکەر مەبەستی گوزارەکەیە نەك کاریگەرییەکەی کە بریتییە لە کەوتنی تەڵاق.

٤-ئەوەش "الغار بن جبلة" لە "صفوان بن عمرو الطائي"ەوە ریوایەتی کردووە: ژنێك رقی لە مێردەکەی بوو، بینی خەوی لێکەوتووە، ئەویش تیغێکی(خەنجەرێك، چەقۆیەك) نا سەر سینەی، پێی وت: تەڵاقم بدە یان سەرت دەپەڕێنم، زۆر تکای لێکرد بەڵام ژنەکە رازی نەبوو، ئەویش تەڵاقیدا، پاشان هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری ئەوەی لێکرد، ئەویش فەرمووی: ((قەیلولە لە تەڵاقدا نییە))[2]

**گفتوگۆ لەسەر ئەم بەڵگانە:**

١-**ئایەتەکانی حوکمەکانی تەڵاق با بە رەهاش هاتبن، بەڵام بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) سنووردارکراون**، وەك لە تەڵاقی منداڵ و شێتدا، حەنەفییەکان ئەم سنووردارکردنە رەدناکەنەوە تایبەت بەو دوانە، نازانم بۆچی تایبەت بە زۆرلێکراو پشتگوێیان خستووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((لەسەر ئومەتەکەم -سێ شت- هەڵگیراوە: هەڵە و لەبیرچوون و ئەوەی زۆریان لێ دەکرێت لەسەری))[3]، پاشان ئەوان لەسەر نادروستی فرۆشتنی زۆرلێکراون لەگەڵ گشتاندنی ئایەتی:﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾.

٢-**وتنی هەڵبژاردنی زۆرلێکراو لەبەر ئەوەی ئاسانترین شەڕی هەڵبژاردووە قسەیەکی ورد نییە**، چونکە هەڵبژاردنی دروست بوونی نییە لەگەڵ زۆرلێکردندا، حەنەفییەکان دان دەنێن بە تێکچوونی هەڵبژاردنەکەدا، پاشان ئەوان لەگەڵ

---

[1] رواه الترمذي وأبو دأود عن أبي هريرة أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال ثلاث جدهن جد وهزلهن جد النكاح والطلاق والرجعة وقال الترمذي هذا حديث حسن غريب

[2] شرح فتح القدير٣/٣٩.

[3] رواه ابن ماجه والبيهقي عن ابن عباس أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال أن الله تجأوز عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه .

جمهووردا هاوڕان لە تیابردنی رازیبوون و لەوەدا کە زۆرلێکراو رازی نییە بە تەڵاقدانی ژنەکەی، و هەڵبژاردنی ئاسانترین دوو شەڕ بە کاریگەری کارتێکەرێکی دەرەکییەوە بووە چونکە کامڵ نییە، بۆیە بە کافر دانانرێت گەر ناچارکرا بە گوزارشت لە گوزارەی کوفر.

**٣-پێوانەی زۆرلێکراو بۆ سەر شۆخیکەر نادروستە لە دوو رووەوە:**

أ. "بۆسەرپێوانەکراو" جێگەی ناکۆکییە، بۆیە پێوانە بۆ سەری دروست نییە، پاشان ئەو کەسەی دەڵێت تەڵاقی شۆخیکەر دەکەوێت شانی لەسەر دەستبردن بۆ هۆی حوکمەکە داداوە بە هەڵبژاردەی خۆی، کەسی زۆرلێکراو هەڵبژاردنی بۆ نییە، بۆیە پێوانە ناکرێتە سەری.

ب-پێوانەیە لەگەڵ جیاوازی، چونکە شۆخیکەر لە ئەوپەڕی ویستی خۆی و ئازادی هەڵبژاردنیەوە قسە دەکات، شۆخییەکە تایبەتە بە ئەسەرەکەی، بەڵام کەسی ناچارکراو نە مەبەستی گوزارەکەیە نە مەبەستی ئەسەرەکەیەتی.

**٤-فەرموودەی: (قەیلولە لە تەڵاقدا نییە) لە چەند روویەکەوە عیللەتدارە:**

أ.لاوازی سەفوانی کوڕی عەمر.

ب. شلگیری "الغار بن جبلة"

ج.تەدلیسی راوییەکانی تر.

نموونەی ئەو فەرموودەیە بەڵگەی پێ ناهێنرێتەوە[1]

ئیبن حەزم دەڵێت: (ریوایەتەکەی سەفوان لە ئەوپەڕی بێبنەمایدایە، سەفوان خۆی فەرموودە نەناسە)[2]

لە باری دروستی فەرموودەکەدا هەڵدەدرێتە سەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هەستی بە رادەی رقی ژنەکە کردووە بەرانبەر مێردەکەی تا هەوڵیداوە سەرببڕێت، بۆیە بۆی

---

[1] زاد المعاد ٤/٤٠.

[2] المحلى لابن حزم الظاهري ١٠/٢٠٣.

دەرکەوتووە هاوسەری نێوانیان ئەستەمە[1]

لە راستیدا ئەو بنچینەی حەنەفییەکان کەوتنی تەڵاقی زۆرلێکراوی لەسەر بنیادەکەن بریتییە لە جیاکردنەوەی رازیبوون و هەڵبژاردن پێچەوانەی جمهووری فەقیهان کاتێ دەڵێن: هەڵبژاردن بریتییە لە مەبەستی گوزارە یان ئەوەی لە جێگەی ئەوە راست دەبێتەوە لە ئاماژە و نووسین، لەو سۆنگەیەوە هۆیەکی ئاساییە بۆ سەرپێهەڵدانی گرێبەستەکان، و هۆکارێکی شەرعییە بۆ دامێنانیان یەکسانە ئارەزوو بۆ سەرهەڵدانی گرێبەستەکە بوونی هەبێت یان نەء تا هەڵبژاردن بوونی هەبێت لە نێوان پارسەنگانی ئەنجامدانی شتێك بەسەر وازلێهێنانیدا، لەگەڵ ئەوەش هەڵبژاردنەکە تێکچووە گەر مەیل و ئارەزوو هاوەڵی نەکات، بەوەی پاڵنەری شەڕێکی ترسناکتر بێت و هەڵبژاردنی سووکترین زیان بێت.

رازیبوونیش بریتییە لە ئاسوودەیی دەروون و کرانەوەی لە کارێکدا ئارەزووی لێبەتی (بەوەی ئارەزوو بکات ئاساری شەرعی لەسەر هەڵسوکەوتەکە سەرهەڵبدات) لە روانگەی ئەم پێناسەیەوە دەکرێ هەڵبژاردن بوونی هەبێت بەبێ ئەوەی رازیبوون هاتبێتە دی.

بینا لەسەر ئەوە وتویانە: زۆرلێکراو لەسەر تەڵاق مەبەستی گوزارەی تەڵاقەکە بووە و هەڵبژاردنی لەو سۆنگەیەوە کە سووکترینی دوو شەڕەکەیە، بەوەش هەڵبژاردن لە جێگەی رازیبوون راستبووەتەوە، بەڵام جمهووری فەقیهان پێیانوایە رازیبوون بریتییە لە هەڵبژاردن، واتە مەبەستی گرێبەستکارەکە بۆ سەرهەڵدانی گرێبەستەکە وەك داخوازییەك بۆ ئاسارەکەی، بۆیە رازیبوون و هەڵبژاردن بە یەك مانا دێن و هەردووکیان گوزارشت دەکەن لە ویست و ئارەزوو بۆ سەرهەڵدانی گرێبەستەکە، بینا لەسەر ئەوە دروستی هەڵسوکەوت لەلایان وێنا ناکرێت بەبێ هاتنە دی هەڵبژاردن کە چاوگەی(خودی) رازیبوونە[2]

---

[1] احكام الاسرة في الاسلام للاستاذ محمد سلام مدكور ٢/٦٤ .

[2] الفقه الاسلامي للاستاذ محمد سلام مدكور ص ٤٠٤ ـ ص٤٠٦.

# لقی دووەم:
# رای جمهووری فەقیهان
# لە تەڵاقی زۆرلێکراودا

جمهوور(مالیکیەکان ، و شافیعیەکان ، و حەنبەلیەکان ، و جەعفەریەکان ، و زەیدیەکان ، و ظاهریەکان ، و ئیباضیەکان) هاوڕان: لەسەر ئەوەی تەڵاقی زۆرلێکراو ناکەوێت گەر مەرجە باسکراوەکانی زۆرلێکردن لە لقی پێشتردا بوونیان هەبێت، چونکە زۆرلێکردن لەو بەرهەڵستکاریانەیە ویست تێکدەدات، زۆرلێکراو کارێك ئەنجام دەدات کە نایەوێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هەندێ لە " مالیکیەکان و شافیعیەکان و حەنبەلیەکان و زەیدیەکان "ەکان مەرجێکی تریان خستۆتە سەر ئەو مەرجانەی پێشوو کە بریتییە لە تەوریە[1]، پاشان ئەوان لەسەر پێوەرێکی هاوبەش بۆ زانینی جێگیرکردنی زۆرلێکردن و رادەکەی رێکنەکەوتوون، هەیانە توندکردنەوەی هەیە لە پێوەرەکەدا، هەشیانە دەڵێت: زۆرلێکردن بە کەمترین زیانی مادی و مەعنەوی دێتەدی.

**مالیکییەکان:**

دەڵێن: لە فتوا و قەزادا تەڵاقی زۆرلێکراو ناکەوێت گەر لە تەڵاقەکەیدا لە ناوەوە پچڕانی هاوسەرگیری مەبەست نەبووبێت، و زۆرلێکردنەکە بە حەق نەبووبێت، پێچەوانەی "المغیرة" کە پێیوایە تەڵاقی پێ پێویست نابێت با زۆرلێکردنەکەش شەرعی بێت، بەڵگەیان هێناوەتەوە بە نەکەوتنی تەڵاقی زۆرلێکراو بە چەندین بەڵگە لەوانە:

---

[1] التوریة: ئەوەسە قسەکەر گوزارەیەك(وشەیەك) بهێنێت تارۆشنی تێدا بێت لەبەر گوێی گوێگردا دوو مانای هەبێت: دوور و نزیك، وەك–بۆ نموونە– بڵێت ئەو ژنە ئازادکراوە، مەبەستی ئەوە بێت لە کۆت و بەند ئازادکراوە نەك بە تەڵاقدان.

١-فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((تەڵاق لە داخستندا نییە))[1]، هەروەها ئایەتی: ((خودا لەسەر ئومەتەکەم هەڵە و لەبیرچوون و زۆر لەسەر کردنی هەڵگرتووە))[2].

٢-پێوانەی زۆرلێکراو بۆ سەر شێت لە ئاراستەنەکردنی مەبەستی بۆ هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیرییەکەی لە کاتی سەرهەڵدانی گوزارەی تەڵاقدا و نەبوونی هەڵبژاردنی.

لە "الشرح الکبیر"دا[3]هاتووە: (هەر کەس لەسەر خستنی تەڵاق زۆری لێکرا شتێکی بۆ پێویست نابێت لە فتوا و قەزادا بەهۆی فەرموودەکەی "مسلم"ەوە (تەڵاق لە داخستندا نییە) بەڵکو گەر لەسەر یەك تەڵاق زۆرلێکرا و زیاتر لە یەك تەڵاقی خوارد هیچ شتێکی لەسەر نییە، چونکە کەسی زۆرلێکراو خاوەنی خودی خۆی نییە، وەك شێت، واتە لە ناوەوە مەبەستی نەبووە لە تەڵاقەکەیدا گرێی هاوسەرگیرییەکەی بپسێنێت، ئەگینا تەڵاقەکە بەسەریدا دەکەوێت)

لە "الخرشي"دا: (ئەوەی وتویەتی زۆرلێکراو تەڵاقەکەی دروست نییە و پێیەوە پەیوەست نابێت شتێکی بەمەرجگیراوی تێدایە بەوەی سوێندخۆر تەوریەی واز لێنەهێنابێت لەگەڵ ئاگاهی پێی)[4].

بەڵام لە هەندێ سەرچاوەوە وا دەردەکەوێت مالیکییەکان هاوڕانین لەسەر پێویستی فەراهەمبوونی مەرجی تەوریە، لە "الشرح الصغیر"دا هاتووە: (کەسی زۆرلێکراو هیچ شتێك لە فتوا و قەزای پێوە پەیوەست نابێت، لەبەر فەرموودەکەی

---

[1] سنن ابي دأود مع حاشية عون المعبود ٢/٢٢٥.

[2] رواه ابن ماجة (٢٠٤٥) ورواه ابن حبان (١٤٩٨).

[3] ٢/٣٦٧

[4] شرح الخرشي ٤/٣٤ وما بعدها.

پێغەمبەر(ﷺ): ((تەڵاق لە داخستندا نییە)) واتە زۆرلێکردن یا تەوریەشی وازلێهێنا بێت))[1]

**شافیعییەکان:**

دەڵێن: تەڵاقی کەسی زۆرلێکراو ناکەوێت وەك چۆن موسڵمانبوونەکەی بەزۆر دروست نییە، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((لەسەر ئومەتەکەم هەڵە و لەبیرچوون و لەسەر زۆرلێکردن هەڵگیراوە))... هەروەها بەو فەرموودەی: ((تەڵاق لە داخستندا نییە)) چونکە قسەیەکە گەر بە هەڵبـژاردنی خۆی بێت ژنەکەی تەڵاقی دەکەوێت، گەر بە ناحەق زۆرلێبکرێت پووچ و بێبنەمایە وەك پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام، جیاوازی نییە لە نێوان زۆرلێکردنی بەرهەست و زۆرلێکردنی شەرعیدا: گەر سوێند بخوات ئەو شەوە دەچێتە لای ژنەکەی و بینی لە حەیزدایە، یان سوێند بخوات مافەکەی زەید دەگێڕێتەوە لەو مانگەدا و دەستەوسان بوو لێی و نەیتوانی بیگێڕێتەوە تەڵاقەکەی ناکەوێت.

پێوەری زۆرلێکردن لە ئیدگایانەوە بە گۆڕینی کەس و رەوشی کەسەکان دەگۆڕێت، لەوانەیە شتێك بۆ کەسێك زۆرلێکردن بێت بەڵام بۆ کەسێکی تر بەو جۆرە نەبێت هەر بەو جۆرە لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر[2]

وازهێنان لە تەوریە لەگەڵ ئاگاهی پێی لە رووالەتەکانی هەڵبژاردنە بۆیە تەڵاقەی دەکەوێت.

لە "الوجیز"دا هاتووە: (تەڵاقی زۆرلێکرلو ناکەوێت مەگەر بە بەڵگەی دەرکەوتنی هەڵبژاردن بۆی، وەك ئەوەی زۆرلێکردنەکەی لەسەر یەك تەڵاق بووبێت ئەو سیانی خستبێت یان تەوریەی وازلێهێنا بێت لەگەڵ ئاگاهی پێی)[3].

---

[1] الشرح الصغير للدردير مع حاشية الصأوي ٤١٨/١.

[2] المهذب لابي اسحاق الشيرازي ١٥٠/٢.

[3] الوجيز للغزالي ٥٧/٢.

فەقیهان لە هەندێ سەرچاوەدا لەسەر مەرجی تەوریە هاوڕانین، لە "الأنوار"دا هاتووە: (مەرجی سێیەم: ئەوەیە هەڵبژاردنی بۆ هەبێت ناکەوێت، بۆیە تەڵاقی زۆرلێکراو بە ناحەق ناکەوێت با توانای تەوریەشی هەبێت)[1].

**حەنبەلییەکان:**

دەڵێن: تەڵاقی زۆرلێکراو ناکەوێت گەر مەرجەکانی هاتنە دی، بەڵام پێویستە بە دڵ(بە نیەت) مەبەستی ژنەکەی خۆی نەبێت، پێوانەکردنی زۆرلێکردن لەلایان توندترە لە هەموو مەزهەبەکان، چونکە جنێو و داشۆردن و بردنی ماڵێکی کەم بە زۆرلێکردن دانانرێت، پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و ئابووری کەسی زۆرلێکەر هەرچییەك بێت، بە پێچەوانەی لێدانەوە کە لە هۆکارەکانی زۆرلێکردنە، با کەمیش بێت، لە "الإقناع"دا هاتووە: (لێدانی کەم تەنها بۆ کەسی خاوەن جوامێری و پیاوەتی زۆرلێکردنە، جنێو و داشۆردن و بردنی ماڵێکی کەم زۆرلێکردن نییە)[2].

ئەوانەی تەوریە بە مەرج دەگرن مالیکییەکان و شافیعییەکانن، ئیسان لە "الإقناع"دا هاتووە: (پێویستە ئەو کەسەی لەسەر تەڵاق زۆری لێدەکرێت و تەڵاق دەدات تەئویلی بکات و بە دڵ مەبەستی ژنێکی تر بێت جگە لە ژنەکەی خۆی).

لە "المغني"دا (ریوایەتی جیاواز لە ئەحمەدەوە سەریهەڵداوە لەوەدا کە تەڵاقی زۆرلێکراو ناکەوێت[3]، ئەوان لەوەدا خۆیان پاڵپشت دەکەن بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) لەوانە: ((خودا لەسەر ئومەتەکەم هەڵە و لەبیرچوون و زۆرلێکردنی هەڵگرتووە)) هەروەها: ((تەڵاق لە داخستندا نییە))

---

[1] الانوار لأعمال الأبرار، المرجع السابق، ٢/١٧٦.

[2] الاقناع ٣/٤ وما بعدها. لكن يشترط صاحب المغني (١٢٠/٧): أن يكون الضرب شديدا والقيد والحبس طويلين.

[3] المغني لابن قدامة ١١٨/٧.

**جەعفەرییەکان:**

فەقیهانی جەعفەری هاوڕان لەسەر نەکەوتنی تەلاقی زۆرلێکراو گەر مەرجەکانی هاتنە دی، لە "شرائع الإسلام"دا هاتووە: (مەرجی سێیەم– هەڵبژاردنە: بۆیە تەلاقی زۆرلێکراو ناکەوێت، و زۆرلێکردن نایەتەدی گەر سێ حاڵ تەواو نەکات: (یەکەم) کەسی زۆرلێکەر بتوانێت هەڕەشەکەی بسەپێنێت، (دووەم) گومانی زاڵ بۆ ئەوە بچێت هەڕەشەکەی جێبەجێ بکات گەر زۆرلێکراو کارەکە ئەنجام نەدات، هەروەها(سێیەم) ئەوەی هەڕەشەی پێ دەکات زیان بە زۆرلێکراو بگەیەنێت لە خودی خۆیدا یان لەو کەسانەی وەك ئەون وەك باوك و کوڕ، یەکسانە ئەو زیانە کوشتن بێت یان بریندار کردن یان جنێو یان لێدان، بەپێی زۆرلێکراوان و رادەی شاندانە ژێر سوکایەتییەکە دەگۆڕێت)[1].

**زەیدییەکان:**

دەڵێن: تەلاقی زۆرلێکراو ناکەوێت بەهۆی فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ): ((ئەوەی لەسەری زۆریان لێ دەکرێت)) و هاوشێوەکانی، بەلام ئەوە بە مەرج دەگرن کەسەکە نیەتی تەلاقی نەبێت، چونکە لە نیەتدا هەڵبژاردنی بۆ هەیە، ئەوانیش وەك حەنەفییەکان زۆرلێکردنیان دابەشکردووە بۆ تەواو و ناتەواو و دەڵێن لەهەردوو بارەکەدا تەلاقی زۆرلێکراو ناکەوێت بەهۆی ئایەتی: ﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ەوە.

واتە حوکم بۆ کاری زۆرلێکراو نییە مەگەر بەڵگەیەك تایبەتی بکات بەهۆی فەرموودەی: ((تەلاق لە داخستندا نییە))[2].

---

[1] شرائع الاسلام للمحقق الحلي، المرجع السابق ٢/٥٣.

[2] التاج المذهب، المرجع السابق ٢/١١٩.

**زاهیرییەکان:**

لە "المحلی"دا هاتووە: (تەلآقی زۆرلێکراو پێویست نییە بەهۆی فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ): ((لەسەر ئومەتەکەم هەڵە و لەبیرچوون و زۆرلێکردن هەڵگیراوە))[1]، واتە حوکمەکەی هەڵگیراوە.

**ئیبازییەکان:**

زانایان ئیبازی لە وتنی نەکەوتنی تەلآقی زۆرلێکرلو جیاوازیان لە نێواندا نییە، لە "جوهر النظام"دا هاتووە[2]:

ومثله المجبور متى طلقا — فالخلف في طلاقه قد اطلقا

والعفو واقع عن الجميع — من الإله الواحد السميع

**حوکمی تەلآقی زۆرلێکراو لە یاساکانی باری کەسێتیدا:**

یاساکانی باری کەسێتی ولآتە ئیسلامییەکان هاوڕان لەسەر نەکەوتنی تەلآقی زۆرلێکراو، بگەڕێرەوە بۆ یاسای: العراقي(م٣٥)، والسوري(م٨٩)، والاردني(م٨٨)، والمغربي(الفصل ـ ٤٩)، والتونسي(الفصل ـ ٣١)...

(١) المحلى لابن حزم الظاهري ٢٠٣/١٠

(٢) جوهر النظام في الفقه الاباضي المرجع السابق ٢٢٠/٢.

# باسی دووەم:
# تەلاقی سەرخۆش

سەرخۆش: ئەو کەسەیە ناتەواوییەك لە ئەقڵیدا سەرهەڵدەدات بەهۆی ئەوەی دەیخواتەوە لە مادە سەرخۆشکەرەکان، بەجۆرێك هۆشی نییە بۆ ئەو ئەنجامانەی لێی دەوەشێتەوە لە هەڵسوکەوتی گوفتاری یان کرداری، وا پێویست بوو سەرخۆش لە باری مەستبوونیدا داوای لێ نەکرابایە، بەلام لەگەڵ ئەوەش رای فەقیهانی موسڵمان لە حوکمی هەڵسوکەوتی سەرخۆش و-لەناویدا تەلاق- جیاوازیان هەیە، ئەوان دوای ئەوەی هاوڕابوون لەسەر نەکەوتنی تەلاق کە لەباری سەرخۆشبوونیدا خستوویەتی گەر مادەی مەستکەری خواردەوە بە رێگەی موباح وەك بەناچاری خواردنەوەی شەراب یان بە زۆرلێکردن یان بە نەزانی یان وەك دەوا، جگە لەمانە جیاوازیان لە نێواندایە بەپێی ئەم درێژەپێدانە:

### حەنەفییەکان:

فەقیهە حەنەفییەکان هاوڕانین لەسەر یەك را لە حوکمی تەلاقی سەرخۆشدا بەڵکو "زفر، والكرخي، والطحاوي، ومحمد بن سلمة" دەڵێن: تەلاقەکەی ناکەوێت مادەی دروستکردنی شەرابەکە هەرچییەك بێت، هەروەها هۆی خواردنەوەکەی هەرچییەك بێت، بەم بەڵگانە:

١-سەرخۆش مەبەستێکی دروستی نییە، کەوتنی تەلاق شان لەسەر مەبەستی دروست دادەدات.

٢-پێوانەکردنی بۆ سەر منداڵ و شێت بە کۆکردنەوەی نەبوونی مەبەست.

٣-بێئاگایی لە خۆی لەسەرو بێئاگایی کەسی خەوتووەوەیە، کەسی خەوتوو کاتێك بەئاگابێتەوە کە بەئاگا دێت، بە پێچەوانەی سەرخۆشەوە، تەلاقی

خەوتوو ناكەوێت بە كۆدەنگی، هەر بەو جۆرە تەڵاقی سەرخۆش.

٤-لاچوونی ئەقڵی بەهۆی گوناهەوە هیچ ئەسەرێكی نییە، ئەگینا پاشگەزبوونەوەی دروست بوو.

**جمهووری حەنەفی لەسەر كەوتنی تەڵاقی سەرخۆشن بەم هۆیانە:**

١-لەبەر ئەو فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ریوایەتكراوە فەرموویەتی: ((هەموو تەڵاقێك رێگەپێدراوە جگە لە تەڵاقی منداڵ و گێل))

٢-هەروەها لەبەر ئەوەی ئەقڵی بەهۆی گوناه و یاخیبوونەوە رۆیشتووە، بۆیە لەباری سەرخۆشیدا بە راستبووەوە دادەنرێت وەك سزا و دەمكوتكردنێك بۆ ئەو كاری یاخیبوونەی.

٣-هەروەها لەبەر ئەوەی گوتاری خودا پەیوەست دەبێت بە كارەكانی سەرخۆشەوە بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿لا تَقْرَبُوا الصَّلاةَ وَأنتُمْ سُكَارَى﴾.

٤-هەروەها لەبەر ئەوەی پێوانەی بۆ سەر خەوتوو پێوانەیە لەگەڵ جیاوازی، چونكە خەو لە كاركردنی دەخات، بۆیە بەهۆی نەمانی كارەوە حوكم دەدرێت بە نەكەوتنی تەڵاقی خەوتوو، پاشان بێئاگایی بەهۆی خەوەوە یاخیبوون نییە[1].

**مالیكییەكان:**

فەقیهانی مالیكیش لە حوكمی تەڵاقی سەرخۆشدا جیاوازیان لە نێواندا هەیە بەپێی ئەو درێژەپێدانەی لە "الخرشي"دا هاتووە كە ئەمە دەقەكەیەتی: (ئایا تەڵاقی سەرخۆش دەكەوێت گەر جیاكردنەوەی لەگەڵ بێت، ئەگەر نە، بە كۆدەنگی تەڵاق پێوە پەیوەست نابێت، ئەمە رێگەی " الباجي وابن رشد"ە، رێگەی "المازري": تەڵاق بەسەریدا دەكەوێت كەسەكە جیابكاتەوە یان نە، لە بەناوبانگترین قسەیدا، رێگەی "ابن بشير": گەر جیاكردنەوەی لەگەڵ بوو بە كۆدەنگی تەڵاقەكەی پێویست

[1] ينظر: المبسوط للسرخسي ١٧٦/٦. شرح فتح القدير ٤٩٠/٣ وما بعدها. بدائع الصنائع للكاساني١٧٩٠/٤. تحفة الفقهاء للسمر قندي ٢٩٣/٢. حاشية ابن عابدين ٢٩٣/٣.

دەبێت، گەر جیاکردنەوەی لەگەڵ نەبوو ئەوا لەسەر بەناوبانگترین تەڵاقەکەی پێویست ناکات)[1].

ئەوەی لە "الشرح الصغير"دا[2]. هاتووە لەگەڵ ئەم رایە بەناوبانگەدا یەکدەگرێتەوە:

لە کۆتاییدا الخرشي دەڵێت: هەر سێ رێگەکە رێگەی "اللخمي": جیاوازییەکە رەهایە، هەروەها رێگەی ئیبن روشد: جیاوازی لەوەدایە هەندێ لە ئەقڵی لاماوەتەوە، رێگەی ئیبن بەشیر: جیاوازی لەوەدایە کە نوقمبووە(واتە ئەو بەشەی ئەقڵی کە رۆیشتووە) نەك ئەوەی جیادەکاتەوە(ئەوەی لە ئەقڵ ماوەتەوە).

**شافیعییەکان:**

جمهووری فەقیهانی شافیعی دەڵێن تەڵاقی سەرخۆش بەرەهایی کەوتووە، یەکسانە جیاکاری چاکەی هەبێت لە خراپە یان نە، بە هەڵواردەی "المزني" لە شافیعییەکان کە دەڵێت ناکەوێت، وەك چۆن دوو قسە دراوەتە پاڵ ئیمامی شافیعی(رەحمەتی خودای لێ بێت) : لە قسە کۆنەکەیدا دەڵێت ناکەوێت، ئیمامی غەزالی(رەحمەتی خودای لێ بێت) هۆی هێناوەتەوە بۆ حوکمی کەوتنی، چونکە دروستییەکەی وەك پەیوەستکردنی ئەحکام وایە بە هۆیەکانەوە[3]، "الشربيني"[4] دەڵێت: (وەك توندکردنەوە لەسەری تەڵاقی دەکەوێت بەهۆی یاخیبوونییەوە) ئەو قسەی دراوەتە پاڵ شافیعی لە "المهذب"دا شیرازی باسی کردووە و دەڵێت: ("المزني" ریوایەتی کردووە لە قسەی کۆنیدا شافیعی فەرموویەتی پشتهەڵکردنی(واتە: الظهار) سەرخۆش دروست نییە هەر بەو جۆرە تەڵاقەکەی، تەڵاق و پشتهەڵکردن یەکێکە، هەندێ لە هاوەڵانمان دەڵێن: دوو قسەی لەسەرە: یەکەمیان

---

[1] شرح الخرشي على مختصر خليل، طبعة بولاق ١٣١٧هـ ، ٣٢/٣.

[2] الشرح الصغير للدردير مع حاشية الصأوي ٤١٨/١.

[3] لرشاد الباري شرح صحيح البخاري للقسطلاني ١٤٦/٨.

[4] مغني المحتاج٢٧٩/٣.

دروست نییە کە بریتییە لە هەڵبژاردەی " المزني وأبي ثور" چونکە ئەقڵی سڕاوەتەوە و وەك خەوتوو و ویست تیاچووی لێهاتووە، "السرخسي" لە "المبسوط"دا[1] باسیکردووە، بۆیە دەڵێت: (خولع و تەڵاقی سەرخۆش لای ئێمە دەکەوێت، لە یەکێك لە دوو قسەی شافیعیدا ناکەوێت).

ئیبن روشد لە "بدایة المجتهد[2]"دا دەڵێت: (لە شافیعییەوە لەم بارەیەوە دوو قسە هەیە، زۆرینەی هاوەڵانی ئەو قسەیان هەڵبژاردووە لەگەڵ جمهوور هاوڕایە، هەروەها "المزني" لە هاوەڵانی شافیعی ئەوەی هەڵبژاردووە کە تەڵاقەکەی ناکەوێت)

"الطوسي" لە "الخلاف"دا[3] باسی کردووە و دەڵێت: (شافیعی لەمەدا دوو قسەی هەیە: "الکاساني" لە " بدائع الصنائع[4]"دا دەڵێت: (لە یەکێك لە دوو قسەی شافیعیدا ناکەوێت)

**حەنبەلییەکان:**

فەقیهە حەنبەلییەکانیش لە حوکمی تەڵاقی سەرخۆشدا لەسەر یەك را کۆنەبوونەتەوە، بەڵکو دوو ریوایەتیان هەیە: یەکەم تەڵاقی کەسی سەرخۆش دەکەوێت ئەوەش مەزهەبەکەیە و هەڵبژاردەی دەستەیەك لە هاوەڵانی ئیمام ئەحمەدە، لەوانە: "ابو بکر الخلال ، و القاضي، والشریف ابو جعفر" و کەسانی تریش.

ریوایەتی دووەم: ناکەوێت، ئەبوبەکری کوڕی عبدالعزیز لە "الشافي و زاد المسافر"دا، و ئیبن عەقیل و هەروەها هەڵبژاردەی "الناظم"ە و ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیمی جەوزی و کەسانی ترە لە هاوەڵانی ئیمام ئەحمەدە، هەروەها "الزرکشي" دەڵێت: بەڵگەی ئەم ریوایەتە -واتە ریوایەتی دووەم- بەهێزترە، "المیموني" دەڵێت:

---

(1) ١٧٦/٦.
(2) ٦٨/٢ .
(3) ٢٤٠/٢.
(4) ١٧٢٩/٤.

پێشتر دەموت دەکەوێت تا بۆم ڕۆشن بوویەوە و ئەوە زاڵ بوو بەسەرمدا ناکەوێت، "الطوفي" لە "شرح الأصول"دا دەڵێت: ئەمە–واتە نەکەوتن– زیاتر لە ڕاستییەوە نزیکە، ئیبن قەیم دەڵێت: (نەکەوتن یەکێکە لە مەزهەبەکان لە یەکێك لە ریوایەتەکان لە ئیمام ئەحمەدەوە، ئەوەش ئەوەیە مەزهەبەکەی لەسەر جێگیربووە و ڕاشکاوانە گەڕانەوە بۆ لای ڕاگەیەنراوە)[1]

**جەعفەرییەکان:**

فەقیهانی جەعفەری لەسەر نەکەوتنی تەڵاقی سەرخۆش هاوڕان، "الطوسي" دەڵێت: (تەڵاقی سەرخۆش لای ئێمە ناکەوێت بەهۆی کۆدەنگی دەستەکەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی بنەڕەت مانەوەی گرێبەستەکەیە و کەوتنی تەڵاق ئاتاجە بە بەڵگە)[2]

لە "شرائع الإسلام"دا[3]: (مەرجی دووەم بریتییە لە ئەقڵ، بۆیە تەڵاقی شێت و سەرخۆش دروست نییە، هەر بەو جۆرە تەڵاقی ئەو کەسەی بە بوورانەوە یان بە دەرمانی خەو ئەقڵی لەدەستداوە لەبەر نەبوونی مەبەست، لە " ایضاح الفوائد[4]"دا: (تەڵاقی شێتی بەردەوام و سەرخۆش دروست نییە)

**زاهیرییەکان:**

فەقیهانی زاهیری لەسەر نەکەوتنی تەڵاقی سەرخۆش هاوڕان، ئیبن حەزمی زاهیری بەرگری لەم ڕایە کردووە بە زۆرێك لە بەڵگە، هەروەها لە کتێبی "المحلى"دا گفتوگۆی لەسەر ئەو بەڵگانە کردووە[5].

---

[1] لمزيد من التفصيل يراجع الانصاف في الفقه الحنبلي ٨/٤٣٣ وما بعدها. مجموع فتأوى ابن تيمية ٣٣/١٠٢. زاد المعاد٤/٤٠.

[2] الخلاف في الفقه للطوسي ٢/٢٤٠.

[3] ٢/٥٣.

[4] لابي طالب محمد بن يوسف ٣/٢١٩.

[5] للاطلاع على تفصيل ذلك يراجع المحلى لابن حزم الظاهري ١٠ /٢٠٨ ـ ٢١١.

**زەیدییەکان:**

دژیەکییەکی ڕۆشن هەیە لە قسەی زەیدییەکاندا کاتێك دەڵێن: ئەو کەسەی بە حەشیشە یان بە ئەفیون یان بە جگە لەو دوانە ئەقڵی لەدەست دەدات تەڵاقەکەی ناکەوێت، بەڵام گەر بە ئارەق سەرخۆش بوو تەڵاقەکەی دەکەوێت با سەرخۆشییەکەشی بە پلەیەك بێت جیاوازی نەکات لە نێوان ئاسمان و زەوی، لە "التاج المذهّب[1]"دا: (ئەو کەسەی ئەقڵی لەدەست دەدات بە حەشیشە و ئەفیون و هاوشێوەکانی ئەو دوانە تەڵاقی ناکەوێت یەکسانە بۆ زەرورەت خواردبێتی یان نە، تەڵاقی ئەو جۆرە کەسانە ناکەوێت، بەڵام سەرخۆش بە ئارەق تەڵاقی دەکەوێت با لەسەر خواردنەوەشی ناچارکرابێت کاتێك لە باری سەرخۆشیدا تەڵاق بدات، یەکسانە جیاکردنەوەی مابێتەوە یان بە تەواوی ئەقڵی ڕۆیشتبێت، بە جۆرێك جیاوازی نەکات لە نێوان ئاسمان و زەویدا)، بەڵام وادیارە ئەوەی تێیدا هاتووە قسەی: "الهادي والمؤيد والمنصور بالله"یە، ئەوەی باسی کرد ڕای هەموو زەیدییەکان نییە، ئەوەی پشتیوانی ئەم قسەیە دەکات قسەکەی خاوەنی کتێبی "البحر الزخار[2]"ە: (گەر سەرخۆشی وای لێ کرد ئاسمان و زەوی لەیەکتر جیانەدەکردەوە، بەڵکو وەك خەوتوو و بووراوە بوو ئەوا بە کۆدەنگی تەڵاقەکەی ناکەوێت، گەر کردی بە کەسێکی چالاکی خۆشمیزاج و شتێك لە ئەقڵی کەم نەبوویەوە بە کۆدەنگی دەکەوێت، گەر لە نێوان ئەو دوو حاڵەتەدا بوو بە جۆرێك هەموو ئەقڵی نەڕۆیشت بوو ئەوا جیاوازی تێدایە).

لەم واڵاکردنەی بۆچوونی فەقیهانەوە حاڵی دەبین گرنگترین بەڵگەیەك دەربارەی کەوتنی تەڵاقی سەرخۆش شانیان لەسەر داداوە ئەم خاڵانەیە:

١- سەرخۆش داوالێکراوە و لەسەر هەڵسوکەوتە گوفتاری و ڕەفتارییەکانی پرسیاری لێ دەکرێت وەك چۆن بە تاوانەکانی دەگیرێت هەر بەو جۆرە حوکم

---

(1) ١١٩/٢.

(2) ١٦٦/٣.

بە کەوتنی سێ تەڵاقەکەی دەردەکرێت.

٢–خۆی بووەتە هۆی تیابردنی ئەقڵی، ئەوەش بە هەڵبژاردنی خۆی و هەستان بە کارێکی رێگەپێنەدراو، بۆیە تەڵاقەکەی وەك سزا وایە لەسەری.

٣–سەرهەڵدانی تەڵاق لەسەر تەڵاقدانی سەرخۆش لە دەروازەی گرێدانی حوکمەکانە بە هۆیەکانیانەوە، بۆیە سەرخۆشی کاریان تێناکات.

٤–فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((هەموو تەڵاقێك رێگەپێدراوە جگە لە تەڵاقی منداڵ و گێل))، سەرخۆش نە منداڵە و نە گێل.

٥–حوکمی هاوەڵان بە کەوتنی تەڵاقی سەرخۆش.

**گفتوگۆ لەسەر ئەم بەڵگانە:**

١–وتنی ئەوەی سەرخۆش داوالێکراوە قسەیەکە نەپێکاوە لەبەر ئەو کۆدەنگییەی هەیە لەسەر ئەوەی ئەقڵ مەرجی داوالێکردنە، بۆیە هەر کەس ئەوەی دەیڵێت نەیژنەوێت داوالێکراو نییە، بە ئایەتی: ﴿لا تَقْرَبُوا الصَّلاةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾، ئەمە ئاراستەکراوە بۆ کەسێکی بەئاگا کە ئاماژە و مانای گوتارەکە تێدەگات.

٢–شەریعەتی ئیسلامی سزای خواردنەوەی ئارەقی بە هەشتا دار داناوە نەك هیچ سزایەکی تر، بۆیە دروست نییە کەسەکە بە دوو سزا سزابدرێت لەسەر یەك تاوان.

٣–تەڵاقی سەرخۆش هۆ نییە تا ئارەقی پێیەوە گرێبدرێت لەبەر نەبوونی مەبەست و نەبوونی ئەقڵ، چونکە هۆی دانراوی بریتییە لە تەڵاقی کەسی ئاقڵ کە گوتاری کیتاب و سوننەت رووی لێ دەکات، گەر ئەوەی ئەوان دەیڵێن دروست بێت تەڵاقی منداڵ و خەوتوو و نەفام و شێتیش دەکەوت لەباری دەستبردنیان بۆ هەمان هۆ.

٤–فەرموودەی: (هەموو تەڵاقێك...)) هەڵدەدرێتە سەر داوالێکراو، سەرخۆش داوالێکراو نییە، پاشان ئەو سەرخۆشەی ژیری لەدەستداوە یان گێلە یان

پاشكۆكراوی گێلە.

سەرباری ئەوە ئیبن حەزم دەڵێت[1]: ئەوە هەواڵێكی درۆیە(واتە فەرموودە نییە).

٥-هاوەڵان رێكنەكەوتوون لەسەر كەوتنی تەڵاقی سەرخۆش، لەوانە عوسمانی كوڕی عەفان و ئیبن عەباس و كەسانی تر-خوایان لێ رازی بێت- كە وتویانە تەڵاقی سەرخۆش ناكەوێت.

**پارسەنگدان:**

ئەوەی بۆم دەردەكەوێت ئەوەیە ناتوانرێت بوترێت تەڵاقی سەرخۆش دەكەوێت یان ناكەوێت بەڵكو پێویستە لەبەر رۆشنایی ئەم درێژەپێدانەدا بڕیار لە حوكمەكەی بدرێت:

گەر لای قازی یان مفتی لە رەوشی قەزیەكەوە یان لە گوفتاری ژنەكەوە یان لە شایەتی رووداوەكەوە سەلمێنرا پیاوەكە دەسەڵاتی بەسەر هێزە ئەقڵییەكانیدا لەدەست نەداوە لەو بارەدا حوكمەكە یان فتواكە بە كەوتنی تەڵاقەكە پێویست دەبێت، چونكە لەو دۆخەدا یان بەڕاستی بەئاگا بووە یان بەئاگابوون زاڵ بووە بەسەریدا.

چونكە ناتوانرێت بوترێت هەركەس مادەی مەستكەر بخواتەوە سەرخۆش دەبێت و ئەقڵ و جیاكردنەوە لەدەست دەدات بەتایبەت بۆ ئەو كەسانەی كە بەرگری دژ بە كاریگەری مادەی سەرخۆشكەر بەدەست دەهێنن.

بەڵام گەر لە رەوش و ئاقار و ئیفادەی شایەتەكانەوە رۆشن بوویەوە كاتێك مێردەكە لە تەڵاق چووەتە پێش لە بارێكدا بووە نەیتوانی سەرئەنجامی هەڵسوكەوتەكانی دیاری بكات و نەیتوانیوە بیری خۆی رێكبخات و مەبەستەكەی

---

[1] ینظر المحلی ١٠/٢١٠.

بەرەو ئەوەی لێیچووەتە پێش ڕێکبخات، ڕاستتروایە حوکم بە نەکەوتنی تەڵاقەکەی بدرێت بەم هۆیانە:

١-خاوەن شەرع ئەسەرێکی شەرعی لەسەر قسەکانی دانەناوە بە بەڵگەی ئایـەتی: ﴿لا تَقْرَبُوا الصَّلاةَ وَانتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾[1]، ئەو ئایەتە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات سەرخۆش نازانێت چی دەڵێت، هەرکەسێکیش نەزانێت چی دەڵێت دروست نییە پابەندبکرێت بە شتێك لە حوکمەکان.

٢-خاوەن شەرع سزای سەرخۆشی بە هەشتا دار دیاریکردووە و دروست نییە یەك تاوان دوو سزای بۆ دیاری بکرێت، گەر سزای پاشکۆییمان بۆ دەرکرد پێویستە تەنها تاوانکەر بگرێتەوە، بەڵام لێرەدا سەردەکێشێت بۆ سەر بێگوناهان لە ژن و منداڵەکان، پاشان گوناهی ژنەکە چییە لە روخانی قەوارەی هاوسەریدا کـە ئـەو رەگەزێکی سەرەکییە لە رەگەزەکانی و قوربانی یەکـەمی روخـانی خێزانەکـە و سەرئەنجامە نەرێنییەکانییەتی.

٣-گرێدانی حوکمەکان بە هۆیەکانیانەوە یەکێکە لە ئەسڵەکانی شەریعەتی ئیسلام، تەڵاقدان هۆی تەڵاقە، بەڵام ئایا هۆیەکە تەنها بریتییە لـە خسـتنی گوزارەکـەی بەرەهایی؟ گەر بڵێین: بەڵێ، ئەوا کەوتنی تەڵاقی شێت و خەوتوو و سەرخۆش کە بە سەرخۆشییەکەی گوناهێکی نەکردووە پێویست دەبێت، ئەگەر نە، دەبێ کەوتنی گوزارەکە لە کەسێکی ئاقڵەوە بێت کە دەزانێت و تێدەگات چی دەڵێت، کەسی سەرخۆش کە هەست و جیاکردنـەوەی لەدەسـتداوە کەسـێکی نائاقڵـە، بۆیە کەوتنی گوزارەی تەلاق لە ئەوەوە نابێتە هۆ، کەوابوو حوکمی دانراو لێرەدا

---

[1] (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَقْرَبُوا الصَّلاةَ وَانتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ وَلا جُنُباً إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّى تَغْتَسِلُوا وَإِن كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيداً طَيِّباً فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوّاً غَفُوراً) (النساء:٤٣).

بریتییە لە تەڵاقی کەسی ئاقڵ نەك تەڵاقدەری تەڵاقەکە، ئەو سەرخۆشەی کە تێدەگات لەوەی دەیڵێت ئەو کەسەیە تەڵاقی دەکەوێت.

٤-عوسمانی کوڕی عەفان-خوا لێی ڕازی بێت- دەفەرموێت: (بۆ شێت و سەرخۆش تەڵاق نییە)، ئبن عەباس-خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێت- دەڵێت: تەڵاقی سەرخۆش و زۆرلێکراو دروست نییە، لەمەدا یەکێك لە هاوەڵان نابینرێتەوە پێچەوانە بووبێت لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەفان و ئیبن عەباس، بۆیە ئیمام ئەحمەد گەڕاوەتەوە بۆ سەر نەکەوتنی تەڵاق و زۆرێك لە شوێنکەوتووانیش ئەو ڕێگەیان گرتۆتە بەر[1].

ئەوەش هەڵبژاردنی " جعفر الطحاوي، وابن الحسن الكرخي" و "وزفر"ە لە شێخی حەنەفییەکان و " المزني و "ابن شريح " لە شێخی شافیعییەکانیش لەسەر ئەم ڕایەن، فەقیهانی جەعفەری و زاهیریش دانیان پێدا ناوە، و یەکێکە لە دوو قسەکەی ئیمامی شافیعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت)

**حوکمی تەڵاقی سەرخۆش لە یاسادا:**

یاساکانی باری کەسێتی وڵاتە ئیسلامییەکان ڕای ئەوانەیان وەرگرتووە لەسەر نەکەوتنی تەڵاقی سەرخۆشن، لەو یاسایانە بگەڕێرەوە بۆ یاسای عێراقی(م٣٥)، والسوري(م٨٩)، والأردني(م٨٨)، والتونسي(الفصل ٣١) والمغربي(الفصل ٣٩).

---

[1] ينظر عمدة القاري شرح صحيح البخاري ٢٠/٢٥٢.

# باسی سێیەم:
# تەڵاقی توورە

**توورەیی:** سیفەتێکی دەروونییە لە ناخی مرۆڤدا راستبووەتەوە ئاسار لەسەری سەرهەڵدەدات لەوانەیە رەوا یان ناڕەوا بێت، ئەم سیفەتە لە خودی خۆیدا بە حەرامکراو دانانرێت، چونکە لەلایەکەوە ناهەڵبژاردەییە و لە روویەکی ترەوە هەندێ جار کەسی توورە هاندەدات بۆ چوونەپێش لە کارێکی پەسەند وەك بەرگری لە خۆ یان ناموس یان رێز و پلە و پایە یان ماڵ و سامان... بەڵام هەندێ جار هەڵیدەنێت بۆ هەڵسوکەوتی خراپ و ناپەسەند لەوانە چوونەپێش لە تەڵاق بەبێ پاساو.

فەقیهان لە حوکمی تەڵاقی توورە جیاوازیان لە نێوانیدایە، سەرچاوەی جیاوازییەکەیان دوو خاڵی سەرەکییە:

**یەکەم:** جیاوازی لە لێکدانەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((تەڵاق لە داخستندا نییە))، هەندێکیان بە توورەبوون لێکیاندلوەتەوە، هەندێکیشیان دەڵێن: داخستن بریتییە لە زۆرلێکردن و هەندێکیشان رێگەی تریان گرتۆتەبەر[1]

**دووەمیان:** جیاوازی لە بەهەندوەرگرتنی مەرام لە تەڵاقدا: هەرکەس پێیوایە لە رەگەزەکانی تەڵاقە لەسەر نەکەوتنی تەڵاقی کەسی توورەیە، فەقیهە جەعفەرییەکان و زاهیرییەکان و هەندێ لە فەقیهانی حەنەفی و مالیکی و حەنبەلی ئەم ئاراستەیان هەڵبژاردووە، بەڵام ئەوانەی وتویانە بۆ کەوتنی تەڵاق بەکارهێنانی گوزارە راشکاوەکەی بەسە با بەکارهێنانەکەشی هاوەڵ نەبێت بە مەبەست و نیەت وەك شافیعییەکان و جمهووری مالیکی ئەوا پێیانوایە تەڵاقی توورە دەکەوێت وەك لەم رۆشنکردنەوەوە رۆشن دەبێتەوە:

---

[1] لمزيد من التفصيل يراجع: عمدة القاري شرح صحيح البخاري ٢٠/٢٥٠ ـ ٢٥١ عون المعبود على سنن أبي دأود ٢/٢٢٤ ـ٢٢٥.

**حەنەفییەکان:**

لەلایان گەر کەسی تووڕە تووڕەبوونەکەی لە سروشتی ئاسایی خۆی دەریکرد بە جۆرێك ورێنە زاڵ ببێت بەسەر گوفتار و رەفتاریدا ئەوا تەڵاقەکەی ناکەوێت[1].

**مالیکییەکان:**

لە قسەی زۆرینەی فەقیهانی مالیکییەوە دەردەکەوێت پێیان وا نییە تووڕەیی کاریگەری هەبێت لەسەر دروستی تەڵاق گەر نەگەیشتبێتە رادەی توندی، تەنانەت لەو بارەشدا لەلایان نەکەوتنی تەڵاقەکەی حوکمێك نییە لەسەری هاوڕابن[2]، بەڵام ئەوانەیان بە مەرجگرتنی مەبەست و نیەتیان لە دارشتنی تەڵاقدا –با راشکاویش بێت– راگەیاندووە نەکەوتنی تەڵاقی تووڕەیان پێویست کردووە لە کاتێکدا نە نیەت و نە مەبەستی تێدایە بۆی، وەك لەباری تێکچوونی هاوسەنگییەکەی و زاڵ نەبوون بەسەر ویستی خۆدا بە ئەندازەیەك ئاساری سەرهەڵدراو لە قسەکانی خۆی بە مەبەست ناگرێت، ئەم قسەیە دراوەتە پاڵ ئیمامی مالیك(رەحمەتی خودای لێ بێت)

---

[1] یقول ابن عابدین (٣/٢٤٤): (ئەوەی بۆ دەردەکەوێت هەردوو سەرسام و تووڕە ئەوە پێویست ناکات حاڵەتەکەیان لە بارێکدا نەزانن چی دەڵێن، بەڵکو ئەوەندە بەسە ورێنە زاڵ ببێت بەسەریدا، و سووربوون تێکەڵ بە شۆخی ببێت وەك چۆن لە سەرخۆشدا فتوای پێدراوە)، هەروەها دەڵێت: (ئەوەی لەسەرسام و هاوشێوەکانیدا بەهەند وەردەگیرێت بتوانی بریار بدەیت ئەو کەسە لە گوفتار و کرداری دەرەکیدا لە سروشتی خۆی دەرچووە، هەر بەو جۆرە دەربارەی ئەو کەسەی ئەقڵی ناتەواوی تێکەوتووە بەهۆی پیری یان نەخۆشی یان موسیبەتێکی ناکاو، لەبەر ئەوەی لەباری ناتەواویدا لە گوفتار و کرداریدا بە گوفتاری ئەو دانانرێت، با بیشزانێت و ویستی بۆی هەبێت، چونکە ئەو مەعریفە و ویستە بەهەند وەرناگیرێت لەبەر بەرهەم نەهاتنی لە پەیبردنێکی دروستەوە وەك چۆن لە منداڵی ئاقڵەوە بەهەند وەرناگیرێت)

[2] یقول الدسوقي (حاشیة الدسوقي علی الشرح الکبیر ٢/٣٦٦ ): (تەلاقی تووڕە پێویست دەبێت با تووڕەییەکەشی توند بووبێتەوە پێچەوانەی هەندێکیان).

**شافیعییەکان:**

فــەقیهانی شــافیعی پێیانوایــە تــەڵاقی کەســی تــووڕە دەکــەوێت، پلــەی تووڕەبوونەکەی هەرچەندێك بێت پاڵپشت بە ڕێسای "سد الذرائع–داخستنی دەرگای مەفسەدە" کە بنچینەیەکە لە بنچینەکانی فیقهی ئیسلامی لە لایەکەوە و ڕێکەوتنیان لەسەر بە مەرج نەگرتنی نیەت لەگەڵ گوزارەی ڕاشکاوی تەڵاق لە لایەکی ترەوە.

ئەوەی نامۆیە خاوەنی "التحفة" پێیوایە ئیجماعی بێدەنگی لـە چاخی هاوەڵانـدا لەسەر کەوتنی تەڵاقی کەسی تووڕە بوونی هەیە و کەس سەرپێچی لێنـەکردوون[1]، کاتێکدا ئیمامی شـافیعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لـەو کەسـانەیە مانـای "الإغـلاق–داخسـتن"ی لـە فەرموودەکـەی پێغەمبـەردا(ﷺ): (لا طـلاق في إغـلاق–تـەڵاق لـە داخستندا نییە) بە تووڕەبوون لێکداوەتەوە، زۆرێك لە فەقیهانی هاوەڵان و ئیمامـانی مەزهەبەکان لەوەدا پێشیکەوتوون، ئیبن قەیم لـەژێر ناونیشـانی "تـەڵاقی تـووڕەدا" دەڵێت: ئەمە قسەی عەلی و ئیبن عەباس و کەسانی تـرە لـە هـاوەڵان، شـافیعی بـە تووڕەبـوون لێکیداوەتـەوە، بۆیـە "مسـروق والشـافعي واحمـد وابـو داود والقاضـي اسماعیل" هەموویان بە تووڕەبوون لێکیانداوەتەوە، ئەوەش باشـترین لێکدانەوەیـە، چونکە کەسی تووڕە دەروازەی مەبەستی بەهۆی توندی تووڕەبوونەکەیەوە بەسەردا داخراوە، ئەو وەك زۆرلێکراو وایە بەڵکو لەپێشترە، چونکە زۆرلێکراو هەڵگرتنی شەڕی زۆری بە شەڕی کەم کە لە خوار ئەوەوەیە بە مەبەست گرتووە[2].

**حەنبەلییەکان:**

پارسەنگدراو لای فەقیهـە حەنبەلییـەکان بریتییـە لـە نەکـەوتنی تـەڵاقی کەسـی تـووڕە، ئـیبن قـەیم دەڵێـت: (تـەڵاقی داخسـتن ئیمـام ئەحمـەد لـە ڕیوایەتێکـدا (فەرموودەکـەی عائشـە–خوا لێی ڕازی بێت–) دەفـەرموێت: (تـەڵاق و ئـازادکردن لـە

---

[1] یراجع تحفة المحتاج ٣٢/٨.

[2] لمزید من التفصیل یراجع اعلام الموقعین لابن قیم الجوزیة ٥٢/٣ ـ٥٣.

داخستندا نییە) "داخستن" واتە لەباری تووڕەبووندا، ئەمە دەقەکەی ئەحمەدە "الخلال وابو بکر" لە "الشافي و زاد المسافر"دا باسیان کردووە، ئەمە بریتییە لە لێکدانەوەی ئەحمەد)[1].

**جەعفەرییەکان:**

سروشتییە فەقیهە ئیمامییەکان لەسەر نەکەوتنی تەڵاق بن، چونکە مەبەستی خستنی تەڵاق(نیەت) بە رەگەزەکانی کەوتن دادەنێن، بۆیە تەڵاق بوونی نییە گەر مەبەست و نیەت بوونی نەبوو، لە "مستدرك الوسائل"دا هاتووە: (بۆ دروستی تەڵاق مەبەست و ویستی تەڵاق بە مەرج دەگیرێت ئەگەر نە پووچ دەبێتەوە) ئەوان- سەرباری ئەوە- خۆیان پاڵپشت دەکەن بە کۆمەڵێك فەرموودە لە رێگەی خۆیانەوە، لەوانە: ((تەڵاق بە زۆرلێکردن و ناچارکردن و سەرخۆشی و تووڕەبوون ناکەوێت))[2]

**زەیدییەکان:**

سەرچاوەیەکم نەبینییەوە راشکاوانە باس لە تەڵاقی کەسی تووڕە بکات جگە لەوەی لە پەراوێزی "البحر الزخار[3]"دا هاتووە ئاماژە بە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((نە تەڵاق و نە ئازادکردن لە داخستندا نییە)) ئەبو داود تەخریجی کردووە و دەڵێت: داخستن: بریتییە لە تووڕەبوون)

---

(1) زاد المعاد ٤/٤٢.

(2) لای جەعفەرییەکان گوزارەی (النصوص المستفیضة) بۆ فەرموودەی مەشهوور دادەنێن، شایانی باسە فەرموودە لای ئیمامییەکان فەرموودەی پێغەمبەر و ئیمامانی مەعسووم لە ئالوبەیتی پێغەمبەر(ﷺ) دەگرێتەوە)

(3) ٣/١٦٧.

**زاهیرییەکان:**

تەڵاقی تووڕە لای فەقیهانی زاهیری ناکەوێت بینا لەسەر ئەو ئەسڵەیان کە دەڵێن: (کار بە نیەتە و نیەتیش بە کارە)[1]، ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە زاهیرییەکان بۆ کەوتنی تەڵاق هاوملبوونی داڕشتنی ڕاشکاو بە نیەت و مەبەستی ڕووکردنە هەڵوەشانەوەی هاوسەرداری بە مەرج دەگرن، بۆیە گەر تووڕە تووڕەبوونەکەی لەم نیەتە هاوملبووە لایدا حوکم بە کەوتنی تەڵاقەکەی نادرێت.

**پارسەنگدان:**

ئەوەی بە لایدا دەشکێمەوە دەستبردنە بۆ درێژەدان بەم بابەتە کە فەقیهی مەزن "ابن قیم الجوزیة"(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لە " رسالة طلاق الغضبان" قسەی لەسەر کردووە و تووڕەبوونی بۆ سێ ئاست دابەشکردووە:

**یەکەم:** ئەوەیە بنەماکانی تووڕەبوون لە مرۆڤدا بەدی بێت بە جۆرێك کارنەکاتە سەر ئەقڵی، و بزانێت چی دەڵێت و چی مەبەستە، لەم بارەی تووڕبووندا گوزارەکەی جێبەجێ دەکرێت و بە کۆدەنگی تەڵاقی دەکەوێت.

**دووەم:** ئەوەیە پلەی تووڕبوون بگاتە لوتکەی بە جۆرێك نەزانێت چی دەڵێت و دەیەوێت چی بکات، لەم شێوازەی تووڕەبووندا هیچ شتێك لە هەڵسوکەوتە گوتارییەکانی جێبەجێ ناکرێت لەناو ئەوانەشدا تەڵاق.

**سێیەم:** بریتییە لە پلەیەکی مامناوەند بەجۆرێك تووڕەبوونەکەی قۆناغی یەکەم بەجێدەهێڵێت، بەڵام ناگاتە لوتکە، ئەم بارەیە ڕای فەقیهانی تێدا ئاڵۆز بووە، سەرباری ئەوەش زۆربەیان لە سەرخەرانی نەکەوتنی تەڵاقی کەسی تووڕەن لەم پلەیەدا.

گرنگترین شتێك پشتیان پێ بەستووە بریتییە لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((تەڵاق لە داخستندا نییە)) چونکە داخستن جا بە زۆرلێکردن یان بە تووڕەبوون

---

[1] أنظر المحلى لابن حزم ١٠/٢٠٠ ، ١٠ / ١٨٥ وما بعدها.

یاخود بە مانایەکی تر لێکبدرێتەوە ئەوە لە راستیدا بریتییە لەو شتەی دەروازەی پەیبردن و ئارامی و مەبەست لە مرۆڤ دادەخات، بە جۆرێك نازانێت چی دەڵێت یان چی دەکات، یەکسانە هۆیەکە توورەبوون بێت یان زۆرلێکردن یان شتێکی تر جگە لەو دوانە[1]، بەڵام ئەو پرسیارەی خۆی نمایش دەکات لەسەر راخەری باس ئەوەیە قازی یان مفتی چۆن ئەم پلانەی توورەبوون دیاری دەکات؟ پێوەری ناسین و زانینی هەر پلەیەك کامەیە؟

**بەڵگەنەویستە:** ئەرکی قازی بە پلەی یەکەم بریتییە لە چۆناندنی بابەتە والأکراوەکە بەسەریدا، و دەرهێنانی پلەی توورەبوونەکە لە رەوشە بابەتییەکە و کۆمەك وەرگرتن لە پاڵنەرەکان و شاهیدەکانی... گەر گەیشتە سەرئەنجامێك پاڵپشتی ئەوەی دەکرد مێردە توورەکە لە کاتی تەلاقدا لە بارێکدا بووە هەموو شتێکی تێکەڵ کردووە، ئەوا مافی ئەوەی هەیە قەزاوەت بە نەکەوتنی تەلاقەکەی بکات وەك وەرگرتنی رای لێکۆڵەران لە حەنەفییەکان، و هەموو فەقیهە جەعفەری و زاهیرییەکان، و هەندێ لە حەنبەلییەکان، گەر نەگەیشتە ئەو باوەڕە ئەوا پێویستە حوکم بە کەوتنی بکات وەك سەرنجدان لە راستبوونەوەی نەیاری و ناکۆکی و پەیوەستبوونی مافی کەسانی تر بە بابەتەکەوە.

بەڵام مفتی دەتوانێت شان لەسەر ئیفادەی مێردەکە و ژنەکە دابدات، گەر گەیشتە ئەو باوەڕەی مێردەکە لە کاتی تەلاقەکەیدا خاوەنی هۆش و پەیبردنی تەواو نەبووە بۆی هەیە فتوا بدات بە نەکەوتنی تەلاقەکە لەڕووی ئاینەوە، و پیاوەکە حەواڵەی ئایینی خۆی بکات و کارەکە واز لێ بهێنێت بۆ نێوان ئەو و خودا، شایانی باسە کەسی سەرسام حوکمی کەسی توورەی هەیە لەوەی باسمان کرد لە درێژەپێدانەکە، **سەرسام:** ئەو کەسەیە نازانێت چی دەڵێت و ئەوەی لەسەر هەڵسوکەوتی سەرهەڵدەدات بە مەبەستی نەگرتووە، ئەوەش بە هۆی رووبەڕووبوونەوەی بۆ

---

[1] للاطلاع الكامل على معنى الاغلاق في حديث (لا طلاق في اغلاق) راجع عون المعبود على سنن ابي داود ٢/٢٢٤. ـ٢٢٥.

هـەژانێکی دەمـاری و سەرسـامکردنی و لەدەسـتدانی هاوسـەنگی بـیر، بـە جۆرێـك ناتەواوی و ئاڵۆزی و بەیەکداکێشان ڕوو لە قسەکانی دەکات.

**یاسا و تەلاقی تووڕە:**

یاسای باری کەسێتی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان ئەو ڕایەیان وەرگرتـووە کـە دەڵێت تەلاقی کەسی تووڕە ناکەوێت:

عێراقی: (ئەو کەسەی جیاکردنەوە لەدەسـت دەدات بـەهۆی تووڕەبوونـەوە یـان بەهۆی موسـیبەتێکی کوتوپڕییـەوە یـان بـە هـۆی تەمـەن زۆرییـەوە یـان بـە هـۆی نەخۆشییەوە تەلاقی ناکەوێت)(م٣٥/١)

سوری: (تەلاقی سەرسام ناکەوێت ئەوەش ئـەو کەسـەیە جیاکردنـەوە لەدەسـت دەدات بەهۆی تووڕەبوونەوە یان بەهۆیەکی ترەوە و نازانێت چی دەڵێت)

مەغریبی: (تەلاقی تووڕە ناکەوێت گەر بـەردەوام بێـت یـان تووڕەبوونەکـەی زۆر توند بێت)

تونسی: (تەلاق تەنها لای دادگا دەکەوێت) بۆیە سروشتییە یاسای تونسی دان بە کەوتنی تەلاقی تووڕەدا نەنێت، چونکە کارەکە بە دادگا تایبەتکراوە).

# باسی چوارەم:
# تەڵاقی شۆخیکەر (الهازل)

"الهزل" لە زماندا دژی "الجد"ە.

لەڕووی زاراوەییەوە: ئەو قسەیە کە مەبەست پێی مانای راستەقینە یان مەجازی نییە[1].

مەبەست پێی لێرەدا بریتییە لە بەکارهێنانی دارشتنی گوزارەی تەڵاق بە شۆخی بەبێ مەبەستی پچڕانی هاوسەرگیری[2].

فەقیهان لە حوکمی تەڵاقی شۆخیکەر جیاوازی لەنێواندایە، هۆی جیاوازییەکەیان لە دانانی رەگەزی نیەت و مەبەستەوەیە لە دارشتنی گوزارەی تەڵاق لەلایەکەوە و فەرموودەکەی: ((سیان سووربوونیان سووربوونە....)) لەلایەکی ترەوە، ئەم بابەتە لە دوو لقدا رۆشن دەکەینەوە:

---

(1) في حاشية عين المعبود( ٢/٢٢٥) : (شۆخی ئەوەیە شتێك بە رێگەیەك دەربڕێت بۆ ئەو مانایە نەبێت بۆی دانراوە بەبێ بوونی گونجان لە نێوانیان، "بەڕستی"یش ئەوەیە بۆ ئەو مانایە بەکاری بهێنێت بۆی دانراوە لە راستیدا یان لە مەجازدا بۆی شیاو بێت)

(2) شرح الخرشي٤/٣٢.

# لقی یەکەم:
# وتنی کەوتنی تەڵاقی شۆخیکەر

کەوتنی تەڵاقی شۆخیکەر بریتییە لە مەزهەبی حەنەفی و مالیکی، بە هەڵواردنی ریوایەتێك لە مالیك و شافیعی و حەنبەلی و جمهووری زەیدی و ئیبازیەوە، لەسەر ئەم درێژەپێدانە:

**حەنەفییەکان:**

دەڵێن: تەڵاقی شۆخیکەر دەکەوێت لەڕووی قەزا و لەڕووی دیانەتەوە، چونکە خاوەن شەرع شۆخییەکەی بە سووربوون داناوە، هەروەها لەبەر ئەوەی لوتبەرزی بە گوزارە دەنوێنێت و شایستەی لێ توندکردنەوەیە.

" الکاسانی[1]" دەڵێت: (لەلای ئێمە کەسەکە لە قسەکەیدا سووربێت(بەڕاستی بێت) بە مەرج ناگیرێت، بۆیە تەڵاقی شۆخیکار و گاڵتەچی دەکەوێت بەهۆی فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ): ((سێ شت سووربوونیان سووربوونەوە و شۆخیکردنیان سووربوونە: هاوسەرگیری و تەڵاق و ئازادکردن))[2].

"السمرقندي" دەڵێت: (لەسەر ئەمە تەڵاقی شۆخیکار و تەڵاقی هەڵەکار دەکەوێت)[3]، ئیبن هەمام دەڵێت: (شۆخیکار هەڵبژاردنی بۆ هەیە لە قسەکردن بە تەڵاق و رازی نییە بە حوکمەکەی بۆیە تەڵاقەکەی دەکەوێت)[4].

---

(1) بدائع الصنائع للكاساني ١٧٩٢/٤.

(2) عن ابي هريرةﷺ (ثلاث جدهن جد وهزلهن جد النكاح والطلاق والرجعة) رواه الاربعة الا النسائي وصححه الحاكم وفي رواية لابن عدي في وجه اخر ضعيف (الطلاق والعتاق والنكاح) سبل السلام ٢٣١/٢.

(3) تحفة الفقهاء للسمر قندي ٢٩٤/٢.

(4) شرح فتح القدير ٣٩/٣.

**مالیکییەکان:**

لە وتنی تـەڵاقی شـۆخیکاردا بەڵگەیان بـەو فـەرموودە باسـکرلوە هێناوەتـەوە، "الـدردیر" دەڵێـت: (پێویسـتبوونی کـەوتنی تـەڵاقی شـۆخیکەر بـۆ هەواڵەکـەی "الترمذي" دەگەڕێتـەوە: ((سـێ شـت شـۆخیکردنیان سـووربوونە: هاوسـەرگیری و تەڵاق و گێڕانەوە(رجعة))[1].

لە ریوایەتێکی نامەشهووردا لـە ئیمـامی مالیکـەوە: تـەڵاقی شـۆخیکار ناکـەوێت، لەوانەیە ئەمە لەسەر ئەو ریوایەتە بیناکرابێت لە ئەوەوە ریوایـەتکراوە کـە راشـکاوی تەڵاق تەڵاقی پێ ناکەوێت گەر نیەتی هاوەل نەبێت، بەڵگەنەویستە: کەسی شۆخیکار نیەتی بۆ نییە[2].

**شافیعییەکان:**

فەقیهە شافیعییەکان پێیانوایە گوزارەی شۆخیکەر لە هەرچی هەڵسوکەوتدایە لە گرێبەستەکان و بەردانەوەکان بەهەند وەردەگیرێت، چونکە حوکمەکە لەسەر ویستی ئاشکرا(دەرکەوتوو) رێکدەخـەن بـا لەگـەڵ ویسـتی ناوەکیـدا جیـاوازی هـەبێت، لـە "الأنـوار"دا: (گـەر بـە تـەڵاق یـان ئـازادکردن شـۆخی کـرد لـە دەرەوە(ئاشـکرا) و ناوەوە(پـەنهان)دا جێبەجێ دەکرێت، با گومانیش ببـات ناکـەوێت، هـەر بـەو جـۆرە فرۆشتن و تەولوی هەڵسوکەوتەکانی تر)[3].

---

[1] شرح الخرشي ٣٢/٤.

[2] يقول الاستاذ سلام مدكور (الاسرة في الاسلام ٦٦/٢): (هەندێك لە مالیکییەکان پێیانوایە کەسی شۆخیکار ژاوەژاوە و بەهەندوەرناگیرێت و هیچ ئەسەرێك لەسەری سەرهەڵنادات تایبەت بە هەموو گرێبەستەکان و هەڵسوکەوتەکان لەناو ئەوانەشدا تەلاق بەهۆی نەبوونی مەبەست و نیەتەوە، چونکە لای ئەوانە مەرجە، خودا دەفەرموێت: (وَإن عَزَمُوا الطَّلاقَ).

[3] الانوار للاربيلي ١٦٩/٢. مغني المحتاج ٢٨٨/٢.

زەیدییەکان:

جمهووریان دەڵێن تـەڵاقی شـۆخیکار دەکـەوێت لەبـەر فـەرمووده باسـکراوەکە، هەروەها لەبەر ئەوەی شۆخیکەر گاڵتە بە حوکمەکانی خودا دەکات[1].

بـەڵام هەنـدێکیان پێیانوایـە ناکـەوێت لەبـەر نواکـەوتنی رەگـەزی سـووربوون و لێبڕان[2]

خاوەنی "روض النضیر" هۆ بۆ حوکمی کەوتن دەهێنێتـەوە بـەوەی شـۆخیکەر گاڵتە بە حوکمەکانی خودا دەکات، خوداش -ﷻ- دەفـەرموێت: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا﴾[3]، هـەروەها لـەم فەرموودەیـەوە: ((سـیان سـووربوونیان سـووربوونە و شۆخیکردنیان سووربوونە)) ئەوە وەردەگیرێت دەربڕینی راشکاوانە ئاتاج بـە نیـەت نییە[4].

ئەوانەشیان دەڵێن تەڵاقی شۆخیکەر دەکەوێت دەڵـێن: گشـتاندنی فـەرموودەی: ((کردارەکـان بـە نیـەتن)) فـەرموودەی: ((سـیان سـووربوونیان سـووربوونە و شۆخیکردنیان سووربوونە)) تایبەتی دەکاتەوە[5].

سەرباری ئەوەش دەڵێن: راشکاوی دەربڕین ئاتاج بە نیەت نییە[6].

---

[1] البحر الزخار ١٦٧/٣ وفیە (یصح طلاق الهازل للخبر).

[2] سبل السلام ٢٣١/٣ وفیە: ("احمد والناصر والصادق والباقر" بۆ ئەوەدەچن پێویستە نیەت بوونی هەبێت بەهۆی گشتاندنی فەرموودەکەی: (الاعمال بالنیات).

[3] ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِتَعْتَدُوا وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ وَلَا تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ يَعِظُكُمْ بِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ (البقرة:٢٣١).

[4] روض النضیر ١٣٩/٤.

[5] سبل السلام ٢٣١/٣.

[6] التاج المذهب (١١٩/٢) وفیە: (تەڵاق بە مەبەستی گوزارەکە دەکەوێت لەگەڵ ئاگاهی بەوەی ئەو گوزارەیە بۆ تەڵاق دانراوە یا ماناکەشی بەمەبەست نەگرتبێت، کەسی شۆخیکەر و گاڵتەکەر دەچێتە ناو ئەمەوە و تەڵاقی هەردووکیان دەکەوێت گەر بە گوزارەی راشکاو گاڵتە و شۆخییان ←

**ئیبازییەکان:**

فەقیهـە ئیبازییـەکان یەکسـانکردنی شـۆخی و سـووربوون لـە تەلاقـدا وەك یـەك دەبینن، چونکە شۆخیکار بە گـوزارەی راشـکاو هاتۆتـە گۆ، لـە "جـوهر النظـام"دا هاتووە:

والجد والهزل سواء ههنا وكان بالصريح نطقا اعلنا

لەم والاکردنەی قسەی فەقیهانەوە بۆ وتنی تەلاقی کەسی شـۆخیکەر تێدەگـەین گرنگترین ئەو بەلگانەی کردوویانە بە پالپشتی خۆیان ئەمانەن:

١-ئایەتی: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا﴾، کەسی شۆخیکار تەلاقی دەکەوێت وەك سزا و توندکردنەوە لەسەری، چونکە گالتـە بـە ئایـەتی خـودا و حوکمـەکانی دەکات[1].

٢-فەرموودەکـــەی پێغەمبـــەر(ﷺ): ((ســـیان ســـووربوونیان ســـووربوونە و شۆخیکردنیان سووربوونە: هاوسەرگیری و تەلاق و گێرانەوە))[2].

٣-دەستبردن بۆ هۆیەکان لە کـاری مرۆڤـی خـاوەن هەلبژاردەیـە، سـەرهەلدانی ئاسار لەسەریان بە حوکمی خاوەن شـەرعە، کەسـی شـۆخیکەر دەسـتی بـۆ هۆیەکـە بردووە(بـەکارهێنانی دارشـتنی گوزارەکـە) ئـەوەش بەسـە بـۆ سەرهەلدانی ئەسەر(کەوتنی تەلاق) با مەبەستیشی نەبێت.

٤-راشکاوی گوزارەی تەلاق پێویستی بە نیەت نییە.

---

کرد). وفيه ايضا (١٢١/٢): (بۆیە دەلێین تەلاقی شۆخیکەر دەکەوێت چونکە راشکاو لەلامان ئاتاج بە مەبەستی ماناکەی نییە). ويقول الشوكاني (الدراري البهية ٦٩/٢): (تەلاق لە هەر داوالێکراو(مكلف)ێکی خاوەن هەلبژاردەوە دەکەوێت با بە شۆخیش بێت، لەبەر ئەو فەرموودەی کە دەفەرموێت: "سیان سووربوونیان...").

[1] عون المعبود على سنن ابي دأود ٢٢٥/٢.

[2] عمدة القاري شرح صحيح البخاري ٢٥١/٢.

**گفتوگۆی ئەم بەڵگانە:**

١-ئایەتەکە تەنها نەهی لە گاڵتەکردن بە حوکمە خودایەکانی لێوە وەردەگیرێت، و دەقێك نییە لەسەر ئەوەی تەڵاقی شۆخیکار-گەر دەستی بۆ هۆیەکەی برد- ئەسەرەکەی لەسەر پەیدا دەبێت.

٢-ئەهلی فەرموودە تانەیان لە فەرموودەکە داوە، "الترمذي" دەڵێت: لە سەنەدی فەرموودەکەدا "عبدالرحمن بن أزدك بن حبيب" بوونی هەیە کە جیاوازی لەسەر هەیە و فەرموودە نەناسە[1].

٣-دەستبردن بۆ هۆ ئەسەری لەسەر پەیدا دەبێت گەر کەسەکە ئەوەی بوێت، ئەگینا کەوتنی تەڵاقی منداڵ و شێتی لێوە پێویست دەبوو گەر دەستیان ببردبایە بۆ گوزارەی تەڵاق.

٤-وتنی ئەوەی راشکاوی دەربڕین ئاتاج بە نیەت نییە جیاوازی لەسەرە بۆیە بە بەڵگە دانانرێت.

[1] عمدة القاري المرجع السابق. المحلى (٢٤٠/١٠) وفيه الحديث موضوع. الدراري البهية (٦٩/٢) وفيه ( في اسناده عبد الرحمن وهو مختلف فيه).

## لقی دووەم:
## وتنی نەکەوتنی تەڵاقی شۆخیکەر

نەکەوتنی تەڵاقی شۆخیکەر مەزهەبی جەعفەری و زاهیری و ریوایەتی ئیمام مالیك و قسەی هەندێك لە فەقیهانی زەیدییە لەسەر ئەم درێژەپێدانە:

**جەعفەرییەکان:**

دەڵێن: تەڵاقی شۆخیکەر ناکەوێت لەبەر سەحیح نەبوونی فەرموودەکە: ((سیان سووربوونیان سووربوونە...))[1]، هەروەها لەبەر ئەوەی نیەت مەرجی دروستی تەڵاقە لەلایان[2].

**زەیدییەکان:**

هەندێ لە فەقیهەکانیان لەوانە "الباقر و الصادق و الناصر" بۆ ئەوە دەچن تەڵاقی شۆخیکەر ناکەوێت، چونکە سووربوون و لێبڕانی بۆ نییە و خودا دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلاقَ﴾[3].

**زاهیرییەکان:**

دەڵێن: مەرام و نیەت لە تەڵاقدا پێویستە، کەسی شۆخیکەر نیەتی بۆ نییە، و دروست نییە بەڵگە بەو ریوایەتە بهێنرێتەوە: ((سیان سووربوونیان سووربوونە...)) چونکە هەڵبەستراوە[1].

---

[1] وفي جواهر الكلام (كتاب الطلاق): (هەواڵەکە لەلامان پشتڕاست نەکراوەتەوە بەڵکو پێچەوانەکەی لەلامان بڕاوەیە).

[2] في شرائع الاسلام (٢/٥٣)، وفي مستدرك الوسائل باب (١١) ٣/٤: (لە دروستی تەڵاقدا مەبەست و ویستی تەلاق بەمەرج دەگیرێت، ئەگەر نە، پووچ دەبێتەوە).

[3] سبل السلام ٣/٢٣١. المنتزع المختار ٢/٣٨٣ الروض النضير.

**مالیکییەکان:**

"الخرشي" دەڵێت: (مالیك دوو ریوایەتی هەیە: لە ریوایەتە بەناوبانگەکەدا ،ەکەوێت)[2].

واتە تەڵاقی شۆخیکار لای ئیمامی مالیك لە ریوایەتە نامەشهوورەکەدا ناکەوێت.

لەوەی باسمان کرد ڕۆشن دەبێتەوە ئەوانەی دەڵێن تەڵاقی شۆخیکەر ناکەوێت ،ەستیان بەم خاڵانەوە گرتووە، گرنگترینیان:

١—ئایەتی: ﴿وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ﴾، کەسی شۆخیکەر عەزمی نییە.

٢—فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): ((کارەکان بە نیەتن)) کەسی شۆخیکەر نیەتی نییە.

٣—ئەوەی پێویستە ئەوەیە گوزارەکە گوزارشت لە ویستێکی ناوەکی و مەبەستی قسەکەر بدات، تەڵاقی شۆخیکەر گوزارشت لە مەبەستی هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیری ناکات.

**گفتوگۆ لەسەر ئەم بەڵگانە:**

١—ئایەتەکە تایبەتە بە حوکمی تەڵاقی سوێند و ناتوانرێت بکرێتە بەڵگەی کەوتنی تەڵاقی شۆخیکەر.

٢—فەرموودەکە گشتییە و فەرموودەی: ((سیان سووربوونیان سووربوونە...)) تایبەتی دەکاتەوە، چونکە ئەم فەرموودەیە—هەرچەند لە لقەکەی پێشتر گفتوگۆمان لەسەر کرد و ڕووی لاوازییەکەیمان باس کرد— لەگەڵ ئەوەش بە

---

(1) المحلى (٢٠٤/١٠) وفيه (بەڵگەیان بە ئاسار هێناوەتەوە، لەوانە: (سیان سووربوونیان سووربوونە و شۆخیکردنیان سووربوونە: هاوسەرگیری و تەڵاق و گێڕانەوە(رجعة)) ئەمەش هەواڵێکی هەڵبەستراوە.

(2) شرح الخرشي٣٢/٤.

سـەنەدی جۆراوجـۆر و چـەندین ریوایـەت[1] هـاتووە و وەك فەرموودەیـەكی بەناوبانگی لێهاتووە و ئوممەت قبووڵی كردووە.

پاشان ئەوانەی دەڵێن تەڵاقی شـۆخیكەر كـەوتووە پشتیان بـەوە بەسـتووە كەوتنەكە وەك تەمبێكردن و سزا بێت، ئەوەش وەك هەڵواردنێك لـە رێسـای: ((كار و كردەوەكان بە نیەتن)) بەهۆی ئایەتی: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُـزُوًا﴾، لەسەر ئەم بنچینەیە سەرنجدان لە نیەت و مەرامی وەردەگیرێت.

٣-لەسەر قازی پێویستە حوكم بە رووالەت و ئاشكرا بكات و پابەندنەكراوە بچێتە ناو قوڵاییەكانی دڵەوە تا بۆی دەربكەوێت ئایـا ویسـتی رووالـەتی و ئاشـكرای پڕاوپڕ و هەماهەنگە لەگەڵ ویستی ناوەوەیدا یان نە.

**پارسەنگدان:**

دروسـتترین را ئەوەیـە جمهـووری فـەقیهان دەسـتیان بـۆ بـردووە لـەوەی گـەر شۆخیكەر گوزارەیەكی ئاشكرای لێوەشایەوە تەڵاقەكەی دەكەوێت لەم روانەوە:

١-كەسی شۆخیكەر دەستی بۆ هۆیەكە بردووە و كەسێكی باڵغی ئـاقڵی خـاوەن هەڵبژاردەیـە و شـۆخیكردنی لـەو پاسـاوانە نییـە هۆیـەكان پـەك دەخـەن و لەوێشەوە حوكمەكان دوادەكەون، هەروەها لەو رێگرانە نییە كە پیـادەكردنی رێسـای "گـەر رێگـر و داواكـار كۆبوونـەوە رێگـر پـێش دەخرێـت" پێویسـت دەكات.

٢-دروست نییە شۆخیكەر پێوانە بكرێـت بـۆ سـەر زۆرلێكـردن و سەرخۆشـی، و هاوشێوەكانی ئەو دوانە، چونكە كەسی شۆخیكەر مەبەستی گوزارە و مانایـە بە مەبەستێكی شۆخیكارانە، لەگەڵ ئـەوەش كەسـێكی بـاڵغی ئـاقڵی خـاوەن هەڵبژاردەیە و زۆرلێكردن و هەڵە و لەبیرچوون و نەزانی لە ماناكەی لایدادات.

---

[1] لەوانە ریوایەتەكەی "فضالة بن عبيد" لە "الطبراني"ەوە بە بەرزكراوەیی: (سیان یاریان تێدا دروست نییە: تەڵاق و هاوسەرگیری و ئازادكردن). ينظر الدراري البهية للشوكاني ٦/٧٠.

٣-لە وتنی کەوتنی تەڵاقی شۆخیکەردا دەرگا بەڕووی ئەو خاوەن دەروونە نەخۆشانەدا دادەخرێت کە گاڵتە دەکەن بە حوکمەکانی خودا و دەستەبەریی پەیوەندی هاوسەرداریی پێوەیە.

٤-یاری و شۆخی و گاڵتە لە مافەکانی خودادا ڕێگەپێنەدراوە، سووربوونی قسەکە و شۆخیکردنی یەکسانە، بۆیە خاوەن شەرع ئەو کەسەی بە شۆخی گوزارشت لە کوفر دەکات بە کافری داناوە، وەك خودا-ﷻ- دەفەرموێت: ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إنمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ، لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾[1].

گوزارشتکردنی بە تەڵاق لەڕووی شۆخییەوە پێوانە دەکرێتە سەر ئەوە، چونکە مافی خودای تێدایە و حەرامبوونی هەریەك لە دوو هاوسەرەکە لە خۆشیوەرگرتن لەیەکتر بەدوای خۆیدا دەهێنێت بە جۆرێك دوای ئەوە ناتوانرێت موباح بکرێتەوە، بەڵام پێموایە ئەم حوکمە تەنها بۆ قەزا بەجێبهێڵرێت، واتە لەڕووی قەزاوە حوکم بە تەڵاقەکەی بکرێت، بەڵام لەڕووی ئاینەوە کارەکە بەجێبهێڵرێت بۆ نێوان ئەو و خودا، لەمەشدا نزیکبوونەوە هەیە لە نێوان بۆچوونی جیاوازی فەقیهانی موسڵماندا[2].

---

[1] (وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إنمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ* لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ أن نَعْفُ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ) (التوبة:٦٥، ٦٦)

[2] بەوەی قسەکەی جمهوور هەڵبدرێتە سەر کەوتنی تەڵاق لەڕووی قەزاوە و قسەی کەسانی تر جگە لەوان هەڵبدرێتە سەر نەکەوتن لەڕووی دیانەتەوە.

# باسی پێنجەم:
# تەڵاقی هەڵەکار و لەبیرکەر

هەڵەکار: ئەو کەسەیە مەبەستی تەڵاق نییە بە قسەکەی، بەڵام زمانی بۆی پێشدەکەوێت، بۆ نموونە لە جێگەی ئەوەی بڵێت: (تۆ نەرمونیانی) ئەم قسەیە بەسەر زمانیدا گوزەر دەکات (تۆ تەڵاقدراوی)، جیاوازی لە نێوان شۆخیکەر و هەڵەکەردا ئەوەیە یەکەمیان مەبەستی گوزارەی تەڵاقە(دارشتنی تەڵاق) بەبێ ئەسەرەکەی، بەڵام دووەم نە مەبەستی گوزارەکەیەتی نە ئەسەرەکەی.

فەقیهانی شەریعەت لەسەر حوکمی تەڵاقی هەڵەکار بۆ سێ قسە دابەشبوون:

(لەرووی قەزاوە دەکەوێت، نەك لەرووی دیانەتەوە، نە لە قەزا و نە لەرووی دیانەتەوە ناکەوێت، لە قەزا و لەرووی دیانەتەوە دەکەوێت)

سەرچاوەی جیاوازییەکەیان جیاوازیانە لە پارسەنگانی یەکێك لە دوو ویستەکە(ئاشکرا و پەنهان) بەسەر ئەویترپاندا.

بەڵام سەرباری ئەم جیاوازییە رای باو لای فەقیهان بریتییە لە دەستبردن بۆ ویستی ئاشکرا لەرووی قەزاوە، و دەستبردن بۆ ویستی ناوەوە(پەنهان) لەرووی دیانەتەوە، بۆ رۆشنکردنەوەی زۆرتر ئەم رایانە لە سێ لقدا دەخەینە روو:

# لقی یەکەم:
# تەڵاقی هەڵەکار لە قەزادا دەکەوێت
# نەک لەڕووی دیانەتەوە

رای جمهووری فـەقیهانی موسـڵمان لەسـەر ئـەم رایـە جێگیربـووە، چـونکە لـەم پرسـەدا ناوەنـدگیری دەکـات لـە نێـوان مـافی تایبـەت(مافی بەنـدە) لەگـەڵ مـافی گشتیدا(مافی خودا)، ئەوانەی ئەم ئاراستەیان گرتۆتە بەر بریتین لە فەقیهانی حەنەفی و مالیکی و شافیعی و زەیدی و ریوایەتێك لە حەنبەلییەکانەوە، وەك لەم درێژەپێدانەدا:

**حەنەفییەکان:**

فەقیهانی حەنـەفی هۆیـان بـۆ قسـەکەیان لەمـەڕ کـەوتنی تـەڵاق لـەڕووی قـەزاوە هێناوەتەوە بەم بەڵگانە، گرنگترینیان:

١-مەبەست مەرج نییە بۆ دروستی تەڵاق هەتا کەسی تەڵاقدەر گوزارەی راشکاو بەکاربهێنێت.

٢-هەڵە کارێکی ناوەکییە تەنها خاوەنەکەی دەیزانێت، لەوانەیە بـەدرۆ بانگەشـە بکات و بڵێت بە هەڵە تەڵاقی خستووە، و لەوەشدا حەڵاڵکردنی ئەوەیە خـودا حەرامی کردووە.

٣-بنەڕەت لە مرۆڤی باڵغی ئاقڵی خاوەن هەڵبژاردەدا بریتییە لـە هەڵـە نـەکردن، ئەوەش بەسە بۆ ئەوەی بەڵگە بێت لەسەر دروستی گوزارەکەی.

"الكاساني" دەڵێت: (ئـەوەی کەسـەکە بـە مەبەسـتی گرتبێـت نابێتـە مـەرج بـۆ کەوتنی تەڵاق تا تەڵاقی هەڵەکار بکەوێت، چونکە بەهەڵە لەدەستچوو تـەنها بـەهۆی

مەرامێکەوەیە، بۆیە نابێتە مەرج بۆ کەوتنی تەڵاق وەك شۆخیکەر و گاڵتەکار بە تەڵاق)[1].

مەلا خەسرۆ دەڵێت: (تەڵاقی هەر مێردێکی ئاقڵی بالغ دەکەوێت با لەبیریشی چووبێت)[2].

ئیبن عابدین دەڵێت: (گەر ویستی بڵێت "سبحان الله" و بەسەر زمانیدا "تۆ تەڵاقدراوی" هات ئەوە تەڵاقەکەی دەکەوێت، چونکە راشکاوە و ئاتاج بە نیەت نییە بەڵام ئەم کارە لە قەزادا بەو جۆرەیە)[3]

واتە تەنها لە قەزادا دەکەوێت نەك لە فتوادا، دروستە بۆ مفتی بە نەکەوتن فتوا بدات بینا لەسەر ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکات و رەوانەکردنی کەسەکە بۆ لای دیانەتی خۆی.

**مالیکییەکان:**

لەلایان لەرووی قەزاوە دەکەوێت نەك لەرووی دیانەتەوە، گەر هەڵەی زمانی کەسەکە و نەبوونی مەبەستی نەسەلمێت، گەر ئەوە جێگیر بوو دروستە بۆ قازی حوکم بە نەکەوتن دەربکات وەك چۆن بۆ مفتی هەیە فتوای نەکەوتنی بدات.

"الدردیر" دەڵێت: (گەر مەبەستی قسەکردن بوو بە شتێکی تر جگە لە گوزارەی تەڵاق ئەوە هەڵەی زمانییەتی، گەر نەسەلما لەرووی فتواوە قبووڵ دەکرێت نەك لەرووی قەزاوە)[4].

"الخرشي" دەڵێت: (هەر کەس ویستی قسەیەك بکات جگە لە تەڵاق و زمانی سوڕایەوە و قسەی بە تەڵاق کرد ئەوا لە فتوادا هیچی لەسەر نییە، بەڵام لەرووی قەزاوە پێیەوە پەیوەستە)[5].

---

(1) بدائع الصنائع للكاساني ١٧٩٣/٤.

(2) درر الحكام شرح غرر الأحكام ٣٦٠/١.

(3) حاشية ابن عابدين ٥٨٤/٢.

(4) الشرح الكبير للدردير ٣٦٦/٢. الشرح الصغير ٤١٨/١.

بە بەراورد لە نێوان تێگەیشتنی پێچەوانەی قسەکانی "الدردیر"(گەر نەسەلما) و قسەکانی "الخرشي"دا(گەر پێشگەوتنی زمانی سەلما) بۆمان رۆشن دەبێتەوە رای فەقیهانی مالیکی لەسەر ئەوە جێگیربووە کەسی هەڵەکار گەر توانی لەبەردەم قەزادا هەڵەی زمانی و هەڵەکردنەکەی بسەلمێنێت لەسەر قازی پێویستە حوکم بە نەکەوتنی تەڵاقەکەی دەربکات.

**شافیعییەکان:**

دەڵێن: گەر بەڵگەیەك ئاماژەی بە راستگۆیی کەسەکە نەدەکرد ئەوا لەڕووی قەزاوە تەڵاقەکەی دەکەوێت، چونکە پێویست بۆ کەسی ژیر ئەوەیە هیچ قسەیەك نەکات گەر مەبەستێك لە پشتییەوە نەبێت.

"الخطیب الشربیني" دەڵێت: (تەنها بە بوونی بەڵگەیەك بانگەشەی هەڵەی زمانی بە وتنی تەڵاق جێگەی باوەڕپێکردنە، بەهۆی پەیوەستبوونی ماف کەسانی تر پێیەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی لە ئاشکرای زاڵدا کەسی باڵغی ئاقڵ قسەیەك ناکات مەبەستێکی نەبێت)[2].

**زەیدییەکان:**

فەقیهانی زەیدی لەگەڵ جمهوور هاوڕان لەوەدا کە لەسەر قازی پێویستە بڕیار لە کەوتنی تەڵاقی هەڵەکار دەربکات گەر بەڵگەیەك بوونی نەبوو پاڵپشتی راستگۆیی بانگەشەکەی بکات لە هەڵەکەدا، "الصنعاني" دەڵێت: (ئەو قسەیەی لێ قبووڵ ناکرێت هەڵەی زمانی بووە مەگەر شوێنەکە ئەوە هەڵبگرێت ئەوەش بە بوونی بەڵگەیەك)[3].

---

(1) شرح الخرشي لابي عبدالله محمد الخرشي على مختصر خليل لابي ضياء سيدي خليل ٣٣/٤.

(2) مغني المحتاج للشيخ محمد الخطيب الشربيني ٢٨٧/٣. وورد نفس الحكم في نهاية المحتاج ٨٢/٦ . وفي الانوار ١٩٦/٢.

(3) التاج المنهب لاحكام المنهب للعلامة احمد بن قاسم العنسي اليماني الصنعاني ١٢٠/٢ وورد مثل ذلك في البحر الزخار ١٦٧/٣.هامش المنتزع المختار ٢٨٢/٢.

## لقی دووەم:
## تەڵاقی هەڵەکار نە لە ڕووی قەزاوە نە لەڕووی دیانەتەوە ناکەوێت

ئەم حوکمە مەزهەبی جەعفەری و زاهیری و ئیبازی و حەنبەلییەکانە.

**جەعفەرییەکان:**

دەڵێن: نە لەڕووی قەزاوە نە لەڕووی دیانەتەوە ناکەوێت، چونکە مەبەست(نیەت) لە مەرجەکانی دروستی تەڵاقە، لە هەموو سەرچاوە فیقهییە جەعفەرییەکاندا دووپاتی ئەوەیان کردۆتەوە، لەوانە ئەوەیە لە "إيضاح الفوائد"دا[1] هاتووە: (لە تەڵاقدەردا مەبەست بە مەرج دەگیرێت، بۆیە تەڵاقی لەبیرکەر و بێئاگا و هەڵەکار و بێ نیەت ناکەوێت، با بە ڕاشکاوانەش گوزارشتی لێ بکات، ئەوە لە هەڵەی زمانییەتی بەبێ مەبەست).

**زاهیرییەکان:**

بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەر نەکەوتنی تەڵاقەکەی لەڕووی قەزا و دیانەتەوە بە کۆمەڵێك بەڵگە گرنگترینیان:

١-ئایەتی: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُمْ بِهِ وَلَكِنْ مَا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ﴾[2]، هەڵەکار لە خستنی تەڵاقدا مەبەستی نەگرتووە.

٢-فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): ((کار و کردەوەکان بە نیەتن و بۆ هەر مرۆڤێك نیەتێك هەیە)) کەسی هەڵەکار نیەتی تەڵاقی نییە[1].

---

[1] ٢٩٢/٣. الروضة البهية ١٤٨/٢. والكافي ٦٢/٦.

[2] (ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ فَإِن لَمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُمْ بِهِ وَلَكِنْ مَا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً) (الأحزاب:٥).

٣–قەزلوەتی عومەری کوڕی خەتاب بە نەکەوتنی تەڵاقی هەڵەکار[٢].

**ئیبازییەکان:**

لە ئاشکرای قسەی ئیبازییەکاندا هەڵە لە ژنەکەدا کارناکاتە سەر دروستی تەڵاق بە پێچەوانەی دارشتنی گوزارەوە، هەڵە تیایدا لەڕووی قەزا و دیانەتەوە نەکەوتنی تەڵاق پێویست دەکات، لە "جوهر النظام"دا[٣] هاتووە:

والجد والهزل سواء ههنا　　　وكان بالصريح نطقا اعلنا
ومثله من أيقظته خدينته　　　بذلك ظن أن تلك الزوجة
فقال أنت طالق فتطلق　　　زوجة للقصد فيما ينطق
وليس كالوهم ولا كالغلط　　　فانه المرفوع دون شطط

**حەنبەلییەکان:**

لە ڕیوایەتێکی ئیمام ئەحمەددا بانگەشەی کەسەکە لە حوکم(قەزا)دا قبووڵ دەکرێت، مەگەر لە باری تووڕەبووندا یان دلوای تەڵاق لەلایەن ژنەکەوە[٤]، واتە بۆ قبوولکردنی بانگەشەکەی هەڵەبوونی بەلگەیەک پشتیوانی لێ بکات لەبەردەم قازیدا بە مەرج ناگیرێت، بەلکو نەبوونی بەلگەیەک بەرهەڵستی بکات وەک تووڕەبوون و تێنەگەیشتن لەیەکتر لەگەڵ ژنەکەی یان دلوای تەڵاقی ژنەکە بە مەرج دەگیرێت.

---

[١] العسقلاني ٨/١٤٤.
[٢] المحلى ١٠/٢٠٠.
[٣] ٢/٢١٩.
[٤] الانصاف ٨/٤٦٦. المغني والشرح الكبير ٨/٢٦٤.

## لقی سێیەم:
## تەڵاق لەرووی قەزا و دیانەتەوە دەكەوێت

ئەم رایە توندڕەوە یەكێكە لەو سێ ریوایەتەی لە مەزهەبی حەنبەلیدایە، كەسی هەڵەكار وەك كەسی شۆخیكەر تەماشا دەكات و لە قەزا و فتوادا تەڵاقەكەی دەخات، با بەڵگەیەكیش بوونی هەبێت ئاماژە بكات بۆ سەر راستی بانگەشەی هەڵەكەی، وەك ئەوەی ناوی ژنەكەی "الطاهرة" بوبێت و زمانی هەڵەبكات و بڵێت "طالقة" لە كاتێكدا ئەو دەیویست بە ناوی خۆی ناوی بهێنێت.

لە "الإنصاف"دا: (گەر ویستی بڵێت "طاهر" ئەوە زمانی هەڵەی كردووە، یان ویستی بڵێت "لە مێردەكەی پێشوو تەڵاقدراوە" كە پێش ئەو بووە تەڵاقەكە ناكەوێت، گەر بانگەشەی ئەوەی كرد دەچێتە گەردنی، دروست ئەوەیە كە مەزهەب و هاوەڵانی ئەحمەدی لەسەرە، هەروەها لە ئیمام ئەحمەدەوە: كەسەكە ناچێتە گەردنی[1]، ئیبن عەقیل لە هەندێ لە كتێبەكانیدا و "حەلوانی" گێڕاویانەتەوە: وەك شۆخیكەر وایە لە راستترین دوو ریوایەتدا.

ئەم ریوایەتە لە ئیمام ئەحمەدەوە كە ئیبن عەقیل و حەلوانی گێڕاویانەتەوە و تیایدا هەڵەكار بە شۆخیكەر دادەنرێت، ریوایەتێكی دوورە و لە دەرەوەی مەنتقی تەندروستی شەریعەتی ئیسلامەوەیە و بە توندڕەوییەك دادەنرێت لەگەڵ پلە و پایەی فیقهی ئیمامێكی مەزن وەك ئیمام ئەحمەددا(رەحمەتی خودای لێ بێت) پێكنایەتەوە، لەوانەشە بەناوی ئەوەوە داهێنرابێت.

---

[1] واتە تەنانەت بە بوونی نیمچەبەڵگەیەك بانگەشەی هەڵەكەی لەبەردەم قەزادا یان لەلای مفتی پشتڕاست بكاتەوە.

**ئەنجامگیری و پارسەنگدان:**

لەم واڵاکردنەی قسەی فەقیهانی موسڵمانەوە تایبەت بە حوکمی تەڵاقی هەڵەکار ئەم ئەنجامانە بەدەست دەهێنین:

١-جیاوازییەکە لە مێردێکی هەڵەکاردایە گوزارەی ڕاشکاوی لە تەڵاقدا بەکارهێناوە.

گەر گوزارەکە لە ناڕاشکاوەکان بوو بە کۆدەنگی ناتوانرێت حوکم بە کەوتنی تەڵاقەکەی بدرێت، چونکە ناڕاشکاو تەڵاقی پێ ناکەوێت مەگەر نیەتی لەگەڵ بێت، نیەتیش تەنها لە تەڵاقدەرەکەوە دەزانرێت کە بانگەشەی هەڵە دەکات لە بەکارهێنانی گوزارەکەیدا و ئەوە ڕەد دەکاتەوە.

٢-بنەڕەت لە قسەی یەکەمدا بریتییە لە کەوتنی تەڵاقی هەڵەکار گەر بەڵگەیەک پێچەوانەی ئەو بنەڕەتە ڕاستنەبێتەوە، چونکە کەسێکی باڵغی ئاقڵە و هەڵبژاردنی بۆ هەیە و گوزارەی ڕاشکاوی لە تەڵاقدا بەکارهێناوە.

٣-بنەڕەت لە قسەی دووەمدا بریتییە لە نەکەوتنی تەڵاقی هەڵەکار گەر بەڵگەیەک پێچەوانەی ئەوە ڕاست نەبێتەوە، چونکە بانگەشەی مانەوەی هاوسەرگیری دەکات و هەرئەوەش بنەڕەتەکەیە، و تەڵاق حوکمێکی پێشهاتی لابەلایە، گەر حوکمێکی شەرعی جێگیرکرا لەسەر قازی پێویستە حوکم بە مانەوەی بکات تا بەڵگەیەک پێچەوانەی ئەوە ڕاستدەبێتەوە.

٤-کارکردن بە قسەی سێیەم شەریعەتی ئیسلام ڕەدی دەکاتەوە کە بە ئایەتی: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾[1]، بانگ بۆ بەریەنی و ئاسانکاری دەکات.

---

[1] (وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِنْ قَبْلُ وَفِي هَذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيداً عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ هُوَ مَوْلَاكُمْ فَنِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ) (الحج:٧٨).

لە قەزاشدا پێویستە قازی حوکم بە نەکەوتنی دەربکات گەر بەڵگەیەك لەلای جێگیر بوو بانگەشەکەی بەڕاست دەردەکرد، ئەوەش لەبەر ئەم هۆیانە:

١- فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((خودا لە هەڵە و لەبیرچوون و زۆرلێکردنی ئومەتەکەم بووراوە))[1] واتە خودا حوکمی هەڵگرتووە لەسەر هەڵسوکەوتی گوفتاری کە لە مرۆڤ دەوەشێتەوە بە هەڵە و لەبیرچوون و زۆرلێکردن.

بەڵام لە هەڵسوکەوتە کردارییەکاندا کە زیانی بۆ کەسانی تر لێوە سەرهەڵدەدات لەڕووی مەدەنییەوە پرسیاری لێ دەکرێت(بۆ قەرەبووکردنەوە) بەڵام لەڕووی تاوانکارییەوە سزای نایەتە سەر، چونکە ئەوەی یەکەمیان لەسەر بنچینەی زیان بیناکراوە و دووەمیان لەسەر بنچینەی فەراهەمبوونی مەبەستی تاوانکارانە ئەوەش لەو سێ بارە باسکراوەدا بوونی نییە.

٢- هەروەها لەبەر ئەوەی تەڵاق بە دوایین هۆکارێك دادەنرێت پەنای پێ دەبرێت بۆ چارەسەر و بنبڕکردنی کێشەی خێزانی نێوان دوو هاوسەرەکە دوای بەکارهێنانی هەموو جۆرە هۆکارەکانی تر، کەوابوو بۆ پێویستی و زەرورەت دانراوە، بەوەش داوای مەبەست دەکرێت بۆ پڕکردنەوەی پێویستییەکە و هەڵگرتنی زیانەکە[2].

٣- هەروەها لەبەر ئەوەی هەڵەکە پەیوەندی بە ناوەوەی مرۆڤەوە هەیە و تەنها لە رێگەی خاوەنەکەیەوە دەزانرێت، لەوانەیە بانگەشەی ئەوە بکات مەبەستی تەڵاق نەبووبێت بەڵکو بە هەڵە بەسەر زمانیدا هاتووە، لەگەڵ ئەوەش کەسەکە لە بانگەشەکەیدا درۆ بکات، وەرگرتنی ئەوەی بانگەشەی دەکات و حوکم کردن پێی لەلایەن قازییەوە بە مەزنراگرتنی ئەوەیە خودا حەرامی کردووە.

---

[1] سنن ابن ماجه ٣٢٢/١. لە ریوایەتێکی تردا: هەڵە و لەبیرچوون و زۆرلێکردن لەسەر ئومەتەکەم هەڵگیراوە، لە ریوایەتێکی تردا: خودا لەسەر ئومەتەکەم... تا کۆتاییەکەی.

[2] قال ابن عباس الطلاق عن وطر أي حاجة. القسطلاني ١٤٥/٨.

بۆیە زەروورە بەڵگەیەك بوونی هەبێت نیشانە بێت بۆ راستی بانگەشەکەی تا قازی لە روانگەی ئەو بەڵگەوە حوکمی خۆی دەربکات.

٤-هەروەها لەبەرئەوەی ئاشکرای زاڵ ئەوەیە کەسی باڵغی ئاقڵ قسەیەك بە دەمیدا نەیەت مەبەستێکی تێیدا نەبێت.

شایانی باسە ئەو کەسەی گوزارەی تەڵاقی فێردەکرێت و بە دەمیدا دێت و ماناکەی نازانێت و لەوێشەوە تەڵاقەکەی ناکەوێت وەك ئەو کەسە وایە هەڵەکارە لە نەکەوتنی تەڵاقەکەیدا، چونکە هەرچەند مەبەستی هەیە لە وتنیدا بەڵام مەبەستی نییە لە ئاماژەکەی و ئەوەی تیایدا بەکاردەهێنرێت ، بۆیە دەبێتە ژاوەژاو.

# باسی شەشەم:
# تەڵاقی منداڵ

منداڵ یان جیاکەرەوەیە یان جیانەکەرەوە، فەقیهانی موسڵمان کۆدەنگیان هەیە حوکمی منداڵی جیانەکەرەوە وەك حوکمی شێت وایە لەوەی لەسەریەتی لە هەڵسوکەوتی گوفتاری و کرداری، ئەو لە خودی خۆیدا حیجری لەسەرە، بینا لەسەر ئەوە تەڵاقەکەی بە رێکەوتنی هەمووان ناکەوێت.

بەڵام تەڵاقی منداڵی جیاکەرەوە لەمەڕ دروستییەکەی فەقیهان بۆ دوو قسە دابەش بوون:

**یەکەم**–کە رای زۆرینەیە– تەڵاقەکەی دروست نییە، حەنەفییەکان و مالیکییەکان لە مەشهووریاندا و شافیعییەکان و حەنبەلییەکان لە ریوایەتێکیاندا و جەعفەرییەکان لە بەناوبانگترین و بەهێزترین بۆچوونیاندا و زەیدییەکان و زاهیرییەکان هەمان رایان هەیە.

**دووەم**–ئەوەش ئەوەیە کەمینەیەك لە فەقیهان هەڵیانبژاردووە– تەڵاقەکەی دروستە گەر لە ئیحتیلام(باڵغبوون) نزیك بوویەوە و ئەوەی زانی تەڵاق واتە کۆتاهێنانی پەیوەندی هاوسەری، ئەوەش قسەیەکی نامەشهووری مالیکییە و ریوایەتێکی مەشهووری حەنبەلییەکان و یەکێك لە ریوایەتەکانی جەعفەرییەکانە، هەر بەوەش زەیدییەکان دەڵێن لەڕووی دیانەتەوە دەکەوێت نەك لەڕووی قەزاوە.

دیدگای دوو دەستەکە بەسەر دوو لقدا دابەش دەکەین:

## لقی یەکەم:
## وتنی نادروستی تەڵاقی منداڵی جیاکەرەوە

وتـنی نادروسـتی تـەلاقی منـداڵی جیاکـەرەوە ئەوەیـە رای جمهـووری لەسـەر دامەزراوە، چونکە تەلاق گەر هەڵسوکەوتێکی زیانبەخشی رووتیش نەبێت ئەوا لە هیچ روویەکەوە ناتوانرێت بە سوودبەخشی رووت دابنرێت، بۆیە بە دروست دانانرێت، وەك لەم رۆشنکردنەوەیەدا:

**حەنەفییەکان:**

دەڵـێن: تـەلاقی منـداڵ ناکـەوێت بـا مێردمنـداڵیش بێـت، چـونکە لـە دەروازەی هەمووەکییەکانی شەریعەتی ئیسلام هەڵسوکەوتی ناکامی(باڵغ نەبوو) زیانبەخش بـە زیانبەخشینێکی رووت بە پووچ دادەنرێت، هەروەها جێبـەجێ کردنـی هەڵسـوکەوتە سوڕخواردووەکان لە نێوان قازانج و زیاندا لەسەر مۆڵەتی ئەو کەسـە وەسـتاوە مـاف مۆڵەتدانی هەیە، بەوەی لە خودی خۆیدا لەو کەسانە بێت مافی دەستبردنی بۆ کـاری خۆی هەبێت، کاتێك سەرپەرشتیار یـان وەسـێتدار راسـتەوخۆ مـافی تەلاقـدانی نییـە کەوابوو تیایدا مافی مۆڵەتیشی نییە.

بینا لەسەر ئەوە تەلاقی منداڵ بەر لە بـاڵغبوونی پووچـە بـا لـەدوای بـاڵغبوونیش مۆڵەتی پێبدرێت یان سەرپەرشتیار مۆڵەتی بدات.

"السرخسي" دەڵێت: (خولعی منداڵ و تەلاقی پووچە، مەبەستێکی بەهەندگیراوی لەڕووی شەرعەوە نییە، بەتایبەت لەو شتانەی زیانی پێدەگەیەنێت)[1].

"ابن الهمام" دەڵێت: (تەلاقی منداڵ ناکەوێت با ژنەوتنیشی هەبێت)[2].

---

[1] المبسوط للسرخسي ٦/١٧٨.

[2] شرح فتح القدير لابن همام ٣/٤٧٨.

لە "تنوير الأبصار" و شەرحەکەیدا: (تەڵاقی منداڵ ناکەوێت با مێردمنداڵیش بێت یان لەدوای باڵغبوون مۆڵەتی پێ بدرێت، چونکە لە کاتی کەوتنی تەڵاقەکەیدا بە پووچی کەوتووە، پووچیش رێگەی پێنادرێت)[1].

**مالیکییەکان:**

مەشهوور لە ئیمامی مالیکەوە منداڵ تەڵاقەکەی جێبەجێ ناکرێت تا باڵغ دەبێت، هاوەڵانی کاریان بەمە کردووە[2].

**شافیعییەکان:**

باڵغبوون و ئەقڵ لەلایان لە مەرجەکانی دروستیی تەڵاقن بە یەك دەنگ- ئەوەندەی من لێی بەئاگام- لە "الأنوار"دا هاتووە: (تەڵاقی منداڵ تێپەڕێنراو بێت یان پەیوەست ناکەوێت لەسەر دوای باڵغبوون با مێردمنداڵیش بێت)[3].

لە "الوجيز"دا: (تەڵاقدەر بریتییە لە هەر دلوالێکراوێك و تەڵاقی منداڵیش ناکەوێت)[4].

**حەنبەلییەکان:**

ریوایەتی مەشهوور لە ئیمام ئەحمەدەوە تەڵاقی ناباڵغ ناکەوێت[5].

**جەعفەرییەکان:**

لە بەناوبانگترین و بەهێزترین ریوایەتیاندا تەڵاقی منداڵی جیاکەرەوە دروست نییە، هەموو پاشینەکان لە فەقیهانی جەعفەری لەسەر ئەوەن، لە "الروضة البهية"دا: (تەڵاقی منداڵ دروست نییە با سەرپەرشتیارەکەش مۆڵەتی دابێت، یان تەمەنی

---

[1] تنوير الابصار وشرحه الدر المختار مع حاشية ابن عابدين رد المحتار ٢٤٣/٣.

[2] شرح الخرشي ٣١/٤.

[3] الانوار للاردبيلي ٩٣/٢.

[4] الوجيز للغزالي ٥٣/٢. ومثله نهاية المحتاج ١١٤/٦.

[5] المغني والشرح الكبير ٢٥٧/٨. الانصاف ٤٣١/٨ وما بعدها.

گەیشتبێتە دە ساڵ لە راسترین قسەدا)[1]، لە "المختصر النافع"دا: (پایەی یەکەم بریتییە لە تەڵاقدەر، باڵغبوون و ئەقڵ و هەڵبژاردن و مەبەستی بۆ بە مەرج دەگیرێت)[2].

**زەیدییەکان:**

دوو را بۆ فەقیهانی زەیدی هەیە: یەکەمیان دروست نییە با جیاکەرەوەش بێت یان سەرپەرشتیارەکەی مۆڵەتی دابێت، لە "التاج المذهب"دا: (لە منداڵەوە دروست نییە با جیاکەرەوەش بێت، یان سەرپەرشتیارەکەی لەو کارەدا مۆڵەتی پێدابێت)[3].

لە "البحر الزخار"دا: (لە منداڵەوە دروست نییە گەر قەڵەمی لەسەر هەڵگیرا بێت، بۆیە حوکم بۆ گرێبەستەکانی نییە)[4]

**زاهیرییەکان:**

لای زاهیرییەکان تەڵاق بۆ منداڵ نییە، چونکە هاوسەرگیری بۆ نییە، ئەوان دەڵێن بۆ باوك و کەسانی تریش دروست نییە ژن بۆ منداڵی نێر بهێنن تا باڵغ دەبێت، گەر ئەو کارەی کرد پووچ بووەتەوە[5].

یاسای باری کەسێتی عێراقی راستکراوە[6] باڵغبوون بە مەرجی پێویستی هاوسەرگیری دادەنێت نەك بە دروستییەکەی.

لەم والأکردنەوە بۆمان روون دەبێتەوە گرنگترین بەڵگەی جمهوور لەسەر نادروستی تەڵاقی منداڵی جیاکەرەوەیە، ئەوەش چونکە تەڵاق هەڵسوکەوتێکی

---

(1) الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية ٢/١٤٨.

(2) المختصر النافع ص٢٢١.

(3) التاج المذهب ٢/١١٩.

(4) البحر الزخار ٣/١٦٥.

(5) المحلى لابن حزم الظاهري ٩/٤٦٢.

(6) مادەی (٧) لێوەشاوەیی هاوسەرگیری بە بوونی ژیری و تەولوکردنی هەژدە ساڵ لە تەمەن داناوە، مادەی(٨) رێگەیداوە بە ئەو کەسانەی پازدەیان تەولوکردووە وەك هەڵواردن.

ترسناکە و تەنها بۆ زەرورەت دەستی بۆ درێژدەکرێت، پاشان گەر ئەو هەڵسوکەوتانەی لە نێوان قازانج و زیاندا دەخولێنەوە جێبەجێ نەکرێن ئەوا لە دەروازەی لەپێشترە تەڵاقەکەشی دروست نەبێت، لای جمهووری فەقیهانی موسڵمان مۆڵەتی سەرپەرشتیار کاریگەری نییە، چونکە شایستەیی ئەوەی نییە، لە کاتێکدا ناتوانێت بە خودی خۆی دەست بۆ کارەکە ببات.

## لقی دووەم:
## وتنی دروستی تەڵاقی منداڵ

ئەم ئاراستەیە وەك باسمان کرد قسەیەکی نامەشهوورە لای مالیکییەکان و ریوایەتێکی مەشهووری حەنبەلییەکان و یەکێکە لە ریواتەکانی جەعفەرییەکان و زەیدییەکانیش لەسەر ئەوەن لەڕووی دیانەتەوە نەك لەڕووی حوکمەوە:

**مالیکییەکان:**

تەڵاقی منداڵ دروستە گەر لە ئیحتیلام(باڵغبوون) نزیکبووبوویەوە لە قسەیەکی نامەشهووری ئیمامی مالیکدا(رەحمەتی خودای لێ بێت)، لە "بدایة المجتهد"دا: (تەڵاقی منداڵ مەشهوور لای ئیمامی مالیك پێیەوە پەیوەست نییە تا باڵغ دەبێت، لە "مختصر ما ليس في المختصر"دا دەڵێت: پێیەوە پەیوەستە گەر لە ئیحتیلام(باڵغبوون) نزیك بوویەوە)[1]

**حەنبەلییەکان:**

مەشهوور لەلای ئەوان منداڵ کە تەڵاق دەژنەوێت و دەزانێت بە تەڵاق ژنەکەی لێ جیادەبێتەوە و لەسەری حەرام دەبێت تەڵاقەکەی جێبەجێ دەکرێت، ئەمە لە

[1] بداية المجتهد ونهاية المقتصد ٢/٦٧.

زۆرترین ریوایەتەکانە لە ئیمام ئەحمەدەوە و هەڵبژاردەی "الخرقي وابن حامد" و کەسانی تریشە لە هاوەڵانی[1].

"المردلوي" دەڵێت: (ئەوە دروستە لە مەزهەبەکەدا و جمهووری هاوەڵانیشی(هاوەڵان لە مەزهەب) لەسەرە و هەر ئەوەش لە ئیمام ئەحمەدەوە بە دەق وەرگیراوە)[2].

لەسەر ئەم هەڵبژاردنە چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە، گرنگترینیان:

١-گشتاندنی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((إن الطلاق لمن أخذ بالساق-تەڵاق بۆ ئەو کەسەیە دەست دەبات بۆ لاق))[3] ئەو منداڵەش دەگرێتەوە لە تەڵاق تێدەکات.

٢-جیانەکردنەوەی منداڵ لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((هەموو تەڵاقێك رێگەپێدراوە جگە لە تەڵاقی بیرکۆڵ(المعتوه) کە بەسەر ئەقڵیدا زاڵ بووبێت)[4] .

٣-قسەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالب-خوا لێی رازی بێت-: (هاوسەرگیری لە منداڵ بشارنەوە) واتە: تا منداڵ تەڵاق نەخات دوای ئاگاهی بە هاوسەرگیری.

٤-هەروەها لەبەر ئەوەی تەڵاقی ئەو کەسەی ئەقڵی هەیە و تێدەگات جێگەی خۆی دەگرێت وەك تەڵاقی باڵغ، "سعيد بن المسيب وعطاء والحسن والشعبي واسحاق" و کەسانی تریش ئەم رایەیان هەڵبژاردووە.

---

(1) الميزان الكبرى للشعراني ١٠٤/٢. ابن عابدين المرجع السابق ٢٤٣/٣.

(2) الانصاف للعلامة المردأوي ٣١/٨وما بعدها.

(3) (عَنْ عِكْرِمَةَ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ:پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی ئەی پێغەمبەری خودا گەورەکەم کەنیزەکەکەی خۆی لێ مارەکردووم ئێستا ئەو دەیەوێت لە یەکترمان جیابکاتەوە، دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) چووە سەر مینبەر و فەرمووی: خەڵکینە یەکێك لە ئێوە کەنیزەکەکەی لە بەندەکەی مارە دەکات پاشان دەیەوێ لە یەکتریان جیابکاتەوە) (ابن ماجة: ٢٠٧٢)

(4) الترمذي: ١١١٢

**جەعفەرییەکان:**

رایەکی نامەشهوور بۆ فەقیهە جەعفەرییەکان هەیە لەمەڕ دروستی تەڵاقی منداڵ گەر گەیشتە دە ساڵان و بەرەوژوور، لە "مستدرك الوسائل"دا: (بۆ دروستی تەڵاق باڵغبوون بە مەرج دەگیرێت، بۆیە تەڵاقی منداڵ دروست نییە مەگەر گەیشتبێتە تەمەنی دە ساڵان)[1].

لە "إيضاح الفوائد"دا: (تەڵاقی منداڵ دروست نییە با جیاکەرەوەش بێت و گەیشتبێتە تەمەنی دە ساڵان، مەگەر لەسەر ریوایەتێکی لاوان)[2].

**زەیدییەکان:**

هەندێ لە فەقیهە زەیدییەکان بۆ ئەوە دەچن تەڵاقی منداڵ دروست بێت گەر دوازدە ساڵ لە تەمەنی تەولو کردبێت، ئەوکاتە لەڕووی دیانەتەوە دەکەوێت، نەک لەڕووی قەزاوە، واتە بۆ قازی نییە حوکم بە کەوتنی بکات، بەڵام لە نێوان ئەو و خودادا دەکەوێت)[3].

**پارسەنگدان:**

لەم واڵاکردنەوە وا دەردەکەوێ ئەو رایەی باشترە کاری پێ بکرێت ئەوەیە جمهووری فەقیهانی موسڵمان بۆی دەچن لە دروستنەبوونی تەڵاقی هەر مرۆڤێك کە باڵغ و ئاقڵ نییە، ئەوەش لەبەر ئەم هۆیانە:

١- تەڵاق کارێکی ترسناکە لەسەر هەردوو ئاستی خێزان و کۆمەڵگە، بۆیە پێویستە بە جێبەجێکرلو دانەنرێت مەگەر لە کەسێکەوە ئەو ترسناکییە پەی پێ ببات بەوەی خاوەنی لێشاوەییەکی کامڵ و ژیرییەکی پێگەیشتوو بێت.

---

(1) مستدرك الوسائل ومستنبط المسائل الباب (١١) ٣/٤.

(2) ايضاح الفوائد ٣/٢٩١.

(3) الروض النضير ٤/١٥٥وما بعدها.

٢-زۆرێك لە دەقی فەرموودەی پێغەمبەری مەزن(ﷺ) بوونی هەیە ئاماژە بە نادروستی تەڵاقی منداڵ دەکات بەبێ جیاوازی جیاکەرەوە لە جیانەکەرەوە، لەوانە لە ئیبن عەباسەوە: فەرمووی: ((تەڵاقی منداڵ و ئازادکردن و وەسێت و کڕین و فرۆشتن و هەر شتێکی تری منداڵ دروست نییە))[1]، هەروەها: ((قەڵەم لەسەر منداڵ هەڵگیراوە تا پەیدەبات(تێدەگات)))[2]، لە ڕێسا ڕاگەیەنراوەکانی زانستی ئوسوڵ: (ڕەها بە ڕەهای خۆی دەمێنێتەوە گەر بەڵگەیەك جێگیر نەبێت سنوورداری بکات) هیچ بەڵگەیەك بوونی نییە.

٣-هەڵسوکەوتی داراییانەی زیانبەخشی منداڵ پووچە، هەڵسوکەوتەکانی سورخواردوو لە نێوان قازانج و زیاندا جێبەجێ ناکرێن مەگەر بە مۆڵەتی ئەو کەسەی مۆڵەتی بۆ هەیە، لە دەروازەی لەپێشترە تەڵاقەکەی پووچ بێت، چونکە ترسناکتر و گرنگترە لە پرسە داراییەکان.

٤-گەر پێویستییەك بوونی هەبوو داوای دەکرد کۆتایی بە پەیوەندی هاوسەرگیری بهێنرێت لە نێوان منداڵەکە و ژنەکەیدا، پێویستە بۆ جیاکردنەوەیان پەنا ببرێت بۆ قەزا.

---

[1] الدارمي: ٣١٦١

[2] القسطلاني شرح صحيح البخاري ١٤٥/٨.

# باسی حەوتەم:
# تەلآقی شێت و گێل

فەقیهانی موسڵمان کۆدەنگیان هەیە لەسەر دروستنەبوونی تەلآقی شێت گەر لە کاتی شێتێتیدا تەلآقی خست، هەر بەو جۆرە هاوڕان لەسەر دروستی تەلآقەکەی گەر شێتێتییەکەی ناوبەناو بوو و لە کاتی چاکبوونەوەدا تەلآقی خستبوو و هەموو پایەکان و مەرجەکانی تری تەلآقی تێدا فەراهەم بووبێت[1].

بەلآم لەسەر تەلآقی گێل جیاوازیان هەیە[2]، جمهوور لەسەر دروستی تەلآقی گێلن، هەنێکیش دەڵێن دروست نییە، بەپێی ئەم درێژەپێدانە:

**حەنەفییەکان:**

دەڵێن: تەلآقی کەسی گێل دەکەوێت با حیجریشی لەسەر بێت، چونکە لەو هەڵسوکەوتانە نییە قابیلی هەڵوەشانەوە بێت، وەك فرۆشتن و شتانی تر کە لەسەر مۆڵەتی سەرپەرشتیار وەستاون، لە "الفتاوى الهندية"دا: (ئەو مامەلآنەی قابیلی هەڵوەشانەوە نین وەك هاوسەگیری و تەلآق حیجر کاریگەری نییە لەسەری)[3]، لە

---

(1) ینظر: المبسوط ٦/١٧٨، المجموع شرح المهذب ١٥/٣٨٣، الانصاف ٨/٤٣٢، والقسطلاني ٨/١٤٤، الروضة البهية ٢/١٤٨، الميزان الكبرى ٢/١٠٤، ایضاح الفوائد ٣/٢٩١، البحر الزخار ٣/١٦٥.

(2) گێلی کەمئەقڵییەکە مرۆڤ هەڵدەنێت بۆ ئەنجامدانی کارێك بە پێچەوانەی داخوازی ئەقڵەوە، ئەو کەم ئەقڵییە هۆیەکە بۆ حیجردانان لەسەری لەلای جمهوور(شافیعی و حەنبەلی و مالیکی و جەعفەری و زەیدی و دوو هاوەڵەکەی ئەبی حەنیفە) ئەبو حەنیفە(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: حیجری لەسەر دانانرێت چونکە پارێزگاری لە کەرامەتی(رێز و پلە و پایە) مرۆڤ گرنگترە لە پارێزگاری لەماڵەکەی، زاهیرییەکان "السفه-گێلی" بەو مانایەی فەقیهان بۆیدەچن رەد دەکەنەوە و هەموو جۆرە دەسەلآتێك بەو کەسە دەدەن فەقیهان بە گێلی ناودەبەن.

(3) الفتأوى الهندية ٥/٦١.

"تنوير الأبصار"دا: (تەڵاقی هەر مێردێکی باڵغی ئاقڵ دەکەوێت با زۆرلێکراو یان شۆخیکەر یان گێلیش بێت)[١].

**مالیکییەکان:**

فەقیهانی مالیکی کۆدەنگیان هەیە لەسەر کەوتنی تەڵاقی گێل، یەکسانە حیجری لەسەر بێت یان نە، لە "الشرح الكبير"دا: (تەڵاقی باڵغی ئاقڵ دەکەوێت با گێلیش بێت)[٢].

لە "الشرح الصغير"دا: (تەڵاق لە موسڵمانێکی داوالێکراوەوە دروستە با کەسێکی گێلیش بێت)[٣].

**شافیعییەکان:**

دەڵێن: لەبەر ئەوەی گێل داوالێکراوە تەڵاقەکەی دروستە، لە "مغني المحتاج"دا: (لە گێل و نەخۆشەوە دروستە لەو سۆنگەیەوە کە لە داوالێکراوانن)[٤].

**حەنبەلییەکان:**

دەڵێن: حیجر لەسەر کەسی گێل کاریگەری نییە لەسەر دروستی تەڵاقەکەی، چونکە حیجر تایبەتە بە ماڵ و سامانەکەی.

"ئیبن قدامة" دەڵێت: (حیجر لەسەر ماڵەکەی ڕێگری لێ ناکات لە هەڵسوکەوتەکانی لە شتانێکی تردا جگە لەوەی حیجری خراوەتە سەر)[٥].

---

[١] تنوير الابصار مع حاشية ابن عابدين ٢/٥٧٩ وما بعدها.

[٢] الشرح الكبير للدردير ٢/٣٦٥.

[٣] الشرح الصغير مع حاشية الصأوي ١/٤١٨.

[٤] مغني المحتاج للشربيني ٣/٢٧٥.

[٥] المغني والشرح الكبير ٨/٢٥٩.

**زاهیرییەکان:**

فەقیهانی زاهیری بوونی مرۆڤێك لە دیدگای ئیسلامەوە بەو مانایەی فەقیهانی موسڵمان دەیڵێن رەد دەکەنەوە، ئەوان دەڵێن قورئان گوزارەی گێلی بەکارنەهێناوە مەگەر بۆ کەسانێك باوەڕیان بەو حوکمانە نەبێت لە قورئاندا هاتوون[1].

**جەعفەرییەکان:**

هاوسەرگیری کەسی گێل لەلایان -بەبێ مۆڵەتی سەرپەرشتیار- دروست نییە، بۆیە لەسەریەتی مارەیی و ژنەکە دیاریبکات، گەر بەبێ مۆڵەتی سەرپەرشتیار کەسی گێل هاوسەرگیری کرد گرێبەستەکە لەسەر مۆڵەتی سەرپەرشتیارەکە دەوەستێت، بەلاّم تەلاّقی دەکەوێت گەر پێویست نەبوو بۆ پابەندبوونی دارایی[2]، لەمەوە تێدەگەین گەر پابەندبوونی دارایی لەسەر پەیدا بوو تەلاّقەکەی ناکەوێت، بەلاّم راشکاوانە لە سەرچاوە فیقهییە جەعفەرییەکاندا چاوم پێینەکەوتووە.

**زەیدییەکان:**

لە کۆی ئەوەی لە "البحر الزخار"دا هاتووە: (هەڵسوکەوتەکان(تصرفات)ی حیجر لەسەر دانراو بە هۆی گێلێتییەوە پووچە)[3] تێدەگەین: تەلاّقی کەسی گێل دروست نییە، چونکە وشەی "تصرفات" بریتییە لە "جمع مضاف" بەوەش لە گوزارە گشتییەکان دادەنرێت، گشتیش هەڵدەدرێتە سەر گشتاندنەکەی گەر تایبەتکەرێك بوونی نەبێت، کە من ئەو تایبەتکەرەم نەبینییەوە.

**پارسەنگدان:**

وا دەبینم جیاوازی بکرێت لە نێوان تەلاّقێك پابەندبوونی دارایی لەسەر پەیدا دەبێت لەگەڵ جگە لەو تەلاّقە، دروستنەبوونی لە باری یەکەمدا لەبەر ئەم هۆیانەیە:

---

[1] لمزيد من التفصيل يراجع المحلى لابن حزم ٨/٢٥٩.

[2] العروة الوثقى ٢/٣٩٢.

[3] البحر الزخار ٥/٩٢.

١-گێلی حیجر لەسەر دانرلو حوکمی منداڵی جیانەکەرەوەی هەیە، ئەوەی دووەمیان لەلای جمهوور تەڵاقی دروست نییە، بۆیە پێویستە هەمان حوکم بەسەر یەکەمیشدا گوزەر بکات.

٢-فەقیهانی شافیعی[1] و جەعفەری[2] لەسەر دروستنەبوونی هاوسەرگیری "گێلی حیجر لەسەر دانراو"ن، هەروەها لەسەر جیاکردنەوەن لە نێوان هاوسەرگیری و تەڵاقێك کە پابەندبوونی دارایی لەسەر پەیدا دەبێت، ئەوەش حوکمدان و پارسەنگانێکە بەبێ پارسەنگدەر.

٣-هەڵسوکەوتی زیانبەخشانەی کەسی گێلی حیجر لەسەردانراو پووچە، ئەو هەڵسوکەوتانەش لە نێوان قازانج و زیاندا سوردەخۆن جێبەجێ کردنیان لەسەر مۆڵەتی سەرپەرشتیار وەستاوە، تەڵاقیش گرنگی و ترسناکی لە پرسە داراییەکان کەمتر نییە.

٤-گەر زەروورەتێك هەبوو بانگی بۆ تەڵاق دەکرد با ئەو کارە لە رێگەی قەزاوە تەولو بکرێت.

(١) الانوار (٢/٩٣). وفیە (گێلی حیجر لەسەر دانرلو بە مۆڵەتی سەرپەرشتیار هاوسەرگیری دەکات و جگە لەوە پووچە).

(٢) ایضاح الفوائد (٣/١٨). وفیە: (گەر بەبێ مۆڵەتی سەرپەرشتیار هاوسەرگیری کرد بە تێکچوو دادەنرێت).

# باسی هەشتەم:
# تەلاقی کەسی نەخۆش بە نەخۆشی مردن

نەخۆشی مردن: ئەو نەخۆشییە بەزۆری سەردەکێشێت بۆ مردن و مردن بەدوای خۆیدا دەهێنێت[1].

هەموو ئەو کارانەی لە حوکمی ئەودان دەبنە پاشکۆ بۆی: وەك حوکمی لە سێدارەدان کاتێك جێبەجێکردنی تەواو بوویێت، یان وەك ئەو حاڵەتەی تیاچوون لە هاونموونەیدا زاڵە گەر لەو حاڵەتەدا بمرێت[2].

جیاوازی لەوەدا نییە تەلاقی نەخۆش لەباری وڕێنەدا ناکەوێت[3] .

جیاوازی نییە[4] لە کەوتنی تەلاقی نەخۆشدا گەر لە کاتی تەلاقداندا پەیبردنی کامڵ و هەستی تەواوی هەبوو.

جیاوازی نییە لەوەدا تەلاقی رجعی رێگر نییە لە میراتگری لە نێوان دوو هاوسەرەکەدا گەر یەکێك بەر لە کۆتاهاتنی عیدەکە مرد، چونکە تەلاقدراو بە تەلاقی رجعی لە حوکمی هاوسەریدایە[5].

---

(1) یراجع استاذنا الشیخ عبد الرحیم الکشکي، المیراث المقارن ص ٨٣.

(2) تنویر الأبصار وشرحه الدر المختار مع حاشیة ابن عابدین ( ٣٨٣/٣). وفیه: (هەر کەس تیاچوون زاڵ بوو بەسەر حاڵیدا بەهۆی نەخۆشی یان شتێکی ترەوە بەوەی نەخۆشییەك پەکی بخات و وای لێ بکات نەتوانێت هەستێت بە راپەڕاندنی بەرژەوەندییەکانی لە دەرەوەی ماڵ یان مەیدانبازی کرد لەگەڵ پیاوێك بەهێزتر لەخۆی یان برا بۆ ئەوەی لە تۆڵەدا بکوژرێتەوە یان رەجم بکرێت ئەوە بە تەلاقەکەی هەڵدێت).

(3) الشرح الصغیر مع الصاوي ٤١٨/٢.

(4) واتە جیاوازییەك نابینرێتەوە جێگەی گرنگییدان بێت، ئەگەر رای شاز هەیە بەرەهایی تەلاقی نەخۆش بە کەوتوو دادەنێت، یاسادانەرێ عێراقی لە (م٣٥)ی یاسای باری کەسێتیدا دەستی بۆ بردووە)

(5) المغني لابن قدامة ٣٣٩/٦.

جیاوازی لەوەدا نییە تەڵاقی بائین لەباری لەشساغیدا(تەندروستیدا) پەیوەندی هاوسەری کۆتایی پێ دەهێنێت، بۆیە لە کاتی عیدەدا گەر یەکێکیان مرد میراتگرتن بوونی نییە.

بەڵکو جیاوازی لە میراتی تەڵاقدراوی پیاوی نەخۆشدایە بە نەخۆشی مردن گەر لە نەخۆشییەکەیدا بە تەڵاقی بائین ژنەکەی تەڵاقدا.

فەقیهانی موسڵمان لەم پرسەدا چوار قسەی سەرەکیان[1] هەیە:

یەکەم: بەرەهایی میرات نابات، دووەم: بەرەهایی میرات دەبات، سێیەم: میراتی لێ دەبات گەر عیدەکەی تەولو نەبووبوو، چوارەم: میرات دەبات گەر مێردی نەکردبوو.

خستنەرووی ئەم چوار قسەیە بەسەر چوار لقدا دابەش دەکەین:

---

[1] ابن حزم في المحلى (١٠/٢١٨- ٢٢٤): کۆمەڵێك قسەی تر دەگوێزێتەوە ئەو قسانە بەناوبانگ نین بۆیە پشتگوێم خستن.

## لقی یەکەم:
## بەرهەڵیی میرات ناگرێت

لای زاهیرییەکان و زەیدییەکان و قسەیەکی شافیعی: تەڵاقدراوی پیاوی نەخۆش بە نەخۆشی مردن–گەر کەوتنی تەڵاقەکەی بە تەڵاقی بائین جێگیربوو– ئەوا ژنەکە میراتی لێ ناگرێ لە بارێکدا دوای تەڵاقەکە پیاوەکە مرد، با مەبەست خراپی پیاوەکەش لە تەڵاقەکەدا سەلمابێت، بەوەی خۆی بدزێتەوە لە میرات پێدانی و بیەوێت بێبەشی بکات لە میراتەکەی لەدوای هەستکردنی بە ترسی مردن.

گرنگترین بەڵگەیەك ئەوانە شانیان لەسەر دادابێت لە میرات نەگرتنی تەڵاقدراو بە تەڵاقی کۆتایی لەلایەن پیاوی نەخۆشەوە بریتییە لە: نەمان(تیاچوون)ی هۆی میرات(واتە هاوسەرگیری) بەهۆی تەڵاقە بائینەکەوە، بۆیە میراتگرتنی تەنها رایەکی ئیجتیهادییە و بە ئاشکرای دەقدا دەکێشێت، تیاچوونی هۆیەکە تیاچوونی هۆکارەکەی پێویست دەکات، وەك لەم رۆشنکردنەوەیەدا:

### زاهیرییەکان:

ئیبن حەزم دەڵێت: (تەڵاقی نەخۆش وەك تەڵاقی لەشساغ(تەندروست) وایە، جیاوازی نییە، بەو نەخۆشییە بمرێت یان نەمرێت، گەر تەڵاقی نەخۆشەکە سێ بوو، یان سێیەمین تەڵاقی بوو، یان بەر لەوەی بچێتە لای مرد یان ژنەکە بەر لە تەواوکردنی عیدە یان دوای تەواوکردنی مرد، یان تەڵاقەکە رجعی بوو تا مرد نەیگێڕایەوە، یان ژنەکە بەر لە تەواوکردنی عیدە مرد[1]: لە هیچ شتێك لەمانەدا ژنەکە میرات لە پیاوەکە ناگرێت و پیاوەکە میرات لە ژنەکە ناگرێت، هەر بەو جۆرە تەڵاقی

---

[1] لە قسەی زاهیرییەکانەوە وا دەردەکەوێت تەڵاقی بائین لە لایان لە سێ شێوەدا کورتدەبێتەوە: تەواوبوونی سێ تەڵاقەکە، تەڵاق بەر لە چوونە لا، و تەڵاقی رجعی لەدوای کۆتاهاتنی عیدە.

کەسی لەشساغ بۆ ژنە نەخۆشەکەی، و تەڵاقی پیاوی نەخۆش بۆ ژنە نەخۆشەکەی هیچ جیاوازی نییە)[1].

ئیبن حەزم قسەی ئەو کەسانەی لەسەر میراتگرتنی تەڵاقدراو لە پیاوی نەخۆش بە تەڵاقی بائین بە پێچەوانەی قورئان دەزانێت و بەرپەرچیان دەداتەوە و دەڵێت: (تەڵاقدەری نەخۆش بە نەخۆشی مردن هەگیز لە کتێبەکەی خودا هەڵنەهاتووە، بەڵکو دەستی بە کتێبی خوداوە گرتووە و شوێنی کەوتووە، چونکە خودا تەڵاقی موباح کردووە، و بە سیان براندوویەتەوە، هەروەها بە تەڵاق پێش چوونە لا هەموو مافەکانی هاوسەری لە خەرجی، هەروەها موباحکردنی چوونە لا، و میراتگری کۆتاپێهێناوە.

بۆیە لێرەدا هەڵهاتن لە کتێبەکەی خودا بوونی نییە، بەڵکو هەڵهاتن لە کتێبەکەی خودا بریتییە لە میراتگرتنی ئافرەتێك کە ژنی پیاوەکە نییە، ئیتر چۆن دروستە کەسێك بە هاوسەری میرات ببات گەر پیاوەکە لەو کاتەدا بچێتە لای رەجم دەکرێت، یان کەسێك بۆی دروستە مێرد بە پیاوێکی تر بکات، یان کەسێك ژنی پیاوێکی ترە.. ئەمە بەبێ هیچ گومانێك پێچەوانەی کتێبەکەی خودایە)[2].

ئەم ئاراستەیە ئەوەیە فەقیهانی زاهیری بە کۆدەنگی لەسەری دامەزراون.

**زەیدییەکان:**

فەقیهانی زەیدی لەگەڵ زاهیرییەکان لە بەڵگەکاندا هاوڕان لەوەی بۆیدەچن لەمەڕ میراتگرتنی تەڵاقدراوی پیاوی نەخۆش، دەڵێن: قورئان هۆی میراتگرتنی دوو هاوسەرەکەی لە هاوسەرگیری راستەقینە یان حوکمی دروستی راوەستاودا کورتکردۆتەوە، ئەوەش بە تەڵاقی بائین هەڵدەگیرێت، بۆیە دروست نییە بەڵگە بە قەزاوەتەکەی عوسمان بهێنرێتەوە، چونکە قسەی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) نابێتە

[1] المحلى لابن حزم الظاهري ١٠/٢١٨.

[2] المرجع السابق ١٠/٢٢٤.

بەڵگەی یەكلاكەرەوە، هەر بەو جۆرە بەڵگە بە پێوانەش ناهێنرێتەوە لەبەر فەراهەم نەبوونی رەگەزەكانی.

لە "الروض النضير"دا هاتووە: (ئایەتی: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ﴾ ئەوە دەگەیەنێت میراتگری بە هاوسەرییەوەیە، تەلاقی بائین ئەو هاوسەرییە دەبڕێت، میراتگری بەبێ هاوسەری بوونی نییە، میراتدان لە لایەن عوسمانەوە بە "تماضر" ژنەكەی "عبدالرحمن بن عوف" رای هاوەڵێكی پێغەمبەرە(ﷺ) و بەڵگەی یەكلاكەرەوەی تێدا نییە، پێوانەكردنی بۆ سەر بكوژ دروست نییە، چونكە هۆی كوكەرەوە بریتییە لە مامەڵە بە دژی مەبەست، بۆیە میراتگری بكوژەكە پێویست دەبێت لە باری نەبوونی نیەت خراپیدا بینا لەسەر ئەو پێوانەیە)[1].

لەسەر ئەم شیكارییەی دوایی زەیدییەكان، تێبینی دەكرێت: بكوژ میرات لە كوژراوەكە دەبات لەلای زۆریەی فەقیهان گەر مەبەستی تاوانكارانە كە پێی دەوترێت مەبەستی خراپ فەراهەم نەبوو، فەقیهە زەیدییەكان خۆیان لەوانە دادەنێن كە دەڵێن: رێگر لە میرات بریتییە لە كوشتنی بەئەنقەستی دوژمنكارانە[2].

**شافیعییەكان:**

شافیعییەكان لەسەر یەك را جێگیر نەبوون لە میراتنەگرتنی تەڵاقدرلو بە تەلاقدانی جیابوونەوەی پیاوی نەخۆش، هۆی ئەوە جیاوازی قسەی شافیعییە لە كۆن و نوێدا، "أبو إسحاق الشيرازي" دەڵێت: (قسەی شافیعی(رەحمەتی خودای لێ بێت) جیاوازی لە نێوانداپە لەسەر ئەو كەسەی لە نەخۆشییەكی ترسناكدا كە مردنی پێوە پەیوەستە تەلاقی ژنەكەی دەدات، لە یەكێك لە دوو قسەكەیدا دەڵێت میرات لە پیاوەكەی دەگرێت، چونكە پیاوەكە لە بڕینی میراتی ژنەكەیدا تۆمەتبارە، دووەمیان دەڵێت

[1] الروض النضير شرح مجموع الفقه الكبير للصنعاني ٣/٢١٦.

[2] يراجع دلالات النصوص وطرق استنباط الأحكام في ضوء أصول الفقه الاسلامي للمؤلف. ص٣١٩

میراتی لیّ نابات ئەمەش دروستەکەیە، چونکە پیّش مردنی بەینونە روویدلوە بۆیە میراتەکەی بڕیوە وەك تەلاقدان لە باری لەشساغیدا)[1].

یەکەمیان دەدرێتە پاڵ قسەی کۆنی شافیعی و دووەمیان دەدرێتە پاڵ قسەی نوێی، لە "المجموع"دا: (لە کۆندا دەڵێ میراتی لیّ دەگرێت، لە نوێدا دەڵێت میراتی لیّ ناگرێت)[2].

بەڵگەی گەورەی شافیعی لە وتنی میرات نەگرتن ئەوەیە تەلاقی بائین جیابوونەوەیە و هۆی میراتەکە دەبڕێت، هەروەك جیابوونەوە وایە لەباری لەشساغیدا، ئیجماعی هاوەڵان لەسەر قەزلوەتەکەی عوسمان–خوا لێی رازی بێت– دانەمەزرلوە، هەندێ لە هاوەڵان سەرپێچیان لێکردووە لەوانە " علي بن ابي طالب وعبد الرحمن بن عوف، وعتبة"–خوایان لیّ رازی بێت–

"ابن قدامە" دەڵێت: (لە " عتبە بن عبدالله بن الزبير" ریوایەتکراوە ئافرەتی تەلاقدراو بە تەلاقدانی بەتکرلو میرات نابات، هەر ئەوەش لە "علي و عبدالرحمن بن عوف"ەوە ریوایەتکراوە، و قسەی شافیعی نوێیە، چونکە ژنەکە جیابووەتەوە و میرات ناگرێت، وەك جیابووەوە لە باری لەشساغیدا، یان وەك ئەوەی تەلاق لە هەڵبژاردەی ژنەکە بێت، هەروەها لەبەر ئەوەی هۆیەکانی میرات لە رەحم(رەچەڵەك) و وەلائدا کورتبووەتەوە، ژنەکە هیچ کام لەم هۆیانەی بەدەستەوە نییە)[3]، هەر بەو جۆرە میرات نەگرتنی لە "أبي الثور"ەوە ریوایەت کراوە[4].

---

[1] يراجع المهذب ٢/٢٥.

[2] المجموع شرح المهذب ١٤/٥٠٤.

[3] المغني لابن قدامة ٦/٣٣٠.

[4] المجموع المرجع السابق.

## لقی دووەم:
## بەرەهایی میراتی لێ دەگیرێت

ئیمام مالیك و هاوەڵەكانی و فەقیهانی ئیبازی و شافیعییەكان لە یەكێك لە دوو قسەكەیدا بۆ ئەوە دەچن: تەلاقدراوی بەتكراو لە مێردی نەخۆش بەرەهایی میرات دەبات، یەكسانە پیاوەكە لە ماوەی عیدەی ژنەكەدا بمرێت یان لە دوای عیدەكەی، هەروەها یەكسانە تەلاقدراوەكە مێردی كردبێتەوە یان نە.

هەروەها دەڵێن: میراتگری لەسەر بنچینەی راستبوونەوەی هاوسەرگیری راستەقینە یان هاوسەرگیری حوكمی بینا ناكرێت، بەڵكو ئەوە هەڵواردنێكە لە رێسا گشتییەكە، سزایەكە بۆ مێردە نەخۆشەكە كە بە تەلاقەكەی مەبەستییەتی ژنەكەی لە میرات بێبەش بكات.

بۆیە بە پێچەوانەی مەبەستی خراپییەوە مامەڵەی لەگەڵ دەكرێت، چونكە پیاوەكە تۆمەتبارە بە تۆمەتی مەبەستی خراپ، و دوای سەلماندنی كاریگەرییەكەی بەردەوام دەبێت كات چەندە درێژ ببێتەوە، بۆیە بە تەواوبوونی عیدەی تەلاقدراوەكە و مێردكردنەوەی كۆتایی پێ نایەت.. وەك لەم درێژەپێدانەدا:

**مالیكییەكان:**

لە "المنتقى"دا هاتووە: (هەر كەس ژنەكەی لە نەخۆشیدا(نەخۆشی مردن) تەلاق بدات میراتی لێ دەگرێت با لە دوای تەواوبوونی عیدەكەشی بێت یان دوای ئەوەی مێردی بە پیاوێكی تر كردبێت، گەر نەخۆشییەكەی بەردەوام بوو تا كاتی مردنی، بەهۆی كۆدەنگی هاوەڵانەوە لەسەری، چونكە لە عومەر و عوسمان و كەسانی ترەوە ریوایەت كراوە، لەوەدا هیچ كەس سەرپێچی لێ نەكردووە، هەروەها لەبەر ئەوەی

جیابوونەوەیە لەباری ڕێگری هەڵسوکەوتی پیاوەکە تیایدا، هەروەها لەبەر بوونی تۆمەت)[1].

هەر بەو جۆرە دەڵێن: (میراتی لێ دەگرێت با جیابوونەوەش بە رازیبوونی ئەو بووبێت یان بەهۆی کەمتەرخەمییەکەوە لە ئەوەوە، "الباجي" دەڵێت: (گەر بەهۆی نشوزی ژنەکەوە یان بە لەعن یان بە خولع تەڵاقیدا حوکمی میرات بۆ ژنەکە دەمێنێتەوە –پێچەوانەی حەنەفییەکان– چونکە عوسمان میراتی دا بە ژنەکەی "عبدالرحمن بن عوف" و ئەویش(ژنەکە) داوای تەڵاقی لێکردبوو.

لەڕووی ماناوە مۆڵەت لە میراتی میراتگردا بەرنابێتەوە، وەك ئەوەی کوڕێك مۆڵەت بدات بە باوکی لە میراتگرتنیدا بەریبداتەوە(مافی نەهێڵێت)[2].

تێبینی دەکرێت لەسەر قسەی مالیکییەکان بە میراتگرتن سەرباری ئەوەی تەڵاق بە رازیبوونی ژنەکە بێت، لە کاتێکدا ئەوە بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ ئەو قسەیان بە بیناکردنی میراتگرتن لەسەر بنچینەی تۆمەتی مەبەست خراپی مێرد لە تەڵاقدا.

**ئیبازییەکان:**

فەقیهە ئیباضیەکان ئەو ئاراستەیان گرتۆتە بەر کە تەڵاقدراوی بەتکرلو بەرەهایی میرات لە مێردە نەخۆشەکەی دەبات، لە "شرح النیل"دا: (گەر لە نەخۆشیدا تەڵاقیدا میراتی لێ دەگرێت با دوای کۆتاهاتنی عیدەکەشی بێت یان دوای مێردکردن و ماوە درێژبوونەوەش بێت، ئەمە قسەی عومەر و عوسمان و مالیکە)[3].

فەقیهە ئیبازییەکان هیچ شتێکیان بەمەرج نەگرتووە جگە لە مردن بەو نەخۆشییەی تیایدا تەڵاقی ژنەکەی داوە:

---

(1) المنتقی شرح موطأ الأمام مالك ٨٥/٤ ـ ٨٦ مع التصرف.

(2) المنتقی شرح الموطأ ٨٦/٤.

(3) شرح النیل وشفاء العلیل ٢٧٦/٨.

"أبو إسحاق التلمساني" دەڵێت:

وان يطلق امرؤ مريض زوجتـه فـارثه مفـروض

ترثه وان مضت عدتها ونكـحت وبعـدت مدتها

هذا اذا مات وهو ما افاق من مرض قارنه ذاك الطلاق[1]

دوورتر لەوە بۆی ڕۆیشتوون و دەڵێت: ژنەکە میرات دەبات با تەڵاقەکەش پێش چوونە لا بێت

شافیعییەکان:

"أبو إسحاق الشيرازي"–لە خستنەڕووی بۆچوونەکانی فەقیهە شافیعییەکان– دەڵێت: (سێیەمیان ژنەکە بە هەمیشەی میرات دەبات، چونکە میراتگرتنەکەی بە هۆی زیانگەیاندنەوەیە، ئەوەش بە مێرد کردن ناسڕێتەوە، بۆیە مافەکەی پووچ ناکاتەوە)[2].

---

[1] المرجع السابق.

[2] المهذب ٢/٢٥.

## لقی سێیەم:
## میرات دەبات گەر عیدەکەی تەواو نەبووبێت

ئەبو حەنیفە(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) و هاوەڵانی و "وسفیان، واللیث، والأوزاعي، والأمّام أحمد لە ڕیوایەتێکیدا و ئیمامی شافیعی لە یەکێك لە دوو قسەکەیدا" دەڵێن: (تەڵاقدراوی پیاوی نەخۆش میراتی لێ دەبات تا لە عیدەکەیدا بێت لە پیاوەکە و دوای مردنی پیاوەکە، "السرخسي" دەڵێت: (گەر نەخۆش بە سێ یان بە یەکێکی جیاکەرەوە ژنەکەی تەڵاقدا و پاشان مرد و ژنەکە لە عیدەدا بوو ئەوا لە پێوانەدا لە پیاوەکەی میراتی بۆ نییە، ئەوەش یەکێکە لە دوو قسەکەی شافیعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لە "إستحسان"دا میراتی لێ دەگرێت، ئەمەش قسەی ئێمەیە... ڕووی پێوانەکە: هۆی میرات بردن بە تەڵاق هەڵگیراوە، حوکمیش بەبێ هۆ دانامەزرێت، بەڵام پێمان باش بوو(إستحسنان) بەهۆی ڕێکەوتنی هاوەڵانەوە لەسەری، پێوانە بە ئیجماعی هاوەڵان-لەم بابەتەدا- وازلێهێنراوە)[1].

حەنەفییەکان بۆ مەرجگرتنی ژنی تەڵاقدراو بە تەڵاقی بەتکراو لە مێردە نەخۆشەکەی ئەم خاڵانە بە مەرج دەگرن:

١-لە نەخۆشی مردندا تەڵاقی بدات یان لە حاڵێکدا تیاچوون زاڵ بێت[2].

٢ـ بەو نەخۆشییە یان بەو حاڵەوە بمرێت[3].

٣ـ کاتێك دەمرێت ژنەکە لە عیدەدا بێت[4].

٤ـ تەڵاقەکە دوای چوونە لا بێت[1].

---

[1] المبسوط للسرخسي ١٥٤/٦.

[2] الدر المختار وشرح تنوير الابصار مع رد المحتار ٣٨٣/٢.

[3] المرجع السابق.

[4] بدائع الصنائع للكاساني ٢٠٦٦/٤.

٥- تەڵاق بە رازیبوونی ژنەکە نەبێت[٢].

**ئیمام ئەحمەد:**

"ابن قدامة" دەڵێت: (لە ئەحمەدەوە ریوایەت کراوە ئاماژە دەکات بەوەی ژنەکە لە دوای عیدە میرات نابات، لەسەر ئەم ریوایەتە ژنە تەڵاقدراوەکە تەنها لەباری چوونە لادا میرات لە مێردە نەخۆشەکەی دەبات)[٣].

**قسە کۆنەکەی شافیعی:**

لە "المجموع"دا هاتووە: (گەر بە قسە کۆنەکەی بڕۆین کە دەڵێت: کەی میراتی لێ دەگرێت؟ سێ قسەی لەسەرە: یەکەمیان میراتی لێ دەگرێت تا لە عیدەدا بێت لە پیاوەکەی، کاتێك عیدەکەی تەولو دەبێت میراتی لێ ناگرێت، "أبو حنیفە، وسفیان، واللیث، والأوزاعي و یەکێك لە دوو ریوایەتەکەی ئەحمەد" لەسەر ئەم رایەن، چونکە میراتی ژنەکە بۆ ژنی خاوەن مێردە، یان بۆ کەسێکە لە حوکمی ژندا بێت، تا لە عیدەدا بێت لە حوکمی ژندایە)[٤].

ئەم ئاراستەیە رەخنەلێگیراوە وەك لە کۆتایی باسەکەدا رۆشنی دەکەینەوە، چونکە سەرچاوەی میراتگرتن بریتی نییە لە هاوسەریی نە لەرووی حەقیقەتەوە نە لەرووی حوکمەوە بەهۆی پچڕانی پەیوەندی هاوسەرگیری بە تەڵاقی بائین.

---

[١] الدر المختار المرجع السابق ٣/٣٨٢.

[٢] بدائع الصنائع (٤/٢٠٥٧) وفیە: (گەر بە رازیبوونی ژنەکە بێت بە کۆدەنگی میرات ناگرێت لە مێردەکەی). واتە بە کۆدەنگی فەقیهانیان.

[٣] المغني لابن قدامة ٦/٣٣٠.

[٤] المجموع شرح المهذب ١٤/٥٠٥.

## لقی چوارەم:
## میراتی لێ دەبات گەر مێردی نەکردبێتەوە

فەقیهە جەعفەرییەکان و ئیمام ئەحمەد لە قسەیەکی بەناوبانگیدا و "ابن أبي ليلی" و ئەبو حەنیفە لە ریوایەتێك لە ئەوەوە و شافیعی لە یەکێك لە دوو قسەکەیدا دەڵێن: تەڵاقدراوی بەتکراو(کۆتاپێهاتوو و بڕاوە) لە پیاوی نەخۆش بە نەخۆشی مردن میرات دەبات گەر مێردی نەکردبێت، گەر مێردی کردبووەوە بە رازیبوونی خۆی مافەکەی بەردەبێتەوە، چونکە هاوسەرگیری وەك دابەزین وایە لە مافی میراتەکەی لە لێجێماوی مێردە پێشووەکەی کە تەڵاقیداوە و لە نەخۆشی مردندا بووە.

فەقیهە جەعفەرییەکان مەرجێکی تریان خستۆتە سەر ئەوە کە تێنەپەڕینی ساڵێکە بەسەر تەڵاقەکەیدا، دوای ساڵێك مافی ژنەکە بەردەبێتەوە با مێردیشی نەکردبێت، وەك لەم رۆشنکردنەوەیەدا:

**جەعفەرییەکان:**

دەڵێن تەڵاقدراوی بەتکراو(بڕاوە)ی پیاوی نەخۆش میرات دەبات بەم مەرجانە:

١-لە نەخۆشی مردندا تەڵاقی دابێت.

٢-بەو نەخۆشییە بمرێت.

٣-زیاتر لە یەك ساڵ ماوە بەسەر تەڵاقەکەیدا گوزەری نەکردبێت.

٤-مێردی بە پیاوێکی تر نەکردبێت[1].

---

(1) الكافي للكليني ١٢٢/٦. وفيه: (گەر پیاوەکە لە نەخۆشییەکەیدا مرد و ژنەکە مێردی بە میراتگرەکان نەکردەوە، گەر رازی بێت مێردبکاتەوە رازی بووە بەوەی رێگرە و میراتی بۆ نییە).

لە "المختصر النافع"دا[1]: (گەر لە نەخۆشیدا ژنەکەی تەلاقدا میراتی لێ دەگرێت، با تەلاقەکەشی بائین بێت گەر لە ساڵێك دەرنەچووبێت، و پیاوەکە ئەستۆپاکی نەکردبێت، و ژنەکە مێردی نەکردبێتەوە)

لە "الروضة البهية"دا: (تەلاق رێگری ناکات لە میراتگری گەر یەکێکیان لە عیدەی گێڕانەوەدا مرد، چونکە تەلاقدراوی رجعی لە حوکمی هاوسەردایە، بە پێچەوانەی تەلاقی بائینەوە لەدوای ئەوە میراتگری لە عیدەکەیدا روونادات، مەگەر تەلاقی دابێت و لە نەخۆشیدا بووبێت، لەو بارەدا میراتی لێ دەگرێت تا ساڵێك، بەلام ئەو میرات لە ژنەکە ناگرێت)[2]

"الكليني" دەڵێت: (گەر لەباری زیانگەیاندن ژنەکەی تەلاقدا میراتی لێ دەگرێت تا ساڵێك، گەر یەك رۆژ لە ساڵەکە زیادی کرد میراتی لێ ناگرێت)[3].

بەلام لەسەر بنچینەی میراتگری جیاوازیان لە نێواندایە: زۆرینەیان دەڵێن: تەنها بە نەخۆشی میراتلێگیراوەکەدا میراتگرتنی لێوە سەرهەڵدەدات، هەندێکیش دەڵێن: بنچینەکەی تۆمەتە، واتە تۆمەتبارکردنی پیاوەکە بەوەی مەبەستی بووە زیان بە ژنەکە بگەیەنێت بە بێبەش کردنی لە میرات لە رێگەی تەلاقەوە[4].

لە دیدگای منەوە سەرئەنجامی دوو قسەکە یەك شتە ئەوەش بریتییە لە مامەڵەکردن لەگەڵ پیاوەکە بە دژی مەبەستی خراپی.

مەرجی تێنەپەڕینی ساڵێك بەسەر تەلاقەکەدا بۆ میرات بردن —لە سەرچاوە فیقهییە ئیمامییەکاندا— هیچ پاساوێکم بۆ نەبینییەوە.

(1) ص٢٧٢.

(2) الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية ٢/٣٢٧.

(3) الكافي المرجع السابق ٦/١٢٢.

(4) هامش الكافي المرجع السابق ٦/١٢٢.

**رای بەناوبانگی ئیمام ئەحمەد:**

فەقیهە حەنبەلییەکان لە ئیمام ئەحمەدەوە دوو ریوایەت دەگێڕنەوە: یەکەمیان لەگەڵ حەنەفییەکان هاوڕایە ئەوەش ئەوەیە ژنەکە دوای تەواوبوونی عیدەکەی میرات ناگرێت با مێردیشی نەکردبێتەوە، دووەمیان کە بە دروستە بەناوبانگەکە لە ئیمام ئەحمەدەوە دادەنرێت میراتی لێ دەگرێت گەر مێردی نەکردبێتەوە.

لە "المغني"دا: (بەڵگەمان ئەوەیە عوسمان میراتی دا بە "تماضر"، تەڵاقەکەشی لە نەخۆشی مێردەکەیدا بوو بە تەڵاقێکی بەتکراو(بڕاوە)، ئەوە لەناو هاوەڵاندا دەنگی دایەوە و کەس رەدی نەکردەوە بۆیە ئەوە ئیجماعە، لە "علي و عبدالرحمن"ەوە پێچەوانەی ئەمە جێگیرنەبووە، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو مەبەستە لە میراتدا مەبەستێکی خراپە بۆیە بە پێچەوانەی مەبەستەکەیەوە بەرهەڵستی کراوە، وەك ئەو بکوژەی مەبەستێتی پەلە لە میراتەکەیدا بکات و سزا دەدرێت بە بێبەشکردنی، گەر ئەمە سەلما بەناوبانگ لە ئەحمەدەوە ئەوەیە ژنەکە میرات دەگرێت لە عیدە و دوای عیدە گەر مێردی نەکردبێتەوە)[1].

لە مەرجەکانی میراتگرتن لای حەنبەلییەکان ئەوەیە مێردەکە بەو نەخۆشییە بمرێت کە تیایدا تەڵاقیداوە[2]، بەڵام فەقیهە حەنبەلییەکان لە میراتگرتنی تەڵاقدراو بە تەڵاقی بەتکراو جیاوازیان لە نێواندایە، گەر تەڵاقە پێش چوونە لا بوو[3]

---

[1] المغني ٦/٣٣٠.

[2] المرجع السابق ٦/٣٣١.

[3] ئبن قودامە لە "المغني ( ٦/٣٣١) چوار ریوایەتی گواستۆتەوە: یەکەمیان مارەیی تەواو و میراتی بۆ هەیە و عیدەی(عیدەی مردن) لەسەرە، دووەم: میرات و مارەیی بۆ هەیە و عیدەی لەسەر نییە، سێیەم: میرات و نیوەی مارەیی بۆ هەیە و عیدەی لەسەرە، ئەوەش ریوایەتی مالیکیشە، چوارەم: میراتی بۆ نییە ئەوەش قسەی: "جابر والنخعي وابي حنيفة والشافعي" و زۆرینەی ئەهلی زانستە).

**"ابن أبي ليلى":**

لە سەرخەرانی ئەو قسەیە کە تەڵاقدراو بە تەڵاقی بەتکراو(بڕاوە) لە پیاوی نەخۆش میرات دەبات گەر مێردی نەکردبێتەوە.

**"السرخسي"** دەڵێت: (ئیبن ئەبی لەیلا(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: عیدەکەی لە مافی میرات کۆتایی پێ نایەت تەنانەت میراتی بۆ هەیە گەر مێردی نەکردبێتەوە، گەر مێردی کردەوە ئەوە ژنەکەیە رازی بووە بە بەردانەوەی مافەکەی خۆی)[1].

**ریوایەتەکەی ئەبی حەنیفە:**

**"الشعراني"** دەڵێت: (ئەبی حەنیفە ریوایەتێکی تری هەیە کە ژنەکە میرات دەبات گەر مێردی نەکردبێتەوە، ئەحمەدیش ئەمە دەڵێت)[2].

**شافیعییەکان:**

لە قسەیەکی شافیعیدا میراتی لێ دەگرێت گەر مێردی نەکردبێتەوە[3].

---

[1] المبسوط للسرخسي ١٥٦/٦.

[2] الميزان الكبرى للشعراني ١٠٦/٢.

[3] المهذب ( ٢٥/٢) وفيه: (شافیعی لە یەکێك لە دوو قسەکەیدا دەڵێت: ژنەکە میرات دەبات چونکە پیاوەکە تۆمەتبارە لە ئەدانی میراتەکە بە ژنەکەی بۆیە میرات دەگرێت وەك کەسی بکوژ کاتێك تۆمەتبار دەبێت لە پەلەکردن لە میرات بۆیە میراتناگرێت، گەر وتمان ژنەکە میرات دەبات، دەبێ بپرسین تا کەی؟ سێ قسەی لەسەرە: یەکەمیان گەر لە عیدەی ژنەکە مرد ئەوا ژنەکە میرات دەبات چونکە حوکمی هاوسەرداری ماوەتەوە، گەر پیاوەکە بمرێت و عیدەکە کۆتایی پێهاتبێت ژنەکە میرات نابات، چونکە حوکمی هاوسەریی کۆتایی پێهاتووە، دووەم: میرات دەبات گەر مێردی نەکردبێتەوە، چونکە گەر مێردی کردەوە تێدەگەین ئەو رێگەیەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، سێیەمیان: ژنەکە بە درێژبوونەوەی کات(بەهەمیشەیی) میرات دەگرێت، چونکە میراتگرتنەکەی بەهۆی زیانگەیاندنەکەیە پێی، ئەوەش بە مێردکردنەوەی کۆتایی پێ نایەت و مافەکەی پووچ ناکاتەوە، بینا لەسەر ئەوە فەقیهانی شافیعی لەم چوار را سەرەکییە باسکراوەدا بەشی خۆیان هەیە.

شیکردنەوە و گفتوگۆ و پارسەنگدان:

## شیکردنەوە:

لەم واڵاکردنەی قسەی فەقیهانەوە لەمەڕ حوکمی میراتی بەتکراو(براوە)ی پیاوی نەخۆش بە نەخۆشی مردن وا دەردەکەوێت گرنگترین هۆیەکانی جیاوازیان بریتی بێت لە جیاوازی دیاریکردنی بنچینەی ئەو میراتگرتنە:

١-هەر کەس ڕێسا گشتییەکەی وەرگرتووە کە بڕیار دەدات هۆی میراتگرتنی دوو هاوسەرەکە لەیەکتر بریتی بێت لە راستبوونەوەی هاوسەری دروست، و پێیوایە لادان لەمە را و ئیجتیهادی رووتە و لە میانەی هاتنی دەقدا ڕێگە بە ئیجتیهاد نادرێت، ئەوا دەڵێت: تەڵاقی بائین هۆیەکە(هاوسەری) هەڵدەگرێت، بە نەرێبوونی هۆیەکە ئەنجامەکەش(میراتگرتن) نەرێ دەبێت، ئەمە ئەوەیە رای زاهیرییەکان و زەیدییەکانی لەسەر دامەزراوە.

٢-هەرکەسیش هەوڵیداوە نزیککردنەوەیەك بکات لە نێوان ڕێسا گشتییەکە و ئەوەی پێویست دەکات لێی لابدەی لە تۆمەتی مەبەستی خراپی مێردە نەخۆشەکە و ڕێگەی رەچاوکردنی یەکێك لە دوو کارەکەی گرتۆتە بەر دەڵێت: تەڵاقدراوی بەتکراو میرات دەگرێت گەر عیدەکەی تەواو نەبووبێت، چونکە هەتا لە عیدەدا بێت حوکمی هاوسەری هەیە لەبەر ئەو پەیوەستبوونەوەی هێشتا ماویەتی بە مێردەکەیەوە، لەمەدا رەچاوکردنی ڕێساکەی تێدایە، بەڵام سەرەڕای جیابوونەوەکەی میراتی لێ دەگرێت وەك سزایەك بۆ تۆمەتی زیانگەیاندن، لەمەدا دەستی بۆ لادان لە ڕێساکە بردووە، ئەوەش مەزهەبی ئەبو حەنیفە و ئەوانەیە ڕێگەی ئەویان گرتۆتە بەر.

٣-هەرکەس کاری بە "سد الذرائع" کردووە و میراتی لەسەر بنچینەی تۆمەتی زیانگەیاندن بیناکردووە هەڵواردنە لە ڕێسا گشتییەکە ئەوەش وەك رەچاوکردنی بەرژەوەندی ژنەکە، و مێردکردنەوەی دواتری وەك دابەزین لەو بەرژەوەندییە لێکدراوەتەوە، لەسەر میراتگرتنی ژنەکەیە گەر مێردی نەکردبێتەوە، ئەمەش ئەوەیە

فەقیهە حەنبەلییەکان و جەعفەرییەکان و ئەوانەی لەگەڵیان هاوڕان دەستیان بۆ بردووە.

٤-هەر کەس دەڵێت: هۆی میراتگرتنەکەی بریتییە لە تۆمەتی پاڵخراو بۆ لای مێردەکە و ئەم تۆمەتە وەك چۆن بە کۆتاهاتنی عیدەکە ناسڕێتەوە هەر بەو جۆرە بە هاوسەرگیری ناسڕێتەوە ئەوا لەسەر میراتگرتنی ژنەکەیە بەرەهایی، چونکە حوکم لەگەڵ هۆیەکەیەتی بە بوون و نەبوون، ئیمامی مالیك(رەحمەتی خودای لێ بێت) ئەم ئاراستەی هەڵبژاردووە و هەندێ لە فەقیهان لەوەدا شوێنی کەوتوون.

## گفتوگۆ:

١-رای زاهیرییەکان و زەیدییەکان و ئەوانەی هاوڕان لەگەڵیان گفتوگۆی لەسەر دەکرێت بەوەی دەق بۆ بەرژەوەندنی مرۆڤ دانراوە، گەر بەرژەوەندییەکی بەهێزتر و گرنگتر و باشتر بۆ ئەو کەسەی دەقەکەی بەسەردا پیادە دەکرێت لەگەڵ ئەو بەرژەوەندییە-کە پیادەکردنی دەقەکە دەستەبەری دەکات- بەرهەڵستی کرد ئەوا لەسەر قازی پێویستە کاری پێبکات و پیادەکردنی دەقەکە وازلێبهێنێت، ئەمە مانای ئەوە نییە بە بەرژەوەندی واز لە دەق بهێنرێت، بەڵکو وازهێنانە لە دەقێك بۆ دەقێکی تر کە بانگ دەکات بۆ دەستبردن بۆ بەرژەوەندی رەچاوکراو لە ترازووی شەریعەتی ئیسلامدا وەك دەقی: (نە زیان و نە زیانگەیاندن) کە لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە.

٢-لەسەر رای حەنەفییەکان تێبینی دەکرێت: ژنی تەڵاقدراو بە تەڵاقی بائین حوکمی هاوسەری نییە لە عیدەکەیدا، چونکە پەیوەندییەکەی لەگەڵ مێردەکە لە چرکەساتی کەوتنی تەڵاقەکەوە کۆتایی پێهاتووە، بۆیە لێیجیابووەتەوە و پەیوەست بە پیاوەکە بێگانەیە پێی لە هەموو ماف و ئەرکەکاندا کە لەسەر هاوسەرگیری سەرهەڵدەدەن، میراتی ژنی تەڵاقدراو لە نەخۆشی مردنی پیاوەکەیدا بیناکراوە لەسەر بنچینەی تۆمەتی مەبەستی خراپ لە دیدی ئەوانەوە، هەروەها لە دیدی هەموو

ئەوانەوە لەسەر میراتگرتنی ژنەکەن، ئەم تۆمەتە پەیوەندی نییە بە عیدەوە نە بە بوون و نە بە نەبوون.

٣-دەتوانرێت بە ئیمام مالیك(رەحمەتی خودای لێ بێت) بوترێت میراتی تەڵاقدراوی بەتکراو مافێکی تایبەتە بۆی، فەقیهان فتوایان پێداوە وەك رەچاوکردنی بەرژەوەندی ژنەکە، بۆ ژنەکە هەیە لەو بەرژەوەندییە دابەزێت راشکاوانە یان ئامێزگرانە، بەوەش مێردکردنەوەی بە دابەزینێکی ئامێزگرانە لەو مافە دادەنرێت، پاشان کارکردن بە قسەی ئەم فەقیهە مەزنە سەردەکێشێت بۆ میراتگرتنی ژنەکە لە دوو پیاو.

٤-لەسەر رای جەعفەرییەکان تێبینی دەکرێت دیاریکردنی ماف ژنەکە بە ساڵێك لە میراتگرتندا حوکمێکی پەرستشییە و ئەقڵ هۆیەکەی پەی پێنابات، پێویستە حوکمی پەرستشی بە را و ئیجتیهاد جێگیر نەکرێت، بەڵکو بە دەق جێگیر بکرێت.

## پارسەنگدان:

ئەو رایەی بەلایدا دەشکێمەوە ئەوەیە بڕیار دەدات بە میراتگرتنی تەڵاقدراوی بەتکراو(بڕاوە) گەر مێردی نەکردبێتەوە، بە فەراهەمبوونی ئەم مەرجانە:

١-تەڵاقەکە لە نەخۆشی مردندا بێت یان لە بارێکدا تیاچوون تیایدا زاڵە.

٢-مێردەکە بەو نەخۆشییە یان بەو حاڵەتە بمرێت.

٣-تەڵاق بە نارازیبوونی ژنەکە بێت یان بە کەمتەرخەمییەکەوە لە پیاوەکە.

٤-پیاوەکە چووبێتە لای.

٥-ژنەکە مێردی نەکردبێتەوە بەر لە مردنی پیاوە نەخۆشە پێشووەکەی، ئەوەش:

أ.چونکە ئەو میراتگرییە لەسەر بنچینەی تۆمەتبارکردنی پیاوەکە بە مەبەستی خراپ بیناکراوە، ئەو تۆمەش راست نابێتەوە کاتێك تەڵاق بە رازیبوونی ژنەکە بێت، گەر بوونی تۆمەتەکە سەلمێنرا لەدوای تەواوبوونی عیدەش دەمێنێتەوە(واتە تۆمەتەکە دەمێنێتەوە).

ب-تەڵاق پێش چوونە لا زیانێك بە تەڵاقدراو ناگەیەنێت میراتگرتنەکەی پێویست بکات لە لێجێماوی مێردە نەخۆشەکەی بە نەخۆشی مردن، با مەبەست خراپییەکەی مێردەکەش لە تەڵاقدا سەلمابێت.

ج-میراتگرتنی دوای هاوسەریکردنەوە سەردەکێشێت بۆ ئەوەی میرات زیاتر لە یەك مێرد وەربگرێت.

سەرباری ئەوەی ئەو هاوسەرگیرییە بە دابەزینێکی ئامێزگرانە دادەنرێت لە مافی تایبەت بە خۆی لەڕوویەکەوە و هەندێ جاریش سەردەکێشێت بۆ تیاچوونی زیانەکە لە روویەکی ترەوە.

**یاسا و تەڵاقی نەخۆشی مردن:**

مادەی(٣٥) لە یاسای باری کەسێتی عێراقی راستکراوە و کارپێکراو لە ئێستادا بە دەق هێناویەتی: تەڵاقی ئەم کەسانەی رۆشنکراونەتەوە ناکەوێت:

١-سەرخۆش و شێت و گێل و زۆرلێکراو و هەر کەس جیاکردنەوە لەدەست بدات لە تووڕەیی یان موسیبەتێك یان رووداوێکی کوتوپڕی یان چوونەساڵ یان لە نەخۆشیدا.

٢-نەخۆش لە نەخۆشی مردندا یان لە بارێکدا تیاچوون لە هاوشێوەیدا زاڵ بێت گەر لەو نەخۆشییەدا یان لەو بارەدا مرد ژنەکە میراتی لێدەگرێت.

بەپێی گشتاندنی ئەم دەقە تەڵاقی نەخۆش بە نەخۆشی مردن بەڕەهایی ناکەوێت یەکسانە خاوەنی هەستی تەواو و پەیبردنی کامڵ بێت یان نە.

وادیارە یاسادانەر تێکەڵییەکی لا دروست بووە لە نێوان کەوتنی تەڵاق و میراتگری ژنەکەدا، بۆیە داوا دەکەم پێداچوونەوەیەك لەم دەقەدا بکرێت و راستکردنەوەی بۆ بکرێت و ئەوەی لە ئیسلامدا رێکەوتنی لەسەرە کاری پێ بکرێت لە کەوتنی تەڵاقی نەخۆش بە نەخۆشی مردن گەر تەڵاقەکە لەباری پەیبردن و هەستی تەواودا بوو، ئەوەش لەبەر ئەم هۆیانە:

١-پێچەوانەیە بەوەی فەقیهانی موسڵمان کۆدەنگیان هەیە لەسەری.

٢-پێچەوانەیە بەوەی یاساکانی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان کۆدەنگیان هەیە لەسەری.

٣-مافی ژنەکە لە میراتدا دەستەبەرکراوە لەگەڵ کەوتنی تەڵاقەکەش.

٤-قازی ناتوانێت تەڵاقەکە بەتبکات(ببڕێتەوە) مەگەر لەدوای مردنی پیاوە نەخۆشەکە، لەو بارەدا ژنەکە سەرسام دەبێت لە حاڵی خۆی تا سەرئەنجامە سەپاوەکەی مێردەکە دەزانێت، گەر مرد حوکم دەکات بە نەکەوتنی تەڵاقەکە، چونکە دەیسەلمێنێت تەڵاق و مردن لە نەخۆشی مردندا بووە، گەر لە نەخۆشییەکەی چاکبوویەوە و هەڵەی دیاریکردنی نەخۆشییەکە دەرکەوت لەو بارەدا حوکم دەردەکات بە کەوتنی تەڵاقەکە، چونکە لە نەخۆشی مردندا نەبووە.

٥-لە گشتاندنی ئەو دەقە باسکراوەوە تێدەگەین تەڵاق ناکەوێت با بە کەمتەرخەمی ژنەکەشەوە بێت یان بە داواکاری ئەو بێت.

٦-گەر یاسادانەر مەبەستی بە نەخۆش لە نەخۆشی مردندا ئەو نەخۆشە بێت هۆش و جیاکردنەوەی لەدەستداوە، ئەوا ئەم حوکمە لە بڕگەی یەکەمی دەقەکەدا هاتووە، ئەو کات ئەمە ناواخنە و پێویستە خۆمانی لێ بەدوور بگرین.

# باسی نۆیەم:
# تەڵاقی سوێند یان پشتتێکەر(المولی)

الإیلاء: لەرووی زمانەوانییەوە بەرەهایی بریتییە لە سوێند لە "آل"ەوە کاتێك سوێند دەخوات.

لەرووی شەرعەوە: ئەوەیە پیاوەکە سوێند بخوات نەچێتە لای ژنەکە بە چوونە لای جووتبوون بۆ ماوەیەك کەمتر نەبێت لە چوار مانگ یان بەرەهایی.

تەڵاقی سوێند لای عەرەب پێش هاتنی ئیسلام تەڵاق بوو، قورئان وەك تەڵاق سڕییەوە و کردی بە هۆیەك لە هۆیەکان کە سەردەکێشێت بۆ تەڵاق وەك ئەوەی پیاوەکە سووربێت لەسەر کۆچکردن لە ژنەکەی و وازهێنان لە جووتبوون لەگەڵی، ئەم حوکمە بەم ئایەتە راگەیەنراوە: ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَائِهِمْ[1] تَرَبُّصُ[2] أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَاءُوا[3] فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ[4] رَّحِيمٌ[5] وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ[6] فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ[7]

---

[1] واتە سوێند دەخۆن لەگەڵ ژنەکانیان جووتنەبن.

[2] واتە چاوەڕوانی چوار مانگ، لەو ماوەیەدا خەرجی و پۆشاك و شوێنی نیشتەجێبوون بۆ ژنەکە هەیە.

[3] واتە لەو ماوەیەدا یان دوای ئەو ماوەیە لە سوێندەکەیان پاشگەزبوونەوە و چوونە لای ژنەکانیان و پێیان تێکەڵ بوون ئەوا کەفارەتی لەسەرە گەر سوێندەکە بۆ خودا بوو.

[4] واتە بەرانبەریان غەفوورە و لە گوناهەکانیان خۆشدەبێت بەوەی بوونەتە هۆی زیانگەیاندن بە ژنەکە.

[5] بە بەزەییە بۆیان لەدوای گەڕانەوەیان بۆ تێکەڵبوون و دەستگرتنەوە بە چاکە و دادپەروەری.

[6] واتە بڕیاریان لەسەر تەڵاق داوە بەوەی نەگەڕێنەوە، قورئان بڕیاری نەگەڕانەوەی بە عەزم لەسەر تەڵاق داناوە، لەوبارەدا پێویستە تەڵاقەکە بخەن بۆ هەڵگرتنی ئازار لەسەر ژنەکە.

[7] بۆ قسەکانیان.

عَلِيمٌ[1]﴾[2].

لەم دەقەوە تێدەگەین تەڵاقی سوێند(پشتتێکردن) پێنج تـوخمی هەیـە: مێـردی سوێندخۆر، ژنەکە، سوێنپێخورلو، و سوێند لەسەرخورلو، ماوە، گـەر ئـەم رەگەزانـە فەراهەمبوون راستەوخۆ کەوتنی تـەڵاقی لەسـەر پەیـدا دەبێـت بـەبێ چـوونە نـاوی ویستی پیاوەکە یان قازی لای حەنەفییەکان، هەروەها سەرهەڵدانی ویستی هەڵبژاردن لە نێوان دەستەیەکدا یان تـەڵاق لای جمهـوور، گـەر نەیویسـت تـەڵاقی بـدات قـازی تەڵاقەکەی پێ دەدات، تەڵاق بە پشتتێکردن لای حەنەفییەکان بائینە و لای جمهوور رجعییە، بەجۆرێك هەر تەڵاقێك بـە جیاکردنـەوەی قەزاییانـە بائینـە مەگـەر تـەڵاقی پشتتێکەر و کەسی هەژار و نەدار بێت لە خەرجکردندا.

ئـەوەی لـەم بابەتـەوە هەسـتی پێدەکـەین لـە گرنگـی گـەورە تایبـەت بـەوەی پەیوەستە بە ژنەکەوە لە مافی خۆشیوەرگرتن لە پیاوەکەی و کەمتەرخەمی هەندێ لە پیاوان لە کۆچکردن لە ژنەکانیان بە ویستی خۆیان بـەبێ ئـەوەی بیانوویـەك بـوونی هەبێت پاساوی ئەو کارەیان بدات، باس لە رۆشنکردنەوەی رەگەزەکانی پشتتێکردن و ئاساری سەرهەڵدراو لەسەری تا بۆ پیاوان رادەی بەرپرسیارێتی سەرهەڵدراو لەسەر کۆچکردن لە ژنەکانیان و نەچوونە لایان بەبێ پاساو رۆشـن ببێتـەوە، هـەروەها بـۆ ئەوەی بزانن ئەو کارەیان بە هەندێ لە دەقەکانی قورئاندا دەکێشێت کە فـەرمان بـە پیاو دەکات یەکێك لەم دوو رێگەیە بگرێتە بەر لە ئایەتی: ﴿فَأَمْسِـكُوهُنَّ بِمَعْـرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾[3]، بۆیە لەسەریانە یان بە چاکە دەستبگرن بە ژنەکانیانەوە یان

---

[1] واتە زانایە بە عەزمی ئەوان، بۆیە لەدوای ئەو چاوەڕوانییە باسکراوە تەنها گەڕانەوە یان تەڵاقیان بۆ هەیە، گەر ئەو کارەی نەکرد قازی لەسەری تەڵاقی دەدات.

[2] سورة البقرة /٢٢٦، ٢٢٧.

[3] (وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِتَعْتَدُوا وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ وَلَا تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ يَعِظُكُمْ بِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) (البقرة:٢٣١).

تەلاقدانیان بە چاکە، و هەڵبژاردەی سێیەمیان بۆ نییە کە سەردەکێشێت بۆ ستەم و زیانگەیاندن بە ژنەکە.

**رەگەزی یەکەم - سوێندخۆر:**

" مالیکیەکان [1]، و شافیعیەکان [2]و حەنبەلیەکان [3]،و جەعفەریەکان ـ لە رای پارسەنگرلویاندا[4] و ظاهریەکان [5]، و ئیباضیەکان [6]" دەڵێن: لە سوێندخۆردا بەمەرج دەگیرێت توانای هاوسەری هەبێت لەگەڵ ژنەکەی لە ئێستا و لە داهاتوودا، گەر دەستەوسان بوو ئەوا گرنگی بە سوێندەکەی نادرێت، چونکە شتێك لە واقیع ناگۆڕێت.

" حەنەفیەکان [7]، و زەیدیەکان [8]، و دەستەیەك لە جەعفەرییەکان [9]" دەڵێن: سوێندی دەستەوسان(پەککەوتوو) لە چوونە لای ژنەکەی دروستە، وەك وەرگرتنی گشتاندنی ئایەتەکە: ﴿لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ...﴾.

**سەرچاوەی جیاوازییەکە:**

لە قسەی فەقیهان و هۆهێنانەوەکانیانەوە تێدەگەین: سەرچاوەی جیاوازی بریتییە لە دواکەوتنی هۆی حوکمەکەی لەباری پەککەوتنی مێردەکە لە کاری جووتبوون.

---

(1) الدسوقي على الشرح الكبير ٢/٤٢٧.

(2) نهاية المحتاج ٧/٦٤. الانوار ٢/١٩٢.

(3) الانصاف ٩/١٨١. منتهى الارادات ٢/٣١٧وما بعدها.

(4) الروضة البهية ٢/١٧٨.

(5) المحلى ١٠/٤٢.

(6) شرح النيل ٣/٤٤٢.

(7) الدرر والغرر ١/٢٨٤.

(8) البحر الزخار.

(9) رياض المسائل كتاب الطلاق. شرائع الاسلام ٢/٨٣.

هەرکەس گشتاندنی دەقەکەی وەرگرتووە دەڵێت: سوێند بۆ هەموو مێردێك دروستە کە تەڵاقەکەی دروست بێت، هەرکەسیش سەرنجی دواکەوتنی هۆی حوکمەکە دەدات دەڵێت: حوکم لەگەڵ هۆیەکەی دەسوڕێتەوە بە بوون و بە نەبوون، حوکمی پشتتێکردن بۆ هەڵگرتنی ستەم و لادانی زیان لە ژنەکە و بێبەشکردنی لە خۆشیوەرگرتن لە پیاوەکەی دانراوە، بێبەشبوونەکە بەر لە پشتتێکردنەکە بە سوێند راستبووەتەوە بۆیە دوای پشتتێکردنەکە بە سوێند تازەیەك نەهاتوتە ئاراوە تا لە رێگەی قەزاوە یان لە رێگەی ناچارکردنی مێردەکەوە بە چوونە لای ژنەکەی یان لە رێگەی تەڵاقەوە هەڵبگیرێت.

**پارسەنگدان:**

گەر وتمان "سوێندلەسەرخورلو" تەنها بریتییە لە جووتبوون(چوونە لای ژنەکە) پارسەنگدراو ئەوەیە پشتتێکردن بە سوێند لە پەککەوتووەکەوە دانامەزرێت، چونکە تازەیەك ناهێنێتە ئاراوە، گەر وتمان بریتییە لە وازهێنان لە مامەڵەی چاك و پاك بەرەهایی وەك چۆن رای زاهیرییەکان و ئەوانەیە لەگەڵ ئەوان هاوڕان باشترە بە دروست و دامەزراو دابنرێت لە کەسە پەککەوتووەکەوە، چونکە پەککەوتوو لە جووتبوون هەندێ جار توانادارە لە پێگەیاندنی خۆششیەکانی تر بە ژنەکەی.

**رەگەزی دووەم -ژنەکە:**

هەموو هاوڕان لەسەر دامەزرانی پشتتێکردن بە سوێند لە ژنی راستەقینە کە چووبێتە لای، شیردان بوونی نەبێت و جووتبوونی لێوە وێنا بکرێت.

جیاوازیان کەوتۆتە نێوان لەبارەی ئەوانەی سیفەتێك لەم سیفەتانەی لێ دوادەکەوێت.

**حەنەفییەکان:**

ژنەکە دەبێت راستەقینە بێت یان لە حوکمی هاوسەرییدا بێت(تەڵاقدرابێت بە تەڵاقی رجعی و لە عیدەکەیدا بێت) توانای جووتبوون بە مەرج ناگیرێت[1].

**مالیکییەکان:**

لە تەڵاقدراوی رجعی و چووە لا و کەسانی تریشدا دروستە، هەروەها لە ئافرەتی منداڵ کە توانای جووتبوونیان نییە، بەڵام کاتەکەی درێژناکرێتەوە بۆ ئەو کاتەی توانای جووتبوونی هەبێت، هەروەها لەوانەی رێگریان تێدایە وەك "رەتق(لکاو) و قەرن(داخراو)"، پشتتێکردنی لەسەر نییە لە ئافرەتی شیردەر بۆ بەرژەوەندی منداڵەکە[2].

**شافیعییەکان:**

پشتتێکردن دروست نییە لەوانەی رێگریان تێدایە لە کاری جووتبوون و هیوای لاچوونی لێ ناکرێت، لە ژنی منداڵ و نەخۆش و رجعییەوە دروستە و لە گێڕانەوەی ژنەکەوە ماوەکە دەژمێررێت[3].

**حەنبەلییەکان:**

هەروەك شافیعییەکان وان، بەڵام لە ریوایەتێکیاندا لە رجعییەوە دروست نییە[4].

**جەعفەرییەکان:**

بە مەرج دەگیرێت چووبێتە لای ژنەکە[5].

---

(1) الطحأوي ٢/١٧٩.

(2) الخرشي ٤/٩١.

(3) نهاية المحتاج ٧/٦٦ الانوار ٢/٢٩٠ تایبەت بە ژنی منداڵ و نەخۆش ماوەکە دوای توانای تێکەڵی سەرژمێر دەکرێت.

(4) الانصاف ٩/١٦٩.

(5) شرائع الاسلام ٢/٨٣.

**زەیدییەکان:**

لە رجعییەوە دروست نییە، لەوەی چووەتە لای و ئەوەی رێگرێکی تێدایە لە جووتبوون دروستە لەبەر گشتاندنی دەقەکە[1].

**سەرچاوەی ناکۆکییەکە:**

سەرچاوەی جیاوازییەکەیان لە دروستی پشتتێکردن لە تەلاقدراوی رجعی و ئەوانەی رێگری جووتبوونیان هەیە بریتییە لە جیاوازی لە رەچاوکردنی توانا یان کاری خۆشیوەرگرتنی هاوسەریانە بۆ ژنەکە، هەر کەس لەسەر بەمەرجگرتنی جێگیربوونی بە کردارە دەڵێت پشتتێکردن لە تەلاقی رجعیدا و لەوەی رێگری تێدایە دروست نییە.

هەرکەس بە توانین راوەستاوە دەڵێت دروستە، بەتایبەت تەلاقدراوی رجعی کە هێشتا لە عیدەدایە جووتبوون لەگەڵی دروستە لەلای ئەوانەی ئەو کارە بە گێڕانەوە (رجعة) دەزانن.

**پارسەنگدان:**

وا دەبینم باشترە پشتتێکردن لە رجعیدا بە دروست دانەنرێت، نەك لەبەر ئەوەی مافێکی ژنەکەیە لە جووتبوون بە کردار بەڵکو لەبەر ئەوەی سەرنەکێشێت بۆ کرژبوونی نێوان و ئامانجی بەمەبەستگیرلو تیابچێت لە مانەوەی ژنە تەلاقدراوەکە لە ماڵی هاوسەریدا لە ماوەی عیدەکەیدا، ئەوە پێدانی هەلێکی تەواوە بۆ دوو هاوسەرەکە بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ تەبایی و نێوانخۆشی لەدوای ئارامبوونەوەی مێشك و بیریان و پەی بە سەرئەنجامەکانی تەلاق و خراپی لەیەکتر دابڕان ببەن، قورئان ئاماژەی بەم حیکمەتە کردووە و دەفەرموێت: ﴿لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً﴾.

جیاکاری نێوان "لەگەڵ جووتبوو" و "لەگەڵ جووت نەبوو"ش ئەوەیە جەعفەرییەکان و دەستەیەك لە زەیدییەکان بۆی دەچن، ئەوە سەرباری بەرهەڵستکاری لەگەڵ گشتاندنی ئایەتی: ﴿لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ﴾ لەگەڵ ئەوەش

---

[1] البحر الزخار ٣/٢٤٢. التاج المذهب ٢/٢٥٤.

پێچەوانەیە لەگەڵ یەکسان بوونی دوو حاڵەتەکە(پێش چوونە لا و دوای چوونە لا) لە هۆی حوکمەکەدا.

سەرچاوەی ئەوەی بە شیردەر دابنرێت یان نە بریتییە لە سەرنجدان بە بوونی مەرامی خراپی پیاوەکە یان نەبوونی، گفتوگۆ لەسەر ئەمە لە مەرجی مەبەستی زیانگەیاندن بە ژنەکە لە رەگەزی سێیەمدا باس لێوە دەکەین.

### رەگەزی سێیەم -سوێندپێخوراو:

فەقیهان لەمەڕ سروشتی سوێندپێخوراو جیاوازیان هەیە: " حەنەفیەکان[1]،و مالیکیەکان[2]، و شافیعیەکان لەسەر قسەی نوێی شافیعی[3]،و حەنبەلیەکان لەسەر قسەیەکی نامەشهوور[4]، و ئیباضیەکان[5]" دەڵێن: پشتتێکردن دادەمەزرێت بە هەموو ئەو پابەندبوونەی تێیدایە.

" جەعفەرییەکان[6]، و ظاهریەکان[7]، والشافعی لە قسەی کۆنیدا[8]،و حەنبەلیەکان لەسەر قسەی مەشهووریان[9]، و زەیدیەکان[10]" دەڵێن: تەنها بە سوێندخواردن بە ناوی خودا یان بە سیفەتێك لە سیفەتەکانی دادەمەزرێت.

---

(1) تحفة الفقهاء للسمرقندي.

(2) الخرشي ٤/٨٩.

(3) نهاية المحتاج ٧/٦٤.

(4) الانصاف ٩/١٧٣.

(5) شرح النيل ٣/٤٤٢.

(6) شرائع الاسلام ٢/٨٣.

(7) المحلى ١٠/ ٤٢.

(8) نهاية المحتاج المرجع السابق.

(9) المغني لابن قدامة ٧/٢٩٨.

(10) الروض النضير ٤/ ١٦٨. البحر الزخار ٣/ ٢٤٢.

**سەرچاوەی جیاوازییەکە:**

سەرچاوەی جیاوازییەکەیان لە بەرهەڵستی گشتاندنی ئایەتەکە: ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ...﴾ لەگەڵ فەرموودەکە: ((مَنْ كَان حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أو لِيَصْمُتْ- هەرکەس سوێند دەخوات با سوێند بە خودا بخوات یان بێدەنگ بێت))[1] لە لایەکەوە و جیاوازی لە شوبهاندنی پشتتێکردن بە سوێندی کەفارەت لەلایەکی ترەوە، هەرکەس گشتاندنی ئایەتەکەی بە فەرموودەکە تایبەت کردووە یان پشتتێکردنی بە سوێندی کەفارەت شوبهاندووە دەڵێت: پشتتێکردن تەنها بە سوێندخواردن بە ناوی خودا یان بە سیفەتێك لە سیفەتەکانی دادەمەزرێت، لەسەر ئەو بنچینەی لەوەدا بۆ سیفەتی خودا حوکمی ناوەکەی هەیە، هەرکەسیش بە گشتاندنی ئایەتەکە کاری کردووە و فەرموودەکەی هەڵداوەتە سەر لەپێشتر(أولوية) و سەرنجی ئەوەی داوە سەرهەڵدەدات لەسەر پابەندبوون لە خۆگرتنەوە بە چاوداخستن لە سروشتی سەرچاوەکەی دەڵێت: پشتتێکردن دادەمەزرێت بە هەر شتێك مرۆڤ پابەند دەکات لە کردنی کارێك یان نەکردنی[2].

**پارسەنگدان:**

وا دەبینم بەرژەوەندی ژنەکە داوا دەکات بوترێت هەر خۆگرتنەوەیەك لە جووتبوون و تێکەڵاوی باش لە مێردەکەوە بەبێ بیانوویەك لە ئەوەوە یان لە ژنەکەوە حوکمی پشتتێکردنی هەیە هەتا زیانگەیاندن بە ژنەکە بوونی هەبێت، بەهۆی ئەو کارە نەرێنییەوە لە مێردەکە دەوەشێتەوە، بە چاوداخستن لە سەرچاوەکەی، بۆیە لەسەر قازی پێویستە مامەڵەی پیاوەکە بکات بە مامەڵەی پشتتێکەر یەکسانە سوێندی خواردبێت یان نە، وەك چۆن ئەوە هەڵبژاردەی هەندێ لە فەقیهانە، "القرطبي" دەڵێت: (زانایانمان دەڵێن: هەر کەس خۆی بگرێتەوە لە جووتبوون لەگەڵ

---

[1] البخاري: ٢٤٨٢

[2] بداية المجتهد ٢/ ٨٣.

ژنەکەی وەك زیانگەیاندن پێی بەبێ ئەوەی سوێندێکی خواردبێت فەرمانی پێ دەکرێت بچێتە لای ژنەکەی، گەر ئەو کارەی ئەنجام نەدا و سووربوو لەسەر خۆگرتنەوەی وەك زیانگەیاندن بە ژنەکە لە یەکتر جیادەکرێنەوە بەبێ ئەوەی کات دیاریبکرێت)[1].

لە "مختصر خلیل"دا هاتووە: (ئیجتیهاد دەکەم، تەڵاقیکەوتووە لە خۆکەنارکردن لە ژنەکە و شەونەمانەوە لای یان وازهێنان لە جووتبوون لەگەڵی وەك زیانپێگەیاندن، با کەسەکەش بزر و نادیار بێت یان لە عیبادەتدا نوقم بووبێت و بەردەوام بێت بەبێ دیاریکردنی کات جیادەکرێتەوە لەسەر راستترین را)[2]، لە ریوایەتێکی حەنبەلییەکاندا: گەر جووتبوونی واز لێهێنا بەبێ پاساوێك و زیانی بە ژنەکە دەگەیاند ماوەی پشتتێکردنەکەی بۆ دیاری دەکرێت و حوکمەکەی بۆ هەیە، " المرداوي" دەڵێت: دروستەکە ئەوەیە[3]، لە " الروض النضیر"دا هاتووە: (لە هەندێ لە پێشینەوە ریوایەتکراوە کورتکردن بریتییە لە پشتتێکردن)[4].

لە دیدگای منەوە: مەرجی مەبەستی زیانگەیاندن لە پیاوەکەوە بەمەرج ناگیرێت گەر زیانگەیاندن بە کردار بوونی هەبێت، چونکە ئیسلام قەرەبووکردنەوە لەسەر زیان بینا دەکات بە چاوداخستن لە مەبەستی زیانگەیەنەر.

ئەوەی پاڵێنام بۆ ئەم درێژکردنەوەیە ئەو دیاردە باڵادەستەیە لەناو خەڵکیدا لە وازهێنان لە ژنی پێشوو و دانانی لە گۆشەی لەبیرچوونەوە پاش هێنانی ژنێکی نوێ.

---

[1] تفسیر القرطبي ٣/١٠٦.

[2] الخرشي ٤/٩٣.

[3] الانصاف للمرداوي ٩/١٦٩.

[4] الروض النضیر ٤/٣٦٨، البحر الزخار ٣/٢٤٢.

**رەگەزی چوارەم -سوێندپێخوراو:**

" حەنەفیـەکان [1]، و مالیکیـەکان [2]، و شـافیعیەکان [3]،و حەنبەلیـەکان [4]، و جەعفەریـەکان[5]، و زەیدیـەکان [6]، و ئیبـاضـیەکـان [7]" هـاوڕان لەسـەر ئـەوەی "سوێندلەسەرخوراو" بریتییە لە وازهێنان لـە جووتبوون(چـوونە لا)، گـەر سـوێندی خوارد لەسەر وازهێنان لە خۆشییەکانی تر وەك دەست لە مل کردن و یاری و شتانی تر بە پشتتێکەر دانانرێت.

بـەڵام زاهیرییـەکان تێگەیشـتنێکی بـەرینتر بـە "سوێندلەسـەرخوراو" دەدەن بەجۆرێك هەموو تێکەڵبوونێك دەگرێتـەوە و لەناویانـدا جووتبـوون و دەسـت لـە مـل کردن یاری و باوەش پێداکردن و نەنووستن لەگەڵی لەناو یەك جێگەدا..

یەکسانە ئـەوە لـە تێنەگەیشـتن لـە یـەکترەوە سـەرهەڵبدات یـان نـە، هـەروەها یەکسانە لە بەرژەوەندی ژنەکەدا بێت یان نـە، بـەهۆی ئایـەتی: ﴿لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ...﴾، هەروەها لەبەر فەرموودەکەی "حەمادی کوڕی بن ئەبی سولەیمان" لە ئیبراهیمی نوخەعییەوە: (گەر سوێندی خوارد بـە خـودا ژنەکـەی دەبوغزێنێـت یـان خراپ دەبێت لەگەڵی یان بێبەشی دەکات یان سەری لەگەڵ سەری لـە یـەك جێگـەدا کۆناکاتەوە ئەوە بریتییە لە پشتتێکردن)[8].

---

(1) تحفة الفقهاء ٣٠٥/٢.
(2) الخرشي ٩٣/٤.
(3) الانوار ٢٩٠/٢.
(4) الانصاف ١٦٩/٩.
(5) مستدرك الوسائل ٣٠/٣.
(6) الروض النضير ١٨٦/٤.
(7) شرح النيل ٤٤٨/٣.
(8) المحلى ٤٢/١٠.

**رەگەزی پێنجەم -ماوە:**

لـە دیـاریکردنی جیاوازیـان لـە نێواندایـە: " حەنەفیـەکان[1]، و زەیدیـەکان[2]، و ئیباضیەکان[3]،و حەنبەلیەکان لە ریوایـەتێکی پارسـەنگ نـەدرلودا[4]،و مالیکیـەکان لەسەر رایەکی نامەشهوور[5]" دەڵێن: ماوەی بەهەندگیراو بریتییـە لـە چـوار مـانگ و بـەرەوژوور، چـونکە ئـەوە ماوەیـە لـە قورئانـدا دیـاریکراوە، " شـافیعیەکان[6]،و مالیکیـەکان لـە را بەناوبانگەکەیانـدا[7]،و حەنبەلیـەکان لـە قسـە پارسـەنگدراوە دروستەکەیاندا[8] و جەعفەریەکان[9]" دەڵێن: مـاوە بریتییـە لـە چـوار مـانگ زیـاتر، چونکە کەسی پشتتێکەر لە دوای ئەو ماوەیە داوای گێڕانەوە و تەلاقی لێ دەکرێت، بۆیە زیاد لە چوار مانگ بریتییە لە ماوەی پشتتێکردنی شەرعی.

زاهیرییەکان دەڵێن: پشتتێکردن دێتە دی گـەر ماوەکەشـی یـەك سـات(یان یـەك کاتژمێر) بێت.

**سەرچاوەی جیاوازییان:**

سەرچاوەی ناکۆکییان بریتییە لە جیاوازیـان لـە لێکدانـەوەی ئایەتەکـە: ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَائِهِمْ...﴾، هەریەك بەوەی ئیجتیهادەکەی دەیگـاتێ و رایەکـەی لەسـەر بینا دەکات لێکیدەداتەوە، "الخرشي" دەڵێت: (سەرچاوەی دوو قسەکە: وتنی چوار مانگ و وتنی زیاتر لە چوار مانگ) جیاوازییە لە تێگەیشتن لە ئایەتەکە: ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ

---

(1) تحفة الفقهاء ٢/٣٠٦.
(2) الروض النضير ٤/١٨٤. البحر الزخار ٣/٢٤٤.
(3) شرح النيل ٣/٤٤٨.
(4) الانصاف ٩/١٧٤.
(5) الدسوقي ٢/٤٢٨.
(6) الانوار ٢/٢٩١.
(7) المنتقى شرح الموطأ ٤/٣٠. الخرشي ٤/٩٠.
(8) منتهى الارادات ٢/٣٢١.
(9) شرائع الاسلام ٢/٢٢٨. المختصر النافع ص٢٣٠.

مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ﴾، ئەو دوانەش لەسەر ئەوە بیناکراون ئایا گێڕانەوە لەدوای چوار مانگ دروستە یان دەبێت لە ناو چوار مانگدا بێت؟ ئایا تەڵاق بە ڕۆیشتنی چوار مانگ دەکەوێت یان نە؟ ئەوەی مەشهوورە ئەوەیە لە دوای چوار مانگ داوای گێڕانەوەی لێ دەکرێت تەڵاق بە تەنها چوار مانگ ناکەوێت)[1].

**پارسەنگدان:**

وایدەبینم زانستیانەتر ئەوەی زاهیرییەکان و حەسەنی بەصری و ئیسحاق و ئەوانەیە لەگەڵ ئەوان هاوڕان، پێویست نەبوونی دیاریکردنی ماوەی کۆچلێکردنەکە لە هاوسەرەکەوە بە قسە، بەڵکو هاتنەدی کۆچلێکردنەکە لە ڕووی کردارییەوە بەسە، ماوەی باسکراو لە ئایەتەکەدا بریتییە لە ماوەی مۆڵەتدان، واتە پیاوەکە ناچارناکرێت بە گێڕانەوە یان تەڵاق مەگەر سووربێت لەسەر حاڵەتی زیاتر لە چوار مانگ، بۆیە لەو ماوەیەدا(چوار مانگ) هیچی داوا لێناکرێت وەك چۆن ئەوە ڕای مەشهووری مالیکییەکان و شافیعییەکان و حەنبەلییەکان و جەعفەرییەکانە، ئەوەش لەم ڕوانەوە:

١-قورئان ماوەیەکی دیاریکردووە بۆ پیاوەکان کە لەو ماوەدا لەڕووی ئایینەوە شتێکیان نایەتە سەر، هەروەك چۆن قەرزدار داوای قەرزی بەماوەی لێ ناکرێت تا کاتەکە تەواو نەبێت، بە هەمان شێوە داوا لە پشتتێکەر ناکرێت بە گێڕانەوە یان تەڵاقدان تا ماوە دیاریکراوەکە(چوار مانگ) تەواو نەبێت.

٢-پیتی "الفاء" لە ئایەتی : (فان فاؤا) بۆ "التعقیب الفعلی-بەدواداهاتنی کرداری"ە نەك بۆ بیرخستنەوە، بۆیە دواکەوتنی ئەوەی دوای ئەو لەوەی پێش ئەو پێویست دەکات، ئەوکات گێڕانەوە بەدوایدا داواکراوە.

٣-ڕستەی مەرجی مانای ڕابردوو دەگوێزێتەوە بۆ ڕانەبردوو، گەر گێڕانەوە لەو ماوەیەدا داواکرلو بوایە مانای ڕابردووەکە بەدوایدا دەمایەوە لەسەر ئەوەی لەسەری بووە پێش چوونە لا ئەوەش پووچ و بێبنەمایە.

---

[1] الخرشي ٤/٩٠.

**ئاساری پشتتێکردن:**

گەر رەگەزەکانی پشتتێکردن فەراهەم بوون ئاسار و ئەنجامگەلێکیان لەسەر پەیدا دەبن کە فەقیهان جیاوازیان هەیە لە رادەیاندا، بەم جۆرە:

**حەنەفییەکان:**

بۆ مێردی پشتتهەڵکەر ئازادی ویست بوونی هەیە لە ماوەی چاوەڕوان لە هەڵبژاردنی گێڕانەوە یان سووربوون لەسەر خۆگرتنەوە، گەر لەو ماوەیەدا لەگەڵ ژنەکەی تێکەڵ(جووت) بوویەوە کەفارەتی بۆ پێویست دەبێت و پشتتێکردنەکە بەردەبێتەوە، گەر نەیویست تیایدا بیگێڕێتەوە راستەوخۆ ژنەکەی بە یەك تەڵاقی بائین جیادەبێتەوە بە کۆتاهاتنی دوایین بەشی ماوەکە(چوار مانگ)[1].

مانای ئەمە ئەوەیە مێردەکە–تەنها بە کۆتاهاتنی ماوەکە– ئازادی هەڵبژاردنی لێ وەردەگیرێتەوە لە تەڵاقدانی ژنەکەی یان تەڵاق نەدانی.

لە "البدائع"دا[2] هاتووە: (گەر ماوەکە تێپەڕی و پیاوەکە ژنەکەی نەگێڕایەوە لەگەڵ توانای گێڕانەوە، ئەوا سووربوونی دڵنیاکەر بە سوێندەکەی لەڕووی کردارییەوە هاتۆتە دی، گومان نەماوە لە ستەم لە مافی ژنەکەی و رۆشن بووەتەوە، بۆیە سزای تۆڵەی ستەمەکەی لەسەرە، هەروەها بەزەییەکە بۆ ژنەکە بە رزگارکردنی لە پەتی پیاوەکەی تا مافی خۆی لە مێردێکی ترەوە بەدەست بهێنێت.

**بەڵگەیان:**

١–دەڵێن: بۆیە تەڵاقەکە بائینە بۆ ئەوەی ژنەکە لە ستەمی پیاوەکە رزگار بکرێت، بەڵام تەڵاقی رجعی ئەو سوودە نابەخشێت، چونکە پیاوەکە دەتوانێت ژنەکە بگێڕێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی هاوسەری خۆی و جارێکی تر پشتی تێبکاتەوە، بەڵام لە تەڵاقی بائیندا ژنەکە خۆی لەدەستی خۆیدایە و

---

[1] راجع شرح فتح القدير ١٨٣/٣. وما بعدها. تحفة الفقهاء ٣٠٨/٢.

[2] بدائع الصنائع ١٩٦٢/٤.

دەسەلاتی پیاوەکە بەسەریەوە نەماوە ئەوەش وەك سزایەك بۆ ستەمی پیاوەکە[1].

٢-دەڵێن: گێڕانەوەکە پێویستە لەو ماوەیەدا بێت، چونکە پیتی "الفاء" لە ئایەتی: (فان فاؤا) بۆ درێژەپێدانی پوختەکەی پێش خۆیەتی، وەك: ﴿فَقَدْ سَأَلُوا مُوسَى أَكْبَرَ مِنْ ذَلِكَ فَقَالُوا أَرِنَا اللَّهَ جَهْرَةً﴾، بۆیە بەدواداهاتن لە ئایەتەکەدا تەنها بۆ یادخستنەوەیە، کەوابوو ماناکەی: گەر گەڕانەوە لەوەی لەسەری بەردەوام بوون بە چوونە لای ژنەکانتان لەو ماوەیەی بەدوای پشتتێکردنەکەدا دێت یان لەو ماوەیەی بە دوای چاوەڕوانکردنەکەدا دێت ئەوا خودا "غفور رحیم"ە بۆ ئەو سوێندەی لەسەر ستەم روویداوە لێتان، دامەزرانی دڵ لەسەر ئەوە بەهۆی گێڕانەوەوە بریتییە لە تەوبەکردن[2].

بۆ خوێندنەوەکەی ئیبن مەسعود: (فان فأوا فیهن) ئەم خوێندنەوەیە هەرچەند شازە، بەڵام پارسەنگی ئەوە دەدات گێڕانەوەکە لە ماوەکەدا بێت، چونکە راویەکە وەك هەواڵێك لە خاوەن وەحییەوە بە شێوەی قورئان دەیخوێنێتەوە، نەرێکردنی قورئانی بوونی-لەبەر نەبوونی مەرجی تەواتور- نەرێکردنی تایبەتترە و نەرێکردنی گشتگیرتر(خەبەری) پێویست ناکات، بۆیە کارەکە لە نێوان ئەوەی قورئانە یان خەبەرە لە خاوەن وەحییەوە دەسوڕێتەوە[3]، گەر قورئانیبوونی نەرێ بکرێت خەبەریبوونی دەمێنێتەوە، چونکە ئەوە دەسوڕێتەوە لە نێوان بەڵگەبوون لە روویەکەوە و خەبەری بوون لە روویەکی ترەوە، نەك لە نێوان بەڵگەبوون و بەڵگەنەبووندا.

٣-کەوتنی راستەوخۆی تەلاق تەنها بە کۆتاهاتنی ماوەی چاوەڕوانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە "قتادە لە علی وابن مسعود وابن عباس"ەوە ریوایەتکراوە،

---

[1] راجع فتح شرح القدیر ١٨٣/٤. وما بعدها.

[2] المرجع السابق.

[3] المرجع السابق.

فەرموویانە: گەر چوار مانگ گوزەری کرد ژنەکە تەڵاقدراوە، لەو بارەدا ژنەکە خۆی لەپێشترە بە خۆی و عیدەی تەڵاقدراو دەژمێرێت، "عطاء وجابر بن زيد وعكرمة وسعيد بن المسيب وأبو بكر بن عبدالرحمن ومكحول" کاریان بەم رایە کردووە، " الدارقطني له الشعبي والنخعي ومسروق والحسن وابن سيرين وقبيصة وسالم وابن سلمة" ئیخراجی کردووە، بۆیە قسەکەیان بەڵگەی پارسەنگدانییەتی لەلایان، هەروەها لەبەر ئەوەی پشتتێکردن تەڵاقێکی پەلە بووە لە سەردەمی نەفامیدا و شەرع کردوویەتی بە تەڵاقێکی دواخراو، تەڵاقی دواخراویش بە کۆتاهاتنی ماوەکە دەکەوێت بەبێ کەوتنی یەکێك بەدوایدا، وەك پێی بڵێت: تۆ سەری مانگ تەڵاقدراوی[1].

**مالیکییەکان:**

مالیکییەکان دەڵێن: سەرئەنجامەکە بەم جۆرەیە[2]:

١-گەر ژنەکە داوای لە مێردە پشتتێکەرەکەی کرد لەدوای ماوەی پشتتێکردنەکە بیگێڕێتەوە و ئەویش نەیویست بیگێڕێتەوە و تەڵاقیشی نەدا ئەوا دادوەر تەڵاقێك بەسەریدا دەخات کە پشتتێکەر دەتوانێت بیگێڕێتەوە بەر لە کۆتاهاتنی عیدەکەی، بە مەرجی هەڵوەشانەوەی سوێندەکە لێی لەو ماوەیەدا، هەڵوەشاندنەوەی بەوە دەبێت لەو ماوەیەدا بچێتە لای ژنەکە و کەفارەتی سوێندەکەی بدات و پەلە بکات لە شکاندنی.

٢-گەر بەڵێنی گێڕانەوەی دا دادوەر سێ جار مۆڵەتی دەدات گەر ئەنجامی نەدات بەسەریدا تەڵاقی دەدات.

٣-گەر دوای ئەو ماوەیە ژنەکە رازی بوو بە مانەوە لەگەڵی بەبێ جووتبوون یان بەردانەوەی مافی خۆی لە گێڕانەوە و پاشان پەشیمان بوویەوە و داوای کرد

---

[1] بدائع الصنائع، المرجع السابق.

[2] راجع شرح الخرشي ٤/٩١ وما بعدها.

لەو بارەدا کات بۆ پیاوەکە دیارینەکرێت، بەڵکو یان دەیگێڕێتەوە یان دادوەر بەسەریدا تەڵاقی دەدات، ئەوەش بەهۆی زۆری زیانەکە و بەردەوامبوونی، وەك ئەوەی لە مافێك بورابێت کە پلە و پایەکەی نەزانیبێت.

٤-ئەشهەب لە مالیکەوە گواستوویەتەوە ژنەکە لێی جیادەبێتەوە بە کۆتاهاتنی ماوەکە، بەوەش لەگەڵ حەنەفییەکان هاوڕایە، لەوانەیە ئەمە لەسەر ریوایەتێکی نامەشهوور لە مالیکەوە بیناکرابێت لەوەی ماوەی پشتتێکردن چوار مانگ بێت.

**شافیعییەکان:**

کەسی پشتتێکەر چوار مانگ مۆڵەتی پێ دەدرێت لە کاتی پشتتێکردنەکەوە و پێویست ناکات قازی کاتی تری بۆ دیاریبکات، گەر بەردەوام بوو بەبێ هەڵوەشانەوەی سوێندەکەی و بەبێ پاساوێك ئەوا ژنەکە بۆی هەیە دلوای چوونە لا(جووتبوون) یان تەڵاق بکات، گەر ڕێگرێك لە ژنەکەدا نەبوو و ژنەکەش دلوای نەکرد فەرمان ناکرێت بە پیاوەکە پێی، و مافی ژنەکە بە دواکەوتن پووچ نابێتەوە، گەر بە یەکێك لەو دوو کارە دلوا لە پیاوەکە کرا و نەیکرد قازی بەسەریدا بە یەك تەڵاقی رجعی تەڵاقی دەدات[(١)]

**حەنبەلییەکان:**

دەڵێن: گەر پشتتێکردن دروست بوو و ماوەی چوار مانگی بۆ دیاریکرا لە کاتی سوێندەکەیەوە، گەر پیاوەکە پاساوێکی هەبوو ڕێگربێت لە جووتبوون بەو ماوەیەی خۆی لەسەری دەژمێررێت، گەر بەهۆی پاساوێکەوە بوو لە ژنەکەوە وەك منداڵی و شێتێتی و نەخۆشی و بەندکردن... لەسەر پیاوەکە ناژمێررێت.

وتراویشە وەك حەیز بۆی دادەنرێت، لە "الوجیز"دا دەڵێت: لە کاتی سوێندەکەیەوە ماوەکە دەژمێررێت یەکسانە لە ماوەکەدا ڕێگر هەبێت لە ژنەکەوە یان

---

(١) رلجع الانولر ٢/٢٩٣.

لـە پیاوەکـەوە، لـە دوای کۆتاهـاتنی ماوەکـە گـەر ژنەکـە لێـی بـوورا مافەکـەی بەردەبێتەوە بەپێی مەزهەب، جمهووری هاوەڵانی ئەحمەدیش لەسەر ئەمەن، گەر ژنەکە لێی نەبوورا فەرمانی پێ دەکرێت بە تەڵاقدانی، گەر یەك تەڵاقیدا گێڕانەوەی بۆ هەیە، ئەمە بریتییە لە مەزهەب و جمهووری هـاوەڵانی ئەحمەدیشـی لەسـەرە، گـەر تەڵاقی نەدا بەند دەکرێت و رێگەی لێ دەگیرێت تا تەڵاقی دەدات لـە یـەکێك لـە دوو ریوایەتەکـەدا، لـە ریوایەتەکـەی تـردا: قـازی بەسـەریدا تـەڵاقی دەدات، خـاوەنی "الانصاف" دەڵێـت: ئـەوەش بریتییـە لـە مەزهـەب، لـە "الفـروع"دا دەڵێـت: ئەمـە بەهێزترە، "الخرقي" هەڵیبژاردووە، "القاضي"ش لە "التعليق"دا و "أبـو خطـاب" و کەسانی تریش[1].

**جەعفەرییەکان:**

دەڵێن: گەر ماوەی چاوەڕوانییەکە کۆتایی پێ هات بۆ قازی نییە تـەڵاقی بخـات، ماوەکە لە دادبینییـەوە دەسـت پـێ دەکـات نـەك لـە کـاتی پشـتتێکردنەکەوە، بـە پێچەوانەی هەندێکیان گەر پیاوەکە داوای ماوەیەکی کرد ئەوەندەی عـادەت رێگـەی پێ دەدا مۆڵەتی پێ دەدرێت، گەر سووربوو لەسەر خۆگرتنەوە لە ژنەکەی و پاشان قازی نەرمی نواند ئەوا هەڵبژاردەی پێ دەدرێت لە نێوان گێڕانەوە و تەڵاقدا، لەسـەر یەکێك لەو دوانە ناچارناکرێت، گەر خۆیگرتەوە بەند دەکرێت و رێگەکانی لێ دەگیرێت لە خواردن و خواردنەوە تا کەفارەتی سوێندەکەی دەدات و دەیگێڕێتەوە یان تەڵاقی دەدات، گـەر تـەڵاقی دا بـە رجعـی تەڵاقەکـەی دەدات، چـونکە هۆیـەك نییـە بـۆ جیابوونەوەی تەولو، گەر لە مـاوەی پشـتتێکردنەکەدا لێـی نزیکبوویـەوە کـەفارەتی سوێندەکەی لەسەرە بە کۆدەنگی، دوای ماوەکە جیاوازی لەسەرە[2]، لە "مسـتدرك الوسائل"دا[3] هاتووە: گەر لـە دوای ماوەکـە نەیویسـت تـەڵاقی بـدات ئیمـام بەنـدی

---

[1] راجع الانصاف ۹/۱۸۳. وما بعدها. منتهى الارادات ۲/۳۲۱.

[2] راجع شرائع الاسلام ۲/۸٤. رياض المسائل كتاب الطلاق.

[3] مستدرك الوسائل كتاب الايلاء ۳/۲۲۹.

دەکات و ڕێگەکانی لێ بەرتەسك دەکاتەوە لە خواردن و خواردنەوە، گەر ملی نەدا ئەوا ئیمام بۆی هەیە بیکوژێت بەهۆی سەرپێچی لە فەرمانی ئیمامی موسڵمانان.

**زەیدییەکان:**

دەڵێن: هەر کات کۆتوبەندەکانی پشتتێکردن تەولو بوون و رەگەزەکانی فەراهەم بوون بۆ ژنەکە پێویست دەبێت مافی خۆی داوا بکات بە گێڕانەوەی بە کۆدەنگی، دوای چوار مانگ پیاوەکە رادەگیرێت تا ژنەکە تەلاق بدات یان بیگێڕێتەوە بەهۆی ئاشکرای ئایەتەکەوە، گەر بەڵێنی گێڕانەوەی دا قازی مۆڵەتی پێ دەدات تا ڕۆژی خۆی، لەلای زەیدییەکان[1] قازی تەلاقی ناخات بەسەریدا، لە "التاج المذهب"دا[2] هاتووە: (دوای تێپەڕبوونی چوار مانگ ڕەوانە دەکرێت بۆ دادبینی و مێردەکە بەند دەکرێت گەر خۆیگرتەوە تا تەلاقی دەدات یان دەیگێڕێتەوە)، تەلاقەکە لەلایان رجعییە.

**زاهیرییەکان:**

دەڵێن: پێویستە لەسەر دادوەر رایبگرێت و فەرمانی پێ بکات بە چوونە لای ژنەکەی یەکسانە ژنەکە ئەوەی داوا کردبێت یان نە، رازی بێت یان رازی نەبێت، گەر لەو ماوەیەدا گێڕایەوە ئەوا هیچی لەسەر نییە، گەر نەیویست بەرهەڵستی ناکرێت تا ماوەکە تەولو دەبێت، ئەو کات حاکم بە قەمچی ناچاری دەکات تا بیگێڕێتەوە و بچێتە لای یان تەلاقی بدات، تا یەکێکیان ئەنجام دەدات وەك چۆن خودا فەرمانی پێکردووە یان دەمرێت بە کوشتنی رەوا بۆ لای تووڕەبوونی خودا، مەگەر کەسەکە لە جووتبوون پەککەوتە بێت لەو بارەدا دروست نییە داوایەکی لێ بکرێت کە لە توانا بەدەرە، بەڵام داوای لێ دەکرێت بە زمان بیگێڕێتەوە و بە باشی هاوەڵی بکات و شەو لەگەڵی بمێنێتەوە.

---

[1] الروض النضير ٤/١٩٠. الروضة الندية ٢/٦٤. البحر الزخار ٣/٢٤٤ وما بعدها.

[2] التاج المذهب ٢/٢٥٦.

ئەوەی نامۆیە ئەوەیە زاهیرییەکان و جەعفەرییەکان کوشتنی مێردەکە بە موباح دەزانن لەسەر دەستی حاکم، لە کاتێکدا نوێنەرایەتی تەڵاقخستنەکەی بە قازی رەوا نابینن، زۆرجار ئیبن حەزم تانە دەدات لە ئیمامە بەڕێزەکان و تۆمەتباریان دەکات بە دەستبردن بۆ بۆچوونی نادروست، بەڵام لەم بوارانەدا خۆی لەبیر دەچێت.

زاهیرییەکان پێیانوایە بۆ دادوەر هەیە رێکارە باسکرلوەکان بگرێتە بەر با ژنەکەش دلوای مافی خۆی نەکردبێت، چونکە مافی خودایە لە بەندەکەیدا نەك مافی ژنەکە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: [1]. ((هەر کەس مونکەرێکی بینی با بەدەستی بیگۆرێت...فەرموودەکە))

**ئیبازییەکان:**

ئاشکرای قسەیان: رایان لەگەڵ رای حەنەفییەکان یێکدێتەوە لەوەدا کە تەڵاق تەنها بە کۆتاهاتنی ماوەکە دەکەوێت، لە "شرح النيل"دا هاتووە: گەر تا چوار مانگ نەچێتە لای لێی جیادەبێتەوە.

لە "جوهر النظام"دا هاتووە:

وبعد أن تخرج من ذاك الامد  حل زواجها لمن لها ورد
وصار زوجها من الخطاب  لا يتقدمن على الاصحاب[2]

وا دەبینم حیکمەتی دانانی حوکمی پشتتێکردن و بەرژەوەندی ژنەکە دلوا دەکەن ژنەکە لە رێگەی قەزلوە دلوای گێڕانەوە یان تەڵاقدانی بکات، گەر پیاوەکە بەبێ بوونی پاساوێك هەردوو کارەکەی رەد کردەوە قازی لە بری ئەو یەك تەڵاقی بائینی ژنەکە دەخات ئەوەش بۆ رزگارکردنی ژنەکە لە ستەمی پیاوەکە و سڕینەوەی زیان لەسەری، ئەم مافە بە دواخستن و بەبێدەنگبوون یان بە لێخۆشبوونی ژنەکە لە پیاوەکە بەرنابێتەوە، هەتا ئەو لە زیاندا بێت بەهۆی ئەو کارە خراپەی مێردەکەیەوە.

---

[1] راجع المحلى ٤٣/١٠. وما بعدها.
[2] جوهر النظام ٢٣٥/٢

**هەڵوێستی یاسا:**

جێگەی داخە یاسای باری کەسێتی وڵاتە عـەرەبی و ئیسـلامییەکان تـاکو ئێسـتا نازانن پشتتێکردن و حوکمـەکانی پشـتتێکردن چـیین، بـەڵام دەسـتیان بـردووە بـۆ بابەتی کۆچلێکردن وەك هۆیەك لە هۆیەکانی جیاکردنەوەی قەزاییانە.

مادەی(٢/٤٣) لە یاسای باری کەسـێتی عێراقـی راسـتکراوە بـە دەق دەڵێـت: بـۆ ژنەکە هەیە داوای جیابوونەوە بکات گەر پیاوەکە بۆ ماوەی دوو ساڵ و زیـاتر بـەبێ بیانوویەکی شەرعی کۆچی لێکرد، با پیاوەکەش شوێنی نیشتەجێبوونی زانراو بێت و خاوەنی ماڵ و سامانێك بێت نەکە بتوانێت لێی خەرج بکات.

# باسی دەیەم:
# تەڵاقی نوێنەر

**نوێنەرایەتی:**

نوێنەرایەتی یان ڕێکەوتنییە: بە پێی ویستی هەردوو لایەکە تەواو دەبێت، و دەبێتە خاوەنی هەموو مافێکی هەڵسوکەوت لەوەی لەسەری ڕێکەوتوون وەك بریکاری، ئەوەش بریتییە لە راستکردنەوەی کەسێك لەلایەن کەسێکی ترەوە لە جێگەی خۆی لە هەڵسوکەوت لەو شتانەی خاوەنی هەڵسوکەوتە تێیاندا.

یان شەرعییە: بە ویستی شەرع بڕیاری لەسەردراوە وەك سەرپەرشتیاری تایبەت بۆ سەرپەرشتیار و وەسێتدار لەسەر کەسی ناکام.

یان قەزایییە: بەپێی سەرپەرشتیاری گشتی بۆ قازی، بۆیە دەبێتە بریکاری ناکام لە هەندێ هەڵسوکەوتدا کە زەرورەت یان بەرژەوەندی ناکامەکە داوای دەکات، لەوانە تەڵاق.

بینا لەسەر ئەوە تەڵاقی بریکار یان لە ڕێگەی بریکارییەوەیە یان سەرپەرشتیاری، هەریەك لە دوو ڕێگەکە لە دوو لقدا دەست بۆ دەبەین:

# لقی یەکەم:
# بریکاردانان لە تەلاقدا

فەقیهان لە بریکاردانانی تەلاقدا جیاوازیان هەیە، جمهوور لەسەر ڕێگەپێدانی بریکارن لە تەلاقدا، زاهیرییەکان بە نادروستی دەبینن.

أ-جمهووری فەقیهانی موسڵمان بۆ ئەوە دەچن وەك چۆن مافی ئەوەی هەیە ڕاستەوخۆ تەلاق بدات مافی ئەوەشی کەسانی تر بکات بە بریکار بۆ ئەوەی تەلاقی بۆ بدات هەرکات بیەوێت، و لە هەر شوێنێك بیەوێت گەر بریکارگرەکە کۆتوبەندی نەکردبێت بە کات و شوێنێکی دیاریکراو، و بریکارییەکە ڕاوەستاو و بەردەوام بێت، بۆ بریکارگر هەیە بریکارەکە کەنارگیر بکات پێش تەلاقدان، هەموو ئەوانە لەگەڵ جیاوازی لە هەندێ درێژەپێدانی بەشەکیدا، بەم جۆرە:

**حەنەفییەکان:**

"ابن همام" دەڵێت: (بریکار بە تەلاق گەر بەرانبەر برێك لە ماڵ نەبێت بە تەلاقی بریکارگرەکە کەنارگیر ناکرێت یەکسانە بریکارگرەکە بە بائین تەلاقی دابێت یان بە رجعی، بۆ بریکارەکە هەیە دوای ئەوە تەلاقی ژنەکە بدات گەر لە عیدەدا بوو، کاتێك ژنەکە عیدەکەی تەواو بوو کەنارگیر دەکرێت، تەنانەت گەر بریکارگرەکە لەدوای عیدە هاوسەرگیری لەگەڵ کردەوە تەلاقی بریکارەکە بەسەر ژنەکەدا ناکەوێت، بە پێچەوانەی ئەوەی گەر بەر لە کۆتاهاتنی عیدەکە هاوسەری لەگەڵ کرد-لەبارێکدا گەر تەلاقەکە بائین بوو- ئەوا گەر بریکارەکە تەلاقی بدابایە تەلاقەکە دەکەوێت)[1].

---

[1] شرح فتح القدير ٣/٤٩٤.

**مالیکییەکان:**

تەلاق بە بریکاردانان ڕێگەپێدراوە، بۆ بریکارگرەکە هەیە بریکارەکە کەنارگیر بکات بەر لە تەلاقدان، دوای ئەوە ناکەوێت یەکسانە بریکارەکە بە کەنارگیرکردنەکەی زانی بێت یان نە، ئەوەی مامۆستا "محمد سلام مدكور" دەیلێت: (بۆی هەیە لە بریکارییەکە کەنارگیری بکات بە پێچەوانەی مالیکییەکانەوە کە مافی کەنارگیرکردن بە بریکارگرەکە ڕەوا نابینن، چونکە ئەمرێکە مافی پیاوەکەی پێوە پەیوەست بووە)[1] قسەیەکی ناتەندروستە بەڵگەیە لەسەر نابلۆقەنەدانی ئەو مامۆستا بەڕێزە بە ڕای مالیکییەکان، لە کاتێکدا لە "الشرح الصغير"دا هاتووە: (بۆی هەیە(واتە بۆ پیاوەکە هەیە) بریکارەکەی کەنارگیر بکات بەر لە ئەنجامدانی ئەوەی پێی ڕاسپێررا بوو مەگەر بە هۆی پەیوەستبوونی مافی ژنەکەوە بەوەی پیاوەکە پێی وتبێت: گەر ژنم بەسەردا هێنای کارەکە بەدەستی خۆتە یان کارەکەت چووەتە ناو هێنانی ژنە نوێیەکەوە، واتە کارەکە بە بریکاری ڕادەستی تۆ کراوە، گەر ژنی بەسەردا هێنا بۆی نییە ژنەکە لە بریکارییەکە کەنارگیر بکات)[2].

کەوابوو قسەی مالیکییەکان بە ڕێگەنەدان بە کەنارگیرکردنی بریکار تەنها یەك حاڵەتی تایبەت لەبارەیەوە هاتووە، بەڵام جگە لەو حاڵەتە جیاوازی نییە لە نێوان ڕای، ئەوان و ڕای جمهووردا لە گونجاوی کەنارگیرکردنی بریکار بەر لە تەلاق.

**شافیعییەکان:**

ئەوانیش وەك جمهوور لەسەر ڕێگەپێدانی گرتنی بریکارن لە تەلاقدا و لە لایان تەلاقی پێ دەکەوێت گەر بریکارەکە سەرپێچی لە مەرجەکانی بریکارگرەکە نەکات، لە "الأنوار"دا: (گەر بڵێت تۆم کرد بە بریکار لە تەلاقدانی بە ئامادەبوونی فلان، یان لە فلان شار یان لە فلان ڕۆژدا یان تەلاقی بدە گەر داوای کرد یان گەر ویستی،

---

(١) احكام الاسرة في الاسلام للدكتور سلام مدكور ٢/٩٠.

(٢) الشرح الصغير مع حاشية الصأوي ٢/٤٣٦. وورد نفس المضمون في شرح الخرشي ٤/٦٩ـ٧٠.

بریکارەکە سەرپێچی لەمانە کرد تەڵاقەکەی ناکەوێت، گەر پیاوەکە بە سێ تەڵاق تەڵاقی دابوو بریکارەکە بە یەك تەڵاقی بدات تەڵاقەکە دەکەوێت، گەر بریکارگرەکە یەك تەڵاقی دابوو بریکارەکە سێ تەڵاقی بە یەك گوزارە دابوو تەڵاق نادرێت، و بە سێ گوزارەش تەنها یەك تەڵاق دەکەوێت)[1].

**حەنبەلییەکان:**

بۆ حەنبەلییەکان درێژەپێدانێك لەمەڕ پەشیمانبوونەوە لە بریکار هەیە هەندێ جار جیاوازی هەیە لەگەڵ جمهوور، ئەوان پێیانوایە هەندێ هەڵسوکەوتی تێکەڵبوون(لە نێوان ژن و پیاوەکە) کەنارگیرکردنی بریکارەکەیە، " المرداوی" دەڵێت: (گەر بۆ تەڵاق بریکاری گرت لەو کەسانەی بریکارییان دروستە تەڵاقەکەی دروستە، بۆی هەیە هەر کات بیەوێت تەڵاقی بدات مەگەر پیاوەکە رادە و سنوورێکی بۆ دانابێت.

دروست لە مەزهەبدا: (چوونە لا(جووتبوون) لەگەڵ ژنەکە بریکارەکە کەنارگیر دەکات، هاوەڵانی ئەحمەد لەسەر ئەمەن، لە پووچبوونەوەی بە ماچ جیاوازی هەیە)[2]، هەروەها دەڵێت: (داوای پیاوەکە-لای هاوەڵانمان-قبووڵ دەکرێت کە لە بریکارییەکە پەشیمان بووەتەوە بەر لەوەی بریکارەکە لە ئەوەوە تەڵاقەکە بخات)[3].

**جەعفەرییەکان:**

لەگەڵ جمهوور هاوڕان لە رێگەدان بە بریکاری لە تەڵاقدا پەیوەست بە کەسی ئامادەنەبوو، گەر پیاوەکە ئامادەش بوو دروست لەلایان نیسان دروستییەتی، بەرانبەر بەمە قسەیەکیان هەیە لەگەڵ قسەی زاهیرییەکاندا هاوڕایە لەباری ئامادەبوونی پیاوەکەدا، ئەوان بۆ کەوتنی تەڵاق بە رێگەی بریکار شایەت لەسەری-لە

---

[1] الانوار للاربيلي ٢/ ٩٣.

[2] الانصاف ٨/٤٤٤. ورد نفس المضمون في الاقناع ٤/٥.

[3] الانصاف المرجع السابق ٨/٤٤٦.

کاتی بەبریکارکردندا– بە مەرج دادەنێن، چونکە بە رای ئـەوان تـەڵاق بـەبێ شـایەت ناکەوێت.

"الكليني" دەڵێت: (لە ئەبی عەبدوڵاوە پرسیارم لێ کرد لە پیاوێك تەڵاقی ژنەکەی دەداتە دەست پیاوێکی تر، و دەڵێت: بە شایەت بـن مـن تـەڵاقی فلانـە کەسـم دایـە دەست فلانە کەس ئایا ئەوە بۆ ئەو پیاوە دروستە؟

وتی: بەڵێ، ریوایەتیش کراوە بریکاری لە تەڵاقدا رێگە پێنەدراوە)[1]

لە "إيضاح الفوائد"دا[2]: (لە کۆتاییدا شێخ(مەبەستی "ئیبن عەلامە"یە) بۆ ئـەوە دەچێت بریکاردانانی کەسی ئامادە بۆ تەڵاق دروست نییە) هەروەها تیایـدا هـاتووە: (لە "الصادق"ەوە بریکاری لە تەڵاقدا دروست نییە، شێخ هەڵیداوەتە سەر بریکـاری کەسی ئامادە وەك کۆکردنەوەی نێوان بەڵگەکان)[3].

**زەیدییەکان:**

رایان لەگەڵ جمهور یەکێتەوە، بەڵام بە مـەرجی دەگـرن بریکارەکـە گـوزارەی تەڵاقەکە بداتە پاڵ بریکارگرەکە وەك پێوانەیەك بۆ سەر هاوسەرگیری[4].

ب–**زاهیرییەکان** دەڵێن: تەڵاق بە بریکاردانان رێگە پێنەدراوە، چونکە بە دەق و کاری پێشین لـە هـاوەڵان و شـوێنکەوتووان جـێگیر نـەبووە، هـەروەها لەبـەر ئەوەی هەر کات قورئان باسی تەڵاق دەکـات رووی گوتـاری دەکاتـە پیـاوان، هەروەها لەبەر ئەوەی لـە هاوشـێوەکانی تەڵاقـدا–لـە پشـتتێکردن و لـەعن و زیهار– بریکاردانان دروست نییە.

ئیبن حەزم دەڵێت: (بریکـاری لـە تـەڵاق رێگـە پێنـەدراوە چـونکە خـودا–ﷻ– دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا﴾ بۆیە کـاری کەسـێك بـۆ کەسـێکی تـر

---

[1] الكافي للكليني ٦/١٢٩.

[2] ٣/٢٩٢.

[3] المرجع السابق ٣/٢٩٣.

[4] البحر الزخار ٤/١٦٥.

گونجاو نییە مەگەر قورئان یان سوننەتی جێگیر لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) رێگەی پێدابێت، قسەی هیچ کەس بۆ قسەی هیچ کەسی تر دروست نییە مەگەر قورئان یان سوننەتی پێغەمبەر مۆڵەتیان پێ دابێت، لە تەڵاقی کەسێك لە کەسێکی ترەوە بە دانانی بە بریکار ئایەتێکی قورئان یان سوننەتێك نەهاتووە، بۆیە ئەو کارە پووچە، ئەوانەی جیاوازیان هەیە لەگەڵ ئێمە ئەوانەن بە بۆچوونی خۆیان پێوانەیان کردووە، هەموو کەسێك بەئاشکرا دەزانێت تەڵاق قسەیە، زیهار قسەیە، لەعن قسەیە، پشتتێکردن قسەیە، لەوەدا جیاوازیان نییە کە هیچ کەس ناتوانێت لە کەسێکی ترەوە زیهار بکات یان لەعن بکات یان پشتیتێبکات، نە بە بریکاری و نە بە رێگەی تر، باشە بۆ تەڵاق پێوانە ناکەن بۆ سەر ئەوانە؟ بەڵام ئەوان(فەقیهانی تری نەیار بە بۆچوونەکەی ئەوان) نە شوێنی دەق دەکەون نە لە پێوانە دەزانن)[1].

**سەرچاوەی جیاوازییەکە:**

سەرچاوەی جیاوازی فەقیهان لە رێگەپێدانی تەڵاق لە رێگەی بریکاردانانەوە جیاوازیانە لە دەستبردن بۆ ئەو رێسا ئوسوڵییە کە دەڵێت: (بنەڕەت لە کاری مرۆڤدا دروستییە گەر بەڵگەیەك راست نەبێتەوە پێچەوانەی ئەوە) ئەمەش لە رێسای:(بنەڕەت لە شتەکاندا موباحبوونە)، جمهوور بەڵگەیەکی شەرعییان لەلا جێگیر نەبووە رێگر بێت بۆ بە بریکاردانان لە تەڵاقدا، بۆیە دەڵێن دروستە وەك دەستبردنێك بۆ یاسا ئاماژەپێکراوەکە.

بەڵام ئەوەی رای زاهیرییەکانی لەسەر دامەزراوە بریتییە لە: (بنەڕەت لە کاری مرۆڤدا پووچەڵییە گەر قورئان یان سوننەتی جێگیر یان ئیجماعی هاوەڵان رێگەی پێ نەدابێت)، ئەوان دان بە ئیجماعی جگە لە هاوەڵاندا نانێن، چونکە بەپێی گومانی زاهیرییەکان لەدوای هاوەڵان ئیجماع دانەمەزراوە.

---

[1] لمزيد من التفصيل راجع المحلى ١٠/١٩٦.

**پارسەنگدان:**

پارسەنگدراو بریتییە لە قسەی جمهوور لەبەر جێگیرنەبوونی بەڵگەیەك رێگری بكات لە بریكاردانان لە تەڵاقدا، بەڵام بەرژەوەندی ژیانی هاوسەری داوا دەكات رێگری لە بریكاردانان لە تەڵاق بگیرێت مەگەر تەنها بۆ ئەو كەسانەی بزرن یان دەستەوسانن لە ئامادەبوون بە خودی خۆیان لەبەردەم قەزادا و دانانی باجێكی دارایی بۆ هەر كەسێك سەرپێچی لەوە دەكات، نەك لەبەر ئەوەی تەڵاق بە بریكاردانان ناكەوێت بەڵكو بۆ كەمكردنەوەی رێژەی رووداوی تەڵاقی بێزراو لەلای خودا و پێغەمبەرەوە(ﷺ)

**هەڵوێستی یاسا:**

راستكردنەوەی پێنجەم ژمارە(١٥٦)ی ساڵی ١٩٨٠ بۆ یاسای باری كەسێتی عێراقی راستكراوە مەزهەبی زاهیریان دەست بۆ بردووە لە نادروستی بریكاردانان لە تەڵاقدا و رێكارەكانی، مەگەر تەنها بۆ خودی ژنەكە، بۆ مێردەكە هەیە رێگە بە ژنەكە بدات بریكار بگرێت لە جێگەی خۆی تاكو خۆی تەڵاق بدات گەر ئەوەی بوێت.

لە مادەی یەكەمی ئەم راستكردنەوەدا هاتووە: (مادەی سی و چوار[1] لە یاسای باری كەسێتی ژمارە ١٨٨ بۆ ساڵی ١٩٥٩ی راستكراوە دەسڕێتەوە و جێگەی بەمانە دەگیرێتەوە:

یەكەم—تەڵاق بریتییە لە هەڵگرتنی گرێبەندی هاوسەرگیری بە خستنی لەلایەن پیاوەكەوە یان لەلای ژنەكەوە، گەر ژنەكە كەسێكی بە بریكار گرت یان دایە دەستی كەسێك یان لە قازییەوە، تەڵاق تەنها بەو گوزارە تایبەتە دەكەوێت بۆی دیاریكراوە

---

[1] دەقی مادە سڕاوەكە: (مادەی سی و چوار—تەڵاق بریتییە لە هەڵگرتنی گرێبەندی هاوسەرگیری بە خستنی لەلایەن مێردەكەوە یان بریكارەكەی یان لە ژنەكەوە گەر كرابێت بە بریكار تیایدا یان سەرپشك كرابێت یان لە قازییەوە، تەڵاقی تەنها بەو گوزارە داڕێژراوە دەكەوێت شەرعی بۆی تایبەت كردووە). الجریدة الرسمیة (الوقائع العراقیة) العدد (٢٧٩٥) السنة (٢٣) ٢٢/أيلول/١٩٨٠.

لەڕووی شەرعەوە.

دووەم- لە ڕێکارەکانی باسی کۆمەڵایەتی و حەکەمدانان لە خستنی تەڵاقدا بریکارگرتن بەهەند وەرناگیرێت.

مادەی دووەم: بە هیچ دەقێك كار ناکرێت بەرهەڵستی ئەم یاسایە بکات.

## لقی دووەم:
## سەرپەرشتیاری لە تەڵاقدا

مەبەست بە سەرپەرشتیاریی سەرپەرشتیاری تایبەت(سەرپەرشتیاری وەلی یان وەسێتدار) و سەرپەرشتیاری گشتییە(سەرپەرشتیاری قازی)، فەقیهانی شەریعەت لە حوکمی تەڵاق لە ڕێگەی سەرپەرشتیارەوە بۆ سێ ڕا جیاوازیان لە نێواندایە:

**ڕای یەکەم:** سەرپەرشتیار بە سەرپەرشتیاری تایبەت[1] مافی ئەوەی نییە تەڵاقی ژنی کەسی ناکام بدات کە لەژێر سەرپەرشتیاری ئەودایە، منداڵ بێت یان شێت یان کەسێك لە حوکمی ئەو دوانەدا بێت، سەرەڕای ئەوەی لەلای جمهوور بەو سەرپەرشیارییە دەتوانێت هاوسەرگیری بۆ بکات، ئەم ڕایە فەقیهەکانی " حەنەفیەکان ، و شافیعیەکان، و حەنبەلیەکان لە ریوایەتێکدا، و زەیدیەکان ، و ظاهریەکان " لەسەری دامەزراون.

**حەنەفییەکان:**

دەڵێن: تەڵاق لە سەرپەرشتیارەوە دروست نییە، مۆڵەت بە بچووك دەدرێت تا باڵغ دەبێت، بەڵام لە شێت و هاوشێوەکانی گەر ژنەکە تووشی زیان دەبوو لە تێکەڵاوی لەگەڵی کارەکەی بەرزدەکرێتەوە بۆ لای قازی، و داوای جیابوونەوەی لێ دەکات، بۆ قازیش هەیە تەڵاقی بدات بۆ هەڵگرتنی زیانەکە لەسەری[2].

[1] ئەوە مافی وەسێتداریش نییە.
[2] المبسوط للسرخسي ٦/١٧٨.

**شافیعییەکان:**

لەگەڵ حەنەفییەکان هاوڕان لەوەدا کە لە مەرجەکانی دروستی تەڵاق ئەوەیە لە مێردەکەوە بێت یان لە بریکارەکەیەوە، یان لە ژنی کەسێکی شێتەوە، "الشیرازي" دەڵێت: (بۆ باوك دروست نییە ژنی کوڕە منداڵەکەی تەڵاق بدات بە بریتییەك یان بە بێ بریتی.. بەڵام ژنی پیاوێکی شێت گەر دلوایەك پێشکەش بە قازی بکات و تیایدا دلوا بکات جیابیکاتەوە بۆ قازی هەیە لە یەکتریان جیابکاتەوە[1]...)

هەروەها دەڵێت: (گەر ژنەکە مێردەکەی بە شێت بینی هەڵبژاردنی بۆ جێگیر بووە، هەڵبژاردنەکە یەکسەرە، هەڵوەشانەوە تەنها لای دادوەر دروستە، چونکە جیاوازی تێدا هەیە)[2].

**حەنبەلییەکان:**

لە ریوایەتێکیاندا تەڵاق تەنها لە مێردەوە دەکەوێت لەبەر ئەو فەرموودەی دەفەرموێت: ((تەڵاق بۆ ئەو کەسەیە دەست دەبات بۆ لاق))[3]، هەروەها لەبەر ئەوەی بەردانەوەی مافی مێردەکەیە و بە مولکی نەکردووە وەك ئەستۆپاکی لە قەرز و بەردانەوەی مافی تۆڵە، هەروەها لەبەر ئەوەی ڕێگەی ئارەزووە بۆیە ناچێتە ناو سەرپەرشتیارییەوە[4]

**زەیدییەکان:**

زەیدییەکان لەگەڵ رای جمهوور هاوڕان لە دروست نەبوونی تەڵاقدا بە سەرپەرشتیاری تایبەت، لە "التاج المذهب"دا: (لە سەرپەرشتیاری منداڵ و شێتەوە تەڵاق دروست نییە، هەر بەو جۆرە لە گەورە(سید)ی بەندەیەکەوە بۆ تەڵاقدانی ژنی

---

(1) المهذب ٧١/٢.

(2) المهذب ٤٨/٢.

(3) ابن ماجة: ٢٠٧٢.

(4) المغني والشرح الكبير ٨٧/٧ وما بعدها. المحرر ٥٠/٢.

بەندەکەی)[1]، لە "البحر الزخار"دا: (تەڵاق تەنها لە مێردەوە دروستە با باوکی منداڵێکی بچووکیش بێت بەهۆی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((تەڵاق بۆ ئەو کەسەیە دەست دەبات بۆ لاق))[2].

**زاهیرییەکان:**

فەقیهانی زاهیری دەڵێن: هاوسەرگیری بۆ منداڵ نییە تاکو تەڵاقی بۆ هەبێت.

ئیبن حەزم دەڵێت: (بۆ باوك و کەسانی تر دروست نییە هاوسەرگیری بۆ منداڵی نێری بچووك بکەن تا باڵغ دەبێت، گەر ئەو کارەی کرد بە هەمیشەیی هەڵوەشاوەتەوە، دەستەیەك(لە زاهیرییەکان) مۆڵەتیان داوە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نییە جگە لە پێوانە کردنی بۆ سەر کچی منداڵ، هەموو پێوانەکە پووچە)[3]

**ڕای دووەم:** وتنی دروستی تەڵاقە لە سەرپەرشتیارەوە گەر باوك بوو بە هاوڕابوونی فەقیهان[4]، یەکسانە بێ بەرانبەر بێت یان بە بریتییەك بێت، باپیریش حوکمی باوکی هەیە لەباری نەبوونی باوکدا، بەڵام لەسەر دروستی تەڵاقی وەسێتدار هاوڕانین، لە "المنتقی"دا: (کوڕی بچووك دروستە باوك خولعی بۆ بکات لە جێگەی ئەو، بەڵام بۆ وەسێتدار دروست نییە، چونکە دەبێتە خاوەنی تەڵاق)[5].

"الخرشي" دەڵێت: (پێویستبوونەکەی ئەوەیە مێردێکی داوالێکراوە با گێلیش بێت یان سەرپەرشتیاری بچووك، دروستییەکەی لە وەسێتدارەوە جیاوازی تێدایە)[6].

---

(1) التاج المذهب ٢/١١٨.
(2) البحر الزخار ٣/٦٥.
(3) المحلى ٩/٤٦٢.
(4) واتە بە کۆدەنگی فەقیهەکانیان.
(5) المنتقی شرح الموطأ ٤/٦٦.
(6) شرح الخرشي ٤/١٧.

بەناوبانگ لە مەزهەبی "أبي القاسم"دا و ریوایەتەکەی لە مالیکەوە: ئەوە بۆ هیچ کەسێك نییە جگە لە باوك)[1].

**حەنبەلییەکان:**

لە یەکێك لە دوو قسەی حەنبەلییەکانەوە تێدەگەین بۆ سەرپەرشتیار هەیە ژنی ناکام بەهۆی بچووکی یان شێتی یان گێلییەوە تەڵاق بدات ئەگەر پێویست بوو.

"ابن قدامة" دەڵێت: (ئەوەش قسەی " عطاء وقتادة"یە لە ئیبن عومەرەوە: لەجێی کوڕێکی گێلی خۆی تەڵاقیداوە، هەروەها ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردووە، بە هەمان شێوە لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: کەسی گێل گەر گەمەی بە خانەوادەی خۆی کرد سەرپەرشتیارەکەی لە جێگەی ئەو تەڵاقی دەدات)[2].

**رای سێیەم**—درێژەپێدانە: ئەوەیە کە فەقیهە جەعفەرییەکان بۆی دەچن و دەڵێن: سەرپەرشتیار باوك بێت یان باپیر لە شێتی بەردەوامەوە تەڵاق دەدەن گەر بەرژەوەندی بانگ بۆ ئەوە بکات و ششێتێتییەکەی پەیوەست بێت بە منداڵییەوە، گەر دوای باڵغبوون شێت بوو یان سەرپەرشتیاری نەبوو ئەوا دادوەر ئەو کەسەیە تەڵاقدانەکە دەگرێتە ئەستۆ، بۆ سەرپەرشتیار و دادوەر تەڵاقدان نییە لەسەر منداڵ یان شێتی ناوبەناو، بەڵکو مۆڵەت بە منداڵەکە دەدرێت تا باڵغبوون و شێتەکە تا نۆرەی چاکبوونەوە.

ئەم جیاکردنەوەیان بەوە شیکارکردووە منداڵ ماوەیەکی بۆ هەیە چاوەڕوان دەکرێت و ناتەواوییەکەی کۆتایی پێ دێت، بە هەمان شێوە شێتی ناوبەناو، هەر بەو جۆرە خۆیان پاڵپشت کردووە بەوەی گواستووویانەتەوە لە فەرموودە، لەوانە: ((کەسی گێلی ئەقڵ رۆیشتوو تەڵاقی سەرپەرشتیارەکەی بۆی دروستە))، ((گێل سەرپەرشتیارەکەی لە ئەوەوە تەڵاقی بۆ دەدات)) حوکمی منداڵیان لەسەر بنەڕەت

---

[1] المنتقى المرجع السابق.

[2] المغني ٨٧/٧ وما بعدها.

هێڵاوەتەوە بە فەرموودەی: (تەڵاق بۆ ئەو کەسەیە دەست دەبات بۆ لاق))، ئەمە رای زۆرینەیانە، دەستەیەك لەوان لەسەر دروستی تەڵاقدانی دادوەرن لە شێتەوە بەرەهایی، بەبێ جیاوازی نێوان شێتی بەردەوام و شێتی ناوبەناو، گێل لەلایان وەك شێت وایە، سەرباری هەموو ئەوانە دەڵێن: بۆ ژنی پیاوی شێت هەیە هاوسەرگیرییەکەی خۆی بەدەستی خۆی هەڵبوەشێنێتەوە[1].

**سەرچاوەی جیاوازییەکە:**

سەرچاوەی جیاوازی فەقیهان لەم پرسەدا بریتییە لە جیاوازییان لە گشتگیری سەرپەرشتیاری تایبەت بۆ ئەو شتانەی دەچنە ناو مافە تاکەکەسییە رووتەکان لەلایەکەوە و جیاوازی لە رادەی دەستگرتن بە هەندێ لە ئاسارەوە کە مافی تەڵاق لە دەسەڵاتی مێرددا یان بڕیکارەکەی کورت دەکاتەوە لە لایەکی ترەوە، پاشان جیاوازی لە نێوان ناکام کە پێشبینی نەمانی ناتەواوی لێوەشاوەییەکەی دەکرێت لەگەڵ ناکام کە پێشبینی نەمانی ناتەواوی لێوەشاوەییەکەی ناکرێت.

لە دیدگای مالیکییەکانەوە سەرپەرشتیاری کاروبارە دارایی و نادارابییەکان دەگرێتەوە بەهۆی زۆری سۆز و بەزەیی سەرپەرشتیارەوە(باوك یان باپیر) هەروەها بۆ چاودێری بەرژەوەندی ناکام، لە کاتێکدا کەسانیتر پێیان وایە پەیوەندی هاوسەرگیری سروشتێکی تایبەتی هەیە ناچێتە ژێر سەرپەرشتیاری باوك یان باپیرەوە، گەر پێویستی دلوای پچڕانی ئەو پەیوەندییەی کرد دلوا لە ژنەکەوە بەرز دەکرێتەوە بۆ قەزا تاکو لە دۆخی ئەو ورد ببنەوە.

**پارسەنگدان:**

پێموایە پارسەنگراو ئەوەیە دەسەڵاتی تەڵاقدان نەدرێت بە سەرپەرشتیار، هەر بەو جۆرە بانگ دەکەم بۆ دەستبردن بۆ مەزهەبی زاهیرییەکان لە رێگری

---

[1] شرائع الاسلام ٢/٥٣ . الكافي ٦/١٢٥. الروضة البهية ٢/١٤٨. مستدرك الوسائل جـ ٢ الباب (٢٥ـ٢٧).

هاوسەرگیری منداڵ، بەوەش گرفتی تەڵاقی بۆ نایەتە پێش، و کارکردن بە قسەکەی "ابن شبرمة" و ئەوانەی هاوڕان لەگەڵی لە نادروستی هاوسەرگیری منداڵ[1]، چونکە ژیان ئاڵۆز بووە و داواکارییەکانی گۆڕانی بەسەردا هاتووە و دەروونەکان گۆڕاون، تایبەت بە تەڵاقی شێت و ئەوەی لە حوکمی ئەودان ڕێسای گشتی دلوا دەکات سوودبینین لەو مافە پەیوەستە بە لێوەشاوەیی دلواکەرەوە نەك لێوەشاوەیی "دلوا لەسەرکراو"، گەر ژنی پیاوە شێتەکە یان گێلەکە باڵغ و ئاقڵ بوو و دلوای لەسەر مێردەکەی بەرز کردەوە و دلوای لە قەزا کرد جیایبکاتەوە، بەهۆی زیانێکی کردارییەوە ئەوا لەسەر قازی پێویستە جیاکردنەوەکە لە ئەستۆبگرێت وەك نوێنەری پیاوەکە بۆ هەڵگرتنی زیانەکە، چونکە پیاوەکە ناتوانێت بە چاکە ژنەکەی لە ئەستۆ بگرێت.

**هەڵوێستی یاسا:**

یاسادانەری عێراقی لە مادەی حەوتدا لێوەشاوەیی هاوسەرگیری بە تەواوکردنی هەژدە ساڵ لە تەمەن داناوە پەیوەست بە هەردوو هاوسەرەکە، بڕگەی یەکەم بە دەق هێناویەتی: (لە تەواوی لێوەشاوەیی هاوسەرگیری ئەقڵ و تەواوکردنی هەژدە ساڵ بەمەرج دەگیرێت)[2]، ئەوەی کردووە بە بنەڕەتێك و پاشان لەم بنەڕەتە هەڵواردەی ئەوەی کردووە کە لە مادەی هەشتدا هاتووە، دەقەکەی: (گەر کەسێك پازدە ساڵ لە تەمەنی تەولو کرد و دلوای هاوسەرگیری کرد بۆ قازی هەیە مۆڵەتی پێ بدات گەر لێوەشاوەیی و قابیلییەتی جەستەیی بۆ ئەو کارە سەلمێنرا دوای ڕازیبوونی سەرپەرشتیاری شەرعی).

بینا لەسەر ئەوە لە داهاتوودا گرفتی تەڵاقی منداڵی کوڕ و کچ ڕوو لە قەزا ناکات.

---

[1] المحلى ٤٦٢/٩ وفيه: (ئیبن شەبرمە دەڵێت: بۆ باوك دروست نییە هاوسەرگیری بۆ کچە بچووکەکەی بکات تا باڵغ دەبێت و مۆڵەت دەدات، هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) لە تایبەتمەندی پێغەمبەرە و پێوانە ناکرێت بۆ سەری..)

[2] یاسای باری کەسێتی ژمارە(١٨٨) بۆ ساڵی ١٩٥٩ی راستکرلوە.

لە مادەی چل و سێ برگەی شەشەم یاسادانەری عێراقی ماف داوە بە ژنەکە دلوای جیابوونـەوەی قەزاییانـە بکـات بـە دلوایـەك پێشکەشـی دەکـات بـە قـازی لەگـەڵ سەلماندنی شێتێتی پیاوەکەی، مادەی (١٠٥) لە یاسای سوری دانـی نـاوە بـە مـاف جیابوونەوەدا گەر دوای گرێبەستەکە پیاوەکە شێت بوو، یاسای جەزائیری لە (م٣)دا لێوەشاوەیی هاوسەرگیری پیاوی بە تەولوکردنی هەژدە ساڵ و لێوەشاوەیی ژنی بـە تەولوکردنی شازدە ساڵ لە تەمەن داناوە، دلوای جیابوونـەوەی بـەهۆی زیانـەوە بـە ئافرەت داوە لە (م٤٥)دا.

بەشـی شەشـەم لـە یاسـای مـەغریبی بـە دەق هێناویـەتی: (پێویسـتە هـەردوو هاوسەرەکە ئاقڵ بن و خاڵیبن لە رێگری شەرعی) بەشی پەنجا و چـوار دانینـاوە بـە جیاکردنەوەی قەزاییانەی پیاوی شێتدا.

بەشی شەشەم لە یاسای مەغریبی بە دەق هێناویەتی: (بۆ لێوەشاوەیی پێویستە هاوسەرگیری داخوازیکەر و داخوازیکراو ئاقڵ بن و داخوازیکەر شازدە ساڵ لە تەمەنی تەولو کردبێت و داخوازیکراو پازدە ساڵ لە تەمەنی تەولو کردبێت، مادەی (١١٥) ماف بـە ژنەکـە دلوە دلوای جیابوونـەوە بکـات لـە قـازی گـەر سـەلمێنرا مێردەکـە بـە نەخۆشییەك تووشبووە قابیلی چاکبوونەوە نییە.

# بەشی چوارەم:
# تەڵاقدراو، و تەڵاقی حەیزدار و راسپێرراو

ئەوەی پەیوەندی هەیە بە پایەی یەکەم(گوزارە ی دارشتن)
لە بەشی دووەمی حوکمەکان و ئەوەی پەیوەستە بە پایە ی
دووەم(تەڵاقدەر) لە بەشی سێیەم باسی لێوەکرا،
لەم بەشەدا هەوڵدەدەین بە پوختی قسە لە سێ شت بکەین:
جێگەی تەڵاق، و حوکمی تەڵاقی حەیزدار و حوکمی تەڵاقی
راسپێرراو، ئەوەش لە سێ باسدا .

# باسی یەکەم:
# جێگەی تەڵاق

فەقیهان لەم بابەتەدا لەسەر دوو شت هاوڕان:

**یەکەم:** ژنی هاوسەرگیری راستبووەوەی دروست لەرووی حەقیقەتەوە یان لەرووی حوکمەوە دەبێتە جێگەی تەڵاق با پێش هاوملبوونیش بێت پێی، گەر نەچووبێتە ناو رێگرێك لە حەیز و زەیسانی.

**دووەم:** ژنی ناپەیوەست بە پیاوێکەوە لە رێگەی هاوسەرگیری دروستەوە بە حەقیقەت یان بە حوکم تەڵاقدانی بە تەڵاقی تێپەڕێنراو لە لایەن ئەو پیاوەوە بە هەند وەرناگیرێت پێش سەرهەڵدانی پەیوەندی هاوسەرداری نێوانیان.

لە چەند شتێکیدا جیاوازن: تەڵاقدانی ژنێك لە گێڕانەوەدا بێت بەر لە گێڕانەوەی، هەروەها: تەڵاقدانی جیابووەوە بە بەینوونەی بچووك، هەر بەو جۆرە: پەیوەستکردنی تەڵاقی ژنێك پێش هاوسەرگیری بەوەی لەدوای هاوسەرگیری دێتە دی، دیدگای فەقیهان لەوەی تیایدا جیاوازن دەخەینە روو، هەروەها لەم خستنەرووەوە رادەی دەسەڵاتی مێرد لە تەڵاقدان تایبەت بە جێگەی تەڵاق رۆشن دەبێتەوە.

**حەنەفییەکان:**

دەڵێن: جێگەی تەڵاق بریتییە لە ژنەکە بە حەقیقەت یان بە حوکم، ئەم ئافرەتانە دەچنە ژێر هاوسەرداری حوکمەوە: ئافرەتی خاوەن عیدە و تەڵاقدراو بە تەڵاقی رجعی، و ئافرەتی جیابووەوە بە بەینوونەی بچووك و ئافرەتی خاوەن عیدە بۆ جیابوونەوە(تەڵاقێکە لە شێوەی جیابوونەوە بە پشتتێکردن و نەبوونی پیاوەتییەوە)

و ئافرەتی خاوەن عیدە لە جیابوونەوە بەهۆی پاشگەزبوونەوە(لە ئاین)ی یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە یان قبوولْ نەکردنی ئیسلام لەلایەن ژنی هاوەڵدانەرەوە.

"السرخسي"[١] دەڵێت: گەر دوای خولع یان تەلاقدانی جیابوونەوە لێی لە عیدەکەیدا بڵێت: تۆ تەلاقدراوی، تەلاقەکەی -لەلای ئێمە- بەسەریدا دەکەوێت، بەهۆی ئایەتی: ﴿فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾، پاشان دوای ئەوە دەفەرموێت: (فان طلّقها)

پیتی "الفاء" مانای "الوصل و التعقيب-گەیاندن و بەدواداهاتن" دەگەیەنێت، بۆیە ئەمە دەبێتە دەق لەسەر کەوتنی تەلاقی سێ لەدوای خولع لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((خولعکراو راشکاوی تەلاقی پێ دەگات تا لە عیدەدا بێت))[٢]

لە پەیوەستکردنی تەلاق پێش هاوسەرگیری جیاوازیان کردووە لە نێوان پاڵخراو بۆ لای کاتێك کە دەبێتە خاوەنی تەلاق وەك دەڵێت بە ژنێك: گەر هاوسەرگیریم لەگەڵ کردی تۆ تەلاقدراوی، یان هەر ئافرەتێك هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەم تەلاقی کەوتبێت، لەگەڵ ئەوەی نەیداوەتە پاڵ کاتێك، وەك ئەوەی بە کەسێك بڵێت کە پەیوەندی هاوسەری لەگەڵی نییە: گەر بچیت بۆ سینەما-بۆ نموونە- تۆ تەلاقدراوی، پاشان هاوسەرگیری لەگەڵ کرد و ژنەکە چوو بۆ سینەما، بۆیە دەڵێن: تەلاقی یەکەمی دەکەوێت، بەڵام دووەم ناکەوێت، چونکە تەلاقەکە لە هاوسەرگیریدا نەبووە و نەشدراوەتە پاڵ هاوسەرگیری[٣].

پێموایە: ئەم جیاوازییە بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ ئەو ئەسڵەیان لە پەیوەستکردنی بە مەرجەوە، لەوەی گەر تەلاق پەیوەستکرا بە مەرجەوە لەگەڵ بوونی مەرجەکەدا دەبێت وەك قسەکەر بە تەلاق لەو کاتەدا، گەر مەرجەکە بینرایەوە

---

[١] راجع المبسوط للسرخسي ٦/٨٣.
[٢] رواه ابو سعيد الخدري وغيره، المرجع السابق ٦/٨٤.
[٣] راجع الجوهرة ٢/١١٠.

و ئافرەتەکە لەژێر دەسەلاتی هاوسەرگیری ئەودا بوو تەلاقەکە دەکەوێت[1]، پاشان، جیاوازییەکە دروست نییە، بۆیە باشترە بەرەهایی دروست نەبێت لەبەر راستنەبوونەوەی هاوسەرگیری دروست لەرووی راستەقینەوە یان لەرووی حوکمەوە لە کاتی سەرهەڵدانی تەلاقەکەدا.

**مالیکییەکان:**

لای ئەوان ئەو ئافرەتەی لە عیدەدایە و تەلاقی پێدەگات تەنها ئەو ئافرەتە دەگرێتەوە لە تەلاقی رجعیدا لە عیدەدایە، چونکە لە "حوکمی هاوسەردار"دایە بە پێچەوانەی کەسانی تر جگە لە ئەو.

لە "المنتقى"دا هاتووە: (کاتێك ئەوەی لە خولعدایە لە عیدەکەیدا تەلاقی پێناگات ئەوا ئەو تەلاقەی کە ئەوی لە تەلاقی یەکەم جیاکردۆتەوە بێدەنگییە) بەلام لە پەیوەستکردندا پێش هاوسەری وەك حەنەفییەکان وان لە جیاکردنەوەی نێوان تەلاقی پاڵدراو بۆ هاوسەرگیری و پاڵنەدراو بۆ هاوسەرگیری، لە یەکەمدا: (وەك: ئەوەی بڵێت: کاتێك هاوسەرگیریم لەگەڵ کرد تۆ تەلاقدراوی) هیچ کاریگەری نییە گەر گوزارەکەی دوای هاوسەرگیری بێت، جیاوازیان لەگەڵیان هەیە لە باری دیاریکردنی ژنەکە، بۆیە قسەکەی: (هەر ئافرەتێك هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەم تەلاقی کەوتبێت) لەلایان ژلوەژلوە لەبەر ئەو زیانەی لێیەوە سەرهەڵدەدات بۆ خودی خۆی.

لە "الموطأ"دا[2] هاتووە: لە عەبدولای کوڕی مەسعودەوە بە مالیك گەیشتووە: لەسەر ئەو قسەی: (هەر ئافرەتێك هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەم تەلاقی کەوتبێت) دەیوت: ئەو لەخۆیدا ناوی هۆز و ناوی ئافرەتەکەی نەهێناوە بۆیە هیچی لەسەر نییە، مالیك دەڵێت ئەمە باشترین قسەیەکە بیستبێتم، "المنتقى"[3] قسەی لەسەر کردووە بەوەی مەزهەبی مالیکە، " النخعي والشعبي والأوزاعي" دەڵێن: چونکە مالیك دەڵێت

---

[1] راجع المرجع السابق.

[2] المرجع السابق ٤/١١٥.

[3] المرجع السابق.

گەر دەروازەی خۆشی وەرگرتنی لەسەر خۆی داخست شتێکی پێ پێویست نابێت ئەگینا ئەوەی پێوە پێویست دەبوو، لە ریوایەتێکی نامەشهووردا لە مالیکەوە کە "ابن وهب[1]" ریوایەتی کردووە: (فتوای بۆ پیاوێك دا -کە وتبووی گەر لەگەڵ فلان کەس هاوسەرگیریم کرد تەلاقی کەوتبێت- وتبووی گەر هاوسەرگیری لەگەڵ کرد هیچی لەسەر نییە)

وایدەبینم ئەم ریوایەتە دروستە پێویستە کاری پێ بکرێت لەبەر ئەوەی وتمان هاوسەرگیری دروست لەرووی راستەقینەوە یان لەرووی حوکمەوە راست نەبووەتەوە.

**شافیعییەکان:**

دەڵێن: تەلاق پێش هاوسەرگیری دروست نییە، نە بە تێپەڕاندن وەك بلێت بە کەسێك کە پەیوەندی هاوسەرگیری لەگەڵی نییە "تۆ تەلاقدراوی" نە بە پەیوەستکردن وەك گەر هاوسەرگیریم لەگەڵ کردی تۆ تەلاق دراوی، یان گەر فلان کەسم هێنا یان هەر ئافرەتێك کە هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەم تەلاقی کەوتبێت، گەر هاوسەرگیری لەگەڵ کرد تەلاقی ناکەوێت نە لە دیاریکراودا نە لە کەسانی تردا، گەر دادوەر بریاری کەوتنی دا ئەوا بۆ شافیعی هەیە هەڵیبوەشێنێتەوە[2].

لە ئافرەتی عیدەگردا کە تەلاقی پێ دەگات دەستیان بردووە بۆ ئەوەی مالیکییەکان بۆیدەچن لەوەدا ئافرەتەکە لە عیدەی تەلاقی رجعیدایە، بۆیە جێگەی تەلاق لەلایان بریتییە لە ژنەکە لە راستەقینەدا یان لە حوکمدا کە تەنها لە تەلاقدراوی رجعیدا خۆی دەبینێتەوە، تەلاق بە کەسانی تر جگە لە ئەو ناگات[3].

بەلام لە خولعی رجعیدا بۆ شافیعییەکان دوو قسە هەیە[4]: لە "الأم"دا دەڵێت: دروستە بۆ مانەوەی هاوسەرگیری، لە "الإملاء"دا دەڵێت دروست نییە، چونکە خولع

---

[1] المرجع السابق.

[2] راجع حاشية البيجوري ٢/١٥٣. المهذب ٢/٧٧.

[3] راجع المهذب ٢/١٠٢.

[4] راجع نهاية المحتاج ٦/٤٣٩ وما بعدها.

بۆ حەرامکردنە و ئەویش حەرامکراوە.

**حەنبەلییەکان:**

بۆ ئەوە دەچن مالیکییەکان و شافیعییەکان کاریان پێکردووە، لەوەی جێگەی تەڵاق بریتییە لە ژنە راستەقینەکە یان ئەو ژنەی لە عیدەی تەڵاقی رجعیدایە، لە "المغني"دا[1] هاتووە: رجعی ژنێکە تەڵاقی پێدەگات، ئەوان لەگەڵ شافیعییەکاندا هاوڕان لەوەدا پیاو خاوەنی تەڵاق نییە پێش هاوسەرگیری با پەیوەستکردنیش بێت، لە " منتهى الارادات[2]"دا هاتووە: (تەنها لە مێردەوە دروستە بڵێت"گەر ژنەکە هاوسەرگیری کرد-یان دیاریکرا- ئەوا تەڵاقی کەوتبێت" بە هاوسەرگیری کردنی ژنەکە تەڵاقەکە ناکەوێت، گەر هەستییە سەرپێ تۆ تەڵاقدراوی کاتێك ئەو بێگانە[3] بێت پێی دواتر هاوسەرگیری لەگەڵ کرد و هەستایە سەرپێ تەڵاقەکە ناکەوێت)

**جەعفەرییەکان:**

ئافرەت لەلایان جێگەی تەڵاق نییە، مەگەر ئەم پێنج مەرجەی تێدا هاتبێتە دی، کە ئەمانەن:

١-مێرددار بێت، دروست نییە پیاوەکە بڵێت گەر هاوسەرگیریم لەگەڵ فلانە ئافرەت کرد تەڵاقی کەوتبێت، رجعی لەلایان تەڵاقی پێ ناگات، چونکە لە مەرجەکانی دروستی تەڵاق لەدوای تەڵاق بریتییە هاتنە ناوەوەی رجعە لە نێوان دوو تەڵاقەکەدا، گەر ویستی تەڵاقی تەڵاقدراوی رجعی بدات پێویستە لەسەری بیگێڕێتەوە پاشان تەڵاقی بدات لەگەڵ رەچاوکردنی مەرجەکانی تردا.

٢-گرێبەستەکە هەمیشەیی بێت، تەڵاقی موتعە ناکەوێت.

---

[1] المغني والشرح الكبير ٨/٤٧٧.

[2] منتهى الارادات ٢/٢٨٠، ٣١٢.

[3] مەبەست پێی کەسێکە بە پەیوەندی هاوسەرگیری بە تەڵاقدراوەکەوە نەبەستراوەتەوە.

٣–لە حەیز و زەیسانی پاك بوبێتەوە ئەمە لەو ژنەی چووەتە لای و سکی نییە و مێردەکەی ئامادەیە(واتە بزر و نادیار نییە).

٤–دەبێ لە چوونە لا راگیرابێت، گەر لە پاکێتییەکدا کە چووەتە لای تەڵاقی دا تەڵاقەکەی ناکەوێت ئەو مەرجە لە ئافرەتێکدا لە حەیز چووبێتەوە بە هەند وەرناگیرێت، هەروەها لەو ئافرەتانەی نەگەیشتوونەتە تەمەنی حەیز و لە ئافرەتی سکپڕدا، ئافرەتی دوور لە چوونە لا بە مەرج دەگیرێت سێ مانگی بەسەردا گوزەر کردبێت، گەر بەر لەو ماوەیە تەڵاقیدا تەڵاقی ناکەوێت.

٥–دیاریکردنی تەڵاقدرلو لەسەر بەهێزترین ڕا وەك ئەوەی بڵێت فلان ئافرەت تەڵاقی کەوتبێت یان ئاماژەی بۆ بکات بەجۆرێك ئەگەر(إحتمال) هەڵبگیرێت، گەر یەك ژنی هەبوو وتی ژنەکەم تەڵاقی کەوتبێت دروستە، گەر دوو ژنی هەبوو دروست نییە مەگەر نیەتی دیاریکردنی یەکێکیان بێت و لێکدانەوەکەی قبوولکراو بێت.

بەم مەرجانە رادەی ئازادی ویستی مێرد لە تەڵاقداندا بەرتەسك دەبێتەوە لەوەی فەقیهانی تر بۆی چوون.

**زەیدییەکان:**

جمهووری زەیدییەکان ئەوەیان وەرگرتووە جەعفەرییەکان بۆی دەچن لە تەڵاق نەدانی رجعی مەگەر دوای گێڕانەوەی ژنەکە.

لە "التاج المذهب[1]"دا هاتووە: (گەر بیداتە پاڵی دوای هاوسەرگیری بە مەرجێك وەك ئەوەی بڵێت: "گەر چوویەماڵەکە"، ئەوا ناکەوێت چونکە خاوەنی تەڵاق نییە لە کاتی پەیوەست کردنی بە مەرجەکەوە، هەر بەو جۆرە گەر تەڵاقی دایە پاڵ کاتی هاوسەرداری وەك بە بێگانەیەك بڵێت: هەر کات هاوسەرگیریم لەگەڵ کردی تۆ تەڵاقدراوی پاشان هاوسەرگیری لەگەڵ کرد تەڵاقەکەی ناکەوێت)

---

(١) التاج المذهب ٢/١٩٩، البحر الزخار ٣/١٦٨.

سەرچاوەیەکم لە فیقهی زەیدیدا نەبینییەوە بۆ ئەوەی مامۆستا "علـی الخفیـف" لە کتێبەکەیدا "فرق الزواج[1]" باسی کردووە لەوەی زەیدییەکان وەك مالیکییەکان و حەنەفییەکان پێیانوایە پەیوەستکردنی تەڵاقی بێگانە لەسـەر هاوسـەرگیری لەگـەڵی دروستە، هەر کەس بڵێ بە ژنەکەی گەر هاوسەرگیریم لەگەڵ کردی تەڵاقت کەوتبێت پاشان هاوسەرگیری لەگەڵ کرد تەڵاقەکەی بەو هاوسەرگیرییە دەکەوێت.

**زاهیرییەکان:**

رایان لەگەڵ ئـەوەی جمهـوور بۆیچـووە هاورایـە، لـە نادروسـتی تەڵاقـدان پـێش هاوسەرگیری بە تێپەڕاندن یان بە پەیوەستکردن، لەبەر ئایەتی: ﴿إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ﴾، ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تـەڵاق لـە کـاتی سـەرهەڵدانییەوە پێویستە هاوسەرگیری پێشی کەوتبێت، هەروەها لەبەر قسەکەی عەلی کـوڕی ئـەبی تالب و ئیبن عەباس –خوایان لێ رازی بێت–: (تەڵاق تەنها لەدوای هاوسەرگیرییە)[2]، هەر بەو جۆرە تەڵاق لە حەیزدا دروست نییە، بەهەمان شـێوە لـە پاکێتییەکدا پیاوەکـە چووبێتە لای[3].

هەروەها دەڵێن: جێگەی تەڵاق بریتییە لە ژنەکە کە هاوسەرداریيەکەی بەردەوامە لەرووی حەقیقەتەوە یان لەرووی حوکمەوە هەمان شت بڵێ: لە پاکێتییەکدا پیاوەکە نەچووبێتە لای.

---

[1] فرق الزواج ص ٩٠.

[2] المحلی ١٠/ ٢٠٥ وفیە (گەر هاوسەرگیریم لەگەڵ فلان کەس کرد ئەوا تەڵاقی کەوتبێت یان بڵێت ئەو بە سێ تەڵاقی کەوتبێت هەموو ئەوانە پووچە و بۆی هەیە هاوسەرگیری لەگەڵ بکات و ژنەکەی تەڵاق نەدراوە، هەر بەو جۆرە گەر بڵێت: هەر ژنێك بوو بە هاوسەرم تەڵاقی کەوتبێت، یەکسانە ماوەیەکی نزیکی دیاریکردبێت یان دوور یان هۆزێك یان وڵاتێك هەموو ئەوانە پووچە و پابەندکەر نییە) .

[3] المحلی ١٠/١٦١ وفیە (حەڵاڵ نییە بۆ پیاوێك ژنەکەی لە حەیزدا تەڵاق بدات یان لە پاکێتییەکدا چووبێتە لای، تەڵاق جێبەجێ ناکرێت گەر ئەو کارەی ئەنجامدا).

**پارسەنگدان:**

پێموایە رای دروست ئەوەیە جمهوور بۆی دەچێت لە نادروستی تەڵاقدان پێش هاوسەرگیری، بەهۆی ئاشکرای دەقەکانەوە دەربارەی تەڵاق، پێویستە تەڵاق هاوسەرگیری پێشی کەوتبێت لە کاتی دارشتنی گوزارەکەیدا وەك ئایەتی: ﴿إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ﴾.

هەروەها لەبەر ئەوەی تەڵاق بۆ پێویستی و زەرورەت دانراوە و خاوەن شەرع وەك دەوایەك دایناوە بۆ نەخۆشییەك کە رێگەکانی تری چارەسەر کۆتایی پێهاتووە، هەموو ئەوانە بەر لە هاوسەرگیری بوونی نییە، ویستی پیاوەکە کۆتوبەند کراوە بەوەی ناتوانێت تەڵاق بدات تا هاوسەرگیری نەکات، بەڵام تایبەت بە ژنی حوکمی دروستتر ئەوەیە جەعفەری و زەیدییەکان بۆی دەچن کە تەڵاق شوێنی تەڵاق ناکەوێت گەر رجعەیەك نەکەوێتە نێوان دوو تەڵاقەکەوە لەبەر ئاشکرای ئایەتی: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾.

ئەم دەقە لەوەدا رۆشنە هەر جارێك پێویستە بەدوایدا یەکێك لەم دوانەی بەدوادا بێت: لە ئامێزگرتن(گێرانەوەی) بە چاکە(الإمساك بالمعروف) یان دەست لێ بەردان بە چاکە(تسريح بالإحسان)، ئەوەش بریتییە لە تەڵاقدانی بۆ جاری سێیەم.

بۆیە گەر مێردەکە یەك جار بە تەڵاقی رجعی تەڵاقی ژنەکەی دا دەسەڵاتی تەڵاقدان بەسەریدا لەدەست دەدات تا جارێکی تر دەیهێنێتەوە بۆ لای خۆی یان گرێبەستێکی نوێی لەگەڵ گرێدەدات، بەهۆی ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النبـي إِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾،، چونکە پیتی "لام" لە (لعدتهن) بۆ "توقيت"ە، واتە لەو کاتەوە راستەوخۆ عیدەکەی دەست پێ دەکات، تەڵاقدراو لە عیدەدا، و دەستپێکردنی عیدە لە عیدەدا بەدەستهێنانی بەدەستهاتووە، وەك تەڵاقدانی تەڵاقدراو ئەوەش پووچە بە رێکەوتنی زێرمەندان.

# باسی دووەم:
# تەڵاقی حەیزدار

فەقیهان لەسەر ئەوە رێکەوتوون ئەم جۆرە تەڵاقە بەبێ پاساو بیدعەیە، و حەرامە گەر ئافرەتەکە لەوانە بێت کە چووەتە لای، بەپێی ئاشکرای ئایەتەکە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾، هەروەها لەبەر فەرموودەکەی ئیبن عمر: (فەرمانی پێ بکە با بیگێڕێتەوە)، هەروەها لەبەر چەندین هۆی تر کە دواتر باسیان دەکەین.

بەڵام جیاوازیان لە نێواندایە لە هۆی حەرامبوونی تەڵاقەکە و ئەو ئاسارەی لێیەوە سەرهەڵدەدات، چونکە هۆ لە دیدگای زۆرینەی فەقیهە مالیکییەکان و شافیعییەکان و حەنبەلییەکانەوە بریتییە لە درێژکردنەوەی عیدە.

لە رای حەنەفییەکان و "أبي الخطاب" لە هاوەڵانی ئەحمەدەوە بریتییە لە بەپاستگێڕانی تەڵاق لەباری ساردبوونەوە و بێنیازی لە جووتبوون لەگەڵ ژنەکە، بۆیە دەبێت لە باری ئارەزووی بۆ ئەو کارە تەڵاقی بدات، لە کاتێکدا کەسانی تر پێیانوایە حەرامکردنەکە پەرستشانەیە[1]، بەڵام ئەمە ساغ نەبووەتەوە، چونکە گەر رێگری لە حەیزدا فەرمانێکی پەرستشانە بێت ئەوا تەڵاقی حەیزدارێك نەچووبێتە لا رێگەی پێنەدەدرا.

پارسەنگراو ئەو قسەیە حیکمەتی حەرامکردن بریتییە لە سووربوونی خاوەن شەرع لەسەر ئەوەی تەڵاق لەباری بێزاری و حەز لێنەکردندا نەبێت، چونکە رەوشی حەیزدار و زەیسان لەو هۆکارە یاریدەدەرانەن لەسەر تەڵاق لەباری سەرهەڵدانی ناکۆکی لە نێوان دوو هاوسەرەکەدا.

---

[1] راجع مجموع الفتأوى لابن تيمية ٧/٣٣.

لە حوكمی حەیزداری زەیساندا: تەڵاقدانی بیدعەیە وەك تەڵاقی حەیزدار، چونكە ژن دوو حاڵی هەیە و سێیەمی نییە "پاكی" و "حەیز"، زەیسانی نە پاكییە نە سكپڕی، بۆیە دەچێتە ناو حوكمی حەیزەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) حەیزی بە "النفاس–زەیسانی" ناوبردووە، كاتێك بە هەریەك لە عائشە و ئوم سەلەمەی فەرموو–كاتێك كەوتنە حەیزەوە– أنفست؟ واتە كەوتییە حەیزەوە؟ وتی: بەڵێ، هەر بەو جۆرە تەڵاقی سكپڕ لە پاكێتییەكدا كە چووەتە لا گەر منداڵ نەبوو یان گەر لە حەیز نەچووبووەوە، چونكە نزیكبوونەوە لەو بارەدا گومانی دروستبوونی سكی لێ دەكرێت، ئەو كارەی زۆرجار سەردەكێشێت بۆ پەشیمانبوونەوەیەك كە پیاگەیشتنی لەدەستچووە، سەرباری درێژكردنەوەی عیدە.

لەوەی باسكرا رۆشن دەبێتەوە مێرد ئازادی ویستی بۆ نییە لە تەڵاقدانی ژنە حەیزدارەكەیدا و ئەوانەی لە حوكمی حەیزداردان، بەڵكو ویستی كۆتوبەند كراوە و پێویستە لەو كاتەدا تەڵاقی بدات كە خاوەن شەرع بۆی دیاریكردووە بە ئایەتی: ﴿إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾.

گەر مێردەكە سەرپێچی لەو كۆتوبەندە كرد و ژنەكەی تەڵاقدا، بەڵام نەك لەو كاتە دیاریكراوەدا، چی لەسەری پەیدا دەبێت؟

دیدگای فەقیهان جیاوازیان تیایدا هەیە بۆ سێ را: لە رایەكدا تەڵاقەكەی دەكەوێت و گێڕانەوەی پەسەندە، لە رایەكی تردا تەڵاقەكە دەكەوێت و پیاوەكە گوناهبارە بۆیە ناچاردەكرێت بە گێڕانەوە، لە رای سێیەمدا تەڵاقەكە ناكەوێت چونكە بیدعەیە و هەموو بیدعەیەكیش رەدكراوەیە.

هەوڵدەدەین لە سێ لقدا رۆشنی بكەینەوە:

## لقی یەکەم:
## تەڵاقەکە دەکەوێت گێڕانەوەی پەسەندە

هەنـدێ لـە حەنەفییـەکان و شـافیعییەکان و حەنبەلییـەکان لـە ڕیوایەتێکـدا و جمهووری زەیدییەکان بۆ ئەم ڕایە دەچن.

**حەنەفییەکان:**

لـە "فـتح القـدیر[1]"دا هـاتووە: گـەر پیاوەکـە ژنەکـەی لـەباری حـەیزدا تەڵاقـدا تەڵاقەکەی دەکەوێت، چونکە نەهیکردن لێی بۆ مانایەکە لە شتێکی تردا، پەسـەندە بۆی بیگێڕێتەوە لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە بە عومەری فـەرموو: (فـەرمان بە کوڕەکەت بکە بیگێڕێتەوە)، ئەو لەباری حەیزدا تەڵاقی دابوو).

**شافیعییەکان:**

لە "نهایە المحتاج[2]"دا هاتووە: (گێڕانەوەی پێویست نابێت، چونکە فـەرمان بـە کەسێك فەرمان بکات بە شتێك فەرمان نییە بـە خـودی شـتەکە، لـە فەرموودەکـەی پێغەمبەرەوە: (با بیگێڕێتەوە) فەرمانی تێدا نییە بە ئیبن عومەر، چـونکە لقێکـە لـە فەرمانەکەی عومەر)

ئەم قسەیە ڕەد دەکرێتەوە بەوەی کاری نوێنەر وەك کاری نوێنەرگر وایـە، بۆیـە وەك ئەوە وایە پێغەمبەر(ﷺ) فـەرمانی پێکردبێـت، لەبـەر ئـەوە پێویسـتبوونەکەی جێگیر بووە، پاشان دەگونجێ بوترێت: (با بیگێڕێتەوە) فەرمانە بە ئیبن عومەر بۆیە گێڕانەوەی لەسەر پێویستە.

---

[1] فتح القدیر ٣/٣٣.
[2] نهایة المحتاج ٦/٥.

**حەنبەلییەکان:**

لە "[1]"دا هاتووە: (گێڕانەوەی پەسەندە، ئەمە لە مەزهەبەکەدا دروستە، و جمهووری هاوەڵانی مەزهەبی لەسەرە) لە "المغنی[2]"دا هاتووە: (گێڕانەوەی پەسەندە، لەبەر فەرمانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بە گێڕانەوەی، کەمترین باری فەرمان بۆ "إستحباب-بەپەسەندزانینیان خۆشویستن"ە، گفتوگۆی لەسەر دەکرێت: حەنبەلییەکان لە زۆرێك لە لقەکانیاندا دەڵێن: فەرمان بۆ پێویستبوونە، ئەحمەد دەڵێت-کاتێك رایەکەی مالیك لە موتعەدا تاوتوێ دەکات- ئەو ئایەتەمان بە دەستەوەیە: (ومتّعوهن) فەرمانەکە داوای پێویستبوون دەکات، بۆچی لێرەدا فەرمانەکەیان بۆ پێویستبوونە و لەو جێگەی تر بۆ "إستحباب"ە.

---

[1] الانصاف ٨/٤٥٠.

[2] المغني والشرح الكبير ٨/٢٣٩.

## لقی دووەم:
## تەڵاقەکە دەکەوێت و
## پیاوەکە ناچار دەکرێت بە گێڕانەوەی

ئەم رایە مالیکییەکان و هەندێ لە حەنەفییەکان و حەنبەلییەکان لە ریوایەتێکدا و داودی زاهیری لەسەرینی.

**مالیکییەکان:**

دەڵێن: تەڵاقەکە دەکەوێت و دادوەر ناچاری گێڕانەوەی دەکات، گەر نەیویست بیگێڕێتەوە ئەو نوێنەرایەتی دەکات لە کاتی عیدەدا.

لە " المدونە[1]"دا هاتووە: (گەر پیاوێك وتی بە ژنە حەیزدارەکەی تۆ تەڵاقت کەوتووە کاتێك پاکبوویەوە، ئەوە لە جێگەی خۆی تەڵاقیداوە و پیاوەکە ناچاردەکرێت بە گێڕانەوەی ژنەکە مەگەر نەچووبێتە لای)، "الخرشی[2]" دەڵێت: (گەر بە هەڵبژاردنی خۆی تەڵاقیدا لە باری حەیز و زەیسانیدا دادوەر فەرمانی پێ دەکات بیگێڕێتەوە، گەر نەیویست بە بەندکردن هەڕەشەی لێ دەکات، گەر ئەنجامی نەدا هەڕەشەی لێ دەکرێت بە لێدان، گەر پێبڕاکێشا گێڕانەوەی پابەند دەکات و بۆی دەگێڕێتەوە، بەوەی بڵێت: ئەوا ژنەکەی تۆم بۆ تۆ گێڕایەوە، بە گێڕانەوەی دادوەر چوونە لا و میراتگری دروستە، با نیەتی مێردەکەشی لەسەر نەبێت، چونکە نیەتی دادوەر لە جێگەی نیەتی ئەو دانیشتووە).

---

[1] المدونة الكبرى ٥/١٠٤.

[2] راجع شرح الخرشي ٤/٢٩.

**حەنەفییەکان:**

لـە " الهدایـە[1]"دا هـاتووە: (بەپەسـەندبینین(الإسـتحباب) قسـەی هەنـدێ لـە مامۆسـتایانی ئێمەیـە، دروسـتتر ئەوەیـە پێویسـتە وەك كـاركردن بـە راسـتەقینەی فەرمانەکە)، هاوشێوەی ئەمە لە "الجوهره[2]" هاتووە.

**حەنبەلییەکان:**

ریوایەتێکی پێویستبوونیان هەیە، هـەروەها ریوایـەتێکی ناچـارکردن وەك چـۆن ریوایەتێکی بەپەسەندبینین(الإستحباب)یان هەیە.

**زاهیرییەکان:**

"داود" لە زاهیرییەکان تەنها کەوتووە بە وتنی: کەوتنی تەڵاقی حـەیزدار لەگـەڵ ناچارکردن بە گێڕانەوە، لە "نیل الّوکار[3]"دا هاتووە: (دلود دەڵێت پیاوەکـە ناچـار دەکرێت گەر لە حەیزدا تەڵاقی ژنەکەی دا، بەڵام کەسانی تر لە زاهیرییەکان وتویانـە تەڵاقی حەیزدار ناکەوێت، وەك چۆن لە لقی سێیەمدا دێت:

---

(1) الهداية مع فتح القدير ٢/٣٣. وما بعدها.

(2) الجوهرة ٢/٣٤.

(3) نيل الأوطار ٦/٢٢١.

# لقی سێیەم:
# تەڵاقی حەیزدار و
# ئەوەی لە حوکمی ئەودایە ناکەوێت

ئەوەش رای جەعفەرییەکان و زاهیرییەکانە -جگە لە داود- خاوەنی "الروضة الندية " و "الباقر الصادق" و "الناصر" لە زەیدییەکان و"ابن عقيل وابن تيميه وابن القيم" و هەندێکی تر لە پێشین و پاشین هەمان رایان هەیە.

**جەعفەرییەکان:**

دەڵێن: پاکێتی لە خوێنی حەیز و زەیسانی لە ژنی تەڵاقدراوی جووتبوو لەگەڵ پیاوەکەی بە هەند وەردەگیرێت گەر سکی نەبوو و مێردەکەی لەگەڵ ئامادە بوو، هەروەها لە پاکێتییەکدا تەڵاقی بدات کە نەچووەتە لای بە کۆدەنگی، بەهەند وەرگرتنی ئەم مەرجانە بەردەبێتەوە پەیوەست بە ئافرەتی منداڵ کە تەمەنی نەگەیشتووەتە نۆ ساڵ، هەروەها ئەو ئافرەتانەی لە حەیزچوونەتەوە و ئافرەتی سکپڕ کە سکەکەی ئاشکرا بوو بێت، هەروەها ئەوەی مێردەکەی تەڵاقی بدات و پیاوەکە لێی بزر و نادیار بێت بۆ ماوەیەك بزانێت کەی ژنەکەی لە پاکێتییەکەوە دەگوێزێتەوە بۆ پاکێتییەکی تر بەپێی عادەتی ژنەکەی، هەروەها ئەو ژنەی حەیز ناگرێت و لە تەمەنی حەیزگرتندایە و حەیزەکەی بە هۆی نەخۆشییەوە یان بە هۆی شیردانەوە دواکەوتووە، یان هۆیەکەی نەزانراوە، لە رووداوەکەوە سێ مانگ چاوەڕوان دەبێت و پاشان تەڵاقی دەدات، تەڵاقەکەی بەر لەوە ناکەوێت ئەوەش بە کۆدەنگی و فەرموودەی دروست و دەقە هاتووەکان و ئەو ئەسڵەی کە دەڵێت هاوسەرگیری بە یەقین جێگیربووە و تەنها بە یەقین هەڵدەگیرێت.

**زاهیرییەکان:**

لەلایان[1] هەر کەس ویستی تەڵاقی ژنەکەی بدات-کە چووەتە لای- بۆی حەڵاڵ نییە لە حەیزدا تەڵاقی بدات هەر بەو جۆرە لە پاکێتییەکدا چووبێتە لای، گەر بە یەك تەڵاق یان دوو تەڵاق تەڵاقیدا-لە پاکێتییەکدا چووبێتە لای یان لە حەیزدا- ئەو تەڵاقە جێبەجێ ناکرێت وەك چۆن ژنی بووە هەروا دەمێنێتەوە، مەگەر تەڵاقەکە بائین بێت بە بەینوونەی گەورە، لەو بارەدا دەکەوێت و پێویست دەبێت.

ئەوان لە تەڵاقی سێیەمدا کە پەیوەندی هاوسەری کۆتایی پێدێت لە جەعفەرییەکان جیاوازن.

رووی جیاکردنەوە، دەڵێن: لە ئایەتەکەدا فەرمان بە تەڵاق هاتووە لە کاتی عیدەدا، ئایەتی: ﴿لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّـهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا﴾، ئاماژە بەوە دەکات دیاریکردنی کات تایبەتە بە تەڵاق لە خوار تەڵاقی سێیەمەوە، و بۆ ژنێك چووبێتە لای، ئیبن حەزم دەڵێت: (تەڵاقی زەیسان وەك تەڵاقی حەیزدار وایە لەم حوکمەدا).

لەوەی باسکرا ئەنجامگیری دەکەین ئەگەر مێرد ژنەکەی لە باری حەیزدا یان لە حوکمی تەڵاقی یەکەمدا یان دووەمدا تەڵاقدا تەڵاقەکەی ناکەوێت بە پێچەوانەی تەڵاقی سێیەمەوە یان بە پێچەوانەی کۆکردنەوەی هەر سێ تەڵاقەکە بە یەك جار، لەسەر ئەو رایەیان کە سێ تەڵاق بە یەك جار دەکەوێت.

وا دەردەکەوێت زاهیرییەکان سەرنجیان نەداوە لە هۆی نەهی لێکردنەکەی تەڵاقی حەیزدار و ئەوەی لە حوکمی ئەودایە، ئەگینا لەباری تەڵاقێکدا بەینوونەی گەورەی لێوە پەیدا ببێت ئەوە گوزەر دەکات.

---

[1] راجع المحلی ١٦١/١٠. وما بعدها. قال ابن حزم: (سەرسوڕمان لە بوێری کەسانێك بە پێچەوانەی ئەمەوە بانگەشەی ئیجماع دەکات، ئەو وشەیەك لە یەکێك لە هاوەڵانەوە نابینێتەوە هاورای قسەکەی بێت لە تێپەڕاندنی تەڵاقدا لە حەیزدا یان لە پاکێتییەکدا چووبێتە لای جگە لەو ریواتەی لە ئیبن عومەرەوە هاتووە کە بە باشتر لەوە لە ئیبن عومەرەوە ریوایەت کراوە بەرهەڵستی دەکات).

**زەیدییەکان:**

خاوەنی "الروضة الندية[1]" دەڵێت: (پارسەنگرلو نەکەوتنی تەڵاقی بیدعییە لەبەر ئایەتی: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[2]، بە هەمان شێوە لەبەر فەرموودەکەی ئیبن عمر و شتانی تر.

هەروەها لەبەر ئەوەی رێکەوتن هەیە لەسەر ئەوەی: ئەو جۆرە تەڵاقە پێچەوانەیە بە تەڵاقی سوننەت و پێی دەوترێت تەڵاقی بیدعە، لە پێغەمبەری خودلوە(ﷺ) جێگیر بووە: ((هەموو بیدعەیەك گومڕاییە))[3]، هەروەها: ((هەر کەس کارێك ئەنجام بدات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت رەتکراوەیە))[4]، لە "البحر الزخار[5]"دا هاتووە: تەڵاقێکی حەرامکراوە و خاوەنەکەی گوناهبار دەبێت با تەڵاقەکەش کەوتبێت، هەروەها "الصادق والناصر والباقر وابن علية هشام بن الحكم والأمامية وابو عبيد" و هەندێ "ظاهریەکان" دەڵێن: ناکەوێت لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((هەموو بیدعەیەك گومڕاییە) هەروەها: ((بیدعە هاوەڵدانانە لە هاوەڵداناندا)) بۆیە حوکم دەدرێت بە پووچبوونەوەی، بەڵام لە "التاج المنهب[6]"دا هاتووە: ((تەڵاقی بیدعی لەلای ئێمە دەکەوێت))

---

[1] الروضة الندية ٢/٤٨. وما بعدها.

[2] (يَا أَيُّهَا النبي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً) (الطلاق:١).

[3] مسلم: ١٤٣٥

[4] مسلم: ٣٢٤٣

[5] البحر الزخار ٣/١٥٣. وما بعدها.

[6] التاج المنهب ٢/١٢٧.

**حەنبەلییەکان:**

لە " الفروع[1]"دا هاتووە: (ئیبن عەقیل لە "الواضح"دا ڕێگری لە کەوتنی کردووە لە حەیزدا، دەڵێت چونکە نەهییەکە دلوای تێکچوون(فساد) دەکات)

"ابن تیمیە[2]" دەڵێت: (گومانی تێدا نییە ئەسڵ مانەوەی هاوسەرگیرییە، بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نەمانی راست نەبووەتەوە لە تەڵاقی حەرامکراودا، بەڵکو دەقەکان و ئەسڵەکان پێچەوانەی ئەوە داوا دەکەن)، هەروەها دەڵێت: (ئەوە بە کیتاب و سوننە و ئیجماع حەرامکراوە)، ئیبن قەیم نەکەوتنی تەڵاقی حەیزداری هەڵبژاردووە و گفتوگۆی ئەم بابەتە دەکات بە شێوەیەکی ورد و دوورودرێژ لە کتێبی (زاد المعاد)[3]دا.

لەوەی باسمان کرد و لە شتانی ترەوە گرنگترین بەڵگەی ئەوانەی دەڵێن تەڵاقی حەیزدار کەوتووە ئەمانەیە:

١-گشتاندنی ئایەتەکانی حوکمی تەڵاق لە قورئاندا، وەك: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ... الآيَة﴾. ﴿وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ﴾ ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ﴾، ئەمانە و ئایەتی تریش، بە جۆرێك حاڵی حەیزی لەوانی تر جیانەکردۆتەوە، ئەم گشتاندن و رەهابوونە بەڵگەیە لەسەر دروستی تەڵاقی حەیزدار و ئەوەی لە حوکمی ئەودایە.

٢-ئەو فەرمانە لە ئایەتی: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ بۆ بە پەسەندزانینە(نەك بۆ پێویستبوون) بە بەڵگەی فەرموودەکەی ئیبن عمر: (فەرمانی پێ بکە با بیگێڕێتەوە) گەر فەرمان بە تەڵاقدانیان لەباری عیدەدا بۆ پێویستبوون بوایە تەڵاقەکەی نەدەکەوت، بەڵام کەوتووە، چونکە گێڕانەوە تەنها لەدوای کەوتنی تەڵاقە، بۆیە فەرمانەکە بۆ پێویستبوون نییە.

---

(١) راجع الانصاف ٤٤٨/٨.

(٢) راجع مجموع فتأوى لابن تيمية ٧/٣٣وما بعدها.

(٣) راجع زاد المعاد ٤٣/٤ وما بعدها.

٣-"عثمان بن عفان وزید بن ثابت" فتوایان بە کەوتنی تەڵاقداوە لە حەیزدا یان لە پاکێتییەکدا چوویێتە لای، ئەوەش لەو بوارانەی ئیجتیهادی تێدا نییە، فتوادانیان بەوە حوکمی بەرزکراوەی هەیە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بواری را و بۆچوونی تێدا نییە، بۆیە بەڵگەیە لەسەر کەوتنی.

٤-ئیجماع: دەڵێن: موسڵمانان کۆدەنگیان هەیە لەسەر کەوتنی تەڵاقی حەیزدار و قسە پێچەوانەی ئەوە پووچە، چونکە پێچەوانەیە بە ئیجماعی بێدەنگی.

٥-نەهیکردن گەر بۆ خودی شتەکە بوو تێکچوون پێویست ناکات، لێرەدا بۆ مانای جگە لە خۆی هاتووە ئەوەش بریتییە لە درێژکردنەوەی عیدە یان رێکەوتی تەڵاق بۆ کاتی ساردبوونەوە و بێنیازی لە جووتبوون یان بۆ شتانی تر.

٦-پێوانە: دەڵێن: حەرامکردنەکەی سەرهەڵدانی ئاسار لەسەری حەرام ناکات وەك زیهار(پشتهەڵکردن).

**گفتوگۆ لەسەر ئەم بەڵگانە:**

١-ئایەتە رەهاکانی هاتوو لە حوکمەکانی تەڵاقدا بەم ئایەتە سنووردارکراون: ﴿يَا أَيُّهَا النبي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾، چونکە لە رێسا ئوسوڵییە زانراوەکان[1] ئەوەیە: گەر حوکمی رەها و سنووردار و هۆیەکەیان یەکێك بوو ئەوا رەها هەڵدەدرێتە سەر سنووردار، هاوشێوەی ئەوە لە قورئاندا زۆرە، خودا-ﷻ- دەفەرموێت: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ﴾ هەروەها دەفەرموێت:﴿قُلْ لا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّماً عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أن يَكُونَ مَيْتَةً أو دَماً مَسْفُوحاً﴾، خوێن لە ئایەتەکەی یەکەمدا بە رەهایی هاتووە و لە ئایەتەکەی دووەمدا بە سنووردارکراوی هاتووە، بۆیە رەهایی ئایەتەکەی یەکەم هەڵدەدرێتە سەر سنوورداری ئایەتەکەی دووەم، هەر بەو جۆرە لێرەدا رەها لە

[1] راجع جمع الجوامع للسبكي ٢/٢٣ الوجيز في اصول الفقه الدكتور عبد الكريم زيدان ص٢٩٦.

هەموو ئایەتەکاندا هەڵدەدرێنە سەر ئەو کۆتوبەندەی لە ئایەتی: ﴿فطلقوهن لعدتهنَ﴾دا هاتووە، چونکە حوکمی رەها و سنووردار و هۆی هەردووکیان یەك شتە.

٢-رێگری لە بەڵگەی هەڵواردن لە پێوانەی باسکراودا دژیەکی دوای خۆیەتی، بۆیە دژی پێشخراو بەڵگەی رێگری بەرهەم ناهێنێت ئەوەش دەگونجێ مەبەست بە گێڕانەوە(المراجعة) مانا زمانەوانییەکەی بێت، بەکارهێنانی لە تەڵاقدراوی رجعیدا زاراوەیەکە لەدوای چاخی پێغەمبەر(ﷺ) داهێنراوە، و هەرگیز بەو مانایە بەکارنەهێنراوە، بەڵکو بەکارهێنراو بریتییە لە "الرد و الإمساك" وەك لە ئایەتی: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ﴾ ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ﴾ ﴿وَلا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَاراً﴾ "المراجعه" لە گێڕانەوەیەکدا بەکاردەهێنرا کە بە گرێبەبەستێکی نوێ بکرێت لەبەر ئایەتی: ﴿فَإن طَلَّقَهَا فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا﴾.

٣-بەڵگەهێنانەوە بە فتواکەی"عثمان بن عفان وزيد بن ثابت" راست نەبووەتەوە، رای هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) نابێتە بەڵگە، چونکە پێچەوانەی ریوایەتی دروستە، لەسەر ئەوەی لە سەنەدی ریوایەتەکەدا وەك "ابن القيم[1]" دەیڵێت درۆزنی تێدایە لە نادیار(مجهول)ەوە، "ئیسماعیل بن سەمعان" لە لە پیاوێکەوە ریوایەتی کردووە ئەویش بەرزی کردۆتەوە بۆ لای عوسمان، ئیبن حەزمیش دەڵێت: ریوایەتەکەی بێ ئەرزشە.

٤-بانگەشەی ئیجماع لەم بابەتەدا دروست نییە، چونکە جیاوازی تیایدا بەردەوام لە نێوان پێشین و پاشیندا بوونی هەبووە، ئیمام ئەحمەد دەڵێت: هەرکەس بانگەشەی ئیجماع بکات ئەو کەسە درۆزنە، ئەو چووزانێت لەوانەیە خەڵکی جیاوازیان لەوەدا هەبووبێت، بۆ نە، لە کاتێکدا جیاوازی لە نێوان فەقیهاندا لەم بابەتەدا روون و ئاشکرایە لە پێشینەکان و پاشینەکانەوە، هەروەها ئیبن حەزم

[1] راجع زاد المعاد ٤/٤٤. وما بعدها. المحلى ١٠/١٦٣.

دەڵێت: (هەندێ کەس بەوە بانگەشە دەکەن کە ئیجماعی لەسەرە ئەو کەسەی بانگەشەی ئەوە دەکات درۆی کردووە)[1].

٥-ئەو قسەیە: "گەر نەهی بۆ خودی شتەکە نەبێت دلوای تێکچوون ناکات" بەڵگە پێ هێنانەوەی دروست نییە، چونکە لەو ئەسڵانەیە کە جیاوازی لەسەرە، بۆیە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەو کەسەی پێچەوانەی ئەوە دەبینێت، ئیمامی مالیك دەڵێت فرۆشتن لە کاتی بانگی جومعەدا پووچە لەگەڵ ئەوەی نەهییەکە بۆ خودی فرۆشتنەکە نییە.

٦-پێوانەکردنی بۆ سەر زیهار بەرهەڵستی دەکرێت بە هاوشێوە بە بەرهەڵستی وەرگەڕان، دەوترێت حەرامکردنی ڕێگری دەکات لە سەرهەڵدانی ئەسەرەکەی لەسەری وەك هاوسەرگیری، لەسەر ئەوەی پێوانەیە لەگەڵ جیاوازی، چونکە بۆ پشتەهەلکردن(الظهار) دوو ئاراستە بوونی نییە، ئاراستەیەکی حەلاڵ و ئاراستەیەکی حەرام بە پێچەوانەی تەلاقەوە[2].

**گرنگترین بەڵگەی ئەوانەی دەڵێن تەلاقی حەیزدار ناکەوێت:**

١-**قورئانی پیرۆز:** خودا-ﷻ- دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النبـي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ ئەم بەشەی ئایەتەکە (فطلقوهنّ) فەرمانە، هەموو فەرمانێکیش لە ئاشکرایدا بۆ پێویستبوونە، فەرمان بە شتێك نەهیکردنە لە پێچەوانەکەی، وەك ئەوەی خودا بفەرموێت: "لا تطلقوهنّ لغیر عدتهن-لە عیدەی خۆیاندا نەبێت تەلاقیان مەدەن"، نەهی لە هەڵسوکەوتێك تێکچوونی ئەو شتە دەگەیەنێت، بەوەش خاوەن شەرع حیجری خستۆتە سەر مێردەکە بۆ تەلاق نەدانی ژنەکەی لە حەیز و زەیسانیدا یان لە پاکێتییەکدا چووبێتە لای، وەك چۆن حیجری قازی لەسەر کەسێك ئەوە پێویست دەکات ڕاستەوخۆ

---

[1] المرجع السابق.

[2] راجع المرجع السابق. فرق الزواج للشيخ علي الخفيف نظام الطلاق في الاسلام احمد محمد شاكر ص٢٩ وما بعدها.

نەبێتە خاوەنی شتێك كە لێی قەدەغەكراوە، كارەكەش لێرەدا بە هەمان شێوەیە، بەڵكو لە دەروازەی لەپێشترە.

ئەو بەشەی ئایەتەكە: (لعدتهن) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تەڵاقدراو بریتییە لە ژنێك كە مێردەكەی چووەتە لای، ئەگینا گەر نەچووبێتە لای عیدەی لەسەر نییە.

**٢–فەرموودەكەی ئیبن عومەر كاتێك ژنەكەی لە حەیزدا تەڵاقدا:**

أ.لە ریوایەتەكەی ئەبی زوبەیردا، ئیبن عومەر وتی: پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە سەرم و ژنەكەم هیچی پیشانی پێغەمبەر(ﷺ) نەدا[1].

ب–لە ریوایەتێكی ترەوە لە رێگەی "أبـي لهيعـة"ەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: با بیگێڕێتەوە ئەو هێشتا ژنەیەتی.

ج–لە رێگەی عەبدولای كوڕی مالیكەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە هیچ نییە.

د–لە رێگەی محەمەدی كوڕی بەشارەوە لە ئیبن عومەرەوە دەربارەی ئەو پیاوەی ژنەكەی لە حەیزدا تەڵاق دەدات وتی: بە هەند وەرناگیرێت(گرنگی پێ نادرێت).

---

(١) مسلم: ٢٦٨٨. ئەبو زوبەیر هەواڵی پێدام گوێی لە عبدالرحمنی كوڕی ئەیمەن(مەولای عەززە) بوو پرسیاری لە ئیبن عومەر دەكرد، ئەبو زوبەیریش گوێی لەوە بوو: رات چییە لەسەر پیاوێك ژنەكەی لە حەیزدا تەڵاق دەدات، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ)ئیبن عومەر ژنەكەی تەڵاقدا و ئەو لە حەیزدا بوو، عومەر پرسیاری لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) كرد و وتی: عەبدولای كوڕی عومەر ژنەكەی لە حەیزدا تەڵاقداوە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: با بیگێڕێتەوە، بۆیە ئەویش گێڕایەوە، فەرمووی: كاتێك پاكبوویەوە با تەڵاقی بدات یان بهێڵێتەوە، ئیبن عومەر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: يَا أَيُّهَا النبي إِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ في قُبُلِ عِدَّتِهِنَّ و حَدَّثَنِي هَارُونُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ عَنْ ابْنِ جُرَيْجٍ عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ عَنْ ابْنِ عُمَرَ نَحْوَ هَذِهِ الْقِصَّةِ و حَدَّثَنِيه مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَيْمَنَ مَوْلَى عُرْوَةَ يَسْأَلُ ابْنَ عُمَرَ وَأَبُو الزُّبَيْرِ يَسْمَعُ بِمِثْلِ حَدِيثِ حَجَّاجٍ وَفِيهِ بَعْضُ الزِّيَادَةِ قَالَ مُسْلِم أَخْطَأَ حَيْثُ قَالَ عُرْوَةَ إِنَّمَا هُوَ مَوْلَى عَزَّةَ.

**رووی بەڵگەهێنانەوە:**

فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((با بیگێڕێتەوە چونکە ئەو ژنیەتی))، ((ئەوە هیچ نییە))، ((هیچی نیشان نەدا))، ((بە هەند وەرناگیرێت)) هەموو ئەوانە لە نەکەوتنی تەڵاق لە حەیزدا راشکاون.

٣-**فەقیهان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی ئەو جۆرە لە تەڵاق بیدعەیە و** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((هەموو بیدعەیەك گومڕاییە))، خستنی تەڵاقەکە بە دروست زانینی بیدعەکەیە و داننانە پیایدا، رەدکراوە هیچ ئەرزشێکی بۆ نییە تا ئەسەرە شەرعییەکەی لەسەر پەیدا ببێت.

٤-**هاوسەرگیری گرێبەستێکی پابەندکەرە بۆ هەردوو لا، تەنهاکەوتنەوەی** مێردەکە بە کۆتا پێهێنانی روخسەتێکە و هەڵواردنە لە رێسا گشتیەکە: (هەموو گرێبەستێك پابەندکەرە بۆ هەردوو لا و ویستی یەکێکیان بۆ هەڵوەشانەوەی تەنها ناکەوێتەوە) بۆی دروست نییە ئەو روخسەتە بەکاربهێنێت مەگەر لەو سنوورەی خودا مۆڵەتی تێدا داوە، گەر لەو سنوورە تێیپەڕاند کارەکەی پووچە.

٥-گەر تەڵاقەکە بکەوتبایە فەرمانەکە بە گێڕانەوە دەبوو و پاشان بە دوایدا تەڵاقدان، ئەمەش زۆرکردنی تەڵاقی بێزرا و درێژکردنەوەیە لەسەر ژنەکە لە عیدەکەیدا و زیانگەیاندنە پێی، لە کاتێکدا نەهی لە تەڵاق لە کاتی حەیزدا بۆ بەرژەوەندی ژنەکە هاتووە.

٦-**کاری تەڵاقدەر ئەوەیە دەست بۆ هۆیەکان ببات بە شێوەیەکی رەوا گەر** دەستی نەبرد بۆ هۆیەکی رەوا و پێیەوە پابەند نەبوو ئەوا خاوەن شەرع ئەسەری شەرعی لەسەر پەیدا ناکات.

٧-**هاوسەرگیری بە یەقین جێگیربووە، یەقینیش تەنها بە یەقین هەڵدەگیرێت،** ئەوەی جمهوور لە ئاسار بەڵگەی پێ دەهێننەوە یەقین ناگەیەنێت، سەرباری بەرهەڵستکارییەکەی لەگەڵ ئاشکرای قورئاندا.

## گفتوگۆ لەسەر ئەم بەڵگانە:

١–فەرمان لە ئایەتەکەدا: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ دەقێك نییە بۆ پێویستبوون، بەڵکو تیایدا دەردەکەوێت، بۆیە بەڵگەیەکی بڕاوە نییە لەسەر ئەوانەی پێچەوانەی ئەوەن.

٢–ریوایەتەکانی فەرموودەکەی ئیبن عومەر سەرباری ئەوەی لە فەرموودەی ئاحادن، کۆمەڵێك ریوایەتی تر بەرهەڵستی دەکەن کە پاڵپشتی رای ئەوانە دەکەن پێچەوانەن لەگەڵی، وەك ریوایەتەکەی "یونسی کوڕی جوبەیر" پرسیاری لە ئیبن عومەر کرد بە چەند تەڵاق ژنەکەت تەڵاق دابوو؟ وتی بە یەك تەڵاق، هەروەها وەك ئەو ریوایەتەی گەر بە سیان تەڵاقت بدابایە لەسەرت حەرام دەبوو تا مێردێکی تری دەکردەوە، بۆیە یەك ئەگەر(إحتمال) ماوەتەوە، گەر ئەگەریش جێگیر بوو بەڵگە پێهێنانەوە بەردەبێتەوە.

٣–هەموو بیدعەیەك گومڕایی نییە، چونکە بەشی زۆری هەیە، هەیانە بیدعەی راستەقینەن ئەوەش ئەوەیە لە هەموو روویەکەوە داهێنانی لە ئایندا تێدایە، ئەوە بیدعەیەکی رووتە و بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نییە وەك رەهبانییەت و ژن نەهێنان لەگەڵ بوونی بانگکەر و نەبوونی رێگری شەرعی، هەندێ جار بیدعە سەرباریە، ئەوەش ئەوەیە تایبەت بە یەکێك لە دوو ئاراستەکە سوننەتە و بەویتریان بیدعەیە، وەك دیاریکردنی رۆژێك خاوەن شەرع تایبەتی نەکردبێت بە رۆژوو، رۆژوو لە خودی خۆیدا رەوایە و تایبەتکردنی بە رۆژێك بیدعەیە، بیدعەکە دەبێتە هەموەکی گەر زیانەکەی هەموەکی بوو، و دەبێتە بەشەکی گەر زیانەکەی بەشەکی بوو، وەك بیدعەی ئاوازدان بۆ قورئان، هەروەها بۆی هەیە پەرستشی و ئاسایی بێت، چەندین جۆری تر لە بیدعە هەیە کە بواری باسکردنیان نییە هەیانە پووچ و هەیانە دروستن[1].

---

[1] راجع الابداع في مضار الابتداع ص٤٥ وما بعدها.

٤-کاتدانان لە تەڵاقدا ڕادەیەکی بڕاوە نییە تا تێپەڕاندنی ئەو کاتە پووچکەرەوە بێت.

٥-وتنی ئەوەی حیکمەتی حەرامکردن بریتییە لە درێژکردنەوەی عیدە کارێك نییە کۆدەنگی لەسەر بێت، بەڵکو دروستە هۆی تری لە پشتەوە بێت وەك ساردی و بێنیازبوون لە جووتبوون.

٦-بۆ کەسی سەرپێچیکەر هەیە خۆی ڕادەستی ناڕەوایەتی هۆیەکە نەکات، لە ئەگەری خۆڕادەستکردنیشدا سەرهەڵنەدانی ئاسار لەسەر هۆیە ناڕەواکان کارێکی هەمووەکی نییە.

٧-وتنی ئەو قسەی یەقین بە یەقین هەڵدەگیرێت دروستە، بەڵام نەچوونەناوی تەڵاقی حەیز بۆ ناو ئەم ڕێسایە ڕێگەپێنەدراوە، چونکە هەموو ئەوەی هەیە ئەوەیە هۆیەکە گوناه و خراپەی لەگەڵە، گوناهیش سیفەتی یەقینی لێ وەرناگیرێتەوە.

## پارسەنگدان:

پێموایە قسەی پارسەنگراو کە پێویستە دەستی بۆ ببرێت و سیفەتی پابەندکردنی پێ بدرێت لە یاسای باری کەسێتی دەوڵەتە عەرەبی و ئیسلامییەکان ئەوەیە مالیکییەکان بۆی دەچن لەوەی تەڵاقی حەیزدار دەکەوێت بەڵام مێردەکە ناچار دەکرێت بە گێڕانەوەی ژنەکەی، گەر ئەوەی نەویست قازی دەیگێڕێتەوە یان هەر کەسێکی تر نوێنەری قازی دەکات لە فەقیهانی ئایین لە ناوچە دوورەدەستەکانی گوند و لادێکان، چونکە لە دەستبردن بۆ مەزهەبی مالیك کۆکردنەوەی هەموو بەڵگەکان و هەڵگرتنی بەرهەڵستییەکانە.

# باسی سێیەم:
# ڕاسپێرراو(سەرپشککراو) بە تەڵاقدانی خۆی

پێشتر باسی ئەوەمان کرد تەڵاق مافێکی سروشتییە بۆ پیاو و ئیسلام دانی پیادا ناوە و پاشان مافی داوای تەڵاقی لەبەردەم قەزادا داوە بە ژنەکە، گەر پاساوی ئەوەی لە لا ڕاستبوویەوە داوای جیابوونەوەی قەزایی بکات، سەرباری ئەوە جمهووری فەقیهانی موسڵمان بۆ ئەوە دەچن ژن دەسەڵاتی تەڵاقدانی خودی خۆی هەیە بەبێ پەنابردن بۆ قەزا، گەر مێردەکەی ئەو کارەی بداتە دەست، بەڵام جیاوازییان هەیە لە چۆناندنی ئەو دانەدەستە، ئایا ژنەکە دەیکات بە موڵکی خۆی یان بریکاری پێدراوە یان سەرپشك کراوە یاخود کۆی ئەمانەیە؟

**حەنەفییەکان:**

دەڵێن: بۆ پیاو هەیە ژنەکەی ڕابسپێرێت بە تەڵاق لە کاتی گرێبەستەکەدا یان دوای ڕاستبوونەوەی باری هاوسەرێتی، بۆ ژنەکە هەیە لە کاتی گرێبەستەکەدا[1] لەسەر مێردەکەی بە مەرج بگرێت تەڵاق لەدەستی ئەودا بێت، ئەوەش گەر ئەرێکردن(الإیجاب) بەدەست ژنەکە بێت، ئەگەر نە، ڕادەستکردنەکە پێش گرێبەستی هاوسەرگیرییە و پووچ دەبێتەوە، گەر ژنەکە سەرەتا دەستی پێکرد و وتی: خۆم لە تۆ مارە کرد لەسەر ئەوەی من تەڵاقدەر بم یان لەسەر ئەوەی کارەکە بەدەستی من بێت هەرکات ویستم، پیاوەکەش وتی قبووڵم کرد، هاوسەرگیرییەکە و تەڵاقەکە دروستە و کارەکە لەدەستی ژنەکەدایە، چونکە گەر دەستپێکردنەکە لە پیاوەکەوە

---

[1] لە سەردەمی نەفامیدا ژن مافی تەڵاقی بۆ هەبوو گەر لە گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەیدا ئەوەی بە مەرج بۆ خۆی بگرتبایە، بەزۆری ئەو مەرجە بۆ ژنێك بوو پلە و پایەی کۆمەڵایەتی باڵای هەبوایە.

بێـت ئـەو کـات تـەڵاق و رادەسـتکردن پـێش هاوسـەرگیرییە بۆیـە دروسـت نییـە، رادەستکردن لەلایان لە هاوشێوەی بە موڵککردنە[1]، ئـەوان لـە سـێ رووەوە هۆیـان هێناوەتەوە:

١–هەڵسوکەوتکەر لە موڵکدا ئەو کەسەیە هەڵسوکەوت دەکات بە بۆچوون و تەگبیر و هەڵبـژاردەی خـۆی، ئـافرەتی راسـپێرراو ئـەو سـیفەتەی بـۆ هەیـە، بۆیـە رادەستکردن بۆ لای بریتییـە لـە بـە مـوڵککردن بـە پێچـەوانەی رادەسـتکردنی کەسی ترەوە.

٢–وتنی پیاوەکە بە ژنەکەی تەڵاقی نەفسی خۆت بدە نابێتە بریکاردانانی، چونکە مرۆڤ نەشیاوە لە مافی خودی خۆیدا بریکار بێت، بۆیە ناگونجێت بکرێتە بریکار لە مـافی تەڵاقـدانی خۆیـدا، بـەڵام دەتوانرێـت بکرێـت بـە خـاوەن، بـە پێچـەوانەی بەبریکاردانانی کەسانی تر جگە لە ژنەکەی بە تەڵاقدان[2].

٣–هەڵسـوکەوتکەر لـە موڵکێکـدا ئـەو کەسـەیە هەڵسـوکەوت بـۆ خـۆی دەکـات، هەڵسوکەوتکەر لە بریکاریدا ئەو کەسەیە بۆ کەسانی تـر هەڵسـوکەوت دەکـات، ئافرەت کارکەری خۆیەتی، بەڵام ئەم رایـە رەخنـەی لـێگیراوە بـەوەی ناکرێـت هەمووی(الكل) شتێك لە یەك کاتدا موڵکی زیاتر لە یەك کەس بێـت، لـە بارێکـدا گەر رادەستکردن بە موڵککردن بێت ئەوە پێویست دەکات، بـەجۆرێك لـە یـەك کاتدا پیاوەکەش مافی تەڵاقدانی بۆ هەیە، ، بەڵام ئەم رەخنەیە دەبرێتە دواوە[3] بەوەی رادەستکردن بە موڵککردنی خستنی تەڵاقەکەیە نەك خـودی تەڵاقەکـە،

---

[1] الدر المختار مع شرح تنوير الأبصار. وابن عابدين ٣/٣١٤ وما بعدها، بدائع الصنائع ٤/١٨٢٢ وما بعدها.

[2] جیاوازی لە نێوان بەموڵککردن و بە بریکارکردن لە پێنج حوکمدایە: لە بە موڵککردندا گەڕانەوەی بۆ نییە، و کەنارگیر ناکرێت، و بە شێتی مێردەکە پووچ نابێتەوە، و کۆتوبەند دەبێت بە دڵنیشتنێکەوە نازنەورێت بە پێچەوانەی بەبریکارکردنەوەو. الدر المختار المرجع السابق.

[3] راجع البحر الرائق ٣/٣١٠.

پێش کەوتن موڵکەکەی ماوەتەوە، بۆیە دروستە پیاوەکە ژنەکە تەڵاق بدات بەر لەوەی ژنەکە خۆی خۆی تەڵاق بدات، بەوەش ئەم بەموڵککردنە وەك بە بریکاردانانی لێ دێت.

**لەسەر دانانی رادەستکردن بە موڵککردن ئەم ئاسارانە سەرهەڵدەدەن:**

أ-بۆ مێردەکە دروست نییە بە قسە پاشگەز ببێتەوە، بەڵکو بە کردار بەوەی تەڵاقی بدات بەر لەوەی ئەو خۆی تەڵاق بدات، چونکە بە موڵککردنە نەك بە بریکارکردن، بەڵام "ابن همام" هۆی بۆ ئەوە هێناوەتەوە بەوەی پەیوەستکردنی تەڵاق بە تەڵاقدانی ژنەکە لەئامێز دەگرێت و پەیوەستکردنیش گەڕانەوەی تێدا نییە[1].

ب-مافی ژنەکە بەردەبێتەوە بە کۆتاهاتنی دانیشتنەکە یان بە دەرچوونی ئەوەی هەست بە پشتهەڵکردن دەکات، ئەمە گەر رادەستکردنەکە پەیوەستکراو نەبێت بە ویستی ژنەکەوە بە ئامرازێك مانای گشتاندنی کات یان کاتی(مؤقت) بە کاتێکی دیاریکراو بگەیەنێت، ئەگینا هەڵبژاردنی بۆ خۆی هەیە بەپێی ئەوە بەبێ پابەندبوون بە مەجلیسەوە[2].

**مالیکییەکان:**

رادەستکردن لەلایان بەموڵککردن و بە بریکارکردن و سەرپشککردنە بەپێی گوزارەی سەرپشککردنەکە(رادەستکردنەکە)[3]

ئەوە بەموڵککردنە گەر تەڵاق درایە دەستی وەك "کاری خۆت لەدەستی خۆتدایە"، بەبریکارکردنە گەر رایسپارد بە تەڵاقدانی خۆی، وەك: "خۆت تەڵاق بدە"، هەروەها سەرپشککردنە گەر گوزارەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد مانەوەی لەژێر

---

(1) راجع الدرر والغرر ١/٣٦٧ وما بعدها.

(2) راجع شرح فتح القدير ٣/٩٩.

(3) راجع المدونة الكبرى ٥/٥٥. وما بعدها. الدسوقي على الشرح الكبير ٢/٤٠٦. وما بعدها. شرح الخرشي ٤/٦٩ وما بعدها. بداية المجتهد ٢/٥٩ وما بعدها.

.ەسەڵاتی پیاوەکەدا یان رۆیشتنی دراوەتە دەستی ژنەکە، بۆیە هەر سێ شێوازەکە
ە هەندێ لە حوکمەکاندا جیاوازن و لە هەندێکی تریدا هاوڕان:

**أ-حوکمە لەیەکتر جیاوازەکان:**

١-گەر رادەستکردن بەبریکارکردن بێت بۆ پیاوەکە دەتوانێت بریکارەکەی خۆی کەنارگیر بکات بەر لە خستنی تەڵاقەکە، جووتبوون لەگەڵی با بە زۆریش بێت بە کەنارگیرکردنی لەو کارە دادەنرێت، بەڵام مافەکەی لە کەناگیرکردن بەردەبێتەوە گەر مافی ژنەکە پەیوەست بوو بە رادەستکردنەکەوە، ئەو کات کەناگیرکردن بۆ ئەو لەدەست دەرچوونە، وەك ئەوەی پێی بڵێت گەر ژنی ترم بەسەر تۆدا هێنا کارەکەت بەدەستی خۆتە.

١-گەر سەرپشککردنێکی رەها بێت وەك بۆ خۆت هەڵبژێرە، پێویستە لەسەر هەڵبژاردی ژنەکە بەینوونە سەرهەڵبدات، گەر وتی بۆ خۆت هەڵبژێرە و ئافرەتەکە لەوانە بوو چووبووە لای و ژنەکەش وتی ئەوا هەڵمبژارد، مالیك دەڵێت ئەوە سێ تەڵاقدانە، چونکە مانای هەڵبژاردن واتای لێجیابوونەوەی هەیە، گەر وتی یەکێکیانم هەڵبژارد سەرپشککردنەکە و ئەسەرەکەی پووچ دەبنەوە، چونکە دەرچوو لەوەی بە هەمووەکی تیایدا سەرپشك کرابوو، بە پێچەوانەی ئەوەی گەر سەرپشککردنەکە کۆتوبەند کرابێت، وەك وتنی "یەك تەڵاق هەڵبژێرە"، ئەویش وتی "یەك تەڵاقم هەڵبژارد"، لەو بارەدا دروستە و یەك تەڵاق دەکەوێت.

٢-گەر بە مۆڵەتکردن بوو بۆی هەیە یەك تەڵاق یان زیاتری خۆی بدات.

**ب-حوکمە هاوبەشەکان:**

١-لە سەرپشککردن و بە مۆڵەتکردن و بە بریکاکردندا کە مافێکی پێوە پەیوەستە: نێوانکەوتنی(حیلولة) ژنەکە و مێردەکەی پێویست دەکات، دروست نییە لێی نزیك ببێتەوە تا ژنەکە وەڵام دەداتەوە بە رەدکردنەوە یان بە وەرگرتن، ئەگینا نزیکبوونەوە لێی سەردەکێشێت بۆ چێژوەرگرتن لە دەسەڵاتێکی هاوسەری مانەوەکەی گومانی تێدایە.

بە پێچەوانەی بەبریکارکردنەوە هیچ مافێکی پێوە پەیوەست نابێت بەهۆی بوونی دەسەلاّتی کەنارگیرکردن لەو بارەدا.

هۆی نێوانکەوتنەکە(حیلولة) ئەوەیە گەر سەرپشککردنەکە یان بە مولککردنەکە رەها بێت، بەلاّم گەر پەیوەستکراو بێت لەسەر شتێك وەك گەڕانەوەی خالد لە سەفەر، ئەوا بەر لە هاتنە دی–لەسەرپەیوەستکراو– نێوانکەوتن لە نێوانیاندا نییە، بەهۆی نەرێبوونی هۆ باسکراوەوەکە، مامۆستا "أحمد الغندور" لەم درێژەپێدانە لای مالیکییەکان بێئاگایە، لە کتێبەکەیدا (الطلاق في الشريعة الاسلامية والقانون)[1] دەڵێت: (مالیکییەکان پێیانوایە گەر مێردەکە ژنەکەی لە کاروباری خۆیدا راسپارد جا رادەستکردنەکە کۆتوبەندکراو بێت بە ماوەیە یان گشتی بێت، ئەوا دەکەوێتە نێوان پیاوەکە و ژنەکەی تا وەلاّمدەداتەوە بە کەوتنی تەلاقەکە یان گێڕانەوەی ئەوەی لە دەستیدایە)

مامۆستا "الغندور" لەم دەربڕینەدا هەڵەی کردووە لە دوو رووەوە:

**رووی یەکەم** حوکمی رادەستکردنی رەها جیاوازە لە کۆتوبەندکراو، کەوتنەنێوان لە کۆتوبەندکراودا بوونی نییە بەر لە هاتنە دی ئەوەی پێیوە کۆتوبەند کراوە.

**رووی دووەم** پێدانی ئەم حوکمە بە رادەستکردن لە هەر سێ شێوەکەیدا، لە کاتێکدا رادەستکردنی بەرجەستە بە بریکارکردن ئەم حوکمەی بۆ جێگیر ناکات، چونکە لە توانای پیاوەکەدا هەیە کەنارگیری بکات مەگەر مافێکی پێوە پەیوەست بووبێت، لەلای مالیکییەکان لە ماوەی کەوتنەنێوانەوە خەرجیکردن بۆ ژنەکە نییە، چونکە رێگر لەو خەرجیکردنە، بەلاّم گەر یەکێکیان بەر لە ئەرێکردن مرد ئەویتریان میراتی لێ دەگرێت.

٢–گەر پاوەکە ژنەکەی سەرپشك کرد یان کردی بە مولکی و ژنەکە شتێك لە ئەرێکردن یان رەدکردنەوەی ئەنجام نەدا ئەوا بۆ دادوەر هەیە ژنەکە رابگرێت تا

---

[1] راجع الطلاق في الشريعة الاسلامية والقانون للدكتور الغندور ص١١٩.

بڕیار لە کەوتن یان ڕەتکردنەوەی ئەوە دەدات لەدەستیدایە، گەر بڕیارەکەی جێبەجێ نەکرد ئەوا حوکم دەدرێت بە هەڵوەشانەوەی رادەستکردنەکە و مۆڵەتی پێ نادرێت با مێردەکەش رازی بێت بە مۆڵەت پێدان بەهۆی پەیوەستبوونی مافی خودا پێیەوە بە پێڕاکێشان لە دەسەڵاتێکدا گومانی تێدا هەیە.

٣-مافی لە تەڵاقدان بەردەبێتەوە گەر لە دوو شێوەی بەموڵککردن و سەرپشککردندا تەڵاقەکەی خست و ژنەکەش گوێڕایەڵ بوو، بەڵام لە بریکارکردندا چوونە لا بە کەنارگیرکردنی ڕەها دادەنرێت ژنەکە بۆ ئەو کارە گوێڕایەڵ بێت یان زۆرلێکراو.

٤-لە سەرپشککردن و بە موڵککردندا بۆ مالیك دوو قسە هەیە[1] تایبەت بە مانەوەی مافی ژنەکە بە کۆتاهاتنی دانیشتنەکە یان نەمانەوەی، لە قسە کۆنەکەیدا مافی ژنەکە بە کۆتاهاتنی دانیشتنەکە کۆتایی پێ نایەت، لە تازەکەیدا-کە لەسەر ئەو قسەیە مردووە- بەوە و بە ڕوودانی هەر شتێك پشتهەڵکردن بگەیەنێت بەردەبێتەوە، ئەمە هەڵبژاردنی "ابن القاسم" و هاوەڵانی مالیکی لەسەرە، بەڵام بەبریکارکردن تەنهادەبێتەوە لێی بە بەردەوامبوونی ئەو مافە گەر بریکارییەکە هەڵنەوەشێتەوە.

٥-لە بە موڵککردن و بە بریکارکردندا هەندێ جار تەڵاقەکە رجعی دەبێت و هەندێ جاریش بائین دەبێت، سەرپشککردن تایبەتە بە بائین گەر کۆتوبەندکرلو نەبێت وەك پێشتر باسکرا.

**شافیعییەکان:**

لە ڕادەستکردندا بۆ شافیعی دوو قسە هەیە[2]، لە قسە کۆنەکەیدا ڕادەستکردنی ژنەکە بە تەڵاقدان-وەك ڕادەستکردنی کەسانی تر وایە بەو کارە- بە بریکارکردنە و

---

(1) الخرشي ٤/٧٠.

(2) راجع المهذب ٢/٨٠.

لەسەر ئەوە پەیوەستکردنی ڕێگەپێدراوە، وەك: "گەر سەری مانگ هات خۆت تەڵاق بدە"، بە مەرج نەگرتنی دەمودەست و یەکسەری لە ڕاستترین ڕادا-وەك هەموان-بریکارییە.

هەندێکیان دەڵێن: ڕادەستکردن با بە بریکارکردنیش بێت بەڵام لەگەڵ ئەوەش بە موڵککردنی خۆی(ژنەکە) لەخۆ دەگرێت بەو گوزارەی ژنەکە دەیهێنێت، ئەوەش پێویستی بە وەڵامێکی پەلەیە، بۆ پیاوەکە مافی پاشگەزبوونەوە هەیە بەر لە تەڵاقدان، لە قسە تازەکەی شافعیدا لەگەڵ حەنەفییەکان هاوڕایە لەوەدا کە ڕادەستکردن بەموڵککردنە گەر بە ئەندازەی ئەوەی قبووڵی پێ دەکەوێت لە ئەرێکردن دواکەوت و پاشان خۆی تەڵاقدا ئەوا تەڵاقەکە ناکەوێت، "خۆت تەڵاق بدە" ڕاشکاوە، یان "بۆ خۆتی هەڵببژێرە" یان "کاروباری خۆت بەدەستی خۆتە" ئەمانە ناڕاشکاون و پێویستە نیەتی تەڵاقیان لەگەڵ بێت، لەسەر تەڵاقدانی خۆ ڕادەستکراو کەوتنی یەك تەڵاقی ڕجعی سەرهەڵدەدات گەر چووبێتە لای و تەڵاقەکە تەواوکەری تەڵاقی سێ نەبێت.

**حەنبەلییەکان:**

حەنبەلییەکان لەگەڵ ئەوەی شافیعی بۆیچووە-لە قسە کۆنەکەیدا- هاوڕان لەوەی ڕادەستکردن بە بریکارکردنە گەر بەم شێوازە بوو: "خۆت تەڵاقبدە"، یان "کاروباری خۆت لەدەستی خۆتدایە"، یەکسەری و دەمودەستی تێدا بەمەرج ناگیرێت وەك بە بریکارکردنی کەسانی تر جگە لە ژنەکە بە تەڵاقدان و پاشگەزبوونەوەی بۆ هەیە بە قسە و بە کردار، لە "الإنصاف"دا هاتووە: گەر وتی بە ژنەکەی: "خۆت تەڵاق بدە" ئەوا ژنەکە ئەو کارەی بۆ هەیە هەروەك بەبریکارکردنی خەڵکی بێگانە تیایدا بەبێ هیچ کێبەرکێیەك، ئاشکرای قسەی دانەری کتێبەکە: ژنەکە بۆی هەیە خۆی تەڵاق بدات لە دانیشتنی بریکارییەکە و دوای دانیشتنەکە گەر

حوکمی بریکارییەکە پووچ نەکرابێتەوە وەك: "کاروباری خۆت بەدەستی خۆتە" ئەوەش دروستەکەیە و هەرئەوەش بریتییە لە رای مەزهەب[1].

بەڵام دەستەیەك لەوان لەسەر ئەوەن هەندێ لە شافیعییەکان دەیڵێن لەوەی رادەستکردن  با بە بریکارکردنیش بێت دلوای یەکسەری و دەمودەستی دەکات، لە "الإنصاف"دا هاتووە: ("القاضي" دەڵێت پابەند دەبێت بە دانیشتنەکەوە و "ابن عبدوس" لە "التذکرة"دا ئەمەی هەڵبـژاردووە)، لە قسەی حەنبەلییەکانەوە ئەوە دەردەکەوێت رادەستکردنیان بە شێوەی "سەرپشك بە لە خۆتدا" بە بریکارکردن دانەناوە، لە "الإقناع"دا هاتووە: (ژنەکە بۆی نییە تەڵاقی خۆی بخات لە "سەرپشك بە لە خۆتدا" مەگەر لە دانیشتنەکەدا بێت، بە دابڕان لە دانیشتنەکە هیچ شتێك سەرهەڵنادات)[2].

**جەعفەرییەکان:**

بۆ فەقیهە جەعفەرییەکان لە حوکمی رادەستکردندا سێ را هەیە:

١-هەندێکیان دەڵێن: تەڵاقدان تەنها لە خودی مێردەکەوە دروستە یان بریکارەکەیەوە کە دەبێت کەسێکی تر بێت جگە لە ژنەکە، وەك کارکردن بە گشتاندنی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((تەڵاق بە دەستی ئەو کەسەیە دەست دەبات بۆ لاق))، هەروەها لەبەر ئەوەی رادەستکردن لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بووە تەنانەت تایبەت بە ئەو تەڵاق نەبووە، چونکە گەر ژنەکانی رادەستکردنی خودی خۆیان هەڵبژاردبایە ئەوا دوای سەرپشك کردن پێغەمبەر(ﷺ) تەڵاقی دەدان)[3].

٢-زۆرینەیان لەسەر رادەستکردنێکن کە لە بریکارکردندا خۆی دەبینێتەوە، بۆ مێردەکە هەیە ژنەکەی بکات بە بریکار لە تەڵاقدانی خۆی یان تەڵاقدانی کەسانی

---

[1] الانصاف ٨/٤٤٦. وما بعدها منتهى الارادات ٢/٢٤٩.

[2] الاقناع ٣/١٣.

[3] راجع شرائع الاسلام ٢/٥٤. جواهر الكلام كتاب الطلاق. مستدرك الوسائل ٣/٩.

تر جگە لە خۆی، وەك چۆن دروستە كەسانی تر جگە لە ئەو لە گرێبەستەكاندا بكات بە بریكار، چونكە كاملە و بوونی لە مەنزیلەتی ئەرێكەر و قبوولكەر نەنگی بۆ دروست ناكات، چونكە گۆڕاوی بەهەندوەرگیراو بەسە، هەروەها لەبەر ئەوەی تەلاق نوێنەری قبوولْ دەكات، بۆیە هیچ تایبەتمەندییەك بۆ نوێنەر نییە، بە بریكاركردنیش پێچەوانە نییە لەگەڵ فەرموودەكەی پێغەمبەر(ﷺ): (تەلاق بۆ ئەو كەسەیە دەست دەبات بۆ لاق)) چونكە دەستی ژنەكە لە دەستی پیاوەكە سوودی وەرگرتووە، هەروەها لەبەر ئەوەی فەرموودەكە ئامرازی كورتهەڵهێنانی تێدا نییە بۆیە ئاماژەكەی بۆ سەری لاوازە[1].

٣-دەستەیەك-لەوانە ئیبن عەقیل[2]- دەڵێن: رادەستكردن رێگەپێدراوە با بە سەرپشككردنیش بێت، بەلام بە مەرجێك ژنەكە بلێت: من تەلاقدراوم، گەر بلێت "خۆمم سەرپشك كرد" تەلاقەكە ناكەوێت.

ئەوەی ئاشكرایە ئەوەیە ئەم قسەیە لەسەر ئەوە بیناكراوە كە رادەستكردن لەلای ئەم دەستەیە بە هەر سێ شێوەكەیەوە بریتییە لە بە بریكاركردن، ئەوە لە مادەی(٢٦٣) وەردەگیرێت لەوەی هەموو بە بریكاركردنێكی پەیوەستكراوە لەسەر هەڵبژاردنی ژنەكەیە[3].

**زەیدییەكان:**

رادەستكردن لەلایان یان بە موڵككردنە یان بە بریكاركردن بەپێی گوزارەی دارشتنەكەی[4].

أ-بە موڵككردن: ئەوەیە بە ژنەكەی بلێت: "تەلاقی تۆم كرد بە موڵكی تۆ یان كاروباری خۆت بەدەست خۆتە یان بۆ خۆت سەرپشك بە"، بەلام لە دوو

---

[1] راجع الروضة البهية ١٤٩/٢.

[2] راجع جواهر الكلام المرجع السابق.

[3] راجع الاحوال الشخصية للفقه الجعفري.

[4] راجع التاج المذهب ١٦٤/٢ وما بعدها. الروضة الندية ٥٧/٢. البحر الزخار ١٦٢/٣ وما بعدها.

گوزارەکەی دوایـیـدا نیـەتی بـە مـوڵککردنی لـێ دەهێنێـت، لەسـەر ئـەوەی بـە موڵککردن بێت ئەم ئاسارانە سەرهەڵدەدەن:

١-مافی ژنەکە بە کۆتاهاتنی دانیشتنەکە و ڕوودانی هەستکردن بە پشتهەڵکردن لـە قسـەکە بەردەبێتـەوە، بێـدەنگبوونی دووروودرێـژ لـە دانیشـتنەکەدا بـە پشتهەڵکردن لە قسەکە دادانرێت، ئەمە گەر بەمەرجگیراو نەبێت بە شێوەی "کەی"، وەك کەی ویستت خۆت تەلاق بدە، ئەگەرنا دوای دانیشـتنەکەش ئەوەی بۆ هەیە.

٢- بۆ پیاوەکە دروست نییە بە وتـن بیگەڕێنێتـەوە، ئەگـەریش بـەر لـە قبـوڵ کردن یان تەلاقدان بێت، چونکە تەلاق بەردانەوەیە و گەڕانەوەی تێدا نییـە، بە پێچەوانەی بە موڵککردنیماڵەوە ئەوەیان جێگیرکردنە و پاشگەزبوونەوە لێی پێش قبووڵ کردن ڕێگەپێدراوە، بە کردار پاشگەزبوونەوەی بۆ هەیە بەر لە قبووڵ کردن و دوای قبووڵ کردن بەوەی تەلاقی بدات بەر لـەوەی ژنەکـە خۆی خۆی تەلاق بدات.

٣-بۆ ژنەکە دروست نییە زیاتر لە یەك جار تەلاقی خۆی بدات.

ب-بە بریکارکردن: ئەوەش کاتێك بەم جۆرە قسەی لەگەڵ ژنەکـەی بکـات: "خـۆت تەلاق بدە یان تۆم کرد بە بریکار لەسـەر تـەلاق"، لەسـەر ئـەوەی بریکـار بێـت ئەمانە سەرهەڵدەدەن:

١-بۆ تەلاقدانی خۆی بە کاتێکی دیاریکراو کۆتوبەند ناکرێت گەر پیاوەکە کاتێکی بۆ ژنەکە دیارینەکردبێت.

٢-بۆ پیاوەکە پاشگەزبوونەوە هەیە بەر لەوەی ژنەکە تەلاقی خۆی بـدات گـەر پیاوەکە نەیوتبێت بە ژنەکە هەرکات تۆم کـەناگیر کـرد تـۆ جـارێکی تـر لـە تەلاقداندا بریکاری.

٣-بۆی هەیە یەك تەلاقی خۆی بدات بەبێ بریتی گەر بریکارییەکە ڕەها بوو.

**زاهیرییەکان:**

رادەستکردن لەلایان پووچ و بێبنەمایە بەرەهایی، هەر کەس ژنەکەی سەرپشک کرد ئەویش خۆی هەڵبژارد یان تەڵاق یان مێرد یان هیچی هەڵنەبژارد، هیچ ئەسەرێکی جیابوونەوە یان حەرام یان تەڵاقی لێوە سەرهەڵنادات، هەر بەو جۆرە لە بەموڵککردن و بەبریکارکردندا.

**بەڵگەیان[1]:**

١–تەڵاق تایبەتە بە پیاو نەك بە ئافرەتان.

٢–بریکاری لە تەڵاقدا دروست نییە، چونکە تایبەت بە بریکارکردنی تەڵاق نە قورئان بوونی هەیە نە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵکو ئایەتی ﴿وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا﴾ راشکاوە لە نادروستی تەڵاقدان بۆ کەسانێکی تر جگە لە مێردەکە.

٣–لە ئایەتەکانی حوکمی تەڵاق قورئان رووی گوتاری تەنها لە پیاوانە، بۆیە هەر تەڵاقدانێك لە کەسانی ترەوە جگە ئەوان سنووریەزێنییە بۆ سنوورەکانی خودا﴿وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾، لە "المحلى"دا[2] هاتووە: هەر کەس تەڵاقدانی دلیە دەستی ژنەکەی ئەوە بۆی پێویست نابێت و تەڵاق نەدراوە، ژنەکە تەڵاقی خۆی بخات یان تەڵاقی خۆی نەخات لەبەر ئەوەی لە تەڵاقدا باسمان کرد.

**لە دیدگای منەوە:**

رادەستکردن کارێکی نوو سەرەیە، سەرپشککردنی ژنەکە لە دەسەڵاتی تەڵاقدان و رادەی ئاگاهی پیاوەکە بەوەی ژنەکەی هەیەتی بەرانبەری لە خۆشەویستی و دڵسۆزی و ئارەزوو بۆ مانەوەی قەوارەی هاوسەرگیری کۆدەکاتەوە، چونکە پیاوە رادەستکەرەکە کاتێك رووی قسەی دەکاتە ژنەکە و پێی دەڵێت "خۆت تەڵاق بدە

---

[1] راجع المحلى ١٠/١٩٦ وما بعدها.

[2] راجع المرجع السابق ١٠/٢١٦.

یان کاروباری خۆت بەدەستی خۆتە" ئارەزووی جیابوونەوەی نییە ئەگینا توانای ئەوەی هەیە خۆی تەڵاقی بدات.

لێرەدا فەلسەفەی رادەستکردن رۆشن دەبێتەوە لە ئەزموون کردنی ژنەکەی لەلایەکەوە و لە بەدەستهێنانی خۆشەویستی و هاندانی لەسەر نەچوونە پێش بۆ ئەو کارە لە روویەکی ترەوە، وەك ئەوەی پێی بڵێت تەڵاق کارێکی ناپەسەندە و سەرەنجامەکەی خراپە، ئەگینا من بۆ خۆم لێی دەچوومە پێش و من مانەوە و بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەریم لا پەسەندە، تۆش هیوادارم هەمان رێگەی من بگریتە بەر و بیر لەوە بکەیەوە من بیری لێ دەکەمەوە و ئەوە بە هەند وەربگری من بە هەندی وەردەگرم، بەڵام گەر جیابوونەوەت هەڵبژارد ئەوا لە منەوە دەسەڵاتی جیابوونەوەت بۆ هەیە، بینا لەسەر ئەمە رادەستکردن جۆرێکی تایبەتە لە بەمولککردن و لە هیچ جۆرە بە مولککردنێکی تر ناچێت، دەرئەنجام بۆ ژنەکە هەیە ئەو دەسەڵاتە بەکاربهێنێت لە دانیشتنی گفتوگۆکەدا، گەر شتێکی لێ نەوەشێتەوە پشتهەڵکردن بگەیەنێت و پاڵپشتی بیرۆکەی مێردەکەی بکات، بۆ مێردەکە مافی گەڕانەوە بە قسە بوونی نییە، چونکە ئەم بە مولککردنە تێکەڵەیەك لە پەیوەستکردنی تێدایە.

**هەڵوێستی یاسا لە رادەستکردن:**

زۆرینەی یاسای باری کەسێتی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان دانیان ناوە بە رادەستکردنی تەڵاق بە دەستی ژن.

**عێراقی:** راستکردنەوەی پێنجەمی یاسای باری کەسێتی دانی بە مافی ژندا ناوە لەوەی خۆی تەڵاق بدات لەدوای هەڵوەشانەوەی مادەی(٣٤) کە دانیناوە بە بریکارکردنی ژنەکە و کەسانی تردا، تایبەت بە خەڵکانی تر جگە لە ژنەکە سڕیویەتەوە بەم جۆرە:

**یەکەم**—تەڵاق هەڵگرتنی کۆتوبەندی هاوسەرگیرییە بە خستنی لەلایەن پیاوەکەوە یان ژنەکەوە گەر کرا بە بریکار تیایدا یان رادەستی کرا یان لە قازییەوە، تەڵاق تەنها بە دارشتنی گوزارەی تایبەتکراو کە شەرع دایناوە دەکەوێت.

**دووەم**—گرنگی بە بریکاری نادرێت لە رێکارەکانی باسی کۆمەڵایەتی و حەکەمدانان لە خستنی تەڵاقدا.

**مادەی دووەم**: کار بە هیچ دەقێك ناکرێت بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ حوکمەکانی ئەم یاسایەدا[1].

لەم یاسایەدا یاسادانەر "رادەستکردن"ی عەتفکردۆتەوە سەر "بەبریکارکردن" عەتف گەر بۆ جیاکاری بوو وەك چۆن بەو جۆرەیە لە بنەرەتدا مەبەست بە "رادەستکردن" بریتی دەبێت لە "بەمولککردن"، گەر عەتفی لێکدانەوە و شرۆڤەکردن بێت مەبەست پێی بە بریکارکردنە بۆ روونکردنەوەی زیاتری عەتف لەسەرکراوەکە، هەرچۆنێك بیت ئاشکرای دەقەکە پاڵپشتی ئەگەری یەکەم دەکات.

**سوری**: (بۆ پیاوەکە هەیە کەسانی تر بکات بە بریکار لە تەڵاقداندا، هەروەها رادەستی ژنەکەی بکات بە تەڵاقدانی خۆی)(م٨٧/٢)

**مەغریبی**: (تەڵاق بریتییە لە هەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری بە خستنی تەڵاقەکە لەلایەن پیاوەکەوە یان بریکارەکەیەوە یان ئەو کەسەی رادەستی کردووە لەو کارەدا یان ژنەکەی گەر بوو بە خاوەنی ئەو مافە یان قازی)(الفصل ٤٤)

لێرەدا یاسادانەر گوزارەی "بوو بە خاوەنی" هەڵبژاردووە لە جێگەی "رادەستکردن" بۆیە لێڵی و تەمومژی تێدایە.

**تونسی**: یاسادانەری تونسی دانی نەناوە بە کەوتنی تەڵاقدا بە بریکاری یان بە رادەستکردن، ئەوەش بەوەی دانی پیادا ناوە لە دوو بەشی(٣٠—٣٢)دا بەم جۆرە:

(تەڵاق تەنها لای دادگا دەکەوێت) (الفصل ٣٠)

---

[1] التعديل الخامس رقم (١٥٦) المنشور في الجريدة الرسمية العدد (٢٧٩٥) السنة (٢٣) في ٢٢/ ايلول/١٩٨٠.

(بڕیاری تەڵاق کاتێك دەدرێت سەرۆکی دادگا یان ئەو کەسەی نوێنەری ئەو دەکات هەوڵبدات بۆ ئاشتەوایی نێوان دوو هاوسەرەکە و دەستەوسان بێت لە پێکهێنانەوەیان) (الفصل ٣٢)

**ئوردەنی:** (بۆ مێردەکە هەیە کەسانی تر بکات بە بریکار لە تەڵاقداندا، هەروەها بۆی هەیە تەڵاقدان رادەستی ژنەکە بکات بۆ تەڵاقدانی خۆی بە مەرجێك ئەوە بە قەواڵەیەکی نووسراو بێت) (م٨٧)

**جەزائیری:** مادەی(٤٣) لە پرۆژەیاسای ڕێخۆشکەر بۆ یاسای باری کەسێتی جەزائیری بە دەق ئاماژە بەوە دەکات کە: (تەڵاق بریتییە لە هەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری، ئەوەش بەدەستی پیاوەکەیە تەنها بە حوکمێك جێگیر دەبێت دوای هەوڵی ئاشتەوایی)

لەم دەقەوە دەردەکەوێت: یاسادانەری جەزائیری بە یاسادانەری تونسی کاریگەرە لە ڕەد کردنەوەی هەموو جۆرە ڕەنگێك لە ڕەنگەکانی بە بریکارکردن لە تەڵاقدا، نادروستی بەبریکارکردن لە تەڵاقدا بریتییە لە مەزهەبی زاهیرییەکان وەك پێشتر ڕۆشنمان کردەوە، بەڵام کۆتوبەندکردنی تەڵاق بەم ڕێکارە قەزاییانەوە هیچ یەکێك لە فەقیهانی موسڵمان نەیانوتووە تایبەت بە تەڵاقی بێ بەرانبەر، بەڵام لە خولعدا(تەڵاق بە بریتییەك) هەندێ لە فەقیهان وتویانە پێویستە لەبەردەم دەسەڵاتدا یان لەبەردەم ئەو کەسەی دەسەڵات دایدەنێت ئەنجام بدرێت، وەك لە بەشی پێنجەمدا دێت.

# بەشی پێنجەم:
# ڕادەی ئازادی ویستی دوو هاوسەرەکە لەسەر ڕێکەوتن بۆ کۆتا هێهێنانی پەیوەندی هاوسەرێتی

ئەوەی زانراوە ئەوەیە هاوسەرگیری گرێبەستێکی پابەندکەرە بۆ هەردوو لا، بنەڕەت تیایدا هەڵنەوەشانەوەیە و کاریگەرییە شەرعییەکەی بە ویستی تاکلایەنە کۆتایی پێ نایەت، تایبەتکردنی پیاوەکە بە دەسەڵاتی تەڵاقدان بە هۆی حوکمێکەوە بووە کە پێشتر لایەنێکیمان باس کرد، بینا لەسەر ئەوە ڕێکەوتنی دوو هاوسەرەکە لەسەر کۆتاهێنان بە پەیوەندی هاوسەری لە سروشتی ئەو گرێبەستە کەم ناکاتەوە، کارێکی سروشتییە ئیسلام دان بەو ڕێکەوتنەدا بنێت وەك چۆن زۆرینەی شەریعەتەکانی ئاسمان و یاسای دانراو دانیان پیادا ناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ویستی دوو هاوسەرەکەی لەم ڕێکەوتنەدا واز لێ نەهێناوە و ئازاد نەکردووە، بەڵکو کۆمەڵێك بنچینەی بۆ دامەزراندووە کە زۆرینەیان لە بەرژەوەندی ژنەکەن، چونکە لایەنێکی لاوازە لەو پەیوەندییەدا.

کۆمەڵێك کۆتوبەندی لەسەر ویستی دوو هاوسەرەکە داناوە هەندێکیان بۆ کۆمەڵێك هۆی پێویستکەر دەگەڕێنەوە، و هەندێکی تر بۆ لێوەشاوەیی دەگەڕێنەوە، هەشیانە بۆ ئەو بریتییە دەگەڕێتەوە کە لەلای ژنەکەوە دەبەخشرێت بە مێردەکە.

جمهووری فـەقیهانی موسـڵمان پێداگری دەکـەن لـە زەروورەتـی ئـەوەی ئـەو ڕێکەوتنە ڕووالەتی نەبێت، بەڵکو پێویستە بە شێوەیەکی کامـڵ ڕازیبـوونی ژنەکـەی تێدا بێتە دی، لەم ڕایەیاندا دەستیان گرتووە بەو دەقانەوە لە قورئاندا هاتوون لەمەڕ ئەم بابەتە، ئەوان حوکمەکانی ئەو ڕێکەوتنە لەژێر ناونیشانی "خولع"دا باس دەکەن، لەم بەشەدا ڕاستەقینەی خولع و بەڵگەکانی و حوکمەکانی و ڕەگەزەکانی و چۆناندنە فیقهییەکەی لە سێ باسدا دەست بۆ دەبەین.

# باسی یەکەم:
# خولع
# پێناسەکەی، بەڵگەکەی، حوکمەکەی

## پێناسەکەی:

**"الخلع" لەڕووی زمانەوانییەوە:** بریتییـە لـە لابـردن، "خلـع فـلان ثوبـه" واتـە جلەکانی لەبەرکردەوە.

**لەڕووی شەرعەوە:** بریتییە لە ڕێکەوتنی دوو هاوسەرەکە یان ڕێکەوتنی ئەوانەی نوێنەرایەتی ئـەوان دەکـەن لەسـەر کۆتاهـاتنی پەیوەنـدی هاوسـەری، بەرانبـەر بـە بریتییەك کە لەلای ژنەکەوە دەدرێت بە پیاوەکە.

ئەم هەڵسوکەوتە ڕێکەوتنییە وەك چۆن بە زاراوەی فەقیهان پێی دەوترێت خولع، هەر بەو جۆرە پێی دەوترێت فیدیە و سوڵح و گەردنئازادی(ئەستۆپاککردن)، هەندێ لە فەقیهانیش جیاوازیان کردووە لە نێوانیاندا.

" مالیکیەکان[1]، و ئیباضیەکان[1]" دەڵێن: "بریتی" لە خولعدا یەکسانە بـەوەی

---

[1] المدونة الکبری ٥/٢٨. تفسیر القرطبي ٢/١٤٥.

لە پیاوەکەوە بە ژنەکە گەیشتووە، بەلاّم لە سولّحدا کەمترە و لە فیدیەدا زۆرترە و لە گەردننازادیشدا بەردانەوەی مافی ئافرەتەکەیە لەسەر پیاوەکە، لە قسەیەکی مالیکدا کە "العربی[2]" باسی دەکات: گەردننازادی بریتییە لە خۆخولعکردن بەوەی هەیەتی بەر لە چوونە لا، خۆخولعکردنیش گەر ژنەکە بۆ ئەو مەبەستە دوای چوونە لا ئەو کارەی کرد، فیدیەش بریتییە لە خۆخولعکردن بە هەندێ لەوەی ژنەکە هەیەتی.

" الطوسي[3]" لە جەعفەرییەکان دەڵێت: هاوەلاّنی ئێمە جیاوازیان کردووە لە نێوان خولع و گەردننازادکردندا لە تەلاّقدا بە بریتییەك، لە گوزارەی خولعدا رێگەیانداوە بە بریتی بەپێی ئەوەی رێکەوتوون، کەم بێت یان زۆر، بەلاّم لە گوزارەی گەردننازادکردندا تەنها رێگەیان داوە بە بریتی لە خوار مارەییەوە.

ئەبو یوسف هاوەڵی ئەبی حەنیفە پێیوایە: هەموو مافە پێویستەکان بە گرێبەستی هاوسەرگیری بە گەردننازادی بەردەبێتەوە نەك بە خولع.

پێموایە گرنگی لەم جیاوازییەدا نییە، بەلّکو گرنگی لە دروستی رێکەوتنەکەدایە، ئەوە بریتییە لە رازیبوونی تەولو و لێوەشاوەیی کاملّ لەرووی چەندێتی و چۆنێتییەوە بریتییەکە هەرچییەك بێت.

## بەڵگەکانی رەوایەتی خولع:

أ‌- قورئان: خودا -ﷻ- دەفەرموێت: ﴿وَلا يَحِلُّ لَكُمْ أن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلَّا أن يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾[4].

---

[1] شرح النيل ٣/٤٨٠.

[2] تفسير ابن العربي أحكام القرآن ١/١٩٤، بداية المجتهد٢/٥٥.

[3] الخلاف للطوسي ٢/٢٣٢ .والكافي ٦/١٤٢ وما بعدها.

[4] (الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلا يَحِلُّ لَكُمْ أن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلَّا أن يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (البقرة:٢٢٩).

ب–سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ): لە ئیبن عەباسەوە: ژنەکەی سابیتی کوڕی قەیس وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، سابیتی کوڕی قەیس هیچ نەنگییەکی لە ئەخلاق و دیندا نییە، بەڵام رقم لە کافربوونە[1] لە دوای ئەوەی چوومە ناو ئیسلامەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: باخەکەی بۆ دەگێڕیتەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی(بە پیاوەکە): باخەکەکە قبووڵ بکە و یەك تەڵاقی بدە[2]، باخەکە مارەیی ژنەکە بوو، هەندێ لە فەقیهان بەڵگەیان هێناوەتەوە بەم فەرموودەیە لەسەر ئەوەی "بڕیتی خولع" پێویستە لەو بڕە مارەییە زیاتر نەبێت پیاوەکە داویەتی بە ژنەکەی.

حوکمەکەی:

١–" أبو بکر بن عبدالله المزنی" دەڵێت: لە بنچینەیدا خولع دروست نییە، بۆ مێردەکە دروست نییە شتێك لە ژنەکەی وەربگرێت، ئەوەش حوکمێکی جێگیرە بە ئایەتی: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَاراً فَلا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئاً... الآية﴾، ئەم رایە رەدکراوەیە، چونکە لە مەرجەکانی نەسخ بریتییە لە دژیەکی دوو ئایەتەکە، ئەوەش لێرەدا نەهاتۆتە دی، چونکە ئایەتی دووەم لەسەر ئەوە بیناکراوە وەرگرتنەکە بەبێ رازیبوونی ژنەکە بێت، یەکەمیان ئاماژە دەکات بە دروستی بە رازیبوونی ژنەکە بۆیە دژیەکی لە نێوانیاندا بوونی نییە..

٢–دەستەیەك دەڵێن دروست نییە مەگەر لەباری ناپاکی هاوسەریدا لە ژنەکەوە.

٣–هەندێ دەڵێن خولع تەنها لای دەسەڵاتدار(سەرۆکی دەوڵەت) دروستە یان لای ئەو کەسەی ئەو دیاریکردبێت وەك قازی، ئەوە رای " الحسن البصری، وابن سیرین وسعید بن جبیر"ە، بەرپەرچی ئەم رایە دەدرێتەوە بەوەی بەڵگەیەك نابینرێتەوە ئەوە بسەلمێنێت، هەرچەند رایەکی پەسەندە تایبەت بە دەستەبەرکردنی مافی ژنەکە.

---

[1] أي كفران التقصير فيما يجب له.

[2] أخرجه البخاري وأبو داود والنسائي وهو حديث متفق على صحته. وفي رواية: (اني ما اعتب عليه في خلق ولا دين ولكن اكره الكفر في الاسلام فقال رسول الله ﷺ اتردين عليه حديقته... الى آخره) رواه البخاري ومسلم. نيل الأوطار ٦/٢٧٦.

٤-جمهوور دەڵێن: خولع پێش ئیسلام بوونی هەبوو لەژێر رەچاوکردنی کۆمەڵێك کۆتوبەندا کە هەمووی بە دەوری یەك شتدا دەسوڕایەوە ئەوەش ئەوە بوو لەو رێکەوتنەدا زۆرداری نەکرێت بە ماف ئافرەتەکە، دیدگای فەقیهان لەمەڕ ئەو کۆتوبەند و ئاسارەی کە لەسەر سەرپێچیکردن لێیان سەرهەڵدەدات جۆراوجۆرە.

**حەنەفییەکان:**

دەربارەی حوکمی خولع دەڵێن موباحە گەر هۆیەکە لە هەردووکیانەوە بێت یان لە ژنەکەوە بێت، لەبەر ئایەتی: ﴿فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾، کەراهەتی هەیە بە کەراهەتی حەرامبوون گەر بە نشوزی پیاوەکەوە بوو، یان لەباری راسترەویدا بێت و هیچ هۆیەك بوونی نەبێت، هەروەها ئایەتی: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَاراً فَلا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئاً... الآية﴾.[1]

## مالیکییەکان:

گەر نشوز لە پیاوەکەوە بوو دروست نییە بۆی هیچ شتێك لە بریتی لە ژنەکە وەربگرێت، گەر نشوز لە ژنەکەوە بوو دروستە بۆی لێی وەربگرێت بەبێ دیاریکردن گەر بە رازیبوونی ژنەکە بوو، و سەرچاوەی رازیبوونەکەی بەهۆی تەنگەتاوکردنەوە نەبێت[2].

**شافیعییەکان:**

بەبێ هۆ کەراهەتی هەیە، بەپەسەند دەبینرێت گەر پاساوی هەبوو، حەرام و پووچە گەر ئەنجامی کارێك بوو پیاوەکە دژ بە ژنەکە پێی هەستابێت وەك خۆگرتنەوە لە خەرجی بۆکردنی، لە "المهذب"دا هاتووە: (گەر رقی لە مێردەکەی بوو بەهۆی نەشیاوی یان خراپی مامەڵە و ترسی ئەوەی هەبوو ماف پێ نەدات،

---

(1) (وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَاراً فَلا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئاً أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُبِيناً) (النساء:٢٠) شرح فتح القدير ١٩٩/٣ وما بعدها. الجوهرة ١٣٥/٢ وما بعدها.

(2) المدونة الكبرى ١٢/٦ وما بعدها شرح الخرشي ١٢/٤ ومابعدها بدية المجتهد ٥٦/٢.

دروستە ژنەکە خۆی خولع بکات لەسەر بریتییەك بەهۆی ئایەتی: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ... الآية﴾.، هەروەها لەبەر فەرموودەکەی سابیتی کوڕی قەیس، هەر بەو جۆرە لەبەر ئەوەی هەڵگرتنی گرێبەست بە رازیبوونی هەردوو لا بۆ پاڵنانی زیان دانراوە، گەر مێردەکە مافی ژنەکەی نەدەدا تاکو خولعی بکات کارەکە لەرووی حوکمەوە دروست نییە، بەڵام تەڵاقەکە دەکەوێت[1] و بریتییەکە بەردەبێتەوە، چونکە بە ناحەقە[2]، لەبەر ئایەتی: ﴿وَلا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ﴾، جمهووری فەقیهانی شافیعی دەڵێن: خولع پەسەندە بۆ ئەو کەسەی سوێندی بە تەڵاقی سێ خواردووە لەسەر شتێك کە دەبێ ئەنجامی بدات، ئیبن قەیم لەسەر ئەم رایە[3] دەڵێت: لە فێڵە(حیلە) پووچەکان بریتییە لە فێڵی خۆرزگارکردن لە کەوتنی سوێند بە خولع، پاشان سوێند لەسەرخوراو ئەنجام دەدات لەباری جیابوونەوەدا، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ هاوسەرگیری، ئەم فێڵە لەرووی شەرعەوە پووچە و لەسەر ئوسوڵی ئیمامانی ولاتان دیسان پووچ و بێبنەمایە، هەر کەس ژیانی شافیعی و گەورەیی و پلە و پایەی لە ئیسلامدا بزانێت ئەوە دەزانێت بە کاری حیلە بەناوبانگ نییە، " ابو عبدالله الزبيري"–کە یەکێکە لە ئیمامە مەزنەکانی شافیعی– دەڵێت: ئەمە لە قسەی شافعیدا ناناسم، پێم نەگەیشتووە شافیعی قسەی لەو جۆرەی لەم بابەتەدا هەبێت، پێموایە ئەو کەسەی ئەم شتە لە شافیعییەوە باس دەکات حیلەکار(فێڵکەر) بێت.

**حەنبەلییەکان:**

خولع بەهۆی خراپی تێکەڵی نێوان دوو هاوسەرەکەوە دروستە، گەر حاڵەکە راوەستاو بوو مەزهەب لەگەڵ خستنییدایە بە کەراهەتەوە، لە ریوایەتێکدا حەرامکراوە

---

[1] واتە بە رجعی، بۆیە بۆ پیاوەکە هەیە بیگێڕێتەوە چونکە گێڕانەوە بە بریتی بەردەبێتەوە، بریتییەکە بەربووەتەوە بۆیە گێڕانەوە جێگیر دەبێت.

[2] المهذب ٢/٧١.

[3] اعلام الموقعين لابن القيم ٣/٢٨١. وما بعدها.

و ناکەوێت، گەر پیاوەکە مافی ژنەکەی نەدا بۆ ئەوەی ژنەکە خولعی لێ بکات و ژنەکە ئەو کارەی کرد و زینای نەکرد بوو، خولعەکە پووچە و بریتییەکەش رەدکراوەیە و هاوسەرگیری وەك خۆی وایە، مەگەر تەلاق بێت لەوبارەدا بە رجعی دەکەوێت، چونکە نەهی لە ئایەتەکەدا: (ولا تعضلوهن) الآیە دلوای تێکچوونی نەهیلێکراوەکە دەکات[1].

**جەعفەرییەکان:**

بێزاری ژنەکە یان هەردووکیان لەیەکتر مەرجێکی بنەڕەتییە بۆ دروستی خولع لەلایان بە کۆدەنگی و بە فەرموودەی هاتوو لەلایان، گەر خولعی لە ژنەکەی کرد و ئەخلاقیان تەبا و بێ گرفت بوو خولع دروست نییە، هەرکەس تەلاقی بەدوادا هێنا ئەوا لە کەوتنی بە رجعی دوو روو هەیە: یەکەمیان دەکەوێت و نابێتە خاوەن بریتی، دووەمیان ناکەوێت، زیانگەیاندن بە ژنەکە دروست نییە تا وای لێبکات فیدیە بدات، گەر هەستا بە فاحیشەیەك تەنگەتاوکردنی دروستە تا فیدیەی خۆی بدات، هەندێکیان دەڵێن لەو بارەشدا تەنگەتاوکردنی دروست نییە[2].

**زەیدییەکان:**

لە مەرجەکانی دروستی خولع لەلایان ئەوەیە ژنەکە لە کاتی خولعەکەدا ناشیزە بێت لە شتێك کە ژنەکە پابەند دەکات بۆ پیاوەکە لە کردنی کارێك یان نەکردنی، یەکسانە ژنەکە لەماڵی مێردەکەیدا بێت یان نە، نشوز بەهۆی خراپی مامەڵەی پیاوەکەوە بوونی نییە، ئەوەش کە بە بێ بێزاری و نشوز و ترس روودەدات دروست نییە، بەهۆی ئایەتی: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ... الآيَة﴾، هەندێکیان دەڵێن بە رازیبوونی هەردوو لایان خولع دروستە با لە ژنەکەشەوە نشوز بوونی نەبێت،

---

[1] المحرر ٢/٤٤، المغني ٨/١٧٤. منتهى الارادات ٢/٢٣٦ وما بعدها. الانصاف ٨/٣٨٣ وما بعدها.

[2] مستدرك الوسائل ٣/٢٤ وما بعدها. رياض المسائل كتاب الطلاق. المختصر النافع ص٢٢٧. الخلاف للطوسي ٢/٢١٣ وما بعدها الكافي ٦/١٣٩ وما بعدها.

گەر بە فاحیشەیەك هەستا و پیاوەكە مافەكەی پێ نەدا ئەوا لە خولعكردنیدا دوو روو هەیە، راستترینیان ئەوەیە دروست نییە.

**زاهیرییەكان:**

دەڵێن: خولع بریتییە لە فیدیەدان گەر ژنەكە لە مێردەكەی بێزار بوو و دەترسا نەتوانێت بە مافی پیاوەكەی هەستێت یان دەترسا پیاوەكەی رقی لێ پەیدا بكات و مافی پێ نەدات، لەو بارەدا دەتوانێ فیدیە بە مێردەكەی بدات تاكو تەڵاقی بدات گەر پیاوەكە رازی بوو، فیدیەدان بە یەكێك لە دوو رووە باسكراوەكە یان بە یەكێكیان دروستە، گەر بێ ئەوە روویدا پووچە و ئەوەی لە ژنەكە وەرگیراوە بۆی رەد دەكرێتەوە و ئەو هێشتا وەك جاران ژنییەتی و تەڵاقەكەی پووچ دەبێتەوە و تەنها رێگری دەكرێت لە ستەمی پیاوەكە دەرحەق بە ژنەكەی[1].

**ئیبازییەكان:**

لەلایان بە مەرج ناگیرێت بێزاربوون لە ژنەكەوە بێت، بەڵكو بۆ دروستی خولع نشوز لە یەكێكیانەوە بەسە، لە " شرح النیل[2]"دا هاتووە: (لە یەكێكیانەوە خولع دروست نییە مەگەر نشوز لەویترياندا بوونی هەبێت، خولع بۆ تەنگەتاوكردنی مێردەكە تەڵاقی پێ دەكەوێت و لەرووی دیانەتەوە بریتی حەڵاڵ نییە و پێویستە لەسەر پیاوەكە رەدی بكاتەوە[3].

**دەرئەنجام و پارسەنگدان:**

لەم واڵاكردنەوە و لەوانی ترەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام لەسەر حوكمی خولع جیاوازیان لە نێواندا هەیە بەسەر ئەم بارانەدا:

---

(1) راجع المحلی ١٠/٢٤٥ وما بعدها.

(2) شرح النیل ٣/٤٨٠.

(3) المرجع السابق، جوهر النظام ٢/٢٢٧.

١-خولـع تـەنها لای دەسـەڵاتدار دروسـتە یـان لای ئـەو کەسـەی نوێنەرایـەتی دەسەڵاتدار دەکات، چونکە دەسەڵاتدار بەرپرسە لە چاککردن، خولعیش تـەنها دوای دەستەوسـان بـوون لـە چـاککردن روودەدات، ئەمـە ئەوەیـە "الحسـن البصری، وابن سیرین، وسعید بن جبیر[1]" هەڵیانبژاردووە، و یاسـای تونسـی و جەزائیری وەك پێشتر باسکران کاریان پێکردووە، ئەم بۆچوونە رەد دەکرێتەوە بـەوەی لەگـەڵ گشـتاندنی دەقەکانـدا بەرهەڵسـتی دەکـات، گشـتی تـەنها بـە بەڵگەیەکی جێگیر تایبـەت دەکرێـت، هـەروەها لەبـەر ئـەوەی هەنـدێ گـرفتی خێزانی بە جۆرێـك دژوار دەبێـت بـەردەوامی ژیـانی هاوسـەری تیایـدا ئەسـتەم دەبێت.

٢-تەنها دوای جێگیربوونی فاحیشەی زینای سەلماو بە بینیننی مێردەکە دروستە، بەهۆی ئایەتی: ﴿وَلا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾[2]، ئەمە ئەوەیە "ابن سیرین وأبو قلابـة" بـۆی دەچـن، کاتێـك دەڵـێن: خولع بۆ مێرد دروست نییە تا لەگەڵ ژنەکەی پیاوێـك دەبینێـت، چـونکە خـودا دەفەرموێت: ﴿إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ ئەوەش بریتییە لە زینـا، بەرپـەرچ دەدرێتەوە بەوەی تایبەت کردنی فاحیشە بە زینا بەڵگەی لەسەر نییە، هەروەها ئەو رایە بە قـەزلوەتی پێغەمبـەردا(ﷺ) دەکێشـێت بـە خولـع کردنـی ژنەکـەی سابیتی کوڕی قەیس لەوەی بەو تۆمەتە تۆمەتبار نـەبوو، بـەڵکو خولعەکـە بـە داوای ژنەکە بوو.

٣-خولع پووچە مەگەر لەباری راستبوونەوەی بێزاری و نشوز لە یەکێکیانەوە یان لە هەردووکیانەوە، وەك کارکردن بە تێگەیشتنی پێچەوانەی مەرجی هـاتوو لـە

---

[1] المحلی لابن حزم الظاهري ١٠/٢٣٧.

[2] (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهاً وَلا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُوا شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً) (النساء:١٩). العيني المرجع السابق ٢٠/٢٦٠.

ئایەتی: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ﴾، ئەمەش بریتییە لە مەزهەبی " جەعفەرییەکان ، و زەیدیەکان ، و ظاهریەکان ".

گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکرێت بەوەی مەرجی هاتوو لەو دەقە ئامـاژەبۆکراوەدا وەك گوزەرکردنی زاڵ گوزەری کردووە، لە مەرجەکانی کارکردن بە تێگەیشتنی پێچەوانە ئەوەیە ئەو کۆتوبەندە هاتووە لە دەقەکەدا گوزەر بکات بە گوزەرکردنی زاڵ، خولعیش بەزۆری لەباری بێزاری و ناکۆکیدایە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە هەموو خولعێك هەمان رەوشی هەیە و لەو شوێنەوە سەرهەڵدەدات.

٤-خولعەکە دروست دەبێت و تەڵاقەکە دەکەوێت و بریتییەکە پووچەڵ دەکرێتەوە گەر نشوزەکە لە پیاوەکەوە بوو، ئەمە ئەوەیە زۆرێك لە فەقیهان کاریان پێکردووە وەك " حەنەفییەکان ، و مالیکییەکان ، و شافیعیەکان ، و ئیباضیەکان..." لەسەر ئەو بنچینەی نەهی لە ئایەتی: (ولا تعضلوهن) تەنها تێکچوونی بریتییەکە دلوا دەکات، گفتوگۆی لەگەڵ دەکرێت بەوەی رایەکە پێچەوانەیە لەگەڵ دلواکاری خولعدا، چونکە تەڵاقی مێردەکە بەرانبەر پابەندبوونی ژنەکەیە بە بریتییەك، سەرباری ئەوەی وتنی پووچەڵی بریتی و دروستی تەڵاق حوکمدان و پارسەنگدانێکە بەبێ بوونی پارسەنگکەر.

**سەرچاوەی جیاوازی:**

لەم شیکارکردنە ئامـاژەبۆکراوانەوە رۆشن دەبێتەوە سەرچاوەی جیاوازیان بریتییە لە جیاوازی لە لێکدانەوەی دەقەکانی ئەحکامی خولعدا لەرووی کارکردن بە گشتاندن یان تایبەتکردن، هەروەها لەرووی تەبایی دروستکردن لە نێوانیان یان دەستبردن بۆ تێگەیشتنی پێچەوانە یان پەنابردن بۆ سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ).

**پارسەنگدان:**

بەڵگەنەویستە پایەی شەشەم لەم هەڵسوکەوتەدا(خولع) بریتییە لە رازیبوون و بەیەکگەیشتنی ویستی دوو هاوسەرەکە لە کۆتاهێنان بە پەیوەندی هاوسەریی

بەرانبەر پابەندبوونی ژنەکە بە بریتییەك، گەر نەنگییەك لە نەنگییەکانی ویست وەك تەنگەتاوکردن و فشار و فریودان لەگەڵ ستەم لەگەڵ ڕێکەوتنەکە هاومل بوو ئەوا بە پووچەڵ دادەنرێت و کاروباری وەك کاروباری هەموو بریتییەکانی ترە.

بەڵام گەر پابەندبوونی ژنەکە بە پێدانی بریتی بەرانبەر گێڕانەوەی ئازادی خۆی بێت وەك جیاوازی تەمەن یان ئاستی ڕۆشنبیری یان کۆمەڵایەتی یان شتانی تر کە مێردەکە هیچ گوناهێکی تێیدا نییە، لەو بارەدا قازی یان مفتی بەڵگەیەك نابینێتەوە لەسەر پووچەڵی خولع و سەرهەڵنەدانی ئاسارەکەی، بەڵام گەر سەرچاوەی ڕازیبوونی ژنەکە بە پابەندبوونی بەرانبەر تەڵاق بریتی بوو لە ستەمی مێردەکە و خۆگرتنەوەی لە پێدانی مافەکانی بۆ ئەوەی فشار بخاتە سەری و ناچاری بکات خولع قبووڵ بکات ئەوا پووچەڵبوونەوەی جێگەی دڵڕاوکێ و گفتوگۆ نییە، بۆیە تەڵاقەکە ناکەوێت و بریتییەکە ڕەد دەکرێتەوە و هاوسەری دەمێنێتەوە وەك جاران، وەك چۆن ئەوە ڕای " حەنبەلییەکان ، و ظاهرییەکان ، وکۆمەڵێك لە جەعفەرییەکان ، و جەماوەری زەیدیەکان " ئەم ئاراستەیە ئاشکرای دەقەکانی ئەحکامی خولع پاڵپشتی دەکات وەك پێشتر باسکرا.

بەڵام وتنی کەوتنی تەڵاق و پووچەڵی پابەندبوونی ژنەکە بە پێدانی بریتی سەرباری بەرهەڵستییەکەی لەگەڵ ئاشکرای دەقەکاندا بە داواکاری خولعیشدا دەکێشێت.

# باسی دووەم:
# رەگەزەکانی خولع
# دارشتن(گوزارە)، خولعکەر، خۆخولعکەر، بریتی

پێمباش نییە را و بۆچوونەکان بخەمە روو لەوەی پێویستە لە خولعکەردا فەراهەم بێت تا خولعەکەی دروست بێت دوای ئەوەی ئەو کۆمەڵە رایەمان هێنا و لە جێگەی خۆی گفتوگۆمان لەسەر کرد[1]، ئەوەش لەبەر ئەو رێسا گشتییەی فەقیهان پێیگەیشتوون: هەرکەس تەلاقەکەی دروست بێت خولعەکەی دروستە، چونکە خولع تەلاقە بە بریتییەك، گەر بەبێ بریتی رێگەپێدراو بێت ئەوا بە بریتی لە دەروازەی لەپێشترە، بۆ ئەو مەبەستە تەنها رەگەزەکانی دەخەینە روو بە شێوازێك بوارەکانی ئازادی ویست یان کۆتوبەندکردنی لە سێ لقدا دەربکەوێت:

---

[1] راجع ص٥ وما بعدها.

## لقی یەکەم:
## دارشتنی گوزارەی خولع

فـەقیهان لەسـەر دارشـتنی گوزارەیـەکی دیـاریکراو بـۆ خولـع رێکنەکـەوتوون، سەرچاوەی جیاوازییەکـەیان کاریگەربوونـە بـە رووالـەت و ئاشـکرای هەنـدێ دەق و عورف و نەریتی ناوخۆییەوە، هەروەها جیاوازیان لە چۆناندنی خولع ئایا تەلاقـە یـان هەڵوەشانەوە؟

**حەنەفییەکان[1] دەڵێن:** راشکاوی ئەرێکردن لە خولعدا بریتییە لە "تۆم خولـع کرد" یان "لێت بەری بووم" یان "لێت جیابوومەوە" یان"تەلاقمدای" یـان "تـەلاقی خۆت بدە لەسەر هەزار دینار–بۆ نموونە–"، قبووڵ کردنیش لە دانیشتنێکدا دەبێـت گەر ئەرێکردنەکە پەیوەستکراو نەبێت، وەك "هەر کات لە مارەییەکەت ئازادت کردم تۆ تەلاقت کەوتبێت".

" مالیکیەکان[2]، و ظاهریەکان[3]، و ئیباضیەکان[4]،و حەنبەلیەکان[5]" دەڵـێن: راشکاوی بریتییە لە داتاشراوەکانی فیدیە و سوڵح و بەریبوون و خولع، قبووڵکردنیش لـە دانیشـتنی قبووڵکردنـدا یـان مەجلیسـی زانسـت لـە تێپەڕاندنـدا، بـەڵام لـە پەیوەستکردن لەسەر شتێك دەستی بەسەردا بگیرێت یان هەسـتان بـە کارێـك ئـەوا دەستبەسەرداگرتن و پێهەستانی تایبەت نییە بە دانیشتنەکە.

---

[1] شرح فتح القدير ٣/٢١٥. المبسوط ٦/١٧٢.

[2] المدونة الكبرى ٥/٢٨.

[3] المحلى ١٠/٢٣٠، وما بعدها.

[4] شرح النيل ٣/٤٨٠.

[5] الانصاف ٨/٣٩٢، منتهى الارادات ٢/٢٣٨.

مالیکییەکان وا دەبینن خولع ڕێگەپێدرلو بێت بە پێدان گەر عورف بەڵگەیەکی راستکردەوە لەسەر مەبەستی دوو هاوسەرەکە لەوەدا، "الخرشی[1]" دەڵێت: (ئەوەندە بەسە بۆ پێدان وەك ئەوەی ژنەکە شتێك بە پیاوەکە بدات بە جۆرێك لێی تێبگەی ئەو لە چاوەڕوانی هەڵوەشانەوەی پەیوەندی هاوسەریدایە و پیاوەکەش کارێك ئەنجام بدات بەڵگە بێت لەسەر قبوولّ کردنی ئەو کارە، وەك ئەوەی نەریتیان وابێت کاتێك بازنەی لەدەست داکەند و دای بە مێردەکەی، یان لە ماڵەکە چووە دەرەوە و مێردەکە ڕێگری لیّ نەکرد: ئەوە بریتی بێت لە تەڵاق)

" شافیعیەکان[2]، و زەیدیەکان[3]" دارشتنی گوزارەی خولع بریتییە لە دارشتنی گوزارەی تەڵاق بە راشکاوی یان بە ناڕاشکاوی، بۆ شافیعییەکان لەمەڕ خولع و داتاشراوەکانی سیّ قسە هەیە:

ناڕاشکاوی جیابوونەوەی پیّ پەیدا نابێت مەگەر نیەتی لەگەڵ بێت ئەوەش قسەی شافعییە لە "الأم"دا، هەڵیدەوەشێنێتەوە ئەوەش قسەی کۆنییەتی، راشکاویش تەڵاقی پیّ دەکەوێت بەبیّ نیەت، ئەوەش قسەی شافیعییە لە "الإملاء"دا.

قبوولکردن لە دانیشتنەکەدا دەبێت لە "تەڵاقی تێپەڕاندن" و هەروەها لە پەیوەستکردن بە "إن-گەر" چونکە وشەی "إن" گشتییە و ئێستا و داهاتوو دەگرێتەوە، گەر بریتی لەگەڵ بوو هەڵدەدرێتە سەر ئێستا پێوانە بۆ سەر بریتییەکان، تایبەتکردنی گشتاندن دروستە بە پێوانە، هەروەها لە شێوەی "متی-کەی" قبوولکردنی دروستە بەهێواشی(بە لەسەرخۆیی)، هەروەها لە شێوەی "إذا-ئەگەر" جیاوازی هەبوو لە لکاندنی بە "إن" یان بە "متی"ەوە، "الشیرازي" لە "المهذّب[4]"دا

[1] شرح الخرشي ٢٣/٤.

[2] المهذب ٧٢/٢ نهاية المحتاج ٣٩٧/٦.

[3] التاج المنهب ١٨٠/٢ وما بعدها. البحر الزخار ١٧٩/٣.

[4] المرجع السابق.

دووەمی پارسەنگدلوە(مەبەستی "إذا"یە)، چونکە ئـەوەی "متـی" و هاوشـێوەکانی دەیگەیەنێت ئەویش دەیگەیەنێت.

"جەعفەرییەکان[1]" راشکاوی قبووڵ کردن لە خولعدا بریتییە لە قسەی مێردەکە بە ژنەکەی "خولعم کردی لەسەر ئەو شتە"، گەر هۆی خولعەکە بێزاری ژنەکـە بـوو، یان "بەریم کردی یاخود فیدیـەم لـێ وەرگرتـی لەسـەر ئەوەنـدە"، گـەر بێـزاری لـە هەردووکیانەوە بوو، بەلاَم لەگەڵ ئەوەش دەڵێن پێویسـتە گـوزارەی تـەلاق بـەدوای گوزارەی خولعدا بێت، ئەگینا هیچی لەسەر پەیدا نابێت، بـەوەی بڵێـت: (تـۆم خولـع کرد لەسەر ئەوە، بۆیە تۆ تەلاقدراوی) یان (تـۆم بـەری کـرد لەسـەر ئـەوە بۆیـە تـۆ تەلاقدراوی) ئەم قسە تایبەت بە "بەریم کردی" جێگەی قبووڵی هەمووانە.

**ئەنجامگیری و پارسەنگدان:**

لەم والأکردنەوە دەگەینـە ئـەو ئەنجامـەی قوتابخانـەی جەعفـەری ئاراسـتەیەکی پێچەوانەی بەو ئاراستەیە وەرگرتووە قوتابخانەی مالیکی گرتوویانەتە بـەر، هـەردوو ئاراستەکە جێگەی رەخنەن، لایـەنی مـالیکی لـە فرلوانکردنـدا گەیشـتۆتە رادەیـەك بەهەندوەرگرتنی گوزارەی تێدا سڕلوەتەوە لە کارێکی ترسـناکدا کـە پەیوەسـتە بـە قەوارەی خێزانەوە، و تەنها بە پێدان کارەکەی بڕیوەتەوە، بیرکردنەوەی جەعفەریش پابەند نەبووە بە گوزارەی ئاسایی خولعەوە بەتـەنها بـەڵکو کۆتوبەنـدی زیـاتری بـۆ دروست کردووە لەو سۆنگەیەوە گوزارەی تەلاق وەك بەشێکی تەولوکەر بۆ گوزارەی خولع، بۆیە فەرزی کردووە بەسەر ویستی مێردە خولعکەرەکـەدا لـە ئەرێکردنەکـەدا بڵێت: (تۆم خولع کرد لەسەر ئەوە بۆیە تۆ تەلاقدراوی)

فەقیهانی تر هەرچەند رێگەیەکی ناوەندیان گرتۆتە بەر، بەلاَم لەگەڵ ئـەوەش لـە کۆتوبەندکردنی ویستی پیاوەکە دەرنەچوون بە هەنـدێ گـوزارەی ئاسـایی، ئـەوەی

---

[1] شرائع السلام ٢/٦٩. مستدرك الوسائل ٣/٢٤. رياض المسائل المجلد الثاني كتاب الطلاق. الخلاف للطوسي ٢/٢١٣.

لەلای من پارسەنگدراوە: شەریعەتی ئیسلام ئەو گوزارە ڕوواڵەتیانەی نەکردووە بە زاراوەگەلێکی لەسەر ڕاوەستاو تا داوالێکراو لە هەمووکات و شوێنێکدا پابەند بکات پێیانەوە، بەڵکو کارەکەی بەجێهێڵاوە بۆ عورفی باوی ئەو دەوروبەرەی دوو هاوسەرەکە تیایدا دەژین.

## لقی دووەم:
## خۆخولعکەر

گەر ژنەکە باڵغ و ئاقڵ و خاوەن هەڵبژاردە و تەندروست بوو، بەهۆی گێلییەوە حیجری لەسەر دانەنرابوو، ناکۆکی نییە لەسەر دروستی خولعی و ئازادی ویستی لە پابەندبوون بە پێدانی بریتی بە مێردەکەی بەرانبەر کۆتاهێنانی پەیوەندی ژن و مێردی، هەر بەو جۆرە ناکۆکی نییە لەسەر پووچی خولعی ئافرەتی منداڵ و جیانەکەرەوە(غير متميـز) و شێت و ئەوانەی لە حوکمی شێتدان گەر خودی خۆی(ژنەکە) دەستی بۆ خولعەکە برد.

جیاوازی لە حوکمی خولعی نەخۆش و گێل و منداڵی جیانەکەرەوە و خولعی سەرپەرشتیاردایە.

**ئافرەتی نەخۆش:**

" حەنەفیەکان[1]": گەر ژنەکە نەخۆش بوو، و پیاوەکە لەسەر بڕێك ماڵ خولعی کرد-گەر لە عیدەدا بە نەخۆشییەکەی مرد- ئەوا بۆ مێردەکە کەمتر لەو میراتە لە ژنەکەوە دەیگرێت و بریتی خولعەکە و سێیەکی ماڵ وەردەگرێت، "زفر" لەوەدا پێچەوانەیە بۆیە دەڵێت: بریتییەکە لە هەموو ماڵەکە دەردەکرێت، گەر پیاوەکە لە دوای ژنەکە مرد ئەوا ژنەکە کەمتری لە "بریتی و سێیەك" بۆ هەیە، گەر ژنەکە لە نەخۆشییەکە چاکبوویەوە ئەوا پیاوەکە ئەو بریتییەی بۆ هەیە لەسەری ڕێکەوتبوون.

---

[1] راجع البحر الرائق ٤/٨٠. شرح فتح القدير ٣/٢١٨.

" مالیکیەکان [1]" دەڵێن: گەر ئافرەتی نەخۆش بە هەموو ماڵەکەی خولعی کرد و پیاوەکەی لەشساغ بوو، مالیك دەڵێت: دروست نییە و تەڵاقەکەی دەکەوێت، و مێردەکە میراتی لێ نابات، جمهوور لەسەر ئەمەیە، "ابن القاسم" دەڵێت: گەر بریتییەکە زیاتر بوو لە میراتەکەی کە لە ژنەکەی دەیگرێت ئەوا بڕی میراتەکەی بۆ هەیە، قسەکەی مالیك: (ئەوەی ڕێگەی پێ نەدلوە) هەندێ لە فەقیهانی وەك "إبن المواز وإبن نافع" دەڵێن: واتە هەمووی پووچ دەبێتەوە، هەندێکی تر لەوانە "عیاض" دەڵێت: واتە بڕی زیادە لەسەر میراتەکەی دروست نییە، بینا لەسەر ئەوە ناکۆکی "ابن القاسم" لەگەڵ مالیك راستەقینەیە لەسەر لێکدانەوەی یەکەم و گوزارەییە لەسەر لێکدانەوەی دووەم، بەلام لەگەڵ ئەوەش لە قسەکەی مالیکەوە"بە هەموو ماڵەکەی(ماڵی ژنەکە)" ئەوە حاڵی دەبین بە هەندێ لە ماڵەکەی ڕێگەپێدراوە)

**شافیعییەکان دەڵێن:** خولعی نەخۆش دروستە بە ئەندازەی مارەیی هاوشێوە، گەر زیاتر بوو زیادەکە لە سێیەکە، لە "تحفە المحتاج[2]"دا هاتووە: (خۆخولعکردنی نەخۆش بە نەخۆشی مردن دروستە، چونکە بۆی هەیە ماڵەکەی لە ئارەزووەکانی خۆیدا خەرج بکات بە پێچەوانەی گێلەوە، لە سێیەکەکە تەنها زیادە لە مارەیی هاوشێوە حساب دەکرێت، چونکە زیادە لەسەرو ئەوەوە بەخشینە)

**حەنبەلییەکان دەڵێن:** گەر نەخۆشەکە خۆی خولع کرد بۆ مێردەکە کەمتر لە بریتی خولعەکە و میراتەکەی لە ژنەکەی بۆ هەیە، لە "الانصاف[3]"دا هاتووە: (گەر ژنەکە خۆی لە مێردەکەی خولع کرد لە نەخۆشی مردنیدا ئەوا کەمتری بۆ هەیە لە ناونرلو یان لە میراتگرتن لە ژنەکەی)، هاوشێوەی ئەمە لە "الانصاف[4]"دا هاتووە،

---

[1] راجع شرح الخرشي ٢٠/٤.

[2] ٨٨/٧، المهذب ٧٤/٢.

[3] الانصاف ٤١٩/٨. وفيه: (ئەم مەزهەبە لە "المغني والشرح، وابن منجا، والخرقي، والزركشي، والوجيز و کەسانیتردا پێداگری لەسەرکراوە).

[4] ٨٨/٧ .

بەوەش ڕای حەنبەلییەکان لەگەڵ قسەکەی "ابن القاسم" لە مالیکییەکان پێکئەکیتەوە.

## زەیدییەکان دەڵێن:

بریتی لە سێیەك جیادەکرێتەوە، گەر بریتییەکە زیاتر بوو لە سێیەك ئەوا دروست نییە زیادەکە بۆ مێردەکە خەرج بکرێت مەگەر بە مۆڵەتی میراتگران لە کاتی خولعەکەدا نەك لە کاتی مردندا، لە "التاج المذهب"دا هاتووە: (گەر پیاوەکە ژنە نەخۆشەکەی لەسەر بریتییەك لە ئەوەوە(لە ژنەکەوە) تەڵاقدا، یەکسانە بریتییەکە بڕی سێیەك بێت یان زیاتر لە سێیەك میرات دروست نییە، ئەوا ئەو بریتییە جێبەجێ ناکرێت لەباری نەخۆشی ترسناك گەر مردنی لێوە پەیدا دەبوو مەگەر تەنها لە سێیەك، بوونی سێیەك و بوونی میراتگر و نەبوونی لە گرێبەستەکەدا لە کاتی گرێدانیدا بەهەند وەرناگیرێن)[1]، واتە کاتی خولعەکە.

## جەعفەرییەکان:

فەقیهانی جەعفەری جیاوازیان نەکردووە لە نێوان خولعی ژنی نەخۆش و خولعی ژنی ساغ، چونکە قورئان درێژەی پێنەداوە، "الطوسي" لە "الخلاف"دا[2] دەڵێت: (گەر ژنەکە لە نەخۆشییەکەیدا خۆی لە پیاوەکەی خولع کرد بە زیاتر لە مارەیی هاوشێوە ئەوا هەمووی لە بڕی ماڵەکەیەتی، بە ئایەتی: ﴿فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾، ئایەتەکە جیاوازی نەکردووە لە نێوان باری لەشساغی و نەخۆشی، بۆیە پێویستە هەڵبدرێتە سەر گشتاندنی مەگەر بەڵگەیەك ڕاست ببێتەوە).

**زاهیرییەکان:** جیاوازیان نەکردووە لە نێوان ژنی لەشساغ و ژنی نەخۆشدا هەروەك جەعفەرییەکان بەهۆی نەبوونی ئەو جیاکارییەوە لە قورئاندا[3].

---

[1] التاج المذهب ٢/١٩١.

[2] الخلاف للطوسي ٢/٢٢٢.

[3] المحلى١٠/٢٣٥ وما بعدها.

گێل و منداڵی بچووکی جیاکەرەوە:

" حەنەفیەکان[1]" دەڵێن: گەر منداڵی بچووك(مێ) دەستی بۆ خولعکردنی خۆی برد، گەر قبوولّی کرد: لەوە تێبگات هاوسەرگیری کارێکی ئەرێنیە و سوود و قازانجی بەردەوامی ژیانی هاوسەرییە و خولع کارێکی نەرێنیە و کۆتایی دەهێنێت بە پەیوەندی ژن و مێردی، خولعەکەی دروستە و و تەلاقەکە دەکەوێت بە کەوتنی رجعی یان بائین بەپێی رەوشەکەی، بەلام ماڵی ناچێتە ئەستۆ، چونکە لێوەشاوەیی بەخشینی نییە، گەر قبوولّی نەکرد یان لێوەشاوەیی قبوولّی نەبوو و خولعەکە پووچەڵ دەبێتەوە.

" مالیکیەکان[2]" دەڵێن: پێویستە پابەندبوو بە پێدانی بریتی لێوەشاوەیی بەخشینی هەبێت و حیجری لەسەر دانەنرابێت بەهۆی منداڵییەوە یان شێتی یان گێلی، لە منداڵی(مێ)ی جیاکەرەوە و گێل(مێ)دا تەلاقەکە بە بائین دەکەوێت و بریتییەکە هەڵدەوەشێتەوە، گەر گوزارەکە پەیوەستکردنی لەسەر شایستەبوون بە ماڵ لەخۆنەگرتبوو، ئەگەر نە، دیسان تەلاقەکە هەڵدەوەشێتەوە بەهۆی نەبوونی لێوەشاوەیی پابەندبوونەوە.

" **شافیعیەکان**[3]" دەڵێن: مەرجی قبوولکەری خولع ئەوەیە ئازادی لە هەڵسوکەوتدا هەبێت، گەر ژنی حیجر لەسەردانراو -بەهۆی گێلییەوە- خولعی خۆی کرد و پیاوەکە چووبووە لای تەلاقەکە بە رجعی دەکەوێت، و بریتییەکە هەڵدەوەشێتەوە، با سەرپەرشتیارەکەش لەو کارەدا مۆڵەتی پێدابێت بەهۆی نەبوونی لێوەشاوەیی هەڵسوکەوتەوە، بۆ سەرپەرشتیارەکە نییە ماڵەکەی خەرج بکات بۆ شتانێك جگە لە بریتی دارایی، ئەمە گەر ژنەکە و ماڵەکەی لەلایەن مێردەکەیەوە هەڕەشەی لەسەر نەبوو، گەر هەڕەشەی لەسەر بوو، و پێدانی ئەوەش تەنها بە خولع

---

[1] راجع فتح شرح القدير ٣/٢١٨ وما بعدها. البحر الرائق ٤/٨٠ المبسوط ٦/١٧٨.

[2] راجع شرح الخرشي ٤/١٢ وما بعدها. الشرح الكبير للدردير ٢/٣٨٤.

[3] راجع المهذب ٢/٧١. نهاية المحتاج ٨/٣٨٨.

بوو راستترین قسە لەلایان دروستییەتی وەك لادانی ستەم لەسەر ژنەكە، دروست نییە پیاو كچی بچووك خولع بكات، گەر بە شتێك لە ماڵەكەی(ماڵی كچەكە) خولعی كرد تەڵاقەكە دەكەوێت و پیاوەكە شایستەی بریتی پێدان نابێت با چوویێتە لای ژنەكەش، بۆیە بۆی هەیە بیگێڕێتەوە.

**حەنبەلییەكان**[1]: گەر حیجر لەسەردانراو بەهۆی گێلی یان منداڵی یان شێتی خولعی خۆی كرد دروست نییە با سەرپەرشتیارەكەش مۆڵەتی پێدابێت.

**جەعفەرییەكان:** لە "تحرير الأحكام"دا دەڵێن: (خولعی منداڵ(مێ) تێكچووە، هەر بەو جۆرە خولعی گێل(مێ)، مەگەر رلوەستاو بە كارەكانی بەو كارە مۆڵەتی دابێت، چونكە ئەوە دروستە گەر لە بەرژوەندی ئەو بێت)[2].

"**زەیدییەكان**[3]" **دەڵێن:** ژنی حیجركرلو بە قەرز خۆخولعكردنی دروستە و بریتییەكە لە ئەستۆیدا دەمێنێت بۆ مۆڵەتی دادوەر یان هەڵگرتنی حیجرەكە، بەڵام حیجركراو بە گێلێتی هەڵسوكەوتە داراییەكانی پووچە، بەڵام بۆ منداڵی جیاكەرەوە(مێ) گەر بریتییەكە لە ئەوەوە بوو نە تەڵاق هەیە و نە خولع.

**زاهیرییەكان:** لەلایان بەمەرجگیراوە خولع لە ژنێكەوە بێت لێوەشاوەیی تەولوی هەبێت، بۆیە لە منداڵەوە(مێ) با جیاكەرەوەش بێت یان بریتییەكە لە كەسی ترەوە بێت جگە لە منداڵەكە دروست نییە، ژنی گێل–بە مانای زانراو لای فەقیهانی تر– بە لێوەشاوە تەولو دادەنرێت لای زاهیرییەكان وەك پێشتر باسكرا[4].

---

[1] المغني ٨٣/٧ وفيه: (حیجر لەسەردانراو بەهۆی گێلێتییەوە یان بەهۆی منداڵی یان شێتێتی بەخشینی بریتی لێیەوە لە خولعدا دروست نییە چونكە هەڵسوكەوتە لە ماڵدا و ئەویش لێوەشاوەیی ئەوەی نییە یەكسانە سەرپەرشتیار مۆڵەتی دابێت یان مۆڵەتی نەدابێت).

[2] راجع تحرير الاحكام ٥٨/٢.

[3] رلجع التاج المنهب ١٧٦/٢ وما بعدها. البحر الزخار ١٨١/٣ وما بعدها.

[4] راجع ص٥٧ بشان السفيه لدى الظاهرية ولمحلى ٢٥٩/٨.

لەم والاکردنەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی رای فەقیهان خەریکە هاورا دەبێت لەسەر ئەوەی خۆخولعکەر پێویستە لێوەشاوەیی بەخشینی هەبێت، چونکە خولع تایبەت بە ژنەکە گرێبەستی بریتیدانە و شتێك لە تێکەڵی بەخشینی تێدایە، گەر منداڵی جیاکەرەوە(مێ) یان گێل(مێ) خودی خۆی دەستی بۆ خولعکردن برد پابەندبوونەکانی بە بریتی لەسەر سەرهەڵنادات با سەرپەرشتیارەکەش مۆڵەتی پێدابێت.

شافیعییەکان و هەندێ لە جەعفەرییەکان پێیانوایە: خۆخولعکردن بۆ ژنی گێلی حیجر لەسەردانراو هەیە گەر خۆی دەستی بۆ خولعکردنەکە برد بە مۆڵەتی سەرپەرشتیارەکەی یان رلوەستاو بە کارەکەی، و لەو کارەدا بەرژەوەندییەکی ئەوی تێدا بوو، ئەوا خولع و پابەندبوونەکە دروستن.

وای دەبینم ئەم رایەی شافیعییەکان و هەندێ لە جەعفەرییەکان تێگەیشتووانەترە چونکە خولع بەرژەوەندی ژنەکەی تێدایە کاتێك هەرەشە لەسەر خۆی و ماڵەکەی هەبێت لەلایەن پیاوەکەیەوە، پاڵنان و سڕینەوەی ئەوەش تەنها لە رێگەی خولعەوەیە، چونکە ئەو بەرژەوەندییە تای بریتیدانەکە قورستر دەکات بەسەر تای بەخشیندا، بۆیە دەبێتە کارێکی سوڕخواردوو لە نێوان قازانج و زیاندا و بە مۆڵەتی سەرپەرشتیار یان رلوەستاوبەکار دروست دەبێت، بەلام گەر بەرژەوەندییەك بوونی نەبوو یان مۆڵەتی پێ نەدرا ئەوا پووچەڵبوونەوەی پابەندبوون جێگەی رێکەوتنە لەوەدا یەکسانە منداڵی جیاکەرەوە(مێ) بێت یان گێلێك(مێ) حیجری لەسەر بێت.

مالیکییەکان دەڵێن: تەلاقەکە بە بائین دەکەوێت گەر گوزارەی پەیوەستکردنەکە شایستەبوونی دارایی لەخۆ نەگرتبوو.

شافیعییەکان دەڵێن: تەلاقەکە بە رجعی دەکەوێت گەر چووبێتە لای ئەگینا بائینە، چونکە بۆی هەیە بەبێ بەرانبەر تەلاقی بدات.

پێموایە ئەم بەکارهێنانە لێیانەوە ورد نییە، بەڵکو لەسەر قازی یان مفتی پێویستە پرسیار بکات لەوەی خولعکەر لەو هەڵسوکەوتەدا مەبەستی بووە پاشان حوکم

دەریکات یان فتوا بدات لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی پێیگەیشتووە، گەر خولعکەر زانا بوو بەوەی خۆخولعکەرەکە(ژنەکە) شایستەیی پابەندبوونی نییە ئەوا ئەوە دەبێتە تیابەری مافەکەی لە بریتی وەرگرتن، وەك ئەوەی بێ بەرانبەر تەڵاقی دابێت بۆیە تەڵاقەکەی دەکەوێت، بەڵام گەر نەزان بوو بەو راستییە و تەنها وەك ویستێك بۆ بەدەستهێنانی بریتی خولعی کرد بوو، بە باوەڕی من ئەو خولعە رووالەتییە و کارناکاتە سەر پەیوەندی ژن و مێردییان، بەڵکو هاوسەری لەباری خۆیدا ماوەتەوە، ئەوەی مالیکییەکان بۆی دەچن پاڵپشتی ئەمە دەکات لەوەی تەڵاق بە بائین دەکەوێت و بریتی هەڵدەوەشێتەوە گەر گوزارەی پەیوەستکردنەکە شایستەیی دارایی لەخۆنەگرتبوو، ئەگەر نە، دیسان تەڵاقەکە هەڵدەوەشێتەوە لەبەر نەبوونی لێوەشاوەیی پابەندبوون.

## خولع لە سەرپەرشتیارەوە:

گەر ژنەکە لێوەشاوەیی تەواوی نەبوو ئایا دەسەڵات بۆ سەرپەرشتیارەکەی هەیە لە مێردەکەی خولعی بکات؟

" حەنەفیەکان[1]" دەڵێن: خولع لە سەرپەرشتیارەوە دروستە گەر بریتییەکەی دەستەبەر کرد، چونکە مێردەکە بە خستنی تەڵاق و بەمەرجگرتنی قبووڵ تەنهادەکەوێتەوە تەنها بەهۆی پابەندبوون بە ماڵەوە، ئەوەش لە سەرپەرشتیارەکەوە دابینکراوە، گەر سەرپەرشتیار بریتییەکەی دابین نەکرد ئەوا پووچ دەبێتەوە، تەڵاقیش دەکەوێت گەر بڵێین پەیوەستکراوە بە قبووڵەوە، ئەگەر نە، ناکەوێت گەر وتمان بەرانبەر شایستەبوونی بریتییە.

" مالیکیەکان[2]" دەڵێن: خولعی باوك لە کچە ناچارەکەیەوە بە ماڵی کچەکەی دروستە، با بە هەموو مارەییەکەشی بێت، هەروەها بۆ گێلیش بە مۆڵەتی ژنەکە

---

[1] راجع البحر الرائق ٤/٨٠. المبسوط ١٧٩/٦.

[2] شرح الخرشي ١٢/٤ وما بعدها. الدردير ٣٤٨/٢.

بەرەهایی لە ماڵی باوکەکە یان لـە مـاڵی کچـەکەی، هـەر بـەو جـۆرە بـەبێ مۆڵـەتی کچەکەی گەر لە ماڵی باوکەکە بوو، ئەگینا دوو قسەی لەسەرە، یەکێکیان دەکەوێت و ئەویتریان ناکەوێت.

" شافیعیەکان[1]" دەڵـێن: بـۆ هـەموو کەسـێك ئـازادی ویـست بـوونی هەیـە بـۆ خۆخولعکردن لە هەر هاوسەرێك یەکسانە ژنەکە بچووك بێت یان گەورە یان گێل، گەر پابەندبوو بە پێدانی بریتی لە ماڵەکەی، گەر ژنەکە بێزار بوو بینا لەسەر ئەوەی(پیاو بە تەڵاق سـەریەخۆکراوە)، (کەسـی خۆخولعکـەر سـەربەخۆیە بـەو پابەندبوونـەوە) دروست نییە سەرپەرشتیارەکە بە مـاڵی ژنەکـە خـولعی بکـات، گـەر بـاوك بـە مـاڵی کچەکەی خولعی کرد تەڵاقەکە بە رجعی لەدوای چوونە لا دەکەوێت و بە بائین پێش چوونە لا دەکەوێت بەبێ بەرانبەر.

" حەنبەلییەکان[2]" دەڵێن: بۆ باوکی کچی ناکام نییە لە ماڵی کچـەکەی خـولعی بۆ بکات، گەر وتی: کچەکەم تەڵاق بدە و تـۆ ئـازادی لـە مارەییەکـەی، مێردەکـەش ئەوەی کرد تەڵاقەکە بە رجعی دەکەوێت، ئازاد نابێت و ناگەڕێتەوە بۆ سەر باوکەکە، چونکە خاوەنی هەڵسوکەوت نییە لە ماڵی کچەکەیدا مەگەر بەوەی بەشی تێدا بێـت، ئەمـەش بەشـی تێـدا نییـە، بـەڵکو بەردانـەوەی تێدایـە، گـەر بریتییەکـە لـە سەرپەرشتیارەوە بوو لەسەر رای مەزهەب دروستە.

" زەیدیەکان[3]" دەڵێن: خولعی ناکام لە سەرپەرشـتیارەکەیەوە دروسـت نییـە، مەگەر بەرەوەندییەکی بۆ ژنەکە تێدا بێت، بریتیش دروست نییە لە هیچ کەسـێکەوە جگـە لـە ژنەکـە، بـەهۆی بەهەنـد وەرنـەگرتنی نشـوزی ژنەکـە بـەر لـە داوالێکردنی(التکلیف).

---

(1) راجع المهنب ٧١/١ . نهاية المحتاج ٣٨٨/٨.
(2) الانصاف ٣٨٨/٨ وما بعدها. المحرر ٤٤/٢. المغني ٨٣/٧.
(3) التاج المنهب ١٧٧/٢. البحر الزخار ١٨١/٣ وما بعدها.

" زەیدیەکان " دەڵێن: بۆ باوك هەیە خولعی کچە بچووکەکەی بکات کاتێك بریتی لە باوکەوە بێت، چونکە نشوز بەمەرج ناگیرێت مەگەر کاتێك بریتی لە ژنەکەوە بێت[1].

" جەعفەرییەکان " دوو ڕێسایان هەیە:

یەکەمیان[2]: خولع تەنها لەگەڵ بێزاری ژندا یان لەگەڵ بێزاری هەردووکیان دروستە.

دووەمیان[3]: بەخشینی بریتی لە کەسێکەوە جگە لە ژنەکە بەبێ ئەوەی ژنەکە کردبێتی بە بریکار پووچ و بێبنەمایە، بە ئایەتی: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾، فیدیەی داوەتە پاڵ ژنەکە، بینا لەسەر ئەم دوو ڕێسایە خولعی سەرپەرشتیار لە ناکامەوە دروست نابێت، چونکە شایستەیی بێزاری و بریکاردانانی بۆ نییە پێش داوالێکردن(بالغبوون).

" ظاهریەکان [4]" دەڵێن: خولعکردنی باوك یان وەسێتدار یان دەسەڵات لە منداڵی بچووکەوە(مێ) یان لە گەورەوە بەدەستهێنانە بەسەر کەسانیتردا، و حەڵاڵکردنی ماڵەکەیەتی بەبێ ڕازیبوونی ئەو و خواردنی ماڵە بە ناڕەوا، ئەوەش حەرامە بەپێی ئایەتی: ﴿وَلا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا﴾[5] ﴿لا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ﴾[6].

---

(1) البحر الزخار ٣/١٨٢.

(2) راجع الروضة البهية ٢/١٦٥.

(3) راجع الخلاف للطوسي ٢/٢٢٢-٢٢٣ وفيه: (بۆ سەرپەرشتیار نییە تەڵاق بدات لەو کەسەوە سەرپەرشتیاری هەیە بەسەریدا نە بە بریتی و نە بە بێ بریتی)

(4) راجع المحلي ١٠/٢٤٤.

(5) (قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبّاً وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ وَلا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا وَلا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ مَرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ) (الانعام:١٦٤).

(6) (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ وَلا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً) (النساء:٢٩).

" ئیباضیەکان[1]" دەڵێن: گەر باوك فیدیەی لە جێگەی لە جێگەی کچە بچووکەکەی یان کچە شێتەکەی دا بە مارەییەکەی یان بە هەندێك لە مارەییەکەی و دوای باڵغبوون و چاکبوونەوە لە شێتێتییەکە رێگەی بەو کارە نەدا لە مێردەکەی وەردەگرێتەوە و مێردەکە دەیگێرێتەوە بۆ سەر باوکەکە.

## شیکردنەوە و پارسەنگدان:

### یەکەم–خۆخولعکەری نەخۆش بە نەخۆشی مردن:

فەقیهان لەسەر دروستی خولعی ژنەکە رێکەوتوون لەباری هۆش و پەیبردنی کامڵدا، بەڵام لە دیاریکردنی جێگەی پابەندبوونی جیاوازیان هەیە، سەرچاوەی ئەوەش جیاوازیانە لە یەکسان کردندا لەنێوان دوو حاڵەتی تەندروستی و نەخۆشیدا لەلایەکەوە وەك وەرگرتنی گشتاندنی دەقەکە، لەلایەکی ترەوە جیاوازیان لە سروشتی پابەندبوون ئایا خۆبەخشییە یان نە؟

ئەوانەی بۆ یەکسان بوون دەچن وەك "ظاهریەکان، و جەعفەریەکان ، وزفر لە حەنەفیەکان" دەڵێن: خولعەکە دروستە و ژنەکە پابەند دەبێت بە پێدانی ئەوەی بەڵێنی دابوو بیدات بە پیاوەکەی، وەك دەستبردنێك بۆ گشتاندنی دەقەکە کە جیاوازی نەکردووە لە نێوان حوکمەکانی دوو حاڵەتی تەندروستی و نەخۆشیدا، ئەوانەش پابەندبوون بە بەخشین نازانن مەگەر زیاتر بێت لە سێیەك وەك شافیعییەکان هۆیان بۆ رایەکە هێناوەتەوە بەوەی مارەیی مافی میراتگرانی پێوە پەیوەست نابێت، هەر بەو جۆرە جێگرەوەکەی (مارەیی هاوشێوە)، بۆیە کاتێك ژنەکە پابەند دەبێت بە گێرانەوەی ئەوەی پیاوەکە پابەندبووە بە بەخشینی بەو وەك ئەوە وایە شمەکێکی بە نرخێکی هاوشێوە کڕی بێت، ئەوەی لە مارەیی هاوشێوە زیاترە بە بەخشین دادەنرێت و حوکمەکانی وەسێتی بەسەردا گوزەر دەکات.

---

[1] راجع شرح النيل ٤٨٣/٣ نقلاً عن الصابوني.

هەرکەسیش دەڵێت پابەندبوون بریتییە لـە بەخشـین دەچێتە ژێـر حوکمـەکانی وەسێتەوە وەك " حەنەفیەکان و زەیدیەکان و مالیکیەکان و حەنبەلیەکان " رایەکەی خۆی پاڵپشت کردووە بەوەی دەسەلاتی هاوسـەریی بـە مـاڵ و دارایـی نافرۆشـرێت، لەگەڵ ئەوەش روویەك بۆ درێژەپێدان بوونی نییە کە هەندێکیان پێیانوایە بۆ پیاوەکە کەمتر لە بریتییەکە یان سێیەکەکە بوونی هەیە، یان کەمتر لەوەی لێیەوە پیاوەکە بە میراتی دەگرێت، و لە ناونرلو و سێیەك.

## پارسەنگدان:

ئەو رایەی بەلایدا دەشکێمەوە ئەوەیە ئەوەیە شافیعییەکان بۆی دەچن لەبەر بوونی ئـەو وردەکارییە شیکاری و فیقهییەی کە تێیدایە.

## دووەم–خۆخولعکاری گێل:

سەرچاوەی جیاوازییەکەیان لەسەر ئـەوەی لـە خۆخولعکردنـەوە سـەرهەڵدەدات بریتییـە لـە جیـاوازی لـە بەهەنـدوەرگرتنی گێلـێتی لەلایەکـەوە و جیاوازیـان لـە پارسەنگدانی یەکێك لە دوو ویستەکە(ئاشکرا و پەنهان) بەسەر ئەویتریانـدا لەلایـەکی ترەوە.

هەرکەس لەسەر دروستی خولع و ئاساری خولعە لە کەوتنی تەلاق و پابەنـدبوون بە پێدانی بریتی وەك " حەنەفیەکان و ظاهریەکان " گرنگی بە گێلێتی نەداوە، بۆیـە ئـەبو حەنیفـە دەڵێـت: (حیجـر لەسـەر گێـل دانانرێـت، چـونکە رەچـوکردنی رێـز و حورمەتی لە رەچاوکردنی ماڵەکەی گرنگترە)، ئیبن حەزمی زاهیری دەڵێت: (مرۆڤـی باوەڕدار بە گێلی وەسف ناکرێت، ئەم وەسفە لە قورئاندا تەنها بۆ ئەوانە بەکارهێنراوە باوەڕدار نین).

هەرکەسـیش ویسـتی ئاشـکرای بەسـەر ویسـتی پەنهانـدا پارسـەنگ بـدات وەك مالیکیـەکان و شـافیعییەکان دەڵـێن: تـەلاق دەکـەوێت، چـونکە لـە کەسـێکەوە دەرچووە کە خاوەنییەتی و لە ژنەکەوە بە قبوولکردن وەرگیراوە، و پابەندبوون بـە بریتییەوە پووچەڵ دەبێتەوە، چونکە ژنەکە شایستەیی ئەوەی نییـە، تەلاقەکـە لای

مالیکییەکان بائینە، گەر مێردەکە ژنەکە بگێڕێتەوە و وا گومان ببات رجعی بووە یان خۆی بە شوێنکەوتەی ئەو زانایانە بزانێت کە تەڵاقەکە بە رجعی دەزانێت پێویستە لەیەکتر جیابکرێنەوە، گەر دادوەر بڕیاری دروستییەکەی نەدابێت لەسەر ئەو بنچینەی حوکمەکەی حەرامکراوی جێ ناکۆك حەڵاڵ دەکات لەسەر رای باوەڕپێکراو لەلایان، لەلای شافیعییەکان: تەڵاق پێش چوونە لا بائینە و دوای چوونە لا رجعییە لەبەر دروست نەبوونی بڕیتی.

هەرکەسیش ویستی پەنهانی بەسەر ویستی ئاشکرادا پارسەنگاوە وەك جەعفەرییەکان و زەیدییەکان دەڵێن: هەریەك لە تەڵاق و بڕیتی پووچن، چونکە مێردەکە تەڵاقێکی ویستووە بڕیتی –کە ژنەکە پێیەوە پابەند بێت– بەرانبەری بێت.

## پارسەنگدان:

پێموایە لەپێشتر بە کارکردن قسەکەی ئەبی حەنیفە(رەحمەتی خودای لێ بێت) و زاهیرییەکانە لەسەر ئەوەی ئەو کارە لەژێر چاودێری قەزادا ئەنجام بدرێت، چونکە هەڵسوکەوتی گێل لە ماڵەکەی و شتانی تردا بە مۆڵەتی قەزا دروستە کاتێك بەرژەوەندی تێدا هەبێت و زیانی کەسانی تری لێوە پەیدا نەبێت.

### سێیەم: خۆخولعکەری بچووك:

جیاوازی لە دروست نەبوونی خۆخولعکردنی منداڵی بچووکی جیانەکەرەوەدا بوونی نییە، چونکە لە حوکمی شێتدایە، بۆیە تایبەت بەو دوانە قازی تەڵاقیان دەگرێتە دەست، جیاوازی لە منداڵی (مێ) جیاکەرەوەدایە، سەرچاوەی جیاوازییەکە لە لێوەشاوەیی پێویستدایە بۆ خولعەکە لەلایەکەوە و جیاوازی لە دەستبردن بۆ ویستی ئاشکرا یان پەنهان لەلایەکی ترەوە.

هەرکەس لەسەر پووچەڵی خولعی منداڵە(مێ) وەك زاهیرییەکان سەرنجی فەراهەم نەبوونی مەرجەکانی لێوەشاوەیی داوە، هەرکەسیش ویستی ئاشکرای پەرسەنگاوە

بەسەر ویستی پەنهاندا وەك " حەنەفیەکان[١]" دەڵێت: تەڵاقەکە کەوتووە، چونکە تەڵاقێکە لە کەسێکەوە دەرچووە شایستەیە پێی و گرێدراوە بە قبووڵەوە و ئەوەش هاتۆتە دی، هەرکەسیش ویستی ناوەکی پارسەنگلوە دەڵێت: گەر بریتییەکە لە منداڵەکەوە بێت خولع بوونی نییە لەبەر نادروستی پابەندبوون، گەر لە کەسێکی ترەوە بوو جگە لە منداڵەکە تەڵاقەکە بە بائین دەکەوێت و پیاوەکە شایستە دەبێت بە بریتییەکە.

**چوارەم -خولع لە سەرپەرشتیارەوە:**

دەسەلأت بۆ ویستی سەرپەرشتیار نییە لە خولعکردندا گەر بریتییەکە لە مالّی ژنەکە بوو، بۆیە مێردەکە شایستە نابێت بە بریتی، بەلأم ئایا تەلأق دەکەوێت؟ دوو رای تێدایە، یەکەمیان: دەکەوێت چونکە تەلأقی پەیوەستکراوە لەسەر قبوولّی سەرپەرشتیارەکە، لەوەدا دەستی بۆ ویستی ئاشکرا بردووە، دووەمیان: ناکەوێت، چونکە مێردەکە لە نیەتەکەیدا کەوتنی تەلأقی بە بەدەستهێنانی بریتییەکەوە بەستۆتەوە، ئەمەیان تێگەیشتووانە تر و لەپێشترە بە قبوولّ کردن.

---

[١] قال السرخسي (المبسوط ١٧٨/٦): (گەر منداڵ(مێ) خۆی لە مێردە بەتەمەنەکەی خولع کرد تەلأق بەسەریدا دێت، چونکە مێردەکە شایستەیی خستنی تەلأقی هەیە، ئەرێکردنی خولعیش پەیوەستکردنی تەلأقە بە مەرجی قبوولّەوە، قبوولّ لە ژنەکەوە هاتۆتە دی بۆیە تەلأقەکە دەکەوێت، وەك ئەوەی پێی بوترێت: "گەر قسە بکەیت تۆ تەلأق دراوی" ئەویش قسە بکات، ماڵیشی پێوە پەیوەست نابێت).

# لقی سێیەم:
# بریتی

ئایا بۆ دوو هاوسەرەکە ئازادی ویست بوونی هەیە لە ڕێکەوتن لەسەر خولع بەبێ بریتی یان نە؟ لەسەر ئەگەری دووەم ئایا دوو هاوسەرەکە هەڵبژاردنیان بۆ هەیە واتە بە بریتییەك لەسەری پێکبێن یان ویستیان لەوەدا سنووردارکراوە؟

" حەنەفیەکان[1]" دەڵێن: بریتی لە خولعدا مەرج نییە، هەموو ئەوەی لە ماڵ و ساماندا دروستە مارەیی بێت دروستە ببێتە بریتی بۆ خولع، خولعکردنی ژنەکە لەسەر دابەزینی لە ماف بەخێوکردن دروستە و مەرجەکە پووچە، چونکە بەخێوکردن مافێکە بۆ بەرژەوەندی منداڵەکە بڕیاردراوە و دابەزین لێی دروست نییە، خولع لەسەر شیردان بە منداڵەکە و گرتنەخۆی بۆ ماوەی دوو ساڵ دروستە.

**بڕەکەی:** دروست نییە زیاتر بێت لەوەی بە ژنەکەی داوە، گەر ئەو کارەی کرد خولعەکە دروستە و ئەویش(پیاوەکە) لەڕووی دیانەتەوە نەك لەڕووی قەزاوە گوناهبارە.

" مالیکیەکان[2]" -هەروەك حەنەفییەکان-دەڵێن: بریتی مەرج نییە، دروستە بریتی ئەوە بێت ژنەکە لە ماوەی سکپڕیدا بۆخۆی خەرجی دەکات، گەر تەنگەتاو بوو پیاوەکە لەسەری خەرج دەکات و بەسەریدا دەیگێڕێتەوە کاتێك ژنەکە هەبوو بێت، دروستە بەردانەوەی ماف ژنەکە بێت لە ماف بەخێوکردنی منداڵەکەی بۆ باوکی، گەر ئەو کارە زیانی بە منداڵەکە نەدەگەیاند، گەر لەسەر نادیارێك خولعی ژنەکەی کرد یان

---

(1) راجع شرح فتح القدير ٣/٢١٥. المبسوط ٦/١٦٩. أحكام القرآن للجصاص ٢/٩٠وما بعدها.

(2) راجع شرح الخرشي ٤/١٢وما بعدها. المنتقى شرح موطأ ٤/٦٢ وما بعدها. حاشية العدوي على الخرشي ٤/١٣.

لەسەر شتێکی بێ بەها یان لەسەر شتێکی داگیرکراو تەڵاقەکە بە بائین دەکەوێت و ژنەکە بە هیچ شتێکەوە پابەند نابێت، دروست نییە بریتییەکە بریتی بێت لە دەرچوون لە شوێنی نیشتەجێبوونی عیدەکەی، چونکە مافی خودایە و بۆ هیچ کەس نییە بەریبداتەوە، و سنووردانان بۆ بریتی لەلای مالیکییەکان بوونی نییە.

" شافیعیەکان[1]" دەڵێن: خولع تەنها بە بریتی دروستە، کەم بێت یان زۆر، قەرز بێت یان ئامادە، یان سوودبینین، لەبەر ئایەتی: ﴿فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾، گەر لەسەر بەخێوکردنی منداڵەکە لە ماوەی شیرداندا و بڕی خەرجی و سیفەتی خەرجییەکە خولعی کرد ئەوا بە دەق دروستە، هەندێ لە هاوەڵانی شافیعی دەڵێن: دروست نییە، چونکە سەودایەکە فرۆشتن و بەکرێگرتنی کۆکردۆتەوە، هەرکەسیش بە دروست دەیبینێت دەڵێت: پێویستی بانگ دەکات بۆ کۆکردنەوەی نێوانیان، گەر لەسەر نادیارێك یان شتێکی بێبەها یان داگیرکراوێك خولعی کرد، یان بە مەرجێکی تێکچوو خولعی کرد لە کۆیدا دروستە و بریتییەکە دەگۆڕێت بۆ مارەیی هاوشێوە و بەوەش دەیگێڕێتەوە بۆ سەر ژنەکە، گێڕانەوەی مارەییەکە ئەستەمە بۆیە گێڕانەوەی هاوشێوەکەی پێویست دەبێت.

لەگەڵ ئەوەش نادیاری لە ئازادکردندا کاردەکاتە سەر دروستی خولع بۆیە تەڵاقەکە ناکەوێت، گەر بڵێت: گەر لە مارەییەکەت منت ئازاد کرد تۆ تەڵاقدراوی، ئەویش ئازادی کرد و نەزان بوو بە بڕی بریتییەکە تەڵاقەکە ناکەوێت، لەسەر ئەمە بینا دەکرێت گەر پیاوەکە خولعی ژنەکەی کرد لەسەر ئازادکردنی لە مارەییەکەی و زەکاتی پێوە پەیوەست بووبوو تەڵاقەکە ناکەوێت، چونکە بەشێك لە مارەییەکە بووە بە موڵکی ئەوانەی شایستەن بە زەکات، خولع لەسەر بەردانەوەی بەخێوکردن دروست نییە، گەر گەڕانەوەی لەسەر بەمەرجگیرابێت تەڵاقەکە بە رجعی دەکەوێت و ماڵی بۆ نییە لەبەر نەرێکاری ماڵ و گێڕانەوە بۆ یەکتر.

---

[1] راجع المهذب ٧٣/٢ وما بعدها. نهاية المحتاج ٣٩١٦ وما بعدها. إبن قاسم الغزي والباجوري ١٣٧/٢ وما بعدها.

"حەنبەلییەکان[1]" خولع بەبێ بریتی دروست نییە، و زیاتر بێت لەوەی پیاوەکە بە ژنەکەی داوە رێگە پێنەدراە، گەر زیادەی وەرگرت بۆی دروستە لەڕووی قەزاوە نەك لەڕووی دیانەتەوە، هەروەها لەسەر شیردان و بەخێوکردن و خەرجی پیاوەکە بۆ ژنەکە دروستە، بە هەمان شێوە لەسەر سوودبینینێك وەك نیشتەجێبوون لە خانووەکەیدا، خولع دروستە لەوانەدا کە دروست نییە بىن بە مارەیی بەهۆی نەزانینەوە یان فریودانەوە.

" جەعفەرییەکان[2]" هەموو ئەوەی دروستە ببێتە مارەیی دروستە ببێتە بریتی، گەر ژنەکەی خولع کرد لەسەر ماڵێکی بێبەها خولعەکە پووچ دەبێتەوە لەسەر بەهێزترین را لەلایان.

لەسەر شیردان بە منداڵەکە و خەرجیکردنی گەر بڕە پێتاتاجەکە دیاریکرابوو دروستە، دروستە بریتی خولع بەردانەوەی ماف بەخێوکردن بێت، چونکە دەقێك نابینرێتەوە بەڵگە بێت لەسەر پێویستبوونی ئەو مافە بۆ یەکێکیان بەبێ ئەویتریان، دروستە زیاتر بێت لەوەی بە ژنەکە گەیشتووە، بەڵام لە ئازادکردندا بەمەرج دەگیرێت لە مارەییەکە زیاتر نەبێت.

" زەیدییەکان[3]": بریتی مەرجە بۆ دروستی خولع، پێویستە زیاتر نەبێت لەوەی بە هاوسەرگیری بۆی پێویست بووە، گەر بریتییەکە بێبەها بوو تەڵاقەکە بە رجعی دەکەوێت، گەر لەسەر ئازادکردنی خەرجی عیدەکەی تەڵاقیدا ئازادکردنەکەی دروست نییە و تەڵاقەکەی بە رجعی دەکەوێت بە قبووڵ کردن.

" ظاهریەکان[4]": بۆ ژنەکە هەیە هەرچی ئەو خاوەنییەتی بە رازیبوونی خۆی بیکات بە فیدیەی خۆی، حوکمەکەی لە خولعدا وەك حوکمەکەی وایە لە

---

[1] راجع منتهى الارادات ٢/٢٣٩. وما بعدها.

[2] راجع الروضة البهية ٢/١٦٣ وما بعدها. الخلاف للطوسي ٢/٨٥. الكافي ٦/١٤٢.

[3] راجع التاج المذهب ٢/١٣٨ وما بعدها.

[4] راجع المحلى ١٠/٢٣٥.

گرێبەستەکانی بریتیداندا.

## شیکردنەوە و پارسەنگدان:

جیاوازی لەوەدا نییە هەر شتێك دروست بێت بکرێتە مارەیی دروستە بکرێتە بریتی لە خولع، جیاوازییەکە لە خولعێکدایە لەسەر ئەوەی مافی کەسانی تری پێوە پەیوەستە، هەروەها جیاوازی لە سیفەتی بریتییەکەدا.

سەرچاوەی یەکەم ئەوەی مافی کەسانی تری پێوە پەیوەستە وەك بەخێوکردن ئەوە ماف و پابەندبوونە لە یەك کاتدا، هەر کەس لای(تای) "ماف"ی زاڵ کردووە دەڵێت خۆخولعکردنی دایکی منداڵ لەسەر دابەزینی پیاوەکەی لە بەخێوکردن دروستە گەر ئەوە زیانی بە منداڵەکە نەدەگەیاند، هەرکەسیش لای "پابەندبوون"ی بەسەر مافدا زاڵ کردووە دەڵێت مەرجەکە پووچە، بەڵام پووچکەرەوە نییە، بۆیە تەلاقەکە دەکەوێت و ژنەکە بەخێوکردنی لەسەرە.

سەرچاوەی جیاوازی لە سیفەتی بریتیدا وەك ئەوەی زانراو بێت یان نادیار یان جێگەی فریودان بێت ئەوە بریتییە لە هاتوچۆی بریتییەکە لە خولعدا لە نێوان بریتی گرێبەستی بریتیدانەکان لەگەڵ ئەو شتانەی دەدرێن و وەسێتیان پێ دەکرێت، هەرکەس بە یەکەم شوبهاندوویەتی ئەوەی لە بریتی ئەو گرێبەستانەدا بەمەرج دەگیرێت بە مەرجی گرتووە، هەرکەسیش بە پێدانەکان شوبهاندوویەتی ئەوەی بە مەرج نەگرتووە.

## پارسەنگدان:

تێگەیشتوانەترئەو قسەیە لەسەر پووچی خولع و نەکەوتنی تەلاقە لە هەر بارێکدا ئەوەی مێردەکە دەیەوێت دەستەبەری بکات لە پشت گرێدانی تەلاقی ژنەکەیەوە– بەوەی ژنەکە بەڵێنی پێداوە و پابەندە بە جێبەجێکردنییەوە– نایەتە دی، چونکە رێکەوتنی فەقیهان هەیە لەسەر ئەوەی خولع جۆرێکی تایبەتە لە تەلاق و حوکم و ئاساری تایبەت بە خۆی هەیە، و لە کتێبە فیقهییەکاندا باسێکی سەربەخۆ تەنهاکراوەتەوە لەسەر تەلاق کە بەبێ بەرانبەرە.

# باسی سێیەم:
# چۆناندنی فیقهی بۆ خولع

فەقیهان لە سروشتی خولعدا جیاوازیان هەیە: ئایا تەلاقە یان هەڵوەشانەوە؟ ئایا بڕیتیدانە یان پەیوەستکردن؟ بەپێی ئەم درێژەپێدانە:

" حەنەفیەکان "[1]: خولع لەلایان تەلاقی بائینە، "السرخسی[2]" دەڵێت: خولع تەلاقدانێکی بائینە لەلامان، بەڵگەیان لەسەر ئەوە:

١-ئەوەی لە "علی وعمر وابن مسعود" بە بەرزکراوەیی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ریوایەتکراوە: ((خولع تەلاقدانی بائینە))[3].

٢-هەڵوەشانەوە پێش تەواویی گرێبەستەکەیە، خولع دوای تەواویی گرێبەستەکەیە، هاوسەرگیری دوای تەواوبوونی شان ناداتە ژێر هەڵوەشانەوە(فسخ).

٣-قورئان ئەوەی رۆشن کردۆتەوە تەلاقی سێیەم بە بریتی و بەبێ بریتی دەبێت، بەم مانایە تەلاق بۆ جاری چوارەم دروست نییە.

### سروشتی خولع

لای ئەبی حەنیفە سوێندێکە لەلایەن پیاوەکەوە، چونکە پەیوەستبوون لەسەر قبووڵکردن لەخۆدەگرێت، بریتیدان لەلای ژنەکەوە لێکچوونێکی هەیە بە بەخشین، چونکە بریتی لەوانەیە بە ماڵ نازمێررێت لەرووی شەرعەوە، لەلای دوو هاوەڵەکەی ئەبی حەنیفە سوێندە لە هەردوو لایەنەکەوە، چونکە قبووڵکردنی ژنەکە سوێندی

---

[1] راجع المبسوط ١٨٤/٦ وما بعدها. شرح فتح القدير ١٩٩/٣. بدائع الصنائع ١٤٥/٣. وما بعدها.

[2] راجع المبسوط ١٧١/٦.

[3] النسائي: باب تفرق الزوجين عند مفارقتهما.

پیاوەکە تەواو دەکات، بۆیە سوێنێك بۆ ئەو قسەی پیاوەکە نامێنێتەوە کە دەڵێت: گەر ژنەکە قبووڵی نەکات، پارسەنگدراو لەلایان ڕایەکەی ئەبی حەنیفەیە.

**لەسەر ئەوەی لای پیاوەکەوە سوێند بێت ئەم خاڵانە سەرهەڵدەدەن:**

١-هەڵبژاردەی مەرج بۆ پیاوەکە نییە، گەر ئەوەی بەمەرج گرت مەرجەکە دەسڕێتەوە و گرێبەستەکە دروستە.

٢-ئەرێکردنی پووچ نابێتەوە بە هەستانی پیاوەکە لە دانیشتنەکە، گەر بڕیتیدان بوایە ئەوا کۆتاهێنان بە دانیشتنەکە-بە هەستانی پیاوەکە- پووچی دەکردەوە.

٣-پەیوەستکردنی لەسەر مەرجێك و دانەپاڵی بۆ داهاتوو دروستە بەپێچەوانەی بڕیتیدانەوە.

٤-گەر ئەرێکردنەکە لە پیاوەکەوە بوو پاشگەزبوونەوەی بۆ نییە پێش قبوولکردن، چونکە لە مانای پەیوەستکردندایە، گەر بڕیتیدانەکە لە هەردوولاوە بوو ئەوە دروستە.

**لەسەر ئەوەی بڕیتیدان بێت لەلایەن ژنەکەوە ئەم خاڵانە سەرهەڵدەدەن:**

١-ژنەکە زانا بێت بە مانای خولع و ئەوەی لەسەری پەیدا دەبێت لە پابەندبوون و ڕازی بێت لە قبوولکردندا و لێوەشاوە بێت لە بەخشیندا.

٢-گەر ئەرێکردن لە ئەوەوە بوو وەك خۆم خولع کرد لە تۆ بە هەزار دینار، ئەوا ژنەکە پاشگەزبوونەوەی بۆ هەیە بەر لەوەی پیاوەکە قبووڵی بکات، ئەرێکردن پووچ دەبێتەوە بە بەجێهێڵانی دانیشتنەکە لەلایەن یەکێکیانەوە پێش قبوولکردنەکە.

٣-بۆ ژنەکە دروستە هەڵبژاردەی سێ ڕۆژ بۆ خۆی بەمەرج بگرێت، لەو ماوەیەدا بۆی هەیە هەڵوەشانەوەی خولع هەڵبژێرێت و لەوێوە خولعەکە بسڕێتەوە، هەروەها بۆی هەیە تێپەڕاندنی خولعەکە هەڵبژێرێت و پیاوەکە خولع و تەڵاقی بۆ پێویست ببێت.

" مالیکیەکان[1]": ئەوان پێیانوایە تەڵاق بە بـریتی-کـە لـەلایان پێـی دەوترێـت خولع- بە بریتیدان دادەنرێت لە هەردوو لایەنەکەوە، لەسەر ئەوەش کۆمەڵێك حوکم سەرهەڵدەن کە لەسەر بریتیدانەکان جێگیر دەبن لە رێکەوتنی ئـەرێکردن بـۆ قبـووڵ کردن، و کورتهەڵهێنانی ئەرێکردن لەسەر دانیشتنەکە، و دروسـتی گێڕانـەوە بـەر لـە قبووڵکردن.. تا ئەوەی پێیانوایە لە حوکمەکانی تری قەرەبووکارییە.

خولع لەلایان تەڵاقدانێکی بائینە وەك حەنەفییەکان، گەر پیاوەکە مافی گێڕانەوەی بۆ خۆی بە مەرج گرت، بۆ مالیك دوو ریوایەت هەیە کە "ابن وهب" ریوایەتی کردوون:

یەکەم: مەرجەکە دروستە، "سحنون" هەڵیبژاردووە و هۆی بۆ هێناوەتەوە بەوەی رێکەوتن کراوە لەسەر تـەڵاقێکی رجعـی بەرانبـەر بریتییـەك، بۆیـە کـارکردن بـەپێی رێکەوتنەکە دروستە.

دووەم: مـەرجێکی پووچـە، چـونکە پێچـەوانەیە بـە داواکـاری گرێبەسـتەکە کـە بریتییـە لـە بەینوونـە، چـونکە "بـریتی" بـۆ رزگـاربوون لـە پیاوەکـە دراوە، بۆیـە جێگیربوونی گێڕانەوە(رجعە) پێچەوانەی ئەوەیە.

" شافیعیەکان[2]": لای شافیعییەکان رایەکان لە چۆناندنی خولع و سەرچاوەکەی جیـاوازن، هــەروەها جیاوازیـان لـەوەدا: ئایـا جیابوونـەوە بـە خولـع تەڵاقـە یـان هەڵوەشانەوە، گەر بڵێین هەڵوەشـانەوەیە ئـەوە بریتیدانـە لـە هـەردوو لایەنەکـەوە، چونکە رێگەیەکی تێدا نییە بۆ پەیوەستکردن تیایدا و لەسـەر ئـەوەش ئـەم خاڵانـە سەرهەڵدەدەن:

١-بۆ ئەرێکەر مافی پاشـگەزبوونەوە هەیـە بـەر لـە قبـووڵ کـردن، چـونکە ئـەوە سروشتی بریتیدانە.

---

[1] راجع شرح الخرشي ١٢/٤ وما بعدها. تفسير القرطبي ١٤٥/٣ وما بعدها. الشيخ علي الخفيف فرق الزواج ص١٤٠.

[2] راجع نهاية المحتاج ٣٩٧/٦ وما بعدها. مغني المحتاج ٢٦٨/٣ وما بعدها. المهذب ٧٢/٢.

٢-قبوولکردن لە دانیشتنەکەدا بە گوزارشت یان ئەوەی لە جێگەی گوزارشت دادەنیشێت لە ئاماژە و نووسین تایبەت بەوانەی ناتوانن قسە بکەن بە مەرج دەگیرێت ، قبوولکردن تەنها بە کردار دروست نییە وەك پێشکەش کردنی ئەو بریتییەی لەسەری ڕێکەوتوون.

٣-لە نێوان قبوولّ کردن و ئەرێکردندا شتێك ڕوونەدات پشتهەلّکردن(واتە ناڕازیبوون)ی لیّ بخوێنرێتەوە.

گەر وتمان تەلاقە لەبارێکدا ئەرێکردن لە مێردەکەوە بێت حوکمەکانی جیاواز دەبن وەك لەوەی لە ژنەکەوە بێت:

أ-گەر ئەرێکردن لە مێردەکەوە بێت و تەلاقەکە تێپەڕێنراو بێت وەك لەسەر سەد دینار تەلاقمدای، ئەوا حوکمەکانی بریتیدانی پێشتر باسکراویان بەسەردا گوزەر دەکات، گەر ئەرێکردنەکە لە پیاوەکەوە بە گوزارەی پەیوەستکردن بوو لەئەرێدا وەك "هەرکات ئازادت کردم لە فلاّن قەرزت تۆ تەلاقدراوی"، ئەوە پەیوەستکردنی ڕووتە لەلای پیاوەکەوە لێکچوونی بریتیدانی لیّ ناخوێنرێتەوە، لەباری هاتنە دی سیفەتی پەیوەستکراو پێیەوە تەلاقەکە دەکەوێت، و ئەمانە لەسەری سەرهەڵدەدەن:

١-پاشگەزبوونەوەی تێدا نییە وەك تەلاقدانی خالّی لە بریتی.

٢-قبوولّکردنی بە گوزارە بە مەرج ناگیرێت چونکە داڕشتنەکە دلوای ناکات.

٣-کاری سوێندلەسەرخوراو لە ژنەکەوە دەمودەست بە مەرج ناگیرێت، گەر پەیوەستکردنەکە لەوانە بوو ئاماژەی بە گشتاندن دەکرد وەك: هەرکات، هەردەم... بە پێچەوانەی "إن-گەر" پەیوەستکردن پێیەوە دەمودەستی و یەکسەری دلوا دەکات، لە "إذا-ئەگەر"دا جیاوازی هەیە وەك پێشتر باس کرا.

ب-گەر ئەرێکردنەکە لە ژنەکەوە بوو یەکسانە تەلاقەکە پەیوەستکردن بێت یان تێپەڕاندن وەك "لەسەر سەد دینار تەلاقم بدە" یان "ئەگەر تەلاقم بدەی سەد

دینارت پێ دەدەم"، پیاوەکەش دەمودەست وەڵامیدایەوە ئەوە بریتیدانە لەلایەن ژنەکەوە شێوەیە لە پاداشتی تێدایە: بریتیدانە چونکە ژنەکە پابەند دەبێت بە پێدانی بریتی بەرانبەر کۆتاهێنان بە پەیوەندی ژن و مێردی، شێوەیە لە پێدانی تێدایە، چونکە ماڵ بەرانبەر شتێك دەبەخشێت پیاوەکەی پێ سەربەخۆ کراوە ئەوەش تەڵاقە، وەك کارکەر لە پاداشتدا، لەسەر ئەوە ئەم خاڵانە سەرهەڵدەدەن:

١-ژنەکە پاشگەزبوونەوەی بۆ هەیە بەر لە وەڵامی پیاوەکە، چونکە ئەمە حوکمی بریتیدانەکان و جەعالەکانە.

٢-دەمودەستی و یەکسەری وەڵام بە مەرج دەگیرێت وەڵامەکەی تێپەڕاندن بێت یان پەیوەستکردن، ئەوەش وەك زاڵبوونی بریتیدان لەلای خۆیەوە بەسەر پەیوەستکردندا، مەگەر ژنەکە لە ئەرێکردنەکەیدا شتێکی راگەیاندن بێت ئاماژە بێت بۆ مانای دواخستن.

٣-هەماهەنگبوونی ئەرێکردن و قبووڵ کردن.

**گەر مێردەکە لە خولعدا بە مەرجی گرت مافی رجعەی هەبێت، بۆ شافیعییەکان سێ را هەیە:**

١-رایەك: تەڵاقەکە بە رجعی دەکەوێت، بۆیە لەسەر ژنەکە پێویستە بریتییەکە رەد بکاتەوە، چونکە ماڵ و رجعە پێچەوانەی یەکترن، بۆیە هەردووکیان بەردەبنەوە و تەڵاقەکە لەسەر بنەڕەتی خۆی دەمێنێتەوە ئەوەش کاتێك رجعی بێت[1].

---

[1] لە "الاشباه والنظائر"دا هاتووە: ئەوەی بە شەرع جێگیربووە پێش دەخرێت بەسەر ئەوەی بە مەرج جێگیربووە، گەر بڵێت: "بە هەزار(دینار) تەڵاقت دەدەم بە مەرجێك رجعەم بۆ هەبێت" وتنی "بە هەزار" بەردەبێتەوە و تەڵاقەکە بە رجعی دەکەوێت، چونکە ماڵ بە مەرجەکە جێگیربووە و رجعە بە شەرع جێگیربووە و ئەمەی دووەمیان بەهێزترە.

٢-لە رایەکدا ناکەوێت گەر بریتی خولعەکە بریتی بوو لە ئازادکردنی پیاوەکە لە مارەییەکەی یان لە قەرزەکەی، چونکە رێگەیەك بوونی نییە بۆ کەوتنی خولع مەگەر بە دروستی ئازادکردن، دروستییەکەشی بەینوونە پێویست دەکات لە ئەرێکردنی کەوتنی تولاقەکە بە رجعی.

٣-لە رای سێیەمدا تەڵاقەکە بە بائین دەکەوێت و بریتییەکە مارەیی هاوشێوە دەبێت بینا لەسەر ئەوەی ئەگەر مەرج بریتییەکەش تێکبدات خولعەکە تێکنادات.

"حەنبەلییەکان[1]": لە ئەحمەددەوە رایەکان جیاوازن، لە یەکێك لە ریوایەتەکاندا بریتییە لە هەڵوەشانەوە، لە ریوایەتی دووەمدا تەڵاقی بائینە، هەروەها لە ریوایەتێکی تردا بە گوزارەی خولع و کەڵکبینین، هەڵوەشانەوە: هەڵوەشانەوەیەکە ژمارەی تەڵاقەکانی پێ کەم ناکات، هەروەها لە ئەحمەددەوە: گەر نیەتی تەڵاقی لێ هێنا ئەوە تەڵاقە، ئەگەر نە، بریتییە لە هەڵوەشانەوە، خاوەنی "المحرر"[2] دەڵێت: ئەوە راسترینیانە.

لەسەر ئەوە بینا دەکرێت:

**أ-گەر ئەرێکردنەکە تێپەڕاندن بێت** خولع دەبێتە بریتیدان لە هەردوو لایەنەکەوە و لەسەری ئەم خاڵانە سەرهەڵدەدەن:

١-گونجاویی پەشیمانبوونەوەی تەواو لە ئەرێکردنەکە بەر لەوەی ئەویتر قبووڵی بکات.

٢-پێویستە قبووڵکردنەکە لە دانیشتنی ئەرێکردنەکەدا بێت، یان لە دانیشتنی زانست بە ئەرێکردنەکە.

٣-پێویستە ئەرێکردن و قبووڵ کردن هەماهەنگ بن.

---

[1] راجع منتهى الارادات ٢/٢٣٨. المغني والشرح الكبير ٨/٢٠٠.

[2] راجع المحرر ٢/٤٥.

**ب–گەر لە شێوازی پەیوەستکردندا بوو لەسەر وتنی دروستییەکەی لە خولعدا، ئەوا:**

١–بۆ پیاوەکە پاشگەزبوونەوە نییە بەر لە قبوولکردنی ژنەکە.

٢–قبوولکردنەکە بە دانیشتنەکە کۆتوبەند ناکرێت.

٣–پێویستە ئەرێکردن و قبوولّ کردن هەماهەنگ بن.

" جەعفەرییەکان[١]": فەقیهانی جەعفەری پێیانوایە خولع بریتییە لە سڕینەوەی کۆتوبەندی هاوسەرگیری بە فیدیەیەك لە ژنەکەوە لەباری تاکبوونەوەی ژنەکە بە بێزاربوون، گەر بێزاربوونەکە لە هەردوو لاوە بوو ئەوا جیابوونەوەکە پێیدەوترێت بەریبوون(دابڕان)، لە هەردوو بارەکەدا پێویستە لە نێوان دوو لایەنەکەدا لەسەر بریتیدانی رووت تەلاقەکە بکەوێت، لە کاتێکدا پەیوەستبوون لەسەر رای ئەوان دروست نییە بۆیە حوکمەکانی بریتیدانی بەسەردا گوزەر دەکات.

زۆربەی فەقیهان پێیانوایە خولع تەلاقێکی بائینە، لە "مستدرك الوسائل[٢]"دا هاتووە: تەلاقی خۆخولعکەر بائینە و رجعەی تێدا نییە، لە "الروضة البهية[٣]"دا هاتووە: (خولع تەلاقێکە بە بریتییەکی مەبەستگیراوی پێویست لەلای مێردەکەوە)، ئەمەش لەسەر ئەوە بیناکراوە بەمەرج دەگیرێت تەلاق دوای خولع بکەوێت، بەلاّم گەر شوێنی نەکەوێت هەندێك لە فەقیهان دەلّێن ئەوە بریتییە لە هەلّوەشانەوە[٤].

گەر پیاوەکە مافی گێڕانەوەی بۆخۆی بەمەرج گرت ئەوا مەرجەکە پووچەلّ دەبێتەوە، چونکە پێچەوانەیە لەگەلّ سوننەتدا، بەلاّم بۆ ژنەکە لە عیدەدا مافی پاشگەزبوونەوە هەیە لە بەخشینەکەی، لەو بارەدا رجعە بۆ مێردەکە دروست دەبێت،

---

(١) راجع شرائع الاسلام ٢/٥٣ وما بعدها.

(٢) مستدرك الوسائل ٣/٣٥. الخلاف للطوسي ٢/٢١٥. الكافي ٦/١٤٤.

(٣) الروضة البهية ٢/١٦٣.

(٤) راجع المختصر النافع ص٢٢٧.

"العاملي[1]" دەڵێت: گەر خولع تەواو بوو رجعە بۆ پیاوەکە نییە بەر لە پەشیمانبوونەوەی ژنەکە لە بەخشینەکەی، بۆ ژنەکە پەشیمانبوونەوە هەیە تا لە عیدەدا بێت گەر لەوانە بوو عیدەیان لەسەرە، گەر عیدەکەی کۆتایی پێهات یان عیدەی نەبوو وەك ئەو ژنەی پیاوەکەی نەچووەتە لای و ئافرەتی منداڵ و ژنی لە حەیزچوو ئەوا بەرەهایی ژنەکە پەشیمانبوونەوەی بۆ نییە، گەر پەشیمانبوونەوە -لەو کاتەی پەشیمانبوونەوەی تێدا دروستە- تەڵاقەکە دەبێت بە رجعی و حوکمەکانی لەسەر پەیدا دەبن.

" زەیدیەکان[2]"زانایانی زەیدی خولعیان بۆ دوو بەش دابەش کردووە:

أ.**خولع بە گرێبەستێك** کە بریتییە لە گرێبەستی نێوان دوو هاوسەرەکە لەسەر هەڵوەشانەوەی گرێی هاوسەری بە بریتییەك کە ژنەکە دەیدات بە پیاوەکە و حوکمەکانی بریتیدانی بەسەردا گوزەر دەکات:

١- دەبێ ئەرێکردن و قبووڵ کردنی تێدا بێت و لە دانیشتنێکدا بێت، و هەماهەنگی لە نێوان ئەرێکردن و قبووڵ کردندا روویدات.

٢-تایبەت بە گونجاوی پەشیمانبوونەوە گەر ئەرێکردنەکە لە مێردەکەوە بوو ئەوەی بۆ دروست نییە بەر لە قبوولکردنی ژنەکە، چونکە بۆی نییە پەشیمان ببێتەوە لە تەڵاق، ئیمام یەحیا لەوەدا دڵەڕاوکێی بۆ دروست بووە لەبەر ئەو مانای بریتیدانەی تێیدایە، گەر ئەرێکردنەکە لە ژنەکەوە بوو مافی پەشیمانبوونەوەی بۆ هەیە، چونکە خولع تایبەت بە ژنەکە بریتیدانە.

ب-**خولع بە مەرج**: ئەوەش ئەوەیە ئەرێکردنەکەی پەیوەست بکات بە بەدەستهێنانی شتێك، بۆیە قبوولکردنەکەی تەنها بە گوزارشت بەهەند وەرناگیرێت بەر لە بەدەستهاتنی مەرجەکە.

---

[1] راجع الروضة البهية المرجع السابق.

[2] راجع التاج المذهب ١٧٤/٢. وما بعدها. الروض النضير ١٦٧/٤ وما بعدها. البحر الزخار ١٧٩/٣ وما بعدها. المنتزع المختار ٤٣٨/٢ وما بعدها.

شێوازەکەی وەك پیاوەکە بڵێت: گەر یان هەرکات فلان شتت پێدام تۆ تەلاقدراوی، یان ژنەکە بڵێت: گەر تەلاقم بدەی فلان شت بۆ تۆ بێت، گەر ئەرێکردنەکە لە پیاوەکەوە بوو:

١-تەنها دوای هاتنەدی مەرجەکە دەکەوێت، لە ریوایەتێکەوە لە ئیمام یەحیاوە پێویستە مەرجەکە لە دانیشتنی ئەرێکردندا بوونی هەبێت، لە ریوایەتی دووەمدا کە جمهووری لەسەرە ئەوە بە مەرج ناگیرێت.

٢-مافی پەشیمانبوونەوە بۆ پیاوەکە نییە وەك پەیوەستکردن بەبێ بریتی، گەر ئەرێکردن لە ژنەکەوە بوو خولع لەلای ئەوەوە بریتیدان و بە مولککردنە، بۆیە مافی پەشیمانبوونەوەی بۆ هەیە بەر لە قبوولکردنی پیاوەکە.

**جیاوازی لە نێوان دوو خولعەکەدا:**

١-لە خولعدا بە گرێبەست پێویستە لە دانیشتنی ئەرێکردندا یان دانیشتنی ئاگاهی پێی قبوولکردن هەبێت، یان لە دانیشتنی زانست بە ئەرێکردن، بە پێچەوانەوەی خولع بە مەرجەوە.

٢-لە خولع بەگرێبەست نشوزی ژنەکە بەمەرج دەگیرێت لە کاتی قبوولکردندا و لە خولع بە مەرجدا لە کاتی مەرجەکەدا.

٣-لە خولعدا بە گرێبەست مۆڵەتی پێ دەگات، گەر کەسێکی فزول هەستا بە ئەرێکردن لە یەکێکیانەوە و ئەو کەسەی مۆڵەتی بۆ هەیە مۆڵەتی پێدا و ئەویتریان قبووڵی کرد تەلاقەکە دەکەوێت.

٤-لە خولع بە گرێبەست پەشیمانبوونەوە بۆ ئەو کەسەی پابەندە بە بریتییەوە پێش قبوولکردن دروستە، یەکسانە ژنەکە بێت یان کەسێکی تر جگە لە ژنەکە، ئەو کارە بۆ پیاوەکە دروست نییە، بەڵام لە خولع بە مەرجدا پەشیمانبوونەوە بەرەهایی بوونی نییە.

مەرجی رجعە:

لای زەیدییەکان ئەم مەرجە دروست نییە، چونکە پێچەوانەی داواکاری گرێبەستەکەیە کە بریتییە لە بەیننونە.

خولع بە ناوی تەڵاقی بائینەوە لەلایان رێگرە لە رجعە مەگەر بە گرێبەستێکی نوێ[1].

" ظاهریەکان[2]": خولع لەلایان گرێبەستە لە نێوان دوو هاوسەرەکەدا و پێویستە لەڕووی رازیبوونەوە مەرجەکان و حوکمەکانی گرێبەستی بریتیدانی تێدا بەدیبێت، هەروەها رێکەوتن(هەماهەنگبوون)ی ئەرێکردن و قبوولکردن لە دانیشتنەکەدا... پەیوەستکردن تیایدا دروست نییە، چونکە هەموو پەیوەستکردنێك لە تەڵاق و خولعدا پووچە.

خولع لەلایان تەڵاقی رجعییە، گەر دوای خولعەکە گێڕایەوە و ژنەکە لە عیدەدا بوو لەسەریەتی بریتییەکە بەتەواوی بگێڕێتەوە بۆ ژنەکە، مەگەر لەکاتی خولعەکەدا بەردانەوەی مافی ژنەکەی لە گێڕانەوەی بەمەرج گرتبێت، لەوبارەدا مەرجەکە دروستە و ژنەکە مافی داواکردنی ئەوەی بۆ نییە.

" ئیباضیەکان[3]": خولع رێکەوتنی نێوان دوو هاوسەرەکەیە بە ئەرێکردن و قبوولکردن، لەگەڵ نارازیبوون دروست نییە، هەماهەنگبوونی ئەرێکردن و قبوولکردنی تێدا بەمەرج دەگیرێت، لە پابەندبوون بە دانیشتنەکەوە جیاوازی هەیە، لە "شرح النیل[4]"دا هاتووە: گەر ژنەکە پیاوەکەی لێ ئازاد کرد ل و هەستا و قبوولی نەکرد و پاشان قبوولی کرد زۆرینە لەسەر دروستی ئەو کارەن، وتراویشە دوای دانیشتنەکە رێگەی پێ نادرێت، بینا لەسەری ئەوە نابێتە فیدا بۆی، دروست

---

[1] راجع التاج المنهب المرجع السابق ١٩٣/٢. البحر الزخار المرجع السابق.

[2] راجع المحلى ٢٣٠/١٠ وما بعدها.

[3] راجع شرح النيل ٤٨٣/٣.

[4] المرجع السابق.

یەکەمەکەیانە، گەر پەشیمانبوویەوە بەر لەوەی پیاوەکە قبووڵی بکات لەدوای ئەوە قبوولکردن بۆ پیاوەکە نییە، وتراویشە بۆی هەیە، گەر پیاوەکە هەستا و قبووڵی نەکرد وتراوە ناچار دەکرێت لەسەر قبوولکردنی یان رەد دەکرێتەوە وترلویشە قبوولکردنی لەدەستچووە.

جیابوونەوە بە خولع تەڵاقی بائینە لەلایان ئەگەر لەسەر بریتییەك بوو، بەڵام گەر لە عیدەدا دوو هاوسەرەکە لەسەر گەڕانەوە پێکهاتن رێکەوتنەکە دروستە و هاوسەرییان بۆ دەگەڕێتەوە گەر تەڵاقی سێیەم نەبێت یان بەر لە چوونە لا نەبێت، ئەگینا گەڕانەوەیان بۆ نییە، بۆ دروستی گێڕانەوە رازیبوونی ژنەکە و قبوولکردنی و ئامادەبوونی دوو شایەت بەمەرج دەگیرێت، لە گێڕانەوەی تەڵاقدا رازیبوونی ژنەکەیان بەمەرج نەگرتووە، چونکە خولع بە هەردووکیان کراوە و پێویستە گەڕانەوەش بە هەردووکیان بێت.

**ئەنجامگیری و پارسەنگدان:**

لەم والاکردنەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی سەرچاوەی جیاوازی فەقیهان لە چۆناندنی خولعدا بریتییە لە جیاوازی لە لێکدانەوەی دەقەکانی حوکمی خولعدا، هەروەها بەرهەڵستی رووالەتی لە نێوان هەندێ لە فەرموودەی ریوایەتکرلو و بەکارهێنانی پێوانە.

هەرکەس دەڵێت: خولع هەڵوەشانەوەیە دەستی بەم بەلگانەوە گرتووە:

١–گەر خولع تەڵاق بێت تەڵاقدان دەبێت بە چوار، دوانیان لە ئایەتی: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ﴾، سێیەمیان لە ئایەتی: ﴿فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾.، چوارەمیش لە ئایەتی: ﴿فَإن طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ﴾

٢- ئەوەی لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ) ڕیوایـەتکراوە: ((فـەرمانی کـردووە بـە ئـافرەتی خۆخولعکەر بـە یـەك حـەیز عیـدە بگرێـت))[١]، "الخطـابي" لـە حەنبەلییـەکان دەڵێت: ئەوە بەهێزترین بەڵگەیە بۆ ئەو کەسەی دەڵێت خولع هەڵوەشانەوەیە و تەڵاق نییە[٢]

٣- ئەوەی لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتکراوە لەوەی پیاوێك کە ژنەکەی خولع کرد بوو لەدوای دوو تەڵاقدان لێی پرسی: ئایا بۆی حەڵاڵە بـە گرێبەستێکی نـوێ بـەبێ ئەوەی مێرد بە پیاوێکی تر بکات؟ وتـی: (بـەڵێ، دەتوانێـت هاوسـەری لەگـەڵ بکات چونکە خولع تەڵاق نییە)[٣].

٤- پێوانــەی هاوســەرگیری لەســەر فرۆشــتن چــونکە گرێبەســتێکە هــەڵگری هەڵوەشــانەوەیە وەك گرێبەســتی فرۆشــتن کــە بــە کــەنارگیرکردن هەڵدەوەشێتەوە)[٤].

**هەرکەسیش دەڵێت خولع تەڵاقی بائینە بەمانە بەڵگە دەهێنێتەوە:**

١- ئایەتی: ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ﴾ مانای حوکمی دووان دەگەیەنێت گەر دووانەکەی خست نەك لەسەر ڕووی خولع و گێڕانەوەیان لەگەڵ جێگیر بوو بە ئایـەتی: ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ﴾، پاشان حوکمی ئەو دووانەی باسکردووە گەر لەسەر ڕووی خولع بوون و لە هەڕەشە و موباحبوون تیایاندا جیابوونەوە(ڕۆشنبوونەوە)، هـەروەها ئـەو بارەی وەرگرتنی ماڵی تێدا دروستە لەگـەڵ ئـەو بـارەی وەرگـرتنی مـاڵی تێـدا دروست نییـە، پاشـان ئەمـەی عەتفکردۆتـەوە سـەر ئـەوە: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا...﴾

---

[١] (عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ أن إمرأة ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ اخْتَلَعَتْ مِنْ زَوْجِهَا عَلَى عَهْدِ النبي ﷺ فَأَمَرَهَا النبي ﷺ أن تَعْتَدَّ بِحَيْضَةٍ) ( البخاري:١١٠٦)

[٢] تفسير القرطبي ١٤٣/٣. أحكام القرآن للجصاص٩٤/٢. سبل السلام ٢٢٠/٣.

[٣] سبل السلام ٢٢٠/٣.

[٤] المبسوط للسرخسي ١٧١/٦.

عەتفکراو بۆ سەر دوانە پێشکەوتووە باسکراوەکە دەگەڕێتەوە، جارێك لەسەر ڕووی خولع و جارێکی تر لەسەر ڕووی خولع نە[1].

٢-لە عومەری کوڕی خەتاب و عەلی کوڕی ئەبی تالب و ئیبن مەسعودەوە-خوایان لێ ڕازی بێت- بە ڕاگیراوی لەسەر ئەوان و بەرزکراوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ریوایەتکراوە: ((خولع تەڵاقدانی یەك دانەیە))

٣-هاوسەرگیری پێوانە ناکرێت بۆ سەر هیچ گرێبەستێکی تر قابیلی هەڵوەشانەوە بێت، چونکە سروشتێکی تایبەتی هەیە و پەیوەستە بە ژیانی خێزانەوە، بۆیە گەر تەواو بوو هەڵوەشانەوە هەڵناگرێت.

## بەری جیاوازی:

١-تەڵاق یەکسەر و دەمودەست پەیوەندی هاوسەری کۆتا پێ ناهێنێت گەر تەڵاقەکە رجعی بوو، بەڵکو دوای کۆتاهێنانی عیدە دێتە بەرەوە، بە پێچەوانەی هەڵوەشانەوە ئەمەیان پەیوەندی هاوسەریی یەکسەر و دەمودەست کۆتا پێ دەهێنێت لە هەموو شێوەکانیدا.

٢-تەڵاق گرێبەستەکە لە بنەڕەتیدا بە ئەسەرێکی گەڕاوە هەڵناوەشێنێتەوە، بەڵکو ئەوە کۆتاهێنانە بە هاوسەری لە چرکەساتی کەوتنییەوە، بە پێچەوانەی هەڵوەشانەوە کە مافی سەرهەڵدراو لەسەری دان پیادا نانێت وەك دابەشکردنی مارەیییەکە پێش چوونە لا.

٣-کۆتاهێنانی پەیوەندی هاوسەری بە تەڵاق بۆ بوونی ناتەواوییەك لە هاوسەرگیریدا ناگەڕێتەوە بە پێچەوانەی هەڵوەشانەوە.

٤-عیدەی هەڵوەشانەوە تەنها یەك حەیزە لەلای هەندێ لە فەقیهان بە پێچەوانەی تەڵاقەوە[2].

---

[1] أحكام القرآن للجصاص ٢/٩٦.

[2] تفسير القرطبي ٣/١٤٤ـ ١٤پارسەنگدان:٥.

٥-هەڵوەشانەوە ژمارەی تەلاقەکان کەم ناکات هەرکەس دوای دوو تەلاقەکە خولعی لە ژنەکەی کرد بۆی هەیە بیگێڕێتەوە با مێردی بە پیاوێکی تریش نەکردبێت، بینا لەسەر ئەوەی خولع هەڵوەشانەوە بێت وەك پێشتر لە فتواکەی ئیبن عەباسدا ئەوەمان ڕۆشن کردەوە.

## پارسەنگدان:

قسەی پارسەنگرلو ئەوەیە جمهووری فەقیهان بۆی دەچن لەوەی خولع تەلاقی بائینە، بەم جۆرە:

١-فیداکردن پێویست دەکات تەلاقەکە بائین بێت، چونکە راستەقینەی فیداکردن لە ئایەتی: ﴿فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ بریتییە لە دلوای جێبەجێکردن و کۆتاپێهێنان، وەك فیدیەدانی دیل بە بریتییەك، گەر تەلاقەکە رجعی بوایە ئەوا پێویستی دەکرد گوزارەی فیدیە لە حەقیقەتی خۆی لابدەین بەبێ پێویست بوون، ئەوەش بە ڕێکەوتنی هەمووان دروست نییە.

٢-پاڵنەری هاندەر بۆ رەوایەتی خولع بەزۆری بریتییە لە هەلگرتنی نشوزی راستبووەوە لە پیاوەکەوە یان لە ژنەکەوە یان لە هەردووکیانەوە، و ترسان لە کەمتەرخەمی بەرانبەر راستکردنەوە و پاراستنی سنوورەکانی خودا، ئەمەش ناتوانرێت دەستەبەر بکرێت مەگەر بە دانانی خولع بە تەلاقی بائین، دەرگاکە بە ڕووی پیاوەکەدا دادەخات لە گێڕانەوە و جارێکی تر چوونەوە ناو دۆزەخی تەنگەژە و دژوارییەکان.

٣-هەڵوەشانەوە یان مانای هەڵوەشانەوەی گرێبەستەکەی هەیە و گەڕانەوەی هەردوو لایەنەکەیە بۆ ئەوەی پێشتر لەسەری بوون بەهۆی راستبوونەوەی ناتەواوییەك تیایدا، بۆیە ئەوە بۆ هاوسەرییەك نابێت تەواو بووبێت و پایە و مەرجەکانی فەراهەم بووبن.

یان مەبەستی پێی کەناردانە بە گێڕانەوەی ئەو شتەی هەریەك لە دوو لایەنەکە دەستی بەسەرداگرتووە بۆ ئەویتریان گێڕانەوەیەك خاڵی بێت لە زیادە و ناتەواوی، ئەمە هیچ کەس لە فەقیهان تایبەت بە خولع بەمەرجی نەگرتووە.

٤-ئەو قسەی گەر خولع تەلاق بێت پێویست دەکات تەلاقەکان چوار بن رەدکراوەیە، چونکە مەبەست لە ئایەتی: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ﴾ ئەو تەلاقەیە کە بەدوایدا بۆ پیاوەکە حەلاڵە ژنەکەی بگێڕێتەوە لە بارێکدا تەلاق رجعی بێت، یان بە گرێبەستێکی نوێ لە بارێکدا تەلاقەکە بائین بێت، تەلاقی سێیەم واتە بۆ جاری سێیەم لەم ئایەتە وەرگیراوە: ﴿أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ واتە: یان تەلاقدانیان بەچاکە، ئایەتی: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ بۆ سێ تەلاقەکە دەگەڕێتەوە، واتە تەلاق لە هەر جارەکەیدا، وەك چۆن بەبێ بەرامبەر دروستە هەر بەو جۆرە بە بەرانبەر و بریتیش دروستە، ئەمە پێی دەوترێت خولع، ئایەتی: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ﴾[1] رۆشنکردنەوەی سێ تەلاقەکەیە لە جاری سێیەمدا، هەڵەیە بوترێت تەلاقی سێیەم لەم ئایەتەوە وەردەگیرێت وەك لە خولعدا.

**هەڵوێستی یاسا لە خولع:**

یاسای باری کەسێتی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان دانیان بە رەوایەتی خولعدا ناوە وەك دەستبردن بۆ ئەوەی لە شەریعەتی ئیسلامدا بڕیاری لەسەر دراوە لەگەڵ جیاوازی لە هەندێ درێژەپێداندا، بەم جۆرە:

[1] (فَإِن طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا أَن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) (البقرة:٢٣٠).

**یاسـای عێراقـی:** یاسـادانەری عێراقـی هەنـدێ لـە حوکمـەکانی خـولعی ڕۆشنکردۆتەوە لە مادەی(٤٦) لە یاسای باری کەسێتی راستکراوە لەژێر ناونیشانی (جیاکردنەوەی هەڵبژاردەیی) لەم بڕگانەدا:

١–خولع لابردنی کۆتوبەندی هاوسەرگیرییە بە گوزارەی خولع یان ئەوەی لە مانای خولعدایە، بە ئەرێکردن و قبوولّ کـردن لەبـەردەم قازیـدا دادەمـەزرێت، لەگـەڵ ڕەچاوکردنی مادەی (٣٩)ی ئەم یاسایەدا[1].

٢–بۆ دروستی خولع بەمەرج دەگیرێت: مێردەکە لێوەشاوە بێت بۆ خستنی تـەڵاق و ژنەکەش لێوەشاوە بێت بۆ جێگەی ئەو تەڵاق خستنە، خولع بە تەڵاقی بائین دەکەوێت.

٣–بۆ مێردەکە هەیـە ژنـەی خولـع بکـات لەسـەر بڕێتییـەك زۆرتـر یـان کـەمتر لـە مارەییەکەی.

لـەم یاسـایەوە وا دەردەکـەوێت رایەکـەی حەسـەنی بەصـری و ئـیبن سـیرین و سەعیدی کوڕی جوبەیری وەرگرتووە لەوەدا کە خولـع پێویسـتە لـە بـەردەم قازیـدا بێت، بەڵام ئەوەی نەکردووە بە مەرج بۆ راستێتی خولعەکە.

یاسادانەری عێراقی رای جمهووری وەرگرتووە لەوەدا کە خولع تەڵاقی بائینـە، و شوێنی مەزهەبی زاهیری کەوتووە لەوەدا کە بڕیتی خولع سنوورێکی دیـاریکراوی بـۆ نییە، لە هەردوو هەڵبژاردنەکەدا کارێکی باشی ئەنجامداوە.

---

[1] نص المادة (٣٩):

١ـ هەر کەسە تەڵاقی دەوێت پێویستە لەسەری لە دادگای شەرعی داوایەك راستبکاتەوە و داوای خستنی تەڵاقەکەی بکات و بڕیاری بۆ بەدەستبهێنێت، گەر نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ دادگا پێویستە لەسەر تەڵاقەکە لە دادگا تۆماربکات لە ماوەی عیدەکەدا.

٢ـ بەڵگەی هاوسەریی بەهەندوەردەگیرێت تا کاتی پووچکردنەوەی لە دادگا.

**میسری:** شتێك لە حوكمەكانی خولعی نەهێناوە جگە لەوەی لە مادەی(٥)دا[1] هاتووە لەوەی تەڵاق لەسەر ماڵێك تەڵاقی بائینە.

**سوری:** یاسادانەری سوری چارەسەری هەندێ لە حوكمەكانی خولعی كردووە لە مادەكانی(٩٥-١٠٠)دا، بۆیە لە ئافرەتی خۆخولعكەردا تەمەنی پێگەیینی بەمەرج گرتووە(م٩٥)، مافی پەشیمانبوونەوەی بۆ هەردوو لایەكە دانپیادا ناوە بەر لە قبووڵ كردنی ئەویتریان(م٩٦)، ئەوەی ڕۆشن كردۆتەوە هەر شتێك پابەندبوونی دروست بێت لەرووی شەرعەوە دروستە ببێتە بریتی خولع(م٩٧)، ڕێگەی بە خولع داوە لەسەر مارەیی و شتی تر و دابەزین لە ماف(م٩٨)، ئەو ڕایەی وەرگرتووە كە دەڵێت تەڵاقی رجعی دەكەوێت لەباری خاڵیبوونی خولع لە بریتی(م١٠٠).

**تونسی:** یاسادانەری تونسی تەڵاقی بۆ دوو بەش دابەش كردووە: تەڵاقی قەزلییانە ئەوەش ئەوەیە تەنها لەبەردەم قەزادا و بە بوونی پاساو دەخرێت، لەگەڵ تەڵاقی ڕازیمەندانە كە بە ڕێكەوتنی هەردوو لایەنەكە ئەنجام دەدرێت(الفصل٣١)، سروشتی ئەو ڕێكەوتنە و ڕۆشنكردنەوەی حوكمەكانی دیارینەكردووە، بەڵام ئەوەی تێبینی دەكرێت لەسەری ئەوەیە نەكەوتنی تەڵاقی ڕاگەیاندووە گەر لە دادگا ئەنجام نەدرێت و بە سەرپەرشتیاری قازی نەبێت، ئەم مەرجە هەرچەند هەندێ لە فەقیهان تایبەت بە خولع وتویانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لە ئیسلامدا تایبەت بە تەڵاقی بێبەرانبەر نەهاتووە.

**مەغریبی:** بۆ دوو هاوسەرەكە هەیە ڕەزامەندی نیشان بدەن لەسەر تەڵاق بە خولع(الفصل ٦١)

ئافرەتی پێگەیوو خۆی خولع دەكات، ئەوانەش لەخوار تەمەنی پێگەیشتووی یاساییەوەن گەر خولع بكرێن تەڵاقەكە دەكەوێت و ژنەكە پابەند نابێت بە پێدانی بریتی خولعەوە مەگەر بە ڕازیبوونی سەرپەرشتیاری ماڵەكەی(الفصل ٦٢)

---

[1] القانون رقم (٢٥) لسنة ١٩٢٩ المعدل بالقانون رقم (٤٤) لسنة ١٩٧٩.

ئەوەی مێردەکە شایستەیەتی لە خولعکردنەکەوە بەمەرج دەگیرێت خولعی ژنەکە هەڵبژاردنێك بێت لە ئەوەوە(لە ژنەکەوە) بۆ جیابوونەوە لە مێردەکە بەبێ زۆرلێکردن و بەبێ زیان(الفصل ٦٣)

هەموو ئەوەی پابەندبوونی لەرووی شەرعەوە دروستە کردنی بە بریتی خولع دروستە(الفصل ٦٤)

خولع بە شتێك کە مافی منداڵەکانی پێوە پەیوەستە دروست نییە گەر ئافرەتەکە نەدار بوو(الفصل ٦٥).

**جەزائیری:** گەر ناکۆکی لە نێوان دوو هاوسەرەکەدا توندبوویەوە(پەرەیسەند) و زیان لە مێردەکەوە نەسەلما پێویستە دوو دادوەر دیاریبکرێن بۆ ئەوەی لە نێوانیاندا سولْح بکەن و پێکیانبهێننەوە، بۆ ژنەکە هەیە لەو بارەدا خولع بخاتە روو، بۆ دوو دادوەرەکە هەیە راپۆرتێك لە دوو تۆمەتبارەکەوە لە ماوەی دوو مانگدا پێشکەش بکەن(م٤٦).

**ئوردەنی:** یاسای ئوردەنی لە هەموو یاساکانی تر زیاتر و زۆرتر دەستی بۆ حوکمەکانی خولع بردووە و رۆشنی کردوونەتەوە، لە مادەکانی(١٠٢-١١٢) بەم جۆرە:

بۆ دروستی خۆخولعکەر بە مەرج دەگیرێت پیاوەکە لێوەشاوە بێت بۆ خستنی تەلاق و ژنەکەش لێوەشاوە بێت بۆ ئەوەی ببێتە جێگەی تەلاق(م١٠٢/أ)، ئەو ئافرەتەی نەگەیشتووەتە تەمەنی پێگەیین گەر خولع کرا پابەند نابێت بە بریتی خولعەکە مەگەر بە رازیبوونی سەرپەرشتیاری ماڵەکەی، (م١٠٢/ب) گەر بریتییەکە پووچ بوویەوە تەڵاقەکە بە رجعی دەکەوێت، بەرانبەر ئەو تەڵاقە بۆ مێردەکە بریتی لەسەر رێکەوتوو لەسەر ژنەکە پێویست نابێت(م١٠٢/ج)

لە خۆخولعکردندا بۆ هەریەك لە دوو لایەنەکە هەیە لە ئەرێکردنەکەی پەشیمان ببێتەوە بەرلە لە قبووڵ کردنی ئەویتر(م١٠٣)

**بریتی خولع:**

هەموو ئەوەی پابەندبوونی لەرووی شەرعەوە دروستە گونجاوە بکرێتە بریتی لە خولعدا(م١٠٤)

**خۆخولعکردن لەسەر مارەیی و شتی تریش دروستە:**

گەر خۆخولعکردنەکە لەسەرماڵێك بوو جیا لە مارەیی پێویستە جێبەجێ بکرێت، ئەستۆی دوو خولعکارەکە لە هەر مافێك پەیوەستە بە مارەیی و خەرجی هاوسەرییەوە پاك دەبێتەوە(م١٠٥)

**ناونەهێنان لە خۆخولعکردندا:**

گەر دوو خۆخولعکارەکە ناوی شتێکیان نەهێنا لە کاتی خۆخولعکردنەکەدا هەریەکەیان لە ماف ئەویتریان پەیوەست بە مارەیی و خەرجی هاوسەری بەرییە(م١٠٦)

**لەباری نەرێکردنی بریتیدا:**

گەر دوو خۆخولعکارەکە راشکاوانە نەرێی بریتیان کرد خولعکردنەکە لە حوکمی تەڵاقی رووتدایە و تەڵاقێکی رجعی پێ دەکەوێت(م١٠٧)

**خەرجی عیدە لە خولعکاریدا بەرنابێتەوە مەگەر بە بوونی دەقێك لەسەری:**

خەرجی عیدە بەرنابێتەوە مەگەر بە دەقێکی راشکاوانە لەسەری لە گرێبەستی خولعکردنەکەدا(م١٠٨)

**گەڕاندنەوەی بریتی خولع لەلایەن پیاوەکەوە بۆ سەر ژنەکە:**

گەر لە خۆخولعکردنەکەدا بەخشینی مێردەکە لە کرێی شیردانی منداڵەکەی تێدا بوو یان بەخێوکردنی یان بەمەرجگرتنی گرتنەخۆی منداڵەکە بەبێ کرێ بۆ ماوەیەکی دیاریکراو یان خەرجکردنی ژنەکە لەسەر پیاوەکە، دواتر ژنەکە مێردی کرد و منداڵەکەی بەجێهێڵا یان ژنەکە مرد: پیاوەکە بە ئەندازەی کرێی شیردانی منداڵەکە و بەخێوکردن و خەرجیکردنی لەو ماوەی ماوەتەوە بۆ ژنەکەی دەگێڕێتەوە، بەڵام گەر

منداڵەکە مرد بۆ باوکەکە نییە شتێك لەوە بۆ ژنەکە بگێڕێتەوە لەو ماوەی دەکەوێتە دوای مردنەکەوە(م١٠٩)

گەر دایکە خۆخولعکەرەکە نەدار بوو لە کاتی خۆخولعکردندا یان دواتر نەداری رووی لێ کرد باوکەکە ناچار دەکرێت خەرجی منداڵەکە بکات و ببێتە قەرزێك بۆی لەسەر دایکەکە(م١١٠)

گەر پیاوەکە لە خۆخولعکردنەکەدا گرتنەخۆی منداڵەکەی لە ماوەی بەخێوکردندا بەمەرج گرت خۆخولعکردنەکە دروستە و مەرجەکە پووچ دەبێتەوە، و بۆ بەخێوکەرە شەرعییەکەی هەیە لێی وەربگرێتەوە، و باوکی تەنها پابەند دەبێت بە خەرجیکردنی منداڵەکەوە گەر منداڵەکە هەژار بوو(م١١١)

## خەرجی منداڵی بچووك لە قەرز نابڕێتەوە:

خەرجی منداڵە شایستەکە لەسەر باوکی و قەرزەکەی باوکی لەسەر بەخێوکەرەکەی پێکەوە حساب ناکرێن(م١١٢)

لە دەقی ئەم یاسا باسکراوانەوە و بەراورد پێکردنیان بە رای فەقیهانی شەریعەت رۆشن دەبێتەوە: یاسادانەر لە وڵاتە عەرەبییەکان پابەندنەبووە بە مەزهەبێکی دیاریکراو لە مەزهەبە فیقهییە ئیسلامییەکان، ئەم ئاراستەیە ئاراستەیەکی دروستە لەبەر نەبوونی دەقێك لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) ئاماژە بکات بە پابەندبوون بە مەزهەبێکی دیاریکراوەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو مەزهەبانە لێکدانەوەی فیقهین بۆ دەقەکانی شەریعەتی ئیسلام و حوکمە شەرعییە سەرچاوەگرتووەکان لە یەك بنەڕەتەوە کە بریتییە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری مەزن(ﷺ).

# بەشی شەشەم:
# رادەی دەسەلاتی ویست
# لە جیاکردنەوەی قەزاییانەدا

لە خستنەرووی ئەم بابەتە ترسناکە هەوڵمداوە رێچکەیەکی نوێ بگرمە بەر، گەر پێکابێتم لە خوداوەیە و حەمد و شوکر بۆ ئەوە، گەر بەهەڵەداچوویم لە منەوەیە و داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەم و ئەو غەفور و رەحیمە.

**ئەوەی پاڵینام بۆ ئەم هەڵبژاردەیە ئەم خاڵانە بوون:**

١-هەموو ئەو هۆیانەی لێکۆڵینەوەم لێکردوون لەو کاتەوەی قوتابخانە و مەزهەبە فقهییەکان سەریانهەڵداوە و دواتر وەك پاساو بۆ جیابوونەوە لێکۆڵینەوەیان لەمەڕ دەکرێت، هەرهەموویان بۆ تەنها یەك هۆ دەگەڕێنەوە، ئەویش بریتییە لە "زیان".

٢-خستنەڕووی جیاوازییە فیقهییەکان و گفتوگۆ لەسەر ئەوەی کۆن و نوێ وتراوە و ئامارکردنی هۆ پاساودەرەکان لە دیدگای هەر فەقیهێکەوە و جیاکردنەوەی ئەوەی داوای جیابوونەوەی پێ موباح دەبێت لەوەی رێگە بە داوای جیابوونەوە نادرێت.. بەرزکردنەوەی هەموو ئەوانە بۆ قەزا لە جیهانی ئیسلامیدا خزمەتێکی کرداری لێوە بەرهەم نایەت و دەبێتە هۆی زیادکردنی کەلەبەری جیاوازییەکان لەناو یاسا دانراوەکانی وەرگیراو لە فیقهی ئیسلامی.

٣-بزربوونی پێوەرێکی ورد بۆ دیاریکردنی ئەوەی بە "هۆ" دادەنرێت و ئەوەی بە "هۆ" دانانرێت، ئەوەش وای لە یاسادانەرانی وڵاتە ئیسلامییەکان کردووە رێگەی راستکردنەوەی بەردەوام و بەدوای یەکترداهاتوو لە یاسای باری کەسێتیدا بگرنە بەر و ناوبەناو لیستێکی نوێ لە هۆیەکانی جیابوونەوە پێشکەش بکەن وەك چۆن یاسادانەرێ عێراقی بەدرێژایی ساڵانی رابردوو ئەنجامیداوە.

٤-ئەوەی لەگەڵ رۆحی شەریعەتی ئیسلام پێکدێتەوە بریتییە لە باس و گەڕان بە دوای "زیان"دا و گەڕان بە دوای سەرچاوەکەی و وازهێنان لە هەژماردنی هۆیەکان لەبەر بێمانایی لەو کارەدا تا ژیان لە گەشە و گوڕاندا بێت، و گرفتە ئاڵۆزەکان و نەخۆشییە زیانبەخشەکان لە نوێبوونەوەدا بن.

٥-پێوەری ورد بۆ بەهەندوەرگرتنی هەر هۆیەك وەك پاساو بۆ جیابوونەوە ئەوەیە سەرچاوەی زیانێك بێت بێتە مایەی تێکدانی پاکی و بێگەردی ژیانی هاوسەری، بە جۆرێك دوو هاوسەرەکە و دوو دادوەرەکە و قازی بگەنە ئەو باوەڕەی هیچ رێگەیەك نەماوەتەوە جگە لە جیابوونەوە.

٦-پاڵپشتی شەرعی کە بڕیار دەدات دەستبرێت بۆ بڕۆکەی زیان لە جیابوونەوەی قەزاییدا بریتییە لە قورئان لە زۆرێك لە ئایەتەکانیدا لەوانە: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾، هەروەها سوننەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەوانە: (نە زیان و نە زیانگەیاندن لە ئیسلامدا)[1]

٧-جیابوونەوە تەنها رێگەیەك نییە بۆ کۆتاهێنانی هەموو زیانێك، بۆیە پێویستە دەروازەی جیابوونەوە نەخرێتە سەر پشت لەلایەن یاسادانەرانی یاسای دانراوەوە، و رێگەنەدانی قەزا بە جیابوونەوە بە هۆگەلێك کە دەتوانرێت بە رێگەی تر رووبەڕوویان ببێتەوە.

---

[1] ابن ماجة: ٢٣٣٢

٨–بەهەندوەرنەگرتنی هۆ پاساودەرەکان بۆ جیابوونەوە بۆ قازی پابەندکەر نەبێت، بەڵکو پێویستە دەسەلاتێکی خەملاندنی رەها بە قازی بدرێت بۆ بەهەندوەرگرتنی جیابوونەوە وەك دوایین چارەسەرێك پەنای پێ دەگرێت، سوودوەربگرێت لە شارەزایی دووروودرێژی و لەبەر رۆشنایی بۆچوونی فەقیهە مەزنەکان و کۆمەك وەرگرتن لە هەوڵی چاکسازی دوو دادوەرەکە و لێکۆڵەری کۆمەلایەتی.

٩–بەدواداچوون و خوێندنەوەی تەولو دلوا دەکەن هۆ زیانبەخشە پاساودەرەکان بۆ جیابوونەوە دابەش بىن بۆ دوو بەش: "بەویست": وەك ناکۆکی و تەنگەژە و خەرجی نەکردن، "نەویست": وەك نەخۆشی و ناتەواوییەکان، هەریەك لەم دوانە یان تایبەتە بە یەکێك لە دوو هاوسەرەکە وەك نەبوونی پیاوەتی و لکان(رتق) لە ژناندا یان وەك شێتی.

هەڵقولاو لەم راستییەوە لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە لەرووی شێوەگرییەوە(لەرووی رووڵەتەوە) بەسەر سێ باسدا دابەش دەکەین، یەکەمیان نموونەگەلێك لە هۆ نەویستەکان، دووەم هەندێ لە هۆ بە ویستەکان، لەگەڵ رۆشنکردنەوەی ئەوەی پەیوەستە بەو هۆیانەوە لە جیاوازی لە مەرجەکان و ئاسارەکان بەپێی جیاوازی سروشتی هۆ، باسی سێیەم تایبەت دەکەم بە رۆشنکردنەوەی هەڵوێستی یاسا لە هەندێ لە ولاتە ئیسلامییەکان.

# باسی یەکەم:
# جیاکردنەوە بە زیانی نەویست

مەبەست بە زیانی نەویست ئەوەیە ویستی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە دەستی نییە لە دروستکردنی سەرچاوەکەیدا، نە راستەوخۆ نە بوونەهۆ، وەك ئەو زیانەی لە نەخۆشی و ناتەواوییەکان و نەخۆشییە بێزارکەرەکانەوە سەرهەڵدەدات.

فەقیهانی شەریعەت لە جیاکردنەوەدا بەهۆی زیانی نەویستەوە بۆ سێ قسە دابەش بوون:

(بەرەهایی دروست نییە، بەرەهایی دروستە، تەنها بۆ ژنەکە دروستە)

سەرچاوەی جیاوازییەکان نەبوونی دەقێکی راشکاوە بەڵگە بێت لەسەر دروستی جیابوونەوە بەهۆی زیانێکەوە کە سەرچاوەکەی ویست نەبێت.

هەرکەس لەسەر دروست نەبوونە دەستی بە نەبوونی دەقەوە گرتەوە، بەڵکو دەڵێت کۆمەڵێك دەق هەیە پشتیوانی لە بەردەوامی هاوسەرگیری و جیانەکردنەوە دەکەن.

ئەو کەسەش بەرەهایی بە دروستی دادەنێت خۆی پاڵپشت کردووە بە کۆمەڵێك رێسای شەرعی گشتی لەوانە: ((نە زیان و نە زیانگەیاندن لە ئیسلامدا)).

هەروەك چۆن ئاماژەی کردووە بە پێوانە لەسەر هەڵبژاردەی نەنگی لە فرۆشتندا، هەروەها بە قسەی هاوەڵان بینا لەسەر ئەوەی بەڵگەیە.

هەرکەس جیاوازی کردووە لە نێوان مێر و ژندا دەڵێت: جیاکردنەوە هەڵواردنە لە رێسای کۆتاپێهێنانی هاوسەریی مەگەر بە مردن یان تەڵاق، هەڵواردنیش بۆ زەروورەتە و زەروورەتەکانیش بە ئەندازەی خۆیان ئەندازەگیرییان بۆ دەکرێت، تا مێردەکە دەسەڵاتی تەڵاقی لەدەستدا بێت تایبەت بە ئەو پێویست نییە.

**قسەی یەکەم -رێگری بەرەهایی:**

هیچ یەکێك لە دوو هاوسەرەکە مافی ئەوەی نییە داوای جیابوونەوەی قەزلییانە بکات بە بەڵگەی سەرهەڵدانی زیان و بۆ قازیش دروست نییە وەڵامی ئەو داوایە بداتەوە.

فەقیهانی زاهیری[1] و هەندێ لە زەیدییەکان ئەم ئاراستەیان گرتۆتە بەر.

بە چەندین بەڵگە بەڵگەیان هێناوەتەوە گرنگترینیان ئەمانەن:

١-ئایەتی: ﴿لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا﴾[2]، زیانی نەویست لە توانای مرۆڤ بەدەرە و ناچێتە ژێر دەسەڵاتی ویست و هەڵبژاردنیەوە، بۆیە بەپێی ئەم ئایەتە لەسەری دادگایی ناکرێت.

٢-هاوسەرگیری دروست بە کتێبەکەی خودا و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) دادەمەزرێت، و حوکمی ئەم ئایەتەی بەسەردا گوزەر دەکات: ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ﴾[3].

---

[1] قال ابن حزم (المحلى ١٠/٥٨): (هەرکەس ژنێکی هێنا و نەیتوانی جارێك یان چەند جارێك بچێتە لای یان هەر نەچووە لای بۆ دادوەر و کەسانی تر نییە لە یەکتریان جیابکاتەوە)، هەروەها لە هەمان سەرچاوەدا (١٠/١٠٩): دەڵێت: (بە رووداوی گولی و پەڵە و شێتی یان بە شتێك لەم نەنگیانە لە ژنەکەدا یان لە پیاوەکەدا، هەر بەو جۆرە بە نەبوونی پیاوەتی و نەخۆشی داوێنی ژن و شتێك لەم نەنگیانە هاوسەری هەڵناوەشێتەوە لەدوای دروست دامەزرانی)

[2] (لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلا تُحَمِّلْنَا مَا لا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ) (البقرة:٢٨٦).

[3] (وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُوا الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنْزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلا تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلا يَنْفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلاقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا بِهِ أَنْفُسَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ) (البقرة:١٠٢).

٣-نەبوونی پێشەنگێکی قەزاییانە لە پێغەمبەری خودلوە(ﷺ) لەگەڵ خستنەرووی چەند نموونەیەك وەك ئەم پرسانە بەسەریدا لەوانە بابەتی ژنەکەی "عبد الرحمن بن الزبیر" کە تووشی نەخۆشی نەمانی پیاوەتی بووبوو لەگەڵ ئەوەش لەیەکتری جیانەکرینەوە[1].

٤-لە زەروورەتە ئاینییەکان ئەوەیە هاوسەگیری دروست تەنها بە تەڵاق یان بە مردن کۆتایی پێ بێت، بۆیە دەقێکی رۆشن لەسەر دروستی کۆتاهێنانی پەیوەندی ژن و مێردی جگە لەو دوو رێگەیە بوونی نییە.

## گفتوگۆ لەسەر ئەم بەڵگانە:

١-ئایەتی:﴿لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا﴾ بەڵگەیە لەسەریان نەك بەڵگە بێت بۆیان، چونکە خودا داوا ناکات لە یەکێك لە دوو هاوسەرە زیان پێگەیشتووەکە لە هاوسەرەکەی ترەوە لەسەر زیانێك ئارامبگرێت کە بەردەوامی ژیانی هاوسەری لەگەڵی بەردەوام نابێت.

٢-جیاکردنەوە بەهۆی زیانەوە کارکردنە بە قورئان و فەرموودە، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾[2]، پێغەمبەری خوداش

---

[1] پوختەی بابەتەکە: ژنەکەی "عبدالرحمن" کە لەدوای ئەوەی "رفاعة" تەڵاقیدا هاوسەرگیری لەگەڵ کرد، ژنەکە بە پێغەمبەری وت: ئەوەی پیاوەکەی وەك ئەم پەرۆیە نەرم و شلە، پارچەیە لە پەرۆی جلبابەکەی بەرزکردەوە و ئاماژەی پێدا، پێغەمبەر(ﷺ) بزەیەك کەوتە سەر لێوی موبارەکی و فەرمووی: لەوانەیە بتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ لای "رفاعة"؟ نابێت، تا تۆ لە هەنگوینەکەی ئەو نەچێژی و ئەویش لە هەنگوینەکەی تۆ نەچێژێت، ئەم قسەیە ئاماژەیە بە چوونە لا. ابن حزم (١٠/٥٨، ١٠٩) دەڵێت: (ئەو ئافرەتە سکاڵای لای پێغەمبەری خوا کرد و ویستی لێی جیابێتەوە، بەڵام سکاڵاکەی لێ وەرنەگرت و کاتی بۆ دانەنا و لێکی جیانەکردنەوە).

[2] ﴿وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِنْ قَبْلُ وَفِي هَذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيداً عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ هُوَ مَوْلَاكُمْ فَنِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ﴾ (الحج:٧٨).

دەفەرموێت: ((نە زیان و نە زیانگەیاندن لە ئیسلامدا))، هەروەها ئایەتی: ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ﴾، ئەو ئایەتە تایبەت بە جیابوونەوەی ژن و مێرد هاتووە لە ڕێگەی فاڵچێتی و سیحرەوە.

٣-ژنەکەی "عبدالرحمن بن الزبیر" داوای جیابوونەوەی نەکرد ئەگینا پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری لە بەرژەوەندی ئەو دەردەکرد، چونکە لابردنی زیان و هەڵگرتنی ستەم ئەرکی پێغەمبەرە(ﷺ) ، پرسیارەکەی دەربارەی حوکمی گەڕانەوەی بوو بۆ لای مێردەکەی یەکەمجاری گەر "عبدالرحمن" تەڵاقیدا، ئەوەش بە ئامازەی فەرموودەکە: ((نا، تا تۆ لە هەنگوینەکەی ئەو چێژ وەردەگری و ئەویش لە هەنگوینەکەی تۆ چێژ وەردەگرێت))[1]، واتە دەچنە لای یەکتر.

٤-ئەو "إستصحاب"ەی کردوویانەتە پاڵپشت بۆ خۆیان لەگەڵ دەقی: ((نە زیان و نە زیانگەیاندن)) و هاوشێوەکانی بەرهەڵستی دەکات، هەروەها لە ڕێسا ئوسوڵییەکان ئەوەیە: "إستصحاب" تەنها لەباری نەبوونی دەقدا کاری پێ دەکرێت، گەر لەگەڵی بەرهەڵستی کرد دەقەکە بەسەریدا پێش دەخرێت.

**قسەی دووەم -دروستی جیاکردنەوە بە زیانێکی نەویست:**

"جمهووری مالیکیەکان ، و شافیعیەکان ، و حەنبەلیەکان ، و جەعفەریەکان ، وجمهووری زەیدیەکان ، و ئیباضیەکان " بۆ ئەوە دەچن جیابوونەوەی قەزاییانە دروستە بەهۆی زیانێکەوە سەریهەڵدابێت لە نەخۆشی و نەنگییەکی نەویستەوە لەگەڵ جیاوازیان لەم درێژەپێدانەدا:

**مالیکییەکان:**

نەخۆشییەکان و نەنگیە پاساودەرەکان بۆ جیابوونەوە لەلایان سنووردارکراوە، هەیانە هاوبەشە لە نێوانیاندا وەك گولی و روخسار پەڵەوی، هەیانە تایبەتە بە

[1] البخاري: ٥٣٤٦

مێردەکە وەك نەبوونی پیاوەتی[1]، هەشیانە تایبەتە بە ژنەکە وەك لکان و داخران(الرتق والقرن)[2].

ئەوان سەرەڕای وەرگرتنی بیرۆکەی دیاریکردنی هۆیەکان، بە مەرجیان داناوە ئەمانەی تێدابێت:

١- هۆیەکە بونی هەبێت لەکاتی بەستنی گرێبەستەکەدا، جا هۆیە کاتیەکانی دوای هاوسەرگیری - جگە لە وەك گولی دیار و روخسار پەڵاوی زیانبەخش - بیانو نین بۆ جیاکردنەوە[3].

٢- لای تەندروست ئاگادار نەبێت بە هۆیەکە بەر لە گرێبەستەکە یان رازی بێت پێی دوای گرێبەستەکە، گەر بە ناتەواوییەکەی زانی و پێیی رازی بوو بە گوفتار یان بە کردار ئەوا مافی ئەوەی نییە داوای جیابوونەوە بکات.

٣- جیابوونەوە دوابخرێت بۆ ماوەی ساڵێك لە بەرواری داواکردنییەوە لە هەر نەخۆشییەکدا هیوای چاکبوونەوەی لێ دەکرێت.

دوای هاتنەدی ئەم مەرجانە بۆ مالیکییەکان دوو قسە هەیە:

یەکەمیان قازی تەڵاقی دەدات بە نوێنەری پیاوەکە گەر نەیویست تەڵاقی بدات، دووەمیان قازی فەرمان بە ژنەکە دەکات خۆی تەڵاق بدات پاشان قازی حوکمی پێ دەریکات، جیابوونەوە لەسەر هەردوو قسەکە تەڵاقی بائینە[4].

---

[1] نەبوونی پیاوەتی: نەبوونی توانای جووتبوونە بەهۆی لاوازییەکەوە یان پیرییەوە یان نەخۆشییەوە.

[2] داخران(القرن) رژێنێکە لەناو ئەندامی زاوزێی ئافرەتدا رێگرە لە پەیوەندی جووتبوون، داخران(الرتق) بریتییە لە داخران و هاتنەوەیەکی ئەندامی زاوزێی ژنەکە و رێگر دەبێت لە پەیوەندی جووتبوون.

[3] جاء في شرح الخرشي (٣/٢٣٥): (العيب الذي يوجب الخيار لأحد الزوجين على صاحبه شرطه أن يكون موجودا عند العقد أو قبله.فالطاريء بعده لا يوجب الخيار الا ما استثني).

[4] الدسوقي على الشرح الكبير ٢/٢٣٧.

**شافیعییەکان:**

فەقیهانی شافیعی دەستیان بۆ هۆیەکان بردووە و لای ئەوان حەوتن: (هەیانە هاوبەشن) وەك شێتی و گولی و بەڵەك، هەیانە تایبەتە بە پیاوەکە وەك نەمانی پیاوەتی و نەمانی ئەندامی کاری جووتبوون(الجب[1])، هەیانە تایبەتن بە ژنەکە وەك لکان و داخران، بۆ جیابوونەوە ئەم خالانەیان بەمەرج گرتووە:

١-داوای جیابوونەوەکە راستەوخۆ دوای ئاگاهی بە نەنگییەکە بێت، هەموو دواکەوتنێك بەبێ پاساو مافەکە بەردەداتەوە پێوانە بۆ سەر هەڵبژاردەی نەنگی لە فرۆشتندا.

٢-جیاکردنەوە بە نەبوونی پیاوەتی لەدوای دواخستنی بۆ ماوەی ساڵێك لە بەرواری داواکەوە بێت..

٣-جێگیربوونی ئەو هۆیەی داواکەی پێکراوە لەلای قازی.

٤-نەمانی پیاوەتی رووداوێك نەبووبێت دوای چوونە لا ئەگینا داوای جیابوونەوە پاساو نادات.

٥-هەردووکیان شێت نەبن، چونکە جیابوونەوە لەسەر داوای یەکێك لە دوو هاوسەرەکەیە، شێت لێوەشاوەیی بەرزکردنەوەی داوای بۆ نییە.

دوای هاتنەدی ئەم مەرجانە قازی جیاکردنەوەکە لەئەستۆ دەگرێت، گەر نەبینرایەوە دەدرێتە دەستی حەکەم ئەگینا ژنەکە مافی هەڵوەشانەوەی هەیە بەهۆی زیانەوە، ئەو کاتە جیابوونەوەکە بریتییە لە هەڵوەشانەوە[2].

---

[1] واتە ئەندامی زاوزێی پیاوەکە برابێت.

[2] المهذب ٤٨/٢. الشرقاوي ٢٢٥٢. نهاية المحتاج ٣٠٢/٦.

**حەنبەلییەکان:**

لە جیاکردنەوەی ژن و مێردەکە لە یەکتری بەهۆی نەخۆشییەکانی ئەندامی زاوزێوە ڕێگر لە ئەنجامدانی هاوسەری جیاوازی لە نێوانیاندا نییە، بەڵام گەر ڕێگرەکە لە هەردوولاوە بوونی هەبوو، وەك ئەوەی مێردەکە پیاوەتی نەبێت و ژنەکەش لکاو(رتقاء) بێت، لە یەکێك لە دوو قسەیاندا لەیەکتر جیاناکرێنەوە[1].

هۆیەکانی تریش جیاوازیان لە نێواندا نییە بۆ جیاکردنەوەی ژن و مێردەکە وەك شێتی و گولی و بەڵەك.

جگە لەم سیانە لە هۆیەکانی تر دوو ڕایان هەیە تیایاندا: یەکەمیان کە هەڵبژاردەی "ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیم"ە مافی داوای جیابوونەوە جێگیر دەکات بە هەر نەخۆشییەك یان بە هەر بەرهەڵستکارێك زیان بە لای بەرانبەر بگەیەنێت بەبێ دیاریکردن[2].

## مەرجەکانی جیاکردنەوە بە نەخۆشی و عیللەت لای حەنبەلییەکان ئەمانەن:

١-لە کاتی گرێبەستەکەدا هۆیەکە بوونی هەبوبێت و لای سەلامەت و تەندروست پێی نەزانیبێت، گەر دواتر هۆیەکە ڕوویدابوو دوو قسەیان هەیە: یەکێکیان جیاکردنەوە بە دروست نابینێت.

٢-لە جیاکردنەوە بەهۆی پەککەوتنی هێزی جووتبوونەوە پێویستە بۆ ماوەی ساڵێك لە بەرزکردنەوەی داواکەوە دوابخرێت .

---

[1] المحرر ٢/٢٤.

[2] زاد المعاد (٣١/٤) وفيه: (پێوانە ئەوەیە هەر نەنگییەك هاوسەرەکەی تر لێی بێزار دەبێت و مەبەستی هاوسەرگیری پێ نایەتە جێ لە سۆز و خۆشەویستی هەڵبژاردەی بۆ هەیە، خودا هەرگیز کەسی زیانپێگەیشتوو و ستەملێکراو پابەند و ناچار ناکات بەو زیان و ستەمەوە ڕووبەڕووی بووەتەوە، هەر کەس تێڕامان بکات بۆ سەرچاوەکانی شەریعەت و دادپەروەری و حیکمەت و ئەوەی لەخۆی دەگرێت لە بەرژەوەندی ئەم قسەیەی لێ شاراوە نییە و نزیکی لە ڕێساکانی شەریعەتەوە هەست پێ دەکات).

٣-بەرزکردنـەوەی داوا لـە زیانپێگەیشـتووەکەوە و قەناعـەتی قـازی بـە بـوونی زیان[١].

**جەعفەرییەکان:**

فـەقیهانی جەعفـەری وەك جمهـوور نەنگییـە پاسـاودەرەکانیان بـۆ جیابوونـەوە دیـاریکردووە، "العـاملي" دەڵێـت: نەنگییـە رێگەپێـدەرەکان بـۆ هەڵوەشـانەوەی هاوسەرگیری لە پیاودا پێنجن: شێتی و خەسان و نـەبوونی ئـامێری زاوزێ و نـەمانی پیاوەتی و گولی.

نەنگییەکانی ژن نـۆن: شـێتی، گـولی، بەڵـەك، کوێری، شـەلەل، داخران(قـرن)، نەخۆشی رەحم و لکان(رتق) و بەرینبوون(والأبوونی ئەندامی زاوزێ).

لەم نەخۆشییانەدا فەراهەمبوونی ئەمانەیان بەمەرج گرتووە:

١-داواکە راستەوخۆ دوای ئاگاهی بە نەنگییەکە بێت ئەگینا ماف بەردەبێتەوە.

٢-گەر هۆیەکە نەمانی پیاوەتی بێت پێویستە لەناکاو و کوتـوپڕ لـەدوای چـوونە لای یەکتر سەریهەڵنەدابێت با چوونەلاکەش بۆ تـەنها یـەك جـار بێـت، لەگـەڵ ئەوەشدا پێویستە جیاکردنەوەکە بەو هۆیە بـۆ مـاوەی سـاڵێك دوابخرێـت لـە بەرواری بەرزکردنەوەی داواکەوە.

٣-لە نەنگی و نەخۆشییەکانی ژنەکەدا گەر دوای گرێبەستەکە هاتبێتـە پێشـەوە سێ قسەیان بۆ هەیە:

أ-بـەرەهایی هەڵبـژاردەی داوای جیابوونـەوەی بـۆ نییـە وەك دەسـتگرتن بـە ریشەداری گرێبەستەکەوە و هاوەڵێکردن و رۆیشتن لەگەڵ حوکمەکەی.

ب-بەرەهایی هەڵبژاردەی بۆ هەیە وەك کارکردن بە بەکارهێنانی هەندێك دەق.

ج-دوای چوونە لا بۆی نییە، بەڵام پێش چوونە لا مافی ئەوەی هەیە.

جیاکردنەوە لەلایان بە هەڵوەشانەوە دادەنرێت[١].

---

[١] منتهى الارادات ٢/١٨٨. الاقناع ٢/٧٨.

**زەیدییەکان:**

ئەوانیش لای سنووردارگرتنیان گرتوەتە بەر و دەڵێن: نەنگییە پاساودەرەکان بۆ دلوای جیابوونەوە یازدەن: (هەیانە هەردوو هاوسەرەکە تیایدا بەشدارن) وەك: شێتی، گولی، بەڵەك، لکان، داخران، نەبوونی ئارەزووی جووتبوون) سیانیان تایبەتن بە ژنەکە: وەك: لکان و داخران و نەخۆشی رەحمی ئافرەت، سیانیشیان تایبەتن بە پیاوەکە: وەك نەبوونی ئەندامی زاوزێ، و خەسان، و نەبوونی دوو هێلکە گونی پیاو، بەڵام جیاکردنەوە لە نەبوونی پیاوەتیدا جێگەی ناکۆکییە، هەیانە بە هۆی جیابوونەوەی دانانێت یەکسانە لەلای پێش چوونە لا یان دوای چوونە لا روویدابێت.

هەندێکیان رێگەی دیاریکردنی نەنگییەکان و نەخۆشییەکانیان گرتۆتە بەر، بەڵکو هەر شتێك زیان بە لای بەرانبەر بگەیەنێت پاساوە بۆ داوای تەڵاق وەك چۆن ئیبن تەیمییە و ئیبن قەیم هەمان بۆچوونیان هەیە[٢].

زەیدییەکان بۆ جیاکردنەوە بەو هۆ باسکراوانە ئەم خاڵانەیان بەمەرج گرتووە:

١- هۆیەکە دوای چوونە لا سەرییهەڵنەدابێت، بە هەڵواردنی شێتی و گولی و بەڵەکی، چونکە جیاوازی نییە لە نێوان و کۆن و نوێیدا بەهۆی ترسناکییەکەیەوە.

٢- لە کەسێك نەوەشابێتەوە مافی هەڵبژاردەی بۆ هەیە کە ئاماژە بە رازیبوون دەکات، بینا لەسەر ئەمە مافی داوای جیاکردنەوە پووچ دەبێتەوە بەم خاڵانە:

أ- گەر پێش گرێبەستەکە بە هۆیەکەی زانیبێت و بێدەنگ بووبێت.

ب- گەر لەدوای گرێبەستەکە پێی زانیبێت و پێی رازی بووبێت.

ج- گەر چوونە لا یان تەنهاکەوتنەوە لەگەڵ یەکتر روویدابێت، یان ژنەکە خۆی دابێتە دەستی پیاوەکەی دوای ئاگاهی بە نەنگی پیاوەکەی، بۆیە چوونە لا

---

(١) الروضة البهية ٢/١٣٦.

(٢) جاء في المنتزع المختار (٢/٢٣٩): ("القاضي حسين" دەڵێت: ئەوانە سنووردار نین، بەڵکو هەر رێگرێك لە ئارەزووی دەروون و شکانی حەزی مرۆڤ هاوسەرگیری پێ رەد دەکرێتەوە).

و تەنهاکەوتنەوە لەگەڵ یەکتر مافی پیاوەکە بەردەدەنەوە، هۆدانەدەستی پیاوەکەش مافی ژنەکە بەردەداتەوە.

٣-گەر هەردووکیان عەیبدار بوون، یەکسانە هەردوو نەنگییەکە هاوشێوە بن یان جیاواز لەیەکتر ئەوا بۆ هیچکامیان هەڵبژاردن نییە.

گەر ئەم مەرجانە فەراهەمبوون هاوسەرییەکە بە رازیبوونی هەردوو لا هەڵدەوەشێتەوە بەبێ پەنابردن بۆ قەزا گەر نەنگی پاساودەر بە جیاکردنەوە لە مەزهەبدا رێکەوتنی لەسەر بوو.

گەر بە رازیبوونی هەردوولایان جیاکردنەوەکە ئەنجام نەدرا یان هۆیەکە جیاوازی لەسەر بوو قازی حوکمی پێ دەکات.

جیاکردنەوە بە نەخۆشی یەکسانە بە رازیبوونی هەردوو لا بێت یان بە بڕیاری قەزا لەلایان هەڵوەشانەوەیە[1].

**ئیبازییەکان:**

فەقیهانی ئیبازی پێیانوایە مافی هەڵبژاردن بۆ هەریەك لە دوو هاوسەرەکە جێگیر دەبێت گەر لە هاوسەرەکەی تردا نەخۆشی زاوزێ یان نەخۆشی کوشندەی گوازراوە یان بێزارکەر بوونی هەبوو، ئەمانیش دەستیان بۆ دیاریکردن بووە وەك شێتی و گولی و نەبوونی ئەندامی زاوزێ و نەبوونی پیاوەتی، دەڵێن: جگە لەمانە جیاکردنەوە بە نەخۆشی تر دروست نییە.

لەگەڵ ئەو دیاریکردنەدا ئەم خاڵانەیان بەمەرج گرتووە:

١-هۆیەکە بەر لە گرێبەستەکە بوونی هەبووبێت، بەڵام ئەو هۆیانەی دواتر دێنە بەرەوە و دوای چوونەلایە دوو قسەیان لەسەری هەیە: یەکێکیان نابێتە پاساوی جیاکردنەوە.

[1] التاج المنهب ٦٦-٦٣/٢. المنتزع المختار ٢٣٩/٢.

٢-لایەکەی تر پێی رازی نەبێت لەدوای ئاگاهی پێی، بەلام دەمودەستی و یەکسەریان بەمەرج نەگرتووە، هەر بەو جۆرە بەمەرجیان نەگرتووە دلواکەری جیابوونەوە سەلامەت و تەندروست بێت لەو نەخۆشیانە.

دەڵێن: مافی دلوای جیاکردنەوە دوای شیفای نەخۆشەکە دەمێنێتەوە، چونکە تووشبوو بە نەخۆشی گوازراوە ئەگەری گەڕانەوەی نەخۆشییەکەی بۆ هەیە، هەر بەو جۆرە حوکمی قازییان بۆ جیاکردنەوە بەمەرج نەگرتووە[1].

جیابوونەوە لەلایان بریتییە لە هەڵوەشانەوە.

ئەم پوختەیە لە درێژەپێدانی جمهوور کە: بە نەخۆشی و عیللەت و واقیعی بێزارکەر و دەرد و ناتەواوی بەردەوام ژن و مێردی پێ جیادەکەنەوە.

## هەندێ تێبینی لەسەریان بوونی هەیە:

١-دەستبردن بۆ هەژمارکردن و کورتکردنەوەی دەرد و نەخۆشییەکان لە هەندێ جۆریان بەبێ ئەوانیتر بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ هۆی تەشریعکردنی جیاکردنەوە بەو هۆیانە کە بریتییە لە سڕینەوەی زیان، واپێویست بوو حوکمەکە لەگەڵ هۆیەکەیدا بەبوون و بە نەبوون بسوڕێتەوە، لە هەر شوێنێك زیانێکی لە توانابەدەر بوونی هەبوو بڕیار لە دروستی جیاکردنەوە بدرێت، بە چاوداخستن لە سەرچاوەی ئەو زیانە.

٢-دانانی رازیبوون بە نەنگی رۆژێك لە رۆژان یان دواکەوتن لە دلوای جیابوونەوە یان هۆیەکە کوتوپڕی بێت یان چوونە لا بەردەرەوەی مافی جیابوونەوە بێت، هەموو ئەمانە بەم ئایەتەدا دەکێشن: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾، هەروەها لەگەڵ کۆی فەموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((لا ضرر ولا ضرار-نە زیان و نە زیانگەیاندن)) پێکنایەنەوە، چونکە گوزارەی "حرج" رەهایە و هەموو بارەکان دەگرێتەوە، هەردوو گوزارەی "ضر و ضرار"یش نەناسراون لە میانەی نەرێدا هاتوون و مانای گشتی دەگەیەنن، رەهاش لەسەر رەهایی خۆی دەمێنێتەوە گەر ئاماژەیەك لەسەر

[1] شرح النيل وشفاء العليل ٣/٢٤٤-٢٤٩.

سنووردارکردنی راست نەبێتەوە، گشتیش کار بە گشتییەکەی دەکرێت گەر بەڵگەیەك لەسەر تایبەتکردنەکەی راست نەبێتەوە، هیچ ئاماژە و بەڵگەیەکیش بوونی نییە.

### قسەی سێیەم -مافی جیاکردنەوە بۆ عیللەت و نەخۆشی تەنها بۆ ژنەکە جێگیرکراوە:

### ئەوەش هەڵبژاردەی حەنەفییەکانە و دەڵێن:

مێرد تەڵاقی بەدەستە، بۆ ژنەکەش مافی داوای جیابوونەوە هەیە گەر پیاوەکەی بە دەردێك لە دەردەکانی زاوزێ گرفتار بوو، وەك نەبوونی پیاوەتی و نەبوونی ئامێری زاوزێ و خەسان، بەڵام نەخۆشییە گوازراوەکان و بێزارکەرەکانی تر نە ئەبو حەنیفە و نە ئەبو یوسف ئەو مافەیان پێ نەداوە بۆ جیابوونەوە، چونکە بنەڕەت نەبوونی هەڵبژاردنە لەبەرئەوەی پووچکردنەوەی مافی پیاوەکەی تێدایە، هەڵبژاردن لە نەنگییەکانی زاوزێدا جێگیر دەبێت، چونکە دەبێتە مایەی ناتەواوی لەو مەرامەی هاوسەرگیری بۆ بڕیاردراوە[1]، محەمەد(هاوەڵی ئەبی حەنیفە) جیاوازی نەکردووە لە نێوان نەنگییەکانی زاوزێ و نەنگییەکانی تردا لە جێگیرکردنی مافی داوای جیابوونەوە بۆ ژنەکە[2]، لە محەمەدەوە(هاوەڵی ئەبی حەنیفە) گوازراوەتەوە دیاریکردنی نەخۆشییە نازاوزێییەکان ئەمانەن: شێتی و گولی و بەڵەکی، بەڵام "الكاساني" دەڵێت: ئیمام محەمەد هاوەڵی ئەبی حەنیفە قسەی لە کورتهەڵهێنان و دیاریکردنی دەرد و نەخۆشییەکان نەکردووە[3].

---

[1] فتح القدير ٤/٣٠٥ .

[2] المرجع السابق. المبسوط ٥/١٠٤.

[3] البدائع (٣/١٥٣٦-١٥٣٧) وفيه: (خاڵیبوونی مێردەکە لە نەخۆشییەك جگە لەم پێنج نەنگییە(نەبوونی ئامێری زاوزێ، و نەبوونی پیاوەتی، و نەبوونی گون و خەسان و نێرەمووکی) ئایا مەرجی پێویستی هاوسەرگیرین؟ ئەبو حەنیفە و ئەبو یوسف دەڵێن: مەرج نین و هاوسەری هەڵناوەشێننەوە، محەمەد(هاوەڵی ئەبی حەنیفە) دەڵێت: خاڵیبوونی پیاوەکە لە هەر نەنگییەك نەتوانرێت لەگەڵی هەڵبکەیت مەگەر بە زیانەوە وەك شێتی و گولی و پەڵە مەرجی پێویستبوونی هاوسەرین تەنانەت هاوسەرگیرییان پێ هەڵدەوەشێتەوە)

بەوەش رای محەمەد لەگەڵ رای ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیم لە حەنبەلییەکان یەکدەگرێتەوە، قازی حوسەین لە زەیدییەکان لەگەڵ دیاریکردنی دەرد و نەخۆشییەکاندایە، پێوەر لێرەدا بریتییە لە زیانی نەویست بە چاوداخستن لە سروشتی نەخۆشییەکە، چونکە هاوسەرەکەی تر ناتوانێت شان بداتە ژێر ئەو زیانە، ئەبو حەنیفە و ئەبو یوسف بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەر نادروستی جیاکردنەوە بە جگە لە نەخۆشی و ناتەواوییەکانی زاوزێ، بەوەی هەڵبژاردە بەو هۆیانە جێگیربوون بۆ پاڵنانی زیانی تیاچوونی مافی شایستە بە ژنەکە کە بریتییە لە چوونە لا تەنها بۆ یەك جار، ئەم مافە بەم نەنگیانە(جگە لە نەنگییەکانی زاوزێ) تیانەچووە، چونکە تێکەڵی هاوسەری لەگەڵ دەردەکانی تر جگە لە دەردی زاوزێ دێتە دی، بۆیە هەڵبژاردە جێگیر نابێت[١].

نامۆیە و جێگەی سەرسوڕمانە ئەو دوو فەقیهە مەزنە مافی ژن لە خۆشیوەرگرتن لە پیاوەکەیەوە بە چوونە لا بۆ یەك جار دابنێن و پێیانوابێت تێکەڵی هاوسەری تەنها بریتییە لە بابەتی چوونە لا، و نەخۆشییە نازلوزێییەکان وا تەماشا بکەن نابنە هۆی رێگر لەبەردەم تێکەڵی هاوسەریدا، لە کاتێکدا تێکەڵی هاوسەری بریتییە لە سوکنایی و ئارامی و خۆشەویستی و بەزەیی لە جۆرەکانی خۆشی ژن و مێردی، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[٢].

---

رووی قسەکەی محمد: هەڵبژاردن لە پێنج نەنگییەکەدا بۆ لابردنی زیان لەسەر ژنەکە جێگیرکراوە، ئەم نەنگیانە لە پێگەیاندنی زیان بە ژنەکە لەسەرو ئەوانەوەن، چونکە لە نەخۆشییە گوزراوەکانن، گەر هەڵبژاردن بەوانە جێگیر بوویێت ئەوا بەمانە لەپێشترە، بە پێچەوانەی ئەوەوە گەر ئەم نەنگیانە لە ژنەکەوە بێت، هەرچەند پیاوەکە پێی زیانۆمەند دەبێت بەڵام دەتوانێت بە تەڵاق زیانەکە لەسەر خۆی لابدات چونکە تەڵاق بە دەستی ئەوە، بەڵام ئافرەت ئەوەی پێنەدراوە)

(١) البدائع، المرجع السابق.

(٢) سورة الروم: ٢١.

فـەقیهانی حەنـەفی بـۆ جیاکردنـەوە بـەو دەرد و نەخۆشـیە باسـکراوانە ئـەم خاڵانەیان بەمەرج گرتووە:

١-لـە ژنەکـەوە شـتێك نیشـان نـەدرابێت بەڵگـە بێـت لەسـەر رازیبـوونی بـە ناتەواوییەکە.

٢-نەنگییەکە کوتوپڕی نەبێت و دوای چوونە لا سەریهەڵنەدابێت.

٣-حوکم بە جیابوونەوە بەهۆی نەبوونی پیاوەتییـەوە دوای دواخسـتنی سـاڵێك بێت لە بەرواری دلواکەوە[1].

٤-لە باری دلوای ژنەکە بۆ جیابوونەوە بەهۆی نـەبوونی پیـاوەتی مێردەکەیـەوە پێویستە ژنەکە "لکاو" نەبێت، چونکە مـافی دلوای تێکـەڵی جووتبـوونی نییـە لەگەڵ راستبوونەوەی رێگرێك تیایدا.

٥-بەرزکردنەوەی دلوایەکە لە ژنەکەوە بۆ قـازی، جیاکردنـەوە[2] تـەڵاقی بائینـە لەلای حەنەفییەکان[3] چـونکە کـاری قازییەکـە درلوەتـە پـاڵ پیاوەکـە، وەك ئەوەی پیاوەکە بۆخۆی تەڵاقی دابێت، هەروەها لەبەر ئەوەی مەرامەکە-کـە بریتییە لە هەڵگرتنی ستەم لەسەر ژنەکە- تەنها بە تـەڵاقی بـائین دێتـە دی، چونکە گەر تەڵاقە بائین نەبێت پەیوەستکرلو دەبێت بە گێڕانەوە[4].

**لەسەر حەنەفییەکان لەم بارەیەوە هەندێ تێبینیان لەسەر تۆمار دەکرێت:**

١-وتنی نەبوونی مافی دلوای جیابوونەوە گەر هۆیەکە کوتوپڕی بوو دوای چوونە لا بەرهەڵسـتی دەکـات لەگـەڵ کـۆی رێسـا گشـتییەکانی شـەریعەتی ئیسـلامدا فەرمانکەر بە هەڵگرتنی زیان وەك باسمان کرد.

---

(1) فتح القدير ٤/٢٩٧.

(2) فتح القدير ٤/٢٩٩.

(3) ويتفق هذا مع قول مالك والثوري.

(4) شرح العناية على الهداية ٣/ ٣ ٢٦ . المبسوط ٥/ ٩٧.

٢-رەدکردنەوەی جیاکردنەوە بە جگە لە نەخۆشییەکانی زاوزێ لەلایەن ئەبو حەنیفە و ئەبو یوسفەوە بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ ئەوەی ئاشکرایە لە سروشتی شیکردنەوەی ئەقڵانی و مەنتقی دروست لە مەزهەبی ئەبی حەنیفەدا، سەرباری بەرهەڵستیکردنەکەی لەگەڵ ڕێسا شەرعییە گشتییەکان کە فەرمان دەکەن بە پێویستی سڕینەوەی زیان بەرەهایی.

٣-بێبەشکردنی مێردەکە لە مافی داوای جیابوونەوە بەو بیانووەی تەلاقی لەدەستدایە پێشێلکاری مافی پیاوەکەیە، چونکە جیاکردنەوە لەرووی قەزاییەوە جیاوازە لە تەلاق لە هەندێ ئاساریدا، جیابوونەوە بە داوای مێردەکە بەهۆیەکی هەبوو لە ژنەکەدا مافی ژنەکە لە مارەیی دواخراو بەردەداتەوە، بە پێچەوانەی تەلاقەوە، چونکە گەر دوای چوونە لا تەلاقیدا-جا بە کەمتەرخەمی ژنەکە بێت یان نە- ئەوا پابەند دەبێت بە پێدانی هەموو مارەیی بەهۆی داننانی بە چوونە لادا.

**ئەنجامگیری و پارسەنگدان:**

١-زۆرینەی سەرخەرانی جیاکردنەوەی قەزاییانە بەهۆی نەخۆشی و دەردەوە دەستیان بردووە بۆ کورتهەڵهێنان و سنووردارکردن، لەگەڵ ئەوەی بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ مەرامی تەشریعی جیاکردنەوە بەهۆی ئەو نەخۆشی و دەردانەوە کە بریتییە لە لابردنی زیانی بەرکەوتوو لەسەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە، چونکە وا پێویستە-وەك چۆن لە ئوسولی فیقهی ئیسلامیدا راگەیەنراوە- حوکمەکە لەگەڵ هۆیەکە بە بوون و بە نەبوون بسوڕێتەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی زانستی پزیشکی کۆمەڵێك نەخۆشی دەدۆزێتەوە ترسناکترە لەو نەخۆشیانە، لەوانەیە کۆمەڵە دەردێك-بەرهەمی گەشە و گۆڕان لە ژیاندا- بێتە ئاراوە زیانی زۆر زیاتر بێت لەو نەخۆشییانە.

٢-بەربوونەوەی مافی جیابوونەوە بە هەندێ لە بەردەرەوەکان کە ئاماژەیان پێکرا وەك دواکەوتن لە بەرزکردنەوەی داوا، یان وەك رازیبوون بەو زیانە لە ماوەیەکی

دیاریکراودا، هەروەها وەك روودانی نەخۆشییەکە دوای گرێبەستەکە یان دوای چوونە لا... لەگەڵ گشتاندن و رەهاکردنی رێسا و دەقەکان کە بۆ جیاکردنەوە و هەڵگرتنی زیان بڕیاریان لێدراوە بەیەکتردا دەکێشن، چونکە مرۆڤ هەندێ جار لە کات و ماوەیەکدا شان دەداتە ژێر زیانێك لە کات و ماوەیەکی تردا ناتوانێت شانبداتە ژێری ئەوەش بەهۆی ئەو گۆڕانانەوە روو لە ژیانی دەکەن.

٣-قسەی هەندێ لە فەقیهان وەك زەیدی و جەعفەری و ئیبازییەکان بەوەی جیابوونەوە ئاتاج بە حوکمی قەزا نییە دەرگای جیابوونەوەی حەزئامێز دەکاتەوە، بە کۆمەڵە هۆیەك کە هەندێ جار راستەقینەیان بۆ نییە و هیچ ترسێك لەسەر لای بەرانبەری داواکەر بە جیابوونەوە دروست ناکات، هەر ئەوەش بوار دەرەخسێنێت بۆ ئاشووب و کاری هەرەمەکی لە ژیانی خێزاندا، بۆیە وایدەبینم هەموو جیاکردنەوەیەك بەهۆی زیانی نەویستەوە بە بڕیاری قازی بێت، دوای جێگیربوونی ئەو زیانە بە راپۆرتی پزیشکی لە لیژنەی پزیشکی پسپۆڕەوە.

٤-ئەرکی ئایینی و ئەخلاقی و مرۆیی داوا لە دوو هاوسەرەکە دەکات لە خۆشی و ناخۆشیدا هاوکاری یەکتر بن و هەوڵ و کۆششی مادی و مەعنەوی بەخت بکەن لە رێگەی چارەسەری تووشبوو بە نەخۆشییەك کە پاساو دەدات بە جیابوونەوە، لە جێگەی ئەوەی پەنا ببەن بۆ قەزا، گەر بگەڕێینەوە بۆ نزیکەی چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر دەبینین یاسای حامورای داوای کردووە لە پیاوەکە ژنە نەخۆشەکەی تەڵاق نەدات، و رێگەی پێداوە بۆ جاری دووەم هاوسەرگیری بکاتەوە بە مەرجێك هەستێت بە چاودێری و هەڵکردن لەگەڵ ژنە نەخۆشەکەیدا، و ئازادکردنی ویستی ژنە نەخۆشەکە لە مانەوە یان داوای تەڵاق و گەڕانەوە بۆ لای خانەوادەکەی، پێویستە ئێمە پابەندبوونمان بەو لایەنە ئەخلاقییەوە زۆرتر و زیاتر بێت، چونکە خۆمان بە شارستانیتر و پێشکەوتووتر و مرۆڤدۆستانەتر لە قەڵەم دەدەین بەراورد بەوانەی لە سەردەمی حامورابیدا ژیاون.

٥- پێشنیار دەکەم یاسا دانراوەکانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی لەمەڕ جیاکردنەوەی قەزاییانە دەست بۆ پێوەری زیانی نەویست ببات کە بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەری لەگەڵ دژوار دەبێت، سەرچاوەکەی هەرچییەك بێت، و واز لە هەژمارکردنی هۆیەکان لە یاسای باری کەسێتیدا بهێنێت وەك دەستبردنێك بۆ رای ئیمام محەمەد(هاوەڵی ئەبی حەنیفە) و ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیم و قازی حوسەین.

٦- لەباری جیاکردنەوەی قەزاییانەدا وایدەبینم رای مالکییەکان و حەنەفییەکان وەربگیرێت لە دانانی جیابوونەوە بە تەڵاقێکی بائین، چونکە مەبەست لێی سڕینەوەی زیانی رلوەستاوە.

# باسی دووەم:
# جیاکردنەوە بە "زیانی بەویست"

مەبەست بە زیانی بەویست ئەوەیە سەرچاوەکەی کردارێك یان گوفتارێکی بەویستی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بێت یان هەردووکیان راستەوخۆ یان بوونەهۆ، یەکسانە زیانەکە مادی بێت وەك زیانی سەرهەڵدراو لەسەر خەرجی بۆ نەکردن یان مەعنەوی بێت وەك بێبەشبوونی ژنەکە لە خۆشی جووتبوون بەهۆی بزربوونی پیاوەکەوە یان کۆچکردنییەوە، دەتوانین هەموو هۆکارە بەویستە زیانبەخشەکان بە یەکێك لە دوو هاوسەرەکە یان بە هەردووکیان بۆ چوار خاڵ بگێڕینەوە:

١-بێبەشبوونی ژنەکە لە خەرجی.

٢-بێبەشبوونی ژنەکە لە تێکەڵی هاوسەری و جووتبوون.

٣-دەستدرێژی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بۆ سەر ئەویتریان بە قسە یان بە کردار.

٤-هەستان بە گوناه و یاخیبوونێك لە یەکێکیانەوە

پێموانییە هۆیەکی بەویست بوونی هەبێت و لەسەری زیان بە یەکێك لە دوو هاوسەرەکە سەرهەڵبدات بەدەر بێت لەم چوار خاڵە سەرەکییە، بینا لەسەر ئەوە رێگە باوەکەم وازلێهێناوە کە کۆن و نوێ بۆ خستنەرووی ئەو هۆیانە شوێنیکەوتوون، هەوڵمداوە کۆی هۆیە پاساودەرەکان بۆ جیابوونەوەی قەزلییانە لەژێر ناونیشانی ئەو چوار خاڵەدا تێڕابمێنم، هەر بەو جۆرە بانگی یاسا دانراوەکان دەکەم هەمان شێواز بگرنە بەر، چونکە وردتر و گشتگیرتر و تۆکمەترە.

**یەکەم -بێبەشکردنی ژنەکە لە خەرجی بۆکردن:**

سەرچاوەی ئەم بێبەش کردنە هەندێ جار لاساری مێردەکەیە، هەروەك چۆن دەگونجێ بەهۆی دیارنەمانی یان بەدیلگیرانی یان بزربوونی یان حوکمدانی بە سزایەکی داگیرکەر بۆ ئازادییەوە بێت، هەموو ئەم کارانە دەچنە ژێر ویستی مرۆڤەوە بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ.

## رای فەقیهان لە جیابوونەوە بەهۆی خەرجی بۆ نەکردن:

قسەیان لەم بابەتەدا بۆ سێ را جیاوازی لە نێواندایە:(بەرەهایی رێگری، و بەرەهایی رێگەپێدان، و درێژەپێدان)

**رای یەکەم -رێگری بەرەهایی( بە بیانوویەك یان بەبێ بیانوو ):**

واتە یەکسانە بەهۆی دەستەوسانی دارایانەی مێردەکەوە بێت یان بە هۆی لاسارییەوە یان بزربوونی یان بەدیلگیرانی، یان بێسەروشوێنبوونی، یان بەندکردنی، ئەمە بریتییە لە هەڵبژاردەی فەقیهانی " حەنەفیەکان[1]، و ظاهریەکان[2]، هەندێ لە " جەعفەرییەکان[3]، و جمهووری زەیدییەکان "[1]. هەروەها قسەیەکی شافیعیەکان

---

[1] فتح القدير (٤/ ٣٩٠ ) وفيه: (هەر کەس توانای خەرجیکردنی ژنەکەی نەبوو لەیەکتر جیاناکرێنەوە، و دەوترێت بە ژنەکە قەرز لەسەر پیاوەکەت بکە، واتە خواردن بکڕێت بە مەرجێك مێردەکە نرخەکەی بدات... گەر لە خەرجی بۆ کرد خۆی گرتەوە لەگەڵ دەوڵەمەنی و هەبووندا جیاناکرێنەوە و دادوەر لەسەر مێردەکە لە ماڵەکەی دەفرۆشێت و بۆ خەرجی ژنەکە بەکاری دەهێنێت، گەر دادوەر ماڵەکەی نەبینییەوە پیاوەکە بەند دەکات تا بۆ ژنەکەی خەرجی دەکات و هاوسەرییەکەیان هەڵناوەشێتەوە).

[2] المحلى ( ١٠/ ٩٢ ) وفيه: (گەر پیاوەکە خەرجی یان پۆشاك یان مارەییەکەی بۆ ژنەکەی نەکرد بە ستەم بێت یان بەهۆی هەژارییەوە توانای نەبێت بۆ ژنەکە دروست نییە لە پێناوی ئەوەدا نەفسی خۆی لە مێردەکەی بگرێتەوە) هەروەها تیایدا هاتووە(١٠ / ٩١) (هەر کەس خەرجی و پۆشاك لە ژنەکەی بگرێتەوە و توانای ئەوەشی هەبێت یەکسانە کەسەکە ئامادە بێت یان ئامادە نەوە قەرزە لە ئەستۆید هەر دەبێت لێی وەربگیرێتەوە و بۆی بگێڕێتەوە لە ژیانیدا یان دوای مردنی(لە میراتەکەی یان وەك مافێکی دواڕۆژی لەسەری بمێنێتەوە))

[3] الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية ٢/١٤٤. الخلاف للطوسي ٢/٣٢٤.

، "الأوزاعي والثوري" هەمان قسەیان كردووە، هەندێ لە فەقیهانی شوێنكەوتوولنیش هەمان بۆچوونیان هەیە وەك: "الزهري والنخعي، وعطاء بن يسار و "إبن أبي ليلى"ش[2] كاری پێكردووە"، دەڵێن: بۆ ژنەكە هەیە دلوای مۆڵەت لە قازی بكات بۆ قەرز وەرگرتن و خەرجی بۆ كردن لەسەر پارە و سەرمایەی مێردەكەی، بۆ قازیش هەیە خەرجی لە ماڵ و دارایی پیاوەكە دابین بكات یان قەرزی بكات یان لە خەزێنەی دەوڵەت بۆی خەرج بكات..

ئەو فەقیهانە بەڵگەی زۆریان هێناوەتەوە گرنگترینیان ئەمانەن:

١-دەستبردن بۆ سووكترین زیان، چونكە گەر لە یەكتریان جیابكەنەوە مافی پیاوەكە پووچ دەبێتەوە، گەر جیاشیان نەكەنەوە مافی ژنەكە دوادەكەوێت، یەكەمیان زیانەكەی زۆرترە، چونكە خەرجی بە قەرز لە ئەستۆی پیاوەكەدا بە بڕیاری قازی جێگیر دەبێت و لە داهاتوودا لێیوەردەگیرێتەوە، خەرجی پێوانە ناكرێت بۆسەر لاوازی جووتبوون، چونكە ماڵ پاشكۆی هاوسەرگیرییە، بۆیە ئەوەی لە هاوسەرگیری مەرامە كە بریتییە لە منداڵبوون ناكرێتە پاشكۆ[3]

٢-دەق لەسەر چاوەڕوانی و مۆڵەتدان لەباری نەداری و دەستتەنگی پیاوەكەدا هاتووە، ئایەتی: ﴿وَإن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾[4]، هەموو دلوایەك لە

---

[1] التاج المذهب: (٢/٢٨٥) وفيه: (گەر مێردەكە بزر بوو یان یاخی بوو لە خەرجی بۆ كردنی ژنەكەی ئەوا دادوەر خەرجی بۆ دەكات لە ماڵ و سامانی پیاوە نادیارەكە بە پێی ئاتاجی و پێویستی ژنەكە لە ماوەی بزربوونی پیاوەكەدا... هەر بەو جۆرە دادوەر لە ماڵی مێردی یاخیبوو لە خەرجی بۆ كردن لەسەر ژنەكەی خەرج دەكات با مێردەكەش ئامادە بێت... دادوەر بەندی دەكات گەر ژنەكە دلوای لێكرد بەندی بكات بۆ ئەوەی دەستبداتە كار و كەسابەت، هەڵوەشانەوەی هاوسەری نێوانیان لەلای ئێمە بەهۆی خەرجی نەكردنەوە ڕێگەپێنەدراوە، یەكسانە بەهۆی بزربوونی پیاوەكەوە بێت یان بەهۆی یاخیبوونی یان بەهۆی نەبوونی، یان بەهۆی كاسی نەكردنەوە بێت).

[2] فتح القدير ٣٠٤/٤. بداية المجتهد ٤٣/٢.

[3] الزيلعي ٥٤/٣ .

[4] (وَإن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَكُمْ إن كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ) (البقرة:٢٨٠).

ژنەکەوە بۆ جیابوونەوە لەبەر خەرجی بۆ نەکردن لەباری دەستەوسانی پیاوەکەدا بەم دەقەدا دەکێشێت.

٣-ئەوەی هاوەڵان لەسەری بوون لەباری ناخۆشی و خۆشی و هەژاری و دەوڵەمەندی، هەژارانیان ژمارەیان زۆرتر و زیاتر بوو لە دەوڵەمەندان، ڕووداوێك تۆمارنەکراوە پێغەمبەر(ﷺ) یان هاوەڵانی بەهۆی خەرج نەکردنەوە بڕیاری جیابوونەوەیان لە قەزادا بۆ ژن و مێردێك دەرکردبێت.

**گفتوگۆ لەسەر ئەم بەڵگانە:**

١-ئەو بانگەشەی زیانی سەرهەڵدراو بۆ سەر ژنەکە بەهۆی خەرجی بۆ نەکردنەوە سووکترە لەو زیانەی بەر پیاوەکە دەکەوێت بەهۆی جیاکردنەوە حوکمدان و پارسەنگ کردنێکی بێ پارسەنگدەرە، بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە، لەبەر ئەوەی مرۆڤ دەتوانێت بەبێ ئەنجامدانی جووتبوون بژی، بەڵام ناتوانێت بەهۆی بێبەشبوون لە خەرجییەوە بژی، لە کاتێکدا جیاکردنەوە بە نەبوونی پیاوەتی دروستە کەوابوو لەباری بێبەشبوون لە خەرجی لەپێشترە، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو بەڵگەیە بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ دەقە قورئانییەکاندا کە فەرمان بە ئامێزگرتن بە چاکە دەکەن، لەوانە: ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾[1].

٢-ئایەتی: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾[2]، بەڵگەیەکی تایبەتە بە کەسی هەژار، تایبەتیش حوکمی گشتی پێ جێگیر نابێت و دەوڵەمەند و هەژاری پێ بگرێتەوە، لەپاڵ ئەوەدا تەبایی لە نێوان ئەو ئایەتە و ئایەتی: : ﴿لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا﴾ بە پێدانی هەڵبژاردن دەبێت بە ژنەکە لە داوای جیابوونەوە

---

[1] (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجاً) (الطلاق:٢).

[2] (وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ)(البقرة:٢٨٠).

گەر نەیتوانی ئارام بگرێت، پاشان قەرز زەلیلییە، لەسەر ئەو بنچینەیە قەرز بە "دین" ناوبراوە، بۆیە دلوا لە ژنەکە ناکرێت شانبداتە ژێر ئەو زەلیلییە و قەرزکردن لەسەر گیرفانی مێردەکەی بۆ ئەوەی بۆخۆی خەرج بکات.

٣-نەبوونی ڕووداوی جیابوونەوە لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵاندا نابێتە بەڵگە لەسەر نادروستی جیاکردنەوە بەهۆی خەرجی بۆ نەکردنەوە، ئەوەش لەبەر ئەم خاڵانە:

أ-جیاکردنەوە دوای دلوا دەبێت، ئەو دلوایە لە ژنی هیچ هاوەڵێکەوە جێگیر نەبووە.

ب-ژنانی هاوەڵان بەتەواوی لە خەرجی بێبەش نەکراون.

ج-ژیان گەشە و گۆڕانی بەخۆوە بینیوە و دەروونەکان گۆڕاون و لایەنی ماڵی و دارایی زاڵبووە بەسەر لایەنی ڕۆحیدا پێچەوانە بەوەی هاوەڵان لەسەریبوون لە سەرەتای ئیسلامەوە، ئەوەی ئەمڕۆ مرۆڤ لەسەری دەژی پێوانە ناکرێت بۆ ئەوەی پێشینی چاکان لە رابردوودا لەسەری بوون، بۆیە ناچارکردنی ژنەکە لە ئەمڕۆدا بۆ شاندانە ژێر ئازار و مەینەتییەکانی ژیانی هەژاری تەنگەتاوکردنی ژنەکەیە و لەگەڵ ئەم ئایەتەدا بەرهەڵستی دەکات: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾.[1]

**ڕای دووەم: بۆ ژنەکە هەیە بەرهەڵایی داوای جیابوونەوە بکات( بەبیانوویەك یان بەبێ بیانوو ):**

واتە بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بکات لەڕووی قەزاوە بەهۆی نەبوونی خەرجییەوە یەکسانە مێردەکە هەبوو بێت یان نەبوو، هەروەها یەکسانە مێردەکە ئامادە بێت یان نادیار، ژنەکە ئازادی هەڵبژاردەی بۆ هەیە لە نێوان دوو کاردا:

---

[1] ﴿وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِنْ قَبْلُ وَفِي هَذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيداً عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ فَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ هُوَ مَوْلاكُمْ فَنِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ﴾ (الحج:٧٨).

(ئارامگرتن یان دلوای جیابوونەوە) گەر قازی نەیتوانی بۆ ژنەکە دەستەبەری خەرجی لە ماڵی پیاوە هەبووەکە بکات.

ئەمە ئەوەیە فەقیهانی " مالیکیەکان[1]، و هەندێ لە حەنبەلیەکان[2]" گرتوویانەتەبەر، ئەوان دەڵێن: جیابوونەوە بە رەهایی لەبەر خەرجی بۆ نەکردن دروستە گەر ئەم مەرجانە فەراهەم بوون:

١–بەرزکردنەوەی دلوایەك لە ژنەکەوە یان لە نوێنەری ژنەکەوە بۆ بەردەم قەزا، تیایدا دلوای خەرجی یان جیابوونەوە دەکات.

٢–جێگیربوونی راستبوونەوەی هاوسەرگیری دروست.

٣–جێگیربوونی شایستەبوونی هاوسەری بە خەرجی، شتێك راستنەبوویێتەوە رێگر بێت لەو کارە[3].

٥–پێدانی مۆڵەتێك بە پیاوەکە بەپێی خەملاندنی قازی بۆ ئەوەی مێردەکە یەکێك لەم دوو کارە هەڵبژێرێت: یان خەرجی بۆ کردن یان تەڵاق[4].

٦–پیاوەکە نەچوویێتە ژێر تەڵاق و خەرجکردن پێکەوە دوای بڕیاری قازی بەسەریدا بە هەڵبژاردنی یەکێك لەو کارە[5].

---

[1] شرح الخرشي ٤/١٩٦ـ١٩٨ .الشرح الصغير للدردير ٢/٨٤٥ فما بعدها. مواهب الجليل ٤/١٩٦.

[2] المغني ٧/٥٧٣ وما بعدها وفيه :(گەر لێیگرتەوە(واتە خەرجی) و ژنەکە شتێکی نەبینییەوە دەستی بۆ ببات و رێگەی جیابوونەوەی گرتەبەر دادوەر لە یەکتریان جیا دەکاتەوە).الانصاف ٩/٣٩٠ وما بعدها الاقناع ٣/١٤٧.

[3] الخرشي (٤/١٩١) وفيه: (بەناوبانگ ئەوەیە گەر ژنەکە رێگەی نەدا پیاوەکەی بچێتە لای بەبێ پاساوێك ئەوا خەرجی بۆ کردنی بەردەبێتەوە، هەر بەو جۆرە خەرجی بۆ کردنی بەردەبێتەوە گەر رێگری کرد لەوەی مێردەکەی خۆشی لێ وەربگرێت یان بچێتە دەرەوە بەبێ گوێڕایەڵی مێردەکەی و بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لێی)

[4] الخرشي ٤/١٩٧) وفيه: (لۆمەی دەکرێت بە ئیجتیهادی دادوەرەکە بەبێ ئەوەی رۆژێك یان سێ رۆژ، مانگێك یان سێ مانگ دیاریبکرێت).

[5] العدوي المرجع السابق وفيه :(هەر کەس هەژارییەکەی نەسەلمێنرا و دانی بە تێری و تەولویدا دەنا و خۆی دەگرتەوە لە خەرجی بۆ کردن و تەلاقدان، واتە ماڵێکی ئاشکرا و دیاری نەبوو ئەو ←

٧-جیاکردنەوەکە بەهۆی خەرجنەکردن لە ئێستادا یان لە داهاتوودا بێت، ژنەکە بۆی نییە داوای جیابوونەوە بکات بەهۆی خەرجییەکەوە لەسەر ئەستۆی پیاوەکە کۆمابووە(کۆبووەتەوە)[1].

جیاکردنەوە بەهۆی خەرجی نەکردنەوە لای مالیکییەکان بە تەلاقی رجعی دادەنرێت واتە: بۆ مێردەکە مافی گێڕانەوە هەیە لە ماوەی عیدەکەیدا گەر بڕیاری خەرجکردنی بۆ دا، ئەمەش رایەکی دروستە و هەڵقوڵاوی رۆحی شەریعەتی ئیسلامە.

**گرنگترین بەڵگەی ئەوانەی لەسەر جیاکردنەوەن و بەرەهایی شانیان لەسەر دادانێت بەهۆی خەرجی بۆ نەکردنەوە ، ئەمانەن:**

١-ئایەتی: ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَو تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾، لەئامێزگرتن لەگەڵ خەرجی بۆ نەکردن لەئامێزگرتن نییە بە چاکە بۆیە دەستلێبەردان دێتە پێشەوە[2].

٢-ئەو فەرموودە مورسەلەی سەعیدی کوڕی موسەیب کە سوفیان لە ئیبن ئەبی زەنادەوە ریوایەتی کردووە دەڵێت: پرسیارم لە سەعیدی کوڕی موسەیب کرد دەربارەی پیاوێك شتێکی نییە بۆ ژنەکەی خەرجی بکات ئایا لەیەکتر جیادەکرێنەوە؟ وتی: بەڵێ، وتی: ساڵێك؟ وتی: ساڵێك، ئەمە دەدرێتە پاڵ

---

کەسە پەلەی لێ دەکرێت بۆ تەلاقدان لەسەر یەکێك لە رایەکان، بەند دەکرێت تا خەرجی بۆ ژنەکەی دەکات لەسەر رایەکی تر کە "ئیبن عەرەفە" باسی کردوون، گەر بەندکرا و خەرجی بۆ نەکرد تەلاقی بۆ پێشدەخرێت). وفي المغني (٥٧٦/٧) (( گەر ماڵەکەی خۆی شاردەوە و لەسەر بەندکردن ئارامی گرت و دادوەریش نەیتوانی ماڵەکەی بیبینێتەوە و لێی وەربگرێت یان نەیتوانی خەرجی بەدەست بهێنێت لە ماڵی کەسە بزرەکەوە ئەوا ژنەکە تەنها هەڵوەشانەوەی بۆ هەیە، ئەوەش قسەی "الخرشي" و هەڵبژاردەی "أبي تالب"ە)).

(1) المغني ٥٧٥/٧ وفیە: (گەر بە خەرجی کردنی رابردوو نەدار بوو هەڵوەشانەوەی بۆ نییە، چونکە قەرزێکە و جەستە بەبێ ئەو قەرزەش دەمێنێتەوە و وەك هەموو قەرزەکانی تر وایە) وفي شرح الخرشي (١٩٤/٤): (گەر پیاوەکە لە خەرجی بۆ کردنی ئێستا یان داهاتوو بۆ ئەو کەسەی سەفەری لەبەرە دەستەوسان بوو، نەك خەرجی رابردوو).

(2) المغني ٥٧٣/٧ .

سوننەتی پێغەمبەری خودا.

٣-عومەری کوڕی خەتاب فەرمانی دەرکرد ئەو پیاوانەی لە ژنەکانیان دیارنامێنن خەرجیان بۆ بکەن یان تەڵاقیان بدەن.

٤-پێوانە بۆ سەر جیاکردنەوە بەهۆی پەککەوتنی جووتبوونەوە، دەڵێن: گەر هەڵوەشانەوە بەهۆی پەککەوتن لە جووتبوون جێگیر بووبێت-کە زیانەکەی کەمترە- ئەوا جێگیربوونی بەهۆی دەستەوسانی لە خەرجکردن کە مانەوەی جەستەی پێوە بەندە لەپێشترە.

رای سێیەم-درێژەپێدان:

واتە جیاکردنەوەی نێوان دوو حاڵەتی دەستەوسانی لە لاساری، یان بە گوزارشتێکی تر: جیاکردنەوە لە نێوان دوو حاڵەتی بوونی بیانوو و نەبوونی بیانوو، بەڵام خاوەنی ئەم رایە یەك ئاراستەیان نەگرتۆتە بەر لەم درێژەپێدانەدا، بەڵکو بۆ دوو دەستە دابەشبوون، بۆ هەر ئاراستەیەك ئاراستەی پێچەوانە هەیە، بەم جۆرە:

أ-دەستەیەك: لەسەر جیابوونەوەن بەهۆی نەبوونی خەرجی لە کەسی هەژاری دەستەوسانەوە، بەڵام گەر نەرێبوونی پیاوەکە بەهۆی لاسارییەوە بوو نەك دەستەوسانی و هەژارییەکەی ئەوا ویستی ژنەکە دەسەڵاتی داوای جیابوونەوەی نییە، بەهۆی ئەگەری بەدەستهێنانی خەرجییەوە لە رێگەی قەزاوە، ئەمە لای شافیعییەکان پارسەنگراوە[1] و هەڵبژاردەی "القاضي"شە

---

[1] المهذب ١٦٣/٢ وفيه: (گەر پیاوەکە نەیتوانی خەرجی بکات بەهۆی نەدارییەوە بۆ ژنەکە هەیە هاوسەرگیرییەکە هەڵبوەشێنێتەوە، گەر پیاوەکە هەبوو بوو و نەیدەویست خەرجی بۆ ژنەکەی بکات هەڵوەشانەوە بۆ ژنەکە جێگیر نەبووە چونکە دەتوانرێ لە رێگەی دادوەرەوە لێی وەربگیرێتەوە)

لە حەنبەلییەکان[1].

**بە کۆمەڵێك بەڵگە بەڵگەیان هێناوەتەوە، لەوانە:**

١-پیاوی هەبوو دەتوانرێت خەرجی لە ماڵەکەی بەدەستبهێنرێت لە رێگەی قەزاوە.

بینا لەسەر ئەوە گەر کەسەکە دیارنەما و بێسەروشوێن بوو هەڵوەشانەوەی بۆ نییە، چونکە هەڵوەشانەوەکە بەهۆی نەبوونییەوەیە و لەم بارەدا جێگیر نەبووە[2].

٢-ئەوەی ئەبو هورەیرە -خوا لێی رازی بێت- ریوایەتی کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((لە پیاوێکدا شتێك نەبینرێتەوە بۆ ژنەکەی خەرجی بکات لەیەکتر جیادەکرێنەوە)).

ئەم رایە گفتوگۆی لەسەر دەکرێت بەوەی هۆی جیاکردنەوەی راستەقینە بریتییە لە زیانی ژنەکە پەیدابوو لە خەرجی بۆ نەکردنەوە، بۆیە هۆیەکە راوەستاوە، یەکسانە پیاوەکە نەبوو بێت یان هەبوو و لاسار تا ژنەکە لە خەرجی بێبەش بێت.

ب-دەستەیەك دەڵێن: بۆ ژنەکە دلوای جیابوونەوە هەیە گەر خەرجنەکردنەکە لە پیاوێکی هەبووی لاسارەوە بوو، چونکە ستەمکارە، نەك کەسی دەستەوسانی

---

[1] المحرر ٢/١١٦ وفيه. (گەر کەسی هەبوو نەیویست خەرجی بکات یان بەشێك لە خەرجییەکە و نەدەتوانرا لە ماڵەکەی خەرجییەکە دابین بکرێت، "القاچی" دەڵێت: ئەوەی بۆ نییە(واتە دلوای جیابوونەوە) بە پێچەوانەی کەسی نەدارەوە)

[2] نهاية المحتاج ٧/٢٠٧ وفيه: (دروستتر ئەوەیە خۆگرتنەوەی کەسی هەبوو یان مام ناوەند لە خەرجکردن هەڵوەشانەوەی هاوسەریی بۆ نییە ئامادە بێت یان بزر).

شافیعییەکان روویەکی تریان هەیە تایبەت بە کەسی بزر و نادیار، هەندێ لە هاوەڵانی شافیعی دەڵێن: گەر هەواڵی کەسی نادیار برا و بێسەروشوێن بوو بۆ ژنەکە هەڵوەشانەوە هەیە، چونکە نەبوونی خەرجی بۆ کردن بە بزربوونی وەك نەبوونی خەرجی بۆ کردن وایە لەباری نەداریدا). المهذب ٢/١٦٣.

هەژار چونکە بیانووی خۆی هەیە، بۆیە مامەڵەی کەسی ستەمکاری لەگەڵ ناکرێت، ئەوەش هەڵبژاردەی ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیمە لە حەنبەلییەکان[1]، هەندێ لە پاشینەکانی جەعفەرییەکانیش[2] لەسەر ئەم رایەن، گەورەترین بەڵگەیان: ئایەتی: ﴿لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفساً إلَّا وُسْعَهَا﴾ هەروەها ئایەتی: ﴿وَإن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾.

گفتوگۆ لەسەر ئەم بەڵگەهێنانەوە دەکرێت بەوەی ئایەتی یەکەم بەڵگەیە بەدەستی ژنەکەوە بۆ داوای جیابوونەوە، دووەمیش پەیوەستە بە قەرز لە مامەڵە داراییەکاندا، شایانی باسە ئیبن حەزم زاهیری(رەحمەتی خودای لێ بێت) لەسەر پێویستبوونی خەرجی مێردی هەژاری دەستەوسانە لە لایەن ژنەکەیەوە کە لەرووی داراییەوە توانادار و بەدەسەڵاتە[3].

---

[1] قال ابن قيم (زاد المعاد ٣/٥١ ):(گەر مێردەکە توانای خەرجی بۆ کردنی هەبوو و نەیکرد و ژنەکە نەیتوانی خەرجی خۆی بەدەستبهێنێت ئەوا بۆی هەیە داوای هەڵوەشانەوە بکات، بۆ ژنی کەسی هەژار ئەوە نییە، مەگەر لە کاتی گرێبەستەکەدا فریوی دابێت و پێی وتبێت: ئەو پیاوێکی دەوڵەمەندە پاشان دەربکەوێت ئەو پیاوێکی هەژار و نەدارە، لەو بارەدا دیسان ژنەکە مافی داوای هەڵوەشانەوەی بۆ هەیە).

[2] يقول الاستاذ جواد مغنية في كتابة (الزواج والطلاق في المذاهب الخمسة) ص١٩٢: (بەڕێز ئەبو حەسەن لە "الوسيلة"دا و بەڕێز محسن الحكيم لە ریسالەی "منهاج الصالحين"دا فتوایانداوە بەوەی گەر مێردەکە خۆی لە خەرجی دەگرتەوە بۆ ژنەکەی لەگەڵ دەوڵەمەندیدا و ژنەکە کارەکەی بەرز کردەوە بۆ بەردەم دادوەر ئەوا دادوەر پیاوەکە بە خەرجی بۆ کردن یان بە تەڵاق پابەند دەکات، گەر پیاوەکە نەیویست خەرجی بکات بۆ ژنەکە و تەڵاقیشی نەدەدا ئاشکرا ئەوەیە دادوەر بۆی هەیە ژنەکەی تەڵاق بدات گەر ژنەکە بیەوێت)

[3] المحلى ١٠/٩٢ وفيه : گەر مێردەکە لە خەرجی بۆ خۆ و بۆ ژنە دەوڵەمەندەکەی دەستەوسان بوو داوا لە ژنەکە دەکرێت خەرجی مێردەکەی بکێشێت و بۆی ناگێڕێتەوە کاتێك پیاوەکە دەوڵەمەند بوو، بەڵگەی ئەمە ئایەتی: (وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا لَا تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ) عەلی دەڵێت: ژن میراتگرە بۆیە بە دەقی قورئان خەرجی لەسەرە).

پێموایە رایەکە سەرچاوەکەی رۆحی شەریعەتی ئیسلامە، داوا لە یاسادانەری وڵاتە ئیسلامییەکان دەکەم وەریبگرن و لە یاساکانی باری کەسێتیدا جێگیری بکەن.

**ئەنجامگیری و پارسەنگدان:**

## یەکەم-ئەنجامگیری:

لەو والاکردنەی پێشووەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی هۆی جیاوازی فەقیهان لە جیاکردنەوەی ژن و مێردا بەهۆی خەرجی بۆ نەکردنەوە لەلایەکەوە بۆ نەبوونی دەقێکی راشکاو دەگەڕێتەوە و لەلایەکی ترەوە بۆ بەرهەڵستی لە نێوان پێوانە و "إستصحاب" دەگەڕێتەوە، سەرباری ئەوەی ئایا هۆی حوکمەکە تەنها زیانی ژنەکەیە یان لەگەڵ مەبەستخراپی مێردەکەدایە؟

ئەوەی لەسەر جیانەکردنەوەیە: دەستی بە نەبوونی دەقەوە گرتووە و پارسەنگدانی "إستصحاب" بەسەر پێوانەدا، هەر کەسیش پێوانەی پێشخستووە و خەرجی نەکردنی پێوانە کردووە بۆ سەر نەبوونی پیاوەتی-بۆ نموونە- بەهۆی بەشداربوونیان لە هۆی حوکمەکەدا(واتە زیان) لەسەر جیاکردنەوەیە، و جیاوازی نەکردووە لە نێوان دوو حاڵەتی هەبوون(دەوڵەمەندی) و نەبوون(هەژاری) و هۆی حوکمەکەی تەنها بە زیان لەسەر ژنەکە داناوە، ئەو کەسەش جیاوازی کردووە لە نێوان خەرجی نەکردن و نەبوونی پیاوەتیدا لەسەر جیاکردنەوەی ژن و مێردەکەیە لە باری دەوڵەمەندیدا نەك باری هەژاری، و دەڵێت: هۆیەکە بریتییە لە زیانی ژنەکە و مەبەستی خراپی پیاوەکەی پێکەوە.

هەرکەس بۆچوونی پێچەوانەی ئەوەیە دەڵێت هۆ تەنها بریتییە لە زیان، ئەوەش قابیلی لادانە لەباری دەوڵەمەندی مێردەکەدا لە رێگەی قەزاوە بە پێچەوانەی حاڵەتی هەژارییەوە کە تەنها بە جیاکردنەوەی ژن و مێردەکە زیانەکە کۆتایی پێ دێت.

## پارسەنگدان:

ئەوەی لەپێشترە بە هەڵبژاردن بریتییە لە وەرگرتنی قسەکەی ئیبن حەزمی زاهیری لەباری دەستەوسانی جەستەیی و دارایی پیاودا لە خەرجی بۆ کردن و توانای

دارایی ژنەکە بۆ خەرجکردن، چونکە پەیوەندی ژن و مێردی پەیوەندییەکی رۆحییە و شەقڵی بەردەوامبوون تیایدا لەسەر بنچینەی هاوکاری و خۆشەویستییە، بۆیە لەسەر ژنی بەرێز پێویستە لە خۆشی و لە ناخۆشیدا بەشداری پیاوەکەی بکات و ئازار و خۆشییەکان لەگەڵ یەکتر بەش بکەن، هەژاری نە نەنگییە و نە ناتەواوییەکە لە بەهای مرۆڤ کەم بکاتەوە، ماڵ دێت و دەڕوات و کەف سەر دەریایە: ﴿فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً وَأَمَّا مَا يَنْفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الْأَرْضِ﴾[1].

لەباری هەژاری هەردووکیاندا لەسەر دەوڵەت پێویستە ژیانیان بۆ دابین بکەن لە خەزێنەی دەوڵەت(بيت المال) چونکە دەستەبەری ئابووریانە بۆ بێتواناکان لە کۆمەڵگەدا لە گرنگترین ئەرکەکانی دەوڵەتە.

گەر مێردەکە هەژار بوو و دەیتوانی کار بکات دیسان لەسەر دەوڵەت پێویستە کارێکی شەرەفمەندانەی بۆ ببینێتەوە.

لەباری لاساری مێردی دەوڵەمەندا پێویستە مافی داوای جیابوونەوە بدرێت بە ژنەکە بۆ هەڵگرتنی ئەو ستەمە لەسەری، چونکە سڕینەوەی زیان و هەڵگرتنی ستەم لە ئەرکەکانی قەزایە، ئەوەش دوای ئەوەی ماوەیەکی تەولو دەخرێتە بەردەم پیاوەکە بۆ ئەوەی ویژدانی بەئاگابێتەوە و بگەڕێتەوە سەر خەرجکردن بۆ هاوبەشی ژیانی.

گەر پیاوەکە خەرجی بۆ نەدەکرد و تەڵاقیشی نەدەدا ئەوا لەسەر قازی پێویستە وەڵامی داوای ژنەکە بداتەوە لەسەر ئەوەی تەڵاقەکە بە تەڵاقی رجعی دابنرێت وەك دەستبردن بۆ رایەکەی ئیمامی مالیك(رەحمەتی خودای لێ بێت) ئەوەش وەك پێدانی هەلێکی تر بە ژنەکە بۆ تێهەڵکردنەوەی ژیانی هاوسەری دوای پێشکەشکردنی گفتنامەیەك لەلایەن پیاوەکەوە بە خەرجکردن لەسەر ژنەکەی.

---

[1] (انزَلَ منَ السَّمَاء مَاءً فَسَالَتْ أودِيَةٌ بقَدَرهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَداً رَابياً وَممَّا يُوقدُونَ عَلَيْه في النَّار ابْتغَاءَ حلْيَةٍ أو مَتَاعٍ زَبَدٌ مثْلُهُ كَذَلكَ يَضْربُ اللّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطلَ فَأمّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً وَأمَّا مَا يَنْفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الأمْثَالَ) (الرعد:١٧).

دووەم -بێبەشکردنی ژنەکە لە تێکەڵی هاوسەری:

باری دووەم بۆ زیانی بەویست بریتییە لە بێبەش کردنی ژنەکە لە خۆشیوەرگرتن و تێکەڵاوی لە مێردەکەی، ئەو مرۆڤە و ئەوەی مافی مێردەکەیە مافی ئەویشە لە خۆشی وەرگرتن لە ژیانی جووتبوون و شتانی تر بە رێگەیەکی رەوا، بۆیە بێبەش کردنی لەم مافە بە ویستی مێردەکە راستەوخۆ یان بوونەهۆ هەڵبژاردە دەخرێتە بەردەم ژنەکە لە نێوان شاندانە ژێر ئازار و مەینەتییەکانی ئەو زیانە یان داواکردن لە قازی بۆ سڕینەوەی ئەو زیانە، چونکە کارەکە ستەمە و هەلگرتنی ستەمیش لەم دەروازەیەوە لە پسپۆری قازییە.

کۆچکردن بە پشتتێکردن دەچێتە ژێر ئەم بارەوە، پێشتر بەدرێژی حوکمەکانیمان باس کرد بۆیە لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە، کۆچکردن بە بزربوون کە حاڵەتی بێسەروشوێن(بێسۆراخ) و دیلکردن و بەندکردن لەخۆ دەگرێت، چونکە هەر بێسەروشوێنێك و هەر دیلێك و هەر بەندییەك لە ژنەکەی بزرە، پاشان ئەم حاڵەتانە هۆی جیاکردنەوە نین، بەڵکو هۆی راستەقینە بریتییە لەو زیانەی لێیانەوە سەرهەڵدەدات، لە دابڕان لە مێردەکەی و بێبەشبوونی ژنەکە لە خەرجی بەهۆی بزربوونی پیاوەکە و بێسۆراخی و دیلی و بەندییەوە، ئەوەش هەمان بێبەشبوونە لە باری ئامادەبوونی پیاوەکەدا لە رووی حوکمەوە، چونکە پیاوەکە ماڵێکی بەجێنەهێڵاوە بۆ ژنەکەی خەرج بکات، بۆیە پێویست ناکات ئەو جیاوازی و ناکۆکییە ئاماژەبۆکراوەی فەقیهان لەبارەی جیاکردنەوەی ژن و مێردەکە لەباری خەرجی بۆ نەکردندا لێرەدا دووبارە بکەینەوە، بەڵکو باسەکەمان کورتدەکەینەوە لەمەڕ زیانی پەیدابوو لە بێبەشبوونی ژنەکە لە خۆشی تێکەڵی هاوسەری لەو بارانەدا، فەقیهانی موسڵمان جیاوازیان هەیە لەمەڕ جیاکردنەوە بەهۆی ئەو زیانەوە بۆ دوو را: یەکەمیان: نەرێکردنی جیاکردنەوە بەرەهایی، و دووەمیان: دەستبردن بۆ درێژەپێدان.

**رای یەکەم-نەرێکردنی جیاکردنەوە بەرەهایی:**

تەنها یەك حوکم دەدەن بە هەموو شێوازەکانی بزربوون ئەوەش رێگەنەدانە بە جیاکردنەوە لەلایەن قازییەوە بەهۆی بزربوونەوە مەگەر هاودەمەکانی کەسە بزرەکە لە تەمەندا بمرن، لەو بارەدا بۆ قازی هەیە حوکم بە مردنی دەربکات وەك سەرنجدان بە مردنی هاودەمەکانی، ئەوجا ژنەکە عیدەی مردن لە مێردەکەی دەگرێت.

ئەم ئاراستەیە ئەوەیە فەقیهانی حەنەفی و زاهیری و جمهووری زەیدی و شافیعی لە قسەی نوێیدا گرتوویانەتە بەر، وەك لەم رۆشنکردنەوەدا:

## حەنەفییەکان دەڵێن:

جیاکردنەوە لە نێوان بزربوو و ژنەکەیدا ناکرێت بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)دەربارەی ژنی کەسی بزربوو: ((ئەوە ژنیەتی تا رۆشنکردنەوەی بۆ دێت)) ، هەروەها بەپێی قسەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالب-خوا لێی رازی بێت- تیایدا: ئەو ژنەیەتی و رووبەڕووی بەڵا بووەتەوە با ئارام بگرێت تا مردن یان تەڵاقی بۆ رۆشن دەبێتەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی هاوسەرگیری بە یەقین جێگیر بووە و مردن لە باری ئەگەردایە، بۆیە یەقین بە گومان ناسڕێتەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی عومەری کوڕی خەتاب-خوا لێی رازی بێت- لەو رایەی پەشیمان بوویەوە کە لەسەر جیابوونەوە بوو دوای دواخستنی چوار ساڵ، لەگەڵ عەلی هاوڕابوو لە نەرێکردنی جیاکردنەوەدا، هەروەها لەبەر ئەوەی بزربوون پێوانە ناکرێت بۆ سەر پشتتێکردن، چونکە تەڵاقێکی پێشخراوە، هەر بەو جۆرە پێوانە ناکرێت بۆ سەر نەبوونی پیاوەتی، چونکە بزربوون ئەگەری کۆتاهاتنی هەیە بە پێچەوانەی نەبوونی پیاوەتییەوە[1]، بینا لەسەر هەموو ئەوانە قازی بڕیار دەردەکات بە مردنی کەسی نادیار کە چارەنووسی دیار نییە لەدوای مردنی هاوتەمەنەکانی، بەڵام کەسی بزر کە شوێن و چارەنووسی دیارە لەسەر تەڵاقدانی ژنەکەی یان گەڕانەوە ناچار دەکرێت.

---

[1] أنظر الهداية شرح بداية المبتدى للمرغيناني طبعة البابي الحلبي القاهرة ٢/١٨١.

باشە بڵێین ئەم رایە بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ رۆحی ئیسلام و ئەو دەقانەی فەرمان دەکەن بە پێویستبوونی سڕینەوەی زیان و هەڵگرتنی ستەمی زیانبەخش.

## زاهیرییەکان:

ئیبن حەزم[1] دەڵێت: هەڵوەشانەوەی هاوسەری هیچ کەسێك بە بزربوونی دروست نییە، هەر بەو جۆرە پێویستکردنی عیدە لە کەسێك کە مردنەکەی راستنەبووەتەوە، هەروەها بۆ هیچ کەس دروست نییە لە کەسێکی ترەوە تەڵاق بخات، تانەی داوە لەوەی لە عومەری کوڕی خەتابەوە ریوایەتکراوە لە دواخستن بۆ ماوەی چوار ساڵ پاشان جیاکردنەوە، چونکە ریوایەتێکی لاوازە.

هەروەها دەڵێت: هیچ کەس جگە لە خودا و پێغەمبەر(ﷺ) ناکرێتە بەلگە.

حەلاڵ نییە ژنێك لە مێردەکەی حەرام بکرێت کە خودا بۆی موباح کردووە و حەلاڵکردنی بۆ کەسێك خودا حەرامی کردووە لەسەری لە پیاوانی تر بەبێ بەلگەی قورئان و سوننەت.

## شافیعییەکان:

" ابو اسحاق الشیرازی[2]" دەڵێت: لە قسەی تازەیدا(واتە شافیعی) ئەوەیان دروستەکەیە، هەڵوەشانەوەی بۆ نییە وەك پێوانە بۆ سەر دابەشکردنیماڵەکەی، چونکە لە دابەشکردنی ماڵەکەیدا ناتوانی حوکم بە مردنی دەربکەی، هەر بەو جۆرە رێگە پێنەدراوە حوکم بە مردنی دەربکرێت لە مێردکردنەوەی ژنەکەیدا.

## زەیدییەکان:

جمهووری فەقیهانی زەیدی دەستیان گرتووە بەو رێسایەوە لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە: ((تەلاق بۆ ئەو کەسەیە پابەندە بە لاقەوە) هەروەها بەوەی

---

[1] أنظر المحلى ١٠ /١٣٩-١٤٣.

[2] المهذب ٢/١٤٦.

هاوسەرگیری بە قورئان و سوننەت جێگیر بووە و تەنها بە تەلاق یان مردن کۆتایی پێ دێت[1].

**رای دووەم-بریتییە لە درێژەپێدان:**

واتە هەر شێوازێك لە شێوازەکانی بزربوون حوکمێکی تایبەتی پێ بدرێت، ئەمە ئەوەیە فەقیهە مالیکییەکان و جەعفەرییەکان و حەنبەلییەکان و هەندێ لە فەقیهە زەیدییەکان و شافیعییەکان لە قسەی کۆنیدا و سەعیدی کوڕی موسەیب و ئەوانەی ڕێچکەی ئەوانیان گرتۆتە بەر هەڵیانبژاردووە.

## مالیکییەکان:

فەقیهە مالیکییەکان لە بابەتی جیاکردنەوە بە بزربوون درێژەپێدانێکیان هێناوە لە هیچ فیقهێکی تردا نایبینینەوە، وەك لەم ڕۆشنکردنەوەدا:

**أ-بێسەروشوێن پێنج بەشە، لەگەڵ هەریەکێك لەمانەدا بۆ ژنەکە حوکمێکی تایبەت هەیە:**

١-بزربوو لە وڵاتی ئیسلامدا بەبێ کاتی بڵاوەکردنی نەخۆشی و لە ڕەوشی ئاساییدا: ژنەکەی عیدەی مردنی لێ دەگرێت دوای دواخستنی بۆ ماوەی چوار ساڵ[2] لە بەرزکردنەوەی داواکەیەوە بۆ لای قەزا یان دەستەیەك لە موسڵمانان لەباری نەبوونی قازیدا.

٢-بێسەروشوێنی وڵاتی ئیسلامی لە کاتی بڵاوەکردنی تاعوندا یان هەر نەخۆشییەکی تیابەری تر: ژنەکەی عیدەی مردنی لێ دەگرێت لەدوای نەمانی نەخۆشییەکە بەهۆی زاڵبوونی گومان لە مردنەکەی.

---

[1] أنظر التاج المذهب ٢/٢٨٥ . البحر الزخار ٣/١٦٥ الروض النضير ٤/٤٢٨ ـ ٤٣٠.

[2] ئەم دیاریکردنە لە قەزاوەتی عومەری کوڕی خەتابەوە(خوا لێی رازی بێت) وەرگیراوە، یان لە دوورترین ماوەی سکپڕییەوە لە دیدی ئەوانەوە یان لە دوورترین ماوەی ڕۆیشتن و هاتنی پۆستەوە لە سەردەمی ئەواندا)

٣–بزربووی جەنگاوەر لە نێوان موسڵماناندا ژنەکەی عیدەی مردنی لێ دەگرێت لەدوای کۆتاهاتنی جەنگەکە، گەر بەڵگە هەبوو ئەو کەسە لە ریزی جەنگاوەراندا بووە، ئەگینا حوکمەکەی وەك بێسەروشوێنە لە وڵاتی ئیسلامدا کە پێشتر باسکرا.

٤–بێسەروشوێنی جەنگی نێوان موسڵمانان و بێباوەڕان: ژنەکەی عیدەی لێ دەگرێت بە عیدەی مردن لەدوای یەك ساڵ لەو کاتەوە کە کارەکە بۆ لای قازی بەرزدەکرێتەوە لەلای هەندێکیان، یان دوای وردبوونەوەی قازی لە کارەکەی و پرسیار و پشکنین دەربارەی بەجۆرێك مردنی بەسەر گومانیدا زاڵ ببێت لەلای هەندێکی تریان.

٥–بێسەروشوێنی زەوی وڵاتی بێباوەڕان: حوکمەکەی وەك حوکمی دیل وایە کە لە برگەی دواتردا باسەکەی دێت.

**ب–بزربووی دیل:**

ژنەکەی چاوەڕوان دەبێت تا هاوتەمەنەکانی دەمرن ئەو کات قازی حوکم بە مردنەکەی دەردەکات، چونکە ناتوانێ پشکنینی بۆ بکرێت و چارەنووسی دیاری بکرێت.

ئاشکرایە ئەمە تایبەت بووە بە چاخ و سەردەمی ئەوان، بەڵام ئەمڕۆ قازی دەتوانێت زانیاری هەبێت لەمەڕ چارەنووسی دیلەکە لە رێگەی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە لەوانە خاچی سوور.

**ج– ئەو بزربووەی شوێن هەواڵی دەزانرێت و دەتوانرێت پەیوەندی پێوە بکرێت لە رێگەی دەزگاکانی راگەیاندنەوە:**

قازی بە داوایەك لە ژنەکەوە فەرمان بە پیاوەکە دەکات یان بگەڕێتەوە بۆ لای ژنەکەی یان بیگوێزێتەوە بۆ لای خۆی یاخود تەڵاقی بدات، قازی بۆی هەیە ماوەیەك بخاتە بەردەستی بەپێی ئیجتیهادی خۆی، گەر لەدوای ماوەکە هەموو ئەوانەی رەد کردەوە قازی لە جێگەی ئەو تەڵاقی دەدات لەسەر ئەوەی ماوەی

بزربوونەکە لە ساڵێك کەمتر نەبێت لەلای هەندێك و لە سێ ساڵ زیاتر بێت لەلای هەندێکی تر لە فەقیهانی مالیکی.

دواخستن لە هەموو ئەو شێوازە باسکراوانەدا بە دوو خاڵ مەرجدارکراون:

**یەکەم:** خەرجی بۆ ژنەکە فەراهەم بێت، ئەگینا بۆ ژنەکە هەیە داوای جیابوونەوە بکات.

**دووەم:** نەترسانی ژنەکە لەخۆی لە بەربوونەوەی بۆ ناو خراپە و تاوان بەرهەمی بێبەشبوونی لە تێکەڵاوی هاوسەری، ئەگینا بۆ قازی دەسەڵاتی خەملاندن هەیە لە جیاکردنەوە بەبێ پابەندبوون بە دیاریکردنی ماوەی دیاریکراو بۆ دواخستن.

بەراست دەرکردنی قسەی ژنەکە لە بانگەشەی ترسان لە زینا و لە بانگەشەی دیاریکردنی شوێنی مێردەکە و توانای پەیوەندی پێوەکردن لە ڕێگەی پۆستەوە و ڕاگەیاندنەوە و لە زیانبینینی ژنەکە لە بزربوونی پیاوەکە، چونکە هەموو ئەوانە کاروبارێکن تەنها لە ژنەکەوە دەزانرێت.

**د-پیاوی ئامادە کە کۆچی کردووە لە تێکەڵاوی جووتبوون لە ژنەکەی بەبێ پاساو بە مەبەستی زیانگەیاندن پێی:**

حوکمی پشتتێکردنی بەسەردا دەگوزەرێت لای مالیکییەکان با ئەو کارەش هاومل بە سوێند نەبووبێت، بۆ قازی هەیە فەرمانی پێ بکات لەگەڵ ژنەکەی تێکەڵ ببێت یان تەڵاقی بدات، گەر هەردووکیانی ڕەد کردەوە قازی لەسەر ئەو تەڵاقی دەدات بە داوای ژنەکە لەدوای تێپەڕبوونی چوار مانگ[1].

---

[1] تایبەت بە پشتتێکردن ماوەکەی لە وازهێنان لە تێکەڵی هاوسەرییەوەیە، لەم بابەتەدا ولیدەبینم ماوەکەی لە بەرزکردنەوەی داوای ژنەکەوە دەست پێبکات.

وللاطلاع على تفاصيل اقسام المفقود والغائب راجع الخرشي ١٤٩/٤-١٥٣ وانظر الشرح الصغير مع الصأوي ٤٦٩/٢.

**هـ-خۆیەکلاکەرەوە بۆ عیبادەت و وازهێنان لە تێکەڵی هاوسەری بە شێوەیەکی تەواو:**

بۆ قازی هەیە لەسەر پیاوەکە ژنەکەی تەڵاقی بدات گەر نەیویست بگەڕێتـەوە بـۆ تێکەڵاوی هاوسەری یان تەڵاقدانی.

لە " مختصـر خليـل"دا هـاتووە: (ئیجتیهـاد دەکـەم[1]، تـەڵاق بـدات لـەباری نـە کەنارگیرکردنیان نە مانەوەی شەو لەگەڵیان، یان وازهێنان لە جووتبوون وەك زیانێك با کەسەکە نادیاریش بێت یان عیبادەتی بە هەمیشەیی بێت بەبێ دیاریکردنی ماوە لەسەر راستترین بۆچوون)[2]

**و-گەر مێردەکە دەوایەکی خواردەوە بۆ بڕینی هێزی جووتبوونی، یان دەوای چارەسەری نەخۆشییەك و بشزانێت ئەو دەوایە هێزی جووتبوونی ئەو نامێڵێت یان گومانی لەوەدا هەبێت پاشان ئەو ئەنجامەی لێوە پەیدا بوو ژنەکە مافی ئەوەی هەیە داوای جیابوونەوە بکات**[3].

**جەعفەرییەکان:**

دەڵێن: بۆ ژنی مێرد نادیار لە دوو باردا هەڵبژاردنی بۆ نییە:

**یەکەم:** گەر نادیارەکە هەواڵی هەبوو بەوەی بزانرێت هێشتا لە ژیاندایە.

**دووەم:** مێردەکەی هەواڵێکی لێوە نەبێت، بەڵام پیاوەکە سەرپەرشتیارێکی هەیە خەرجی لەسەر ژنەکەی دەکات.

گەر هەواڵێکی لەبارەوە نەبوو و کەسێکیش نـەبوو خـەرجی بـۆ بکـات: لەبارێکـدا ژنەکە ئارام نەگرێت کارەکەی بەرزدەکاتەوە بۆ بـەردەم قـازی، ئـەویش بـۆی هەیـە

---

[1] واتە قازی لەبەر رۆشنایی رەوشی بابەتەکە و پێویستی ژنەکەدا ئیجتیهادی خۆی دەکات و دەسەڵاتی خۆی بەکاردەهێنێت.

[2] مختصر خليل وشرحه الخرشي ٤/٩٣.

[3] أنظر شرح الخرشي ٤/٩٣، ٩٤،١٤٩، ١٥٣،١٥٢،١٥٠. الشرح الصغير مع حاشية الصأوي ٢/٤٦٩-٤٧١.

جیاکردنەوەکە بۆ ماوەی چوار ساڵ دوابخات و لە پیاوەکە بگەڕێ و پرسیار لە سەرئەنجامی بکات.

أ-گەر زانی لە ژیاندایە ئەوا ئارامگرتنی بە هەمیشەیی لەسەر ژنەکە پێویستە، بۆ ئیمام هەیە لە بەیتولمال خەرجی لەسەر بکات.

ب-گەر چارەنووسی پیاوەکە لە ژیان و مردن بۆ قازی ئاشکرا نەبوو، فەرمان بە ژنەکە دەکات عیدەی مردن لە پیاوەکەی بگرێت لەدوای کۆتاهاتنی چوار ساڵەکە پاشان بۆی هەیە مێربکاتەوە.

گەر مێردی نەکرد و لەدوای ئەوە مێردەکە گەڕایەوە دوو قسەیان بۆ هەیە: بەهێزترینیان ڕێگەیەك لەبەردەم پیاوەکەدا نییە بۆ گێڕانەوەی ژنەکەی، بەهۆی پچڕانی پەیوەندی هاوسەرگیرییەوە بە حوکمی قەزا[1]

## حەنبەلییەکان:

فەقیهانی حەنبەلی لە جیاکردنەوەی ژن و مێردا بەهۆی دیارنەمانەوە بۆ ئەم درێژەپێدانە دەچن:

أ-بزری نادیار لە ڕەوشێکدا تیاچوون تیایدا زاڵە وەك ڕەوشی جەنگ، ژنەکە چوار ساڵ چاوەڕوان دەبێت پاشان عیدەی مردن لە مێردەکەی دەگرێت، "المرداوی[2]" دەڵێت: ئەمە رای مەزهەبە و جمهووری هاوەڵانی مەزهەبی لەسەرە، ماوەی چاوەڕوانی ڕاستەوخۆ لە دیارنەمانەوە دەست پێ دەکات بەبێ ئەوەی پێویست بێت پەنا بۆ قەزا ببرێت ئەمەش لە ریوایەتێکدا کە زۆرینەی فەقیهانی حەنبەلی بە دروستترینی دادەنێن[3]، لە ریوایەتێکی تردا لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە کارەکەی بۆ بەردەم قازی بەرزدەکاتەوە بۆ ئەوەی حوکمی چاوەڕوانییەکە و عیدەی مردنەکەی(دوای چوار ساڵەکە) بۆ دەربکات.

---

[1] ایضاح الفوائد شرح اشکالات القواعد ٣/٢٥٣. المختصر النافع ص٢٢٥.

[2] الانصاف ٩/٢٨٨.

[3] المرجع السابق ٩/٢٨٩.

ب-بزری نادیار لەبارێکدا سەلامەتی و لەژیاندابوون بەسەریدا زاڵە لەسەر ژنەکە پێویستە چاوەڕوان ببێت تا مردنەکەی دەسەلمێت.

جیاکردنەوەی بۆ ناکرێت تا خەرجی بۆ کردن بوونی هەبێت، ئەگەر نە، داوای جیابوونەوەی بۆ هەیە لەبەر نەبوونی خەرجی نەك نادیاری و بزربوونی مێردەکەی[1]

ج-بۆ ژنێك مێردەکەی بەدیلگیرابێت حوکمی نادیار و بێسەروشوێنی هەیە لە رەوشی سروشتیدا[2].

د-گەر بزربوونەکە بڕلوە نەبوو بۆ ژنەکە دلوای جیابوونەوە نییە مەگەر نەتوانێت لە ماڵەکەی خەرجی بۆ بکات[3].

هـ-لە ئیمام ئەحمەدەوە وتنی جیاکردنەوە ریوایەتکراوە بۆ ژنی کەسی نادیار کە شوێن و چارەنووسی زانراوە گەر نادیارییەکەی بە بیانوویەك(پاساوێك) نەبێت لەدوای ئاگادارکردنەوەی لەلایەن قازییەوە بە گەڕانەوە یان گواستنەوەی ژنەکەی بۆ لای خۆی لەدوای تێپەڕبوونی شەش مانگ با بزربوونەکەی بە پاساوێکیش بێت.

**هەندێ لە فەقیهانی زەیدییەکان:**

هەندێ لە زەیدییەکان پێیانوایە گەر ماوەی بزربوونەکە درێژەیکێشا و ژنەکە بە نەبوونی هاوسەر زیانی بەردەکەوت هەڵوەشانەوە لەو بارەدا رێگەپێدراوە، چونکە گەر جیابوونەوە بەهۆی نەبوونی پیاوەتییەوە رێگەپێدراو بێت ئەوا رێگەپێدانی بۆ بزربوونی دووردودرێژ لەپێشترە، هەروەها لەبەر ئەوەی لە دەقەکانی کیتاب و سوننەتەوە زانراوە هێڵانەوەی ژنەکە بە زیانەوە حەرامە[4].

---

[1] المرجع السابق ٢٨٨/٩.

[2] المرجع السابق.

[3] المغني لابن قدامة ٤٨٨/٧.

[4] كما في قوله تعالى (وَلا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَاراً لِتَعْتَدُوا) سورة البقرة: ٢٣١.

بە هەمان شێوە لە چەندین شوێن نەهێکراوە لە هاوسەرگیری بە زیانگەیاندنەوە، بۆیە هەڵگرتنی زیان لەسەر ژنەکە بە هەموو شێوازێك پێویستە[1]، تێبینی دەکرێت لەم ئاراستەی زەیدییەکاندا ماوە دیارینەکراوە، بەڵکو کارەکەی بۆ خەملاندنی قازی بەجێهێڵاوە بەپێی رەوشی ژنەکە و لەبەر رۆشنایی هەلومەرجی بزربوونەکەدا.

## شافیعییەکان لە قسەی کۆنیاندا:

شافیعی لە قسەی کۆنیدا لەسەر جیاکردنەوە و هەڵوەشانەوەیە تەنها بۆ ژنی پیاوی بێسۆراخ لەدوای چوار ساڵ چاوەڕوانی، لەبەر ئەو ریوایەتەی عەمری کوڕی دینار ریوایەتی کردووە: ژنی پیاوێکی بێسەروشوێن هاتە لای عومەری کوڕی خەتاب– خوا لێی رازی بێت– فەرمانی پێکرد چوار ساڵ بمێنێتەوە پاشان عیدە بگرێت و پاشان مێرد بکاتەوە[2]، لەم پاڵپشتەی شافیعییەوە تێدەگەین چاوەڕوانی لە بەرواری بەرزکردنەوەی کارەکەیە بۆ بەردەم قەزا، شافیعی بە پێوانە پاڵپشتی رایەکەی خۆی کردووە و دەڵێت: گەر هەڵوەشانەوە لەبەر نەبوونی کاری جووتبوون بەهۆی نەبوونی پیاوەتییەوە و خەرجینەکردن لەباری هەژاریدا رێگەپێدراو بێت ئەوا لێرەدا کە هەردووکی هاتۆتەدی(نەبوونی هاوسەریکردن و نەبوونی خەرجی) جیاکردنەوە لەپێشترە[3].

## سەعیدی کوڕی موسەیب:

سەعیدی کوڕی موسەیب دەڵێت: گەر لە ریزی جەنگاوەراندا[4] بێسەروشوێن بوو ساڵێك ژنەکەی مۆڵەت دەدرێت و پاشان لەیەکتر جیادەکرێنەوە، لە رەوشەکانی تردا کە ژیان و سەلامەتی تێدا زاڵە چوار ساڵ دوادەخرێت و پاشان لەیەکتر

---

(1) أنظر الروضة الندية ٢/٥٦.

(2) المهذب ٢/١٤٦.

(3) المهذب المرجع السابق.

(4) أي صف الحرب.

جیادەکرێنەوە[1]

**ئەنجامگیری:**

لەم خستنەڕووەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی سەرچاوەی جیاوازی فەقیهان لە جیاکردنەوەدا بە بزربوون بریتییە لە بەرهەڵستی هەندێ ریوایەت لەگەڵ ئاشکرای دەقی قورئاندا وەك ئەو بەرهەڵستییەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ریوایەتکراوە دەربارەی ژنی پیاوی بێسەروشوێن فەرمووی: ((ئەو ژنییەتی تا رۆشنکردنەوەی بۆ دێت)) لەگەڵ ئاشکرای ئایەتی: ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾.[2]

لەلایەکی ترەوە بەرهەڵستی قەزاوەتی هاوەڵان وەك جیاوازی نێوان قەزاوەتی عومەر–خوا لێی رازی بێت– بە دواخستنی چوار ساڵ پاشان جیاکردنەوە و پاشان عیدە و مێردکردن لەگەڵ قەزاوەتی عەلی کوڕی ئەبی تالب–خوا لێی رازی بێت– بە پێچەوانەی ئەوەوە.

هەر بەو جۆرە بەرهەڵستی پێوانە بۆ سەر نەبوونی پیاوەتی و خەرجی بۆ نەکردن و پشتتێکردن لەگەڵ "إستصحاب"(جێگیر بە یەقین تەنها بە یەقین دەسڕێتەوە)

پاشان بەرهەڵستی دیدگای خودی فەقیهان بە یەکتری لە تێڕوانیان بۆ زیانی مەعنەوی(بێبەشبوونی ژنەکە لە خۆشیوەرگرتن لە تێکەڵی لەگەڵ پیاوەکەی) هەیانە گرنگیان پێداوە و جیاوازی نەکردووە لە نێوان زیانی مەعنەوی و زیانی مادیدا(بێبەشبوون لە خەرجی)، هەیانە تەنها دەستی بۆ زیانی مادی بردووە، بۆ هەر دیدگایەك رێچکەیەکی تایبەت هەیە و خودا زاناترە بە راستی.

---

[1] المغني لابن قدامة ٤٩٠/٧، المحلى لابن حزم ١٤٠/١٠.

[2] (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجاً) (الطلاق:٢).

## پارسەنگدان:

تێگەیشتووانەتر ئەوەیە ئیمام سەعیدی کوڕی موسەیب(رەحمەتی خودای لێ بێت) بۆی دەچێت لەوەدا گەر پیاوەکە لە رەوشێکدا بزربوو مردنی تێدا زاڵ بێت قازی دەتوانێت حوکم بە جیاکردنەوە بکات لەدوای ساڵێك لە دیارنەمان نەك لە بەرواری بەرزکردنەوەی داواکەوە، تا ژنەکە زیانی پێ نەگات گەر ئارەزووی جیابوونەوەی کرد بە بەرزکردنەوەی داوایەك لە ئەوەوە یان لە نوێنەری ئەوەوە، ئەگەر نە، دیارنەمان لە رەوشی ئاساییدا جیاکردنەوەیان لە دوای چوار ساڵە دیسان لە بەرواری دیارنەمانەوە، گەر چارەنووسی دیل دیاربوو چوار ساڵ ژنەکەی دوادەخرێت گەر لە فیتنە نەدەترسا، ئەگەر نە، بۆ قازی هەیە لەبەر رۆشنایی رەوشی ژنەکەدا بڕیار دەربکات.

دیارنەمان بەهۆی بەندکردنەوە بە ماوەیەك زیاتر بێت لە چوار ساڵ گەر ژنەکە داوای جیابوونەوەی کرد ساڵێك دوادەخرێت لە بەرواری جێبەجێ کردنی حوکمەکەوە.

نادیاری خاوەن پاساو کە چارەنووس و شوێنی دیارە، پاساوی دیارنەمانەکەی ماوەیەك زیاتر لە چوار ساڵ داوا دەکات حوکمی ژنی کەسی بەندکراو و نادیار(غائب)ی شوێن و چارەنووس دیار بە ژنەکەی دەدرێت، گەر پاساوی نەبوو ماف جیابوونەوە بۆ ژنەکە هەیە لەدوای ئاگادارکردنەوەی و تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر بزربوونیدا، وەك دەستبردن بۆ ئەوەی هەندێ لە مالیکییەکان بۆی دەچن، ئەوەش بە چاوداخستن لەو ماوەیەی بزربوونەکەی دەیخایەنێت.

پیاوی ئامادە(حاضر) کە بەبێ پاساوێك کۆچی لە ژنەکەی کردووە و ژنەکەش بەو کارە زیانی پێگەیشتووە مامەڵەی پشتتێکەری لەگەڵ دەکرێت، بۆ قازی هەیە لەیەکتریان جیابکاتەوە لەدوای ئاگادارکردنەوە و پێدانی مۆڵەت کە قازی بڕیاری لەسەر دەدات بەپێی ئیجتیهادی خۆی، لەسەر ئەوەی دەست پێ بکات لە دوای تێپەڕبوونی چوار مانگ(ماوەی پشتتێکردن) بەسەر پشتتێکردنەکەیدا بەپێی ئەوەی مالیکییەکان دەیڵێن لەوەی حوکمەکانی پشتتهەڵکەر بەسەر ئەو کەسەدا گوزەر

دەكات كە بەئەنقەست كۆچ لە ژنەكەی دەكات با ئەو كۆچكردنەش هاوملی سوێند نەكرابێت.

ئەوەش وەك دەستبردن بۆ گشتاندنی ئەو دەقانەی فەرمان بە هەڵگرتنی حەرەج و سڕینەوەی زیان و ڕێگری لە ستەم و هەڵگرتنی بەشخوراوی دەكەن و جیاكاری نەكردن لە نێوان زیانی مادی و زیانی مەعنەوی بۆ كەسی زیانپێگەیشتوو.

هەروەها لەبەر ئەوەی قورئان بە چوار مانگ كەمترین ئاستی دیاریكردووە بۆ داواكاری ژنەكە لە مافی هاوسەریكردن و تێكەڵاوی، گەر لێی بێبەشكرا، لە ئایەتی: ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ* وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[1].

هەروەها لەبەر ئەوەی عومەری كوڕی خەتاب لە سەردەمی خەلافەتی خۆیدا پرسیاری لە ژنان كرد(دەوترێت پرسیاری لە كچەكەی خۆی (حەفصە) كرد) ئافرەت چەند دەتوانێت لەسەر مێردەكەی ئارام بگرێت؟ وتیان دوو مانگ، لە سێیەمدا ئارامی كەم دەبێتەوە، لە چواردا ئارامی نامێنێت، بۆیە عومەر –خوا لێی ڕازی بێت– بۆ ئەمیری سەربازەكانی نووسی: پیاوێك زیاتر لە چوار مانگ لە ژنەكەی بەند مەكەن.

ئەو قەزاوەتەشی لە دوای ئەوە بوو شەوێك بە شاری مەدینەدا دەسوڕایەوە گوێی لە ژنێك بوو دەیوت:

| | |
|---|---|
| تطأول هذا الليل وازوّر جانبه[2] | وليس الى جنبي خليـل الاعبه[3] |
| فوالله لو لا الله لا شيءَ غيره[4] | لزعزع[5] من هذا السرير جوانبه |
| مخـافةَ ربي والحيـاءُ يكفّني | وأكـرم بعلي أن تُنال مراكبه[6] |

---

[1] سورة البقرة: ٢٢٦،٢٢٧.

[2] واته لایداوه، له ریوایهتێكدا "واسود جانبه".

[3] له ریوایهتێكدا: وطال عليّ أن لا خليل الاعبه.

[4] له ریوایهتێكدا: فوالله لو لا خشية الله وحده.

[5] زعزعه: به توندی جموجووڵی دەكرد

[6] أنظر المغني لابن قدامة ٣٠١/٧.

## سێیەم-جیاکردنەوە بە گوناه و یاخیبوونێک یەکێک لە دوو هاوسەرەکە ئەنجامی بدەن:

بۆ ئەو گوناه و یاخیبوونە نموونەی زۆر هێنراوەتەوە لە فیقهی ئیسلامیدا لەوانە: پشتتێکردن و لەعنکردن[1] و پاشگەزبوونەوەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە لە ئیسلام و نەویستنی یەکێکیان بۆ هاتنە ناو ئیسلام لەدوای ئەوەی ئەویتریان هاتە ناو ئیسلامەوە...

پێشتر بەدرێژی باسی حوکمەکانی پشتتێکردنمان کرد بۆیە پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات، تایبەت بەوانی تر ئەم رۆشنکردنەوەمان هەیە:

**أ-لەعنکردن[2]:**

هەندێ جار مێردەکە بە شێوەیەکی راستەوخۆ ژنەکەی بە ناپاکی تۆمەتبار دەکات یان بە رێگەی ناڕاستەوخۆ بەوەی رەچەڵکی سکەکەی یان منداڵەکەی نەرێ بکات(نەیداتە پاڵ خۆی) و بڵێت: ئەو سکە یان ئەو منداڵە لە من نییە، ئەم تۆمەتە بریتییە لە قەزف(تۆمەتبارکردن)ە، بۆیە پێویستە حوکمە هاتووەکانی ئەم ئایەتەی

---

(1) پشتتێکردن و پێویستکەری لەعن لە کاری خراپەوە لە یاخیبووەکانن، پشتتێکردن رۆشنە لەبەر ئەو ستەمەی تێیدایە لە ژنەکە بەبێ پاساوێك، لەعنکردنیش لەبەر ئەوەی ژن و پیاوەکە لە تاوانێکەوە گلاون: یان تاوانی درۆکردن(بوختان) یان تاوانی زینا، وەك پێغەمبەر(ﷺ) بە دەق ئەوەی هێناوە و دەفەرموێت بە دوو لەعنکارەکە: ((دادگاییتان لەلای خودایە، یەکێك لە ئێوە درۆ دەکات، تۆش(پیاوەکە) هیچ رێگەیەکت بۆ سەر ژنەکە لەبەردەمدا نەماوەتەوە)). نیل الأوطار ٦/٣٠٤.

(2) اللعان: مصدر لاعن يلاعن ملاعنة ماخوذ من اللعن وهو الطرد والابعاد. رووی لێکچوون لە نێوان مانای زمانەوانی و مانای شەرعیدا بریتییە لە دووری لە دووری دوو هاوسەرەکە لە بەزەیی، یان دووری هەریەکەیان لەویتریان بە جۆرێك هەتا ماون لەگەڵ یەکتر کۆنابنەوە. عمدة القارئ شرح صحيح البخاري ٢٠/٢٨٩.

بەسەردا گوزەر بکات: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾[1].

بەڵام حیکمەتی خودایی دەیەوێت سزاکە بە ڕێگەیەکی تر بێت کاتێك گومان خۆی دەخزێنێتە ناو قەوارەی خێزانەوە و بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەری سەردەکێشێت بۆ دەرئەنجامی نەرێنی و ئاسارەکانی لەسەر منداڵەکان بەخراپی دەشکێنەوە و لەوێشەوە بەسەر کۆمەڵگەدا.

لەسەر ئەم ڕاستییە و ڕاستییەکانی تر خودا -ﷻ- دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ أَنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ* وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ* وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ* وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾[2].

بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزانە کە چۆنێتی لەعنکردن ڕۆشن دەکەنەوە پێویستە ئەم ڕێکارانە بگیرێنە بەر:

١- لەعنکردنەکە لەبەردەم دادوەردا یان نوێنەری دادوەردا بێت، چونکە سوێند و شایەتی تەنها لەبەردەم قازیدا دەبنە بەڵگە.

٢- دادوەر یان نوێنەرەکەی فەرمان بە دوو لەعنکەرەکە بکات گوزارەی لەعنکردنی هاتوو لە ئایەتەکاندا بەکاربهێنن و مێردەکە چوار جار بڵێت: خودا دەکەم بە شایەت ئەو لە ڕاستگۆیانە لەوەی تیایدا ژنەکەی تۆمەتبار کردووە، پاشان بۆ جاری پێنجەم دەڵێت لەعنەتی خودا لەسەری بێت گەر لە درۆزنان بێت.

---

[1] سورة النور: ٤.

[2] سورة النور: ٦،٧،٨، ٩.

ژنەکەش چوار جار دەڵێت: خودا دەکەم بە شایەت ئەو پیاوە لە درۆزنانە لەوەی منی پێ تۆمەتبار کرد، و لە جاری پێنجەمدا دەڵێت: خەشم و تووڕەیی خودای لەسەر بێت گەر پیاوەکەی راست بکات.

٣-لەعنی پیاوەکە پێش لەعنی ژنەکە بکەوێت ئەوەش وەك ڕێکخستنی هاتنی لە ئایەتەکاندا و شوێنکەوتنی کاری پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەروەها لەبەر ئەوەی لەعنی ژنەکە بۆ لابردنی سزایە لەسەر خۆی و تەنها دوای لەعنی پیاوەکە سزاکە(بە هۆی تۆمەتەکەوە) رووی لێ دەکات.

٤-بەدوای یەکتردا هاتنی گوزارشتەکانی لەعن.

٥-هەریەك لە دوو لەعنکارەکە هاوەڵەکەی بەرانبەری بە ئاماژە یان رووتێکردن یان ناونیشانی تەواو دیاریدەکات.

**ئەسەرەکانی لەعنکردن:**

جیاوازی لە نێوان فەقیهانی موسڵماندا نییە[1] لەدوای لەعنکردن ئەم ئاسارانە لەسەر دوو هاوسەرەکە سەرهەڵدەدەن:

١-بە هەموو تەمەن ژنەکە لە پیاوەکە حەرام دەبێت.

٢-بەربوونەوەی سزای قەزف لەسەر مێردەکە و سزای زینا لەسەر ژنەکە، چونکە تۆمەتەکە بە بەڵگە نەسەلماوە.

٣-نەرێکردنی رەچەڵکی منداڵەکە یان سکەکە لە باوکی بە بڕیاری قازی.

٤-جیابوونەوەی دوو هاوسەرەکە لەدوای بڕیاری قازی.

---

[1] واتە جیاوازییەك بەهەند وەرناگیرێت، ئەگینا "عثمان البتي" بۆ ئەوە دەچێت بە لەعنکردن یان بە قازی جیابوونەوە روونادات، بەڵکو مێردەکە تەلاقەکە دەخات "ابو عبید" دەڵێت: جیابوونەوە بە هەمان ئەو قەزفکردنە روودەدات با لەعنیش بوونی نەبێت. أنظر عمدة القاری، شرح صحیح البخاري ٢٠/٢٩٥.

بەڵکو جیاوازی لە دوو ئەسەری تردایە ئایا ئەو دوو ئەسەرە لەسەر لەعنکردن سەرهەڵدەدەن گەر یەکەمجار حوکمی قازی پێوە پەیوەست نەبێت یان نە؟ لەم درێژەپێدانەدا:

أ-حەنەفییەکان[1]:- جگە لە "زفر"، و" زەیدییەکان "[2]، و" حەنبەلییەکان " لە یەکێك لە دوو ریوایەتی الإمام أحمد[3] دەڵێن: هەرکات لەعنکردن پێویست بوو و بە شێوەیەکی دروست لە نێوان دوو هاوسەرەکەدا ئەنجامدرا و شتێك بەسەریدا نەهات پووچی بکاتەوە راستەوخۆ جیاکردنەوە و بڕینی رەچەڵەکی لێوە پەیدا نابێت مەگەر لە دوای پەیوەستبوونی بڕیاری قازی بە کارەکەوە، بەر لەو بڕیارە هاوسەری راوەستاوە و رەچەڵەك ماوەتەوە، بینا لەسەر ئەوە گەر حوکمی قازی دواکەوت یان بەهۆی بەربوونەوەی لەعنکردنەکەوە حوکمەکە دەرنەکرا ئەوا تەلاق و پشتەهەڵکردن و پشتتێکردنی ئەو پیاوە بۆ ژنەکەی دروستە و لەیەکتر میرات دەبەن، بە فەرموودە و پێوانە و "إستصحاب" بەڵگەیان لەسەر ئەمە هێناوەتەوە.

فەرموودە: کۆمەڵێك ریوایەت هەن ئاماژە دەکەن بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆخۆی سەرپەرشتی جیاکردنەوەی نێوان دوو لەعنکارەکەی کردووە لەدوای لەعنکردنیان لەیەکتر، لەوانە:

لە نافیعەوە لە ئەبی عومەرەوە-خوا لێی رازی بێت-: (پێغەمبەر(ﷺ) سەرپەرشتی لەعنی ژن و پیاوێکی کرد خۆی لە منداڵەکەی ژنەکە بەریکرد و منداڵەکە بە ئافرەتەکە درا[4]، هەروەها ئەوەی لە ئیبن عومەرەوە ریوایەت کراوە لەوەی دەڵێت: (پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێك و ژنێکی لەیەکتر لەعن کرد و لەیەکتری جیاکردنەوە)[5].

---

[1] بداية المبتدى وشرحه الهداية مع فتح القدير ٤/٢٨٥ ـ ٢٨٦.

[2] التاج المذهب ٢/٢٦٣ ـ ٢٦٤.

[3] المغني لابن قدامة ٧/٤١٠.

[4] عمدة القارئ شرح صحيح البخاري للعيني٢٠ /٣٠١ نيل الأوطار ٦/٢٩٩ .

[5] عمدة القارئ المرجع السابق ٢٠/٢٩٥، فتح الباري شرح صحيح البخاري ٩/٤٥٨.

هەروەها ئـەوەی لـە عەبـدوڵاوە لـە نافعـەوە لـە ئـیبن عومـەرەوە هـەواڵی پێـدا: پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێکی لە ژنەکەی جیاکردەوە، پیاوەکە ژنەکـەی قـەزف کردبـوو و پێغەمبەریش سوێندی دان)[1].

## رووی بەڵگەهێنانەوە:

سێ ریوایەتی یەکەم بەئاشکرا ئاماژە دەکەنە سەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆخۆی قەزاوەتی جیابوونەوەی نێوان دوو لەعنکارەکەی کردووە دوای لەعنکردنی یـەکتری، ئەوەش بەسە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت جیاکردنەوە لە دوای بڕیاری قازی روودەدات.

لـە تەڵاقەکـەی "عـویمر"ەوە لـەدوای لـەعنکردن و بێـدەنگی پێغەمبـەر(ﷺ) تێدەگەین: جیاکردنەوەکە تەنها بە لەعنکردنیان رووینەداوە ئەگینا پاساوێك بۆ تەڵاق نامێنێتەوە.

**پێوانە:** دەڵێن: لەعنکردن یان شایەتییەکی دڵنیاکەرە بە سـوێند، یـان سـوێندە، هەریەك لەم دوانە ئەسەرێکیان لە تیابردنی حەقدا بۆ نییە گەر پەیوەست نـەبێت بـە قەزاوە پێوانە بـۆ سـەر شـاتیدانەکان و سـوێندخواردنەکان لـە پرسـەکانی تـردا کـە ئاساری لەسەر پەیدا نابێت مەگەر لەدوای حوکمی قازی.

**ئیستصحاب:** دەڵێن: حوکمی هاوسەرگیری بە هۆیەکی شەرعی بە یەقین جـێگیر بووە(گرێبەستی شـەرعی) و تـەنها بـە هۆیـەکی شـەرعی (تـەڵاق) دەسـڕێتەوە گـەر سڕینەوەی واجب بوو و پیاوەکە رێگری دەکرد یان دەستەوسان بوو قازی لە جێگەی پیاوەکە راست دەبێتەوە.

ب-" مالیکیـــەکان[2]:و جەعفەریـــەکان[1]و ظـــاهریـــەکان[2]، و"زفـــر" لـــە " حەنەفیەکان "[3]، و ریوایەتێکی حەنبەلییەکان[4]" بۆ ئەوە دەچـن جیاکردنـەوە بـە

---

[1] عمدة القارئ المرجع السابق.

[2] في شرح الخرشي (١٣٤/٤): (بەری لەعنکردن شەش شتە: سیانیان لەسەر لەعنی مێردەکە سەرهەڵدەدات: هەڵگرتنی حەد لەسەر خۆی، پێویستکردنی حەد لەسەر ژنەکەی، بڕینی رەچەڵەك لە سکی ژنەکەی یان منداڵێکی نەرێکراو، سیانیشیان لەسەر لەعنکردنی ژنەکە ←

لەعنکردنی تەولوی دوو هاوسەرەکە تەولو دەبێت، بەڵگەیان بە فەرموودە و پێوانە لەسەر ئەوە هێناوەتەوە:

**فەرموودە:** چەند ریوایەتێك لە فەرموودەدا بوونی هەیە پاڵپشتی ئەوە دەکەن جیاکردنەوە تەنها لەدوای بڕیاری قازی دەبێت، هەروەها فەرموودەی تر ریوایەتکراوە ئەوەی لێ حاڵی دەبین بە لەعنکردنی دوو هاوسەرەکە جیابوونەوە بەدەستهاتووە با حوکمی قازیش هاوملی نەبێت، لەوانە: فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): ((دوو لەعنکارەکە کۆنابنەوە))[5]، رووی بەڵگەهێناوە بەم فەرموودەیە ئەوەیە وتنی مانەوەی هاوسەری دوای تەولوبوونی لەعنکارییەکەیان بەم دەقەدا دەکێشێت.

فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بە مێردە لەعنکارەکە –دوای لەعنکردنەکەی–: ((هیچ رێگەیەکت(سبیل) لەبەردەمدا نەماوەتەوە بۆ سەر ژنەکەت)) دەڵێن: گوزارەی "سبیل" نەناسرلوە لە میانەی نەرێدا کە گشتاندن دەگەیەنێت، هەروەها قسەکەی

---

سەرهەڵدەدات: هەلگرتنی حەد لەسەر خۆی، و هەڵوەشانەوەی هاوسەرییە پێویستەکەی، و بۆ هەتاهەتایە حەرامبوونی لە پیاوەکەی).

(1) في ایضاح الفوائد (٣/٤٥١): (چوار حوکم بە لەعنەکەیانەوە پەیوەست دەبێت: جیابوونەوە، بۆیە نابن بە میراتگری یەکتری، و حەرامبوونی هەتاهەتایی لە یەکتری و هەرگیز بۆ یەکتر حەلاڵ نابن، بەربوونەوەی دوو حەدەکە لەسەر پیاو و ژنەکە، نەرێکردنی منداڵەکە لە پیاوەکە نەك لە ژنەکە، جیابوونەوە لەسەر جیاکردنەوەی دادوەر کورتنەبووەتەوە بەڵکو بە خودی لەعنکردنەکە دێتەئارلوە، جیابوونەوەی لەعنکردن هەڵوەشانەوەیە نەك تەلاق).

(2) في المحلى (١٠/١٤٣): (گەر ژنەکە نەرێی کرد لە حەد بەری دەبێت و هاوسەرییەکەی هەڵدەوەشێتەوە لە پیاوەکە و هەتاهەتایە لێی حەرام دەبێت، و هەرگیز بۆی حەلاڵ نابێتەوە، بە تەولوبوونی لەعنەکە جیابوونەوە بەرهەم دێت).

(3) في الهدایة مع فتح القدیر (٤/٢٨٦): "زفر" دەڵێت: جیابوونەوە دێتە ئارلوە بە لەعنکردنیان بۆ یەکتری، چونکە حەرامبوونی هەتاهەتایی جێگیر دەبێت بە فەرموودەی: ((دوو لەعنکارەکە هەتاهەتایە کۆنابنەوە))

(4) في المغني ٧/٤١٠ ریوایەتی دووەم جیابوونەوە بەرهەم دێت تەنها بە لەعنکردنیان، ئەوەش قسەی "مالیك و داود و زفر"ە).

(5) نیل الأوطار ٦/٣٠١.

عـەلی و ئـیبن مەسعود(سـونەت وایـە لـە دوو لەعنکارەکـەدا هـەرگیز جـارێکی تـر کۆنەبنەوە)[1].

ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی لـەعنکردنی دوو هاوسـەرەکە تـەحریم کردنـی هەتاهەتایی لەگەڵە و ئەوەش بوونی جیاکردنەوە راستەوخۆ لەدوای لەعنەکە پێویست دەکات.

"الباجي[2]" دەڵێت: فەرموودەکەی "عویمر" بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جیابوونەوە دوای لەعنکردنەکە روودەدات با بڕیاری قەزاشی پێوە پەیوەست نەبێت بـە بەڵگـەی ئەوەی تیایدا هاتووە: (بەر لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمان بکـات پێـی) چـونکە ئـەم قسەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جیابوونەوە بەبێ بڕیاری قازی روودەدات.

**پێولـە**: دەڵـێن: ئـەم جیاکردنـەوە وەك جیاکردنـەوە وایـە بـە حـەرامکردنی شیرخواردن و خزمایەتی کە دلوای حەرامی هەتاهەتایی دەکـات وەك چۆن حـوکمی "لەسـەرپێوانەکراو" پێویسـتی بـە قـەزا نییـە هـەر بـەو جـۆرە حـوکمی "پێوانەکراوەکە"[3].

ج-شافیعییەکان دەڵێن: جیابوونەوە بە تەواوبوونی لەعنی پیاوەکە روودەدات با ژنەکەش هێشتا لەعنی نەکردبێت[4] و قازیش حوکمی پێ دەرنەکردبێت[5].

---

(1) المرجع السابق ٦/٣٠٤.

(2) المنتقى شرح الموطأ للباجي ٤/٧٣.

(3) المنتقى شرح الموطأ ٤/٧٣.

(4) في قليوبي وعميرة (٤/٣٧): (جیابوونەوە لە لەعنی پیاوەکەوە پەیوەست دەبێت با درۆزنیش بێت یان ژنەکە لەعنی نەکردبێت یان قازی بڕیاری پێ دەرنەکردبێت).

(5) في شرح التحرير مع الشرقاوي (٢/٣٠٨ ـ ٣٠٩): (شەش حوکم بە لەعنەکەیەوە بەرهەم دێ: نەرێکردنی رەچەڵەك بە سکی ژنەکە یان منداڵەکەیەوە، لادانی حەد لەسەر خۆی بۆ سەر ژنەکە، و بە هەتاهەتایی حەرامبوونی ژنەکە، و پێویستبوونی حەد بۆ سەر ژنەکە، و هەڵوەشانەوەی هاوسەریی لە ناوەوە و لە دەرەوە وەك شیردان، بەربوونەوەی ماف بەخێوکردن لە پای پیاوەکە)، "الشرقاوي" لەسەر گوزارەی "بە لەعنەکەیەوە" دەڵێت: (واتە دوای تەواوبوون لە لەعنەکەی بەبێ وەستان لەسەر لەعنی ژنەکە و بڕیاری قازی).

بەپێی زانستی من یەکێك لە فەقیهانی موسڵمان نابینینەوە لەگەڵ شافیعی هاوڕابێت لە وتنی جیابوونەوە تەنها بە لەعنکردنی پیاوەکە.

کارەکە لە مامۆستای پایەبەرز "فرج السنهوری "(رەحمەتی خودای لێ بێت) تێکەڵبووە کاتێك دەڵێت: (جیابوونەوە بە تەولوبوونی لەعنی پیاوەکە رووەدات با ژنەکەش لەعنی نەکردبێت، ئەوەش ئاشکرای قسەی مالیکە لە "الموطأ"دا و قسەی "اصبغ"ە)[1].

ئەمەش بە تەواوی پێچەوانەیە بەوەی لە "الموطأ" و شەرحەکە"المنتقی"دا هاتووە کە دەقەکەی دەڵێت: (جیابوونەوە بە لەعنی پیاوەکە روونادات تا ژنەکە لەعنکردنی خۆی تەواو دەکات پێچەوانەی شافیعی لەوەی جیابوونەوە بە لەعنکردنی مێردەکە رووەدات "أصبح" لە "ابن القاسم"ەوە لە "العتبیة"دا ریوایەتی کردووە: جیابوونەوە بە لەعنکردنی مێردەکە رووەدات، بەڵام تەنها بە لەعنی ژنەکە تەولو دەبێت، ئەمە ناکۆکییە لە مەزهەبدا لەلای هاوەڵانمان ئەو(ژنەکە) گەر لەعن نەکات جیابوونەوە لە نێوانیاندا جێگیر نابێت، هەر بەو جۆرە گەر پیاوەکە خۆی بەدرۆخستەوە لە نێوانیاندا تەولوی لەعنکردنەکە جێگیر نابێت، مالیك لەسەر ئەمە بە دەق هێناویەتی)[2].

**لەم قسەیەوە بۆمان رۆشن دەبێتەوە:**

١-کەس لە مالیکییەکان لەگەڵ شافیعی هاوڕانەبووە، چونکە ئەو کەسەی دەڵێت جیابوونەوە بە لەعنی پیاوەکە رووەدات دەڵێت بە لەعنی ژنەکە تەولو دەبێت.

٢-ئەو کەسەی دەڵێت بە لەعنی پیاوەکە رووەدات گەر لەعنی ژنەکە بە دوایدا تەولو بوو لە ماناد‌ا جیاوازی نییە لەگەڵ ئەوەی دەڵێت تەنها بە لەعنی

---

[1] استاذنا الشیخ فرج السنهوري، محاضرات في موضوع (النسب) القاها على طلبة الدارسات العليا - كلية الحقوق - جامعة القاهرة ١٩٧٢ ص٦٢ وكنت لحد تلاميذه أنئذ جزاه الله عنا خير الجزاء.

[2] أنظر المنتقى شرح الموطأ ٧٣/٤.

هەردووکیان روودەدات، چونکە ناکۆکییەکە گوزارەییە، وەك "الباجي" دەڵێت: (ئەوە تەنها جیاوازییە لە دەربڕیندا)

٣-هیچ یەکێك لە مالیکییەکان نەیوتووە گەر ژنەکە لەعنی نەکرد جیابوونەوەکە روودەدات پێچەوانەی ئەوەی شافیعییەکان لەسەری کۆبوونەوەتەوە لەوەی لەعنکردی پیاوەکە جیابوونەوەی لەسەر پەیدا دەبێت با ژنەکەش لەعنی نەکردبێت یان قازی حوکمی پێ دەرنەکردبێت.

٤-قسەکەی "الباجي": واتە ئەو قسەی کە دەڵێت: (مالیك بە دەق هێناویەتی) واتە بە دەق هێناویەتی هەر کەس خۆی بەدرۆ خستەوە بەر لە تەولوبوونی لەعنکردنی ژنەکە جیابوونەوە روونادات)

## پارسەنگدان:

پێمولیە تێگەیشتووانەتر ئەوەیە حەنەفییەکان و ئەوانەی رێچکەی ئەوانیان گرتۆتە بەر بۆی دەچن، بە دوو هۆ:

یەکەم-جێگیربوونی قەزاوەتی پێغەمبەر(ﷺ) بە جیابوونەوە دوای لەعنی دوو لەعنکارەکە ئەوەش لە زۆرێك لە ریوایەتدا وەك باسمان کرد.

دووەم-کۆدەنگی فەقیهانی موسڵمان لەسەر ئەوەی لەعنکردن پێویستە لەبەردەم قازیدا بێت یان لەبەردەم نوێنەری قازیدا بێت، بەڵگەنەویستە هەموو رێکاری قەزاییانە پێویستە بە بڕیارێکی قەزاییانە کۆتایی پێ بێت.

### ب- پاشگەزبوونەوەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە:

پاشگەزبوو ئەو کەسەیە دەچێتەوە سەر بێباوەڕی لەدوای ئیسلام، یەکسانە بێباوەڕی پێش ئیسلامەکەی کەوتبێت یان نە، یەکسانە پاشگەزبوونەوەکەی بە کردار بێت وەك سوژدەبردن و عیبادەت بێت بۆ بێگیان بێت یان رووەك یان ئاژەڵ یان مرۆڤ یاخود قورئان هەڵبداتە ناو پیسایی، هەموو کارێکی تر بەئاشکرا و راشکاوانە گاڵتەکردن بێت بە ئایینی ئیسلام.. یاخود بە گوفتار بێت وەك گوزارەیەکی راشکاو لەسەر نەرێکردنی ئەوەی لە ئیسلامدا بە جێگیربوونێکی بەڵگەنەویست جێگیربووە،

یان ئەوەی ئیسلام حەلاڵی کردووە حەرامی بکات یان ئەوەی ئیسلام حەرامی کردووە حەلاڵی بکات..

یەکسانە هەموو ئەوانە لە لاسارییەوە بێت یان لە باوەڕەوە یان گاڵتەپێکردن..

لە کەسی پاشگەزبوودا باڵغبوون و ئەقڵ و هەڵبژاردن بە مەرج دەگیرێن، بۆ کەسی پاشگەزبووو زۆرێك لە حوکم بوونیان هەیە، ئەوەی لێرەدا جێگەی گرنگی ئێمەیە حوکمی هاوسەریکردنییەتی گەر هاوسەری هەبوو.

جیاوازی لە نێوان فەقیهانی موسڵماندا بوونی نییە -بە هەڵواردەی زاهیرییەکان- لەوەدا کە پاشگەزبوونەوەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بەر لە چوونە لا راستەوخۆ جیابوونەوەی لەسەر پەیدا دەبێت[1].

ناکۆکی لەوەدا نییە پاشگەزبوونەوەی یەکێکیان بێ هیچ دوودڵییەك سەردەکێشێت بۆ جیابوونەوە لەدوای کۆتاهاتنی عیدە گەر لەو ماوەیەدا نەگەڕایەوە لەبارێکدا پاشگەزبوونەوەکە دوای چوونە لا بێت.

ناکۆکییەکە لەو شوێنەدایە ئایا جیابوونەوە دوای پاشگەزبوونەوە روودەدات بەبێ چاوەڕوانی کۆتاهاتنی عیدە گەر دوای چوونە لا بێت یان نە؟ بەپێی ئەم درێژەپێدانە:

١-"حەنەفیەکان[2] و مالیکیەکان[1]و حەنبەلیەکان لە یەکێك لە دوو قسەیاندا[2]، و زەیدیەکان " پێیانوایە پاشگەزبوونەوەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە جیابوونەوەی

---

(1) في ليضاح الفوائد شرح القواعد (٣/١٠٤): (زانایانی ئیسلام جگە لە داودی زاهیری لەسەر ئەوە هاوڕان گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بەر لە چوونە لا پاشگەزبوویەوە هاوسەرییەکە هەڵدەوەشێتەوە).

(2) في الاختيار لتعليل المختار (٣/١٦٢- ١٦٣) (گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە پاشگەزبوویەوە جیابوونەوە روودەدات بەبێ تەلاق، محمد(هاوەڵی ئەبی حەنیفە) دەڵێت: گەر پاشگەزبووەکە ژنەکە بێت ئەوا جیابوونەوەکە تەلاقە، گەر پاشگەزبوونەوەکە دوای چوونە لا بوو مارەیی هاوشێوەی بۆ هەیە، پێش چوونە لا نە مارەیی و نە خەرجی بۆ نییە، گەر پاشگەزبووەکە پیاوەکە بوو هەموو مارەییەکەی بۆ هەیە دوای چوونە لا و نیوەی مارەیی پێش چوونە لا)

لەسەر پەیدا دەبێت یەکسانە پاشگەزبوونەوەکە پێش چوونە لا بێت یان دوای چوونە لا، بەڵام حەنەفییەکان دەڵێن گەر هەردووکیان بە یەکەوە پاشگەزبوونەوە و پاشان هەردووکیان پێکەوە موسڵمان بوونەوە ئەوان لەسەر هاوسەری خۆیانن چونکە بەنی حەنیفە لە سەردەمی ئەبوبەکردا -خوا لێ رازی بێت- پاشگەزبوونەوە پاشان موسڵمانبوونەوە و دانینا بە هاوسەرییەکانیاندا و فەرمانی پێنەکردن هاوسەرییەکانیان نوێ بکەنەوە، ئەو کارەش بە ئامادەبوونی هاوەڵان -خوایان لێ رازی بێت- و هیچ کام لەوان نارەزایی لێ نەوەشایەوە، بۆیە ئەو کارە کۆدەنگی هاوەڵانی لەسەرە[3].

ئەم رایە گفتوگۆی لەسەر دەکرێت بەوەی ئیبن حەزم وتوویەتی لەوەی ئەهلی پاشگەزبوونەوە دوو بەشن: بەشێکیان هەرگیز باوەڕیان نەهێناوە وەك هاوەڵانی موسەیلەمەی درۆزن و سەجاح، ئەوانە جەنگاوەر بوون دژ بە ئیسلام و هەرگیز

---

(1) في الشرح الصغير مع الصأوي (٢/٣٨٨): (گەر پیاوی هاوسەردار پاشگەزبوویەوە هاوسەرییەکەی پووچ دەبێتەوە، گەر موسڵمانبوویەوە و زینای کرد رەجم ناکرێت(واتە داری لێ دەدرێت). وفيه ليجا (گەر ژنێکی هێنا و پاشان پاشگەزبوویەوە و پاشان گەڕایەوە بۆ ئیسلام ئەوا ژنەکەی بۆ حەڵاڵ نییە تا مێرد بە پیاوێکی تر دەکات چونکە ئەو هاوسەرییەی حەڵاڵی کردبوو پووچی کردەوە). وفي شرح الحطاب (٣/٤٧٩): (پاشگەزبوونەوەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە تەڵاقی بائینە).

في المغني (٦/٦٣٩): (گەر دوو هاوسەرەکە پێکەوە پاشگەزبوونەوە حوکمەکەیان وەك حوکمی پاشگەزبوونەوەی یەکێکیان وایە، گەر پێش چوونە لا بێت جیابوونەوەکە پێش دەخرێت، گەر دوای چوونە لا بێت ئایا پێش دەخرێت یان لەسەر تەواوبوونی عیدەکە دەوەستێت؟ ریوایەت لە ئەحمەدەوە جۆراوجۆرە لەمەڕ پاشگەزبوونەوەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە دوای چوونە لا، لە ریوایەتێکدا جیابوونەوەکە پێش دەخرێت، ئەوەش قسەی ئەبو حەنیفە و مالیکە).

(2) في التاج المذهب (٢/٨) (گەر جیاوازی لە ئاییندا هاتە ئاراوە بەوەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە پاشگەزبوویەوە هاوسەرییەکە هەڵدەوەشێتەوە و یەکسەر ژنەکە جیادەکرێتەوە، یەکسانە چووبێتە لای یان نە، ئیمام دەڵێت: ئەوە ئەو مەبەستەمانە کاتێك دەڵێین هاوسەریی هەڵدەگیرێت بە دانپێنانی جیاوازی دوو ئایینەکە، واتە بە لادانی جیاوازی دوو ئایینی دوو هاوسەرەکە).

(3) الاختيار لتعليل المختار ٣/١٦٣.

موسڵمان نەبووبوون، هیچ کەس جیاوازی لەوەدا نییە ئەوانە تەوبە و ئیسلامیان لێ قبووڵ دەکرێت، بەشی دووەم دەستەیەك موسڵمان بوون و دوای موسڵمانبوونەکەیان بێباوەڕنەبوونەوە، بەڵام زەکاتیان نەدا بە ئەبو بەکر لەسەر ئەوە جەنگیان لەگەڵ کرا[1] کەوابوو بەڵگەهێنانەوە بەو ڕووداوە بۆ حەنەفییەکان بوونی نییە.

٢-" شافیعیەکان[2]و جەعفەرییەکان[3]،و حەنبەلیەکان لە یەکێك لە دوو ریوایەتەکەی الإمام احمد[4]" دەڵێن: پاشگەزبوونەوە لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە یان لە هەردووکیانەوە بەر لە چوونە لا یەکسار جیابوونەوەی لەسەر پەیدا دەبێت، بەڵام دوای چوونە لا پەیوەندی هاوسەری بە کۆتاهاتوو دانانرێت گەر عیدەکەی تەواو نەبێت و پاشگەزبوو لەسەر پاشگەزبوونەوەی خۆی بێت، بینا لەسەر ئەمە گەر گەڕایەوە بۆ ئیسلام بەر لە کۆتاهاتنی عیدە هاوسەرێتی وەك خۆیەتی و بەردەوامە بەبێ پێویستی نوێکردنەوەی هاوسەری، بەڵام فەقیهانی جەعفەری بۆ درێژەپێدانێك دەچن کە لە هیچ مەزهەبێکی تری مەزهەبە ئیسلامییەکاندا نەمبینیوە ئەوەش

---

(1) المحلى ١١/١٩٣.

(2) في المهذب (٢/٥٤): (گەر دوو هاوسەرەکە پاشگەزبوونەوە یان یەکێکیان پاشگەز بوویەوە: گەر پێش چوونە لا بێت جیابوونەوە ڕوودەدات، گەر دوای چوونە بێت جیابوونەوەی دوای تەواوبوونی عیدە ڕوودەدات، گەر بەر لە تەواوبوونی عیدە لەسەر ئیسلام کۆبوونەوە ئەوە هاوسەرییەکەیان بەردەوامە).

(3) في شرائع الاسلام (٣/١٠٦): (گەر موسڵمان بێت و پاشان پاشگەز ببێتەوە ئەوا عیدەکە تەواو دەبێت لە کاتی موسڵمانبوونی پیاوەکە و بێباوەڕی ژنەکە، هەڵوەشانەوە ڕوودەدات لە کاتی موسڵمانبوونی پیاوەکەوە، گەر ژنەکە لە عیدەکەیدا موسڵمان بوو هەڵنەوەشانەوە بە ئیسلامەکەی دێتە ئاراوە و لە پیاوەکەی دادەبڕێت و لە کاتی پاشگەزبوونەوەی پیاوەکەوە عیدەی لەسەر دادەنرێت گەر گەڕایەوە بۆ لای ژنەکەی ئەوا ئەو لەپێشترە پێی ئەگینا لە کاتی پاشگەزبوونەوەوە لەیەکتر دابڕاون).

(4) في المغني (٦/٦٣٩): (ئەحمەد دەڵێت لە ریوایەتەکەی مەنصوردا: گەر پێکەوە پاشگەزبوونەوە یان یەکێکیان پاشگەزبوویەوە پاشان هەردووکیان تەوبەیان کرد یان پیاوەکە تەوبەی کرد ئەوا پیاوەکە لەپێشترە بە ژنەکەی گەر عیدە تەولو نەبوویێت) تێبینی دەکرێت ئەمە پاشگەزبوونەوەیەکە دوای چوونە لا.

بریتییە لە جیاکردنەوە لە نێوان پاشگەزبوویەك کە موسڵمان بووە بە فیترەت بەوەی لە دوو دایك و باوکی موسڵمان بێت و بە موسڵمانی لەدایك بووبێت و بە موسڵمانی گەورە بووبێت پاشان پاشگەز بووبێتەوە لە بارێکدا کە کەسێکی باڵغی ئاقڵی خاوەن هەڵبژاردەیە، لەگەڵ پاشەگەزبوویەك موسڵمان بووە دوای ئەوەی کە موسڵمان نەبووە، فەقیهانی جەعفەری جۆرێك لە توندکردنەوەیان دژ بەو کەسەی موسڵمان بووە بە فیترەت و پاشگەز بووەتەوە بەکارهێناوە، دەڵێن: گەر پاشگەزبوویەوە هاوسەرییەکەی دەمودەست هەڵدەوەشێتەوە با دوای چوونە لاش بێت، چونکە گەڕانەوەی بۆ سەر ئیسلام قبووڵ ناکرێت، جیاکردنەوە لە نێوان دوو حاڵەتی چوونە لا و نەچوونە لا تایبەتە بە پاشگەزبوویەك کە لە بێباوەڕییەوە(یان لە ئاینێکی ترەوە جگە لە ئیسلام) هاتووە بۆ ئیسلام[1].

سەرچاوەی ناکۆکی فەقیهان لەوەی لەسەر پاشگەزبوونەوەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە یان هەردووکیان سەرهەڵدەدات بریتییە لە جیاوازی لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەدا: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُمْ مَا أَنْفَقُوا وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ الآية...﴾[2]

---

[1] في شرائع الاسلام (٢/ ٢٥٩): (پاشگەزبوو کە بێباوەڕ دەبێتەوە دوای ئیسلام دوو بەشی هەیە: یەکەم– کەسێك لەسەر ئیسلام لەدایك بووبێت، ئەمەیان ئیسلامەکەی قبووڵ ناکرێت با بیشگەڕێتەوە، کوشتنی دەسەپێت و لە ژنەکەی جیادەبێتەوە.. بەشی دووەم– کەسێك لە بێباوەڕییەوە موسڵمان بووبێت پاشان پاشگەزبووبێتەوە، ئەمەیان داوای تەوبەی لێ دەکرێت گەر تەوبەی نەکرد دەکوژرێت، داوای تەوبە لێکردنی پێویستە، گرێبەستەکە لە نێوان ئەو و ژنەکەیدا هەڵدەوەشێتەوە، هاوسەرییەکەی لەسەر تەواوبوونی عیدەی ژنەکە وەستاوە، ئەوەش وەك عیدەی تەڵاقدراو وایە).

[2] (الممتحنة:١٠). للاطلاع على اختلاف الفقهاء في تفسير هذه الاية راجع تفسير القرطبي (الجامع لاحكام القرآن لابي عبدالله محمد بن احمد الانصاري القرطبي ١٨/٦٠ـ ٦٨.)

**ج-ئەهاتنە ناو ئیسلامی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە دوای ئەوەی یەکێکیان دێنە ناو ئیسلامەوە:**

لەسەر موسڵمانبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە یان هەردووکیان کۆمەڵێك حوکم سەرهەڵدەدەن پەیوەستن بە پەیوەندی هاوسەرگیرییانەوە، هەیانە کۆدەنگیان لەسەری هەیە و هەشیانە تیایدا ناکۆکن.

## ئەو حوکمانەی لەسەری هاوڕان:

١-جیاوازی لەوەدا نییە دوو هاوسەری ناموسڵمان گەر موسڵمان بوون لەسەر هاوسەرگیرییەکەی پێشوویان دەمێننەوە گەر رێگرێك لە رێگرەکانی هاوسەرگیری بوونی نەبوو وەك رەچەڵەك و شیرخواردن یا گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەشیان پێشتر بەبێ سەرپەرشتیار و شایەت ئەنجام درابێت، بە بەڵگەی ئەوەی خەڵکێکی زۆر لە سەرەتای پەیامی ئیسلامەوە موسڵمان بوون و پێغەمبەر(ﷺ) دانینا بە هاوسەرییەکانیاندا و پرسیاری نموونەی ئەو مەرجانەی لێ نەکردن.

٢-ناکۆکی نییە لە نێوان فەقیهاندا-بە هەڵواردەی زەیدییەکان[١]- لەوەدا گەر دوو هاوسەرەکە ئەهلی کیتاب بوون وەك مەسیحی و یەهودی هاوسەرییەکەیان بە بەردەوام دادەنرێت گەر مێردەکە موسڵمان بوو و ژنەکە دەستی گرت بە مانەوەی خۆی لەسەر ئایینەکەی، چونکە بۆ موسڵمان هەیە ئافرەتی ئەهلی کیتاب بهێنێت، ئەوەش هەر لە سەرەتاوە رێگەی پێدرابێت مانەوەی رێگەی پێدراوە.

---

[١] هەندێ لە فەقیهانی زەیدی پێیانوایە هاوسەرگیری بە موسڵمانبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە هەڵدەوەشێتەوە، یەکسانە ئەو کارە پێش چوونە لا بێت یان دوای چوونە لا، بە هۆی فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ): ((هاوسەری لە نێوان ئەهلی دوو ئاییندا نییە)). أنظر البحر الزخار ٧٢/٢.

٣-جیاوازی لەوەدا نییە گەر ژنەکە بەتەنها موسڵمان بوو و مێردەکە نەیویست بێتە ناو ئیسلامەوە دوای ئەوەی بۆی باسکرا لەیەکتر جیادەکرێنەوە، بە ئایەتی: ﴿إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ... الآية﴾.

٤-ناکۆکی لەوەدا نییە گەر هەردووکیان بە یەکەوە موسڵمان بوون و لە نێوانیاندا رێگرێك لە رێگرەکانی هاوسەرگیری هەبوو بە ترازووی شەریعەتی ئیسلام ئەوا لەیەکتر جیا دەکرێنەوە.

## جیاوازی لە جگە لەمانەدایە بەم درێژەپێدانە:

" شافیعیەکان[1]،و جەعفەریەکان[2]،و حەنبەلیەکان " جگە لە ریوایەتێکدا لە "ئیمام ئەحمەد"ەوە[3]" دەڵێن: دوو هاوسەرەکە یان هەردووکیان ئەهلی کیتابن یان نە، بۆ هەریەکەیان حوکمێکی تایبەت هەیە:

**١-گەر هەردووکیان ئەهلی کیتاب بوون یان ژنەکە ئەهلی کیتاب بوو:**

أ-گەر پیاوەکە موسڵمان بوو بەبێ ژنەکە هاوسەرییەکەیان بەردەوام دەبێت یەکسانە ئەوە بەر لە چوونە لا بێت یان دوای چوونە لا گەر رێگرێك لە رێگرەکانی هاوسەری لە نێوانیاندا بوونی نەبوو.

ب-گەر تەنها ژنەکە موسڵمان بوو یەکسەر جیابوونەوە روودەدات لەباری نەچوونە لا، جیابوونەوە روودەدات لە دوای عیدە گەر ئیسلامبوونەکەی دوای چوونە لا بوو، گەر پیاوەکە لە ماوەی عیدەدا موسڵمان بوو

---

[1] المهذب ٢/٥٢.

[2] أنظر ایضاح الفوائد ٣/١٠٥، شرائع الاسلام ٢/١٩.

[3] في المغني (٦/٦١٤) (گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە کە ئەهلی کیتاب نین موسڵمان بوو، یان پیاوێکی کیتابی و ژنێکی ناکیتابی بەرلە چوونە لا یەکسەر جیابوونەوە لە نێوان روودەدات، ئەوەش دەبێتە هەڵوەشانەوە نەك تەلاق، ئیمام ئەحمەد ریوایەتێکی هەیە: جیابوونەوە لەسەر کۆتاهاتنی عیدەکەیە(واتە هەمان حاڵ کاتێك یەکێکیان دوای چوونە لا موسڵمان بوو).

هاوسەرییەکەیان بەردەوام دەبێت ئەگەر ڕێگرێك لە ڕێگرەکانی هاوسەری بوونی نەبوو.

**٢-گەر هەردووکیان ئەهلی کیتاب نەبوون و یەکێکیان بەر لەویتریان موسڵمان بوو:**

أ-گەر ئیسلام بوونەکە بەر لە چوونە لا بێت جیابوونەوە یەکسەر ڕوودەدات.

ب-گەر دوای چوونە لا بێت جیاکردنەوە ڕوونادات تا ماوەیەك بەسەریدا گوزەر نەکات یەکسان بێت بە ماوەی عیدە لەگەڵ سووربوونی لایەنی ناموسڵمان لەسەر نەهاتنە ناو ئیسلامەوە، جیابوونەوەیان بە یەکسەری بەر لە چوونە لا لە هەموو شێوەکانیدا بڕیار داوە، چونکە هاوسەری بەر لە چوونە لا دڵنیاکەر نییە بە پێچەوانەی دوای چوونە لا.

**حەنەفییەکان جیاوازیان کردووە لە نێوان خانەی ئیسلام و خانەی جەنگدا:**

**أ. گەر موسڵمانبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە لە خانەی ئیسلامدا بوو:**

١-گەر ژنەکە موسڵمان بوو ئیسلام بۆ مێردەکەی پێشکەش دەکرێت گەر موسڵمان بوو ژنەکە هاوسەرییەتی، گەر نەیویست موسڵمان ببێت قازی لەیەکتریان جیادەکاتەوە، جیاکردنەوەکە لەسەر نەهاتنە ناو ئیسلامە کە عیبادەت و گوێڕایەڵییە و نەهاتنەکەی ئەویش یاخیبوون لە ئیسلام دەگەیەنێت، جیاکردنەوە لای ئەبی حەنیفە و محەمەدی هاوەڵی تەلاقە، چونکە لەسەر ملنەدانی مێردەکە بیناکراوە، لەلای ئەبی یوسف جیاکردنەوەکە هەڵوەشانەوەیە لەبەر ئەوەی لەسەر هۆیەکی هاوبەش بیناکراوە.

٢-گەر پیاوەکە موسڵمان بوو و ژنەکەی نا کیتابی بوو، ئەگەر دوای پێشکەشکردنی ئیسلام بۆ ژنەکە موسڵمان بوو هاوسەرگیرییەکەیان دەمێنێتەوە، ئەگینا قازی لەیەکتریان جیا دەکاتەوە.

**ب–گەر ئیسلامبوونەکەیان لە خانەی جەنگدا بوو:**

١–گەر هەردووکیان ئەهلی کیتاب بوون یان ژنەکە ئەهلی کیتاب بوو و پیاوەکە موسڵمان بوو هاوسەرییەکەیان دەمێنێتەوە گەر ڕێگرێك بوونی نەبێت.

٢–گەر ژنەکە کیتابی نەبوو یەکێکیان موسڵمان بوو یان ژنەکە کیتابی بوو موسڵمان بوو بەبێ موسڵمانبوونی پیاوەکە لەو دوو شێوەدا بەینوونە لە نێوانیاندا رادەگیرێت لەسەر تێپەڕبوونی عیدە و موسڵمان نەبوونی ئەویتریان لەماوەی عیدەکەدا، چونکە هەر دەبێ لەیەکتر جیابکرێنەوە لە پێشکەش کردنی ئیسلامەوە بەسەر لایەنە ناموسڵمانەکەدا، لە خانەی جەنگدا توانای پێشکەش کردنی ئیسلام نییە بۆیە عیدە جێگەی ئەوە دەگرێتەوە یەکسانە ئەوە بەر لە چوونە لا بێت یان دوای چوونە لا[1].

شایانی باسە دابەش کردنی جیهان بۆ خانەی ئیسلام و خانەی جەنگ بوونی نەماوە بۆیە ئەم دابەشکردنە لە رووی کردارییەوە بێمانایە.

**مالیکییەکان: بۆ فەقیهانی مالیکی درێژەپێدانێکی تر هەیە، بەم جۆرە:**

أ–گەر پیاوەکە موسڵمان بوو، ژنەکە لە ئەهلی کیتاب نەبوو:

١–گەر پێش چوونە لا بوو: لە مالیکەوە جیاکردنەوەکە لەسەر زانینی هەڵوێستی ژنەکە وەستاوە، گەر موسڵمان بوو دروستە، ئەگینا لەیەکتر جیادەکرێنەوە، ئەمەش لەگەڵ رای حەنەفییەکاندا پێکدێتەوە، "أشهب و أصبغ" لە فەقیهانی مالیکی دەڵێن: یەکسەر پەتی هاوسەری لە نێوانیان دەپچڕێت، ئەمەش لەگەڵ شافیعییەکان و حەنبەلییەکان و زەیدییەکاندا یەکدەگرێتەوە.

رووی قسەکەی مالیك: موسڵمانبوونی پیاوەکە رێگرە لەبەردەم بەردەوامی هاوسەرییەکەدا و خستنی جیاکردنەوەکە دەستەبەر ناکات، ئەوەی دلوای دەکات بریتییە لە ملنەدانی لایەنەکەی تر(بۆ هاتنە ناو ئیسلام)، رووی قسەکەی

---

[1] الاختيار لتعليل المختار ٣/١٦٠. شرح فتح القدير ٣/ ٤١٨ ـ ٤٢٢.

"أشهب و أصبغ"یش: ڕێگر لە بەردەوامبوونی هاوسەرییەکەیان بریتییە لە ئیسلام بوونی یەکێك لە دو هاوسەرەکە بەبێ ئەویتریان، گەر پێش بینای هاوسەری ڕوویدا پچڕانی پەتی هاوسەری پێویست دەبێت وەك ئەوەی ژنەکە یەکەمجار موسڵمان بووبێت.

٢-گەر ئیسلام بوونی پیاوەکە دوای چوونە لا بێت: ئیسلام بە ژنەکە پێشکەش دەکرێت گەر موسڵمان بوو دروستە، ئەگەر نەهاوسەرییەکەیان هەڵدەوەشێتەوە، ئەمەش ئیسان لەگەڵ ڕای حەنەفییەکان یەکدەگرێتەوە، لە "ابن القاسم"ەوە: ئیسلام بە ژنەکە پێشکەش دەکرێت و ماوەیەکی بۆ دیاری دەکرێت لە ڕۆژێکەوە تا سێ ڕۆژ.

"أشهب" دەڵێت: ئیسلام بۆ ژنەکە دەخرێتە ڕوو لەباری خستنەڕوودا ماوەی بۆ نییە، گەر موسڵمان بوو، ئەگینا هیچ ڕێگەیەك لەبەردەم پیاوەکەدا نییە بۆ لای ژنەکە، ئەمەش لەسەر ئەوە بیناکراوە کە ئیسلامبوونی مێردەکە جیابوونەوەی پێ ڕوونادات، بەڵکو جیابوونەوە بەو حوکمەیە لەدوای پێشکەش کردنی ئیسلام یان پشتگوێخستن، لەباری پێشکەش نەکردندا(پشتگوێخستن) بۆ ژنەکە ماوەی مانگێك مۆڵەتی بۆ هەیە لای "ابن القاسم" پاشان لەیەکتر جیادەکرێنەوە، لای "أشهب" جیابوونەوەکە بە نەهاتنە ناو ئیسلامی ژنەکە و کۆتاهاتنی عیدەکەی ڕوودەدات.

**ب-گەر ژنەکە بەر لە پیاوەکە موسڵمان بوو:**

١-گەر ئیسلامبوونەکە پێش چوونە لا بوو، موسڵمانبوونی پیاوەکە نەهات بە دوای موسڵمانبوونی ژنەکەدا یەکسەر جیابوونەوە دەکەوێتە نێوانیانەوە.

٢-گەر ئیسلام بوونی ژنەکە دوای چوونە لا بوو گەر پیاوەکە لە عیدەی ژنەکەدا موسڵمان بوو یان هەردووکیان پێکەوە موسڵمان بوون بڕیاری مانەوەی هاوسەرییەکەیان دەدرێت گەر پیاوەکە دوای عیدەی ژنەکە موسڵمان بوو بە

کۆدەنگی لەیەکتر جیادەکرێنەوە[1].

**زەیدییەکان:**

جیاکارییان کردووە لە نێوان حوکمی زیمی(ئەهلی کیتاب لە خانەی ئیسلامدا) و حوکمی جەنگاوەر، بەم جۆرە:

أ–گەر هەردووکیان جەنگاوەربوون و یەکێکیان موسڵمان بوو:

١–پێش چوونە لا لەیەکتر جیادەکرێنەوە تەنها بە موسڵمانبوونی ژنەکە یان پیاوەکە.

٢–دوای چوونە لا لەیەکتر جیادەبنەوە بە جیاوازی ئایین لەگەڵ تێپەڕینی عیدە.

ب–گەر زیمی بوون و یەکێکیان موسڵمان بوو: جیاکردنەوە بە یەکێك لەم دوو حاڵە ڕوودەدات:

١–بە گوزەرکردنی ماوەیەك هاوتا بێت بە ماوەی عیدەکەی یەکسانە چووبێتە لای یان نەچووبێت، گەر ئەویتریان لەو ماوەیەدا موسڵمان نەبوو.

٢–یان ئیسلام بۆ ئەوەیان موسڵمان نەبووە پێشکەشکرا ئەگەر نەیویست بێتە ناو ئیسلامەوە بەینوونە بە نەهاتنی ڕوودەدات با عیدەکەش گوزەری نەکردبێت[2].

**پێموایە تێگەیشتوانەتر ئەوەیە کە حەنەفییەکان بۆی دەچن بەم جۆرە:**

١–جیاکاری لە نێوان حوکمی چوونە لا و نەچوونە لا ڕایەکی ئیجتیهادی ڕووتە نە دەق و نە پێوانە پشتیوانی ناکات.

٢–جیاکردنەوە وەك سزایەك وایە لەسەر یاخیبوون ئەوەش(یاخیبوونەوەکە) لەسەر ئیسلامبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە سەرهەڵنادات، بەڵکو بەهۆی ملنەدانی ئەویتریانەوەیە دوای دڵنیابوونەوەی لە پێشکەش کردنی ئیسلام، کەوابوو

(1) ینظر المنتقى شرح الموطا ٣/٣٤٦. الشرح الصغير مع الصأوي ١/٣٧٧ ـ ٣٧٨.

(2) التاج المذهب ٢/٨٠ ـ ٨١. البحر الزخار ٢/٧٢.

خستنەرووی ئیسلام بۆ هاوسەرەکەی تردا رەگەزێکە پێویستە فەراهەم بێت ئەگەر لە تواندا بوو.

٣-بەهەند وەرگرتنی تێپەڕبوونی ماوەی عیدەکە-لەباری نەتوانینی خستنەڕووی ئیسلام بۆی- ئاماژەیەکە لە جێگەی پێشکەشکردنی پێویست راست دەبێتەوە بۆ ئەوەی بەڵگەبێت لەسەر ملنەدانی بە ئیسلام بەشێوەیەکی راشکاوانە ئەمەش رایەکی فیقهییە لەگەڵ رێکارە قەزاییە پێویستەکانی ئێرەدا بە تەولوی یەکدەگرێتەوە.

٤-بۆ جێگیرکردنی موسڵمانبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە و ملنەدانی ئەویتریان پێویستە جیاکردنەوەکە لەسەر دەستی قەزا بێت.

٥-بەهەندوەرگرتنی جیاکردنەوەی قەزاییانەی بیناکراو لەسەر ملنەدان لەدوای پێشکەش کردن گەر ملنەدەرەکە پیاوەکە بوو، هەروەها دانانی بە هەڵوەشانەوە گەر رەدکردنەوە لە ژنەکەوە بوو وەك چۆن ئەبو حەنیفە و محەمەدی هاوەڵی(رەحمەتی خودایان لێ بێت) بۆی دەچن، جیاکارییەکی وردی هەڵقوڵاوە لە قووڵی فیقهی ئەو دوو فەقیهە مەزنە.

**چوارەم-دەستدرێژی یەکێک لە دوو هاوسەرەکە بۆ سەر ئەویتریان:**

سەرچاوەی چوارەم بۆ زیانی بەویست بریتییە لە ناکۆکی و تەنگەژەی نێوان دوو هاوسەرەکە، و دەستدرێژی یەکێکیان بۆ سەر ئەویتریان بەکردار وەك لێدان و بە گوفتار وەك جنێو، یان بە هەردووکیان وەك سووکایەتی پێکردن..

بۆ لادانی بەردەوامی ئەو تەنگەژە لە تێنەگەیشتن لەیەکتری و جەنگ و هەرا و تەنگەژەی نێوانیان و لادانی بەردەوامبوونی و رێگری لە سەرئەنجامە خراپەکانی راستەوخۆ بۆ سەر دوو هاوسەرەکە و منداڵەکان و بۆ سەر کۆمەڵگەش ناڕاستەوخۆ، قورئان فەرمانی کردووە بە هاتنە ناوەی دوو دادوەر کە یەکێکیان لە خانەوادەی ژنەکە و ئەویتریان لە خانەوادەی پیاوەکە پێکدێن، خودا-ﷻ- دەفەرموێت: ﴿وَإِن

خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا أن يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا أن اللَّهَ كَان عَلِيماً خَبِيراً﴾[1].

پێشتر ئەوەمان ڕۆشن کردەوە کە پەیوەستە بەو مەرجانەی پێویستە لە دوو داوەرەکەدا فەراهەم بن، ئەوەی لێرەدا لامان گرنگە بریتییە لە رادەی دەسەڵاتی ئەو دو داوەرە لە جیاکردنەوەی نێوان دوو هاوسەرەکە لەباری پێکنەهاتنەوە و دژواری ئاشتەواییان، وەك لەم درێژەپێدانەدا:

١-ناکۆکی نییە لە نێوان فەقیهانی شەریعەتدا لە دروستی ناردنی دوو داوەر بۆ لای ژن و مێردەکە گەر شەڕ و هەرا کەوتە نێوانیانەوە و حاڵ و باریان نادیاربوو لەو ناکۆکییەدا و هۆکار و کەمتەرخەم تیایدا نەدەزانرا، ئەوەش بەپێی ئایەتی: ﴿وَإن خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً... الآية﴾.

٢-نـاکۆکی نییـە لـەوەدا دوو داوەرەکـە دەبێـت لـە خانـەوادە و خزمـانی دوو هاوسەرەکە بن ئەگەر دەگونجا، یەکێکیان لە خانەوادەی پیاوەکە و ئـەویتریان لـە خانـەوادەی ژنەکـە، ئـەوەش لەبـەر پارێزگـاری لـە نهێنییـەکانی خێـزان لەلایەکەوە و لەبەر ئەو سووربوون و خەمخۆرییـەی هەیـە بـۆ چـاککردنیان بـە پاڵنەری خزمایەتی لە لایەکی ترەوە.

٣-ناکۆکی نییە لەوەدا گەر دوو داوەرەکە لە حوکمەکەیان جیاوازیـان لـە نێوانـدا هـەبوو لـەوەی پێیگەیشـتبوون بەرهـەمی لێکۆڵینـەوە لـە حـاڵ و بـاری دوو هاوسەرەکە ئەوا حوکمەکە جێبەجێ ناکرێت، بەڵکو دوو داوەرەکە بە دوانی تر دەگۆڕدرێن، یان داوەری سێیەمیان دەخرێتە پـاڵ، بـەڵکو جیـاوازی لـە رادەی دەسـەڵاتی دوو داوەرەکەدایـە لـە جیاکردنـەوەی بینـاکراو لەسـەرجیاوازی سـیفەتی ئـەو دوو کەسـە چاکسـازە، ئایـا سـیفەتی داوەریـان هەیـە بـە مانـا شـەرعییە راسـتەقینەکەی ئـەو زاراوەیـە، لـەو بـارەدا مـافی جیاکردنـەوەی دوو

[1] (وَإن خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا أن يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا أن اللَّهَ كَان عَلِيماً خَبِيراً) (النساء:٣٥).

هاوسەرەکەیان هەیە گەر چاکسازی شکستی خوارد، یان ئەو دوانە بریکارن و پێویستە پابەندبن بە هەڵسوکەوتەوە لە سنووری بریکارییەکەیاندا بۆیە جیاکردنەوەیان بۆ نییە گەر مۆڵەتێکی پێشینە بەو کارە لە مێردەکەوە نەدرابێت؟

هەڵقولاو لەم واقیعە فەقیهان بۆ دوو دەستە دابەش بوون: دەستەیەك دان بە دەسەلاتدا دەنێن و دەستەیەك رەدی دەکەنەوە.

**دەستەی یەکەم**—لە فەقیهە مالیکی و زەیدی و شافیعییەکان—لە یەکێك لە دوو قسەیاندا— و ئیمام ئەحمەد لە یەکێ لە دوو ریوایەتیدا پێکێن:

**مالیکییەکان:** دەڵێن چاکسازی لەسەر دوو حەکەمەکە پێویستە چەندە بتوانن، گەر چاکسازی بەرهەم نەهات حوکم دەردەکەن بە جیاکردنەوە، حوکمی دوو داوەرەکە لای قازییەوە لە دەرەوە و لە ناوەوە جێبەجێ دەکرێت، گەر دوو هاوسەرەکە و قازییەکەش پێی رازی نەبوون یان حوکمەکە پێچەوانەی مەزهەبی قازییەکە بوو، چونکە تەبایی دوو داوەرەکە لەگەڵ قازییەکە لە مەزهەبدا بەمەرج ناگیرێت، یەکسانە دوو داوەرەکە لەلای دوو هاوسەرەکەوە بێت یان لەلای قازییەکەوە بێت، بەلام لەسەریانە لەسەر یەك تەلاق کورتببنەوە، چونکە ئەو جیاکردنەوەیە بۆ زەرورەتە و زەرورەتیش بە ئەندازەی خۆی ئەندازەگیری بۆ دەکرێت، تەلاقەکە بێبەرانبەر بێت یان بە بریتی(خولع) بەو سەرئەنجامەوە بەستراوەتەوە کە دوو داوەرەکە پێیدەگەن لە لێکۆڵینەوەی باری دوو هاوسەرەکە و زانینی بنچینەی تەنگەژەکە و لایەنی کەمتەرخەم، لەو بارەدا تەلاق بەبێ بریتی دەبێت گەر خراپەکە لە مێردەکەوە بوو، بریتی بە مێردەکە دەدرێت گەر خراپە لە ژنەکەوە بوو، گەر هەردووکیان خراپەیان دەرحەق بەیەکتر دەکرد بەوەی هەریەکەیان زیان بەویتریان بگەیەنێت تەلاقەکە بەبێ بریتی دیاریدەکرێت لای زۆرینەی فەقیهانی مالیکی، مالیکییەکان پێیانوایە لەسەر قازی پێویستە حوکمی دوو داوەرەکە جێبەجێ بکات بە جیاکردنەوەیان و بە تەلاق، بۆ قازی دروست نییە شوێنپێی

بڕیارەکە هەڵبگرێت یان هەڵیبوەشێنێتەوە، با پێچەوانەی مەزهەبەکەی ئەویش بێت، بە ئایەتی: ﴿فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا... الآية﴾ قورئان بە دوو دادوەر ناوی هێناون(١) .

**زەیدییەکان:** هەندێ لە فەقیهە زەیدییەکان وای دەبینن: لەسەر دوو دادوەرەکە پێویستە -دوای ناکۆکی هەریەك لە دوو هاوسەرەکە- هەوڵبدەن کۆیان بکەنەوە(پێکیان بهێننەوە) بە رازیبوونی دوو هاوسەرەکە، گەر ئەوە گونجاو نە بوو جیاکردنەوە ئەنجام دەدرێت لەسەر بڕیتییەك یان بێ بڕیتی بەپێی خوێندنەوەی دوو دادوەرەکە(٢).

**شافیعی لە یەکێك لە دوو قسەکەیدا:** رای شافیعی لە سیفەتی دوو دادوەرەکەدا جیاوازە لەوێشەوە لە دەسەلاتی دوو دادوەرەکەدا، لە یەکێك لە دوو قسەیدا دەڵێت: ئەو دوانە دادوەرن بۆیان هەیە بڕیار بدەن لە کۆکردنەوەی دوو هاوسەرەکە یان جیاکردنەوەیان بە بڕیتی یان بێ بڕیتی بەپێی ئەوەی بۆیان دەردەکەوێت، لەبەر ئایەتی: ﴿فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا... الآية﴾ لە کاتێکدا قورئان رازیبوونی دوو هاوسەرەکەی بەمەرج نەگرتووە(٣) .

**ئیمام ئەحمەد لە یەکێك لە دوو ریوایەتیدا:** لە ئیمام ئەحمەدەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) دوو ریوایەت هەیە: یەکێکیان هەردووکیان دادوەرن، بۆیان هەیە ئەوەی دەیبینن ئەنجامی بدەن لە کۆکردنەوەی دوو هاوسەرەکە یان جیاکردنەوەیان بە بڕیتی یان بێ بڕیتی و پێویستیان بە بریکاریکردن و رازیبوون نییە لە لایەن دوو هاوسەرەکەوە، ئەم رایە لە "علي بن ابي طالب، وابن عباس، وابي سلمة بن عبد الرحمن، والشعبي،

---

(١) أنظر المنتقى شرح الموطأ ٤/١١٣- ١١٥. شرح الخرشي ٤/٨ -١٠. الشرح الصغير مع الصأوي ١/٤٠٨- ٤٠٩، بداية المجتهد ٢/٨١ - ٨٢.

(٢) البحر الزخار ٣/٩٠.

(٣) المهذب ٢/٧٠ ،المغني لابن قدامة٧/٤٩.

والنخعي، وسعيد بن حبيب، والأوزاعي، واسحاق، وابن المنـذر " ریوایـەت كـراوە، بـە ئایەتی: ﴿فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ... الآيَة﴾[1].

وا دیارە گرنگترین بەڵگەیەك ئەم رایە شانی لەسەر دادابێت بریتییە لەو ئایەتە پیرۆزە بەو جۆرە لێكیانداوەتەوە پاڵپشتی ئیجتیهادەكەیان بكات لەوەی ئەو دوو كەسە دوو دادوەرن و بریكارن و لە یەك كاتدا دەسەڵاتی چاكسازی و جیاكردنەوەیان بۆ هەیە.

**دەستەی دووەم:** دەڵێن: دوو دادوەرەكە بریكارن و تەنها دەسەڵاتی چاكسازیان بۆ هەیە یان بەرزكردنەوەی راپۆرتێك بۆ قازی، بەوەی پێبگەیشتوون لە سەرئەنجامی لێكۆڵینەوەی حاڵ و باری دوو هاوسەرەكە لەو راپۆرتەدا بەرزی دەكەنەوە و مافی ئەوەشیان هەیە پێشنیار بكەن بە مانەوە و بەردەوامی هاوسەری لەدوای چارەسەری گرفتەكانی نێوانیان یان پێشنیار بە تەلاق لە دوو هاوسەرەكەوە، گەر پیاوەكە نەیویست ئەوا جیاكردنەوە لە قازییەوەیە بە تەلاق لەسەر رای ئەوانەی لەسەر دەسەلاتی قازین لەو كارەدا، ئەم ئاراستەیە فەقیهانی: " حەنەفییەكان ، و جەعفەریەكان ، و ظاهریەكان "، و ئیمامی شافیعی لە یەكێك لە دوو قسەیدا، و "ئیمام ئەحمەد"یش لە یەكێك لە دوو ریوایەتیدا" ئەم ئاراستەیان گرتۆتە بەر، وەك لەم درێژەپێدانەدا:

**حەنەفییەكان:** "الجصاص" دەڵێت: دوو دادوەرەكە لای ئەبی حەنیفە و هاوەڵانی دوو بریكارن، یەكێكیان بریكاری ژنەكەیە و ئەویتریان بریكاری پیاوەكە بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿إِن يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا﴾ نەیفەرموو گەر جیاكردنەوەیان بوێت[2].

---

(1) ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً﴾ (النساء:٣٥). المغني لابن قدامة ٤٩/٧.

(2) احكام القرآن للجصاص ١٥١/٢ـ ١٥٤.

**جەعفەرییەکان:** فەقیهانی جەعفەری دەڵێن: دوو دادوەرەکە بریکارن و دەسەڵاتی جیاکردنەوەیان بۆ نییە، بەڵکو ئەرك و کاریان لەسەر هەوڵی چاکسازی نێوان دوو هاوسەرەکە کورت دەبێتەوە، پاشان بەرزکردنەوەی راپۆرتێك بۆ قازی گەر چاککردن بەرهەم نەهات، گەر لە دوو هاوسەرەکەوە بە کاری تەڵاق(یان جیاکردنەوە) رانەسپێررابن ئەو کارەیان بۆ نییە[1].

**زاهیرییەکان:** ئیبن حەزم(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: نە لە ئایەتدا و نە لە سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) شتێك نەهاتووە بۆ دوو داوەرەکە هەبێت دوو هاوسەرەکە جیابکەنەوە، تەنانەت ئەوەش بۆ حاکم دروست نییە، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا﴾. بۆیە دروست نییە هیچ کەس لە جێگەی کەسێکی تر تەڵاق بدات یاخود پیاوەکە و ژنەکە لەیەکتر جیابکاتەوە جگە لەو شوێنەی دەق هاتووە بە پێویستبوونی هەڵوەشانەوەی هاوسەریی بەتەنها، بەڵگە لە قسەی هیچ کەسێکدا بوونی نییە جگە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)[2].

**شافیعی لە یەکێك لە دوو قسەکەیدا:** "أبو إسحاق الشيرازي"(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: (قسەی شافیعی لەسەر دوو داوەرەکە جیاوازە، لە یەکێك لە دوو قسەیدا دەڵێت: ئەو دوانە بریکارن بۆیە خاوەنی مافی جیاکردنەوە نین مەگەر بە مۆڵەتی دوو هاوسەرەکە، چونکە تەڵاق بۆ هاوسەرگیرییە، بەوەش ماڵ بۆ ژنەکەیە بۆیە بەبێ مۆڵەتی دوو هاوسەرەکە رێگەپێنەدراوە)[3].

**ئیمام ئەحمەد لە یەکێك لە دوو ریوایەتیدا:** ئیبن قودامە(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: (ریوایەت لە ئەحمەدەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەربارەی دوو داوەرەکە جیاوازە، لە یەکێك لە دوو ریوایەتیدا دەڵێت دوو داوەرەکە بریکاری دوو

---

[1] شرائع الاسلام ٤٢/٢، المختصر النافع ص٢٧١.

[2] المحلى لابن حزم ٨٨/١٠.

[3] المهذب لابي اسحاق الشيرازي ٧٠/٢. قارن المجموع شرح المهذب ٣٢٩/١٥.

هاوسەرەکەن و خاوەنی مافی جیاکردنەوە نین مەگەر بە مۆڵەتی دوو هاوسەرەکە)[1].

**خاوەنی ئەم رایە بە چەندین بەڵگە بەڵگەیان هێناوەتەوە گرنگترینیان:**

١-قورئان ئەرك و کاری دوو دادوەرەکەی دیاریکردووە کە بریتییە لە چاکسازی و دەفەرموێت: ﴿إن يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا﴾

٢-لە بنەڕەتدا تەلاق تەنها مێرد خاوەنییەتی یان کەسێك کە پیاوەکە رایدەسپێرێت.

٣-جیاکردنەوە دەرکردنی مولکە لە خاوەنەکەی بەبێ رازیبوونی، ئەمەش نادروستە چونکە حەڵاڵبوونی خۆشی وەرگرتن لە ژنەکە مولکی پیاوەکەیە، و مارەیی دواخراو مولکی ژنەکەیە و هەندێ جار بە جیاکردنەوە لەدەستی دەچێت گەر سەلمێنرا کەمتەرخەمی لە ئەوەوەیە.

٤-لە عەلی کوڕی ئەبی تالبەوە -خوا لێی رازی بێت- ریوایەتکراوە دوو دادوەری رەوانە کرد و فەرمووی: دەزانن چی لەسەر ئێوە پێویستە؟ گەر پێتان وابوو یەکدەگرنەوە پێکیان بهێننەوە، گەر پێتان وابوو لەیەکتر جیابوونەتەوە جیان بکەنەوە، ژنەکە وتی: رازیم بە کتێبەکەی خودا و ئەوەی تیایدایە بۆ من و لەسەرمە، پیاوەکە وتی: جیاکردنەوە نەخێر، عەلی فەرمووی: سوێند بە خودا لەدەستم دەرناچی تا داندەنێیت بەوەی ژنەکە دانی پیاداناوە)[2].

دەڵێین ئەم قسەیە لە نێوان عەلی کوڕی ئەبی تالب و مێردی ژنەکەدا بەڵگەی ئەوەیە دوو دادوەرەکە ناتوانن جیایان بکەنەوە مەگەر بە مۆڵەتی پیاوەکە.

---

[1] المغني لابن قدامة ٧/ ٤٩.

[2] وفي رواية (درۆ دەکەی تا کتێبەکەی خودا بڕیارت بۆ یان لەسەر دەردەکات) أنظر بداية المجتهد ٨٢/٢. احكام القرآن للجصاص ١٥٢/٣.

بەڵام ئەم بەڵگەیە وەك چۆن گونجاوە ببێتە بەڵگەی رای دووەم بە هەمان شێوە گونجاوە خاوەنی رای یەکەم بەڵگەی پێ بهێننەوە.

پێموایە هەریەك لە دوو ئاراستەكە خاڵی نییە لە جۆرێك لە زیادەڕەوی، لە رای یەكەمدا زیادەڕەوی كراوە بە پێدانی دەسەڵاتێكی زیاد لە پێویست بە دوو داوەرەكە.

لە ئاراستەی دووەمدا زیادەڕەوییە بە كەمكردنەوەی بەهای زانستی كاری دوو داوەرەكە كە قورئان بۆی بڕیاردلون.

ئەوەی بۆم دەردەكەوێت ئەوەیە دەسەلاتی دوو داوەرەكە لە دەسەلاتی دوو بریكار بەهێزترە، بە بەڵگەی قورئان كە بە دوو داوەر ناوی هێناون و دلوای كردووە لە بریكار جیاببنەوە بەوەی لە خانەوادەی دوو هاوسەرەكە بن، بەلام ئەم دەسەلاتە سەرپشكیان ناكات بە جیاكردنەوەی دوو هاوسەرەكە بەبێ ئەوەی قازی بڕیاری خۆی هەبێت لە بابەت و دەسەلاتدا.

بینا لەسەر ئەوە دوو داوەرەكە بە ئەڵقەی گەیاندنی نێوان قەزا و خێزانەكە كە شەڕ و تەنگەژەی بەسەردا داباریوە دادەنرێن، ئەو دوانە گەر هاوڕابوون لەسەر ئەوەی چارەسەر بڕینییە لە كۆتاهاتنی پەیوەندی دوو هاوسەرەكە ئەوا ئەوەی ئەوان پێیان دروستە بۆ قازی پێویست دەبێت، بۆیە لەسەریەتی تەلاق بۆ پیاوەكە بخاتە بەردەم گەر نەیویست ئەوا قازی لە جێگەی ئەو دادەنیشێت و لەیەكتریان جیادەكاتەوە.

# باسی سێیەم:
# هەڵوێستی یاسا لە جیاکردنەوە لەرووی قەزاوە

مەبەست بە یاسا بریتییە لە یاسای باری کەسێتی ولاتە ئیسلامییەکان، چونکە هەموو ئەوەی پەیوەستە بە حوکمەکانی تەڵاق و جیاکردنەوە لە ولاتانی تر لە دەروازەی پێنجەمی ئەم کتێبەدایە.

یاسا لە ولاتە عەرەبییەکان دەستی بۆ هەژمارکردنی هۆیەکان بردووە، بەرهەمی دەست نەبردن بۆ پێوەری زیان جیاوازییەکی گەورە لە یاساکانی ئەو ولاتانەدا لەمەڕ سروشتی هۆیەکان و مەرجەکانیان سەریانهەڵداوە، لەم باسەدا هەوڵدەدەم هەموو ئەو هۆیانە بۆ زیانی نەویست و زیانی بەویست بگێڕمەوە.

### یەکەم -زیانی نەویست:

مەبەست بە زیانی نەویست ئەوەیە ویستی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە رۆڵێکی نەبێت لە سەرهەڵدانی سەرچاوەی زیانەکە، نە راستەوخۆ نە ناڕاستەوخۆ(بوونەهۆ)، وەك نەخۆشییەکانی ئەندامی زاوزێ و نازاوزێ لە نەخۆشییە جەستەییە گوازراوەکان یان بێزارکەرەکان، یان نەخۆشییە ئەقڵییەکان و ناتەواوییە(شکسە) بەردەوامەکان، ئەمانە و شتانی تر کە هیوای چاکبوونەوەیان لێ نەکرێت و نەتوانرێت لەگەڵ راستبوونەوەی ئەو زیانە سەرهەڵدراوە لە نەخۆشییەکەوە ژیانی هاوسەری بەردەوام بێت.

یاسا ئیسلامییەکان—ئەوانەی خوێندنەوەم بۆ کردوون— هاوڕان لەسەر دروستی جیاکردنەوە لەرووی قەزاوە لەباری جێگیربوونی نەخۆشییەك لەو نەخۆشیانە لەدوای فەراهەمبوونی مەرجە پێویستەکان تیایدا وەك: العراقی(م٤٣/٤ـ٦)، والاردنی مادەکانی (١١٣-١٢٢)، والسوری مادەکانی (١٠٥-١٠٨)، والمصری مادەکانی (٩ـ١١)، والمغربی (ف ٥٤-٥٥).

**بەڵام لەم دڕێژەپێدانەدا جیاوازیان هەیە:**

١-مافی داوای جیابوونەوە بۆ ژنەکە جێگیرکراوە نەك بۆ پیاوەکە-چونکە پیاوەکە بۆ خۆی خاوەنی تەڵاقە- لە العراقی (م٤٣)، المصری (م٩)، السوری (م١٠٥) مەزهەبی حەنەفی وەرگرتووە، هەروەها بۆ مێردەکە لە ئوردەنی: (م١١٣،م١١٧)، والمغربی (ف -٥٤).

ئەم ئاراستەی دووەمە تێگەیشتوانەترە، چونکە هاوڕایە لەگەڵ بۆچوونی جمهووری فەقیهانی موسڵمان، و دەستەبەری دادپەروەری و یەکسانی دەکات لەوەی لەسەر هاوسەرگیرییەکە سەرهەڵدەدات لە ئاساری ئەرێنی و نەرێنی، شایانی باسە جیاوازییەکی جەوهەری بوونی هەیە لە نێوان تەڵاق و جیاکردنەوەدا لەڕووی ئاسارەوە: پیاوەکە لە تەڵاقدا پابەندە بە هەموو مافە پاشینەکانی ژنەکەوە با هۆیەکەش لە ژنەکەوە بێت، بە پێچەوانەی جیاکردنەوە لەمەدا پیاوەکە پابەند نابێت بە مافی ژنەکەوە گەر ژنەکە هۆی جیابوونەوەکە بێت.

٢-مافی داوای جیابوونەوە لەباری ئاگاهی کەسی زیانۆمەند بە نەنگییەکە(سەرچاوەی زیانەکە) بەردەبێتەوە پێش گرێبەستەکە یان دوای گرێبەستەکە لەگەڵ رازیبوونی بە نەنگییەکە بەراشکاوانە یان بە ئاماژە(ئامێزگرانە) لە یاسای ئوردەنیدا بە هەڵوارنی نەبوونی پیاوەتی(م١١٤)، السوری (م١٠٦)، المصری (م٩)، المغربی (ف -١/٥٤) بەڵام دەقی العراقی (م٤٣/٤ -٦) بەرەهایی هاتووە، رەهاش هەڵدەدرێتە سەر رەهاییەکەی خۆی گەر بەڵگەیەك لەسەر سنووردارکردنی راست نەبێتەوە، بەڵگەش بوونی نییە.

پێموایە یاسادانەری عێراقی پێکاویەتی، چونکە هۆی حوکمەکە بریتییە لە زیانێك کە لە توانابەدەرە، یەکسانە پێش گرێبەستەکە بینرابێتەوە یان دوای گرێبەستەکە، پێش چوونە لا بێت یان دوای چوونە لا، زیانپێکەیشتوو لە ماوەیەکدا پێی رازی بێت یان پێی رازی نەبێت، پاشان دروست نییە کەسی زیانپێکەیوو ناچاریکرێت بە ئارامگرتن بەدرێژایی ژیانی، چونکە رۆژێك لە رۆژان

زیانی قبووڵ کردووه، ڕێسا ئوسوڵییەکە بڕیار لـە سـوڕخواردنی حـوکم دەدات لەگەڵ هۆیەکەی بە بوون و بە نەبوون، بۆیە پێشنیار دەکـەم هـەموو یاسـاکانی جیهانی ئیسلامی هەمان ڕێچکەی ئەم یاسایە بگرنە بەر.

٣-یاسای ئوردەنی(م١١٣) بەمـەرجی گرتـووە دلواکـەری جیابوونـەوە بـە هـەمان نەخۆشی تووش نەبوویێت یان بە نەخۆشییەك نزیك بێت لە نەخۆشییەکەی ئەو لە زیاندا، ئەگەر نە، مافەکەی لـە دلوای جیابوونـەوە بەردەبێتـەوە، بۆیـە ژنـی خاوەن لکان(رتق) یان داخران(قرن) بۆی نییە داوای جیابوونەوە بکـات بـەهۆی نەبوونی پیاوەتی مێردەکەیەوە، هـەمان شـت تایبـەت بـە نەخۆشـییەکانی تـر پێوانە بکە بۆ سەری.

پێشنیار دەکەم ئەو مەرجە پشتگوێ بخرێت، چونکە بەری ژیانی هاوسەری لـە واقیعدا لەدەستچووە، ئەوەش بەهۆی نەخۆشی یەکێکیانەوە یەکسانە ئەویتریان پێی تووشبوویێت یان بە هاوشێوەی ئەو لە زیاندا گرفتـار بوویێـت یـان تـووش نەبوویێت، گەر هیوای چاکبوونەوە و ئارامگرتن لەسەر زیانەکە بوونیان نەبوو.

٤-لە دیدگای یاسادانەری ئوردەنییەوە(م١١٧، م١١٨) جیاکردنەوە بوونی نییە گـەر نەخۆشی لەدوای چوونە لا روویدا، با چوونە لاش تەنها بۆ یەکجار بێت، یەکسانە زیانپێگەیشتوو پێی رازی بێت یان نە، ئـەم رایـە سـەرەڕای ئـەوەی هەنـدێ لـە فـەقیهان وتوویانـە-وەك حەنەفییـەکان- بەرهەڵسـتی دەکـات لەگـەڵ ڕێسـا گشتییەکانی شەریعەتی ئیسلامدا لەوانە: ﴿لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا﴾ ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ ، ((نە زیان و نە زیانگەیاندن)) بۆیـە پێشـنیار دەکەم پشتگوێ بخرێت.

٥-یاسادانەری سوری(م١٠٥/٢) لە نەخۆشـییە نازاوزێییەکانـدا تـەنها باسـی شـێتی کردووە گەر لەدوای گرێبەست هاتەکە ئاراوە، ئەم سـنووردارکردنە پێچـەوانەیە لەگەڵ ڕێسا گشتییەکانی شەریعەتی ئیسلامدا کە فەرمان دەکەن بە لادانی زیان سەرچاوەکەی هەرچییەك بێـت گـەر زیانپێگـەیوو بـە شـێوەیەکی هەمیشـەیی

راشکاوانە یان ئامێزگرانە(بە ئاماژە) قبووڵی نەکات، تێبینی دەکرێت ئەو یاسا باسکراوانە لەسەر ئەم خاڵانە هاوڕان:

أ–دانانی جیاکردنەوە–بەهۆی زیانی نەویستەوە– بە تەڵاقی بائین.

ب–دواخستنی جیاکردنەوەکە بۆ ماوەی ساڵێك لە هەر هۆیەك پێشبینی لاچوونی دەکرێت.

هەردوو حوکمەکە لەگەڵ رۆحی ئیسلام دادپەروەریدا پێکگێنەوە.

**دووەم- زیانی بەویست**

زیان بەویست دادەنرێت گەر ویستی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە دەستی هەبێت– راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ– لە روودانیدا، دەتوانریٚ سەرچاوەی ئەم جۆرە زیانە بۆ ئەم خاڵانە بگێڕینەوە:

أ–بێبەشکردنی ژنەکە لە خەرجی.

ب–بێبەشکردنی ژنەکە لە تێکەڵی و هاوسەری.

ج–دەستدرێژی یەکێکیان بۆ سەر ئەویتریان.

د–هەستانی یەکێکیان بە گوناه و یاخیبوونێك زیانی ئەویتری لێوە پەیدا ببێت.

**لێرە بەدواوە هەڵوێستی یاسا لەم بارانە دەخەینە روو:**

**أ-بێبەشبوونی ژنەکە لە خەرجی:**

مافی ژنەکەیە داوای جیابوونەوەی قەزاییانە بکات گەر بەهۆی بێبەشبوونی لە خەرجی تووشی زیان بوو، دانی پیادانراوە لە یاسای العراقي (م٤٣/٧، ٨، ٩) والاردني مادەی (١٢٧-١٣١)، والسوري المواد (١١٠-١١١)، والمصري المواد(٤-٦)، والمغربي (ف ٥٣-)، والتونسي (ف ٣٨-٤٠)، والمشروع الكويتي مادەی (١٠٨-١٠٩). بەڵام ئەم یاسایانە لەم حوکمانەدا جیاوازیان هەیە:

١–یاسای عێراقی(م٤٥) تەنهاکەوتۆتەوە بە دانانی جیاکردنەوە–بەهۆی خەرجی بۆ نەکردنەوە– بە تەڵاقی بائین، بە پێچەوانەی هەموو یاساکانی ترەوە کە بە تەڵاقی رجعی دادەنێن: الاردني (م١٢٨)، السوري (م١١١)، المصري (م٦)،

المغربي (ف ـ٥٢/٢)، الكويتي (م١٠٩). پێشنیار دەکەم یاسای عێراقی رێگەی ئەو یاسانەی تر بگرێتە بەر، چونکە پشتگیری بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەری تێدایە و چاودێرییەکە بۆ منداڵەکان ئەگەر هەیان بێت، زۆرجار ئەو پیاوەی بەهۆی لاسارییەوە خەرجی بۆ ژنەکەی ناکات پەشیمان دەبێتەوە، یان خودا پیاوە دەستەوسانەکە لە خەرجکردن دەوڵەمەند دەکات لەدوای تەڵاقەکە و لە ماوەی عیدەی ژنەکەدا، بۆیە پێدانی بوار بۆ گەڕانەوە لەپێشترە لە داخستنی دەرگا بە رووی تێهەڵچوونەوەی ژیانی هاوسەریدا لەگەڵ وەرگرتنی بەڵێننامە(گفتنامە) بە بەردەوامبوون لە خەرجکردن بۆ ژنەکە.

٢-یاسادانەری تونسی(ف-٣٩) بە پێچەوانەی هەموو یاساکانی ترەوە بەمەرجی گرتووە ژنەکە بەئاگا نەبێت بە هەژاری پیاوەکە لە کاتی گرێبەستەکەدا ئەگینا مافی لە داوای جیاکردنەوە بەردەبێتەوە با لە خەرجی بۆنەکردنیش تووشی زیان بووبێت.

بۆیە پێشنیار دەکەم ئەو مەرجە بسڕێتەوە، چونکە یاسا و شەرع حوکمەکەیان بە هۆوە گرێداوە، لەبەر ئەوەی سەرچاوەی زیانە، بۆیە لەگەڵی بە بوون و بە نەبوون دەسوڕێتەوە، رازیبوونی ژنەکە لە کات و سەردەمێکدا بە هەندێك هۆ و پێشبینی بەدینەهاتوو دروست نییە بێبەشی بکات لە داوای جیابوونەوە و بەدرێژایی ژیانی شانبداتە ژێر ئازاری زیان.

٣-لەباری جێگیربوونی دەستەوسانی پیاو لە خەرجی بۆ کردن ماوەیەك جیاکردنەوەکە دوادەخرێت لە مانگێك زیاتر نەبێت لە المصری (م٤)، دوو مانگ التونسی (ف ـ٣٩) و سێ مانگ الاردنی (م١٢٧)، والسوری (م١١٠)،والمغربی (ف ـ٥٣)، یاسای عێراقی لەباری خەرجی بۆ نەکردن بەهۆی بیانوویەکەوە وەك دەستەوسانی پیاوەکە مۆڵەتی نەداوە، بەڵکو مۆڵەتی بەو کەسە داوە بیانووی بۆ نییە بۆ ماوەی(٦٠) رۆژ وەك مێرێکی دەوڵەمەندی لاساری خەرجینەکەر بۆ ژنەکەی(م٤٠/٧,٨).

ئەوەی پێشنیار دەکەم یاسادانەر لە جیهانی ئیسلامی بیگرێتە بەر ئەوەیە زانا و فەقیهی مەزن ئیبن حەزم بۆی دەچێت پێش سەدان ساڵ لەمەوبەر: (خەرجی مێردی هەژاری دەستەوسان لەسەر ژنی دەوڵەمەند لەرووی دارایییەوە پێویستە) وەك باسمان کرد[1]، وایدەبینم پیاوی دەوڵەمەندی خەرجینەکەر شایستەی دواخستن و مۆڵەتپێدان نییە، چونکە کارەکەی بە تاوانێکی ئایینی و یاسایی و ئەخلاقی دادەنرێت، خەرجیکردنی لەسەر واجبە و ئەویش دەوڵەمەندە و ژنەکەشی گوێڕایەڵە و کارێکی ئەنجام نەداوە لەرووی شەرعەوە لە خەرجی بۆکردن بێبەش بکرێت، بۆیە لەسەر قازی پێویستە یەکسەر و دەمودەست ئەو ستەمە هەڵبگرێت بە دەرکردنی حوکم بە جیاکردنەوە گەر پیاوەکە سووربوو لەسەر خەرجی بۆنەکردن و ژنەکەش سووربوو لەسەر داوای تەڵاق.

٤-یاسای عێراقی(م٤٣/٩) -ئەوەندەی من لێی ئاگادار بم- تەنهاکەوتۆتەوە بە داهێنانی حاڵەتێك کە نە لە فیقهی ئیسلامی و نە لە یاسادا بوونی نییە، ئەوەش ئەوەیە بۆ ژنەکە ڕەوایە داوای جیاکردنەوە بکات(گەر پیاوەکە نەیویست ئەو خەرجییە کۆمابووە حوکمپێکراوەی بۆ بگێڕێتەوە لەدوای پێدانی مۆڵەت لەلایەن فەرمانگەی جێبەجێکردنەوە بۆ ماوەیەك زۆرەکەی شەست ڕۆژ بێت)

پێشنیار دەکەم ئەم برگەیە بسڕێتەوە چونکە یاسادانەری عێراقی کۆمەڵێك ڕێگەی یاسایی و قەزایی بۆ گێڕانەوەی قەرز دانپیاداناوە، بۆیە لێرەدا ناکرێت قەرزی ژنەکە لەسەر پیاوەکە بکرێتە هۆیە بۆ جیاکردنەوە لە کاتێکدا مێردەکە- لە ئێستادا- بەردەوامە لەسەر خەرجی بۆکردنی ژنەکەی.

**ب-بێبەشبوون لە تێکەڵی و هاوسەری:**

جیاکردنەوەی قەزایی بەهۆی زیانی بەویستی سەرهەڵدراو لە بێبەشکردنی ژنەکە لە هاوسەری و تێکەڵاوی، یاسای: العراقي (م٤٣/١، ٢، ٣)، الاردني مادەکانی

---

[1] ص٢٠٧. أنظر المحلى ٩٢/١٠.

(١٢٣ـ١٢٥)، السوری (م١٠٩)، المصری مادەكانی (١٢ـ١٤)، المغربی (ف ـ٥٨،٥٧) دانیان پیاداناوە لەگەڵ جیاوازی لەم درێژەپێدانەدا:

١–بێبەشبوون بەهۆی حوكمدان بەسەر پیاوەكەدا بە سزایەكی نەرێنی بۆ ماوەیەك كەمتر نەبێت لە سێ ساڵ ماف بە ژنەكە دەدات داوای جیابوونەوە بكات لەدوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر جێبەجێ كردنی حوكمەكەدا لە هەموو یاسا باسكراوەكاندا: الاردنی (م١٣٠)، السوری (م١٠٩)، المصری (م١٤). پێچەوانەی یاسای العراقی (م١/٤٣) كە راستەوخۆ لەدوای حوكمەكە ماف بە ژنەكە دەدات ئەمەش ئەوەیە لە هیچ یاسایەكی تردا–ئەوەندەی من لێی بەئاگام– نەمبینیوە، جگە لە یاسای یەكێتی سۆڤییەتی كارپێكراو لە ئێستادا(مەبەستی كاتی نووسینی كتێبەكەیە)، تەولوی یاسا ئیسلامییەكان و نائیسلامییەكان رێگە نادەن بە جیاكردنەوە مەگەر لەدوای تێپەڕبوونی ساڵێك لە كاتی جێبەجێ كردنی بڕیارەكەوە.

پێشنیار دەكەم یاسادانەری عێراقی هەمان ئاراستە بگرێتە بەر، چونكە بەندیخانە لە عێراقدا دامەزراوەی چاكسازییە و ژمارەیەكی زۆر لە بەندكراوەكان هەندێ جار و ناوە بەناوە مۆڵەتی سەردانی خێزان و ماڵ و خانەوادەیان پێ دەدرێت.

٢–یاسادانەری سوری(م١/١٠٩) جیاكردنەوەی بەهۆی سزایەكی نەرێنی بۆ ئازادی بە تەلاقی رجعی داناوە، پێشنیار دەكەم یاسادانەران لە جیهانی ئیسلامی رێگەی ئەو بگرنەبەر لەبەر ئەو پاڵپشتییەی تێیدایە بۆ بەردەوامی ژیانی هاوسەری.

٣–لەباری بێبەشبوونی ژنەكە لە تێكەڵاوی و هاوسەری بەهۆی كۆچی مێردەكەیەوە بەبێ پاساوێك، یاسادانەری عێراقی(م٢/٤٣) رێگەی نەداوە بە جیاكردنەوە گەر دوو ساڵ بەردەوام نەبێت، پێموایە ئەو ماوە دوورودرێژە زیان بە بەرژەوەندی ژنەكە دەگەیەنێت بەتایبەت گەر ترسی ئەوەی لەسەر بێت بكەوێتە ناو

گوناهەوە، بۆیە پێشنیار دەکەم ماوەکە بکرێت بە یەك ساڵ، چونکە مێردەکە هیچ پاساوێکی بەدەستەوە نییە.

٤-حوکمی کۆچکردن بە پشتتێکردن تەنها یاسای مەغریبی (ف-٥٨) باسی لەبارەوە کردووە کە بە دەق دەڵێت: (گەر مێردەکە پشتیکردە ژنەکە یان سوێندی خوارد لەسەر کۆچکردن لە ژنەکەی و وازهێنان لە جووتبوون لەگەڵی بۆ ژنەکە دروستە کارەکەی بەرزبکاتەوە بۆ لای قازی کە چوار مانگ مۆڵەت بە پیاوەکە دەدات گەر وەفای پێ نەکرد(نەگەڕایەوە بۆ هاوسەری کردن لەگەڵی) لەدوای ماوەکە ژنەکەی لەسەر تەڵاق دەدرێت، ئەوەش تەڵاقێکی رجعییە)

پێشنیار دەکەم هەموو یاسادانەران لە وڵاتە ئیسلامییەکان چاوی لێ بکەن، چونکە بڕیارێکی راست و دروستە و قورئان رایگەیاندووە: ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[1]، پێشتر بەدرێژی حوکمەکانی پشتتێکردنمان باس کردووە[2].

٥-یاسای الاردنی (م١٢٣-١٢٥)، والمصری (م١٢-١٣) ، والمغربی (ف -٥٧) دانیان بەوەدا ناوە: ژنەکە مافی ئەوەی نییە داوای جیابوونەوە بکات مەگەر ساڵێك بەسەر ئامادەنەبوونی مێردەکەیدا تێپەڕی بێت، لەدوای ئەوە:

أ-گەر شوێنی پیاوە بزرەکە زانراو بوو و دەتوانرا پەیوەندی پێوە بکرێت قازی ماوەیەکی بۆ دادەنێت، گەر ئامادە نەبوو لەگەڵی نیشتەجێ ببێت یان ژنەکە بگوێزێتەوە بۆ شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی یان تەڵاقی بدات ئەوا قازی لە جێگەی ئەو تەڵاقی دەدات، گەر ماوەکە گوزەری کرد و پاساوێکی قبووڵکراوی لێوە دەرنەکەوت قازی دڵنیادەبێتەوە لە سووربوونی ژنەکە لەسەر داوای تەڵاق گەر سووربوو بە تەڵاقی بائین لەیەکتریان جیادەکاتەوە.

---

(١) سورة البقرة: ٢٢٦،٢٢٧.

(٢) ص٧٥.

ب–گەر نەدەتوانرا پەیوەندی پێوەبکرێت و ماوەیەك بۆ چاوەڕوانی هەواڵی دانرا، گەر لەو ماوەدا ئامادەبوو، ئەگەر نە، قازی لەسەر ئەو تەڵاقی دەدات بەبێ دواخستن یان پاساو بۆ هێنانەوە.

تێبینی دەکرێت یاسای مەغریبی تەنهاکەوتۆتەوە بەوەی بەمەرجی دەگرێت ژنەکە بزربوونی پیاوەکە و زیانپێگەیشتنی بە هۆی بزربوونییەوە بسەلمێنێت جا یان بە بەڵگە یان بە سوێند، پێشنیار دەکەم یاساکانی تر ئەم مەرجە وەربگرن، چونکە ئەو سەلماندنە لە دلواکارییەکانی قەزای دادپەروەرن، وەك چۆن پێشنیار دەکەم گوزارەی(نامەی پێبگات، نامەی پێ نەگات) لە مادەکانی یاسای میسری و ئوردەنی و مەغریبیدا بگۆڕرێت بە (بتوانرێت پەیوەندی پێوە بکرێت، نەتوانرێت پەیوەندی پێوە بکرێت) تا گوزارشتەکە هەموو هۆکارەکانی پەیوەندیکردن لە چاخی نوێدا بگرێتەوە.

٦– المصری (٢١، ٢٢)، والاردنی (م١٧٧)، والتونسی (ف -٨٢) دەستیانبردووە بۆ بابەتی جیاکردنەوە بەهۆی بێسەروشوێنبوونی پیاوەکەوە لەگەڵ ئەم جیاوازیانەدا:

أ–یاسای تونسی ماوەی بە دوو ساڵ دیاریکردووە گەر بێسەروشوێنبوونەکە لە ڕەوشی نائاساییدا بوو لەدوای گەڕان و بێهیوابوون لە چارەنووسی، خەملاندنی ماوەکە بۆ دەسەڵاتی قازی وازلێدەهێنرێت گەر لە ڕەوشی ئاساییدا کەسەکە بێسەروشوێن بوو.

ب–یاسای میسری لەگەڵ تونسی هاوڕایە لە بەجێهێلانی کاری خەملاندن بۆ دەسەڵاتی قازی لە بێسەروشوێنبوون لەباری ئاساییدا، لە دیاریکردنی ماوە بە چوار ساڵ لەباری نائاساییدا وەك جەنگ لەگەڵ یەکتر جیاوازن.

ج–یاسای ئوردەنی لەگەڵ یاسای میسری هاوڕایە لە دیاریکردنی ماوەکە بە چوار ساڵ، بەڵام لەگەڵ میسری و تونسی لە دیاریکردنی ماوەکە بە یەك

ساڵ جیادەبێتەوە گەر پیاوەکە بێسەروشوێن بوو بەهۆی کارەساتی بوومەلەرزە و هێرش و پەلاماری فڕۆکەوە.

پێشنیار دەکەم خەملاندنی ماوەکە بۆ دەسەڵاتی قازی بەجێبهێڵرێت لە هەموو رەوش و حاڵەتەکاندا، کۆمەکی لە هۆکارە هاوچەرخەکان وەردەگیرێت بۆ زانینی چارەنووسی پیاوەکە.

یاسادانەری عێراقی دەستی بۆ ئەم درێژەپێدانە نەبردووە لەو سۆنگیەوە قسەکە تایبەتە بە جیاکردنەوەی قەزاییەوە نەك بە حوکمی مردنەوە.

یاسادانەری عێراقی تەنهاکەوتۆتەوە(م٤٣/٩) لە پێدانی مافی داوای جیابوونەوە بە ژنەکە بەبێ ئەوەی زیانی بەویست یان نەویست بوونی هەبێت، بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بکات لە ماوەی نێوان گرێبەستی هاوسەرگیری و چوونە لادا، تەڵاق پێش چوونە لا هەرچەند قورئان موباحی کردووە بە ئایەتی: ﴿لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ﴾(1)، بەڵام لەگەڵ ئەوەش وای دەبینم قازی پەلە نەکات لە وەڵامدانەوەی داوای جیابوونەوە تا لە نهێنی ئەو داوایە و رادەی سەرکەوتن و شکستخواردنی هاوسەرییەکە تێدەگات، شارەزایی قەزاییانەی خۆی و دوو داوەرەکە و لێکۆڵەری کۆمەڵایەتی بەکاربهێنێت، ئەوەش وەك پارێزگاری لەسەر بەردەوامی ژیانی هاوسەری و ناوبانگی خێزانەکە، چونکە هەموو تەڵاق و جیابوونەوەیەك خراپی ناوبانگی بۆ دوو هاوسەرەکە یان بەلانیکەمەوە بۆ یەکێك لە دوو هاوسەرەکە لێوە پەیدا دەبێت.

**ج-دەستدرێژی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بۆ سەری ئەویتریان:**

یاسای باری کەسێتی وڵاتە ئیسلامییەکان-ئەوەندەی من لێی ئاگادارم- جگە لە یاسای میسری هاوڕان لەسەر ئەوەی بۆ هەریەکێك لە دوو هاوسەرەکە هەیە داوای

(1) (لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أو تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ مَتَاعاً بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُحْسِنِينَ) (البقرة:٢٣٦).

جیاکردنەوە لە قەزا بکات گەر زیان پێگەیاندنی ئەویتر–بە گوفتار یان بە کردار– بۆ ئەم سەلمێنرا، بەجۆرێك ناکرێت لەگەڵ ئەو زیانەدا ژیانی هاوسەری بەردەوام بێت: (العراقی٤٠/١)، الاردنی (١٣٢)، السوری (م١١٢) المغربی (ف ـ٥٦)، التونسی (ف ـ٣٢)، المشروع الکویتی (م١١١).

بەڵام یاسادانەری میسری(م٦) ئەو مافەی تەنها بە ژنەکە داوە لەسەر ئەو بنچینەی پیاوەکە تەڵاقی بەدەستە، هەندێ حاڵەتی بەشەکی لێرەدا هەن، لەوانە:

١–گوزارەی(لا یستطاع[1]–نەتوانرێت شان بدرێتە ژێری) لە هەموو یاساکاندا هاتووە جگە لە یاسای عێراقی کە بە گوزارەی (یتعذر–ناتوانرێت) هێناویەتی، گونجاوتر ئەوەی یەکەمیانە، چونکە وشەی "یتعذر" مانای "مستحیل"ی هەیە، ئەم پلەیە بۆ حوکم بە جیابوونەوە داواکراو نییە.

٢–یاسادانەری میسری پێیوایە ئەو مافە بە تێپەڕبوونی کات بەردەبێتەوە بۆیە بۆ کەسی زیانپێگەیو بۆی نییە لەدوای تێپەڕبوونی ساڵێك داوا بەرزبکاتەوە، پێشنیار دەکەم ئەم مەرجە بسڕێتەوە، چونکە هۆی حوکمەکە بریتییە لە زیان، ڕێساکەش بڕیار دەدات لەوەی حوکم لەگەڵ هۆیەکەی بە بوون و بە نەبوون دەسوڕێتەوە.

٣–یاسادانەری عێراقی(م٤٠/٥) و میسری(م٦مکرر) فرەژنیان لە دەروازەی زیانگەیاندنی پاساودەر بە جیابوونەوە داناوە، بۆیە یاسای عێراقی ئەم مافەی داوە بە ژنە پێشووەکە و ژنە نوێیەکە بەرەهایی، گەر ژنی دواتر بەبێ مۆڵەتی دادگا بوو.

لە کاتێکدا میسری بوونی مۆڵەتی دادگا یان نەبوونی بەهەند وەرنەگرتووە، وەك چۆن ماف بە ژنی دواتر نەداوە مەگەر مێردەکەی هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی تر لێ شاردبێتەوە.

[1] واتە بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەری لەگەڵ زیانەکەدا ناتوانرێت شان بدرێتە ژێری.

وای دەبینم رێچکەی میسری لە راستییەوە نزیکە، چونکە گەر ژنی دووەم زانابوو بە هاوسەرییەکەی پێشووی بە دەستدرێژکار بۆ سەر مافی ژنەکەی پێشوو دادەنرێت، بۆیە پێویستبوو شایستە نەبێت بە مافی داوای جیابوونەوە، پاشان هیچ پەیوەندییەك بوونی نییە لە نێوان زیانی پێویست بە جیاکردنەوە لەگەڵ مۆڵەت پێنەدانی دادگا.

٤-هەمووان لەسەر ئەوە هاوڕان قەزا پەلە نەکات لە جیاکردنەوە مەگەر لەدوای هەوڵی تەولو بۆ چاکسازی و پەنابردن بۆ دوو داوەرەکە، وەك چۆن قورئان فەرمانی پێکردووە[1]، بەڵام جیاوازی دەربارەی دیاریکردنی سروشتی دەسەڵاتی دوو داوەرەکە هاتۆتە ئاراوە، زۆرینە لەسەر ئەوەن داوەر بریکارە و کارەکەی تەنها چاکسازییە و جیاکردنەوەی بۆ نییە، وەك چۆن قازیش پابەند نییە بەوەی دوو داوەرەکە پێشنیاری دەکەن یان بڕیاری لێ دەدەن.

یاسادانەری ئوردەنی بۆ ئەوە دەچێت بۆ دوو داوەرەکە دەسەڵاتی بڕیاردان هەیە و لەسەر قازی پێویستە جێبەجێی بکات، برگەی " ط/م١٣٢" بە دەق هێناویەتی: (لەسەر دوو داوەرەکە پێویستە راپۆرتێك بۆ قازی بەرزبکەنەوە لەمەڕ ئەو ئەنجامەی پێیگەیشتوون، لەسەر قازی پێویستە بەپێی ئەو راپۆرتە بڕیار بدات گەر تەبابوو لەگەڵ حوکمەکانی ئەم یاسایەدا)

ئەوەش برامان مامۆستا"أحمد حسن الفاضل"[2] گواستوویەتەوە: (یاسادانەری میسری بۆ ئەوە دەچێت دەسەڵاتی دانان بە جیاکردنەوەدا بە دوو داوەرەکە بدرێت بەبێ ئەوەی قازی بتوانێت خۆی لە جێبەجێ کردنی لابدات، رۆڵی قازی تەنها بریتییە لە راگەیاندنی بڕیار لە دوو داوەرەکەوە) ئەم قسەیە پڕلوپڕ نییە لەگەڵ واقیعدا و دەقی(م٩) بە هەڵە گوازراوەتەوە.

---

[1] (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا) (النساء: ٣٥).

[2] في مؤلفه: مدى حرية الزوجين في التفريق قضاء ط/١٩٧٥ ص١١٦.

٥-یاسادانەری عێراقی هەندێ حاڵەت باس دەکات کە ژنەکە تیایاندا زیانی پێدەگات بۆیە داوای جیابوونەوەی بۆ هەیە، بەڵام سەرچاوەی هۆی زیانەکە مێردەکە نە بێت، وەك لە باری هاوسەرگیریدا بەر لە تەولوکردنی هەژدە ساڵ بەبێ رازیبوونی قازی(م٤٠/٣) هەروەها لەباری زۆرلێکردن لە ژنەکە لە دەرەوەی دادگا(م٤٠/٤) پێشنیار دەکەم گوزارەی: (تەولوکردنی هەژدە ساڵ) بگۆڕرێت بە : (بەر لە باڵغبوون) تا لەگەڵ رای فەقیهانی موسڵمان یەکبگرێتەوە.

وای دەبینم حاڵەتی زۆرلێکردن لابدرێت، چونکە هاوسەرگیری بە زۆرلێکردن پووچە و جیاکردنەوە بۆ هاوسەرگیری دروستە، وەك یاسادانەر بە دەق لە هەمان یاسادا هێناویەتی(م٩/١)

پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە دڵنیادەکاتەوە مۆڵەتی ئافرەتی باڵغی ئاقڵ مەرجە بۆ دروستی هاوسەرییەکەی لە فەرموودەی: ((بێوەژن مارە ناکرێت تا فەرمانی لێ وەرنەگیرێت، کچیش مارە ناکرێت تا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێت))[1].

**د-هەستان بە گوناه و یاخیبوون لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە:**

لە شێوەکانی ئەو یاخیبوونانە ئەمانەن:

١-پاشگەزبوونەوەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە لە ئیسلام.

٢-یەکێك لە دوو هاوسەرەکە نەیەوێت بێتە ناو ئیسلامەوە دوای ئەوەی یەکێکیان هاتە ناو ئیسلامەوە بە هەڵواردنی ئەو حاڵەتەی ژنەکە ئەهلی کیتاب بێت لەدوای موسڵمانبوونی پیاوەکە، قورئان بە دەق ئاماژەی کردووە بە دروستی هاوسەری لەو بارەدا لەرووی سەرهەڵدان و مانەوەوە[2].

٣-پشتتێکردن: پێشتر بەدووردرێژی توخمەکانی و حوکمەکانی رۆشنکراونەتەوە[3].

---

[1] القسطلاني شرح صحيح البخاري ١٤٤/٦.

[2] (وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ) (المائدة الآية: ٥).

[3] ص٧٥.

٤-لەعنكردن دوای تۆمەتی ناپاكی هاوسەری، پێشتر حوكمەكانی ڕۆشنكراوەتەوە[1].

یاسا چارەسەری دوو حاڵەتی یەكەمی نەكردووە-بەپێی زانینی من-

یاسای مەغریبی(ف-٥٨) تەنهاكەوتۆتەوە بە ڕۆشنكردنەوەی حوكمی جیاكردنەوە بە پشتتێكردن وەك باسمان كرد، یاسادانەری عێراقی حوكمی ڕاستكراوەی جیاكردنەوەی(م٤٣) بۆ ناپاكی هاوسەری دەست بۆ بردووە، هەمان حوكمیشی بە نێربازی داوە، وەك چۆن لە شەریعەتی ئیسلامدا بڕیاری لێدراوە، بە جۆرێك جیاكردنەوە لەسەر كاری لەعنكردن ڕاستەوخۆ سەرهەڵدەدات هەروەك ڕای هەندێ لە فەقیهان، یان دوای حوكمی قەزا وەك چۆن هەندێكی تریان بۆی دەچن، ئەوەمان بە دوورودرێژی ڕۆشن كردۆتەوە[2].

ئاوات دەخوازین یاسا لە جیهانی ئیسلامیدا هەستێت بە ڕێكخستنی حوكمەكانی هاوسەرگیری و تەڵاق بە ڕێكخستنێك بەختەوەری و دامەزرانی ژیانی خێزانی موسڵمان دەستەبەر بكات، و لەگەڵ ڕۆحی شەریعەتی ئیسلامدا پێكبێتەوە، بەبێ پابەندبوون بە مەزهەبێكی دیاریكراوەوە.

ئەم باسە كەمە دەخەینە بەردەم یاسادانەری عێراقی هیوا وایە ڕای پارسەنگدراوی گونجاو لە ڕای فەقیهانی موسڵمانەوە وەربگرێت كە دەربارەی تەڵاق و جیاكردنەوە خستوومەتە ڕوو.

(خودا هەموو لایەك كۆمەك بكات بۆ كاری خێر و چاكە)

---

(1) ص٢٢١ وما بعدها.

(2) ص٢٢١ وما بعدها.

لەبەر ئاسان نەبوونی بەدەستهێنانی سەرچاوەکانی هەر دەوڵەتێك، یاسای هەندێ دەوڵەتم وەرگرتووە کە خاوەن تەشریعی شارستانی دێرین و پێشکەوتوون.

لە جیهانی سۆشیالیستەکاندا لەسەر یاسای یەکێتی سۆڤییەتی(جاران) وەستاوم لەو سۆنگەیەوە کە باشترین نموونەیە بۆ یاسا سۆشیالیستیەکان.

بەرانبەر بەوە بەدوای تەڵاقدا گەڕاوم لە یاسای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەو پێیەی دەوڵەتێکی مەزن و پیشکەوتووی جیهانی سەرمایەدارییە.

لە یاسا ئەوروپییەکاندا باس و گەڕانم بۆ تەڵاق لە یاسای ئینگلیزی و ئیتالی و ئەڵمانی و فەرەنسیدا کورتکردۆتەوە، چونکە ئەو دەوڵەتانە لە دێر زەمانەوە مۆرکێکی پێشکەوتنی یاساییان هەیە لە سەرجەم بوارەکانی ژیاندا.

بینا لەسەر ئەمە ناوەرۆکی ئەم دەروازەیەم لەرووی رواڵەتەوە دابەش کردووە بەسەر دوو بەشدا: بەشی یەکەمیانم تایبەت کردووە بۆ باس و لێکۆڵینەوەی تەڵاق لە دوو دەوڵەتی مەزنی یەکێتی سۆڤییەت و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە بەشی دووەمدا باسی تەڵاقم کردووە لە چوار دەوڵەتی جیهانی ئەوروپادا.

# بەشی یەکەم:
# تەلاق لە یاسای سۆڤێتی و ئەمریکیدا

بۆ باسی تەلاق لە یاسای هەر وڵاتێکدا باسێك تایبەت دەکەین.

باسی یەکەم: تەلاق لە یاسای سۆڤێتیدا لە شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە.

باسی دووەم: تەلاق لە سیستەمی ئەمریکیدا.

# باسی یەکەم:
# تەڵاق لە یاسای سۆڤییەتدا
# لە شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە

پـێش شۆڕشـی ئۆکتۆبـەری سـاڵی ١٩١٧ز ڕێسـا ئایینییـەکان ئەوانـەبوون حوکمەکانیان بەسەر پرسی هاوسەرگیری و تەڵاقدا تێدەپەڕاند، موسڵمان دەچووە ژێر شەریعەتی ئیسلامەوە و یەهودی دەچووە ژێر تەعالیمی ئیسرائیلی و مەسیحیش دەچووە ژێر ڕێساکانی کڵێساوە، بۆ هـەر دەستەیەکی ئـایینی دادگـای تایبـەت بـە خۆیان هەبوو کە پیادەکردنی حوکمە ئایینییـەکانی لەئەستۆ دەگرت، هاوسـەرگیری گرێبەستێکی ئایینی بوو بەپێی پایە و مەرج و شێوەگری داواکـراو لـە هـەر ئاینێکدا ئەنجام دەدرا، سەرەرای ئەوەی مەزهەبی فەرمی دەوڵەت لـەو کاتـەدا(پێش ١٩١٧ز) بریتی بوو لە مەزهەبی ئەرسۆزسکی لە ئایینی مەسیحیدا[1].

لەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر و ڕوخانی حـوکمی قەیسـەری لـە ڕوسـیا حوکمـەکانی هاوسـەرگیری و تـەڵاق بـەپێی ڕێسـا ئاینییـە ڕەچـاوکراوەکانی پـێش ئـەو شۆڕشـە هەڵوەشایەوە و جێگەی بە یاسای مـەدەنی گیرایـەوە کـە تـەبا و هـاوڕا بـوو لەگـەڵ سیستمی نوێی دەوڵەتدا.

چـەندین یاسـا بـەدوای یـەکتردا دەرکـران و چـەندین گـۆڕان بەسـەر حـوکمی هاوسەرگیری و تەڵاقدا هاتە ئاراوە، بەڵام ئەو یاسانە لە یەك شێوازدا نەبوون، بـەڵکو بە دوو قۆناغدا گوزەریان کردووە:

---

[1] David et hazard: القانون السوفيتي ج٢ ص٢٩٤، نقلا عن استاذنا الدكتور جميل الشرقاوي: أنحلال الزواج في حياة الزوجين واسبابه في التشريعات الأوربية ص٩٦ .

**یەکەم–** قۆناغی ڕەهاکردنی ویست بۆ پێکهێنانی هاوسەرگیری، و کۆتاهێنانی بە تەلاق لەلایەن یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە کەی و چۆنی بوێت، تا کارەکە گەیشتە ڕادەیەك یاسای یەکێتی سۆڤییەت دانی نا بە هاوسەرگیری کرداریدا(تەنها تێکەڵی لە نێوان پیاو و ژندا) و تەڵاقی کرداری(تەنها وەستانی گوزەرانی هاوبەش) ئەم حاڵەتە نزیکەی نۆزدە ساڵی لە ژیانی سۆشیالیستی خایاند.

**دووەم–** قۆناغی سنووردارکردنی ئازادی ویست لە تەڵاق و ڕێکخستنی حوکمەکانی هاوسەرگیری و تەڵاق بە ڕێکخستنێك دەست بەسەر ئەو هەرەمەکییەدا بگرێت و سنوورێك بۆ حاڵەتی هەڵوەشانەوەی هاوسەریی دابنرێت و دامەزران و جێگیربوونی خێزانی سۆڤێتی دەستەبەر بکرێت، دامەزرانێك پەروەردە بۆ منداڵی سۆڤێتی لە باوەشی باوانیان و ژیان لەژێر سێبەری سۆز و خۆشەویستی دایکاندا فەراهەم بهێنێت، بۆ سوود و ڕۆشنکردنەوەی زیاتر باسی ئەو دوو قۆناغە بەسەر دوو لقدا دابەش دەکەم:

## لقی یەکەم:
## قۆناغی ڕەهاکردنی ئازادی ویست لە تەڵاقدا
## ١٩١٧-١٩٣٦

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر١٩١٧ز و کۆتاهاتنی حوکمی قەیسەری بۆ یەکەم جار لە ١٨ی کانوونی یەکەم/١٩١٧ فەرمایشنامە(مەرسووم)ێك دەرکرا بەپێی داواکارییەکانی ئەو فەرمایشنامە هەموو سیستمە ئایینییە ڕەچاوکراوەکان لە حوکمەکانی هاوسەرگیری و تەڵاقدا هەڵوەشانەوە[1].

هاوسەرگیری ئایینی بزربوو تاکو هاوسەرگیری مەدەنی جێگەی بگرێتەوە پەیوەست بە هەموو هاوڵاتیان، بەچاوداخستن لە شوناسی بیروباوەڕ و نەتەوە و هەرێمیان.

لەو فەرمایشنامەدا ئازادی ویستی دوو هاوسەرەکە لە تەڵاق دانی پیادانراوە بەبێ ئەوەی بچێتە ژێر هیچ مەرج و کۆتوبەندێکەوە، مافی جیابوونەوەی بە ژنەکە داوە بە تەڵاقدانی پیاوەکەی، وەك چۆن مافی بە پیاوەکە داوە بە تەڵاقدانی ژنەکەی بەبێ پەیوەستبوون بە هیچ چاودێرییەکی ئایینی یان قەزاییەوە.

پاشان لە ١٦ی ئەیلولی ساڵی ١٩١٨ز یاسایەکی تر بە ناوی(کۆمەڵەی یاسای خێزان) دەرکرا کە حوکمەکانی بەسەر هەموو ئەوانەدا دەسەپا سەر بە دەوڵەتن لە کۆمارە سەرەکییەکان، ئەم کۆمەڵە یاسایە سیفەتی مەدەنیبوونی لە هاوسەرگیری و تەڵاقدا دانپیادانراوە، لەگەڵ ئەوەش دانی بە پیرۆزی گرێبەستی هاوسەرگیریدا ناوە و ڕێگری لە پیاوانی ئایینی نەکردووە بە کارەکە هەڵبستن و سەرپەرشتی بکەن، بەڵام ئەم هاوسەرگیرییە ئایینییە یاسا دانی پیادانانێت تا ئەوەی لە هاوسەری مەدەنیدا لە

---

[1] الشرقاوي المرجع السابق ص٩٧.DAVID: المرجع السابق ص٢٩٥.

ماف و ئەرکە هاوسەرییەکان[1] سەرهەڵدەدەن لەسەر ئەویش سەرهەڵبدەن، بۆیە لەسەر دوو هاوسەرەکە پێویستە لەدوای رێکارە ئاینییەکان پەلە بکەن بۆ تۆمارکردنی هاوسەرگیرییەکەیان بە شێوەیەکی مەدەنی لە تۆمارەکانی باری مەدەنیدا، بەوەش هەردوو سیفەتی ئاینی و مەدەنی دەگەنە ئەنجام(یەکدەگرنەوە)، بەپێی ئەم یاسایە هیچ جۆرە کۆتوبەندێکی بابەتیانە یان رووالەتیانە(شێوەگریانە) لەسەر ویستی دوو هاوسەرەکە بوونیان نەبووە جگە لە یەك کۆتوبەندی رووالەتی ئەوەش تەلاقدان بووە لەبەردەم قەزادا، تەنانەت لەو بارەشدا بۆ قازی هیچ جۆرە دەسەلاتێك نەبووە لە گفتوگۆ لەگەڵ دوو هاوسەرەکە و وەلامگۆییان دەربارەی هۆی چوونەپێش لە تەلاق یان رەدکردنەوەی داوایەکە، وەك چۆن هیچ جۆرە چاودێرییەکی قەزاییانە لەسەر دادگای تایبەتکراو بە تێروانین لە پرسی تەلاق بوونی نەبووە.

## گرنگترین حوکمەکانی کۆمەڵەی ١٩١٨:

دەتوانین ئەو حوکمانە لەم خاڵانەدا کورت بکەینەوە:

١- بۆ هاوسەرگیری هیچ کاریگەرییەك لەسەر لێوەشاوەیی ژنەکە و ماڵ و سامانەکەی نەبووە، ئەو لەرووی لێوەشاوەیی و هەڵسوکەوت و بەرێوەبردنی ماڵ و سامانەکەیەوە وەك پێش هاوسەرگیری دەمێنێتەوە.

٢- ئەم یاسایە دەربارەی گوزەرانی هاوبەش(نیشتەجێبوون) هیچ جۆرە پابەندبوونێکی بەسەر هەردوو هاوسەرەکەدا بەرانبەر بە یەکتر نەسەپاندووە، بەڵکو بۆ هەریەکەیان هەیە ئەو شوێنە هەڵبژێرێت کە ئارەزوو دەکات تیایدا بژی، بەبێ ئەوەی هیچ کام لە دوو هاوسەرەکە شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی بگۆرێت وەك پابەندبوونێك بە هاوسەرەکەی ترەوە بەوەی لەو شوێنگۆرینەدا

[1] أنظر المادة (٥٢) من مجموعة قانون الاسرة ١٩١٨. الشرقاوي المرجع السابق ص٩٧.

شوێنی بکەوێت، بەرپرسیارێتی یاسایی یان ئەدەبی لەسەر رەچاونەکردنی پەیوەندی هاوسەری لەرووی نیشتەجێبوونەوە سەریهەڵنەدەدا[1].

٣-ئازادی ویستی ژنەکە بۆ مافی تەڵاقدانی پیاوەکەی کەی بیەوێت لەم رادەیەدا نەوەستابوو، بەڵکو ئەو مافە بەپێی مادەی(١٩٧) لە یاسای سزاکانی سۆڤییەتی ئەوکات دابینکرابوو، یاساکە بڕیاری بەندکردنی پیاوەکەی دەدا گەر هەوڵبدات ژنەکەی ناچاربکات لەسەر بەردەوام بوون لە ژیانی هاوسەری لەگەڵی و لادانی لە بیرکردنەوەی تەڵاق[2]، بەڵام ئەم یاسایە ژنەکەی سزا نەدەدا گەر هەڵبستایە بەو جۆرە هەوڵانە.

٤-لەباری تەڵاق لە نێوان دوو هاوسەرەکەدا یاسا ناچاری نەکردبوون تەڵاقەکەیان بۆ یاسا بخەنە روو تاکو بەڕاستی بگێڕێت، بەڵکو سەرپشک کرابوون لە نێوان رووکردنە نووسینگەکانی تۆماری باری مەدەنی یان رووکردنە دادگا.

لە هەردوو بارەکەدا هیچ کۆسپێك لەبەردەم کەوتنی تەڵاقدا بە رێکەوتنی دوو لایەنەکە بوونی نەبوو، بۆیە سەرۆکی نووسینگەی تۆمارەکان تەنها دڵنیابوونەوەی لەسەر بوو لە دەرچوونی تەڵاق لە دوو هاوسەرەکەوە، پاشان جێگیرکردنی لە تۆماردا و رادەستکردنی بەڵگەنامە بە کەوتنی تەڵاقەکە[3].

٥-تەڵاق بە ویستی تاکلایەنە: وا پێویست بوو لەبەردەم قەزادا ئەنجام بدرێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نەبوو بۆ قەزا دەسەڵاتی رەدکردنەوە یان گفتوگۆ لەگەڵ دوو هاوسەرەکە دەربارەی رۆشنکردنەوەی هۆیەکان بوونی هەبووبێت[4].

---

[1] أنظر المادة (١٠٤) من مجموعة ١٩١٨.

[2] GROUBER: تطور قانون الاسرة في اتحاد الجمهوريات السوفيتية مقالة في نشرة جمعية التشريع المقارن سنة ١٩٤٦ ص١٢٣.

[3] استاذنا الشرقاوي المرجع السابق ص٩٧.

[4] سيمسون: تطور قانون الطلاق في أوربا مقالة في نشرة جمعية التشريع المقارن سنة ١٩٤٦ ص١٣٧ نقلا عن الشرقاوي ص١٠٠.

٦-کارێکی سروشتی بوو تەڵاق هەموو ئەرك و مافە سەرهەڵدراوەکان لە هاوسەرگیری کۆتایی پێ بهێنێت، بەڵام هەندێ هەڵواردن لەم ڕێسایە کرابوو، لەوانە:

أ- مافی خەرجی بۆکردن بۆ هاوسەری ئاتاجی دەستەوسان لە کار لەسەر هاوسەرەکەی تر کە خاوەنی دەسەڵاتی دارایی بوو بوونی هەبوو، بەبێ دیاریکردنی ماوەیەك بۆ ئەو خەرجکردنە، وادیارە داوالێکراوەکە بریتی بووە لە مێردەکە کە دەستپێشخەری بۆ تەڵاق کردووە[1].

ب-دوو هاوسەرەکە دوای تەڵاق-وەك باری پێش تەڵاق- پابەندبوون بە خەرجکردن بۆ منداڵەکانی هەردووکیان، ڕێکەوتنیان لەسەر ئەو ڕێژەیەی هەریەکەیان دەیتوانی شانبداتە ژێری بۆ هەبوو گەر ئەو کارە زیانی بە بەرژەوەندی منداڵەکان نەگەیاندبایە، چونکە بەپێی یاسا خەرجیکردنیان بۆ هەبوو بە چاوداخستن لە مەرج و ڕێکەوتنی دوو هاوسەرەکە[2].

٧-گەر لەسەر چۆنێتی خەرجی بۆ کردن ڕێنەکەوتبانایە دادگا کارەکەی دەگرتە ئەستۆ بۆ دیاریکردنی پابەندبوونی هەریەك لە دوو هاوسەرەکە(دایك و باوك) لەو کارەدا[3].

## کۆمەڵەی ١٩٢٦:

لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٦ز کۆمەڵەیەکی نوێ لە یاسای خێزان دەرکرا بۆ ئەوەی جێگەی یاسای ساڵی ١٩١٨ز بگرێتەوە، یاساکە جێبەجێ بکرێت لە یەکی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٧ز)ەوە، ئەم یاسایە زۆرترین زیادەڕەوی-بەراورد بە

---

[1] أنظر المادة (١٣٠) من القانون المذكور. وقد نظمت المواد (١٠٧ـ ١٢٩) احكام التزام الزوجين بالاتفاق. أنظر GROUBER المرجع السابق ص١١٩ نقلا عن الشرقاوي ص٩٨.

[2] المادة (١٦٦).

[3] المادة (١٦٧).

یاساکەی پێشوو– تێداکرابوو لەرووی رەهاکردنی ئازادی ویست لە پێکهێنانی هاوسەرگیری و کۆتاپێهێنانی، یاسادانەری سۆڤییەتی بۆ یەکەم جار دانی بە رەوایەتی هاوسەرگیری کرداری و تەڵاقی کرداریدا نابوو.

أ-هاوسەرگیری کرداری:

بریتی بوو لە سەرهەڵدانی پەیوەندی لە نێوان پیاو و ژنێکدا بەبێ ئەوەی گرێبەستی ئایینی یان مەدەنی پێشی کەوتبێت، یاسای ساڵی ١٩٢٦ز هەر مانەوەیەك لە شوێنی نیشتەجێبوونی هاوبەشدا و هەر دەرکەوتنێك بە سیفەتی هاوسەری لەبەردەم خەڵکیدا و هەر کۆمەکییەکی دارایی لە نێوان دوو رەگەزەکەدا بە نیشانەکانی راستبوونەوەی هاوسەرگیری دانابوو(م١١،م١٢) و ئاساری شەرعی وەك رەچەڵەك و میرات و شتانی تری لێیەوە سەرهەڵدەدا[1]، شایانی باسە ئەم دانپیادانانە مانای ئەوە نەبوو سیستەمی هاوسەرگیری تۆمارکراو پشتگوێ بخرێت لەرووی مانەوەی یاسا لەپاڵ هاوسەرگیری کرداریدا بۆ رەچاوکردنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت کە لە زۆرینەیدا تەنها بەرژەوەندنی ئاماریانە(إحصائية) بووە، هەروەها بۆ ئاسانکاری پارێزگاری لە مافە تاکەکەسی و داراییەکانی دوو هاوسەرەکە و منداڵەکان[2].

ئەوەی لەم یاسایەدا سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە: سەرەرای داننای بە هاوسەرگیری کرداریدا هەندێ کۆتوبەندی نوێی خستۆتە سەر رێکارەکانی تۆمار بۆ هاوسەرگیری فەرمی، بریار دەدات لە هاوسەرگیری فەرمی تۆمارکراودا تەنها دانانی دوو هاوسەرەکە بەس نییە بە نەبوونی رێگرێك لە رێگرەکانی هاوسەرگیرییەکەیاندا، بەڵکو پێویستە لەسەر هەموان لەبەردەم فەرمانبەری بەڵگەوەرگردا دان بنێن بەوەدا

[1] دادگای باڵای کۆماری یەککگرتووی سۆڤییەتی لە ساڵی ١٩١٢٧ بریاریدا لەوەی ژنی کرداری مافی لە میراتدا جێگیرە بەبێ ئەوەی پێویستی بەوە بێت هاوسەرگیرییەکەی لە تۆمارەکانی باری مەدەنیدا تۆمارکرا بێت.الشرقاوي المرجع السابق ص١٠٠ .

[2] أنظر المادة الأولى من هذا القانون.

ئاگاهییان لە باری تەندروستی لایەنی بەرامبەر هەیە، بەتایبەت لەمەڕ نەخۆشییە گوازراوەکان و ئەقڵییەکان، هەروەها هەریەکەیان چەند جارەی هاوسەرگیری پێشووی خۆی رابگەیەنێت، هەر بەو جۆرە ژمارەی منداڵەکانی گەر بوونیان هەبوو، هەر بەو جۆرە یاسا فەرمانبەری بەڵگەوەرگری پابەند کردووە بە ئاگادارکردنەوەی بە دوو هاوسەرەکە بەوەی پێچەوانەی ئەم گفتەیان لە داهاتوودا رووبەرووی سزایان دەکاتەوە[١].

ب-تەڵاقی کرداری:

کارێکی سروشتی بوو یاسای ساڵی ١٩٢٦ز دانبنێت بە تەڵاقی کرداریدا، چونکە دانی بە رەوایەتی هاوسەرگیری کرداریدا نابوو[٢]، تەنها راگرتنی گوزەرانی هاوبەشی نێوان دوو هاوسەرەکەی بە هەڵوەشانەوەی پەیوەندی هاوسەری(تەڵاقی کرداری) دانابوو.

شایانی باسە تەڵاقی کرداری تایبەت نەبوو بە هاوسەرگیری کرداری، بەڵکو هەموو کۆچکردنێکی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە لەویتریان یاسا بە تەڵاقی دادەنا، یەکسان بوو هاوسەرگیرییەکە بە تۆمارکراوی سەریهەڵدابێت یان بە کرداری بەرهەمی تێکەڵبوونی دوو هاوسەرەکە بەیەکتری، بەڵگە ئەوەبوو دادگای باڵای کۆمارە یەکگرتووەکانی روسیا لە ساڵی ١٩٢٩ز دەریکرد لەوەی راوەستانی گوزەرانی هاوبەشی نێوان پیاو و ژنەکە کە بە هاوسەرییەکی تۆمارکراو و جێگیرکراو لە تۆمارەکانی باری مەدەنیدا هاوسەری لەگەڵ کردووە بە تەڵاقی نێوانیان دادەنرێت[٣].

---

[١] الشرقاوي ص١٠٠.

[٢] پێشتر لەم کتێبەدا ئەوەمان رۆشن کردەوە هەریەك لە یاسای رۆمانی و یاسای حامورابی دانیان بە هاوسەرگیری کرداریدا نابوو بەڵام لەدوای گوزەرەکردنی ساڵێك لە تێکەڵاوی نارەوا.

[٣] أنظر GROUBER المرجع السابق ص١٢١ . الشرقاوي ص ١٠٠ .

یاسای کۆمارەکان دەستیان بۆ تەڵاقی کرداری بردووە: "ئۆکرانیا و روسیای سپی و ئازەربێجان و جۆرجیا و ئەرمینیا و تورکستان و ئۆزبەکستان و ئوتۆغیز" لە ماوەی نێوان ساڵەکانی ١٩٢٦ـ١٩٣٦[١].

دانانی یاسا نوێیەکە بە هاوسەرگیری کرداریدا بریتی نەبوو لە سڕینەوەی هاوسەری فەرمی، هەر بەو جۆرە دانانی بە تەڵاقی کرداریدا بریتی نەبوو لە کۆتاپێهێنانی تەڵاقی فەرمی کە لەبەردەم قەزادا ئەنجام دەدرا گەر بە ویستی یەکلایەنە بوایە و لای فەرمانبەری بەڵگەگر تۆماربکرایە، بەڵام لەژێر سێبەری یاسای نوێدا هیچ رۆڵێك بۆ ئەو تۆمارە نەمایەوە جگە لە پەردەلادان لە حاڵی کەوتنی تەڵاق نەك سەرپێهەڵدانی، ئەوەی لە مادەی(٢٠)ی ئەم یاسایەدا هاتووە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دادگا رێگەپێدراوە بڕیار لە کۆتاهاتنی هاوسەرییەکە بدات با تەڵاقی تۆمارکراویش لە تۆمارەکاندا بوونی نەبێت[٢].

بینا لەسەر ئەمە رێکارە قەزاییەکان بۆ کەوتنی تەڵاق لەژێر سێبەری یاسای (١٩٢٦)دا بەهەندوەرنەگیراون، بەڵکو تۆمارکردنی ئارەزووی تەڵاق لە نووسینگەی بەڵگەنامە بەس بووە.

ئەم یاسایە رێساکانی پابەندبوون بە خەرجی هاوسەری لەدوای تەڵاق راستکردۆتەوە، ماوەی خەرجکردن بۆ هاوسەری ئاتاجی بێ توانا لەکار بە ساڵێك یان شەش مانگ دیاریکردووە پێچەوانەی ئەوەی یاسای ساڵی ١٩١٨ لەسەری بوو لە دیارینەکردنی ئەو ماوەیە[٣].

---

[١] سیمسون ص١٣٧ .

[٢] مجموعةBRAS LE: مجموعة قواعد الطلاق في أوربا ص٣٢٩.

[٣] GROUBER المرجع السابق ص١٣٦،١٢٥. نقلا عن الشرقاوي المرجع السابق ص١٠١.

## لقی دووەم:
## قۆناغی سنووردارکردنی
## ئازادی ویست لە تەڵاقدا

دوای ئەوەی یاسادانەری سۆڤێتی هەستی کرد بە ترسناکی ئەو هەرەمەکییە لە هاوسەرگیری و تەڵاق بەرهەمی ئازادی بێسنوور بۆ هاوڵاتی سۆڤێتی لە پێکهێنانی هاوسەرگیری و خستنی تەڵاق بە پێویستی زانی سنوورێك بۆ ئەو هەرەمەکی و بەریەرەڵاییە خێزانییە دابنرێت کە سەرئەنجامە خراپەکانی تەنها خێزانە سۆڤێتییەکانی نەگرتبووەوە، بەڵکو کاریگەری لەسەر ژیانی گشتی کۆمەڵگەی سۆڤێتی دانا بوو، لەسەر ئەم بنچینەیە بۆ یەکەم جار لە لیژنەی جێبەجێکاری ناوەندی و دەستەی قومسێری گەلی یەکێتی سۆڤییەتەوە لە ٢٧/حوزەیران/١٩٣٦مەرسومێك دەرکرا تیایدا بڕیاردرابوو لە نەگونجانی جێگیرکردنی تەڵاق لە تۆمارە فەرمییەکاندا مەگەر بە ئامادەبوونی دوو هاوسەرەکە، هەر بەو جۆرە بڕیاریدا لە پێویستبوونی جێگیرکردنی تەڵاق لە شوناسنامەی کەسی هەریەك لە دوو هاوسەرەکەدا، وەك چۆن باجی سەپێنراوی زۆرتری لەسەر تەڵاق وەردەگرت، یاساکە کۆڵی قورسی دارایی لەسەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە یان هەردووکیان دانا لەدوای تەڵاق بۆ بەرژەوەندی منداڵەکان.

### گرنگترین حوکمەکانی یاسای ١٩٣٦:

دەتوانین گرنگترین ئەو حوکمانەی ئەم یاسایە بۆ سنووردارکردنی ئازادی ویستی دوو هاوسەرەکە لە تەڵاقدا بڕیاری لێدا لەم خاڵانەدا پوختە بکەین:

١-**جێگیرکردنی تەڵاق:** گەر تەڵاق بە ویستی تاکلایەنی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بوو پێویستە لە فەرمیدا تۆماری فەرمیدا تۆمار بکرێت و بە ئامادەبوونی هەردوو هاوسەرەکە بێت، لەسەر نووسینگەی تۆمار پێویستە ئەو هاوسەرەی تەڵاقی

بەسـەردا کـەوتووە ئاگاداربکاتـەوە بـۆ ئامـادەبوون، ڕێکارەکـانی تۆمـارکردن ناگیرێتەبەر بـەر لـە گەیشـتنی هـەواڵ بـە هاوسـەرەکەی تـر، گـەر شـوێنەکەی نادیاربوو جێگیرکردنەکە بۆ ماوەی شەش مانگ دوادەخرێت، بەڵام ئامادەبوونی خودی هاوسەرەکەی تر لەخۆیدا پێویست نییە و دەتوانێـت کەسـێك بکـات بـە بریکار و لەو کارەدا نوێنەری ئەو بکات.

پێویست بوو ڕێکەوتنی دوو هاوسەرەکە لەسەر پرسی دارایی یـان بـەخێوکر .. تۆماربکرێت، لەباری ڕێنەکەوتندا(ڕێنەکەوتنی دوو هاوسەرەکە) یەکلاکردنەوەی تەڵاقەکە لە پسپۆڕی دادگای تایبەتکراوە بۆ وردبوونەوە لە داواکە.

لەباری ئامادەنەبوونی ئەو لایەنەی تەڵاقی بەسەردا دەکەوێت پرسە داراییەکان و بەخێوکردن بەپێی ئارەزووی تەڵاقی ئەو هاوسەرەیان بڕیاری لێ دەدرێت[1].

٢-**باجی زیادە:** یاسای نوێ بڕی باجی تەڵاقی بەرزکردەوە وەك کۆتوبەندکردنێکی تر لەسەر ئازادی ویست بۆ چوونەپێش لە تەڵاق، بـۆ تـەڵاقی یەکـەم(٥٠) ڕۆبـڵ بوو، بۆ تەڵاقی دووەم(١٥٠) ڕۆبل بوو، بۆ تەڵاقی سێیەم(٣٠٠) ڕۆبڵ بوو[2]

٣-**خەرجی منداڵەکان:** ئەم یاسا نوێیە خەرجی منداڵەکانی کردووە بە کۆسپێکی تر لەبەردەم ڕووداوی تەڵاقدا، بڕیاریداوە چارەکێك لـە مووچـەی ئـەو هاوسـەرەی ئارەزووی جیابوونەوەی هەیە بۆ یەك منداڵ دیاریبکات، سێیەکی مووچەکەی بۆ دوو منداڵ، نیوەی مووچەکەی بۆ سێ منداڵ.

٤-**توندکردنەوەی قەزا:** لەسـەر قـازی پێویسـت بـوو توندکردنـەوە بکـات لەسـەر داواکارییەکانی تـەڵاق، و هەوڵبـدات پێکیانبهێنێتـەوە و بـەپێی توانا تـەڵاقەکـە ڕەدبکاتەوە[3].

---

[1] أنظر DAVID: القانون السوفيتي ج٢ ص٣٠٦.

[2] المرجع السابق ص٣٠٦، ص٣٠٧. الاستاذ الشرقاوي المرجع السابق ص١٠٢.

[3] أنظر المرجعين السابقين.

**یاسای ساڵی ١٩٤٤:**

گۆڕانێکی ریشەیی-بە شێوەیەکی راستەقینە و کرداری- نەهات بەسەر سیستمی هاوسەرگیری و تەڵاقدا لە یەکێتی سۆڤییەت تا دەرچوونی فەرمایشنامەی دەستەی باڵای یەکێتی سۆڤییەت لە (٨/تەمووز/١٩٤٤)، رێساکانی هاوسەری و تەڵاقی بە گۆڕانێکی ریشەیی گۆڕی لەپێناو بەرژەوەندی دامەزراوی خێزانی سۆڤێتی و جێگیربوونی ژیانی هاوسەری و پەروەردەی منداڵ لە ئامێزی دایك و باوکدا..

ئەم فەرمایشنامە کارێکی یاسایی یەکێتییانە بوو دلوای دەکرد یاسای کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤییەت لەسەری بڕۆن، دەتوانین گرنگترین ئەو حوکمانەی لەم یاسایەدا هاتبوون بۆ ئەم خاڵانە کورتبکەینەوە:

**١-ناشەرعیبوونی هاوسەرگیری تۆمارنەکراو:**

یاسای نوێ تۆمارکردنی کرد بە مەرجێکی شێوەگری بۆ دروستی هاوسەرگیری دوای ئەوەی هۆیەك بوو لە هۆیەکانی جێگیرکردن لەژێر سێبەری یاساکانی تردا.

هەر هاوسەرگیرییەك بە رێگا و رێکاری یاسایی تۆمار نەکرێت بە پووچ دادەنرێت و ئاساری یاسایی لەسەر پەیدا نابێت کە یاساکانی هاوسەرگیری و تەڵاق و وەسێت لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤییەت بڕیاری لێ دەدەن[1].

**٢-نادروستی تەڵاق لە دەرەوەی دادگا:**

ئەوەش وەك کۆمەکی بۆ جێگیربوون و دامەزرانی خێزانی سۆڤێتی و سنووردارکردنی ویستی دوو هاوسەرەکە لە چوونەپێش لە تەڵاق، یاسای نوێ بنەمای: (تەڵاق تەنها بە دەرکردنی حوکمێکە لەبەردەم قەزادا) هێنا، بۆیە هەموو تەڵاقێك بە ویستی تاکلایەنە بێت یان بە رێکەوتنی دوو هاوسەرەکە بە پووچ دادەنرێت گەر حوکمێکی قەزاییانەی لەسەر دەرنەکرێت و لە نووسینگەی باری

---

(١) الشرقاوي ص١٠٢

مەدەنی تۆمارنەکرابێت.

**٣-قەناعەتی قازی بە پاساوەکە[١]:**

یاسا نوێیەکە فەراهەمبوونی قەناعەتی قازی پێویست کرد بەوەی پاساوێك بۆ بوونی تەڵاقەکە هەیە، ئەم قەناعەتە لە لێکۆڵینەوەی هەموو کاروبارەکانی ژیانی هاوسەری بەدەست دێت بەتایبەت بۆ ئەوەیان داوای تەڵاق بەرزدەکاتەوە، هەر بەو داوا لەسەرکراویش، لەسەر قازی پێویستە وەڵامی دلواکە نەداتەوە و بڕیار بە کەوتنی تەڵاقەکە نەدات گەر قەناعەتی بەوە نەبێت پاساو بوونی هەیە ئەو کارە پێویست دەکات، بەوەش یاسادانەری سۆڤێتی خەملاندنی بەسبوونی هۆیەکان-کە داوای تەڵاق شانی لەسەر دادەدات بۆ پاساودانی- بە دەسەڵاتی قەزای دادەنا کە هەر حاڵەتێك بەپێی ڕەوشی تایبەت خۆی یەکلادەکاتەوە.

لەسەر قازی پێویستە لە قبووڵ کردنی ئەو هۆیانەی ئارەزوومەند لە تەڵاق دەستی پێوە دەگرێت ڕێنموونی لە مەبەستی یاسادانەری سۆڤێتی وەربگرێت لە یاسای ١٩٤٤ کە بریتییە لە دامەزرانی خێزان و دەستەبەری ناوەندی خێزانی بۆ بەرژەوەندی پەروەردەی منداڵەکان.

**٤-دەسەڵاتی خەملاندنی قازی:**

بەپێی یاسا نوێیەکە دادگا پابەند نییە بە حوکمدان بە تەڵاق هۆیەکە هەرچییەك بێت، بەڵکو ڕەدکردنەوەی دلواکەی بۆ هەیە یا بە ڕێکەوتنی دوو هاوسەرەکەش بێت.

**٥-تەڵاق بەبێ هۆی یاسایی بوونی نییە:**

بۆ دادگا نییە وەڵامی داوای تەڵاق بداتەوە گەر هۆیەکی یاسایی بوونی نەبوو تاکو پاساوی بدات، وەك ئەم هۆیانە:

أ-هەستان بە زینا لە هاوسەرەکەی ترەوە.

---

[١] سيمسون المرجع السابق ص٣٨. الشرقاوي المرجع السابق ص١٠٥.

ب–هەڵسوکەوتی خراپ و نەشیاو.

ج–دابڕانی بەردەوامی یاخی لە چارەسەر.

د–مامەڵەی خراپ کە بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەری ئەستەم دەکات.

سەرەڕای راستبوونەوەی هۆیەك لەم هۆیانە بۆ دادگا هەبوو دلواکە لەم بارانەدا رەد بکاتەوە:

أ–گەر دلواکەر دانی بە هەڵەی خۆیدا نا.

ب–گەر هەڵەی دلوالەسەرکرلو نەسەلما.

ج–گەر دوو هاوسەرەکە منداڵی ناکامیان هەبوو، تەلاقیش رەوشێکی نالەباری بۆ بەرژەوەندی پەروەردەی منداڵەکان دروست دەکرد.

٦-رێکارە قەزاییەکان[1]:

یاسادانەری سۆڤێتی لە یاسای (١٩٤٤)دا شوێنکەوتنی رێکارە قەزاییە توندەکانی سەپاند وەك هۆکارێك لە هۆکارەکانی کەمکردنەوەی رووداوی تەلاق، ئەو رێکارانە: هەر تەلاقێك لە قەزاوە بڕیار بەدەست دەهێنێت پێویستە بە دوو قۆناغدا گوزەر بکات:

**قۆناغی یەکەم:**

دلوای تەلاق بەسەر دادگایەکی پلە نزمدا لە پلەکانی قەزاوەت بخرێتە روو، دلوای تەلاق بەپێی یاسا بۆ دادگای تایبەتکرلو بە گەل دەخرێتە روو بەپێی رێساکانی پسپۆڕی لە یاسای سۆڤێتیدا، لەسەر ئەو دادگایە پێویستە ئەم رێکارانە بگرێتە بەر:

أ–دلوای ئامادەبوونی دوو شایەت و پرسیارکردن لە پاڵنەرەکانی تەلاقەکە.

ب–گوێگرتنی ئامادەبوونی هەریەك لە دوو هاوسەرەکە گەر بە پێویستی بینی.

ج–دلوا لە دلواکەری تەلاق بکرێت لە رۆژنامەیەکی لۆکاڵی لەسەر باخەڵی خۆی هەواڵی دلوای تەلاقەکەی لەگەڵ رۆشنکردنەوەی ناوی دوو هاوسەرەکە و شوێنی

---

[1] مجموعة BRAS IE ص٣٣٥ . الشرقاوي ص١٠٦.

نیشتەجێبوونیان بلاوبکاتەوە، گەر دلوا لەسەرکرلو نەیتوانی بۆخۆی ئامادە ببێت وەرگرتنی قسەکانی بە ڕێگەی نوێنەرایەتی دەبێت[1].

د–هەوڵی پێکهێنانەوەی دوو هاوسەرەکە، گەر هەوڵەکە سەریگرت بڕیار دەدرێت بە کۆتاهێنانی دلواکە بە پێکهێنانەوەی دوو هاوسەرەکە، گەر شکستی خوارد بڕیار دەدرێت بە کۆتاهێنانی ڕۆڵی وردبوونەوە لە دلواکە و کۆنووسێك سەرنووس دەکرێت بۆ جێگیرکردنی هەموو ڕێکارەکان کە لەبەردەم دادگادا بەئەنجام گەیەنراوە.

**قۆناغی دووەم:**

گەر دلوای تەڵاقەکە بە چاکسازی و پێکهاتنەوەی دوو هاوسەرەکە لەبەردەم دادگای یەکەمدا هەڵنەوەشایەوە بۆ دلواکەری تەڵاق هەیە پەنا ببات بۆ دادگایەکی پلە بەرزتر، ئەوەش هەندێ جار دادگای هەرێمەکەیە یان دادگای ناوەند یان شار یان تەنانەت دادگای باڵای کۆمارەکە کە ئەندامی یەکێتییەکەیە بەپێی ڕێساکانی ڕێکخستنی قەزاییانە لە هەر کۆمارێکدا، ئەویش لەسەریەتی بانگی دوو هاوسەرەکە بکات بۆ ئامادەبوون لەبەردەمی و گفتوگۆ لەگەڵیان تا سەرپەرشتی یەکلابوونەوەی دلوایەکە بکات، ئەوە سەلمێنرا دادگاکانی گەل سەرکەوتنێکی گەورەیان لە زۆربەی کاتەکاندا بەدەستهێناوە لە چارەسەرکردنی کێشەکان و پێکهێنانەوەی دوو هاوسەرەکە، ڕێژەی پێکهێنانەوە لە هەرێمی "تیشرنیگوف"ی کۆماری ئۆکرانیا گەیشتبووە ٥٤٪ وەك چۆن لە هەرێمی ریزان گەیشتبووە ٥٦٪ لە کۆی ئەو دلوایانەی بۆ قەزای تایبەتکرلو خرابوونەروو.

٧-باج:

باجی سەپێنرلو بەسەر دلواکاری تەڵاقدا کارکەرێکی تر بوو یاسادانەری سۆڤێتی خستبوویە سەر کارکەرەکانی تر کە ئازادی ویستی تەڵاقیان کۆتوبەند دەکرد، بۆ ئەوەی مەوداکەی بەرتەسك بکەنەوە، بەپێی مادەی(٢٧) لە یاسای باسکرلو پێویستە

---

[1] أنظر المرجعين السابقين.

بڕێك پارە كە لە (٥٠٠–٢٠٠٠) رۆبڵە بدات، بڕیار لە تەڵاق نادرێت گەر ئەو باجە نەدات، دیاریكردنەكەی لەلایەن دادگاوەیە، هەروەها لەرووی ئەو كەسەوە پێیەوە پابەند دەبێت، بەڵام زۆرجار قەزا دەیسەپاند بەسەر ئەوەیاندا ئارەزووی تەڵاقدانی هەبوو، تێبینی دەكرێت ئەو برە پارەیە كۆڵێكی زۆر قورس بووە تایبەت بەوانەی داهاتیان سنووردار بووە، بەڵام سەرەرای ئەوەش یاسادانەری سۆڤێتی وەك هۆكارێك لە هۆكارەكانی كەمكردنەوەی رووداى تەڵاق تەماشای كردووە.

٨-پەلەنەكردن لە چوون بە دەم داواكەوە:

كۆمەڵەی گشتی دادگای باڵای یەكێتی كۆمارەكانی سۆڤییەتی سۆشیالیستی لە (١٦/ئەیلول/١٩٤٩[١])دا فەرمایشنامەیەكی دەركرد كە رێنموونی بە قەزا دەدات پاڵپشتی كردنی دامەزراوی خێزانی سۆڤێتی بەهەند وەربگرێت، هەموو ناكۆكییەكی لابەلا بە هۆی قبوولكراو بۆ تەڵاق تەماشا نەكات، هەر بەو جۆرە ناكۆكی نێوان دوو هاوسەرەكە بە هۆی لەناكاو و كوتوپڕ و كاتی یان تەنها بە رەدكردنەوەی پەیوەندی هاوسەری لەلایەن یەكێك لە دوو هاوسەرەكەوە، هەروەها پێویستە لەسەری رەچاوی ئاراستەی یاسادانەری سۆڤێتی بكات بەرەو جەنگان دژ بە تەڵاق و پێكهێنانەوەی دوو هاوسەرەكە بەپێی توانای پێویست.

٩-چاودێری قەزایی لەسەر رێكارە قەزاییەكان:

یاسای دادگا باڵاكان دادگاكانی گەلی–كە ورددەبنەوە لە بابەتی تەڵاق–پابەندكردووە بۆ دڵنیابوونەوە لە رادەی پابەندبوونی ئەو دادگانە بە رێكارە داواكراوەكانەوە، هەروەها لە رادەی ئەو هەوڵ و كۆششانەی ئەو دادگانە بۆ رێكەوتنەوەی دوو هاوسەرەكە دەیبەخشن، تێبینی دەكرێت جیاوازی ئەو بنەمانەی كە رێكخستنی هاوسەرگیری و تەڵاقی لە یاسا یەك بەدوای یەكەكانی سۆڤییەتدا

---

[١] ونشر في جريدة البرافدا في ١٥/ تشرين الأول/١٩٤٩.

لەسەر دەرچووە لەدایکبووی ڕێکەوت نەبووە، بەڵکو لەسەر ئەزموونی کرداری و سەرئەنجامی نەرێنی ئاشووبەی تەڵاق بیناکراون، لەدوای ئەزموونە خراپەکانی هاوسەرگیری کرداری بۆ یاسادانەری سۆڤییەتی و بیرمەندانیان ڕۆشن بوویەوە مەبەست لە هاوسەرگیری تەنها تێرکردنی غەریزەی جووتبوون نییە، بەڵکو ئامانجی بنەڕەت بریتییە لە پێکهێنانی خێزانی بەختەوەر و دامەزراو و بیناکراو لە بنچینەی خۆشەویستی و سۆز و ئارامی بۆ ئەوەی نەوەیەکی نوێ پەروەردە بکەن، وەك چۆم قورئان هەزار و چوارسەد ساڵ لەمەوبەر ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاندووە بە ئایەتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً أن فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[1].

پاشان پابەندکردنی قەزا بە پەلەنەکردن لە بڕیاری تەڵاق و پەنابردن بۆ هەوڵی پێکهێنانەوە و ئاشتەوایی نێوان دوو هاوسەرەکە بەر لە وەرگرتنی هەر بڕیارێکی تر ئەوەیە قورئان بە دەق هێناویەتی، لە ئایەتی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا أن يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا﴾[2].

بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە ئەو دەوڵەتانەی ئایینیان بریتی نییە لە شەریعەتی ئیسلام لە هەندێ پرس و بابەتدا حوکمەکانی ئیسلام زۆرتر و زیاتر لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامی و قەزای وڵاتە ئیسلامییەکان جێبەجێ دەکەن.

## حوکمەکانی تەڵاق لە یاسای کارپێکراوی ئێستادا:

ئاراستەی یاسادانەری سۆڤێتی لەسەر بیرۆکەی دەستبردن بۆ تەڵاقی سنووردار و پێنەدانی بوار بە تەڵاق دامەزراوە گەر باوەڕ بەوە نەهێنێت بەردەوامی ژیانی هاوسەری بووە بە کارێکی نەشیاو و نەگونجاو.

---

[1] سورة الروم: ٢١.

[2] (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا أن يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا أن اللَّهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً) (النساء:٣٥).

دەتوانین گرنگترین ئەو کۆتوبەندانە کە یاسای ئێستا لە تەلاقدا دەیسەپێنێت بەسەر ویستی دوو هاوسەرەکە لەم خالانەدا کورتبکەینەوە:

١-بۆ مێردەکە دروست نییە بەبێ رازیبوونی ژنەکەی داوای تەلاق بکات لە ماوەی سکپڕیدا و لەدوای تێپەڕبوونی سالێك بەسەر لەدایکبوونی منداڵەکەدا.

٢-حوکم بە تەلاق بوونی نییە گەر نەگونجانی بەردەوامی ژیانی هاوسەری و زیان نەگەیاندنی تەلاقەکە بە منداڵە ناکامەکان و بە هاوسەرەکەی تر(داوا لەسەرکراو) بۆ دادگا نەسەلمێت، واتە پێویستە تەلاق زیان بە بەرژەوەندی دوو هاوسەرەکە و منداڵەکان و کۆمەڵگە نەگەیەنێت.

بە دەق چاودێری کردنی ئەو بەرژەوەندییانە بڕیاری لەسەردراوە لەلایەن دەستەی دادگای بالای یەکێتی سۆڤێتەوە لە (٢٨/تشرینی دووەم/ ١٩٨٠) بەناوی پیادەکردنی دادگاکان بۆ یاسای پەیوەست بە پرسی تەلاقەوە، بلاوکراوەی دادگای بالای یەکێتی سۆڤییەت(پۆلیتین)(١٩٨١م ژمارەی یەك، لا١٢-لا١٧) کە لە ناوەرۆکەکەیدا هاتووە: (لەسەر دادگا پێویستە هەموو رێکارە پێویستەکان بگرێتەبەر بە مەرامی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان دوو هاوسەرەکە و پارێزگاری لە خێزان، بۆیە پیاوەکە مافی ئەوەی نییە داوای تەلاق بکات لە کاتێکدا ژنەکەی سکپڕە، هەر بەو جۆرە ئەو مافەی بۆ نییە لە سنووری سالێك دوای دانانی منداڵەکە، بۆ دادگا نییە لەو ماوەیەدا بوار بە تەلاق بدات) هەروەها بلاوکراوەکە بە دەق هێناویەتی لەباری بڕیاری دادگا بە تەلاق(کاتێك پێکنەهاتنەوە) لەسەریەتی هەموو رێکارە پێویستەکان بگرێتە بەر بۆ پارێزگاری لە بەرژەوەندی منداڵەکان(ئەوانەی بالغ نین)، هەروەها بۆ بەرژەوەندی ئەو ژنانەی کارکەر نین و سەرچاوەیەکی داهاتیان نییە بۆ گوزاران.

٣-پێویستە باجێك بدات کە بڕەکەی (١٠ رۆبل)ە لەباری بەرزکردنەوەی داوادا، لەدوای دەرچوونی بڕیاردان ئەو بڕە پارەیە کە پێویستە لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە یان لە هەردووکیانەوە بدرێت دادگا لە سنووری(٥٠-٢٠٠) رۆبل

دیاریدەکات، خەملاندنی بڕە پارەکە بەپێی بڕی مووچەی هەریەك لە دوو هاوسەرەکە و بوونە هۆی تەڵاقە[1].

٤-کار بە هاوسەرگیری کرداری(ناڕەوا) ناکرێت با بە ڕێگەی ئوسولیش تۆمارکرابێت، بۆیە ڕێکارەکانی تەڵاق بۆ ئەو جۆرە هاوسەرگیرییە ناگیرێتە بەر، چونکە لە بنچینەوە بە پووچ دادەنرێت، مادەی(١٥) لە یاسای خێزانی سۆڤێتی کارپێکراو لە ئێستادا بە دەق هێناویەتی: گرێبەستی هاوسەرگیری پووچە لەباری دەرچوون لەو مەرجانەی بەدەق هاتوون لە مادەی "١٠"ی ئەم یاسایەدا[2]، لە گرنگترین هۆکارە یاساودەرەکان لە ئێستادا:

أ-لەدەستدانی لێوەشاوەیی مەدەنی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بەهۆی نەخۆشییەکی دەماغی یان دواکەوتنی ئەقڵی پاساوبداتە دەست هاوسەرەکەی تر داوای تەڵاق بکات.

ب-حوکمدان بەسەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکەدا بە بەندکردن بۆ ماوەیەك لە سێ ساڵ کەمتر نەبێت.

تێبینی دەکرێت یاسادانەری سۆڤێتی تەنها حوکمەکە لەدوای بەدەستهێنانی پلەی بەتکردن(بڕانەوە) بە هۆی پاساودەر دادەنێت بۆ داوای تەڵاق بەبێ دواخستن بۆ ماوەیەك کە بەسەر حوکمەکەدا گوزەر بکات، ئەمە ئەوەیە یاسادانەری عێراقی کاری پێکردووە وەك باسمان کرد[3].

ج-بێسەروشوێنبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بەپێی بڕیاری دادگا کە بڕیاربدات یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بێسەروشوێنە، لەو بارەدا ئەویتریان مافی

---

(1) أنظر: أ. م. نيجايفا ـ الزواج، العائلة، القانون ـ موسكو ١٩٨٤م/دار العلم للطباعة ـ ص٥٨ وما بعدها. وقد تفضل بالترجمة مشكورا الزميل الدكتور صالح العبيدي من اللغة الروسية.

(2) أنظر كتاب القوانين والاحكام الاساسية في التشريع السوفيتي الصادر عام ١٩٧٢ في موسكو الجزء الثاني ص٣٤٧ ومابعدها. وقد تفضل بالترجمة مشكورا الزميل الدكتور حكمت شبرد من اللغة الروسية.

(3) ص٢٥٠.

ئەوەی هەیە دلوای تەڵاق بکات، لەسەر ئەم حوکمە تێبینی دەکرێت کەسی ونبوو گەر قازی بە مردووی دانا پەیوەندی هاوسەری کۆتایی پێ دێت، بۆیە لە دوای ئەوە پێویست ناکات بریار بدرێت بە تەڵاق.

٥- لەباری رێکەوتنی دوو هاوسەرەکە لەسەر تەڵاق و نەبوونی منداڵی ناکام رێکارەکانی تەڵاق لە زاکس(ناوەندە مەدەنییە تایبەتکراوەکان بە تۆماری هاوسەرگیری) بەرێوەدەبرێن، لەو بارەدا بەڵگەنامەی تەڵاق دەرناکرێت مەگەر دوای تێپەربوونی سێ مانگ بەسەر بەرواری بەرزکردنەوەی دلوای جیابوونەوە.

رێکخستنی ئەم بابەتانە بەپێی یاسای هاوسەرگیری و خێزانە لە یەکێتی سۆڤییەت بۆ ساڵی ١٩٦٨.

شایانی باسە رێگەی پیادەکردنی یاسای سەراپا و وەك یەك بەسەر هەموو کۆمارەکانی پێکهێنەری یەکێتی سۆڤییەت کاری پێنەکراوە لە کاتی دەرچوونی یاسای (١٩٦٨)ەوە و پاڵپشت بۆ لای یاسای کۆمارەکان کە لە ١٩٦٩-١٩٧٠ دەرکراون، هێڵە سەرەکییە بەرینەکانی وەرگرتووە و رەچاوی بیروباوەڕ و نەریتی کۆمارەکانی کردووە لە هاوسەرگیری و تەڵاقدا، پێچەوانەی ئەوەی یاساکانی پێشتر لەسەری بوون[1].

---

(1) أ. م. نيجايفا المرجع السابق ص٥٨-٧٣ باللغة الروسية.

# باسی دووەم:
# تەڵاق لە سیستمی ئەمریکیدا

بنەمای باڵادەست و بڕیار لەسەردراو و کارپێکراو لە ئێستادا و لە دادگاکانی ئەمریکادا ئەوەیە هەردوو هاوسەرەکە مافی ئەوەیان هەیە داوای تەڵاق بۆ دادگا بەرزبکەنەوە گەر توانی دادگا باوەڕ پێ بهێنێت بەوەی لە ژیانی هاوسەریدا بەختەوەر نییە و ناتوانێت لەسەر ئەو ژیانە بەردەوام بێت، بەڵام پابەند نییە بەوەی لەبەردەم قەزادا بوونی هەڵە لە هاوسەرەکەی ترەوە بسەلمێنێت، بۆ دادگاش هەیە بڕیاری تەڵاق دەربکات گەر باوەڕی بەوە هێنا بوارێك نەماوە بۆ چارەسەری ناکۆکییە هاوسەرییەکان و گێڕانەوەی تەبایی و پاکی و خۆشەویستی بۆ نێوانیان.

**پوختەی قسان:** ئەو هۆیانەی دادگا ئەوروپییەکان پێیەوە پابەندن لە قەزای ئەمرکیدا بوونیان نییە، بەڵکو ئاراستەی باو لە حەفتاکانی سەدەی رابردوودا ئەوە بوو دادگا دەتوانێت بڕیاری هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیری بدات گەر باوەڕی هێنا بەو بەڵگانەی خاوەن داواکە بۆ تەڵاق پێشکەشی دەکات و ئاسۆیەك بۆ گێڕانەوەی پاکی و بەختەوەری بۆ ژیانی هاوسەرییان بوونی نەبوو.

لە ساڵی (١٩٧١)ەوە ئەم ئاراستەیە دەستی پێکردووە[1] لەدوای ئەوەی یاسارێژی ئەمریکی لە هەندێ لە ویلایەتەکاندا کاریگەر بوو بە مەزهەبی پرۆتستانتی مەسیحی لە هاوسەرگیری و تەڵاقدا، لەو ویلایەتانەدا رێگەنەدەدرا بە تەڵاق مەگەر بۆ تەنها یەك هۆ ئەویش ناپاکی هاوسەری بوو، دەستگرتن بەم کۆتوبەندە بەرتەسکەوە ماوەیەکی دوورودرێژ کاری پێکرا هەتا سەرەتای حەفتاکان، یاسادانەری ئەمریکی لەوە لایدا و

---

[1] بڕوانە: WEYRAUCH KATZ: AMERICAN FAMILYLAWINTRANSITION (1982) U. S. A P. 309 بەسوپاسەوە هاوکارم دکتۆر ممدوح عبد الکریم وەریگێڕاوە.

رووی لە بەرینکردنی بازنەی تەلاق کرد لەدوای ئەوەی خراپ بەکارهێنانی ئەم هۆیە سەلمێنرا، کاتێك هەر هاوسەرێك کە ئارەزوومەند نەبوو بۆ ژیان لەگەڵ هاوسەرەکەی تر و هەستی بە فەراهەمبوونی بەختەوەری نەدەکرد بە ناپاکی هاوسەری تۆمەتباری دەکرد و دلوای تەلاقی بۆ قەزا بەرز دەکردەوە.

لە ئێستادا پێوەری کارپێکراو لە دادگاکانی ئەمریکادا ئەوەیە هەر کات یەکێك لە دوو هاوسەرەکە توانی قەزا باوەڕ پێ بهێنێت بەوەی ناتوانێت بەردەوام بێت لە ژیانی هاوسەری رلوەستاو مافی ئەوەی هەیە دلوای تەلاق بۆ قەزا بەرزبکاتەوە، ئەمریکییەکان دەستبردن بۆ ئەم پێوەرە بەوە پاساو دەدەن پێوەرێکە لەگەڵ خێر و بەختەوەری مرۆڤ پێکدێتەوە[1].

تەنانەت پێش ئەو بەرینکردنە هەموو گەلی ئەمریکی نەچووبووە ژێر هەڵنەوەشانەوەی هاوسەرگیری مەگەر بە ناپاکی هاوسەری، "ئیدوارد وسترمارك" دەڵێت: (کاتێك لە یاساوە دەگوێزینەوە بۆ پیادەکردن دەبینین رێژەی تەلاق لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هەر ولاتێکی تری ئەورووپی زیاترە، هەندێ جار ژمارەی رووداوەکانی تەلاق لە ئەمریکا لە ژمارەی رووداوەکانی تەلاق لە هەموو ولاتانی ئەورووپا بەیەکەوە زیاترە، رووداوەکانی تەلاق هەنگاو بە هەنگاو بۆ سەرەوە دەچێت)[2]، ویلکۆکوس-کە قسە لەسەر ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات- دەڵێت: (رووداوی تەلاق لە شارە گەورەکانی ئەمریکادا ٩٥٪ زۆرترە لە هەر رێژەیەکی تر لە ولاتانی دونیا)[3].

دوای ئەوەی بڕیاردرا دەست ببرێت بۆ بنەمای فراوانکردن و کارکردن بەو پێوەرە باسکراوە لە یاسای ١٩٧١ هەوڵ و کۆشان خرلیەگەڕ بۆ دەستبردن بۆ تەلاقی سنووردار بە کۆمەڵە هۆیەك یاسا دیاریدەکات، بەلام لە ئاسۆیەکی بەرینتردا، لیژنەی

---

[1] المرجع السابق ص٣٠٢ .

[2] ادوارد وسترمارك: قصة الزواج ص٣٢٣ـ٣٢٤.

[3] المرجع السابق ص٣٢٤.

لێکۆڵینەوەی یاسای تەڵاق لە ئەمریکا نۆ هۆی پێشنیار کرد بۆ بەدەستهێنانی بڕیاری تەڵاق لە قەزای ئەمریکییەوە، ئەوانەش:

١-ناپاکی هاوسەری.

٢-کۆچکردنی بەئەنقەست بەبێ پاساوێك بۆ ماوەیەك زیاتر بێت لە دوو ساڵ.

٣-هەستان بە تاوانێك لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە لەدوای تەواوبوونی هاوسەرگیرییەکەیان.

٤-تووشبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە نەخۆشی ئەقڵی بەجۆرێك هیوای چاکبوونەوەی لێ نەکرێت بینا لەسەر راپۆرتی پزیشکی دەرچوو لە لایەنە فەرمییەکانەوە، بە مەرجێك نەخۆشییەکە ماوەیەکی بەسەردا تێپەڕی بێت لە سێ ساڵ کەمتر نەبێت لە بەرواری بەرزکردنەوەی دلوای تەڵاقەوە.

٦-ئاکار و هەڵسوکەوتی خراپ و مامەڵەی نادروست لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە دژ بە ئەویتریان بە جۆرێك لەگەڵ رێز و پلە و پایەی مرۆڤدا یەکنەگرێتەوە.

٧-دەرکەوتنی سکپڕی ژنەکە لە کاتێکدا نەتوانرێت بدرێتە پاڵ مێردەکە، بەڵکو لە پیاوێکی تر بێت جگە لە مێردەکەی[1].

٨-جیابوونەوەی جەستەیی نێوان دوو هاوسەرەکە لەدوای بەرزکردنەوەی دلوا بۆ ماوەیەك لە سێ ساڵ کەمتر نەبێت[2].

٩-بوونی منداڵێکی نایاسایی یان زیاتر لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە:

أ-گەر مێردەکەی تر ئاگاهی بەو کارە نەبوو کاتی هاوسەرگیری.

ب-گەر منداڵە نایاساییەکە یان منداڵە نایاساییەکان لەگەڵ دوو هاوسەرەکەدا بوون لە یەك شوێنی نیشتەجێبوون.

---

(1) گەر ژنەکە بەر لە تێپەڕبوونی شەش مانگ بەسەر هاوسەرگیرییەکەیدا سکەکەی دلنا، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی منداڵەکە لەو هاوسەرەی نییە.

(2) گەر دابڕانی جەستەیی هاتە ئاراوە، ئەوەش حاڵەتێکە لە نێوان ناهاوسەری و ناتەڵاقدا، بۆ یەکێکیان دروستە دلوای تەڵاق بکات بۆ ئەوەی جێگەی دابڕانەکە بگرێتەوە گەر قەزا رازیبوو.

بەڵام ئەم پێشنیارانە لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانانی ئەمریکییەوە هەڵی قبوولکردنیان بۆ نەڕەخسا، بەشی ٥٩٨/١٧ لە راستکردنەوەی یاسای ١٩٧٢ هاتبوو بۆ ئەوەی پێداگری بکات لەوەی روخانی بینای هاوسەرگیری بریتییە لە تەنها هۆیەك بۆ دەرکردنی بڕیاری تەڵاق لەلایەن دادگاوە، و هیچ گرنگییەکی تری بە هۆیەکانی تر نەدابوو، بەتایبەت ئەو هۆیانەی راستبوونەوەی هەڵە و کەمتەرخەمی گریمانە دەکات، ئازادییەکی بەرین و دەسەڵاتی خەملاندنی بە دادگاکان دابوو بۆ ئەوەی لەبەر رۆشنایی واقیعی هاوسەری راوەستاو هەڵسوکەوت بکات لە کاتی بەرزکردنەوەی دلوای تەڵاقدا.

## ئاساری تەڵاق:

یاسای ئەمریکی چاکسازی بۆ ساڵی ١٩٧١ بەشی٥٩٨/٢١ بۆ ویلایەتی ئەیەوا(نموونەیی) بە دەق هێناویەتی: ئەو دادگایەی بڕیار بە تەڵاق و جیاکردنەوە دەردەکات پێویستە بڕیار لەسەر ئەمانە دەربکات:

أ-منداڵ.

ب-سیستمی دارایی دوو هاوسەرەکە.

ج-خەرجی بۆ ژنەکە و منداڵەکان کە هۆی پاساوداری تایبەت بەخۆی هەیە، بۆ دادگا هەیە ئەگەر رەوشەکە پێویستی کرد چاوخشاندنەوە بکات لە بڕیاری دەرکراو لەو بارەیەوە.

بەشی ٩٨/١٧ی هەمان یاسای راستکراوەی ساڵی ١٩٧١ پێداگری دەکات لەوەی لەسەر دادگا پێویستە (کاتێك باوەڕی تەواوی لا دروست دەبێت بەوەی هاوسەرگیرییەکە ناتوانرێت لە نێوان دوو لایەنەکەدا بەردەوام بێت لە دووتوێی ئەو بەڵگانەی پێشکەشکراون پێی لەلایەن دلواکاری دەرکەری بڕیارەو بە تەڵاق لەو پابەندبوونانەی لەرووی یاساوە بەسەریدا سەپاوە) بڕیار دەر کات بە خەرجی بۆکردنی کەسی تووشبوو بە نەخۆشی دەماغی، بۆیە لەسەر دادگایە-سەرباری دەرکردنی بڕیاری تەڵاق- بڕیارێك بە خەرجی بۆ کردنی ئەو تووشبووە دەربکات.

بەپێی چاکسازی یاسایی باسکراو ئەو پێوەرانەی لە دەرکردنی بڕیاردا دادگا شانی لەسەر دادەدات بە خەرجی بۆ کردن ئەمانەن:

١-پێویستییەکانی ژنەکە و رادەی پێویستی بۆ شاندادان لەسەر ماڵ و سامانی پیاوەکەی.

٢-توانای دارایی مێردەکە.

٣-ئاستی ئەو ژیانەی کە ژنەکە لەسەری راهاتووە لە کاتی راستبوونەوەی ژیانی هاوسەری نێوانیان پێش تەڵاقەکە.

٤-ماوەی بەردەوامبوونی پەیوەندی هاوسەری پێش تەڵاق.

٥-ژمارەی منداڵەکان لەو هاوسەرگیرییەدا.

٦-باری تەندروستی و جەستەیی دوو هاوسەرەکە و دیاریکردنی سەبەبکار بۆ شکستی هاوسەرییەکە.

٧-رادەی هاوبەشی ژنەکە پێش تەڵاق بۆ سەرخستنی کاری مێردەکەی و پێکهێنانی ماڵ و سامانەکەی.

٨-هەر رەگەزێکی تر بەشداری دەکات لە نزیک کردنەوەی دادپەروەری و یەکسانی نێوانیان.

ئەمە ئەوەیە لە یاسای نموونەیی ویلایەتەکانی ئەمریکا بۆ ساڵی ١٩٧١ بەشی(ی ٣٠٢) هاتووە.

بەپێی ئەو یاسایە خەرجی هاوسەری بۆ ژنی تەڵاقدراو بەدرێژایی تەمەن بەردەوام دەبێت، یان تا کاتی هاوسەری لەگەڵ پیاوێکی تر، یان تا کاتی مردنی پیاوەکە.

بەڵام لە ئێستادا دوای تێپەڕبوونی پێنج ساڵ بەسەر تەڵاقدا پیاوەکە بەرپرسیار نییە لە بەردەوامی پێدانی خەرجی بە ژنەکە، بۆیە لەسەر ژنی تەڵاقدراو پێویستە کاتێك توانای کارکردنی هەیە و خاوەنی لێوەشاوەییە بۆ کارێك بگەڕێت لەباری نەبوونی منداڵی بچووکدا لەخوار تەمەنی (١٨) ساڵەوە لە مێردەکەی، بە جۆرێك رێگری لێبکرێت لە کارێك گوزەرانێکی گونجا و شیاوی بۆ دابین بکات.

هەروەها بەپێی ئەو یاسا باسکراوە هەر گۆڕانێك لە رەوشی گوزەراندا زیادکردن یان کەمکردن تایبەت بە ژنە تەلاقدراوەکە و منداڵەکان داوا دەکات دادگا چاوخشاندنەوە بکات لە بڕیاری خەمڵاندنی خەرجییەکەدا بەپێی رەوشی هەر پرسێك و هەلومەرجی تایبەت[1].

دەتوانرێ ئەم کۆڵە دارایيە سەرهەڵدراوە لەسەر تەلاق بە کۆتوبەندێك دابنرێت کە لە بەرتەسککردنەوەی مەودای روودلوی تەلاق لە ئەمریکا بەشداری دەکات.

(1) بڕوانە: american family law in transition by walter o. weyrauch and sanford n. katz (1982) p. 302, 307, 339

# بەشی دووەم:
# تەڵاق لە یاسای هەندێ
# لە دەوڵەتانی ئەوروپی

لەم بەشەدا دەست دەبەین بۆ باسی حوکمەکانی تەڵاق لەرووی رادەی تەڵاق و کۆتوبەندکردنی ئازادی ویستی دوو هاوسەرەکە تیایدا، گرنگترین ئەو یاسایانە لە چوار باسدا دەخەینە روو:

یەکەم تایبەت دەکەین بە یاسای ئینگلیزی.

دووەم: ئەڵمانی.

سێیەم: ئیتالی.

چوارەم: فەرەنسی.

# باسی یەکەم:
# تەڵاق لە یاسای ئینگلیزیدا

سیستمی تەڵاق لە بەریتانیا لەسەر یەك شێواز بەردەوام نەبووە، هەروەك هەموو یاسا دانراوەکانی تر لەو دەوڵەتانەی کاریگەرن بە پەیامی مەسیحییەوە و بەشێوەیەکی بەتایبەت چوونەتە ژێر مەزهەبی کاسۆلیکی کە دانینەناوە و نانێت بە تەڵاقدا هۆیەکەی هەرچییەك بێت.

ململانێ لە مێژساڵە بەردەوامە لە نێوان یاسای دانراو و کەنیسە لەمەڕ پرسەکانی حوکمی هاوسەرگیری بەتایبەت لە بابەتی تەڵاقدا وەك لەم گەشە و گۆڕانە یاساییەوە لامان ڕۆشن دەبێتەوە:

**یاسای ۱۸۵۷:**

پێش ئەم یاسایە داواکانی هاوسەرگیری ملکەچی ڕێساکانی یاسای کەنیسە بوو، وردبوونەوە تیایدا لە پسپۆڕی دادگای کەنیسەی کاسۆلیکی بوو کە تەنها ڕێگەی بە جیابوونەوەی جەستەیی دەدا(باری ناهاوسەری و ناتەڵاق)، بەڵام لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا نەرێتێك سەریهەڵدا بەپێی ئەو عورفە بەدەستهێنانی تەڵاق بە بڕیاری پەرلەمان دروست بوو، بەڵام پەنابردن بۆ ئەم ڕێگەیە زۆر نەبوو بەهۆی زۆری تێچوونییەوە لەلایەکەوە و لەلایەکی ترەوە پەرلەمانیش حوکمی بە تەڵاق دەرنەدەکرد گەر کەنیسە پێشتر بڕیاری جیابوونەوەی نێوان دوو هاوسەرەکەی دەرنەکردبایە[1].

---

[1] أنظر: ارمانجون ونولده وولف: القانون المقارن فقرة ٧٣١. نقلا عن استاذنا الدكتور جميل الشرقاوي: أنحلال الزواج في حياة الزوجين واسبابه في التشريعات الأوربية ص٥٦.

کاتێك یاسای ١٨٥٧ز–تایبەت بە دلواکانی هاوسەری– دەرکرا پسپۆری لە دادگاکانی کەنیسە وەرگیرلیەوە لە پرسی هاوسەرگیریدا و رادەستی دادگا مەدەنییەکان کرا.

تەلاق بەتەنها یەك هۆ موباح کرا ئەویش بریتی بوو لە زینا، یاسادانەری ئینگلیزی لە بریاردانی ئەم هۆیەدا خۆی لە دەرەوەی پەیامی مەسیحییەوە تەماشا نەدەکرد بەو پێیەی تەلاق ئینجیل موباحی کردووە بە هۆی زیناکردن، وەك چۆن لە لێکدانەوەی مەزهەبی پرۆتستانتیدا راگەیەنراوە، بەلاّم ئەم یاسایە دوو هاوسەرەکەی لەیەکتر جیاکردۆتەوە لە رادەی دەستگرتنیان بەم هۆیەوە بۆ مەرامی داوای تەلاق، رێگە بە پیاو دراوە دلوای تەلاق بکات بەرەهایی بەهۆی زینای ژنەکەیەوە، لە کاتێکدا بۆ ژنەکە ئەم مافە بەرەهایی بوونی نەبوو، رێگە بە ژنەکە نەدەدرا بەهۆی زینای مێردەکەیەوە داوای تەلاق بکات، بەلکو پێویست بوو هۆیەکی تر بخرێتە سەر ئەو هۆیە وەك مامەڵەی خۆاپی لەگەڵ ژنەکەی یان زیناکەی لەگەڵ کەسی مەحرەمدا بێت یان چوونە لای ژنی دووەم لەگەڵی گرێبەست بێت هاورێ لەگەڵ راستبوونەوەی هاوسەرگیری یەکەم(واتە فرە ژنی)، یان پیاوەکە توورە بێت، یان کۆچی لێ بکات بۆ ماوەیەك لە دوو ساڵ کەمتر نەبێت، بەلاّم ئەم جیاکارییە لە نێوان دوو هاوسەرەکەدا بە راستکردنەوەی ساڵی ١٩٢٣ز هەموارکرایەوە، بۆیە بۆ هەردوو هاوسەرەکە مافی داوای جیابوونەوە هەبوو بە سەلماندنی زینای هاوسەرەکەی تر، لەگەڵ ئەوەش جیاکارییەکی تر هاتە ئارلوە بەرزکردنەوەی دلوا بە تەلاق لە مێردەکەوە داوای دەکرد هاوبەشی زیناکە وەك دلوالەسەرکراو بێتە ناوەوە گەر دادگا لەو کارە نەیبەخشیبایە، بە پێچەوانەی داوای ژنەکەوە داوای لێ نەدەکرا هاوبەشەکەی(زیناکەری هاوبەش لەگەڵ پیاوەکەی) بێنەتە ناوەوە گەر قەزا داوای لێ نەکردبایە[1].

---

[1] الشرقاوي المرجع السابق ص٥٨.

شایانی باسە دلوای هەریەك لە دوو هاوسەرەكە رەد دەكرایەوە گەر زیناكە بە هاندانی ئەویتریان بوایە، یان چاوپۆشی ئەویتریان، یان بۆ قەزا بسەلمێت دلوای تەڵاق بەهۆی زیناوە تەنها لە ئەنجامی رێكەوتنی ژێربەژێری نێوان دوو هاوسەرەكەوەیە.

**یاسای ١٩٣٧:**

"هربرت" یەكێك لە ئەندامانی دەستەی گشتی بەریتانی هەوڵێكی زۆریدا بۆ راستكردنەوەی یاسای تەڵاق لە ئینگلتەرا، پرۆژەیاسای ساڵی ١٩٣٧ی پێشكەش كرد، ئامادەكارییەكەی سێ ساڵی سەرومڕی لە تێكۆشان خایاند تا لە رۆژنامەكان و گفتوگۆكانی دەستەكاندا بە یاسای(Herbert Bill) ناسرا، بەڵام ئەم پرۆەیە بەرهەڵستكارییەكی توندی بۆ پەیدا بوو بەهۆی بەدەمەوەنەچوونی كەنیسەی ئینگلیزی و قیسیسەكانی كەنیسەی كاسۆلیكی بۆ یاسایەكە.

بۆ ئەو مەبەستە پشتیوانی حوكمەتی بەدەست نەهێنا و دەستەی گشتی لەسەری هاوڕانەبوون، تا دوای گفتوگۆیەكی توند و چەندین جار دواخستن، دواجار رازیبوون لەسەری نیشاندرا بۆیە لە ساڵی ١٩٣٧ز یاساكە دەركرا.

ئەم یاسایە بە گرنگترین چاكسازی یاسایی دادەنرێت لە بەریتانیا لە ساڵی (١٨٥٧ن)ەوە، ئەم گرنگییە بۆ داهێنانی كۆمەڵێك هۆی تر بۆ تەڵاق دەگەڕێتەوە كە پێشتر زانراو نەبوون.

ئەم هۆیانە ئاماژە بە گۆڕانی دیدگای یاسادانەری ئینگلیزی دەكات لەڕووی دەرچوون لە پەیامی كەنیسە و لەو رووەوە كە تەڵاق چارەسەرە نەك سزا.

یاسای نوێیەكە كۆمەڵێك هۆی تری خستە پاڵ هۆی زینا كە لە یاساكەی پێشوودا جێگیر كرابوو، ئەوانەش[1]:

---

[1] بەوەوە رانەوەستا حوكمەكانی تەڵاق و دابڕانی جەستەیی راستبكاتەوە بەڵكو حوكمەكانی پووچ بوونەوەی هاوسەری راستكردەوە و چوار هۆی داهێنا كە هاوسەرگیری پووچ دەكاتەوە بە پووچبوونەوەیەكی رێژەیی، ئەوانە:

١ـ مێردەكە بە ویستی خۆی نەیەوێت بچێتە لای ژنەكە.

←

١-**کۆچلێکردن:** گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بەبێ بوونی هۆیەك کۆچی کرد لە هاوسەرەکەی تر ئەوا بۆ هاوسەرەکەی تر بۆی هەیە دلوای تەلاق بکات لەبەردەم قەزادا گەر ئەم مەرجانە فەراهەم بوون:

أ-کۆچەکە بەردەوام بێت بۆ ماوەیەك کەمتر نەبێت لە سێ ساڵ تا کاتی بەرزکردنەوەی دلوایەکە.

ب-کۆچلێکردنەکە بە رازیبوونی لایەنەکەی تر نەبێت.

ج-هۆیەکی یاسایی بوونی نەبێت کۆچلێکردنەکە پاساو بدات وەك نەخۆشی، یان سەفەرکردن بۆ تەواوکردنی خوێندن.

د-مافی داوای تەلاق تایبەتە بە زیانپێکەوتوو(کۆچلێکراوەکە) ئەو مافە بۆ ئەویتریان نییە.

٢-**دلڕەقی:** گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە رەقی و توندوتیژی مامەڵەی لەگەڵ ئەویتر کرد بە جۆرێك نەتوانرێت لەگەڵی شان بدرێتە ژێر ژیانی هاوسەری ئەوا بۆ ئەویتریان دلوای تەلاقدان هەیە.

**٣-نەخۆشی ئەقڵی گەر سێ ساڵی خایاند.**

**٤-بۆ ژنەکە مافی دلوای تەلاق هەیە گەر مێردەکەی تاوانێکی ئەنجام دا پێچەوانە بێت بە ئاداب و سیستمی گشتی،** وەك تاوانی پڕدان و نێربازی و چوونە لای ئاژەلان[1]... تێبینی دەکرێت ئەم یاسایە گەر لە هۆیەکانی تەلاقدا بەرینخواز بێت ئەوا لەلایەکی ترەوە پێداگری کردووە لە سنووردارکردنی ئازادی ویست تایبەت بە رێکارەکانی بەرزکردنەوەی داوای تەلاق یان جیابوونەوەی جەستەیی،

---

٢- تووشبوونی پیاوەکە بە نەخۆشی زەهەری گوزارلوە.

٣- دەرکەوتنی سکپڕی ژنەکە لە پیاوێکی تر جگە لە هاوسەرەکەی.

٤- لە کاتی هاوسەرگیریدا یەکێکیان ئەقڵی ناتەواو بێت یان پەیبردنی لاواز بێت.

مادەی(٧) هەمان یاسای باسکراو

[1] الشرقاوي: المرجع السابق ص٦١. مستر فردريك كودي: القانون الدولي والملي الخاص ص٢٢٥. المراغي: الزواج والطلاق في جميع الاديان ص٣٨٦. ادوارد وسترمارك: قصة الزواج ص٣١٧ ومابعدها

کاتێك بڕیاریداوە گوێ بۆ دلوای تەڵاق و جیابوونەوەی جەستەیی نەگیرێت هەتا سێ ساڵ بەسەر هاوسەرگیرییەکەیاندا گوزەر نەکات، بەڵام لەم ڕێسایە هەندێ حاڵەت هەڵواردە کراون، لەوانە:

أ- باری بەدەستهێنانی مۆڵەتی قازی دادگای باڵا بە بەرزکردنەوەی دلوا بەر لەو ماوەیە.

ب- باری دلواکەری تەڵاق لە گوزەرانێکی نائاساییدا بێت بە جۆرێك نەتوانرێت شانبدرێتە ژێر بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەری.

ج- باری تێکچوونی ئاکار و ڕەفتاری هاوسەرەکەی تر.

د- باری بەرژەوەندی منداڵەکان پەلەکردن لە تەڵاق پێویست بکات[1].

**یاسای ١٩٥٠:**

یاسای ڕێکخستنی دلواکانی هاوسەرگیری لە ١٩٥٠/١٢/٤ دەرکرا، بەڵام گۆڕانێکی ریشەیی بەسەر ڕێکخستنی حوکمەکانی تەڵاقدا نەهێنابوو کە لە یاسای ١٩٣٧دا هاتبوون، مادەی یەکەمی هەمان هۆیەکانی پێشووی دیاریکردبوو، بۆ هەر هاوسەرێك هەبوو دلوای تەڵاق بکات بەهۆی زینا یان کۆچلێکردن یان دڵڕەقی یان شێتی، بۆ ژنەکەش ئەو مافە هەبوو لە بارێکدا مێردەکەی هەندێ تاوان ئەنجام بدات وەك لەم درێژەپێدانەدا:

١- زینا: زینای یەکێکیان مافی دلوای تەڵاقی ئەویتریان پاساو دەدات، مەبەست بە زینا لادانی ویستە بەلای پەیوەندییەکی سێکسیدا با تێکەڵی جەستەییش بەرهەم نەهاتبێت(م١/أ)

٢- کۆچلێکردن: کۆچی یەکێکیان دلوای تەڵاق بۆ ئەویتریان موباح دەکات دوای تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەسەریدا یەکسانە کۆچەکە مانیانە بێت(وازهێنان لە

[1] أنظر classeur juris : القانون المقارن برطانيا وقم (٥٠) مجموعة bras le ص٢٣ نقلا عن الشرقاوي المرجع السابق ص٥٧.

نیشتەجێبوون لەگەڵی) یان کۆچی مەعنەوی بێت(وازهێنان لە تێکەڵاوی با لەژێر یەك سەقفیشدا ژیان بەڕێ بکەن)(م١/ب)

٣–دڵڕەقی: گەر یەکێکیان خراپ مامەڵەی ئەویتری کرد ئەوا دلوای تەڵاقی بۆ هەیە، یەکسانە ئازاردانەکە مادی بێت یان مەعنەوی) (م١/ج)

٤–بۆ ژنەکە هەیە دلوای تەڵاق بکات لە بارێکدا مێردەکەی هەندێ تاوان ئەنجام بدات وەك تاوانی پڕدان و نێربازی و چوونە لای ئاژەڵان.

هەموو ئەم هۆیانە یاسای ساڵی ١٩٣٧ دانیپیادا نابوون، بۆیە یاسای ١٩٥٠ تەنها هەندێ دریژەپێدان بوو، لەوانە:

**بۆ دادگا هەیە دلوای تەڵاق رەد بکاتەوە لەم بارانەدا:**

أ– گەر داوای تەڵاق لە هەمان هەلومەرجدا بێت، بۆ نموونە: بۆ یەکێکیان دروست نییە دلوای تەڵاق بکات پاڵپشت بە زینای ئەویتریان گەر ئەویش هەمان کاری ئەنجام دابێت.

ب– گەر دلواکەری تەڵاق پشتگوێخەر و کەمتەرخەم بێت بەرانبەر هاوسەرەکەی تر(دلوا لەسەرکراو) یان کەسێکی ئاکار خراپ بوو.

ج– گەر لە بەرزکردنەوەی داوایەکە دواکەوت لەدوای ئاگاهی بە هۆیەکە و بەبێ بیانوویەك بۆ دواکەوتنەکە دەتوانرێت بە چاوپۆشی دابنرێت لەوەی ئەویتر ئەنجامی دەدات[1].

بەپێی یاسای ١٩٥٠ گەر هۆی تەڵاق فەراهەم بوو و رێگر لەبەردەم قبوولی داواکەدا بوونی نەبوو دادگا بڕیارێك دەردەکات کە ناوەرۆکەکەی: هاوسەرگیری بە تەڵاق هەڵدەوەشێتەوە گەر لە ماوەی شەش مانگدا(گەر ماوەی کورتتر دیاری نەکرابێت) لە بەرواری بڕیارەکەوە شتێك سەرهەڵنەدات ببێتە هۆی بەردەوام نەبوونی تا کۆتایی،

---

[1] استاننا الشرقاوي المرجع السابق ص٦٨ وهو بدوره نقله عن مجموعة bras le ص٣٦. دادگا پاساوی دواکەوتنی مێردەکە لە دلوای تەڵاق دلوا دەکات گەر ئاگاهی بە هۆیەکە زیاتر لە دوو ساڵ بوو.

نوێنەرایەتی گشتی لەو ماوەیەدا مافی بەرهەڵستکاری هەیە و دەتوانێت داوا لە دادگا بکات لە بڕیارەکەی پەشیمان ببێتەوە گەر سەلمێنرا شتێك هەیە ڕێگرە لە بەردەمیدا، وەك ڕێکەوتنی ژێربەژێری دوو هاوسەرەکە یان هەر ڕووداوێکی تر کاریکاتە سەر بڕیارەکە و لە دادگا شاراوە بووبێت[1]، بۆ هەر هاوڵاتییەك هەیە نوێنەرایەتی ئاگاداربکاتەوە بە هەر شتێك بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ بڕیارەکە، هەروەها بۆی هەیە بەرەو بەرهەڵستکارییەکە هەنگاو هەڵبگرێت هەرکات باوەڕی بەوە هێنا شتێك ڕاست بووەتەوە گەڕانەوە لە بڕیارەکە پاساو دەدات.

گەر ماوەکە بەبێ بەرهەڵستی کۆتایی پێهات ئەو کەسەی داوای تەڵاقی کردووە بۆی هەیە لە دادگا داوا بکات لە ماوەیەکی ماقووڵدا بڕیارە سەرەتاییەکە بگۆڕێت بۆ تەڵاقی کۆتایی و وێنەیەك لە بڕیاری تەڵاقەکەی رادەست بکرێت، ئەگەر نە، بۆ لاکەی تر هەیە –لە ماوەی سێ مانگدا لە بەرواری کۆتاهاتنی ماوەکە– داوا بکات لە دادگا داوایەکە ڕەد بکاتەوە و لە بڕیارەکە پەشیمان ببێتەوە لەسەر ئەو بنچینەی کە داواکەر شوێنی ڕێکارە بنەڕەتییەکان نەکەوتووە[2].

## دابڕانی جەستەیی:

یاسای ١٩٥٠ وەك چۆن بەو هۆ باسکراوانە دانی بە تەڵاقدا ناوە دانیشی بە دابڕانی جەستەییدا ناوە بە هەمان ئەو هۆیانە، گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە داوایەکی پێشکەش کرد و خۆی پاڵپشت کردبوو بە یەکێك لە هۆیەکانی تەڵاق و بڕیاری پێ دەرکرا ئەوا وەستانی تێکەڵی هاوسەری لە نێوان دوو هاوسەرەکە لەگەڵ مانەوەی پەیوەندی هاوسەری لەسەر پەیدا دەبێت، کەوابوو بۆمان هەیە بڵێین ئەوە حاڵەتێکە لە نێوان ناهاوسەری(چونکە تێکەڵی و پابەندبوون و میرات بوونی نییە) و ناتەڵاقدا،

---

(1) ينظر المادة (١٢) من قانون ١٩٥٠.

(2) مجموعة bras le ص٣٥ نقلا عن الشرقاوي ص٦٩ .

چونکە هەریەك لەو دوانە ناتوانن لە هاوسەرگیرییەکی تر بچنە پێش تا کەسی بەرانبەر لە ژیاندا بێت.

پێشتر سەرئەنجامە نەرێنییەکانی دابڕانی جەستەییمان ڕۆشن کردەوە بەتایبەت بۆ کەسانێك نەچوونەتە ناو قۆناغی پیرییەوە.

**یاسای کارپێکراو لە ئێستادا:**

کۆمەڵێك یاسا هەیە هێشتا لە بەریتانیا کاریان پێ دەکرێت ئەوانەش:

-یاسای تەلاقی راستکراوە بە یاسای تەلاقی ١٩٦٩.

-یاسای تەلاقی یەکگرتوو(یاسای باری هاوسەری)١٩٧٣م.

-راستکردنەوەکانی یاسای دادبینی هاوسەرییەکان ١٩٨٤م.

ئەوەی پەیوەستە بە رێکخستنی تەلاقەوە لەم یاسایانەدا دەبینین هەندێك لە حوکمەکانی لە یاسا پێشووەکاندا بڕیاری لەسەر دراوە، هەشیانە داهێنراون وەك لەم درێژەپێدانەدا:

أ-بەرزکردنەوەی داوای تەلاق بۆ دادگای تایبەتکراو لەلایەن هیچ کام لە دوو هاوسەرەکەوە دروست نییە گەر ساڵێك بەسەر بەرواری هاوسەرگیردا گوزەر نەکات.

ب-رێگری نییە لە بەرزکردنەوەی دلوای تەلاق لەدوای بەروارە باسکراوەکەوە بە مەرجێك شانی دادابێت لەسەر بوونی هۆیەك پێش هاوسەرگیرییەکە[1].

ج-بۆ هەر یەك لە دوو هاوسەرەکە هەیە دلوای تەلاق لە دادگا بکات گەر هۆیەك هەبوو بۆ پاساودانی بە جۆرێك بەردەوامی ژیانی هاوسەری لەگەڵی ئەستەم بێت، بۆ دادگا هەیە بڕیاری لێ بدات گەر باوەڕی بەوە هێنا هیچ رێگەیەك بۆ

---

[1] واتە دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر هاوسەریدا رێگەدراوە بە یەکێك لە دوو هاوسەرەکە دلوایەك بۆ تەلاق پێشکەش بکات بە هۆیەك پاساوی بدات، و ئەو هۆیە لە درێژایی ئەو ساڵە باسکراوەدا روویدابێت.

چاککردنەوەی ئەو ناتەواوییەی رووبەرووی هاوسەرییەکەیان بووەتـەوە بـوونی نییە[1].

د–لە هەموو بارەکاندا بۆ دادگا دروست نییە بڕیاری تەڵاق بدات گـەر دلواکـەر رازی نەکات بە راستبوونەوەی هۆیەك یان زیاتر لە هۆیـەکی هـاتوو[2] بـەپێی برگـەی یەکەم لە مادەی دوو لە یاسای باری هاوسەری:

١–**زینا**: گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە تاوانی زینای ئەنجامدا هاوسـەرەکەی تـر مافی خۆیەتی دلوای تەڵاق بکات گەر ئەم مەرجانە فەراهەم بوون:

أ–سەلماندنی روودلوی زینای "دلوالەسەرکرلو" لە بەردەم قازیدا.

ب–دلواکەر پێیوابێت لە دوای ئەو روودلوە ژیان لەگـەڵ دلوالەسـەرکرلو کارێکـە ناتوانێت شانبداتە ژێری.

پێوەری توانینی بەردەوامی ژیانی هاوسەری و نەتوانینی کـارێکی بابەتیانـە نییە، چونکە پەیوەندییەکی پێویست لە نێوان روودلوی زینا لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە لەگەڵ نەتوانینی بەردەوامی ژیانی هاوسەری بوونی نییە، لەم مەنتقەوە زینا لە دیدگای یاسای ئینگلیزی کارپێکراوەوە لە ئێستادا تەنها لە خودی خۆیدا بەس نییـە بـۆ دلوای تـەڵاق، بـەڵکو پێویسـتە هـەژانی ژیـانی هاوسەری لە باوەڕی هاوسەری دلواکەرەوە لەسەر پەیدا ببێت.

ج–کەسی دلواکەر دوانەکەوێت لە بەرزکردنەوەی دلواکەی لـەدوای ئاگـاهی بـەو هۆیە بە دواکەوتنێك بەڵگە بێت لەسەر رازیبوون و چاوپۆشـی، بینـا لەسـەر ئەوە گەر دوو هاوسەرەکە بە یەکەوە دەژیان لە ژیانێکی هاوبەشدا بۆ ماوەی

---

[1] ینظر المادة (١/١) من قانون الاحوال الزوجية.

[2] هەرکات هۆیەك یان زیاتر لە هۆیەك لەم هۆیانە سەلمێنرا و لای دادگا باوەڕی هێنا بە بوونی ناتەولوی راستبووەوە لە ژیانی هاوسەریدا لەسەر قازی پێویستە پەلە نەکات لە دەرکردنی بڕیاری تەڵاق، بەڵکو هەوڵبدات دادبینییەکە دوابخات وەك هەوڵێك بۆ پێکهێنانەوەی دوو هاوسەرەکە تا ترووسکاییەك لە هیوای چاکسازی بوونی هەبێت. أنظر المادة (٢/١) من قانون الاحوال الزوجية.

شـــەش مـــانگ لـــە دوای ئاگـــاهی داواکەرەکـــە بـــە تـــاوانی زینـــای "داوالەسەرکراوەکە" ئەوا لە یاسای ئینگلیزی ئێستادا ناتوانێت داوای تەلاق بکات پاڵپشت بە ئەو هۆیە[1].

٢-خراپی ئاکار: گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە لەگەڵ ئەویتر خراپ مامەڵەی کرد بە جۆرێك نەتوانێت شانبداتە ژێری، یان هەستا بە کارێکی نەشیاو پێچەوانە بە سیستم و ئـادابی گشـتی و داواکـەر تـوانی بـۆ دادگـای بسـەلمێنێت لـەرووی ئەقڵەوە ناتوانێت پێشبینی ژیان بکات لەگەڵ داوالەسـەرکراو، ئـەوا بـۆ دادگـا دروستە بڕیار لە تەلاقەکە بدات گەر بـاوەڕی بـەوە هێنـا، پێـوەری گونجـاوی ژیان و حاڵەتی راستبوونەوەی ئەو ئاکارە و نەگونجانی لێرەدا بابەتیانەیە نەك تاکەکسیانە[2].

٣-گەر یەێك لە دوو هاوسەرەکە کۆچی لەویتریان کرد ئـەوا کۆچـلێکراوەکە مـاف ئەوەی هەیە داوای تەلاق بکات گەر ئەم مەرجانە فەراهەم بوون:

أ-کۆچلێکردنەکە دوو ساڵ لەسـەریەك بـەردەوام بێـت بـەر لـە بەرزکردنـەوەی داوای تـەلاق.

ب-کۆچکردنەکە مادی و مەعنەوی بێت تەنها دابڕانی مادی و نیشـتەجێنەبوون لەگەڵ یەکتر لەژێر یەك سەقفدا بەس نییە، گەر کۆچی مەعنەوی(وازهێنان لە ئەرکەکانی هاوسەری) لەگەڵ نەبێت[3].

---

[1] ینظر المادة (١/٢) من قانون الاحوال الزوجية.

[2] واتە پەند بەوە نییە هاوسەری داواکەر خۆی وابببینێت دەتوانێت ژیان لەگەڵ خاوەن ئاکارە نەشیاوەکە بەسەرببات یان ناتوانێت، بەڵکو پەند بە رای گشتی و گەڕانەوەیە بۆ ژێری تەندروستی دادوەر بۆ بڕیاردان لەسەر توانای بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەریی یان بەردەوام نەبوونی سەرەڕای بوونی ئەو ئاکارە نەشیاوە.

[3] خۆگرتنەوە لە جێبەجێ کردنی ئەرکی هاوسەری ئاماژەیە بۆ کۆتاپێهێنانی پەیوەندی هاوسەریی، لێرەوە دابڕان دەستپێدەکات گەر بە وازهێنان لە نیشتەجێبوون هاوەل بوو.

تێبینی دەکرێت کۆچکردن گەر لە هەردووکیانەوە بوو بەوەی هەریەکەیان واز لە ئەویتریان بهێنێت ئەوا پێویستە دابڕانەکە بەردەوام بێت بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەر لە بەرزکردنەوەی دلوا.

وا دەردەکەوێت بۆ هەریەکەیان لەو بارەدا دلوای تەڵاق بوونی هەیە.

**پاساوەکانی رەدکردنەوەی داوای تەڵاق لە دادگاوە**

ئەو دادگای دلوای تەڵاقی لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە بۆ بەرز دەکرێتەوە بۆی هەیە دلواکە لەم بارانەدا رەد بکاتەوە:

أ-گەر باوەڕی بەوە هێنا هاوسەرییەکەیان بە جۆرێك درزی نەبردووە توانای چاککردنەوەی نەبێت سەرەڕای راستبوونەوەی هۆیەکە(م١/١)

ب-گەر پاڵپشتی دلوایەکە روودلوی زینا بوو(م٢/١) و دلوا لەسەرکراو زانیاری ناڕاستی پێشکەش کردبوو تا کار بکاتە بڕیاری دادگا بە دەرکردنی بڕیاری تەڵاق.

ج-گەر دلوا لەسەرکراو بەرهەڵستی دەرکردنی حوکمی تەڵاقەکەی کرد پاڵپشت بۆ دوو مادەی: (١٠، ٥) لە یاسای باری هاوسەری[1].

لە هەڵسەنگاندن و بەراورد لە نێوان یاسای کارپێکراوی ئێستا و یاسای ١٩٥٠، و ١٩٣٧ ئەم تێبینیانە دەکرێت:

١-یاسای ئێستا شێوەیەکی تری لە شێوەی کۆچلێکردن داهێناوە ئەوەش ئەوەیە لە هەردووکیانەوە بێت بۆ ماوەیەك لە پێنج ساڵ کەمتر نەبێت.

---

[1] لسنة ١٩٧٣. المادة (٥): رفض القرار في حالات المادة (١/٢) (گەر روودلوی زینا) بەهۆی تەنگەلانییەکی زۆرەوە کە دلوالەسەرکرلو پێیەوە دەتلایەوە. المادة (٢/١٠): هەرکات دادگا بڕیارەکەی خۆی بە جیاکردنەوەی دواخرلو دەرکرد پاڵپشت بە هەر روودلوێك لە هۆیەکانی تەڵاق "دلوالەسەرکرلو" مافی خۆیەتی دلوا لە دادگا بکات سەرنجی لایەنی دارایی دوای تەڵاقی ئەو بدات.

٢-یاسای نوێدا مەرجێکی نوێی داهێناوە بۆ بەرزکردنەوەی دلوا ئـەوەش ئەوەیـە وەرناگیرێت گەر ساڵێك بەسەر هاوسەرییاندا گوزەر نەکات.

٣-یاسای نوێ دڵڕەقی و هەستان بەتاوانی لەژێر هۆ(ئاکار)دا داناوە، ئەم کارەش وردتر و کورتترە.

٤-کۆچلێکردنی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە وەك هۆیەك لە هۆکانی تـەلاق یاسـای ئێستا کەمترین رادەی بە دوو ساڵی بەردەوام بەر لە بەرزکردنەوەی داوایەکـە دیـاریکردووە، لـە کاتێکدا یاسـاکەی پێشـوو کـەمترین رادەی بـە سـێ سـاڵ دانابوو.

٥-یاسای ئێستا هیچ جۆرە نەخۆشییەك لە نەخۆشییەکانی دەروونـی و ئـەقڵی و تەندروسـتییەکانی بـە هۆیـەکانی تـەلاق دانـەناوە، ئەمـەش مانـای ئەوەیـە یاسادانەری ئینگلیزی گەڕاوەتـەوە بـۆ ئـەو بیرۆکـەی کـە تـەلاق سـزایە نـەك چارەسەر[1].

٦-یاسای ئێستا هەریەك لە کۆچلێکردنی مـادی و کۆچـلێکردنی مەعنـەوی (هـەر یەکەیان بەتەنها) بە هۆی پێویست دانەناوە بۆ داوای تەلاق پێچەوانەی ئەوەی یاسای ١٩٥٠ دانیپیادا نابوو(م١/ب)

ئـەم خسـتنەڕووە پوختەیەکـە لـە گەشـە و گـۆڕانی یاسـای ئینگلیـزی لـەوەی پەیوەسـتە بـە ڕێکخسـتنی خێـزان و چاکسـازی تەلاقـەوە، سـەرەڕای ئـەو هەوڵـە

[1] لە کاتێکدا یاسادانەری ئینگلیزی لە یاسای ١٩٣٧دا لە کۆمەڵێك یاساڕێژییەوە کە تەلاق دەکات بە سزا و دژ بە هاوسەرە هەڵەکارەکە بڕیاری پێ دەدرێت گواستوویەتەوە بۆ کۆمەڵێك یاساڕێژی تر کە لەسەر بنچینەی چارەسەر تەلاق ڕێکدەخات. أنظر martne de pitre اصلاح قواعد أنحلال الزواج في أنجلترا النشرة الفصلية الجمعية ـ التشريع المقارن ص١٩٣٩ ص١١٢ وما بعدها. الشرقاوي المرجع السابق ص٥٧.

یاساڕێژییانە وا دەردەکەوێت یاسادانەری ئینگلیزی تاکو ئێستا نەیتوانیوە سنوورێك دابنێت بۆ ئاشووبی خێزانی وەك لە هەندێ ئاماردا دەردەکەوێت(١).

(١) ڕۆژنامەی (الجمهورية)ی عێراقی لە ژمارەی دەرچو لە ١٩٨٥/١/١٢ بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە لەژێر ناونیشانی: (روخانی ژیانی خێزانی بەریتانی) ـدابەزینی باری هاوسەرگیری ـ: تیایدا هاتوە:
لەندەن: ڕاپرسییەك کە ئەنجامەکەی نوێنێ لەم ڕۆژنامەیە بڵاوکرایەوە دەریدەخات: ژیانی خێزانی بەریتانی بەرەو دلڕمان دەڕوات، ئەوەش بەهۆی دابەزینی حاڵەتی هاوسەرگیری و زیادکردنی ڕێژەی تەلاق و کەمبوونەوەی ڕێژەی منداڵبوون، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ دوایین گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان کە نووسینگەی ئاماری ناوەندی بڵاویکردۆتەوە دەریدەخات ڕێژەی ئەندامانی خێزان لە بەریتانیا دابەزیوە لە ٣/١ وە لە ساڵی ١٩٦١ بۆ ٢/٦ لە ساڵی ١٩٨٢. هەر بەو جۆرە ڕێژەی خێزانی پێکهاتوو لە شەش ئەندام و زیاتر بۆ نیوە دابەزیوە لەو ماوەیەدا لە ٧٪ هوە بۆ ٣٪، لە بەریتانیا(١٦٢٠٠٠) حاڵەتی تەلاق لە ساڵی ١٩٨٣دا ڕوویداوە، هەر بەو جۆرە لەدایکبوونی منداڵی ناشەرعی بەرز بووەتەوە، لە ١٦٪ لەدایکبووی ساڵی ١٩٨٣ منداڵی ناشەرعی بوون، بەراورد بە لەدایکبووی ناشەرعی بە ڕێژەی ٦٪ لە ساڵی ١٩٦١دا، ئامارەکە ئەوە دەردەخات حاڵەتی هاوسەری منداڵ و ژمارەی ژنی سکپڕ لەم ساڵانەی دوایی بە ڕێژەیەکی زۆر بڵاوبووەتەوە.
ژمارەی لەباربردنی منداڵ لە ساڵی ١٩٨٣ بە ڕێژەی ٣٤٪ بەرزبووەتەوە بەراورد بە ساڵی ١٩٧١، لە ٥٨٪ ئەو حاڵەتانە لە لە نێوان ئافرەتی هاوسەردارد‌ا بووە.
ئەمە ئەوە بوو کە ڕۆژنامەی(الجمهورية) لە ڕاگەیاندنی بەریتانی خۆیانە گواستویەتیەوە.

## باسی دووەم:
# تەلاق لە یاسای ئەڵمانیدا
# لە (١٩٠٠ زایینییەوە)

یاسای ئەڵمانی لە رێکخستنی تەلاقدا لەسەر یەك شێواز دانەمەزراوە، بەڵکو- لەرووی سنووردارکردنی ئازادی ویستی دوو هاوسەرەکە لە تەلاقدا- بە چەندین جۆری گەشە و گۆڕاندا گوزەری کردووە، بۆیە چەندین یاسای دەرکردووە، یاسای دواتر ئەوەی پێش خۆی دەسڕێتەوە و جێگەی دەگرێتەوە وەك لەم درێژەپێدانەدا:

یاسای ١٩٠٠ BGB[1]:

ئەم یاسایە کە پێی دەوترێت(کۆمەڵەی مەدەنی ئەڵمانی) لە ساڵی ١٩٠٠ دەرکراوە و حوکمی رێساکانی لە مادەکانی(١٥٦٤-١٥٧٦) بەسەر تەلاقدا گوزەر دەکات و رێکی دەخات بەم جۆرە:

تەلاق کۆتایی بە پەیوەندی هاوسەری ناهێنێت گەر قازی بڕیاری لەبارەوە دەرنەکات وەك گونجانێك بۆ بە بەڵگەبوونی شتێکی داواپێکراو پاڵپشت بە یەکێك لە هۆیەکان کە یاسا دیاریکردووە و بە پاساودەری تەلاقی داناوە(م١٥٦٤)، لەو هۆیانە:

١-زینا و نێربازی و فرەهاوسەری لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە پاساوی داوای تەلاق دەدات بەویتریان بە دوو مەرج:

أ-یەکێك لەو کارانە بە رازیبوونی لایەنەکەی تر کە داوای تەلاق دەکات ئەنجام نەدرابێت.

---

[1] أنظر الدكتور جميل الشرقاوي: أنحلال الزواج في حياة الزوجين وأسبابه في التشريعات الأوربية ص٨٧.

ب- داواکەری تەڵاق هەمان کاری ئەنجام نەدابێت و نەگلابێت لە هەمان هۆوە(م١٥٦٥)

٢- هەوڵی دەستدرێژی: گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە هەوڵیدا دەستدرێژی بکاتە سەر ژیانی ئەویتریان ئەوا بۆ "تاوان دەرحەقکراو" هەیە داوای تەڵاق بکات(م١٥٦٦)

٣- کۆچلێکردنی بەئەنقەست: گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بەئەنقەست کۆچ ی لەویتر کرد بۆ لایەنە کۆچلێکراوەکە هەیە داوای تەڵاق بکات، یاسا کۆچلێکردنی لەم دوو شێوازەدا دیاریکردووە:

أ- گەر بڕیار لە قەزلوە درا ژیانی هاوسەری هاوبەش تێهەڵبکەنەوە و حوکمبەسەرداکراو بەبێ بیانوویەك نەیویست جێبەجێی بکات و ساڵێك بەسەریدا گوزەری کردبێت.

ب- دوورکەوتنەوە لە شوێنی نیشتەجێبوونی هاوسەری بۆ شوێنێکی نادیار بۆ ماوەی ساڵێك(م١٥٦٧).

٤- هەڵە و ناتەواوی ترسناك بە ئەرکە هاوسەرییەکان: گەر یەکێکیان ئاکارێکی نەشیاو یان نەرێکار بە ئەخلاق یان شتانی تری لێ وەشایەوە بۆ ئەویتریان هەیە داوای تەڵاق بکات گەر لەگەڵ راستبوونەوەی ئەو حاڵەتەدا نەیدەتوانی لەسەر ژیانی هاوسەری بەردەوام بێت(م١٥٦٨)

٥- تووشبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە نەخۆشی ئەقڵی بە لانی کەمەوە سێ ساڵ بەسەریدا گوزەری کردبێت، بۆ هاوسەرە تەندروستەکە هەیە داوای تەڵاق بکات لەبارێکدا نەیدەتوانی لە ژیانی هاوسەری لەگەڵی بەردەوام بێت(م١٥٦٩)

**بەردەرمووی داوا:**

مافی داوای تەڵاق بە یەکێك لەم حاڵانە بەردەبێتەوە:

أ- چاوپۆشی دوای راستبوونەوەی یەکێك لە هۆ باسکراوەکان.

ب- گوزەرکردنی شەش مانگ بەسەر ئاگاهی بە هۆیەکە بەبێ بەرزکردنەوەی داوا.

ج–گوزەرکردنی دە ساڵ بەسەر راستبوونەوەی هۆیەکەدا لە هەموو بارەکاندا، واتە یەکسانە بە هۆیەکەی زانیبێت یان نەیزانیبێت(م١٥٧٠–١٥٧١)، تێبینی دەکرێت هەر هۆیەك بۆ تەڵاق شیاوە لە هەمان کاتدا بۆ دابڕانی جەستەیش دروستە و لە دەروازەی لەپێشترە، بەلاَم بۆ کەسی دلوالەسەرکراو هەیە دلوا لە دادگا بکات بڕیار لە تەڵاق بدات لە جێگەی دابڕانی جەستەیی، دادگاش ئەو کارەی بۆ هەیە گەر باوەڕی هێنا بە هۆی پاساودەری تەڵاقەکە(م١٥٧٦)

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەم یاسایەدا ئەم خالاَنەیە:

أ–رێکخستنی بۆ تەڵاق شوێنێکی ناوەندی گرتووە لە نێوان ئەو یاساڕێژییانەی تەڵاق حەرام دەکەن بە حەرامکردنێکی بڕاوە(وەك یاسای ئیتالی) لەگەڵ ئەو یاساڕێژییانەی ئاسانکاری دەکەن تا رادەیەکی دوور لە تەڵاقدا(وەك یاساکانی دەوڵەتانی ئەسکەندناڤ و هەندێ لە ویلایەتەکانی ئەمریکا).

ب–ئەو هۆیانەی ئەم یاسایە دانیپیادانـاون وەك پاساودەرێك بۆ تەڵاق هەموویان لەسەر هەڵەی هاوسەری دلوالەسەرکراو بیناکراوە بەرانبەر هاوسەری ئارەزوومەند لە تەڵاق بە هەڵواردەی نەخۆشییە ئەقڵییەکان.

**یاسای ١٩٣٨:**

حوکم کردن بە "کۆمەڵەی مەدەنی ئەڵمانی" لە پرسی تەڵاقدا بۆ گەلی ئەڵمان بەردەوام بوو لە ١٩٠٠–١٩٣٨، چەندین هەوڵی گۆڕین بۆ رێساکانی تەڵاق لەم کۆمەڵەیەدا ئەنجامدرا، بەلاَم هەمووی شکستی خوارد بەهۆی بەرهەڵستی حیزبی کاسۆلیکییەوە[1].

دواجار پیاوانی یاسای ئەڵمانیا هەستان بە ئامادەکردنی پرۆژە یاسای ساڵی ١٩٣٨ کە هەندێ چاکسازی بۆ رێکخستنی تەڵاق لەخۆگرتبوو، بەلاَم یاساکە دەرنەکرا تا

[1] Dietz: التشريع الالماني الجديد في الزواج لسنة ١٩٣٨ مجلة القانون الدولي ١٩٣٩ ص٥٣ نقلا عن الشرقاوي المرجع السابق ص٨٦.

بۆنەی داگیرکردنی نەمسا لەلایەن ئەڵمانیاوە.

بێبەشبوونی کاسۆلیکی لە مافی تەڵاقدان هۆیەك بوو بۆ لایەنگرییان بۆ هیتلەر کە بەڵێنی ئاوەڵاکردنی تەڵاقی دابوو بۆیان، وەفای بە بەڵێنەکەی خۆی کرد لەگەڵ خستنەسەری نەمسا بۆ ئەڵمانیا لە مانگی مارتی ١٩٣٨، یاسای هاوسەرگیری نوێی لە ٦/تەمووز/١٩٣٨ دەرکرد تاکو ئێستا ئەو یاسایە لە نەمسا کاری پێ دەکرێت سەرەڕای جیابوونەوەی لە ئەڵمانیا لەگەڵ هەندێ گۆڕانکاری و راستکردنەوە تیایدا لە دوای جیابوونەوە لە ئەڵمانیا.

ئەم یاسایە هەندێ مەرجی نوێی بۆ هاوسەرگیری لەخۆگرتبوو کە ئامانجەکەی دەستەبەرکردنی خاوێنی خوێنی ئەڵمانی و سەلامەتی وەچە بوو[1].

**هۆیەکانی تەڵاق لە یاسای ١٩٣٨دا:**

یاسا نوێیەکە هەندێ هۆی سڕیەوە و هەندێکی تری خستە سەر وەك لەم درێژەپێدانەدا:

١- زینا: زینای یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە هۆیەکی پاساودەر دادەنرێت بۆ ئەویتریان تاکو لە داوای تەڵاق بچێتە پێشەوە گەر بە کارەکە رازی نەبوو یان ئاسانکەر نەبوو بۆ ئەنجامدانی. (م٤٧)

٢- منداڵ نەبوون: رەدکردنەوەی منداڵ لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە بەبێ هۆ یان بەکارهێنانی هۆکاری ناڕەوا بۆ رێگری لە منداڵ(وەك لەباربردن) مافی داوای تەڵاق بۆ ئەویتریان پاساودار دەکات. (م ٤٨)

---

[1] هاوسەرگیری لە نێوان رەگەز جیاواز(race)دا قەدەغەکرد، هەر بەو جۆرە تووشبووان بە هەندێ نەخۆشی، بۆیە پێشخستنی بەڵگەنامەی پشکنینی پزیشکی بە قەزا بە پێویست گرتبوو. أنظر dietz قانون الزواج الجديد في المانيا مجلة القانون الدولي لسنة ١٩٣٩ ص٥٢ نقلا عن الشرقاوي المرجع السابق ص٨٤.

٣-هەڵـە و ناتـەواوی: هەڵـە و ناتـەواوی یـەکێك لـە دوو هاوسـەرەکە لـە ئەرکـە هاوسەرییەکانیدا بە ناتەواوییەك سەربکێشێت بـۆ کـەرتبوونی ژیـانی هاوسـەری ماف دلوای تەڵاق دەدات بە لایەنە سەلامەتەکە.(م٤٩)

٤-هەژانی ژیانی هاوسەری: هەژانی ژیانی هاوسەری بەرهەمی تێکچوونی ئەقڵی ماف دلوای تەڵاق پاساودار دەکات.(م٥٠)

یاسای نوێ ماوەی چاوەڕوانی کە مادەی(١٥٦٩) لە یاسای پێشوو دیاریکرد بوو بەوەی لە سێ ساڵ کەمتر نەبێت سڕییەوە.(م٥١)

٥-راستبوونەوەی نەخۆشی گوازراوە یان بێزارکەر بە یەکێکیانەوە مـاف تـەڵاق بـە لایەنی سەلامەت دەدات.(م٥٢)

٦-نەزۆکی بەرلە چوونەلا لە تەمەنی بێهیوابووندا لەباری نەبوونی منداڵدا لە مێردی پێشوو، و بەخێونەکردنی منداڵێکی تەندروستی تر بە رێکـەوتنی هـەردووکیان، ماف تەڵاق دەدات بە لایەنەکەی تر(م٥٣)

شایانی باسە ئەم یاسایە دلوای لە قازی دەکرد بەپێی(م٥٤) تەڵاق رەد بکاتـەوە بـۆ هـەر دوو هـۆی هـاتوو لـە مـادەی(٥٢،٥٣)دا گـەر رەوشـێك بـوونی هـەبوو تەڵاقەکـەی وا لێـدەکرد نەرێکـەری ئـەخلاق بێـت و زیـان بـە هاوسـەری "دلوالەسەرکرلو" بگەیەنێت، وەك ئەوەی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەگەڵ یـەکتر ژیابن یان دوو هاوسەرەکە لە قۆناغەکانی کۆتایی تەمەندا بن و تەڵاق بۆیان شیاو نەبێت، لایەنی دلوا لەسەرکرلو ئاتاج بێت بە یارمەتی ئەو هاوسەرەی دەیەوێت بە تەڵاق جیاببێتەوە بەهۆی پەککەوتنی بە نەخۆشی و شتی ترەوە.

سوێند بە خودا ئەم لاکردنەوە مرۆییەی یاسادانەری ئەڵمانی شایانی رێزلێنـان و مەدح و سەنایە.

٧-داڕووخانی لانەی هاوسەری: گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بۆ ماوەیە دابـڕا لـە سێ ساڵی بەردەوام کەمتر نەبێت بۆ هاوسەرە کۆچلێکراوەکە هەیە دلوای تەڵاق

بکات بەمەرجێك ئەو خاوەنی هەڵەی گەورەتر نەبێت سەریکێشا بێت بۆ ئەو جیابوونەوەیە و لەوێشەوە داڕووخانی لانەی هاوسەری(م٥٥)[1].

گەر یاسای ١٩٢٨ لەگەڵ یاسای ١٩٠٠ بەراورد پێبکەین ئەم خاڵانەمان بۆ ڕۆشن دەبێتەوە:

أ-یاسای نویێ ئەوەی لە کۆنەکەدا بوو لە بەردانەوەی مافی داوای تەڵاق وەك چاوپۆشی و کات بەسەرچوون وەك خۆی هێلآیەوە(م٥٦، م٥٧)

ب-یاسای نویێ نێربازی و فرەهاوسەری و هەوڵی دەستدرێژیکردنە سەر ژیان و کۆچلێکردنی بەئەنقەست لەو هۆیە هاتوانەی یاسای پێشوو پشتگوێخست، لەسەر ئەو بنچینەی هەموو ئەوانە لەژێر کەمتەرخەمی بەرانبەر ئەرکەکانی هاوسەری و ئاکاری نەشیاو-کە مافی داوای تەڵاق پاساو دەدات بەپێی مادەی(٤٩)- جێیان دەبێتەوە.

ج-چەند هۆیەکی زیاد کرد: ڕێگەنەدان بە لەدایکبوونی منداڵ و نەخۆشی گوازراوە یان بێزارکەر و نەزۆکی و داڕوخانی لانەی هاوسەری.

د-یاسای دابڕانی جەستەیی لە شێوەی چەسپاو لە یاسای پێشوودا هەڵوەشاندەوە.

**یاسای ١٩٤٦:**

دوای ئەوەی جەنگی جیهانی دووەم کۆتایی پێهات یاسای ئەڵمانی نویێ هات تاکو جێگەی یاسای ١٩٣٨ بگرێتەوە.

گرنگترین ئەو حوکمانەی ئەم یاسایە تایبەت بە تەڵاق دانیپیادا نا ئەمانە بوون:

---

[1] أنظر الأحوال الشخصية للأجانب للأستاذ جميل خنكي ص٥٧ وما بعدها، التقنين المدني اليوناني جورج رويلوس ص١٤٩ نقلا عن الصابوني ٤٨/١ المراغي المرجع السابق ص٣٨٧ وما بعدها.

**أ–لە هۆکانی تەلآق ئەمانە سڕانەوە:**

١–خۆگرتنەوە لە منداڵبوون و پەنابردن بۆ هۆیە ناڕەواکان لە ڕێگری منداڵ نەکرا بە پاساو بۆ داوای تەلآق.

٢–نەزۆکی پێش وەختە: ئەوە نەدەتوانرا دەستی پێوەبگیرێت بۆ داوای تەلآق.

**ب–پاساکە هۆیەکانی تری بەم جۆرە هێلآیەوە:**

١–زینای یەکێك لە دوو هاوسەرەکە: بەلآم هاوسەرەکەی تر ناتوانێت دەستی پێوە بگرێت بۆ داوای تەلآق گەر لەسەری ڕازی بوو یان ئاسانکاری بۆ کرد یان بە ئاکاری مەبەستگیرانەی وایکرد بەدیبێت(م٤٢/٢)

تێبینی دەکرێت زینا لە دیدگای فیقهی ئەڵمانییەوە بە هۆیەکی ناچارکەر بۆ تەلآق دادەنرێت[1].

٢–ناتەواوی: گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە کەمتەرخەمی کرد بەرانبەر پابەندە هاوسەرییەکانی بە شێوەیەك ترسناك وەك ئاکاری نەشیاو یان نەرێکار بۆ ئەخلاق ئەوا بۆ هاوسەرەکەی تر هەیە داوای تەلآق بکات(م٤٣)

تێبینی دەکرێت زۆرینەی ڕووداوی تەلآق لەم هۆیەوە سەریهەڵداوە[2].

٣–ناتەواوی ئەقڵی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بەجۆرێك پاکی ژیانی هاوسەری لێڵبکات داوای تەلآق بۆ ئەویتریان پاساو دەدات(م٤٤)

٤–تووشبوونی یەکێکیان بە نەخۆشی ئەقڵی بۆ لایەنە تەندروستەکەی تر دروستە داوای تەلآق بکات بەبێ چاوەڕوانی چاکبوونەوە(م٤٥)

وا دەردەکەوێت هۆی هاتوو لە مادەی(٤٤)دا کە بە ناتەواوی ئەقڵی ناودەبرێت مەبەست پێی شێتێتی نییە ئەگینا ئەوەی تێیدایە دووبارەیە لەگەڵ ئەوەی لە مادەی(٤٥)دا هاتووە.

---

[1] الشرقاوي المرجع السابق ص٨٩.

[2] ارمانجون ونولده وولف: القانون المقارن باريس طبعة ١٩٥٠ فقرة (٥٥٨). استاذنا الشرقاوي ص٩٠.

٥- تووشبوونی یەکێکیان بە نەخۆشی گوازراوە یان بێزارکەر دلوای تەڵاق پاساو دەدات گەر پێشبینی شیفای یان لاچوونی ترسی گواستنەوەکەی لە ماوەیەکی نزیکدا نەدەکرا(م٤٦).

شایانی باسە بۆ قازی نییە بڕیار بە تەڵاق بدات بۆ ئەو هۆیە هاتوانە لە مادەی(٤٤، ٤٥، ٤٦)دا گەر کۆمەکی لە پزیشکی پسپۆڕ وەرنەگیرێت و قازی دڵنیا نەبێتەوە لە راستبوونەوەی هۆیەکە لەڕووی کردارەوە.

٦- دابڕانی دوو هاوسەرەکە لە شوێنی نیشتەجێبوون: بە بەجێهێڵانی شوێنی هاوبەش، بەڵام گەر ئەو هاوسەرەی ئارەزووی بە تەڵاقە بەرپرسیار بوو لەو کارە یان بەشی گەورەی بۆ ئەو دەگەڕایەوە بۆ هاوسەرەکەی تر هەیە بەو بەرپرسیارێتییە داوایەکەی بۆ تەڵاق پاڵپێوە بنێت، بەڵام ئەم بەرهەڵستکارییە لەلایەن قەزلوە قبووڵ ناکرێت گەر کارەکە گەیشتە سنوورێك پێچەوانە بێت لەگەڵ ئەخلاق و رۆحی پەیوەندی هاوسەریدا.

**رەد کردنەوەی داوای تەڵاق:**

لەسەر قازی پێویستە دلوای تەڵاق لەم دوو بارەدا قبووڵ نەکات:

أ- لەباری زینادا یان لە باری کەمتەرخەمی بە ئەرکە هاوسەرییەکان گەر لایەنی بەرانبەر چاوپۆشی دەکرد بە راشکاوانە یان بە ئاماژە، ئەوەی چاوپۆشی لێوە ئەنجامگیری دەکرێت هەستان بە ئەرکەکانی هاوسەری وەك هاوسەرێك و تێکەڵبوون و جووتبوون و هاوشێوەکانی ئەمانە.

ب- لەباری تێپەڕبوونی شەش مانگ بەسەر ئاگاهی بە هۆیەکە و بێدەنگبوونی لە بەرزکردنەوەی دلوای تەڵاق[1].

---

[1] اعتمدت في حل هذه المواضيع على استاذنا الشرقاوي المرجع السابق. وهو اعتمد على ما يلي:

١ ـ dietz: التشريع الالماني الجديد في الزواج سنة ١٩٣٨ مجلة القانون الدولي سنة ١٩٣٩ ص٥٢ وما بعدها.

٢ ـ s. f. k.: تعديلات قواعد الطلاق في المانيا نشرة جمعية التشريع المقارن ١٩٤٧.

←

**حوکمەکانی تەلاقی کارپێکراو لە ئێستادا لە ئەڵمانیای یەکگرتوو:**

لە ئێستادا یاسای خێزانی ئەڵمانیای یەکگرتوو بابەتی تەلاقی چارەسەر کردووە بە جۆرێك جیاکاری نەکردووە لە نێوان هۆ پاساودەرەکانی نێوان ژن و مێرد، بەڵکو هەموو هۆیەکانی کردووە بە ئاوەڵاکەری تەلاقی هاوبەش لە نێوان دوو هاوسەرەکەدا لەسەر بنچینەی یەکسانی نێوانیان لە شاندانە ژێر کۆڵی قورسی خێزان، پێچەوانە بەوەی هەندێ یاسا لەسەریەتی لە دیاریکردنی حاڵەتی تایبەت و مەرجی دیاریکراو بۆ هەریەك لە دوو هاوسەرەکە بۆ بەرزکردنەوەی داوای بڕیاری تەلاق.

**هۆیەکانی تەلاق:**

ئەو هۆیانەی یاسادانەری ئەڵمانیای یەکگرتوو بە پاساودەری جیابوونەوەیان دادەنێت بەجۆرێك بۆ هەریەکێك لە دوو هاوسەرەکە بەرزکردنەوەی داوا موباح بکات بۆ بەدەستهێنانی بڕیاری تەلاقدان ئەمانەن:

١–تێکەوتنی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە زینا و بێدەنگ نەبوونی لایەنەکەی تر لەسەر ئەوە و هەستان بە بەرزکردنەوەی داوای تەلاق.

٢–تووشبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە ناتەواوی ئەقڵی لە هێزی ئەقڵیدا بە ناتەواوییەك هیوای چاکبوونەوەی لێ نەکرێت.

٣–تووشبوونی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە نەخۆشییەکی کوشندە سەریکێشێت بۆ ئەوەی نەتوانرێت ژیانی هاوسەری بەردەوام بێت.

٤–هەستانی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە گرتنەبەری ئاکارێکی ناتەبا بە ئاداب و سەریکێشێت بۆ پسانی پەیوەندی هاوسەری بە پسانێك لەگەڵیدا پێشبینی بەردەوامی ژیانی هاوسەری لێ نەکرێت.

---

٣ ـ le bras: المجموعة السابقة.

٤ ـ juris classeur : القانون المقارن ـ المانيا.

لەراستیدا فیقه و قەزا لە ئەڵمانیای یەکگرتوودا لە لێکدانەوەی ئاکاری پێچەوانە بە ئاداب بەرینخوازە بەجۆرێك هەر خراپەیەك سەریکێشێت بۆ لەرزۆکی و روخانی پەیوەندییە هاوسەریەکان و نەرێکردنی تێگەیشتنی نێوانیان لەئامێز دەگرێت، یاساکە هەموو ئەو شتانەی بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەری بەشێوەیەك لە شێوەکان ئەستەم دەکات لەخۆ دەگرێت.

لەوانە بۆ نموونە نەك هەمووی:

أ-هەستانی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە مامەڵەی خراپ لەگەڵ ئەویتریان وەك لێدان و هەڕەشە و سوکایەتی پێکردن و رێزلێنەگرتنی..

ب-هەستانی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە کۆچکردن لەویتریان بەبێ ئەوەی بیانوویەکی قبوولکراوی بەدەستەوە بێت و لەسەر ئەوەش هەژانێکی گەورە لە ژیانی هاوسەریدا سەرهەڵبدات.

ج-کەمتەرخەمی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە ئەرکە هاوسەرییەکانی بە کەمتەرخەمییەك نەتوانرێت لەگەڵی ژیانی هاوسەری بەردەوام بێت.

د-هەستانی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە هاندانی ئەویتر بۆ گرتنەبەری ئاکارێکی شەرمەزارکەر و نەشیاو بە ئاداب وەك هاندانی بۆ لەشفرۆشی و دەلاڵی، بۆ نموونە.

هـ-هەستانی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە تاوانێکی شەرمەزارکەر کە لە رێگەیەوە زیانێکی جێگیر بە هاوسەرەکەی تر بگات و نەتوانێت شانبداتە ژێری.

و-خۆگرتنەوەی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە-لەگەڵ بوونی دەسەڵاتی مادی- لە بەخێوکردنی خێزانەکەی بەبێ پاساوێکی قبوولکراو بەجۆرێك ژیانی هاوسەری سەریکێشێت بۆ لەرزۆکی و جیاوازییەك چارەسەر و دەرووی بۆ نەبێت.

٥- دوورەپەرێزی سروشتی دوو هاوسەرەکە بەیەکتر و ناتەباییان لەگەڵ یەکتر بەجۆرێك ئەوە لە کۆتاییدا سەریکێشێت بۆ تەنگەژەی توند لە پەیوەندییە هاوسەرییەکاندا تەنگەژەیەك رێگەخۆشکەر بێت بۆ هەستکردن بە بێزاری و دوورەپەرێزی پاشان سەریکێشێت بۆ چاندنی رۆحی رق و کینە و خراپ تێگەیشتن، کارەکە بگاتە حاڵەتێك هەموو هەوڵەکانی چاککردنی نێوانیان شکستبخوات، لەو بارەدا لە هەموو لایەکەوە دەرگاکان داخراو دیارین و هیچ جێگرەوەیەك بوونی نەبێت جگە لە تەقەدان لە دەرگای تەلاق[1].

---

[1] المرجع باللغة الالمانية:

dr. khaLIL ABBASI
Die RECHTLICHE STELLUNG Der FRAU
1965 S. 72- 74 KOLN –

# باسی سێیەم:
# تەڵاق لە یاسای ئیتالیدا
## ۱۸۰۹-۱۹۸۳

یاسای ئیتالیا لە دێرین زەمانەوە زیاتر لە هەموو یاسارێژییەکانی تری جیهان بە پەیامی کەنیسەی کاسۆلیکی کاریگەر بووە کە بانگ دەکات بۆ ئەوەی هاوسەرگیری گرێبەستێکی پیرۆزە لەبەردەم خودادا و هیچ هێزێکی مرۆیی ناتوانێت تەڵاق بدات.

هاوسەری لە ئیتالیا چووەتە ژێر ڕێساکانی یاسای کەنیسەوە لەو کاتەوەی زاڵبوونیان بەسەر یاسای ڕۆمانیدا بەدەستهێنا، بەجۆرێك هاوسەرگیریان کرد بە سیستمێکی ئایینی و تەڵاقی کرد بە کارێکی قەدەغەکراو.

ئەم حاڵەتە بەردەوام بوو تا دەرچوونی کۆمەڵەی ناپلیۆن ساڵی ۱۸۰۹ز، دوای ئەوە حوکمەکانی بەسەر هاوسەرگیری و تەڵاقدا لە ئیتالیا جێبەجێ کرا، سەرەڕای ئەوەی بەرهەڵستییەکی توند کرا لەلایەن سەرخەرانی کەنیسەوە، بۆیە جێبەجێ کردنی دەقە ڕێکخەرەکانی تەڵاقی ڕاگرت، بەڵام دواجار ڕاگرتنەکە هەڵگیرا و تەڵاق بەپێی یاساکە لە هەمان ساڵدا ئاوەڵاکرا[1]، بەڵام ئەم یاسایە بەردەوامی لە چارەنووسیدا نەبوو، چونکە لەگەڵ ڕووخانی ناپلیۆن هەڵوەشێنرایەوە و کەنیسە دەسەڵاتی خۆی بەسەر هاوسەرگیری و تەڵاقدا سەپاندەوە.

**یاسای ۱۸٦٥:**

هەرچەند کارکردن بە یاساکەی ناپلیۆن لە ئیتالیا سڕایەوە، بەڵام ئەو وڵاتەی بەجێنەهێڵا تا کاریگەری خۆی لەسەر بیرکردنەوەی پیاوانی یاسا و بیرمەندان

---

(1) DeSjardins: الزواج في ايطاليا منذ معاهدة لاتران طبعة باريس ١٩٣٣ ص٣١. نقلا عن استاننا الشرقاوي المرجع السابق ص١١٢.

بەجێهێلا بە ئاراستەکردنیان بەرەو دەستبردن بۆ تەلاق لەبەر حاڵەتی پێویست کە سوننەتی ژیان دەیسەپێنێت بەسەر پەیوەندی هاوسەریدا بەجۆرێك چارەسەرەکەی تەنها لە رێگەی تەلاقەوەیە، بەرهەمی ئەوە زۆرێك لە نووسەران لە نووسینەکانیاندا بانگیان بۆ بە مەدەنیکردنی هاوسەرگیری و رێگەپێدانی تەلاق دەکرد، کەنیسە بەتوندی دژ بەم بانگەوازە راوەستا و هێرشی کردە سەر بانگکەرانی[1].

بەلام لەگەڵ هەموو ئەوانە هەوڵ و کۆشانی بانگکەران هەندێك سەرکەوتنی بەدەستهێنا بە دەرکردنی یەکەمین کۆمەڵەی مەدەنی ئیتالی ساڵی ١٨٦٥ز، بەپێی ئەم کۆمەڵەیە هاوسەرگیری بوو بە مەدەنی و پسپۆری قەزاییانە لە پرسی هاوسەرگیریدا لە کەنیسە داڕنرا.

بەلام سەرەڕای بە مەدەنی کردنی هاوسەرگیری تەلاق بە حەرامکراوی لەژێر سێبەری ئەم یاسایەدا مایەوە، ئەوەش بریتی بوو لە بەرهەڵستی نێوان بەمەدەنی کردنی هاوسەرگیری و حەرامکردنی تەلاق کە بە نەنگی و ناتەواوی یاسای ١٨٦٥ دادەنرێت.

بەلام مانەوەی تەلاق لەسەر حەرامکردن مانای ئەوە نەبوو حوکمێکی ئارەزووبۆکراو بووبێت لەلای ئیتالییەکان، بەڵکو بەرهەڵستییەکی بەهێز دژ بەوە راستبوویەوە و هەوڵی زۆر درا بۆ ئاوەلاکردنی تەلاق.

لە ساڵی (١٨٧٨)ەوە چەندین پرۆژە یاسا پێشکەشکرا تیایدا دان بە تەلاقدا نرابوو با لە سنوورێکی دیاریکراویشدا بێت، بەلام لەگەڵ ئەوەش بەرهەڵستییەکی توند کرا لەلایەن کەنیسە و هەندێ دەستەی ترەوە[2].

---

[1] المرجع السابق ص٣٢.

[2] مجموعة le Bras ص١٧٢ نقلا عن الشرقاوي ص١١٣.

**یاسای ١٩٢٩:**

دوای ئـەوەی پەیماننامـەی "لاتـران" بەسـترا لـە نێـوان حوکمـەتی ئیتالیا(لـە سەردەمی موسۆلینی) و پاپای ڤاتیکاندا بەپێی ئەو پەیماننامەیە هاوسەگیری ئایینی کە لە کەنیسەی کاسۆلیکی دەبەسترا بەرهەمهێنەری هاوسەرگیری مەدەنییە لەدوای تۆمارکردنی لە تۆمارەکانی باری مەدەنیدا بەپێی رێسا رەچاوکراوەکان، وردبوونەوە لـە داوای پووچبوونی هاوسـەرگیری بـوو بـە پسـپۆری دادگاکـانی کەنیسـە، بـەلآم رێکخستنی ئاساری هاوسەرگیری و دابڕانی جەسـتەیی لـەژێر حوکمـەکانی کۆمەڵـەی مەدەنی ئەڵمانیدا مایەوە.

لەدوای ئەم پەیماننامەیە یاسایەك ٢٤/حوزەیران/١٩٢٩ز دەرکرا دانی بەوەدا نا بـۆ کەسانی تر جگـە لـە کاسـۆلیك، ئەوانـەی دەوڵـەتی ئیتالیـا دان دەنێـت بـە ئـایین و مەزهەبیاندا وەك مەسیحی پرۆتستانت و ئیسرائیلی بۆیان هەیە هاوسەرگیرییەکانیان لەبەردەم لایەنی ئایینی ئەواندا رێکبخەن و ئەو هاوسەرگیرییە لە مەرجەکان و ئاسار و کۆتاهێنانیدا بچێتە ژێر حوکمەکانی کۆمەڵەی مەدەنییەوە[1].

**یاسای ١٩٤٢:**

کۆمەڵەی مەدەنی ئیتالی نوێ ساڵی ١٩٤٢ دەرکرا تاکو جێگەی کۆمەڵەی مەدەنی پێشوو بگرێتەوە، گرنگترین ئەو حوکمانەی لە بواری هاوسەرگیریدا هێنابووی ئەوەبوو کە سێ شێوەی بۆ هاوسەرگیری بڕیار دابوو:

أ–هاوسەرگیرییەك لەبەردەم قیسیسێکی کاسۆلیکیدا ئەنجام دەدرێت و دەچێتە ژێر یاسای کەنیسەوە و وردبوونەوە لە داوای پەیوەست بەو هاوسەرگیرییە لە پسپۆری کەنیسەیە.

ب–هاوسەرگیری ئایینی بۆ کەسانێکی تر جگە لە کاسۆلیك.

ج–هاوسەرگیری مەدەنی.

---

[1] الاستاذ الشرقاوي المرجع السابق ص١١٣. مجموعة le Bras ص١٧٤.

ئەم دوانە دەچنە ژێر حوکمەکانی کۆمەڵەی مەدەنییەوە و وردبوونەوە لێیان لە پسپۆڕی دادگا مەدەنییەکانە.

لەم سێ شێوەدا تەڵاق حەرامکراوە و تەنها موباحێک بریتییە لە دابڕانی جەستەیی.

**لە حوکمەکانی یاسای ١٩٤٢:**

أ–هاوسەرگیری بە مردنی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە هەڵدەوەشێتەوە(م١٤٥).

ب–ژنی پیاوی بێسەروشوێنی بەمردوو حوکمدراو لەلایەن قەزاوە بۆی هەیە هاوسەرگیرییەکی نوێ بکات(م٦٥)، چونکە گریمانەی مردن بە حوکمی قازی وەك مردنی راستەقینە وایە، بەڵام هاوسەرییەکە بەپووچ دادەنرێت گەر ونبووەکە گەڕایەوە یان سەلمێنرا لە ژیاندایە(م٦٨).

دەقی مادەکانی(٤٨–٧٣) حوکمەکانی ونبووی بێسەروشوێن لەخۆدەگرن.

ج–جیابوونەوەی جەستەیی نێوان دوو هاوسەرەکە رێگەپێدراوە(م١٥٠).

ئەم یاسایە دانی نەناوە بە دابڕانی جەستەییدا، ئەو دابڕانە یان قەزاییانەیە یان رێکەوتنانە:

**یەکەم-دابڕانی قەزاییانە:**

بۆ بڕیاردان لە حوکمی دابڕانی قەزاییانە فەراهەمبوونی یەکێك لەم هۆیانە بەمەرج دەگیرێت:

**١–زیناکردنی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە:**

گەر یەکێکیان کاری زینای ئەنجامدا بۆ لایەنەکەی تر هەیە داوا بکات لە قەزا بە دابڕانی جەستەیی بڕیار لە نێوانیان دەربکات[1].

---

[1] زینا بە هۆیەك بۆ دابڕانی جەستەیی تەماشا دەکرێت بان لەسەریشی سزا نەدرێت، یان داواکەر هەروەك داوالەسەرکراو زینای ئەنجام دابێت، واتە لێرەدا بنەمای هەڵە بە هەڵە جێبەجێ ناکرێت.

بەڵام ئەم یاسایە جیاوازی کردووە لە نێوان زینای پیاو و زینای ژن لەڕووی هێزی بوونەهۆ بۆ دابڕان، بۆیە زینای ژنەکە بەسە بۆ ئەوەی هۆیەك بێت بۆ دابڕانی جەستەیی، بە پێچەوانەی زینای مێردەکەوە ئەمەیان قازی وەك هۆیەکی تەواو قبووڵی ناکات، بەڵکو پێویستە رەوشی تر هاوملی ببێت و خراپەی زۆری مێردەکە بۆ ژنەکەی بسەلمێت(م١٥١/٢).

ئەمە بە پێچەوانەی یاسای کەنیسەوە کە جیاوازی نەکردووە لە نێوان زینای هەردوو هاوسەرەکە بە دانانی بە هۆی تەواو بۆ داوای بڕیاری دابڕانی جەستەیی.

**٢-کۆچکردنی بەئەنقەست:**

کۆچکردنی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە لەویتریان بە هۆ دادەنرێت بۆ داوای بڕیاری دابڕانی جەستەیی(م١٥١/٣)

لەم یاسایەدا دیاریکردنی ماوەی کۆچلێکردنەکەم نەبینی، وادیارە ئەوەی بۆ خەملاندنی قەزا بەجێهێڵاوە.

**٣-ئاکاری خراپ:**

مامەڵەی ناباش و خراپەی زۆر لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە دلوای بڕیاری دابڕانی جەستەیی پاساودار دەدات(م١٥١/٤).

**٤-حوکمدان بە بەندکردن بەسەر یەکێکیاندا بۆ ماوەیەك**

لە پێنج ساڵ زیاتر بێت ماف دەدات بەویتر دلوای دابڕانی جەستەیی بکات(ژمارە١٥٢)

**٥-بۆ ژنەکە دروستە دلوای دابڕانی جەستەیی بکات گەر پیاوەکە بەبێ بیانوویەك شوێنێکی بۆ پێکەوە مانەوەیان(نیشتەجێبوونیان) دابین نەکرد**

یان لەگەڵ بوونی دەسەڵاتدا نەیویست دابینی جێگەیەك بکات لەگەڵ حاڵ و باری شیاو بێت(م١٥٣)

تێبینی دەکرێت بەدەستهێنانی گونجان و تەبایی نێوان دوو هاوسەرەکە مافی

دلوای دابڕان بەردەداتەوە(ناهێڵێت) [1]، یەکسانە پێش بەرزکردنەوەی دلوایەکە بێت یان دوای بەرزکردنەوەی(م١٥٤).

**دووەم-دابڕانی ڕێکەوتنانە :**

ڕێکەوتنی نێوان دوو هاوسەرەکە لەسەر دابڕانی جەستەیی ڕێگەپێدراوە بەبێ ئەوەی پێویست بە راستبوونەوەی هۆیەك بکات پاساوی بدات، بەڵام ئەسەرەکەی بەرهەم ناهێنێت گەر دادگا بەڕاستی نەگێڕێت لەدوای ئامادەبوونی دوو هاوسەرەکە لەبەردەمیدا و هەوڵی ئاشتەوایی نێوانیان و گەڕانەوە لە نیەتی دابڕان(م١٥٨).

لەسەر دابڕانەکە: بەربوونەوەی هەموو ئەرکە سەرهەڵدراوەکان لەسەر هاوسەرگیری سەرهەڵدەدەن، هەر بەو جۆرە بەربوونەوەی هەموو مافەکانی ئەو کەسەیان بەرپرسیارە لە هۆی دابڕانەکە.

بەڵام مافەکانی "بڕیاربۆدراو" دەمێننەوە گەر ئەو مافانە بەرهەڵستی نەکەن لەگەڵ سروشتی دابڕانەکە(م١٥٦/١) [2]، دوو هاوسەرەکە دەتوانن ئاساری بڕیاری دابڕانەکە کۆتا پێ بهێنن و ژیانی هاوسەری تێهەڵبکەنەوە بە ڕێکەوتنی هەردووکیان بەبێ پێویستی بە بڕیاری قەزا یەکسانە ڕێکەوتنەکە راشکاوانە بێت یان ئامێزگرانە(ئاماژەیی) وەك گەڕانەوەی کردارییانە بۆ ژیانی هاوبەش(نیشتەجێبوون لەگەڵ یەکتر).

تێکەڵی جووتبوون بە مەرج ناگیرێت لە تێکەڵی نیشتەجێبووندا بۆ مەرامی کۆتاهێنان بە دابڕان و تێهەڵکردنەوەی ژیانی هاوسەری(م١٥٧)

بەوەش دابڕانی جەستەیی لە پەیامی مەسیحیدا وەك تەڵاقی رجعی وایە لە شەریعەتی ئیسلامدا، چونکە هەردووکیان حاڵەتێکە لە نێوان ناهاوسەری و ناتەڵاقدا، رجعە لای زۆرێك لە فەقیهان بە قسە و بە کرداریش بەرهەم دێت، بەبێ پێویستبوون

---

(1) الشرقاوي المرجع السابق ص١١٨. قانون المرافعات الايطالي (م٦٠٦ـ ٦٠٨).

(2) مجموعة le Bras ص١٨٠ـ١٨١.

بە حوکمی قەزا، بەڵام جیاوازییەکی جەوهەری لە نێوانیاندا هەیە ئەوەش ئەوەیە تەڵاقدراو بە تەڵاقی رجعی لە ئیسلامدا پەیوەندییەکەی لەگەڵ مێردەکە کۆتایی پێ نێت بە کۆتاهاتنی عیدەکەی و لەوە بەدواوە ژنەکە سەربەخۆ دەبێت، بۆی هەیە مێرد بکات بە هەر کەسێك دەیەوێت بیکاتە هاوبەشی نوێ بۆ ژیانی هاوسەری خۆی، بە پێچەوانەی دابڕانەوە هەریەك لە دوو هاوسەرەکە لە هاوسەرگیری نوێ بێبەش دەکرێن تا ئەویتر لە ژیاندا بێت ماوەکە هەرچەند درێژ ببێتەوە، لە تەڵاقی رجعیدا میراتگری لە نێوان دوو هاوسەرەکەدا جێگیرە گەر یەکێکیان بەر لە تەواوبوونی عیدەکە بمرێت، بە پێچەوانەی دابڕانەوە.

تێبینی دەکرێت بێبەش بوونی هاوڵاتی ئیتالی لە تەڵاق هەندێ جار پاڵی دەنێت بۆ بەدەستهێنانی رەگەزنامەی وڵاتێکی تر بە مەرامی بەدەستهێنانی تەڵاق، گەر ئەو کارە تەواو بوو پاشان دوای تەڵاق بگەڕێتەوە بۆ رەگەزنامە ئیتالییەکەی، لەم بارەدا قەزا بڕیار بە پووچەڵی تەڵاقەکەی و مانەوەی ژیانی هاوسەرییەکەی دەدات گەر بۆی سەلما تەنها بە مەرامی تەڵاق رەگەزنامەی بیانی بەدەستهێناوە[1].

**دەستووری ١٩٤٨:**

حەرامکردنی تەڵاق لەژێر سێبەری کۆمەڵەی ١٩٤٢دا گۆڕانی بەسەردا نەهات لەدوای تیاچوونی سیستەمی پاشایەتی و روخانی فاشییەت لە ئیتالیا، بەڵکو پەیماننامەی "لاتران" بوو بە بەشێك لە دەستووری ئیتالی نوێ کە لە یەکی حوزەیرانی ساڵی (١٩٤٨)ەوە جێبەجێ کرا.

بەڵام ئەم دەستوورە رووبەڕووی گفتوگۆی توند بوویەوە کە شیوعییە ئیتالییەکان لە کۆمەڵەی دامەزراندندا هوروژاندیان و بوونی ئەو دەقەیان لە دەستووردا بەتوندی رەد کردەوە لەسەر بنەمای (نەشیاوی هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیری لە رێگەی تەڵاقەوە).

---

[1] Juris Classeur القانون المقارن الايطالي رقم ١٤٨. مجموعة Bras ص١٧٧.

سەرەڕای ئەوەی ئەم رەدکردنەوەیە ئاماژەیەکی یاسایی بۆ نەبوو، بەڵام بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی تەوژمێکی جەماوەری لە ئیتالیا دژ بە حەرامکردنی تەڵاق بوونی هەیە، سەرباری ئەوە فەقیهانی ئیتالیا هەستیان بە زەرووەتی ئاوەڵاکردنی تەڵاق کرد لەو بارانەدا کە زۆر پێویستن وەك چاولێکردنێك بۆ هەموو دەوڵەتانی جیهان[1].

یاسای ١٩٧٠:

تەوژمی جەماوەری دژ بە حەرامکردنی تەڵاق لە ئیتالیا دواجار ئەنجامێکی کرداری بەدەستهێنا، بەر لە دەرکردنی یاسای ١٩٧٠ چەندین خۆپیشاندانی جەماوەری بۆ ئاوەڵاکردنی تەڵاق رژانە سەر شەقامەکان، لە لافیتە بەکاربراوەکانی ئەو خۆپیشاندانانەدا هاتبوو: (ئاژەڵەکان تەڵاق نادەن، بەڵام گەلانی پێشکەوتوو تەڵاق دەدەن).

لەژێر ئەم فشارە بەردەوامەدا یاسادانەری ئیتالیا ناچاربوو بۆ یەکەمجار لە مێژووی یاساڕێژی ئیتالیادا یاسایەك دەربکات رێگە بە تەڵاق بدات، لە ١٩٧٠/١٢/٢ یاساکە دەرکرا، لە (١٩٧٠/١٢/١٢)ەوە جێبەجێکرا و کاری پێکرا، دەوترێت: لەدوای ئەو رێگەپێدانە ژمارەی ئەو ئافرەتانەی تەڵاقدران گەیشتە ملیۆنێك سەرەڕای ئەوەی تەڵاقی دلنیادانرلو یاسایەك بوو تایبەت بە هاوسەرگیری مەدەنیانە کە تەنها لە دەرەوەی کەنیسە گرێبەستەکەی تەولو دەبوو[2]

یاسای ١٩٨٣:

وا دەردەکەوێت یاسادانەری ئیتالی دواجار پەشیمان بوویێتەوە لە رێگەدان بە تەڵاق لەژێر کاریگەری کەنیسەی کاسۆلیکیدا، ئەو نەیتوانی بەتەولوی کارێك پشتگوێ بخات واقیعی ژیان دلوای دەکات، چونکە هەندێ جار هاوسەرگیری شکست دەخوات

---

(1) TRObuCChi فقرة (١١٧) نقلا عن الشرقاوي ص١١٤.

(2) أنظر الاستاذ لبراهيم النعمة: نفحات من شريعة الاسلام وصلاحها للتطبيق في كل زمان وفي كل مكان ص٥١.

و هیچ ڕێگەیەك بۆ چارەسەری نامێنێتەوە جگە لە هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیرییەکە، بینا لەسەر ئەم ڕاستییە لە جێگەی تەڵاق شتێکی تری هێناوە ناوی ناوە چارەسەری هاوسەرگیری(یان سڕینەوە) لەبارێکدا هۆیەك بوونی هەبێت ئەو کارە پێویست بکات، ئەوەش هەمان ئەو ئەنجامە دەستەبەر دەکات تەڵاق دەستەبەری دەکات، کەوابوو ئەو هەستیارییە چییە بەرانبەر گوزارەی تەڵاق؟ نازانم!!!

لە ڕۆژی ١٩٨٣/١١/٢٧ یاسا نوێیەکە دانیپیادا نرا، ئەوەش بە گەشە و گۆڕانێك دادەنرێت بۆ یاسا کە بە دەستپێشخەری پاپا یوحەنای بیست و سێ لە دەستەی ڤاتیکان ساڵی ١٩٦٢–١٩٦٥ دەستی پێکرد و پاپا پۆلسی شەش کۆتایی پێهێنا، بە داهێنانی مادەی(١٠٥٥) لە یاسای نوێ لەلایەن کەنیسەوە، دەقەکەی دەڵێت: (گرێبەستی هاوسەرگیری کە ژن و پیاو بۆ ژیانێکی هاوبەش بڕیاری لێ دەدەن و ئامانج تیایدا لەدایکبوونی منداڵ و پەروەردەی منداڵ بێت لە نێوان تەعمیدکراوەکاندا لەلایەن مەسیحەوە سەروەری ڕێز و پیرۆزییەکان هەڵگیراوە)

مادەی(١٠٥٦) دەقەی دەڵێت: (گرێبەستی هاوسەرگیری بە ڕێکەوتنی دوو لایەنەکەیە قابیلی هەڵوەشانەوە نییە لەلایەن هیچ هێزێکی مرۆییەوە، ڕازیبوونی هاوسەریانە بریتییە لەجێگیرکردنی ئارەزووی هەردوو لا لە گرێبەستێکی هەتاهەتایی و ئارەزوومەندانە لە بینای ژیانی هاوسەری).

### هۆیەکانی سڕینەوە لەژێر سێبەری یاسای نوێدا:

هۆیەکانی سڕینەوە بەر لەو یاسایە کەم بوون، بەڵام ئەم یاسایەی ئێستا کاری پێ دەکرێت لەو هۆیانەدا فراوانخواز بووە، هەیانە کۆمەڵایەتی و هەیانە دەروونییە و یەکێك لە دوو هاوسەرەکە شان لەسەر داوای سڕینەوەی هاوسەری دادەدات کاتێك کاریگەری هەبێت لەسەر ڕازیکردنی قەزا.

### یەکەم-هۆ کۆمەڵایەتییەکان:

نەگونجان و هەڵنەکردن لە زۆرترین ئەو هۆیانەن بۆ سڕینەوەی هاوسەری دەخرێنە ڕوو سەرەڕای ئەوەی هۆیەکە قبوولکردنی کەمترە لەلایەن قازییەکانەوە.

لە پێشەنگەکانی هۆ کۆمەڵایەتییەکان: منداڵ نەبوون دێت بەهۆی نەزۆکییەوە یان بەهۆی خۆگرتنەوە لە رێگەدان پێی.

شایانی باسە زۆرێك لە ژنە ئیتالییەکان نایانەوێت منداڵیان ببێت و ژیانی ژوورەوەیان لەلا پەسەند نییە، چونکە ئارەزوویان بە سڕینەوەی هاوسەرییە بۆ ئەوەی بەختی خۆیان تاقیبکەنەوە لە مەیدانی فەرمانبەری و سەندیکاکان و سیاسەت و شتانی تر لە کاری ئازاد کە زۆرێك لە کات و گرنگیپێدانی گەرەکە.

**دووەم-هۆ دەروونییەکان:**

ئەوانەش ئەو هۆیانەن تایبەتن بە نەخۆشییە ئەقڵییەکان و نەخۆشییە دەروونییە جۆراوجۆرەکان وەك هیستریا و دەمارتوندی یان ئەوەی پەیوەستە بە لەرزۆکی کاری زاوزێ وەك ناتەواوی سێکسی و گۆڕینی رەگەز و پەرگیری سێکسی.. ئەوانەش هۆگەلێکن سەردەکێشن بۆ ئاستەنگە قەزاییەکان لە دیدی ڤاتیکانەوە، چونکە تاککەوتن و تایبەتمەندی دیاردە دەروونییەکان سەرچاوەی دژوارییەکی سروشتین پەیوەست بە قازی و پێویستە لە بڕیاری ئەوەی سروشتییە و ئەوەی نەخۆشییە بەهەند وەربگیرێن لە هەر بارێکی کۆمەڵایەتی و دەروونیدا.

بۆ گەیشتن بە حوکمی سڕینەوەی هاوسەری پێویستە هۆیەکی رۆشن بوونی هەبێت تاکو بتوانرێت بسەلمێت و کاریگەرییەکانی لەسەر توانا ئەقڵی یان سۆزیاوی یان بەویستەکان جێگیر بکرێن، رۆشنترین حاڵ لەباری ترس و توندوتیژیدایە یان نەتوانینی هەستان بە ئەرکەکانی هاوسەری لەرووی کۆمەڵایەتییەوە.

ئاماری باری سڕینەوەی هاوسەرگیری لە نێوان ساڵانی ١٩٧١–١٩٨١ کە دادگا کاسۆلیکییەکان بڕیاریان لێداو:

| ناوی دەوڵەت | ئیتالیا | ئەوریا | ئەمریکای باکوور | کۆی هەموو لە جیهاندا |
|---|---|---|---|---|
| ٧١ | ٥٩٤ | ٢٠٩٠ | ٥٩٠١ | ٨٤٩٠ |
| ٧٢ | ٦١٤ | ١٨٢٤ | ٧٩٥٧ | ١٠١٩٣ |
| ٧٣ | ٦٦٤ | ٢٢٥٤ | ٨٢٧٦ | ١١١١٩ |
| ٧٤ | ٨١٩ | ٢٩٠٦ | ١٤٠٣٨ | ١٧٥٦٥ |
| ٧٥ | ١٠٦٥ | ٨٨٦ | ٢٠٧٤٢ | ٢٥٧٠٣ |
| ٧٦ | ١٠٥٠ | ٢٠٧٢ | ٣١٧١٢ | ٣٨٢٣٣ |
| ٧٧ | ٩٦٦ | ٦١٧١ | ٤٠٣٠٧ | ٤٨٢٠٥ |
| ٧٨ | ٨٣٣ | ٥٤١٩ | ٤٣٩٢٨ | ٥١٢٨١ |
| ٧٩ | ٧٦٦ | ٦٦٦٥ | ٣٥٧٠١ | ٦٢٧١٩ |
| ٨٠ | ٧٩٦ | ٦٢٥٩ | ٥٥٦٤٦ | ٦٤٢٧٩ |
| ٨١ | ١٠٧٧ | | | |

هۆیەکانی سڕینەوەی هاوسەریی لەلای کەنیسە قبوولکرلو لەلای و قبوولنەکرلو و ڕێژەکەی لە ئیتالیا بۆ ساڵی ١٩٨٣[١]

| ت | هۆیەکان | وەرگیرلو | ڕێژە | ڕەتکرلوە | ڕێژە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | منداڵ نەبوون | ١٠٨ | ٣٠,٥٪ | ٤٥ | ٣١,٢٪ |
| ٢ | هەڵنەکردن و نەگونجان | ٨٩ | ٢٥,١٪ | ٤٤ | ٤٠,٤٪ |
| ٣ | ناپاکی هاوسەری | ١٨ | ٥,١٪ | ١٥ | ٤٨,٤٪ |
| ٤ | تێنەگەیشتن لەیەکتر | ٥٩ | ١٦,٦٪ | ٨ | ١٤,٨٪ |
| ٥ | توندوتیژی و ترس | ٣٢ | ٩٪ | ١٠ | ٢٦,٣٪ |
| ٦ | خامۆشی تەولو | ١٧ | ٤,٨٪ | ١٥ | ٥٠,٠٪ |
| ٧ | نەتوانین بۆ هەستان بە ئەرکەکانی هاوسەری | ١٢ | ٣,٤٪ | ٥ | ٢٩,٠٪ |
| ٨ | پەککەوتنی سێکسی | ٩ | ٢,٥٪ | ١ | ٢٠,٠٪ |
| ٩ | هۆی جۆرلوجۆری تر | ١٠ | ٢,٨٪ | ٦ | ٥٤,٥٪ |

[١] مترجمة عن مجلة العائلة اليوم التي تصدر من الفاتيكان العدد السابع الصادر في كانون الثاني ١٩٨٤.

# باسی چوارەم:
# تەڵاق لە یاسای فەرەنسیدا

سیستمی تەڵاق لە یاسارێژییە فەرەنسییەکاندا لەڕووی رادەی رەهاکردن و کۆتوبەندکردنی ئازادی ویستی دوو هاوسەرەکەوە تیایدا بە چەندین قۆناغی یەك لەدوای یەکدا گوزەری کردووە:

**أ-قۆناغی رەهاکردنی ئازادی ویست:**

بەهۆی عورفی باڵادەست لە هەرێمی فەرەنسای باکوور و شوێنکەوتنی یاسای رۆمانی لە هەرێمی باشووری کاتێك فەرەنسای کۆن کاریگەر بوو بە یاسای رۆمانی لە ئاوەڵاکردنی تەڵاقدا.

**ب-قۆناغی کۆتوبەندکردن:**

کەنیسە دژ بە بیرۆکەی ئازادی ویست لە تەڵاقدا جەنگی راگەیاند بەهۆی بەیەکداکێشانی ئەو بیرۆکەیە بەو بنەمایەی کەنیسە بانگی بۆ دەکرد گوایە هاوسەرگیری پەیوەندییەکی هەتاهەتاییە و ناپچڕێت.

بۆیە تەڵاق لە باکوری فەرەنسا لە سەدەی دوازدەهەمدا سڕایەوە، هەر بەو جۆرە لە باشووری فەرەنسا لە سەدەی سیازدەهەمدا، دوو سیستمی بڕیار دا ئەو دوانەش: سیستمی پووچبوونەوەی هاوسەرگیری و سیستمی دابڕانی جەستەیی بۆ ئەوەی جێگەی تەڵاق بگرێتەوە لە چارەسەری گرفتی نەگونجانی دوو هاوسەرەکە.

**ج-لە قۆناغی سێیەمدا:**

کاتێك شۆڕشی فەرەنسا ساڵی ١٧٨٩ی زایینی بەرپابوو سیستمی تەڵاق گەڕایەوە بۆ ئەوەی لەسەری بوو لە قۆناغی یەکەمدا بەپێی یاسای ٢٠/ئەیلول/١٧٩٢.

فەقیهانی یاسا پێیانوایە[1]: ئەم یاسایە بە شۆڕش دادەنرێت بەسەر یاسای کەنیسەدا لە رێکخستنی تەلاقدا، لە پێشەکییەکەیدا هاتبوو: (مافی تەلاق لە راگرەکان(مقومات)ی ئازادی تاکەکەسییە، پەیوەستبوون بە هاوسەرەوە بە پەیوەندییەکی هەمیشەیی مانای لەدەستدانی ئەو ئازادییەیە) بۆیە تەلاقی تا رادەیەکی زۆر بەرین کرد، بە رێکەوتنی دوو هاوسەرەکە تەلاقی ئاوەلا کرد وەك چۆن بواری رەخساند بۆ هەریەك لە دوو هاوسەرەکە دلوای تەلاق لە قەزا بکات تەنها بەهۆی نەگونجانی ئەو و هاوسەرەکەیەوە، یان بەهۆی شێتییەوە یان بەهۆی کۆچلێکردنییەوە وەك کۆچلێکردنی نوبڵمانەکان لە فەرەنسا لە کاتی شۆڕشی فەرەنسا و رووخانی باستیلدا) یان خۆشاردنەوەی بۆ ماوەیەك لە پێنج ساڵ کەمتر نەبێت.

وەك چۆن سیستمی دابڕانی جەستەیی سڕییەوە، بەوەش یاساکە لەگەڵ ئاراستەی بالادەست پێکهاتەوە لەدوای بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسا دژ بە بنەمای کۆتانەهاتنی هاوسەرگیری وەك چۆن وەلامدەرەوەی رۆحی تاکەکەسی بوو کە لە سەرەتایەوە بالادەست بوو.

ئەنجامی ئەوە زیادەرەوی لە تەلاقدا گەیشتە رادەیەك تا ژمارەی حاڵەتی تەلاق لە ساڵی ١٧٩٣دا گەیشتە یەك لەسەر سێی ئەو هاوسەرگیرییانەی لەو ساڵەدا ئەنجام درابوو.

**د-قۆناغی چوارەم:**

دوای گەڕانەوەی پاشایەتی و گرتنە دەستی دەسەلات لەلایەن خێزانی "بەربون"ەوە سەرلەنوێ کاسۆلیکی بوویەوە بە ئایینی فەرمی دەوڵەت لەو سۆنگەیەوە کە ئایینی زۆرینەی فەرەنسییەکانە، بۆیە سیستمی تەلاقی لە مایس/١٨١٦ سڕییەوە و بارەکە گەڕایەوە سەر ئەو دۆخەی پێش شۆڕش لەسەری

---

[1] أنظر الدكتور الشرقاوي المرجع السابق ص٢٧.

بوو، لەوێوە هاوسەرگیری بۆ جاری دووەم قابیل بە جیابوونەوە و پچڕان نەبوو مەگەر بە مردن.

بەڵام سیفەتی ئاینی فەرمی لە (١٨٣٠ن)ەوە لە کاسۆلیکی وەرگیرایەوە، وا پێویست بوو لەدوای ئەوە کارکردن بە سیستمی تەڵاق بگەڕێتەوە، هەوڵێکی زۆر درا بۆ دەرکردنی یاسایەك بۆ گەڕانەوە بۆ سەر ئاوەڵابوونی تەڵاق بەڵام هەموو ئەو هەوڵانە شکستیان خوارد بەهۆی بەرهەڵستی دەستەی پیرانەوە، رێگری لە تەڵاق بۆ ماوەی(٧٠) ساڵ لە فەرەنسا بەردەوام بوو تا بە یاسای ٢٧/تەموز/١٨٨٤ گەڕایەوە، یاساکە بە "Naguet" ناسرلوە بەناوی ئەو پیاوەی گەورەترین کاریگەری هەبوو لەسەر دەرکردنی یاساکە[1].

لەدوای ئەم یاسایە یاسادانەری فەرەنسی چەندین یاسارێژی یەك لە دوای یەکی هێنایە ئاراوە بۆ ئاسانکاری رێکارەکانی تەڵاق تا دواجار هەموو کۆتوبەندێك سڕایەوە لەسەر هاوسەرگیری ئەوانەی تەڵاق بە نێوانیاندا تێپەڕی بوو یان لەسەر تەڵاقیاندا بۆ جارێکی تر.

هەر بەو جۆرە قەزای فەرەنسی تا رادەیەکی زۆر ئاسانکاری کردووە لە پێدانی مافی تەڵاق، ئەوەش بووە هۆی زیادبوونی حاڵەتەکانی تەڵاق بە رێژەیەکی ناماقووڵ کە زۆرێك لە نووسەرانی فەرەنسا دەستیان بە بانگەواز کرد بۆ دانانی سنوورێك بۆ تەڵاق تەنانەت بانگکردن بۆ سڕینەوەی تەڵاقیش[2].

---

(1) ينظر الدكتور عبد الفتاح عبد الباقي: الزواج قيامه. آثاره. أنقضاءه في القانون الفرنسي ط/١٩٦٥/ القاهرة. ص١٧١ وما بعدها.

(2) ينظر Savatier: شرح القانون المدني الفرنسي ج١ ف٢٨١ نقلا عن الشرقاوي المرجع السابق ص٢٩.

ه-قۆناغی گەڕانەوە بۆ سنووردانان:

یاسادانەری فەرەنسی ساڵی ١٩٤١ وەڵامی بانگی بیرمەندان و نووسەرانی دایەوە بە کۆتوبەندکردنی تەڵاق لەپێناو پارێزگاری لە خێزانی فەرەنسی لە داڕوخان، بۆیە یاساکە لە ٤/نیسان/١٩٤١ دەرکرا، یاساکە ئامانجی بوو حوکمەکانی تەڵاق رێکبخاتەوە، ئامانج لە کارەکە قەدەغەکردنی تەڵاق نەبوو بەڵکو گرانکردنی زۆرتر بوو بە سەپاندنی رێکارە قەزاییەکان بەسەر ویستی ئارەزوومەند لە تەڵاقدا و داهێنانی کۆمەڵێك مەرج مەودای حوکم بە تەڵاق بەرتەسك دەکاتەوە.

سەرباری ئەوە کۆمەڵێك کۆتوبەندی تر، لەوانە: قبووڵ نەکردنی داوای تەڵاق پێش گوزەرکردنی سێ ساڵ بەسەر هاوسەرگیریدا، بەڵام ئەو مەرجە بە یاسای ساڵی ١٩٤٥ز سڕایەوە.

و-دوایی قۆناغ:

ئەمەش یاسارێژی فەرەنسی لەسەر دامەزراوە بە دەستبردن بۆ تەڵاقی سنووردار(کۆتوبەندکراو) واتە ئەو تەڵاقەی کە تەنها بە کۆمەڵێك هۆی سنووردار کە یاسا دیاریان دەکات بڕیاری لەسەر دەدرێت، تەڵاق بە مادەکانی(٢٢٩-٢٣٢)ی کۆمەڵەی مەدەنی فەرەنسی رێکخرابوو، لە دەقەکانی ئەم مادانەوە هۆیەکانی تەڵاق لە یاسای فەرەنسیدا لەسەر سێ هۆ کورتدەبێتەوە، ئەوانەش:

١-زینای ژن(م٢٢٩) یان زینای پیاو(م٢٣٠)

٢-حوکمدان بەسەر پیاوەکەدا بە سزایەکی تاوانکارانە(م٢٣١)

٣-دڵڕەقی و مامەڵەی خراپ((م٢٣٢)

هۆی یەکەم-زینا adultere:

یاسای فەرەنسی(م٢١٢) هەریەك لە دوو هاوسەرەکە پابەند دەکات بە دڵسۆزی بۆ یەکتر، گرنگترین ئەرکێك لەم پابەندبوونەوە سەرهەڵدەدات بریتییە لە خۆگرتنەوە لە ناپاکی هاوسەری.

بۆیە هەستان بە تاوانی زینا لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکەوە بە هەڵەیەکی ترسناك دادەنرێت بەرلنبەر ئەو پابەندبوونە، یاساش لەسەر ئەوە ماف دەدات بە هاوسەرەکەی تر دلوای تەڵاق بکات.

زینا هۆیەکی پابەندکەرە بۆ تەڵاق یەکسانە لە پیاوەکەوە بێت یان لە ژنەکەوە(م٢٣٠-٢٢٩ مەدەنی) سەرەڕای ئەوەی یاسای تاوانکاری لە سزادا جیاکاری دەکات لە نێوان زینای پیاو و زینای ژندا، لەبەر ئەوەی هۆیەکە بۆ تەڵاق پێویستە لە کەسێك بوەشێتەوە لێوەشاوەیی کامڵ و هەڵبژاردەی بۆ هەبێت، هەروەها دەبێت بە رازیبوونی هاوسەرەکەی تر و کاری ژێربەژێری یان هاندانی ئەو نەبێت، گەر ئەو مەرجانە لەلای قازی فەراهەم بوون پێویستە لەسەری حوکم بە تەڵاق بکات با بشزانێت بەرژەوەندی خێزان بریتییە لە مانەوەی هاوسەری نێوانیان[١].

**هۆی دووەم-حوکمدان بە سزای تاوانکارانە :**

گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بە سزایەکی تاوانکارانە حوکم درا و پەیوەست بوو بە جەستە و شەرەفەوە بۆ هاوسەرەکەی تر هەیە دلوای تەڵاق بکات بەپێی مادەی(٢٣١) لەسەر ئەو بنچینەی ویژدانی ئازار دەخوات لە مانەوە لەگەڵ هاوشێوەی ئەو تاوانبارەدا.

بەڵام لەبەر ئەوەی هۆیەکی پابەندکەرە بۆ تەڵاق پێویستە ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١-حوکمدانەکەی بە حوکمی تاوانکارانە بێت نەك بە حوکمی کەتن[٢].

---

[١] الدكتور عبد الفتاح، المرجع السابق ص١٨٠.

[٢] تاوان: ئەوەیە لەسەری کەسەکە سزا دەدرێت بە لەسێدارەدان یان بە بەندکردنی هەتاهەتایی یان بە بەندکردنی کاتی زیاتر لە پێنج ساڵ تا بیست ساڵ.
کەتن: تاوانێکە سزا دەدرێت بە بەندکردنی توند یان سووك(سادە) زیاتر لە سێ مانگ تا پێنج ساڵ یاخود سزادان بە غرامە.. ق. ع. ع. (م٢٥).

٢-سزاکە جەستەی یان ئازادی کەسەکە بگرێتەوە وەك کارکردنی سەخت و بەندکردن، هەروەها پەیوەستبێت بە شەرەف و پێگەی کەسەکەوە.

٣-حوکمەکە لە دادگایەکی فەرەنسییەوە دەرچووبێت نەك دادگایەکی بێگانە.

٤-حوکمەکە پلەی براوە(پلەی بەتکردن)ی بەدەست هێنابێت، بەوەی قابیلی تێهەڵچوونەوە نەبێت.

٥-حوکمەکە لە کاتی هاوسەرگیریدا دەرکرابێت یا تاوانەکەش پێش هاوسەرگیرییەکە ئەنجام درابێت.

٦-تاوانبارەکە پێگەی یاسایی خۆی بۆ نەگەڕابێتەوە و لێبوردنی گشتی نەیگرتبێتەوە.

گەر ئەم مەرجانە فەراهەم بوون لەسەر قازی پێویستە حوکم بە تەڵاق دەربکات لەدوای بەرزکردنەوەی داوایەك بۆ بەردەمی، هیچ کام لە دوو هاوسەرەکە مافی ئەوەیان نییە دلوا لەسەر یەکتر بەرزبکەنەوە لە بارێکدا گەر تاوانەکە لە هەردووکیان روویدابێت یەکسانە گەر دوو بکەری بنەڕەتی بن یان دوو هاوبەش یان یەکێکیان بنەڕەت و ئەویتریان هاوبەش.

**هۆی سێیەم-دڵڕەقی و مامەڵەی خراپ و بەدرەفتاری لەرادەبەدەر:**

ئەوانە شێوەگەلێکی ئازاردانن گەر لە یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بوەشێتەوە بۆ ئەویتریان موباح دەبێت دلوای تەڵاق بکات، بۆیە هەموو ئەوانە بە یەك هۆ بۆ تەڵاق دادەنرێن، بۆ قازی دەسەڵاتی خەملاندن هەیە تاکو تەڵاقەکە بۆ ئەو هۆیە بگێڕێتەوە و بەپێی مادەی(٢٣٢) بریار دەربکات، گەر ئەم مەرجانە فەراهەم بوون:

١-کارەکە بەویست بێت، گەر کەسەکە شێت بوو یان هۆشی لەدەستدابوو بە هەر هۆیەك بێت کارەکەی نابێتە هۆیەك بۆ ئەوەی ئەویتریان دلوای تەڵاق بکات.

٢-کارەکە تاکەکەسی بێت، واتە سەرچاوەکەی لە یەکێکیانەوە بێت بەرانبەر ئەویتریان، گەر کارەکە لەسەر کەسە نزیکەکانی بێت یان لە کەسە نزیکەکانیەوە بێت لە بواری ئەو هۆیە دەردەچێت.

٣-کارەکە لە کاتی ڕاستبوونەوەی هاوسەریدا ڕوویدابێت بەپێی مادەی(٢٣٢)
٤-فەراهەمبوونی ناڵەباری و توندوتیژی جا یان بەهۆی توندی کارەکەوە یان بەهۆی دووبارەبوونەوەی کارەکە، پێگەی کۆمەڵایەتی کەسی بێگوناه بە هەند وەردەگیرێت، هەندێ جار زلەیەکی پیاوەکە لە ژنەکەی کارێکی ئاساییە تایبەت بە ئافرەتێك و هەڵەیەکی گەورەیە تایبەت بە ئافرەتێکی تر.
٥-دڵڕەقی و مامەڵەی خراپ بگاتە ڕادەیەك قازی وا ببینێت بەردەوامی ژیانی هاوسەری بووە بە کارێك ناتوانرێت شان بدرێتە ژێری[1].

**ئەم تێبینیانە لەسەر یاساکە دەخرێتە ڕوو:**

١-دەستبردن بۆ بنەمای سنووردارکردن(دیاریکردن)ی یاسایی بۆ هۆیەکانی تەڵاق و کورتکردنەوەیان لە دەقەکانی یاساڕێژیدا، دەقی مادەی(٢٣٢) ئاماژە دەکاتە سەر ئەوەی کە: (جگە لەو حاڵەتانەی دەقیان لەسەرە لە مادەکانی(٢٢٩-٢٣١) بۆ قازییەکان نییە بڕیار بە تەڵاق دەربکەن مەگەر بەهۆی دڵڕەقی و مامەڵەی خراپ و بەدرەفتارییەوە).
٢-لە ڕێکخستنی تەڵاقدا دەستی بۆ بیرۆکەی سزا بردووە و تەڵاقی بە سزا داناوە بۆ ئەوەیان هۆکارە لە ڕوخانی قەوارەی هاوسەریدا، شایانی باسە دوو بیردۆزە لە بنچینەی دیاریکردنی هۆی تەڵاق لە هەموو یاساڕێژییە دانراوەکاندا بوونییان هەیە، ئەو دوانەش: بیردۆزەی تەڵاق وەك سزا و بیردۆزەی تەڵاق وەك چارەسەر، یاسای فەرەنسی بنەمای بیردۆزەی یەکەمی وەرگرتووە لەو سۆنگەیەوە تەڵاق تەنها بە ناتەواوی و کەمتەرخەمی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە یان هەردووکیان بەرانبەر ئەرکە هاوسەرییەکان بڕیاری لێ دەدرێت.

---

[1] ينظر الدكتور الشرقاوي المرجع السابق ص٣٣ وما بعدها. الدكتور عبد الفتاح المرجع السابق ص١٧٥ وما بعدها. د الدكتور حسن الاشموني الاحوال الشخصية في القانون الفرنسي ص٢٣.

**بینا لەسەر ئەوە یاسای فەرەنسی بەم هۆیانە تەڵاقی ئاوەڵا نەکردووە:**

أ–شێتێتی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە.

ب–بێسەروشوێنی.

ج–نەخۆشییەکانی زاوزێ.

د–هەر هۆیەکی تر لە هۆیەکان کە بە کەمتەرخەمی و ناتەولوی دانانرێت بەرانبەر ئەرکە هاوسەرییەکان.

لە دەروازەی چوارەمی ئـەم کتێبـەدا بۆمـان ڕۆشـن بوویەوە: تـەڵاق لـە دیدگای شـەریعەتی ئیسـلامەوە سروشتێکی دوولایەنەی هەیە، ئـەو دوانـەش بـریتین لە: چارەسەر و سزا، لە پشتتێکردندا-وەك نموونە- چارەسەرە بۆ هەڵگرتنی زیان لەسەر ژنەکە و سـزایە بـۆ پیاوەکـە، لـە نشـوزی ژنەکـەدا سـزایە بـۆی و چارەسەرە بۆ پیاوەکەی.. ئەمە بریتییە لە سیفەتی تەڵاق لە زۆربەی ڕووداوەکانیدا.

هەنـــدێ جـــار تـــەنها چارەســـەرە گـــەر هـــیچ کەمتەرخەمییەك لە هەردوو لایەنەکەوە بوونی نەبوو، وەك لە باری نەخۆشییەکانی زاوزێ یـان نەخۆشـییە ئەقڵییـەکان یـان نەخۆشـییە گوازراوەکانـدا، ئـەم سروشتە دووسەرە گشتگیرە لەگەڵ ئەو حیکمەتـەدا پێکئێتـەوە دلوا دەکـات دانبنرێـت بە(تەڵاقـدا لـە شەریعەتەکان و یاساکان و نەریتەکاندا)

# پاشكۆ

ئـەم پاشـكۆیە لـە كتـێبی "الإسـلام قبـل المـذاهب" وەرگـێراوە، حـەفتا سـاڵێك لەمەوبـەر دانـراوە لەلایـەن دەسـتەیەك لـە گـەورەپیاوانی ئەزهـەری شـەریفەوە، مامۆستا"زەكەریا عەلی یوسف" هەستاوە بە راستكردنەوەی و منـیش وەكو خۆی لـەم پاشـكۆیەدا دەیگوێزمـەوە، بـەڵكو خـودا هیدایـەتی ئەقڵـە چەقبەسـتووەكانی پێبدات، ئەوانەی لە ئەنگێزەی مەزهەبیبوون و سۆفیگەری و تایەفەگەریدا نغرۆبوون، ئەوانەی ژنی عەمر بۆ زەید موباح دەكەن بەر لەوەی عەمر تەڵاقی بدات و زەید مارەی بكات، بەردەوامن لە روخانی خانە و لانەی خێزانی بەسەر خانەوادەكەدا لە پیاو و ژن و منداڵ بەبێ ئەوەی گوناهێكیان هەبێت.

دەقی ئەوەی لە كتێبی"الإسلام قبل المذاهب"دا هاتووە لە لاپەڕەی ١١٩–١٢٣.

## ئەو بابەتانەی كەمر بوونیان نەبێت تەڵاق ناكەوێت:

١–شایەتگرتن لەسەر تەڵاق و رجعە(گێڕانەوە)، بە ئایەتی: ﴿يَاأَيُّهَا النبـي إِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَ يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّـهِ فَقَـدْ

ظَلَمَ نَفْسَهُ لاَ تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا، فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَى عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ﴾.[1]

فەرمانەکە لەم ئایەتەدا بۆ واجبوونە، ئەوەش بریتییە لە قسەی ئیبن عەباس.

"الطبري" لە تەفسیرەکەیدا ریوایەتی کردووە دەڵێت: گەر پیاوەکە ویستی بیگێڕێتەوە بەر لەوەی عیدەکەی تەواو بێت دوو پیاو دەکات بە شایەت، وەك لە ئایەتی: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَى عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ لە کاتی تەڵاق و گێڕانەوەدا، هەروەها قسەکەی:"عطاء" کە "عبدالرزاق وعبد بن حمید" ریوایەتیان کردووە دەڵێت: (تەڵاق بە شایەتە)"

٢-پووچبوونەوەی رجعە گەر پیاوەکە مەبەستی زیانگەیاندن بێت بە ژنەکە، بە ئایەتی: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلاَحًا﴾[2].

٣-واجبوونی موتعە(خەرجی بۆ کردن) بۆ تەڵاقدراو بە ئایەتی: ﴿وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾[3].

٤-عیدەی گومانلێکراو بە ئایەتی: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوءٍ وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ أَن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾[4]. هەروەها ئایەتی ﴿وَاللاَّئِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ أَنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاَثَةُ أَشْهُرٍ وَاللاَّئِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُولاَتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا﴾[5].

---

[1] سورة الطلاق/١-٣.

[2] سورة البقرة/٢٢٨.

[3] سورة البقرة/٢٤١.

[4] سورة البقرة/٢٢٨.

[5] سورة الطلاق/٤.

پاشان کتێبەکە بەردەوام دەبێت لە وتن و دەڵێت:

**"پوختەی ئەوەی پێشوو":**

١–تەڵاق بەر لە چوونە لا ڕێگەپێدراوە بە خستنی یەك تەڵاق.

٢–خولع یان تەڵاق ڕێگەپێدراوە لە هەموو کاتێکدا لەسەر بڕێك لە ماڵ(سامان) یان ئازادکردن بۆ ئەوەی چووەتە لای و ئەوەش نەچووەتە لای بە خستنی یەك تەڵاق.

٣– ئەو ئافرەتەی مێردەکەی چووەتە لای گەر لەوانە بوو حەیزی دەشۆری و سکپڕ نەبوو دروستە بە یەك تەڵاق تەڵاقی بدات لە پاکێتێییەکدا نەچووبێتە لای.

٤–ئەو ئافرەتەی مێردەکەی چووەتە لای و منداڵە و حەیزی نەشۆریوە یان بە تەمەنە و لە شۆرینی حەیزدا نەماوە بە دابڕانێکی تەولو تەڵاقدانی ڕێگەپێدراوە لە هەر کاتێکدا بە یەك تەڵاق.

٥–سکپڕێك سکەکەی دەرکەوتووە دروستە تەڵاقدانی لە هەر کاتێکدا بە یەك تەڵاق.

٦–تەڵاق لە حەیز و زەیسانی و پاکێتییەکدا مێردەکەی چووبێتە لای دروست نییە مەگەر سکپڕییەکەی ئاشکرا بێت.

٧–تەڵاقی پەیوەستکرلو بە هەموو شێواز و گوزارەکانییەوە لە بنەڕەتدا هیچ شتێکی پێ ناکەوێت.

٨–سوێندخواردن بە تەڵاق ژلوەژاوە و تەڵاقی پێ ناکەوێت.

٩–ئافرەتێك لە عیدەدا بێت تەڵاقی پێ ناکات[1].

[1] واتە یەکسانە تەڵاق رجعی بێت یان بائین بە ئایەتی: ﴿يَاأَيُّهَا النبي إِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾سورة الطلاق/١. "اللام"ەکە بۆ دیاریکردنی کاتە، واتە لەو کاتەوەی راستەوخۆ عیدەکەیان دەست پێ دەکات، تەڵاقدرلو تەڵاق نادرێت و ئافرەتێك لە عیدەدا بێت عیدەی تر ←

١٠–تەڵاقی هاوەڵ بە ژمارە لەڕووی گوزارەوە یان ئاماژەوە تەنها یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت.

١١–تەڵاق بە گوزارشت و بەڵگەیەك دەکەوێت مەبەست پێی سەرهەڵدانی تەڵاق بێت.

١٢–هیچ تەڵاقێك ناکەوێت تا دوو شایەتی دادپەروەری گوێگری تێگەیشتوو ئامادە نەبێت.

١٣–هەواڵدان بە تەڵاق و دانانن پیایدا بە تەڵاق دانانرێت مەگەر مەبەست پێی سەرهەڵدانی تەڵاق بێت و مەرجەکانی دروستی تەڵاق لە کاتی هەواڵپێدانی هاتبنە دی.

١٤–گەر دوو هاوسەرەکە جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە لەوەدا کە تەڵاقەکە لە حەیزدا بووە یان لە زەیسانیدا یان لە پاکێتییەکدا چووبێتە لای، ئەوا قسەی "بانگەشەکەری دروستییە" لەگەڵ سوێندخواردنیدا.

١٥–گێڕانەوە(رجعة) تەنها بە قسە یان شتێك بەڵگە بێت لەسەری دروستە و بە ئامادەبوونی دوو شایەتی دادپەروەری گوێگری تێگەیشتوو.

١٦– گێڕانەوە(رجعة) دروست نییە گەر مەبەست پێی زیانگەیاندن بێت، لە زیانگەیاندنەکان ئەوەیە بیگێڕێتەوە تاکو تەڵاقێکی تری بخات لەدوای گێڕانەوەکە.

١٧–گەر تەڵاقدراو بانگەشەی ئەوەی کرد گێڕانەوەکە مەبەست پێی زیانگەیاندن بووە بە ئەو ئەوا بەڵگە بەڵگەی ئەوە و قسەش قسەی مێردەکەیە لەگەڵ سوێندخواردنی(گەر ژنەکە بەڵگەی بەدەستەوە نەبوو)

---

ناگرێت، ئەگینا بەدەستهێنانی بەدەستهاتوو دەردەچێت ئەوەش ئەستەم و پووچە بە ڕێکەوتنی زیرمەندان.

١٨–ئەو ئافرەتەی مێردەکەی نەچووەتە لای و تەڵاقدراوە خەرجی بۆ کردنی لەسەر پیاوەکە پێویست دەبێت گەر مارەییەکەی ناوی لێ نەنرابوو.

١٩–خەرجیبۆکردن لەسەر تەڵاقدەر پێویستە بۆ ئەو ژنەی چووەتە لای و تەڵاقیداوە.

٢٠–بۆ ئافرەتێك خۆی خولعکردبێت یان خۆی بە هۆیەك تەڵاق دابێت خەرجی لەسەر پیاوەکە پێویست نابێت[1].

٢١–خەرجی لەسەر تەڵاقدەر بەپێی گوزەرانییەتی لە دەوڵەمەندی و هەژاری، حاڵی تەڵاقدراوەکە هەرچۆنێك بێت، لەگەڵ رەچاوکردنی ئەو رەوشەی تەڵاقەکەی تێدا بەرهەم هاتووە.

٢٢–ئەو ئافرەتەی لە عیدەدایە کۆتاهاتنی عیدەکەی بە حەیز بەڕاستناگەڕێت بەر لە تێپەڕبوونی سێ مانگی تەولو لە بەرواری تەڵاقەکەوە.

٢٣–گەر ئەو ئافرەتەی لە عیدەدایە لەو ئافرەتانە بوو حەیز دەشۆرێ و سکپڕ نییە و شیردەر نییە بانگەشەی ئەوەی کرد هەموو مانگێك یەك جار حەیزی بۆ نایەت ئەوا عیدەکەی سێ مانگی تەواوە لە بەرواری تەڵاقەکەیەوە.

٢٤–گەر ئەو ئافرەتەی لە عیدەدایە و شیردەدات بانگەشەی ئەوەی کرد لە مادەی پێشوودایە(هەموو مانگێك یەك جار حەیزی بۆ نایەت) ئەوا عیدەکەی سێ مانگی تەواوە لە ڕۆژی دوای ئەوەوە دەست پێ دەکات بۆ تەواوکردنی شیردانەکەی بە کۆرپەکە لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا.

هەروەها کتێبەکە بەردەوام دەبێت لە وتن و دەڵێت:

سەرباری ئەوانە:

---

[1] واتە گەر ژنەکە کەمتەرخەم بوو و هۆکاری خولع و تەڵاق بوو.

أ–تەڵاق تەنها بە گوزارە شەرعییەکان دەکەوێت، وە: (تـۆ تەڵاقـدراوی)، یـان(تۆ دەستت لێ بەردرلوە(ئازادکرلوی) یان (لێت جیابوومەوە) یان (بچۆرەوە بۆ لای باوانت)[1].

ب–تەڵاق تەنها بە تاك و ئارەزوویەکی دڵنیاکەرەوە دەکەوێت.

ج–تەڵاق لەباری تووڕەبوونێکی زۆر توندا کە نازانێت چی دەڵێت ناکەوێت.

کۆتایی هات...

رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ

[1] واتـە بـۆ ئـەو کەسـانەی زمـانی عـەرەبی دەزانـن، بـەڵام بـۆ کەسـانی تـر مانـای ئـەم گوزارانـە وەردەگیرێن لە زمانەکەی خۆیاندا.

# گرنگترین سەرچاوەکان


* المراجع الاسلامية

- تفاسير القرآن الكريم

١. ابن العربي (أبو بكر محمد بن عبد الله المالكي المعروف بابن العربي ٤٦٨-٥٤٣هـ) أحكام القرآن تحقيق محمد علي البجأوي ط/٢ مطبعة عيسى البابي.

٢. أبو حيان (محمد بن يوسف بن علي بن يوسف بن حيان الغرناطي الاندلسي ٦٥٤-٧٤٥هـ) التفسير الكبير المسمى بالبحر المحيط. مطبعة السعادة - القاهرة ١٣٢٨هـ.

٣. الجصاص (الأمّام أبو بكر أحمد بن علي الرازي ت -٣٧٠هـ) أحكام القرآن . تحقيق محمد صادق قمحأوي.

٤. الرازي (الأمّام فخر الرازي ت - ٦٠٦هـ)، التفسير الكبير، المطبعة البهية المصرية - القاهرة.

٥. الطبري (أبو جعفر محمد بن جرير الطبري ٢٢٤-٣١٠هـ)، تفسير الطبري. طبعة دار المعارف - القاهرة ١٩٦٦م.

٦. القرطبي (أبو عبد الله محمد بن أحمد الانصاري القرطبي ت -٦٧١هـ) الجامع لأحكام القرآن ط/٣، ١٣٨٧هـ-١٩٦٧م.

- الحديث الشريف وشروحه:

١. أبو دأود (سليمان بن الأشعث السجستاني) سنن أبي دأود مع حاشية عون المعبود، طبعة دار الكتاب العربي - بيروت.

٢. البخاري (الأمّام أبو عبد الله محمد بن اسماعيل البخاري ١٩٤-٢٥٦هـ) صحيح البخاري طبعة بولاق ١٣١٤هـ.

٣. البيهقي (الأمّام أبو بكر أحمد بن الحسين النيسابوري ٣٨٤ـ٤٥٨هـ) السنن الكبرى طبعة حيدر آباد ١٣٤٧هـ.

٤. الشوكاني (محمد بن علي بن محمد الشوكاني ت ـ١١٢٥هـ)، نيل الأوطار شرح منتقى الاخبار من أحاديث سيد الاخيار. مطبعة البابي الحلبي.

٥. العسقلاني (أحمد بن علي بن حجر العسقلاني ٧٧٣ـ٨٥٢هـ) فتح الباري شرح صحيح البخاري. نشر وتوزيع المملكة العربية السعودية.

٦. بلوغ المرام من جمع أدلة الأحكام مع شرحه سبل السلام للصنعاني. مطبعة العاطف.

٧. العيني (الأمّام بدر الدين أبو محمد محمود بن أحمد ت ـ٨٥٥هـ) عمدة القاري شرح صحيح البخاري. الطباعة المنيرية.

٨. النووي (أبو زكريا يحيى بن شرف ت ـ٦٧٧هـ) شرح النووي على صحيح مسلم.

*** الكتب الفقهية:**

- **الفقه الحنفي:**

١. ابن الهمام (الأمّام كمال الدين محمد بن عبد الواحد ت ـ٦٨١هـ) شرح فتح القدير على الهداية شرح بداية المبتدي للمرغيناني ت ـ٥٩٣هـ.

٢. ابن عابدين (محمد أمين الشهير بابن عابدين) رد المحتار على الدر المختار شرح تنوير الأبصار ط/٢، ١٣٨٦هـ ـ١٩٦٦م.

٣. الزيلعي (عثمان بن علي الزيلعي)، تبيين الحقائق شرح كنز الدقائق ط/٣.

٤. السرخسي (شمس الدين السرخسي) المبسوط مطبعة السعادة ـ مصر ١٣٢٤هـ.

٥. الكاساني (علاء الدين أبو بكر بن مسعود الكاساني ت ـ٥٨٧هـ) بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع ط الأمّام.

- **الفقه المالكي:**

١. الدردير (سيدي أحمد الدردير) شرح الصغير مع حاشية الصأوي (أحمد الصأوي) بلغة السالك لأقرب المسالك ط دار الفكر ـ بيروت.

٢. الدسوقي (شمس الدين محمد عرفة الدسوقي)، حاشية الدسوقي على الشرح الكبير لأبي البركات سيدي أحمد الدردير ط دار احياء الكتب العربية.

٣. الخرشي (أبو عبد الله محمد الخرشي) شرح الخرشي على المختصر الجليل للأمّام أبي ضياء سيدي خليل ط/٢ بولاق ١٣١٧هـ.
٤. القرافي (شهاب الدين أبو العباس أحمد بن ادريس بن عبد الرحمن الصنهاجي المعروف بالقرافي) الفروق ط/١، ١٣٤٤هـ.
٥. المنتقى للباجي (سلمان بن خلف) شرح موطأ أمّام مالك.

- **الفقه الشافعي:**

١. الأربيلي (يوسف الأربيلي) الانوار لأعمال الأبرار مع حاشيتي الكمثري والحاج ابراهيم ط الحلبي ـ القاهرة.
٢. الباجوري (ابراهيم الباحوري)، حاشية الباجوري على شرح ابن قاسم الغزوي ط احياء الكتب العربية.
٣. الشيرازي (أبو اسحاق ابراهيم بن علي بن يوسف الفيروز آبادي) المهذب ط عيسى البابي الحلبي ـ مصر.
٤. الشربيني (محمد الخطيب الشربيني)، مغني المحتاج. ط الاستقامة ـ القاهرة ١٣٧٣هـ.

- **الفقه الحنبلي:**

١. ابن قدامة (أبو محمد عبد الله بن أحمد بن محمد بن قدامة المقدسي ت ـ ٦٢٠هـ) المغني على مختصر الخرقي. نشر مكتبة الرياض الحديثة.
٢. ابن تيمية (شيخ الاسلام أحمد بن تيمية)، مجموع فتأوى ابن تيمية. ط مكتبة المعارف ـ الرباط ـ المغرب.
٣. ابن قيم الجوزية (شمس الدين أبو عبد الله محمد بن أبي بكر ت ـ ٧٥١هـ). أعلام الموقعين عن رب العالمين، نشر مكتبة الكليات الأزهرية.
٤. اغاثة اللهفان من مصايد الشيطان ط مصطفى البابي.
٥. زاد المعاد، هدي خير العباد
٦. محمد خاتم النبي ين وأمّام المرسلين ـ المطبعة المصرية.

- **الفقه الجعفري:**

١. الحلّي (جعفر بن الحسن الحلّي الملقب بالمحقق ٦٠٢-٦٧٦هـ) المختصر النافع فقه الأمّامية ط ١٣٨٣هـ. شرائع الاسلام في الفقه الاسلامي الجعفري، منشورات دار مكتبة الحياة.

٢. الطوسي (الأمّام أبو جعفر محمد بن الحسن بن علي)، كتاب الخلاف في الفقه ط تابان طهران.

٣. الطبرسي (الأمّام حسين النوري الطبرسي)، مستدرك الوسائل ومستنبط المسائل ط طهران ١٣٨٢هـ.

٤. العاملي (الشهيد السعيد زين الدين الجبعي العاملي) الروضة البهية شرح اللمعة الدمشيقة.

٥. شرائع الاسلام للمحقق (نجم الدين ابي القاسم).

- **الفقه الزيدي**

١. الشوكاني (محمد بن علي الشوكاني)، الدراري المضية شرح الدرر البهية ط/١، ١٣٤٧هـ.

٢. الصنعاني (القاضي أحمد بن القاسم العنسي اليماني الصنعاني). التاج المذهب شرح متن الأزهار ط/١٣٦٦هـ-١٩٤٧م.

- **الفقه الأباضي:**

١. أطفيش (محمد بن يوسف أطفيش)، شرح النيل وشفاء العليل ط السلفية - القاهرة ١٣٤٣هـ.

٢. السالمي (أبو محمد عبد الله بن حميد السالمي)، جوهر النظام في علمي الأديان والأحكام، تحقيق لبراهيم أطفيش الجزائري ط السلفية.

- **الفقه الظاهري:**

١. ابن حزم (أبو محمد علي بن أحمد بن سعيد بن حزم ت - ٤٥٦هـ) المحلي ط المكتب التجاري للطباعة والنشر والتوزيع - بيروت. معجم فقه ابن حزم الظاهري ط ١٣٨٥هـ-١٩٦٦م.

• **الفقه المقارن:**

١. ابن رشد (الأمّام أحمد بن محمد القرطبي الاندلسي الشهير بابن رشد)، بداية المجتهد ونهاية المقتصد ط/١، ١٣٢٩هـ.
٢. الشعراني (الأمّام سيدي عبد الوهاب الشعراني) الميزان الكبرى.

*** قوانين الأحوال الشخصية:**

١. القانون العراقي رقم (١٨٨) لسنة ١٩٥٩ المعدل.
٢. القانون المصري رقم (٢٥) لسنة ١٩٢٩ المعدل بقانون رقم (٤٤) لسنة ١٩٧٩م.
٣. القانون الأردني رقم (١٦) لسنة ١٩٧٦.
٤. القانون الأردني رقم (٢٥) لسنة ١٩٧٧.
٥. القانون السوري رقم (٤٣) لسنة ١٩٧٥.
٦. القانون الجزائري (المشروع التمهيدي لقانون الأحوال الشخصية) الصادر سنة ١٩٨١.
٧. القانون التونسي (مجلة الأحوال الشخصية التونسية) الصادرة سنة ١٩٥٦.
٨. القانون التونسي (مجلة الأحوال الشخصية) لسنة ١٩٧٦.
٩. القانون المغربي (مدونة الأحوال الشخصية) لسنة ١٩٥٧.

*** المراجع الحديثة:**

١. أحمد شاكر، نظام الطلاق في الإسلام.
٢. أحمد الغندور، الطلاق في الشريعة الإسلامية والقانون.
٣. الصابوني (عبد الرحمن الصابوني)، مدى حرية الزوجين في الطلاق.
٤. كمال أحمد عوف، الطلاق في الإسلام محدود ومقيَّد.
٥. المراجع الأخرى المذكورة في الهوامش.

*** المراجع الموسوية:**

١. **التوراة**
٢. شعار الخضر في الأحكام الشرعية الاسرائيلية للقرائين للباهو بشيامي تعريب وشرح مراد فرح، مطبعة الرغائب ـ القاهرة ١٩١٧.

٣. التوراة والتاريخ عدد (١٤) سلسلة كلام الله، تعريب الأب عمّانوئيل، المطبعة العصرية ـ الموصل ١٩٦٥.

٤. التوراة سفر تثنية الاشتراع والتكوين من الكتب المقدسة، المطبعة الامريكية ـ بيروت ١٩١٣م.

٥. القراؤون والريانون، مراد فرح، مطبعة الرغائب ـ القاهرة ١٩١٨م.

٦. الأحكام الشرعية في الأحوال الشخصية للاسرائيليين، مسعود حاي بن شمعون، طبعة القاهرة ١٩١٢م.

* المراجع المسيحية:

١. انجيل متي، أنجيل لوقا، أنجيل مرقص، كتاب العهد الجديد ليسوع المسيح ط/٣ مطبعة الزمان ـ بغداد ١٩٥٦.

٢. المجموع الصفوي.

٣. قواعد الأرمن الأرثونكس، الدكتور اهاب حسن اسماعيل.

٤. قواعد الروم الأرثونكس، الدكتور اهاب حسن اسماعيل.

٥. حياة السيد المسيح، فاروق الدملوجي.

٦. انحلال الزواج في شريعة الأقباط الارثونكس للدكتور اهاب حسن اسماعيل ١٩٥٩م.

* الأحوال الشخصية لغير المسلمين:

١. الأحوال الشخصية للوطنيين غير المسلمين وللأجانب للدكتور أحمد سلامة ط/٢، ١٩٦٢.

٢. أحكام الأحوال الشخصية لغير المسلمين من المصريين للدكتور توفيق حسن فرج ط/١، ١٩٦٢.

٣. أحكام الأحوال الشخصية للمصريين غير المسلمين، حلمي بطرس. الأحوال الشخصية للطوائف غير الإسلامية من المصريين في الشريعتين (المسيحية والموسوية) للدكتور محمد محمود نمر ألفي.

٤. الأحوال الشخصية لغير المسلمين الوطنيين والأجانب، ـ محاضرات، الدكتور جميل الشرقأوي.

٥. انحلال الزواج في حياة الزوجين في التشريعات الأوربية الدكتور جميل الشرقأوي.

٦. تطور قانون الطلاق في أوربا الدكتور سيمسون.
٧. القوانين والأحكام السياسية في التشريع السوفيتي ١٩٧٢.
٨. القانون الدولي والملي الخاص مستر فردريك كودى.
٩. الأحوال الشخصية للأجانب الدكتور جميل خنكى.
١٠. الزواج قيامه .أثاره .انقضاؤه في القانون الفرنسي.الدكتور عبد الفتاح عبد الباقي.
١١. مجلة عائلة اليوم الصادرة من الفاتيكان العدد السابع ١٩٨٤.
١٢. المراجع الأخرى المذكورة في الهوامش.

*** التشريعات العراقية القديمة:**

١. قانون أورنمو.
٢. قانون أشنونا.
٣. قانون لبت عشتار.
٤. قوانين حمورابي.
٥. القانون الحيثي.
٦. القوانين الآشورية الوسيطة.

*** الترجمة، والتعليق، والشرح للتشريعات العراقية القديمة:**

١. الدكتور محمود الأمين، قوانين حمورابي، مستل من مجلة كلية الآداب عدد (٣) كانون الثاني ـ بغداد ١٩٦١م.
٢. الدكتور فوزي رشيد، الشرائع العراقية القديمة ط دار الحرية ـ بغداد ١٩٧٩م.
٣. الدكتور عامر سليمان، القانون العراقي القديم.
٤. الدكتور صبيح مسكوني، تاريخ القانون العراقي القديم.
٥. الأستاذ عبده حسن الزيات، مجلة القضاء، السنة الثانية، العدد الخامس، كانون الأول ١٩٣٦م.
٦. الدكتور إبراهيم عبد الكريم الغازي، تاريخ القانون في وادي الرافدين والدولة الرومانية.

## * المراجع التاريخية


١. أدوارد وستر مارك، قصة الزواج، ترجمة عبد المنعم الزيادي. أحمد أمين، فجر الإسلام.

٢. ابن حبيب (أبو جعفر محمد بن حبيب البغدادي)، المحبر، مطبعة حيدر آباد الدكن الهند ١٣٦١هـ.

٣. الآلوسي (محمود شكري)، بلوغ الأرب في معرفة أحوال العرب. شرح وتصحيح وضبط بهجت الأثري، المطبعة الرحمانية ١٩٢٤م.

٤. الأصبهاني (علي بن الحسين الاصبهاني) كتاب الأغاني. مصور عن طبعة دار الكتب.

٥. أحمد شبلي، مقارنة الأديان (الهند الكبرى).

٦. بواقيم ميخائيل، تاريخ القانون في مصر.

٧. توفيق السويدي العباسي، حقوق الرومانيين، طبعة الفلاح ١٩٢٢م.

٨. الدكتور جواد، تاريخ العرب قبل الإسلام.

٩. حامد عبد القادر، قادة الفكر في الشرق والغرب.

١٠. الدكتور عبد الوهاب عزام

١١. إيران في عهد الساسانيين.

١٢. الدكتور يحيى الخشاب.

١٣. فاروق الدملوجي، الألوهية في المعتقدات الوثنية.

١٤. محمد حافظ صبري، المقارنات والمقابلات ط/١، ١٣٢٠هـ ـ١٩٠٢م.

١٥. المحمصاني (الدكتور صبحي المحمصاني)، الأوضاع التشريعية في الدول العربية، ماضيها وحاضرها ط/٣، ١٩٦٥م.

١٦. الدكتور محمد سلام زناتي (المرأة عند قدماء اليونان) (المرأة عند الرومان)، دار الجامعات العربية للطباعة ١٩٥٨م.

١٧. الميداني (أبو الفضل أحمد بن محمد النيسابوري)، مجمع الأمثال ط القاهرة ١٣٤٤هـ.

١٨. محمد عبد السلام، فلسفة الهند القديمة (ثقافة هندية) ط ١٩٥٣م.

١٩. نورمان (الدكتور بالمر)، النظام السياسي في الهند ترجمة وتقديم الدكتور محمود فتح الله، تصوير حسن جلال العروسي.

٢٠. وليام لانجر، موسوعة تاريخ العالم، أشرف على ترجمته الدكتور محمد مصطفى زيادة.

٢١. ول ديوارنت، قصة الحضارة.

* القانون الروماني وشروحه:

١. مدونة جوستنيان في الفقه الروماني، ترجمة الدكتور عبد العزيز فهمي ط ١٩٤٦م.

٢. الدكتور شاب توما، القانون الروماني.

٣. الدكتور محمود مصطفى، القانون الروماني، ط/٣، ١٩٥٩م.

٤. الدكتور عبد المنعم البدرأوي مبادئ القانون الروماني (تاريخه ونظمه) طبع دار الكتاب العربي مصر ١٩٥٤م.

* المعاجم:

١. الموسوعة الميسرة، دار القلم ومؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر ـ القاهرة ١٩٦٥م.

٢. دائرة المعارف القرن العشرين، والقرن الرابع عشر، تأليف محمد فريد وجدي، مطبعة دار المعارف القرن العشرين ـ القاهرة.

٣. دائرة المعارف، تأليف المعلم بطرس البستاني، طبعة بيروت ١٨٧٦م.

* المراجع باللغات الاجنبية:

١. اللغة الانكليزية

1.American FamiLY Law in Transition by walter O. wegrausn and sanfordn. Katz (1983).

2. dlvorcE In ENGLAND relevant Statutes
D. R..a 69 Law of divorce reformeD By divorce ReForm act 1969
m.c.a 73 law of dlvorce consoLiDateD matri – moniaL causes ast. 1973
m.p.a 84 amendments matrim oniaL proseedinGs ast 1984

٢. اللغة الالمانية

dr. KhaLiL aBBASi
die recHtLi cHe sTeLLunG Der fraus. 72-74
KOLN – 1965

### ٣. اللغة الروسية

a.m. Hezaeba. BpaK, cem6 JL, 3aKoH. HOCKba1984c.58-73

### ٤. اللغة الفرنسية:

1.Traite eLementaire du dorit pLanioL, ripert & bouLanger civiL t. 1, paris 1949
2. Le bras: divorce et separtion de corps dans Les LegisLations positives. Europe, paris 1952M. Depitre